

حکومەتی هەریمی کوردستان
وەزارەتی روشنبیریی و لاوان
بەریوەبەریتیی گشتیی روژنامەنووسیی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەریوەبەریتیی چاپ و بلاوکردنەوەی سلیمانی





بەریوەبەریتیی
چاپ و بلاوکردنەوەی
سلیمانی

**پـواز**

- ❖ نووسەر: محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆلەیی
- ❖ بابەت: بیرەوەری زیندان
- ❖ پیتچنی: نووسەر
- ❖ هەلەچنی: کارزان عەبدوللا
- ❖ نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- ❖ نەخشەسازیی ناوەوە: چۆمان عادل
- ❖ سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوللا
- ❖ قەبارەی کتێب: ۲۵×۳۵
- ❖ ژمارەی لاپەڕە:
- ❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: (۷٦٦)
- ❖ تیراژ : (۵۰۰) دانە
- ❖ چاپ: چاپخانەی ئاوێنە
- ❖ نرخ: (٦۰۰۰) دینار
- ❖ ژمـارەی سـپاردنی (۲۷۸۳ )ی سـالی ۲۰۱۰ی وەزارەتـی ڕۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی**

**گردی ئەندازیاران- بەرامبەر کوردستانی نوێ**

**ژمارەی تەلەفۆن: ۳۱۸۰۹۹٤**

## ئەم بەرهەمی ماندووبوونەم پێشکەشە بە:

- گیانی پاکی باوکم کە بەدەر لە خواستی خۆی لە تەمەنی پەنجا ساڵییدا ئێمەی دایە دەست دایکم[1].
- گیانی بەرزەفڕی دایکم کە تا لە ژیاندا بوو لە خەم و هەمی ئێمەدا بوو.
- گیانی شۆخی ئامۆزاو هاوسەرم کە تا شێخەڵی سەوزی تەمەنی زەرد هەڵگەڕا یارمەتیدەرێکی دڵسۆزو بەئەمەك و بێوێنەی ڕۆژانی ژیانم بوو.
- جگەرگۆشەکانم (بەخشی، ئازاد، بەهار، ژیر، بڵێسە، شێتێ و شەنگە).
-هاوڕێیانی شەهید (جەبار، حەمەڕەحیم، ئەحمەدی سەناعە، عەتا، وەستا بەکری دارتاش، سالار، ڕزگار، موحسین).
- هاوڕێیانی زیندانیم.
- براو خوشکە بەسۆزو خۆشەویستەکانم.
- ئەو تێکۆشەرانەی خۆنەویستانە لەپێناوی گەل و نیشتمانەکەماندا سەربەرزانە گیانیان بەخشی.
- ئەو مامۆستاو تێکۆشەرانەی ڕایانکێشامە ناو خەباتی سیاسییەوە.
- ئەو هاوڕێ و خزم و کەسە دڵسۆزانەی کە لەکاتی زیندانیکردنمدا پەرۆشی ژیانی خۆم و منداڵەکانم بوون.

---

[1] باوکم شێخ عەبدولکەریمی شێخ کاکە حەمەی سۆڵە، شێخی تەکیەی ... لەشوێنی باپیرەم لەسەر تەکیەکەی دانیشتبوو. لەکاتی گەڕانیدا بۆ نێشادو لەگەڕانەوەی لە شاربازێڕو دۆڵە رووت بۆ بەکرەجۆو ماڵی (شێخ سدیقی شێخ عارفی دێلێژە)، کە هاوسەری پوورە ئامینەم بووە لە بەکرەجۆ، بەمەبەستی پرسینەوە لە دۆستێکی بەناوی (حاجی فەتاح) لە گەڕەکی مەلکەندی سلێمانی سەردانی سلێمانییان کردبوو. لەکاتی گەڕانەوەیاندا لەنێوانی (قلیاسان و بەکرەجۆ)دا، لە دامێنی باخی بەختیاری، ئۆتۆمبێلەکەیان بە کەندێکدا دەکێشێ و لەو رووداوەدا لە ئێوارەی رۆژی (١٩٥٦/٩/١٤) لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی گیانی سپاردو کۆچی دوایی کرد.

# کتێبەکەم بۆ ناونا پواز؟

پێشینانمان وتوویانە (دار تا پوازی لەخۆی نەبێ، ناقلەشێت).

خوێنەری هێژا... ئەم یاداشتەی بە ناونیشانی (پواز یان لە ئەمنە سوورەکەوە بۆ ئەبوغرێب)، کە دەخوێنیتەوە گێڕانەوەی بیرەوەریی مێژوویەکە، لە رۆژو رۆژگارێکدا بوون، کە دەسەڵاتی رژێمی دکتاتۆری بەعس و شەخسی سەدام خۆی لەوپەری لوتبەرزیدا حوکمرانیی عیراقیان دەکرد، بەحیسابی خۆیان لە شەری (عیراق-ئێران)دا سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێنابوو. بۆیە لەگەل دەستبەربوونیان لەو شەرە، یەکسەر رووی شەری قەلاچۆکردنی کوردیان بەرەو کوردستان و شۆرشەکەی کردەوە، بە دڕەندەترین شالاوی پەلاماردان و بە بەکارهێنانی هەموو جورە چەکێك بە قەدەغەکراوەکانیشەوە، پەلاماری سەرجەم کوردستانیانداو لەبەر (بێپەیمانیی رژێمی ئێران)و نەبوونی هێزو چەکی پێویست بۆ بەرپەچدانەوەی ئەو هێرشەی رژێم. شۆرشی کورد تووشی شکست بوو. لەمەشدا خۆی بەسەرکەتوو دادەنا... بەپێی سیاسەتی پاوانخوازیی و غەرابوونی دەیویست دەست بەسەر وڵاتانی عەرەبیشدا بگرێت، کارێك بکات کە (سەدام) ببێتە تاکە سەرکردەی عەرەبیی و حزبی بەعسیش ببێتە تاکە حزبی عەرەبیی لە وڵاتانی عەرەبیدا... بۆیە هەنگاوی یەکەم بۆ ئەو سیاسەتەیان پیلانی داگیرکردنی دەولەتی کوەیتیان دارشتو پەلاماریان داو داگیریان کرد...

ئا لەو رۆژو سەردەمەدا، کۆمەلێك رۆلەی بەجەرگ، نەبەز و بە ئەمەکی ئەم گەلە لەناو ریزی رێکخستنەکانی (کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) دا لەناو شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا نەبەردانەو چاونەترسانە، روو بەرووی سیاسەتی جینۆسایدی کوردستان وەستانەوەو زۆر بەوردیی و زیرەکانە درێژەیان بە خەباتی نهێنیان داو بە ئاشکرا ملیان لە چەقۆی تیژی بێ ئامانی بەعس دەسوو.... ئەوەندە بەدلسۆزیی و پەرۆشەوە تێدەکۆشان، دەربەستی خێزان و مندال و مال و ژیانیان نەبوون.

بەعسییەکان دوای جێبەجێکردنی سیاسەتی جینۆسایدی کوردستان، دەیانزانی و هەستیان بەوە کردبوو، کە بزووتنەوەیەکی شۆرشگێریی نهێنی لە کوردستانی ژێر دەسەلاتیاندا هەیە. کە لەلایەن سەرکردایەتی شۆرشەوە سەرپەرشتی دەکرێت، ئەو بزووتنەوەیە کە بووبووە جێگای مەترسی بۆسەر دامودەزگاکانی رژێم و حکومرانییان.

بۆیە بیریان لە دروستکردنی (پواز) کردەوە، دوای ئەو پەندە کوردییە کەوتن کە لە سەرەتای پێشەکییەکەدا وتوومە.

(دار تا پوازی لەخۆی نەبێت، ناقلەشێت)

بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو سیاسەتەیان، بە بەرنامەیەکی دارێژراوی (ئەمنیی، ئیستخباراتی، موخابەراتیی، بەعسییانە) کەوتنە پیلانی هەمەلایەنە، بۆئەوەی لەو رێگایەوە

بتوانن بزووتنەوەکە کلــۆرو بنکەن بکەن... ئەوەش یەکەم: بەکەڵکوەرگرتن لەو (پوازانەی) کە لەناو ڕێکخســتنەکان و مەفرەزەکانی پێشــمەرگەدا هەیانبوو. دووەم: بە دروستکردنی (پوازی تر) بۆ ناو ڕێکخســتنەکان و مەفرەزە پارتیزانەکانی پێشمەرگە. سێیەم: هەوڵدان بۆ کرینی ئەوکەســانەی کە لەناو ڕێکخســتنەکاندا کاریان دەکردو دەیانتوانی رازییان بکەن و لەخشتەیان بەرن و بیانکەنە (پواز) لەناو ریزەکانی ڕێکخستندا. چوارەم: بە ناردنی پیاوانی ئەڵقەلەگوێی خۆیان بۆ ناو مەفرەزەکان و ڕێکخستنەکان، بۆئەوەی بتوانن بەهۆی ئەو پوازانەوە (زەفەر) بە شــۆڕش و ڕێکخســتنەکانی بهێنن. جێگای داخ بوو، کە ڕژێم لەو سیاسەتەیاندا توانییان سەرکەوتن بەدەســت بهێنن، بە ڕێنمایی و راسپاردەکانی دەزگاپەیوەندیدارەکانیان بۆ (پوازەکانیان)، بەهێمنیی کاری خۆیان لەناو ڕێکخســتنەکان و مەفرەزەکانی پێشمەرگەدا بکەن. زۆری لەو (پوازانە) کە لە زووووە لەناو ریزەکانی ڕێکخســتن و هێزی پێشــمەرگەدا خۆیان مەڵاس دابوو، بەدڵسۆزیی کاریان بۆ دەزگاکانی ڕژێم دەکرد لە دژی شۆڕش...

کاتێك شــاڵاوەکانی ئەنفــال و کیمیاباران وەکو تاوانێکی گەورەی مرۆیی جینۆســایدی کوردســتانیان کردو قڕکردنی گەلەکەمانی پێ جێبەجێکراو شکســتی بە شــۆڕش و هێزی پێشــمەرگە هێنا... ئەو (ســیخورو پوازانەی) کە خۆیان (مەلاس) دابوو ملیان زیاتر قووت کردەوەو کەوتنە چاوەڕوانی فەرمانی پیاوەکانی ڕژێم... بۆئەوەی زیاترو زیاتر ئەڵقە لەگوێی خۆیان بســەلمێنن و ئــەو بەڵێن و پەیمانەی بــە ڕژێمیان دابوو بۆ دژایەتیکردنی شــۆڕش، بیبەنەسەر.

دیــارە لــەو ڕۆژگارەدا، ڕژێم حیســابی ئــەوەی دەکرد کە شۆڕشــی کــوردی بەتەواویی لەناوبردووەو هەموو خەڵکی کوردستانی لە چەند شارو شارۆچکەو ئۆردووگایەکی زۆرەملیدا کۆکردووەتەوەو بەنیازە لەو شارو ئۆردووگایانەش پەرتوبلاویان بکاتەوە، (کورد بکاتە ئاردی ناو درك)و ناوی کوردســتان لەســەر نەخشەی سیاســیی و ئیداریی عیراق بسڕێتەوە، ناوی کوردیش وەکو میللەت لە عیراقدا نەهێڵێت... ئا لەو کات و ساتەدا دەزگاکانی ڕژێم بەهۆی (پوازەکانیانەوە) ئاگادارکرانەوە کە ڕێکخستنێکی بەتواناو ئیشکەرو چالاك لەناو شارەکاندا هەیەو لەلایەن ناوەندی کۆمەڵەو (ڕێکخراوی پێڕەمەگروون) لە سلێمانی سەرپەرشتی دەکرێن. بەداخــەوە لەکاتێکدا، ڕێکخراوی پێرەمەگروون ســەرقاڵی خەباتێکی هێمنانەی درێژخایەن بــوو، لەناو شــارەکانی (ســلێمانی، هەولێر، دهۆك، بەغدا، کەرکوك، شــارو شــارۆچکەو ئۆردووگاکان...) بەبێ پشوودان و لێبڕاوانە کاری دەکرد. هاوڕێیانی ناو ریزەکانی ڕێکخستن بەپێی راسپاردەو ڕێنماییەکانی ڕێکخراو هەڵدەسووڕان و کەمتەرخەمییان نەدەکرد. ڕژێم لە ڕێگای (پوازەکانییەوە) بەرنامەیەکی وردی دارشــت بۆئەوەی بکەوێتە ویزەی هاوڕێیانمان بە مەبەستی دەســتگیرکردنیان، تا بتوانێت بەو ڕێگایە (ئەنفالی ڕێکخستنەکانی ناوشارەکان) بکات. بەرنامەکەشیان بە چەند هەنگاوێك دەست پێکرد...

لە وەرزی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩)دا. چەند پوازێکیان خستە جووڵەو توانییان لەو وەرزەدا

(مامۆستا ئەحمەد عەلی، مامۆستا ئەحمەدی سەناعە) دەستگیر بکەن. لە وەرزی دووەمی ساڵەکەدا توانییان (حەمەرەحیم حەسەن و سەید محەمەد) لەناو شاری کەلاردا بەهۆی پوازەوە دەستگیر بکەن، بەدوایدا توانییان (عەتای حاجی ئەحمەدو حەمە زاهیر) لەناو شاری سلێمانیدا دەستگیر بکەن. لە وەرزی کۆتایی ساڵدا توانییان (کارزان ئیسماعیل، ئەردەڵان عومەر، وەستا بەکری دارتاش و کامل سابیر) دەستگیر بکەن و لەماوەی ساڵی (١٩٨٩)دا ئەو تێکۆشەرانەیان رادەستی دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات کرد.

دوای گرتنی ئەو هاورێیانە بڕیاری یەکجاریی ئەنفالی رێکخستنی ناوشارییان دا. لە مانگی (١٩٩٠/١)دەستیان بەو شاڵاوە کرد، پوازەکانیان بەگشتیی خستە گەڕو جووڵەو هانیاندان، تا لە (١٩٩٠/١/٢٣) ئەوەی مەبەستیان بوو، لە ماوەی دوو مانگدا بە ئەنجامیان گەیاند، توانییان ژمارەیەکی بەرچاو لە تێکۆشەرانی ناو ریزەکانی رێکخستنی ناو شارەکان بپێچنەوەو لە دەزگاکانی ئەمن توندیان بکەن.

ئەو(پوازانە) جگە لەوەی ئەرکی خیانەتکارانەیان لە دژی هاورێیان ئەنجامدا. بەوەشەوە نەوەستان وەکو چۆن بەڵێنیان بە پیاوانی دەزگاکانی رژێم دابوو، تا دوا تێکۆشەری گەلەکەمان راپێچی دەزگاکانی ئەمن نەکەن، وازنەهێنن، بڕیاری ئەوەشیان دابوو، کە بروانامەی خیانەت لەدژی گەلەکەیان بەدەستبهێنن و مەدالیای سەرشۆڕیی بکەن بە یەخەیاندا، بۆیە دوای گرتنی تێکۆشەران، نامەردانە لە رۆژانی تەحقیق و ئازارو ئەشکەنجەدانیدا، دەچوونە ئەمن و دەبوونە شاهید بەسەریانەوەو بێشەرمانەو بێتابڕووانە ناپاکیی و ناپیاویی خۆیان دەسەلماند...

دیاربوو ئەو (پوازە) خۆفرۆشانە واتێگەیەنرابوون، کە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی کورد بۆ هەتاهەتایە زیندوو نابێتەوەو دروست نابێتەوە، کوردستان و خاکی کوردستانیش کورد ناتوانێت تێیدا بژی و خۆی بەخاوەنی بزانێت، ئەوەشی نەبێتە پیاوی رژێم لەم وڵاتەدا، ناتوانێت ژیان بەسەر بەرێت. عەقڵی ساویلکەی ئەو پوازانە ئەو راگەیاندنانەی دەزگاکانی ئەمنیان بە عەقڵداچووبوو بەراست لایان گەرابوو.

راستە (پوازەکان) دەستی خۆیان وەشاندو هەڤاڵانی ناو رێکخستنەکانیان بەفەتارەت برد، ئەوەی ویستیان بۆ رژێم کردیان، ئەگەر بارودۆخی عێراق یارمەتی بدانایە بەدەیانی دیکە راپێچی ئەمن دەکران.

بۆیە ئەم کتێبەم ناو نا (پواز)، چونکە جگە لەو تێکۆشەرانەی ناو رێکخستنەکانی (رێکخراوی سلێمانی) (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) کە لە ساڵانی (١٩٨٩-١٩٩٠)دا بەهۆی پوازەوە گیران، لە مێژووی گەلەکەمان و دروستبوونی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی و شۆڕشەکانی کورد دا (پوازەکان) بە حەق پوازبوون و رۆڵی کارگەریان بینیوە، بۆ زیانگەیاندنی گەورەو کوشندە بە شۆڕشەکان و بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان، وەك: حکومەتی کوردستان-ی مەلیك مەحموود، کۆماری مەهاباد، شۆڕشی بارزان، شیخ سەعیدی پیران، شۆڕشی کوردستان و لەت و پەتکردنی شۆڕشی نوێخوازی گەلەکەمان، لەناوبردنی سەرکردەکانی

شــورش و مەفرەزە پارتیزانەکان، تا تاوانی کیمیاباران و ئەنفال و ئەنفالی ڕێکخــستنەکانی ناوشــار، هەر هەمووی بەهۆی (پوازەکان)ەوە لەناوبــراون و بەئەنجام گەیەنراون، واتە (پواز) ئەو پارچە ناقۆلاّو نەگریس و نا پەســەندەی ناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی کوردییە، کە وەکو پوازی دارێکی ئەســتوور و پتەو وایە کە دەبێتە هۆی یارمەتیدەرێکی ڕاســتەوخۆ بەدەست تەور بەدەســتەکانەوە بۆ کەرت و پەرتکردنی دارە ئەســتوورەکە. بۆیە کورد لە دێرزەمانەوە وتوویەتــی (دار تا هۆزە لەخۆی نەبێت ناقەڵەشــێت)و ئەو دزەکردن و هەڵخلیســکانە لەناو کوردەواریدا پێی دەڵێن (پواز). دیارە ئەم پەندەی پێشینان لەخۆڕا نەیانوتووە، هەڵبەتە لەدێر زەمانەوە ئەم دیاردەیە بووەتە دیاردەیەکی نامۆو ناشیرین و لە جەستەو ملی کوردەوە ئالاّوەو زیانی زۆری بە کۆمەڵگای کوردەواریی گەیاندووە...

(پیلانی لەناوبردنی بارزانی، لە ســێدارەدانی خالە شــیهاب و هاوڕێیانی، شەهیدکردنی حەمەغەفوور ئاغجەلەریی و د.عەبدولڕەحمان قاســملۆ، سیروان تاڵەبانی، ئارام، مامۆستا غەفوور ژاژلەیی، مامەریشــە، حەمەڕەش، سەید کەریم، مەلا عەلی مەولوودو سەیدا ساڵح یوسفی، مامۆستا عەزیز مەحموود، بێســتونی مەلا عومەر، دایکی مســتەفا چاوڕەش، ئاشــتی، گــۆران، مــەلا جەمیل ڕۆژبەیانــی و... دەیانی تــر) هەر بەهــۆی پوازەکانەوە ئەنجامدراون. واتە (پواز) ڤایرۆســێکی کوشــندەی ناو بزووتنەوەی کوردایەتییەو تائێســتا دەرمانی بۆ نەدۆزراوەتەوە، بەڵکو لەگەڵ گەورەبوون و پتەو بوون و باڵاکردنی شۆڕشــەکاندا پواز گەشــەی کردووەو باڵای لە هاوشانی شۆڕشەکان بەرزبووەتەوە... گرووپی (شەهید لەیلا قاسم) کە (یەکەم کچی کورد) بوو لە ساڵی ۱۹۷٤-دا لە بەغدا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا کە لەسێدارە دران، هۆیەکەی (پواز) بوو...

لەبەرئەوەی یەکێکم لەو زیندانییانەی لە ڕۆژانی دەســتگیرکردنمەوە تا ئازادبوونم، ئازارو ناخۆشیی زۆرم بەدەست پوازەکانەوە چەشتووە، ئەو ڕۆژو ڕۆژگارانەم بیرناچێتەوە کە پوازەکان ڕوو بەڕووم دەبوونەوە، وێنەو سیمای دەموچاویانم هەمیشە لە پێش چاوەو زۆر شەو خەویان پێوەدەبینم و لە ئێســتاشــدا شــەوانە خــەوم لێ تێکدەدەن. بەداخەوە تــا ئەمرۆش (پواز) لە کۆڵمان نەبووەتەوە، بۆیە دەبینین لەمرۆدا کە کوردســتان ئازادکراوە. دەسەڵاتێکی خۆماڵیی کوردیمــان پێکهێناوە، جۆرێك لە ئازادیمان دەســتەبەر کردووە، لەژێــر بەزەیی دامودەزگا ســەرکوتکەرەکانی ڕژێمدا نەماوین، بەڵام (پوازەکان) ئێستا بەشێوەو شێوازو بەرگ و دەنگ و ڕەنگێکی دیکەوە لێمان ڕاســتبوونەتەوە، بە ئاشکرا لە هاوشانی دوژمنەکانمان دژایەتی ئازادیمان و دەسەڵاتی حوکمڕانیی خۆماڵیمان دەکەن، لە هەوڵدان ئازادییەکەمان لێ زەوت بکەنەوە، کوردستانەکەمان داگیربکرێتەوە، گەلەکەمان دووچاری چەوساندنەوەو ژێردەستیی بکرێتەوە...

بۆیــە دەمەوێت بەنــاوی کتێبەکەم بە (پــواز) نەفرەت لە پوازەکانی ڕابردوو و ئێــستاو ئایندەمان بکەم.

خوێنەری ئازیز، دڵنیام کاتێك کتێبەکە دەخوێنیتەوەو بە ناوەرۆکیدا شۆڕ دەبیتەوە، بۆت دەردەکەوێت کە (پواز) چۆن لە جەســـتەماندا یارییکردووەو ناجوامێرانە لە ناخماندا کنەیان کردووە لەو ڕۆژگارە سەخت و ناهەموارەدا، لەگەڵ ئەمانەشدا دڵنیام هەندێ کەسـتان لەکاتی خوێندنەوەیدا بکەونە گومانەوەو دوورنییە بەڕاست وەرینەگرن، بەڵام دڵنیام ئەوکەسـانەی لە ڕۆژانی دەسەڵاتی ڕژێمدا پریشکی زوولم و زۆریان بەرکەوتبێت و لە سیاسەتی ڕژێم ئاگادار بووبن. بە قەناعەتەوە بە یاداشـــتەکەمدا ڕۆدەچن و ڕۆژانی خۆیـــان دێتەوە یادو نەفرەت لە پوازەکان و ڕژێمی بەعس دەکەن.

ئاواتەخوازم ڕۆژان و ســاڵانێکی دیکەی وەکو ئەو ساڵانەی دەسـەڵاتی ڕژێمی بەعس. بەخە بە گەل و نیشـــتمانەکەمان نەگرێتەوە، هیچ کەسـێکی ئەم میللەتە نەکەوێتەوە ژێر زوولم و چەوساندنەوەو گرتن و کوشتنی دوژمنانمانەوە...

بۆیە ئەمەش دەڵێم، بەداخەوە لە ئێســـتای ئازادیی کوردســـتان و پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و ئازادکردنی عێراق و ڕووخاندنی ڕژێمی دکتاتۆریی بەعســـدا، لە زۆر کەس و شوێن و بۆنەدا دەبیســتم و گوێم لێدەبێت و دەڵێن: ئەرێ پێشـمەرگەو پێشمەرگایەتی، خەباتی شاخ بوون بەچی و نەبرانەوە؟!

ئەرێ ڕێکخســتنی کۆن و نهێنی ناوشارو زیندانیبوون نەبرایەوە؟ چییانکردووە؟ هەر دەیڵێن و دەیلێنەوەو کردوویانەتە بنێشـــتە خۆشەی ســـەر زمانیان. وەکو بەیتەکەی بلەی لێهاتووە، نابڕێتـــەوە... ئەگەر جارێك بەیانێکیان بە دیوارێکدا هەڵواســـیبێت، یان بڵاوکردبێتەوە، وا حیســـاب دەکەن ئەوان حکومەتیان ڕووخاندووە، ئازادیی کوردستان بەهۆی ئەوانەوە هاتووە، بۆ هەموو پۆستێکی حزبیی و ڕێکخراوەیی و حکومیی، هەر دەبێت ئەوان بن و بوون بە چی، دنیایان خواردو تێر نابن. منیش و هەموو هاوڕێیانی زیندانیمان، ڕێکخســـتنە تێکۆشـــەرو خاوەن خەباتەکان، پێشمەرگە گیان لەســـەر دەستەکان، بەو بەڕێزانە دەڵێین: ئێمە لەپێناوی بەدیهێنانی مافەکانی گەلەکەمان و ڕزگاربوون لە ســـتەم و زۆرداریی و داگیرکردنی خاکی نیشـــتمانەکەمان و فەراهەمکردنی ئەم ئازادییـــەو هێنانەدی ئەم ڕۆژەو ڕزگارکردنی خاکی کوردســـتاندا خەباتمان دەکرد... بۆنەوەی لەم ڕۆژەدا ئێمەو ئێوەی بێئاگاو بێباك لە ســـتەم و زوولمـــی ڕژێمـــە داگیرکەرەکان و ســـەرکوتکەرەکانی گەلەکەمان، ببنە خاوەنی پۆســـتی جۆراوجـــۆرو کۆمپانیاو پرۆژەی هەمەجۆری ئەوتۆ، کە بە خەوی شـــەویش نەتاندەبینی، کە ئـــەوەی لەمرۆدا بۆ ئێوە ڕەخســـاوە، هەرگیز بۆ ئێمە نەلواوە، ئێمە مافی خۆمانە شـــانازیی بە ڕابردوومانەوە، بە خەباتمانەوە، بە هەوڵ و تێکۆشـــان. دەربەدەریی، ئازارو ئەشـــکەنجەی زیندان. بریندابوون و کەمئەندامیی و شەهیدەکانمانەوە بکەین، شانازییەکەمان نە عەیبە، نە شـــوورەیی. باسـکردنیان نابێتە ئاســـتەنگێك لە بەردەمی ئێوەی بەڕێزو هیچ تاکێکی ئەم گەلەدا. ئـــەوکارو کردارانەی لەو ڕۆژو ڕۆژگارەدا کردوومانە، بـــەکاری چاکەمان زانیوە بۆ میـللەتەکەمان، لە ئێستاشـــدا ئێوەو هەر ڕۆڵەیەکی ئەم نیشـــتمانە هەرکارێکی باشـــە بۆ

گەلەکەمان و وڵاتەکەمان ئەنجامبدات، دەستخۆشـــیی لێدەکەین و ئومێدی کاری باشـــترو ســـەرکەوتنی بۆ دەخوازین...! هەرگیز ئێمە نابینە (پواز)ێـــك لەبەر دەمتاندا. ئێوە چۆن بۆ وەرگرتنـــی پۆســـتی حزبیی و ڕێکخراوەیـــی و حکومیی و پەرلەمانیـــی، لاف و گەزاف بە خزمەتی (سەربازیی، جەیشی شەعب-ی، مەجهود حەربی و تەسنیع عەسکەریی و کولییەی بەحریی و بەعســـیتی خزمەتکردنتان لە دامودەزگاکانی ئەو ســـەردەمانەداو پسپۆریتان لە بواری ئابووریی و ئیداریی و سیاســـییدا دەکەنە بروانامەو (ســـیڤی) بۆ وەرگرتنی پۆســـت)، ئێمەش ناچارین و مافی ڕەوامانە کە (ســـیڤی) خەباتی ڕابردوومان پێشکەش بکەین و داوای مافی خۆمان لە حزب و حکومەتەکەمان بکەین، بۆئەوەی قەرەبووی ســـاڵانی ماندووبوونمان و ماڵوێرانیمان بکەنەوە.

بۆ دڵگرانیتان ناڵێم، ئەوەندەی لەم ســـەردەمەدا پیاوە شـــانتەکێن و ماستاوچی و خۆبەرە پێشـــوەکان لە حزب و حکومەت ســـوودمەندن، هەرگیز تێکۆشەرانی ڕۆژگارە سەختەکان کەڵکیان وەرنەگرتووە.

(پواز) ئەگەر لە ســـەرتاوە تا کۆتایی بیخوێنیتەوە، بە بەشێك لە ئەرشیفێکی (ی.ن.ك)و مێژووی خەباتیدا دەچیتەوە. بەڵگەکانیش دەبنە ئاوێنەنمای ڕاستییەکان و بۆتان دەردەکەوێت کە (ڕێکخراوی سلێمانی پێڕەمەگروون)و ئەو هاوڕێیانەی لە سنووری ئەو ڕێکخراوەو شوێنەکانی دیکەدا خەباتیانکـــردووە، چ ڕۆڵێکیان بینیوە لە مێژووی گەلەکەیاندا!. خوێنەری ئازیز... لە پێشـــەکی بەڵگەنامەکاندا کە بەناونیشانی بەڵگەنامەکان زیاتر ڕاستییەکان دەسەلمێنن، باشتر بۆتان دەردەکەوێت کە بۆ کتێبەکەم ناوناوە (پواز).

بـــە ئومێدی ئـــەوەی مێردەزمەو پواز لە کـــۆڵ گەلەکەمان و نیشـــتمانەکەمان بێتەوە، نەوەکانی ئەمڕۆو ئایندەمان بیر لەوە نەکەنەوە ببنە (پواز)و زیان بە گەل و نیشـــتمانەکەیان بگەیەنن.

فەرموون من و ئێوەو پواز

نووسەر

٣٠-٢٠١٠/٨/٣١

سلێمانی

-١-

# نسکۆی شۆڕش و مەرگەساتەکان

نسکۆی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥-دا، بارودۆخێکی لە کوردستاندا دروستکرد، کە گەلی کوردو بە تایبەتی باری دەروونیی تێکۆشەران و کادیرو پێشمەرگەو دڵسۆزانی زۆر ئاڵۆزو ناهەموار کرد... هەوری ڕەشی نائومێدیی سەرتاسەریی کوردستانی کردە تاریکستان، شۆڕش خاوەنی دووسەد هەزار پێشمەرگەی قارەمان و گیانلەسەردەست بوو، کە لەژێر ناوی چەند هێزدا لە سەرتاسەری کوردستاندا ڕێکخرابوون. جگە لە شارە گەورەکانی وەکو (سلێمانی، هەولێر، دهۆك، کەرکوك)، چەند شارو شارۆچکەیەك نەبێت، سەراپای خاکی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بوو... شۆڕش خاوەنی جۆرەها چەك بوو، توانای ئیداریی و ئابووریی بەهێز بوو، ئیزگەیەکی ناوەندی بەهێزو چەند ئیزگەیەکی ناوچەیی هەبوو... چالاکیی پێشمەرگە لە هەموو ڕوویەکەوە تەنگی بە سوپاو دامودەزگاکانی ڕژێم هەڵچنیبوو. لە ناکاو (بە پیلانێکی نێودەوڵەتیی کە لە دژی شۆڕش و گەلەکەمان سازکرا)، بانگەشەی نسکۆو کۆتایی شۆڕش یەخەی هێزەکانی پێشمەرگەو گەلەکەمانی گرت، بەناچاریی و نابەدڵیی چەك بە پێشمەرگە فڕێدرا... لە دووڕێیانێکدا قەتیس کراو دوو ڕێگای لە بەردەمدا دانرا... تەسلیمبوونەوە بە ڕژێمی بەعس، یان سەرهەڵگرتن بۆ ئێران... هەردوو ڕێگاکە بۆ پێشمەرگە ئێجگار قورس بوون... لە سەرەتای کارەساتەکەدا ژمارەیەکی زۆر کادیرو فەرماندەی هێزی پێشمەرگە، کەوتنە خۆکۆکردنەوەو هەوڵدان بۆئەوەی گوێ بە پیلانەکە نەدرێت و بە ئاشبەتاڵ ڕازی نەبن، بۆ ئەمەش پێشمەرگە کۆکرانەوەو ڕاستیی دۆزەکەیان پێراگەیاندن، ئەوانیش بەوپەڕی پەرۆشییانەوە لەگەڵ ئەوەدا بوون هێزی پێشمەرگە بڵاوەی پێنەکرێت و بە شێوازێکی دیکەو بەرنامەیەکی دیکەوە درێژە بە شۆڕش بدرێتەوە.

بەڵام یازوخ ئەو هەوڵانەیان ڕێگریی لێکراو نەیانهێشت سەربگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەداخەوە پێشمەرگە بەرەڵڵاکراو درایە دەست چارەنووسێکی ڕەش و نادیار، ناچاریی تەسلیمبوونەوەو چوونە ناو ئێران کرانەوە، بەرپرسان‌و فەرماندەکان، هەریەکەیان شپرزەی خۆیان و خێزان و منداڵ و کەسوکاریان بوون، کەسیان لە خەمی پێشمەرگەو کادیری حزبدا نەمان. بەرپرسێك نەما ڕێنماییان بکات، لێیان بپرسێتەوەو ڕێگایەکیان بۆ دابنێت... نەیاندەزانی ڕوو لە ئێران بکەن و بە ژیانی ئۆردووگاو دەسەنەیی ڕازین و بچنە ژێر سایەی ڕژێمێکەوە کە نامەردانە پیلانی دەرحەق کردوون و لەپشتەوە خەنجەری ژەهراویی لێداون، یان ڕووبکەنە

عیراق و تەسلیم ببنەوە بە رژێمێك، ساڵانێکە ئارەزوومەندانە، بە بیروباوەڕی کوردایەتییەوە، لەپێناوی مافی گەلەکەیدا، بەهەموو توانای دژی سیاسەتی شۆڤێنیانەو رەگەزپەرستییانەی چەلەنگانە خەباتی کردووەو تێکۆشاوەو زیانی بە هێزی سوپایی و دامودەزگاکانی گەیاندووە، بەعس بە یاخیبوو، بە بەکرێگراو، تێکدەرو، لادەر، ئەژماری کردووەو سەیری کردووە... ئاسان نەبوو پێشمەرگەیەك، کادیرێك، فەرماندەیەك، شۆڕشگێڕێك، تێکۆشەرێك، وا بە ئاسایی و بەبێ هیچ زەمانەت و پشتێك بڕیاری تەسلیمبوونەوە بدات، لەکاتێکدا لێی روون نەبێت دوژمنەکەی دوێنێ و ئەمڕۆ کە دەچێتەوە بەردەستی چی لێدەکات؟ چ جۆرە سزایەك و مامەڵەیەکی لەگەڵدا دەکات؟ چارەنووسی چی دەبێت...؟ لەکاتێکیشدا دەشیان بینی بەداخەوە بەرپرسان، هەریەکەیان هەڵپەی خۆیانە... ئەو بەرپرسانەی تا دوێنێ، فەرمانی پێدەدان و کۆیدەکردنەوەو دەیناردن بۆ کارو چالاکی پێشمەرگانەو دەستخۆشیی لێدەکردن و لەسەر بچووکترین هەڵە لێی دەپرسینەوەو سزای دەدان و چەکی دەکردن، لەمڕۆدا نایانناسێت و پشتیان تێدەکات، ئەو سەرکردایەتییەی تا دوێنێ حیسابی بۆ کەس نەدەکرد، لەمڕۆدا سەری لێشێواوەو دەسەڵاتی بڕیارێکی نەماوە.

بەڕاستیی زۆر ئەستەم بوو، بڕیاری ئەوە بدەیت چەکەکەت فیشەکی لی دەربهێنیت و شۆڕی بکەیتەوەو بچیتەوە ژێر دامودەزگای رژێمێکەوە کە تادوێنێ هەڕەشەی رووخان و لەناوبردنت لێدەکرد. گران و زۆر قورس بوو، ملی خۆتت بەپەتەوە دەبینی و سەرشۆڕییەکی زۆر زۆر ناخۆشبوو... پێشمەرگە رامابوو، دۆش دامابوو، لەنێوانی ئەو دوو رێگایەدا، هەرچەند دەیهێناو دەیبرد، سەیریدەکرد، شۆڕشێك، سەرکردایەتی دۆشدامابێت، نەتوانێت هیچ بڕیارێك بدات، لەبیری نەمابێت، هێزێکی وا گەورەی پێشمەرگەی خاوەن چەك و جبەخانەو بەتوانا، بەناچاریی چەکەکەی لە شان بکرێتەوە، کەسێکیش نەبێت لێی بپرسێتەوەو هاوکارییەکی بکات و رێنمایی بکات...

منیش یەکێك بووم لەو (کادیرە پێشمەرگانەی) ناو ئەو هەزاران هەزار پێشمەرگەو تێکۆشەرەی ناو شۆڕش، دوای ئەوەی هەموو هەوڵەکانمان بەهەدەر دراو. (ریسەکەمان لێ کرایەوە بە خوری)، ئەوەی پێکمان هێنابوو هەڵوەشێنرایەوە، لەو کات و رۆژگارەدا، من و (مامۆستا جەمال تاهیرو کاك حەمەرەشیدی حاجی شەریفی باریکەیی) لە یەك ئۆرگانی حزبییدا کارمان دەکرد، زۆر لە یەکەوە نزیك بووین. لەسەر باروودۆخەکە قسەمان کرد، مامۆستا جەمال رای وابوو (باشتر وایە بگەڕێینەوە بۆ عیراق و خۆمان تەسلیم بکەینەوە)، ئەو ئەوەی بەلاوە باشتربوو لەوەی کە بچینە ئێران و بە کولەمەرگی و ژیانی دەسەنەیی بژین. ئێمە لەڕاستیدا لەگەڵ گەڕانەوەو خۆتەسلیمکردنەوەدا نەبووین... (مامۆستا جەمال) کە زانی هەوڵەکانی شەری پارتیزانیی و کۆکردنەوەی پێشمەرگە هەڵوەشایەوە، خواحافیزیی کردو دوای بڕیارەکەی کەوت و گەڕایەوە بۆ عیراق... (من و کاك حەمەرەشید) ماینەوە... خێزان و منداڵەکانمان بردە ئێران و لە ئۆردووگای (دووئاوان) بەشێوەیەکی کاتیی جێگیر بووین، لە

دوو ئاوانەوە بڕیارمان دا منداڵەکان بنێرینەوەو خۆمان سووکبار بکەین، بەو نیازەی بچین بۆ ناوچەی (سەردەشت)و لەوێوە خۆمان بگەیەنینە ناوچەی (ئالان و سیوەیلی شارباژێر)، کاتێ منداڵەکانمان بردە سەر مەرز بۆ ڕەوانەکردنەوە، (کاک فازڵ سۆرانی) ئامر هێزی کەرکوك بوو، پێی زانی و بانگیکردین و منداڵەکانی پێگێڕاینەوە بۆ دووئاوان و نەیهێشت بیاننێرینەوە، دوای ئەوە بەپێویستمانزانی و بە مەبەستی تێگەیشتن لە بارودۆخەکە، بەجووتە بەرەو (کرماشان)و لەوێوە بەرەو (مەهاباد) ڕۆیشتین، ئەوکاتە زۆری سەکردایەتی و بەرپرسان هەر هەموو لەو دەڤەرەبوون.

چەند ڕۆژ ماینەوە بەتەواوەتی لە بارودۆخەکە گەیشتین، گەڕاینەوە بۆ ناو منداڵەکان، دوای گواستنەوەمان لە (دووئاوانەوە) بۆ (ئۆردووگای سەریاس)، بڕیاری گەڕانەوەمان بۆ عیراق دا کە خۆمان تەسلیمی ڕژێم بکەینەوە... بەو ماوە کەمەی لە ئێران و ئۆردووگاکانیدا ماینەوە، ئەوەمان لێ حاڵی بوو خۆتەسلیمکردنەوە زۆر خۆشترو گونجاوترە لە ژیانی ئۆردووگاو ژیانی دەسەنەیی بەسەربردن... وامان لێکدایەوە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ عیراق، ڕژێم ئەگەر بیەوێت لێمان بپرسێتەوەو سزامان بدات، تەنها سزای خۆمان دەدات، خێزان و منداڵمان دەتوانن لەناو کەسوکارماندا بژین و سەرگەردان و دەربەدەر نەبن.

بۆیە لە سات و ڕۆژێکی ئێجگار دژوارو ناهەمواردا، پێمان بە جەرگی خۆماندا نا و بڕیاری گەڕانەوەمان دا بۆ عیراق... ڕۆژی پێنجشەممەیەك سەرەتای مانگی پێنج بە سواری زیلێکی سوپا لە (سەریاسەوە) بەرەو سنووری ئێران-عیراق کەوتینە ڕێ لە (نەوسو) تەسلیم بە عیراقیان کردینەوە... کاتێ بەناو دارو باخ و ماڵەکانی تەوێڵەدا گوزەرمان دەکرد، بەرەو مەرکەزی پۆلیسیان دەبردین، هەردووکمان ئاخ و خەفەتی ڕۆژانی شۆڕشمان هەڵدەکێشا، بەچاو یەکە یەکەی بنکەکانی پێشمەرگەو حزب و ماڵە بەرپرسەکانمان بەسەر دەکردەوە، بیرمان لەو کاتەی دەسەڵاتی شۆڕش و خۆمان دەکردەوە. خەڵکەکەی تەوێڵەمان دەبینی کۆمەڵ کۆمەڵ سەیریان دەکردین، وامان مەزەندە دەکرد، کە ئەو خەڵکە بە کۆمەڵ تف و نەفرەتمان لێدەکەن، سەرزەنشتمان دەکەن... ئێمە لە دڵی خۆماندا وامان لێکدەدایەوە... لەوانەشە بەپێچەوانەوە بووبێت، خەڵکەکە بە بینینمان نیگەران و خەفەتباربووبن... بە هەموو کەموکورییەکی شۆڕشەوە، شۆڕشەکەیان بەلاوە باشترو خۆشتربووبێت، لە هاتنەوەی دامودەزگاکانی ڕژێم و چاو زەقکردنەوەی پیاوەکانی بەعس، ئا لەوکاتەدا کە بە ناو شارۆچکە جوانەکەی تەوێڵەدا، بەرەو مەخفەری پۆلیس ڕێمان دەکرد، سەیری ماڵ و شاخ و باخ و باخاتمان دەکرد، شوێنی بارەگاکانمان بەچاو دەدۆزییەوە، لە دڵمانەوە بەکوڵ دەگریاین و مردنمان بە ئاوات دەخواست.

کاتێك گەیشتینە مەخفەرەکە، چەند پۆلیسێك پێشوازییان لێکردین، بردیانین بۆ لای (ئامر مەخفەر) ئامر مەخفەرەکە مفەوەزێك بوو، بە گەرمیی پێشوازیی لێکردین... کاتێك خۆمان لەبەردەمی مفەوەزێکی پۆلیسدا بینی بەزەلیلیی و بێدەسەڵاتی ڕاوەستاوین، بەنیی بۆ

دەکەین و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەین، نارەقی شەرمەزاریی بەگیانماندا دەهاتە خوارەوە، ئۆتۆمبێلێکی بۆ پەیداکردین. ئەو کەلوپەلەی کە پێمان بوو خستمانە سەر جێبەکەو خێزان و منداڵیش لەدواوەو خۆشمان بەجووتە لە پێشەوە لەگەڵ شۆفێرەکەدا سوار بووین، تا ئەمانە کرا، کەوتینە پاشنیوەڕۆ، لەوکاتەدا بەرێگای تەوێڵەو بیارەدا بەرەو خورماڵ و هەڵەبجە دەڕۆیشتین... بە چاوانمان لوتکە بەلوتکەو دێ بە دێ و باخ بە باخمان دەکێلاو بەسەر دەکردەوەو ڕۆژانمان دەهاتنەوە یاد. دیسان قوولپی گریان هەناومانی دەخواردەوە، بیرمان لەوە دەکردەوە بۆ وامان بەسەرهات؟ بۆ وایان پێ کردین...؟ شۆفێرەکە کە گەیشتینە ناو خورماڵ، کاتێك ئێمە شوێنی بارەگاکەمان بینی و هەستی کرد، لەگەڵ قولپدانماندا فرمێسك بەچاوانماندا دێتە خوارەوە، وتی دەتانبینم زۆر بێتاقەتن...؟ بێتاقەت مەبن... هەر ئێوە لێتان نەقەوماوە، کورد هەر هەمووی لێی قەوماوە... جاران سەرێکمان هەبوو، ئەویش شۆڕش بوو، ئێستا ئەو سەرەمان نەماوەو کورد ئێستا بێسەرو بێکەس ماوەتەوە... باوەڕ ناکەم ئەم وەزعە زۆر بخایەنێت... خەفەت مەخۆن و هیوادارم بە سەلامەتیی بە کەسوکارتان شادبنەوە، مەشترسن وەزع باشەو خراپ نییە لە ئێستادا، ئیتر نازانم دواتر چی دەبێت، بەو قسانەوە گەیشتینە ناحیەی سیروان و زۆری نەخایاند گەیشتینە ناو هەڵەبجەو بردینی بۆ قایمقامییەت، قایمقام لەوێ نەبوو، دەوام تەواو بووبوو، پۆلیس چوو ئاگاداریان کرد... هات پێشوازیی لێکردین و مۆڵەتی داین کە شەو بچینە ماڵە ناسیاوێك و بەیانی ڕەوانەی سلێمانیمان بکات...

بەیانی ڕۆژی هەینی دیسان بەجێبێك بەرەو سلێمانی کەوتینە ڕێ... بەرێگای هەڵەبجەدا بەرەو سەیدسادق و عەربەت و سلێمانی ڕێمان دەکرد، بەدرێژایی ڕێگاکە بیرەوەریی ڕۆژانی شۆڕش و پێشمەرگایەتیمان دەهاتەوە یادو دەستمان بە دەستماندا دەدا...

بەیانی ڕۆژی شەممە بەیەکەوە بەو نووسراوەی قایمقام بۆیکردبووین، چووین بۆ (سەرا)، لەکاتی چوونە ژوورەوەماندا، لەناو دەرگای سەرادا، لوتمان تەقی بەلووتی برادەرێکدا، کە ئەویش وەکو ئێمە لە دەرەوەبوو، لەناو سەرا دەهاتە دەرەوە... لەجیاتی بەخێرهاتنەوەمان... بە پۆزو لەخۆباییبوون و دڵخۆشییەکەوە وتی: ئەوە ئێوەش هاتنەوە...؟! (کاك حەمەرەشید) وتی: بەڵێ... ئێمەش هاتینەوە... وتی: لام سەیرە ئێوە هاتوونەتەوە!! کاك حەمەرەشید وتی بۆ ئێمە نەیەینەوەو بۆ نەدەبوو نەهاتینایەتەوە...؟! ئەی ئەوە نییە تۆش هاتوویتەوە...؟ یان تۆ ئەوکاتەش لەدەرەوەبووی هەر لێرە بوویت...؟ ئەو هەڵوێستەم هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، کاك حەمەرەشید تا کۆچیشی کرد، هەموو جار دەیگێڕایەوە... ئەوەشم هەر لەبیرە کاتێك بردیانینە مونەزەمە ئەوکاتە لە شوێنی ئێستای شارەوانیدا بوو... یەکێك لە بەرپرسەکانی بەعس لەو شوێنە قسەی بۆ دەکردین و وتی: (ئێمە لۆمەی خەڵکە نەخوێندەوارەکە ناکەین، کە بە نەزانییان کەوتبوونە دوای ئەو هەڵخەڵەتاو و یاخیبوو و بەکرێگیراوانە. ئێمە لۆمەی ئێوەی خوێندەوار دەکەین، کە چۆن دوایان کەوتبوون...؟ وتی: (ئێمە ئومێد دەکەین لەمەودوا

بیر بکەنەوەو ببینە کەسێکی باش و خزمەتی سەورەو حکومەت و حزب بکەن، جارێکی تر ڕێگای هەڵە نەگرنەوە... ئەوە بەچاوی خۆتان بینیتان بەرپرسەکانتان بۆکوێ چوون و چییان بەو خەڵکە کردووە شۆڕش و حزب و حکومەت چەند بەهێزەو دڵسۆزە بۆ گەلی کوردو چۆن لێیان خۆش بووە. لێتان ناشارمەوە ئەمجارە وا شۆڕش و سەرکردایەتی لێتان خۆش بوو... ئەگەر جارێکی تر هەڵە بکەنەوەو ڕێگای خراپ بگرنەوە، حزب و شۆڕش چیتان لێبکات ئۆباڵی بەملی خۆتانەو لۆمەی «سەرۆك سەدام» نەکەن...).

# نەدەکرا ئەوەی پێمان ڕاگەیەندرا، ملکەچی بین

دوای چەند ڕۆژێك و بەتەواوبوونی کاری خۆتەسلیمکردنەوە، لەگەڵ (کاك حەمەڕەشید) دا لەیەك جیابووینەوە. ئەو گەڕایەوە بۆ (باریکە) بۆ ماڵی باوکی خۆی و منیش چوومەوە بۆ ماڵی (کاکی) خۆم... لەگەڵ ئەوەی لەباری دەروونییدا لە حاڵێکی زۆر خراپدابووم، (زەینەب) دووگیان لەکاتی منداڵبووندا بوو، بێ جێگاو شوێن و بەخۆمان و منداڵەکانمانەوە لە یەك ژووردا بووین... ناوماڵ تەنها ئەوەمان هەبوو، کە لە ئێرانەوە لەگەڵ خۆماندا هێنابوومانەوە. باخەڵ چۆڵ و بێپارە، نانخواردن و حەوانەوەمان لەگەڵ دایکم و کاکم و براژنم و منداڵەکانی و میوانیاندابوو... منداڵ ڕۆژانە خەرجییان دەویست، لە باخەڵی چۆڵ خەرجی چۆنیان بدەمێ؟! جارجارە (کاکەم) لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا، خەرجی ڕۆژانەی دەدانی، (دایکیشم) دەیزانی حاڵی من چۆنە، بۆیە بە بەردەوامی دەستی بە زەینەب و منداڵەکانەوە بوو. (محیدینیش) ژنی نەبوو. مووچەی هەبوو. کەمتەرخەمیی نەدەکردو بەردەوام چاوی لە زەینەب و منداڵەکان بوو... بەو هەموو بێ حاڵییەوە، شەو و ڕۆژ بیرم لە داڕۆژی خۆم و پرسینەوەی ڕژێم دەکردەوە. دەبێت بە نیازی چی بێت لەگەڵماندا بیکات؟. ڕۆژانەش بەردەوام لە خزم و کەس و هاوڕێیان و دۆست و ناسیار میوانم هەبوو، دەهاتن بۆ بەخێرهاتنەوەم و دلدانەوەم... ئێوارانێك بە تەنها لە حەوشەکەدا دانیشتبووم، کاتێکمزانی لە دەرگا درا، کە دەرگایان کردەوە، سەیرمکرد (مامۆستا جەمال تاهیر)ە، بە ڕووگەشیی و پێکەنینەوە خۆی بە حەوشەکەدا کرد، منیش بەپیرییەوە چووم، باوەشمان بەیەکدا کرد، بە ئارەزووی خۆمان یەکمان ماچ کرد، بەسەر یەکدا شۆڕبووینەوەو ئەو ئێوارەیەم بەو ڕۆژە هاتە پێش چاو، کە دوو مانگێك لەوەو پێش کە هەرەس بوو، بە ئەمری واقع و مامۆستا جەمال بەدوای بڕیارەکەیدا من و کاك حەمەڕەشیدی بەجێهێشت، بانگی کردینە لاوەو وتی: (من دەڕۆمەوە بەقسەم بکەن با هەرسێکمان بەیەکەوە بگەڕێینەوەو لە یەك دانەبڕێین)، ئێمە بەگوێمان نەکردو ئەویش لەکاتی گەڕانەوەیداو لەکاتی خواحافیزیدا لە (دەرگا شێخان) باوەشمان بە یەکدا کردو شۆڕێکی باوکمردووانەمان بەسەریەکدا کرد...).

هەردانیشتین، کەوتە قسەکردن بە گەشبینییەوە باسی بارودۆخەکەی بۆ کردم، لە قسەکانیدا سەرزەنشتی هەندێ لە برادەرانی کرد، کە نەزانانە بە دەنگی دەزگاکانی ڕژێمەوە دەچن و زانیارییان لەسەر شۆڕش و برادەرانیان دەدەنێ... کۆمەلێك ئامۆژگاریی و ڕێنمایی وردی کردم، پێی ڕاگەیاندم کە گوێ بۆ قسەی هیچ کەسێك نەگرم، ترسیشم نەبێت، چونکە دامودەزگاکانی ڕژێم زۆر بێسەرەو بەرەن و هیچ زانیارییەکی ئەوتۆیان لەسەر شۆڕش و دامودەزگاکانی نییە... هەر لەو دانیشتنەماندا مژدەی ئەوەی دامێ، کە هەر لە ئێستاوە لە هەوڵی خۆ ڕێکخستنەوەو کۆکردنەوەدان، بۆئەوەی لە زووترین کاتدا شۆڕش جارێکی دیکە بەرپا بکرێتەوە، دوای دانیشتنێکی دوو سێ سەعاتیی زۆر شتم بۆ ڕوونبووەوەو لە زۆر شت

تێگەیشتم، هیواو ئومێدێکی زۆر لە دلما چەکەرەی کردەوەو بڕیاری ئەوەمان دا لە یەکتر بینین بەردەوامبین و ئاگامان لەیەك بێت و بەهێمنیی و لەسەرخۆ بەرنامە دابڕێژین... بەلاَ، هەروامان کرد، کاتێك بڕیاری دامەزراندنەوەو گواستنەوەم بۆ پارێزگای کوت دەرچوو... پێش ئەوەی بڕۆم (مامۆستا جەمال و مامۆستا عەزیزو فەهمی قەرەداغی)م بینی و رێ و شوێنی چۆنێتی کارکردنمان دارشت... لە پشووی نیوەی سالی (١٩٧٦)دا مامۆستا عەزیز لە عەزیزییەو منیش لە قەزای حەی بووم، کاتێکمزانی مامۆستا عەزیز پەیدابوو... نامەیەکی مامۆستا جەمالی بۆ هێنابووم، دوو شەو لام مایەوەو زۆر لایەنمان تاو و توێکرد، ئەوەی لەو بارودۆخەدا دەکرا بەلێنی کردنیم دا... (((بەلاَ، ئەوەبوو هەر ئەو رۆژەی بۆ یەکەمجار (مامۆستا جەمال)و بەدوایدا ئەو دوو تێکۆشەرەی دیکەم بینی، ئەو هەرەشەیەی پیاوەکەی بەعس لێی کردین، خستمانە پەرۆیەکی شەری پیسەوەو بە روویانمان دا دایەوەو جارێکی دیکە رێبازی شۆرش و بەرپاکردنەوەیمان گرتەوەبەر... بەلاَم بەشێوازو بەرنامەیەکی نوێی شۆرشگێریی)))، لەم نووسینەمدا بە پێویستی نازانم بەدوورو درێژیی بە خەباتی سیاسیی و کاری رێکخستن و چۆنێتی کارکردنی رۆژانەو سالانەمدا شۆرببمەوە، ئەوە دەهێلمەوە بۆ هەلێکی دیکەو بابەتێکی دیکە... بەلکو دەمەوێت پێش گرتنم بەکورتی باسبکەم و لەو روانگەیەوە مەرگەساتی هەرەس و هەلگیرسانەوەی شۆرش بەکورتی باسبکەم، کە (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) رابەرایەتی دەکردو (کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان) بالێکی گرنگ و دینامۆیەکی پر وزەی پێکهێنانەوەو دامەزراندنی (ی.ن.ك)و بەرپاکردنەوەی شۆرشی نوێخوازیی گەلەکەمان بوو... لەو بارودۆخە سەخت و پرمەترسییانەدا، کەوتنە مشوورخواردن و بەرنامەدارشتن، بۆ کۆکردنەوەو گرتنەوەو رێکخستنەوەی تێکۆشەران و خەباتگێران و جۆشدانەوەیان بۆ خەبات و هەلسانەوە، نەبەردانە لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان لەماوەیەکی کەمدا توانییان پەیوەندیی بە سەدان کادیرو پێشمەرگەی نەبەزیوەوە بکەن و رێکیان بخەنەوەو سازو ئامادەیان بکەنەوە، بۆ مەیدانی شۆرشگێریی، ئەوەی لەناوەوەی کوردستان بۆیان کرا کردیان و ئەوانەشی لە دەرەوەی ولاَت بوون، بەسەرپەرشتی (هەڤال مام جەلال) کۆیان کردنەوەو لە کات و ساتێکی گونجاودا بانگەشەی دامەزراندنی (ی.ن.ك)و هەلگیرسانەوەی شۆرشیان کرد...

لەو قۆناغەدا (خالە شیهاب)و ژمارەیەك لە هاورێیانی کۆمەلە، بەنیازی چوونە دەرەوە لە عیراق، بەرەو ئێران رۆیشتن لەناو ئێراندا لەلایەن رژێمی شاوە دەستگیرکران، پاش ماوەیەك ناجوامێرانە تەسلیمی رژێمی عیراق کرانەوە، ((ئەو کۆمەلە کادیرو تێکۆشەرە کە بوونە یەکەم دەستەی زیندانی سیاسیی شۆرشی نوێخوازیی گەلەکەمان... لە دادگایەکی ناعادیلانەدا بڕیاری لەسێدارەدانی (خالە شیهاب و جەعفەرو ئەنوەر)دراو ئەوانی دیکەش بەزیندانیکردن حوکمدران))، ئەو کۆمەلە تێکۆشەرە، رۆلەگەلێکی لەخۆبردووبوون، بێباکانە شانیان دایە ژێر باری کەوتووی گەل و شۆرشەکەمان، بە دوژمنانیان سەلماند، کە کوردو شۆرشەکەی

بەهیچ هێزو شێوازێکی سەرکوتکەرانە داناساکێ و خەفە ناکرێت... دوای مەرگەساتی ئەنفال و سووتماککردنی کوردستان و تێکشکانی هێزی پێشمەرگە، بەهۆی چەکی کیمیایی و هێرشێکی بەربلاوی سوپاو جاشەکانی رژێمەوە، هێزی پێشمەرگە ناچاری پاشەکشە کرا بۆ سنووری ئێران و ناو ئێران.

سالی (١٩٨٨) وەکو سالی (١٩٧٥) وابوو، ئەو سەردەمە چۆن (ئارام)و هاورێکانیان دوای (خالە شیهاب)و هاورێکانی، نەترسانە هاورێیانیان گرتەوەو رێکیانخستنەوەو رێکخستنێکی پۆلایینیان لەناو شارو شارۆچکەکاندا پێکهێناو بەو رێکخستنە تۆکمەیە توانییان بانگەشەی شۆرشی نوێ بکەنەوە... لە سالی (١٩٨٨)دا بەهەمانشێوە نائومێدیی بووە هەورێکی چلکن و بەری سامالی کوردستانی گرتەوە... ئا لەو رۆژگارە دژوارەدا سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بە بەرنامەیەکی دارێژراو بۆ دانەبرانی شۆرش لەخەلك و جەماوەری کوردستان و لەبەر دوورکەوتنەوەیان لە شارو ناوچەکان و جێگیربوونیان لەسەر سنوورەکان و دروستبوونی گرفتی زۆر بۆ رێکخستنەکانی ناو شارەکان لە رووی پەیوەندیکردنەوە... بۆیە بریاریان دا کە (رێکخراوی سلێمانی) لەو سەردەمەدا، لەشێوەی سەرکردایەتی ناوخۆدا، ئەرك و کارەکانی شۆرش و رێکخستن و سەرپەرشتیکردنی مەفرەزەکانی پێشمەرگە بگرێتە ئەستۆ، هاورێیانی رێکخستنەکانی ناوشار، وەکو چۆن هاورێیانی کۆمەلە لە سەرەتای دامەزراندنی (ی.ن.ك)و هەلگیرسانەوەی شۆرشدا بە سەرپەرشتی شەهید (ئارام) ئەرکی قورسیان گرتە ئەستۆ، رێکخراوی سلێمانیش دوای ئەنفال هەمان ئەرك و کاریان کەوتە ئەستۆ، جوامێرانە شانیان دایە ژێر باری گرانیی شۆرش و هەموو توانایان خستە کار بۆئەوەی هەوری رەشی نائومێدیی بە خەبات و ململانێی بەردەوام برەوێننەوە...

# ئەنفال و ڕێکخستنی ناوشارەکان

دوای ئەنفال، ڕژێم لە ڕێگای دامودەزگا سەرکوتکەرەکانییەوە، کە دەیانبینی شاڵاوی ئەنفالیان سەرکەوتنیٚ بەسەر پێشمەرگەدا بەدەستهێناوە، هەموو بنکەو بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەو شۆڕش دەستیان بەسەرداگیراوەو، خاپوورکراون، چالاکی پێشمەرگە کپکراوە... هەموو گوندەکانیان تەقاندووەتەوەو پانتایی گەرمیان و هەموو دۆلی قەرەداغ، شارباژێر، هەورامان، پێنجوێن، دۆلی جافەتی، ناوچەی ئاغجەلەرو چەمچەماڵ، هەر هەموو خاپوور کراون و لەگەڵ خاکدا تەخت کراون، خەلکەکەی یان ئەنفال کراوە، یان لە ئۆردووگای زۆرەملێدا نیشتەجیٚ کراون، لە هەلەبجەو سەوسێنان و ئاغجەلەرو عەسکەرو گۆپتەپەو شێخ وەسانان بەچەکی کیمیایی مەرگەساتیان دروستکردووە، خۆیان بەسەرکەوتوو دادەنا، بەوردیی چاودێریی جموجوولی ناوشار و ڕێکخستنەکانی ناوشارەکانیان دەکرد، بەنیازبوون کە بە بەرنامە ئەنفالی ڕێکخستنەکانی ناوشارەکانیش بکەن... بۆ ئەم شاڵاوەشیان جەختیان لە پیاوە ئەلقە لەگوێکانیان دەکرد، کە هەوڵ بدەن بە هەرنرخێك بووە سەرەداوی ڕێکخستنەکانیان دەستبخەن.

بۆ ئەمەش بە زەبری پارەو ئیمتیازاتی جۆراوجۆر، توانییان خۆفرۆشان بخزێننە ناو ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە، ئەنجامەکەی بەوە شکایەوە لە سەرەتای وەرزی دووەم و سێیەم و کۆتایی ساڵی (١٩٨٩)و سەرەتای ساڵی (١٩٩٠)دا ژمارەیەك تێکۆشەری ناو ڕێکخستنەکان و مەفرەزەی پێشمەرگە، کەوتنە بەر شاڵاوی دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخباراتی ڕژێم، ((گۆڕانکارییەکانی ناو عیراق و ناوچەکەو پەلاماردانی هێزی هاوپەیمان و شەڕی (عیراق- کوەیت) وایکرد، ((کە ئەو کۆمەلە تێکۆشەرەش ببنە دوا دەستەی زیندانی سیاسیی شۆڕش و (ی.ن.ك)-))، منیش یەکێك بووم کەوتمە بەر ئەو شاڵاوەو لە ڕۆژی (١٩٩٠/١/٢٤) لەلایەن دەزگای ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکرام... لەو شاڵاوی ئەنفالەدا، بەهۆی کەسە خۆفرۆشەکان و پوازەکانی ناو ڕێکخستنەکانەوە، لەگەڵ گرتنی هاوڕێیاندا، چەند شوێنێکی کاری نهێنی و شوێنی شاردنەوەو هەلگرتنی بەڵگەنامەکانی ڕێکخستن و شۆڕش کەوتنە بەردەستی دوژمن، ئەگەر بلێم زۆربەی زۆری ئەرشیفی ڕێکخستنی ناو شار بوو، بەلاتانەوە سەیرنەبێت، لە ناویاندا چەند ئامێرێکی چاپکردن و فۆتۆکۆپییان تێدابوو.

لەو خۆفرۆشانە بوونە مێردەزمە بەسەر هاوڕێیانەوە، لەناو ئەمنی سلێمانی و مەحکەمەی سەورە، تاوانبارانەو بێشەرمانە دەهێنرانە سەرمان و دەبوونە شاهیدو نامەردانە بۆیان دەسەلماندن کە ئێمە لە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)دا کاردەکەین... چی لەوە ستەمترە پیاو لە ڕۆژانی ژیانی سیاسییدا لەگەڵ کەسانێکدا کار بکەیت و کارت لەگەڵدا بکەن. متمانەت پێیان بێت و وەکو تێکۆشەرو هاوڕێیەکی خاوەن بیرو باوەر هەلسوکەوتی لەگەڵدا بکەیت، نهێنییەکانت بزانێت، ئاگاداری جموجوولی ڕۆژانەت بێت، شارەزای ماڵ و ناوماڵت بێت،

خیزانت بناسـێت و ئەو هاوڕێیانەی لـە هێلەکانتا کاردەکەن ناویـان بزانێت، بەڵام تا ئەو پیاوە لەژێرەوە ئەوەندە نامەردو نەفسنزم و خۆفرۆشبێت لەپێناوی مەرحەبایەك و چەردەیەك پوول و پارەو پلەیەکی وەزیفیی و دەسـتکەوتێکی کاتیی، دەست لەگەڵ پیاوانی دەزگاکانی رژێمدا تێکەڵاو بکات، کە بەحیسـاب ئەویش لە دژی سیسـتمەکەی و سـتەم و زۆرداریی خەبات و بەرخودان دەکات، بەلامەوە هیچ عەیب و عار نییە ئەگەر بڵێم ئێمە لەو شـاڵاوی گرتنـەدا رووبەڕووی، ئەو دیاردە قورس و ناجوامێرانەیـە بووینەوە... چونکە ئەو دیاردەیە تەنها رووبـەڕووی ئێمەو ریزەکانی رێکخسـتنەکانی (ی.ن.ك) نەبووبـووەوە، دیاردەیەکی نامۆو سـەر سـوورهێنەر نەبوو... بەڵکو دیاردەیەك بوو، بە بزووتنەوەی شۆڕشـگێڕیی و سیاسـییەکانی عیراق و کوردستان و تەنانەت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشدا، لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوەو دروسـتبوونی جووڵانەوەی سیاسـیی لە عیراق و کوردسـتاندا بووبووە دیاردەیەکی زەق و ناشیرین و بووبووە هۆیەك بۆ سستکردن و ئاڵۆزکردن، تەنانەت راوەستان و هەڵوەشـاندنەوەی چەندین حزب و رێکخراوی سیاسـیی، راسـتەوخۆ بە فەتارەتی بردوون و دوژمـن زەفـەری پێ بردوون.. ئـەم دیاردەیە بەداخەوە ئەگەر لەنـاو ریزەکانی کۆمەڵەو (ی.ن.ك)و هێزی پێشمەرگەدا هاتبێتە ئاراوە، جێگای سەرسوورمان نییە.

(ی.ن.ك) هەموو دەزانین لە بارودۆخێکدا هەرەسی بەهەرەس هێناوە، کە زۆرێك لەو کادیرو پێشـمەرگەو بەرپرسانەی شۆڕشی ئەیلوول لەگەڵ هەرەسی شۆڕشـدا زووربەیان بەتەواویی رووخابوون... بەر چاویان بەتەواویی تاریك بوو، لانە دۆزێی سەرشۆڕیـان دەکرد، هاوڕێیانی کۆمەڵەو (ی.ن.ك) بەمەبەسـتی کۆکردنەوەی زۆرترین و باشـترین کەس لەو شۆڕشـگێڕانە لێیان نزیکدەبوونەوەو قسـەیان بۆ دەکردن و داوای بەشداریکردنی شۆڕشیان لێدەکردن، بەو نیـازەی ئەگەر هـەر پیاوێکی شۆڕشـگێڕ بتوانرێت رازی بکرێت لە سیاسـەتی رژێم خۆی بەدووربگرێت و سۆزێکی بەلای شۆڕشدا هەبێت، هەوڵێکی سەرکەوتوو دراوە...

کاتێك شـۆڕش بەرپابووەوە، لە هەموو بوارەکاندا کەوتە گەشـەکردن و لە کوردسـتاندا پەلوپۆی هاویشـت، دەواری رەشـی نائومێدیی بەتەواویی سـووتێنرا، خەڵکانێکی زۆر لە هێزی پێشـمەرگە کۆبوونەوەو بوونە پێشـمەرگە... هێزی پێشـمەرگە رێك خراو چالاکیی و خەباتی پێشـمەرگانە گەیشـتە ئاستێك، کە لە زۆر ناوچەی کوردسـتان، بنکەو بارەگای بەئاشکرا تێدا دانرا. بە سەدان خەڵکی دڵسۆزو کوردپەروەر لە گوندو شارەکان هەوڵیاندەدا لـە ریزەکانی رێکخسـتندا رێکبخرێن و ببنە ئەندام... کار گەیشـتە ئەوەی رێکخسـتنە نهێنییەکانی ناوشارەکان فراوان بوون و تۆرگانی جیاجیا دروستکرا... گومانی تێدا نییە لە رێکخسـتنێکی وا فراواندا و لەکاتێکیشـدا شۆڕشەکە و هێزی پێشمەرگە تووشی شکست و باری ناهەموار بووبێت، دوژمنیش بەهەموو رێگایەك و بە زەبری پوول و پارە بە بەردەوامی لە کنەکردندا بووبێت، بمانەوێت و نەمانەوێت لە کەسـانی نەفسـنزم و خۆپارێزو خۆفرۆش بەدەر نابێت... چ لەناو رێکخسـتنە نهێنییەکان و چ لەناو هێزی پێشمەرگەو تۆرگانەکانی

شۆرشدا... لەکاتێکیشــدا بەم شێوەیە باسی ئەو دیاردەیە دەکەین، نابێت ئەوەش فەرامۆش بکەین و لەبیرمان بچێت... رژێمێکی وەکو رژێمی بەعس، کە خاوەنی دەســەلاتێکی رەهاو ســەرمایەیەکی ئابووریی بەهێزو دامودەزگای جۆراوجۆرو شــارەزا بوو، خاوەنی بنکەیەکی فراوانی حزبیی، ســوپایەکی پڕچەك، پۆشــتەو پەرداخ، تێرو تەســەلی راهێنراو و شەرکەرو بەهێــزو پەروەردەکراو بوو... بێگومان پلانی هەمەجۆری بۆ ســەرکوتکردن و لەناوبردن و رازیکردنی نەیاران و لەخشتەبردنیان دارشــتووە، هەموو رێگایەکی گرتووەتەبەر، بۆئەوەی نەیارەکانــی بێهێز بکات و لــەدوا جاردا لەناویان بەرێت، بۆئــەوەی تەمەنی حوکمڕانیی و دەسەلاتی رۆژبەڕۆژ درێژ بکاتەوە...

رژێمی بەعس کە پیلانی لەناوبردنی شۆرش و گەلی کوردی بەرێگای شالاوەکانی ئەنفال و کیمیاباران و خاپوورکردنی کوردســتان دارشت، توانی شۆرش لەقالب بدات و پێشمەرگە داغان داغان بکات و مەرگی بەکۆمەلی کردە نەریت و شــەرمی لە هیچ یاســاو رێسایەکی نێودەولەتیی و مرۆڤایەتیی نەکردو (١٨٢) سەدو هەشتاو دوو هەزاری لە خەلکی کوردستان بەپێــش چــاوی دنیای مرۆڤایەتییەوە ئەنفــال کرد، (پێنج هەزار) مرۆڤــی کوردی لە چەند چرکەیەکدا لە شــاری هەلەبجە بە گازی کیمیایی قەلاچۆ کرد، رژێمێك لەپێناوی مانەوەی دەســەلاتی حوکمڕانیدا ئەو رێگایانــە بگرێتەبەرو بریاری قڕکردنــی گەلێك بدات... ئیتر چۆن بەهەزاران هەزار دینار لە رێگای دەزگا ســەرکوتکەرەکانییەوە تەرخان ناکات و خەرج ناکات بۆ کڕین و لەخشــتەبردن و هەلخەلەتاندنی خەلکی نەزان و کەمفرســەت و ناکام، دانــی تاوانیان بە مفتی بۆ ناڕێژێت و نایانکاتە خۆرەی ناو رێکخســتنی حزبە نەیارەکانی؟ بۆئەوەی بیانکاتە پوازی دارە ئەســتوورەکانی رێکخســتن؟ رژێمێك ئەنفال و جینۆســایدی میللەت و نیشــتمانێکی کردبێت، چۆن هەوڵ نادات ئەنفالی رێکخستنەکانی بکات؟ بۆیە لە وەرزی دووەمی سالی (١٩٨٩)دا بە بەرنامەیەکی درێژخایەن و لەسەرخۆ ئەنفالی ناوشاری دەســتپێکرد، بەهــۆی پوازەکانەوە توانی هاوڕێ «(گمۆ)، (مامۆســتا ئەحمەدی ســەناعە)، (هاوڕێ شــەماڵ)، (حەمەڕەحیم حەســەن)، (مامۆســتا ئەحمەد عەلی)، لە وەرزی سێیەمدا (عەتــای حاجی ئەحمەدو حەمە زاهــیر تۆفیق)و لە وەرزی چوارەم و کۆتایی ســالدا (هاوڕێ پۆلا)، (وەســتا بەکری دارتاش)، (پەسەند)، (کامل سابیر)، (هاوڕێ ئاکۆ)، (کارزان ئیسماعیل) و (ئەردەلان عومەر)یان دەســتگیرکرد، چەند مەفرەزەیەکی پێشــمەرگەش کەوتنە کەمینی جاش و پیاوانی رژێمەوەو دەستگیرکران، هەر لەوسالەدا لە رێکخستنی پێشمەرگەی حزب و لایەنە کوردستانییەکانی دیکە کەوتبوونە بەر ئەو شالاوە، ئەم شالاوی گرتنە درێژەی کێشاو لە ســەرەتای ســالی (١٩٩٠)داو لە مانگی یەك-دا توانییان (هاوڕێ بەرانان)، (عەبدولعەزیز عومەر)، (هاوڕێ پیرەمەگروون)و (جەباری حاجی رەشــید) لە بۆســەیەکدا دەســتگیر بکەن و بەدوایاندا ئەم تێکۆشــەرانەی ناو ریزەکانی رێکخستن لە سلێمانی و کەلارو هەولێر بخەنە بۆسەیانەوەو لە دەزگاکانی ئەمنیان تووند بکەن.

هاوڕێیان ((سامان مەولود، مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد، عەلی ساڵح، سالار محەمەد، شێخ عەبدول، موحسین حەمە ئەمین، مامۆستا ئەحمەد ساڵح، مامۆستا جەمال عەزیز، عەریف تالب، حەمە تاهیری شێخ مەحموود، مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن، کاکە زیاد، مامۆستا شێخ عوسمان عەبدول، کامەرانی مەلا عەزیز، عەلی شەهید محەمەد، بەختیاری عومەری ئەولیە، فەرەیدوون دارتاش، رزگار محەمەد و بەندە))، لە دوو مانگدا لە دەزگای ئەمنی سلێمانی توندمان بکەن، لەگەڵ ئەو شاڵاوەی ئێمەدا ژمارەیەك پێشمەرگە لێرەو لەوێ کەوتبوونە بۆسەو کەمینی دوژمنەوەو ژمارەیەکیان لە ئەمنی سلێمانی زیندانیی کرابوون، لەوانە: (فەخرەدین عەبدوڵلا، محەمەد رۆستەم، د.مەحمود کاکەبرا، سەرکەوت فایەق، کەمال سادق، مەلا بەکر...).

ئەگەر بەوردیی سەرنج بدەین ئەو کەسە گیراوانە، زۆربەیان کەسانی ئاسایی نەبوون، پێتان سەیر نەبێت زۆرێك لە هاوڕێیان لەپێش گرتنیانداو لە ساڵانی خەباتیاندا لەنزیکەوە یەکتریان دەناسی و لە ئۆرگانەکانی ڕێکخستندا بەیەکەوە کاریان کردبوو، ئاستی ڕێکخراوەیی یەکتریان دەزانی. پلەو شوێنی کارکردنی یەکترو ماڵی یەکتر شارەزابوون... خێزان و منداڵی یەکتریان دەناسی... بۆیە دەڵێم ئەو هاورییانە ئەگەر لەکاتی لێکۆڵینەوەو پرسینەوەو سزاداندا، تەنها یەك لەسەر یەك قسەیان بکردایە، بەس بوو بۆئەوەی هەر هەمووومان سزای لەناوبردنمان بەسەردا بدەن... یان ئەو هاوڕێیانە بەپێی ساڵانی خەباتی چەند ساڵەیان و کارکردنیان لەگەڵ هاوڕێیاندا لە ئۆرگان و چالاکییەکاندا، دەیان هاوڕێیان دەناسی، لەگەڵیاندا کارو خەباتیان کردبوو، خۆڕاگرو بەتوانا نەبوونایەو گاڵتەیان بە ئەشکەنجەو قسەکانی پیاوانی دەزگای ئەمن نەکردایە، ناوی تێکۆشەرانیان بدرکاندایە، ئەمنە سوورەکەو ئەمنەکانی دیکەش لە سلێمانی جێگایان تێدا نەدەبووەوە هەر هەموو پردەبوون لە تێکۆشەرانی ڕێکخستنی ناوشارەکان.

# سەردانی تەیناڵ و شەوێکی ناخۆش

(نیزامەدین گلی) یەکێك بوو لەو زیندانییانەی کە لەسەر (حسك) گیرابوو، پاش مانەوەی ماوەیەك لە ئەمنی سلێمانی ئازادکرابوو. (حەمدی) برای هاوڕێمان بوو، دەمێ بوو بەبۆنەی بەربوونی براکەیەوە بەنیازبووین سەری لێبدەین، پەیوەندییەکەی زیاتر لەگەڵ (مامۆستا رەئووف بێگەرد)دا بوو. پێی وتبوو کە دێن، وا بێن شەو بمێننەوە... لە ڕێگای مامۆستا رەئووفەوە ئاگادار کرابوو، کە دەچین بۆ سەردانی، ئێوارەی ۱۹۹۰/۱/۲۳ دوای تاقیکردنەوەی وەجبەی یەکەم لەگەڵ (بێگەرد)دا لە قوتابخانەوە سواری تەکسییەك بووین بۆ گەراجی (سەعیدی تەها کۆیی)... بەفر وردە وردە دەباری... لە گەراجەکە (کاك شێخ رەزای شێخ کەریمی سەنگاو) لەسەر مەوعید چاوەڕوانی دەکرین، دەمانویست تەکسییەك بۆ بازیان و تەیناڵ بگرین... بە شوفێری هەر تەکسییەکمان دەوت، زاتی نەدەکرد بەو بەفرەو بەو درەنگانە لەگەڵمان بێت، لەبەر مەترسیی ڕێگاکەو گەڕانەوەیان، دیار بوو تەکسی ئەو ناوەش لەوێ نەمابوون تا بڕۆنەوە... دۆشداماین... چی بکەین...؟ دووقات پارەمان دەدا بەهەر تەکسییەك لەگەڵمان بهاتایە... کەسمان بۆ رازی نەدەکرا، کاتێکمزانی (سەدیقی حاجی محەمەدی شاناخسێ) بەخۆی و تەکسییەکەیەوە پەیدابوو، سدیق ماڵیان لە ئۆردووگای باینجان بوو، پورزای برازاکانم بوو، کە ئێمەی بینی، هات بۆ لامان، وتی: خێرە وابەم درەنگانە لێرە راوەستاون؟ وتم: چاوەڕێی تۆ بووین، وا خوا ناردیتی... ئێمە بەنیازین بچین بۆ تەیناڵ و تەکسیمان دەوێت... دیارە تۆ دەگەڕێیتەوە، وتی نەشگەڕێمەوە لەبەر ئێوە هەر دەگەڕێمەوە، فەرموون سواربن، سێ قۆڵیی لەگەڵ سدیق سواربووین، کەوتینە ڕێ... سدیق، وتی: ترسی تاسلوجەم هەیە، بەفر گرتبێتی و سەرنەکەوین. بەفر زۆر بەباشی دەباری. گەیشتینە تاسلوجە هێشتا بەفر ڕێگاکەی نەگرتبوو، سەرکەوتین بەرەو ئەڵڵای و بازیان، لە تەکسییەکەدا بە ئارەزووی خۆمان قسەمان دەکرد، جارجارەش بێگەرد ورەوورێکی گۆرانیی دەکرد، کە گەیشتینە بازیان بە سدیقمان وت بەیانی وەرەوە بە شوێنماندا، وتی: سەعات چەند بێم باشە؟ وتم: سەعات هەشت بۆ هەشت و نیو بێیت زۆر باشە، قەدەر نەبێت و بەفر ڕێگاکان نەگرێت دڵنیابە بەیانی لاتانم. لە ئۆردووگای بازیان لە ئاستی ماڵی (شێخ سەعیدی شێخ حەمە سالحی مەیدان)[1]ی مەیدان راوەستاین، ئەو کاتە (شێخ سەعید) ماڵەکەی لەو ئۆردووگایە بوو، کاکە رەزا چوو بەشوێنیدا و هات و سواربوو. لە تەیناڵیش چووینە بەرماڵی مامۆستا (نەجیب)[2]. کە هاتە بەر دەرگا وایزانی میوانی ئەوین، (کاکە رەزا) وتی: سواربە

---

۱ - شێخ سەعید لەکاتی ڕاپەڕینەکاندا شەهیدکرا، پیاوێکی دڵسۆزو کوردپەروەر بوو.

۲- مامۆستا نەجیب خەڵکی گەرمیان- دووزخورماتوو بوو، مامۆستایەکی خاوەن بیروباوەڕی کوردایەتی و ڕووناکبیرێکی باش بوو، لەساڵانێك پێش ئێستا کۆچی دوایی کرد.

دەچین بــۆ ماڵی (حەمدی) میوانی ئەوین، بەفر پەیتا پەیتـــا دەباری و کەلوی گەورە گەورە دەهاتە خوارەوە، گەیشـــتینە بەر ماڵی (حەمدی). مامۆســـتا نەجیــب دابەزی و لە دەرگای دا، هاتن بە دەممانەوە، کە دابەزین ویســـتم پارە بدەمە (ســـدیق)، وتی: مەمدەرێ کە بەیانی هاتمەوە، هی هەردوو سەرەکەم بەیەکەوە بدەرێ، کە چووینە ژوورەوە (بێگەرد) پرسی حەمدی کوا...؟ وتیان هێشـــتا نەهاتووەتــەوە، چووینە ژووری میوان، ژووری چی، وەك سەرســـەر وابوو. سەلاجەیەك بوو بۆخۆی، لەوە نەدەچوو ئەو ساڵە ئاگری تێدا سووتابێت، نەماندەزانی چۆن دانیشــین، (بێگەرد) بانگی ئەو کــورەی کرد کە بەدەنگمانەوە هــات، وتی: کاکە دوو ســێ ســـۆبەمان بۆ بێنە، (بێگەرد) وتی: بە زاتی خوا وابزانم ئەمشەو کلکمان ڕەقدەبێت... سەیرکەن لەم هەموو شەوە چ شـــەوێکمان هەڵبژارد؟ لەسەرما یەك سەیری یەکمان دەکرد، مامۆســـتا نەجیب وتی: کاکە ماڵی ئێمە گەرمە با بچینەوە بۆ ئەوێ، کاکەڕەزا وتی: دان بە خۆتانا بگرن بابزانین حەمدی دێتەوە؟ ئەگەر نەهاتەوە، دەچینەوە بۆ ماڵی ئێوە.

کەوتنە سۆبا هێنان، دوو سۆباو هێتەرێکی کارەبایان هێنا، لەم قسەو گەردەشانەدابووین، حەمدی پەیدابوو. بێگەرد وتی: کوڕی باش دەعوەتیشمان دەکەیت و خۆشت نایەیتەوە، وتی: باوڕبکەن لە زۆر دەمێکەوە بەڕێوەم، خۆتان دەزانن دەربەندیخان دوورەو ڕێگا لەبەر بەفر زۆر خــراپ بووە، داوای لێبووردنتان لێدەکەم کــە دواکەوتووم. زۆری نەخایاند ژوور گەرم بوو، سفرەی داخست و بە ئارەزووەمان رازایەوە...

مەزە بەدوای مەزەدا دادەنرا، بێگەرد وتی: شــێخ محەمەد شەوی تۆیە، بەئارەزووی خۆت مـــەزە بخۆ، ئەمەی بۆیە بەمن وت لە خواردنـــەوەدا مەزەم زۆر دەخواردو هەموو جار پێیان دەوتم شێخ محەمەد خواردنەوە بۆ مەزە خواردن دەخواتەوە، حەمدی هەر ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد، بێگەرد وتی: کاکە وەرە دانیشــە، با ســـەرو پێك بخۆینەوە، مەگەر پێك گەرممان بکاتەوە، هەرکەسە بەئارەزووی خۆی پێکی تێکرد، حەمدی وتی: ئەمشەو شەوی خواردنەوەو قەل و ماسییە، هەر هەمووی ئامادەکراوەو برنجی کوردییشی لەگەڵدایە.

بێگــەرد پێکــی هەڵگرت و وتی: یاڵڵا برادەرینە با ســـەرو پێك بە بۆنـــەی ئازادکردنی کاکە نیزامەدینـــەوەو بەکوێرایی چاوی دوژمـــنانمان، هەڵبدەین... لەپشـــووی پێکی یەکەم تەواوبوویـــن، وتم: بێگەرد ئەمشـــەو شـــەوی (مامڵی)یەو بەدەنگە زووڵاڵەکەت دەســـت پێ بکــە، پێکی دووەمی هەڵداو وتی: لەچاوی مامڵی و دەســـتی بـــە ورەورکردو وردەوردە بۆی هەڵســـا، کاتێکمانزانی ســەرو قاپ ئاوی قەل بە پارچەی باڵەوە لەبەردەمماندا دانرا، بێگەرد لەگەڵ مژی ئاوی قەلدا دەنگی بۆ هەڵبڕی و ئێمەش لەســـەرخۆ چەپڵەمان لێدەداو لەگەڵیا دەمانوتەوە، شــەو بوو بەشەوی خۆمان، بێگەرد وتییەوە شەوی تۆیە، بەئارەزووی خۆت مەزە بخۆ، حەمدی وتی: بۆ وا بە شێخ دەڵێیت...؟

وتــی: کاکە ئــەوە بەینی خۆمانە، لای ئێمە بەمەزەخۆر ناســـراوە، لــە گەرمەی زەوق و خۆشیی و گۆرانیدابووین،و تاو نا تاوێك مەزەی دیکە لە باڵی قەل و شیشی گۆشت دەهێنرا،

جارجاره شـيخ سەعيد بۆ بێگەردی دەسـەندەوە، بەراستيی دەنگی ئەويش ئێجگار خۆشبوو، بەجووتە کرديانە شـەوی (مامڵی)، ئـەوان دەيانوت و ئێمەش لەبەرخۆمانەوە بەسـووکيی بۆمان دەسـەندنەوەو بەسووکيی چەپڵەمان لێدەدا، سـەرمامان بيرچووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا قەمسـڵەکانمان دانەکەندبوو، کاتێکمانزانی لەدەرگا درا، حەمـدی چوو بەدەم دەرگاکەوەو لەگەڵ حەمديدا (دوو زرتە بۆزی ريشـن) بە دوو کڵاشـينکۆفی حەفتـاو پێنجييەوە خۆيان بەژووردا کرد، لەگەڵ سـەلاميانداو بەبێ تەوقەکردن و فەرمووکردن يەکسـەر دانيشـتن، حەمدی تێگەيشـت بەهاتنيان زۆر قارس بووين، وتی: ئەوە (کاکە شـێخەو برای کاك شيخ عەزيزی چۆڵمەکە)، ئەوی تريش خزميانە، کەوتە تاريفکردن و وەسـفکردنيان بەوەی کە زۆر پياوی باشـن!! خەڵکی ئەم ناوچەيە گيانيان بەمانە!! کاکەی بەدەم هەموو کەسـێکەوەيە!! هەر کێشـەيەك هەبێت يەکسـەر بەدەنگييەوە دەچن و چارەسـەری دەکەن! ئەگەر کەسێك خوانەخواسـتە گرفتێکی هەبێت بەخۆيان چارەسـەرنەکرێت، يەکسەر کاکە شيخ بە رێگای (حاجی عەبد) فريای دەکەوێت و چارەسـەری بۆ دەکات! (حاجی عەبد) قسـەی رەت ناکاتەوەو هەرچی بوێت بۆی جێبەجێ دەکات، بەراسـتيی زۆر زۆر پياوی چاکن! لەگەڵ ئەم قسانەدا، دوو پەرداخی بۆ دانان بۆ دانان يەکسەر پێکيان تێکردو دەستيان بەهەڵدانی پێك کرد. مەزەی زۆريان بۆ دانان، بە شـيش گۆشتيان بۆ دەهێنان، ئێمەش وەکو خۆڵ و دۆ بەسەرماندا بکرێت، هەر هەموومان لە شـوێنی خۆمانەوە چوورين و ورتەمان لێبڕا، تاقەتی مژی پێکيشـمان نەما، بێگەردو شـيخ سەعيد لەو زەوقی (مامڵی)يەوە هاتنە سـەر سفرو هەموورشتيان بيرچووەوە، نورکتەو قسـەی خۆش و چەپلەو ورتە نەما، کپ کپ و بەبێ دەنگيی دانيشتبووين، بێگەرد رێگای سەراوی گرتە بەر، ئێمەش يەك بەدوای يەکدا، حەمديش بۆئەوەی ئەوان بێتاقەت نەبن و هەست بەبێزاريی ئێمە نەکەن، لە يەکپێ قسـەی بۆ دەکردن و پرسياری لێدەکردن و باسی چاکەو پياوەتيانی دەکرد، ئێمە وەکو گوێزمان بۆ بژمێرێت وابوو، لە دڵی خۆماندا دەمانوت (پيـاوی خائين خۆی چييەو پياوەتی چييە؟) ئێمە دەمانناسـين و دەمانزانی کێن و چين و چی دەکەن، زياتر لە دوو سەعات دانيشتن پێش هەڵسانيان خواردنيان بۆ هێنان و نانيان خواردو لەجياتی ئەوەی دەسـت و دەميان بشۆن، بەچمکی پشـتێنەکانيان دەست و دەميان سری و سـەرو دوو چايان هەڵقوراندو رۆيشتن... حەمدی لەگەڵيان چووە دەرەوە.. زياتر لە چارەکە سـەعاتێك لەگەڵياندا راوەستا، کە هاتەوە ژوورەوە، بێگەرد وتی: ئەرێ برا ئەم زرتە بۆزانە بەم شەوە لە کوێوە پەيدابوون و ئێمەيان دۆزيـيەوە؟ شەوەکەيان لێ تێکداين، وەسفيکردنەوە. بێگەرد جنێوێکی بە شـێخی کاکيان داو باسەکەی داخست، زانی حەمدی پێی خۆش نييە. بەراستيی ئەو شەوە ئەگەر ئەوانە نەهاتنايە شەوێك دەبوو لە شەوە هەرە خۆشەکانمان، بێگەرد وتی: هەڵدەن بەکوێرايی چاوی دوژمنان و خۆفرۆشانی دژی گەلەکەمان، وتی: کاکە حەمدی ئەمانـە چۆن دەبێت پياوی چاکن؟ ئەمانە بوونەتە پوازی دارو دەيانەوێت بمانبڕنەوە، ئەمانە گياکەڵەو خۆرەن، ئەمانە چاوسـاغ و دەستکيشـی دوژمنن، دەبێت لەهەر شوێن بيانبينيت

نەفرەتیان لێبکەیت، ئەمانە راوە پێشـــمەرگە دەکەن، ئەگەر وا نەبن (حاجی عەبد)ی پیاوی رژێم چۆن گوێ بۆ قسەیان دەگرێت؟ تۆ کە کاکە نیزامەدین گیرا، توانییـان هیچت بۆ بکەن؟ بەری بدەن؟ دلنیـام نا، لەوباوەڕەدام هەوڵیان داوە باری گرانتر بکەن، لێت تێکنەچێت ئەمانە دەتوانن لە رۆژێکدا سەد کەس بەگرت بدەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن یەك شوان بەربدەن، وتی: یاڵلا، بزن بەپێی خۆی و مەڕ بەپێی خۆی و جنێوێکی بەخۆفرۆشان دا.

حەمـــدی وتی: نان ئامادەیە بیهێنین؟ کاکە رەزا وتی جارێ ماومانە با تەواوبین و با تۆڵەی ئەو دوو ســـەعاتە بکەینەوە. مامۆســـتا نەجیب وتی: من دەڕۆمەوە، بێگەرد وتی: لە ئێمە زیاتر نیت، نابێت بڕۆیتەوە شـــەو لەگەڵمان بخەوە ئەمشەو تۆش وەکو ئێمە یان رەقدەبیتەوە یان گەرم دەبیتەوە.

ســـەر ســـفرە پاککرایەوە، خواردن ریز کرا، گۆشـــتی قەل، برنجی کوردی، ماسی برژاو، بەراســـیتی ئەو خواردنە دەقی داینەوە، دوای نانخواردن بەڕیز جێگا داخرا، بێگەرد وتی: من و شـــێخ محەمەد قەمـــەلە داناکەنین، ســـەرمامان بێت بەم زستانە چاك نابینەوە، سۆپاکان لابـــران. ، تەنها هیتەرەکـــە مایەوە، بەیانی کاتێك حەمدی هات و هەڵیســـاندین خەبەرمان بـــووەوە. . وتـــی: نان و چا ئامادەیە، دوای دەموچاو شـــۆردن نان و چایـــی بەیانیمان خوارد، ســـەعات بوو بە هەشـــت ســـدیق دیارنەبوو، چاوەڕوانیمان کرد، تا هەشـــت و نیو هەر دیار نەبوو، لە ســـەعات نۆ لە ماڵی حەمدییەوە بەسەر ئەو بەفرەدا بەرەو سەر شەقامی سەرەکی (ســـلێمانی- کەرکوك) کەوێتنە رێ بە ئومێدی ئەوەی لە رێگا سدیقمان پێدەگات، هەرچەند حەمدی بۆ نیوەڕۆو دواجار مامۆســـتا نەجیب و شێخ ســـەعید هەر هەموو خولقیان کردین بۆ مانەوەمان بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، نەماینەوە، گەیشـــتینە ســـەر رێگای سەرەکی و سدیق هەر دیار نەبوو، بەســـەر شەقامەکەدا بەرەو سەر پردەکە ملمان نا، دەشتی بازیان و چیاکانی دەوروبەری سەراپا بەفر داپۆشیبوون، بەرگێکی سپی هاودامانی پۆشیبوو، رەشایی بەدەرەوە نەبـــوو، چەمی بازیان بەناو ئەو بەفرەدا وەکو رەشـــمارێکی قەترانیـــی لرفە لرفی بوو، چەند ســـەرنجت لەو بەفرەو ئەو چەمـــە بدایە، لێی تێر نەدەبوویت، پردەکەمان بڕی، گەیشـــتینە لای چایخانەکە، لەبەری خوارەوەی شـــەقامەکە چەند تەکســـییەك راوەستا بوون، خەڵکیش بەدیاریانەوە وەستابوون.

(شێخ ســـەعید) بە خاوەن تەکسییەکانی وت: تەکســـییەکمان دەوێت بۆ سلێمانی... ئەم ســـێ نەفەرەن. وتیان: تا ئێستا لە سلێمانییەوە ئۆتۆمبێل نەهاتووە، چاوەڕێی ئەوەین، بزانین رێگا کراوەتەوە؟ شـــێخ رەزا وتی: ســـەر دەکەوین و دەڕۆین تا کوێ برمان کرد، بێگەرد وتی: یاڵلا... هەر نەڕۆیشـــت بەپێ دەڕۆین، ســـواربووین لای ئۆردووگای بازیان (شـــێخ سەعید) دابـــەزی، ئۆتۆمبێلەکەمـــان تاکە ئۆتۆمبێل بوو، بەو شـــەقامەدا بەرەو ســـلێمانی بڕوات و لە سلێمانیشـــەوە ئۆتۆمبێل بەرەو روومان نەدەهات. بەئاســـانی گەیشـــتینە ئەڵڵایی و بە تاسلوجەشدا بەئاسانی سەرکەوتین. بەرووکاری سلێمانیدا شۆڕبووینەوە، بازگەکە لەبەر بەفر

راینەگرتــین، لە دووریانی دووکانەوە ئۆتۆمبێل دەهــات، ئێمەش تەنها ئۆتۆمبێل بووین لە تاســلوجەوە بێینە خوارەوە، لە تاسلوجەوە تا راپەڕین کێشــەمان نەبوو، لەولای راپەڕینەوە ســەیرمان کرد ریزی ئۆتۆمبێل وەستاوە، یەك ئۆتۆمبێل جوولە ناکات، نەفەرەکان دابەزیون و زۆریان بەپێ بەناو ئەو بەفرەدا کەوتبوونە رێ بەرەو سلێمانی.

ئۆتۆمبێلەکەی ئێمەش لە ریزی ئەو ئۆتۆمبێلانە راوەستا، دابەزین، تێگەیشتین ئۆتۆمبێل دەرناچێت، بە شۆفێرەکەمان وت: سوپاس، لێرەوە ئێمەش بەپێ بەرەو سلێمانی دەڕۆین، (شێخ رەزا) پارەی تەکســییەکەی داو بەپێ کەوتینە رێ. کەوتینە بەفرشێلان بە لامانەوە رۆژێکی زۆر خۆش بوو، دەمێ ســالبوو بەفری وا نەباریبوو، هەستمان بە خۆشییەکی زۆر دەکرد، بە بێگەردم وت: من بۆیە حەزم لە سەردانی حەمدی بوو، بۆئەوەی هەوالی هەندێ برادەرمانی لێ وەرگرم، چونکە نیزامەدین لە ئەمن بووە، دلنیام لەو برادەرانەی ئێمەی بینیووە.

زۆر لام ناخۆشبوو، ئەو ملۆزمانەمان لێ پەیدابوون، شەوەکەیان لێ تێکداین، ئەوەی من دەمویست پێی نەگەیشتم.

بێگەرد بە ئارەزووی خۆی جنێوێکی ســرەوانده (کاکە شــێخی)، شــەو و بەدەم قسەکردن و گالتەو گەپەوە گەیشــتینە لای (باخی بەختیاری) تەکســی راوەستابوو، تەکسییەکمان بۆ ســەرچنارو ناوشار گرت (شێخ رەزاو بێگەرد) لە ســەرچنار دابەزین و منیش بۆ ناوشارو لە (شــەقامی کاوە) دابەزیم، شــەقامی کاوە لە ســالانی (٥٩-٦٠)ەکان دەچوو. توانەوەی بەفرو لێوانلێو ئاو بە قەراغی شــەقامەکەداو شــۆڕبوونەوەی چلوورە بە چەتری سەر دووکانەکان و شــەپۆلی ئاو بەســەر شەقامەکەداو چۆراوگەی سەربانەکان دەهاتنە خوارەوە، تیشکی خۆریش وەکو زیوێکی زاخاودراو بریســك و هوری بوو. لە ئاســتی مزگەوتی هەلاجەکان دابەزیم و قەیسەری نەقیب خۆت بگرەو هاتم.

•

# قەیسەری نەقیب و بەیانیی (١٩٩٠/١/٢٤)

هەرچوار دەرگای قەیسەرییەکە کرابوونەوە. لە دەرگای لای هەلاجەکانەوە خۆم بە قەیسەریداکردو گەیشتمە بەر دووکان، وەکو رۆژان بەیانی باشێکم لە دووکاندارەکانی دراوسێم کرد، بەو بەیانی باشە دووکاندارەکانم بەئاگاهێنایەوە، بەدەم بەخێرهاتنەوە دووکانەکەم هەڵدایەوە، (قادر)[١].. درەنگ هاتی.. (ئەنوەر)[٢].. خەمی دواکەوتنەکەتم بوو.. (والی)[٣].. من بزانم مامۆستا ئەمشەو لەناوشار نەبووە.. (مامە رەشە)[٤].. لێنی گەڕێن با دووکانەکە بکاتەوە.

تازە گەیشتبوومە ناو دووکانەکە، سەیرمکرد هەر دووکاندارە لە دووکانەکەیەوە باسی گەرەکی خۆیان و بەفرەکە دەکات، کاتێکمزانی (مامۆستا سامانی شێخ سالح)[٥]، کە مامۆستایەکی موحازربوو، رۆژی پێشوو پێش رۆیشتنم بانگم کردو کلیلی ئیدارەم دایە بۆئەوەی کە وەجبەی دووەم تەواو بوو، سەرمێزو دۆلابەکە کۆبکاتەوە، پەیدابوو، وتی: جگە لەوەی کلیلەکانم هێناوەتەوە، بۆ دوو شتی دیکەش هاتم. یەکەم: دوێنێ دوای رۆیشتنی تۆ، لە مونەزەمەوە تەلەفۆنیان کردو داوای تۆیان کرد، منیش وتم: بۆ پرسەچووە بۆ دەرەوەی شار، ئیشتان چییە؟ داوای میلاکی مامۆستاو ژمارەی خوێندکاریان دەکرد، وتم: هیچ نییە رۆژانە تەلەفۆنی وا دەکەن. دووەم: پێش نیوەرۆ دێمەوە بەشوێنتا، دەچینەوە بۆ مالی خۆمان نانی نیوەرۆ بەیەکەوە دەخۆین، برنجی کوردی، فاسۆلیای لامیامان هەیە بەگۆشتی گوێرەکەوە، هەر ئەو رۆژ (کاك حەمەنووری حاجی ئەحمەدی گەرمیان و کاك حەمەرەشیدی حاجی شەریفی باریکەیی)[٦]پەیدابوون. پرسیاری شەویان کرد کە لەکوێ بووم؟ کە وتم: لە تەینالّ و بازیان بووم، پێیان خۆش نەبوو. وتیان: دەبوو نەچوویتایە. لەراستیدا تێنەگەیشتم بۆ ئەوەیان وت. وتیان: بەیانی عەسرەکەی دێین بەدواتا دەچین بۆ (عەربەت) شەو میوانی (عوسمانی حەمە ئەمین)[٧] (عوسمان سەرسپین)و شەو ناگەڕێینەوە، جگە لە خۆشحالییان بە

---

١-قادر فەتاح: دووکانەکەی بەرامبەر دووکانەکەمان بوو خەڵکی گوندی سەرزەلە.

٢-ئەنوەری حاجی فایەق: دووکانەکەی بەرامبەر دووکانەکەمان بوو. خەڵکی گوندی (دووکانی قەرەداخ) بوو.

٣-والی حاجی سالّح: دووکانەکەی بەرامبەر دووکانەکەی قادر بوو. خەڵکی گوندی (دوکەرۆی قەرەداخ) بوو.

٤-رەشید حەسەن: دووکانەکەی بەرامبەری قادرو بەتەنیشتی والیەوە بوو. خەڵکی (قەرەداخ)بوو پێمان دەوت (مامە رەشە).

٥-سامانی شێخ سالّح: خەڵکی بەکرەجۆیە. بەلاّم لە سلێمانی دادەنیشێ‌و مامۆستای موحازرو وانەی مێژووی دەوتەوە.

٦- دوو هاورێی زۆر خۆشەویستم بوون، زۆربەی شەوانی هەینیمان لە مالّی یەکتر بەسەردەبرد.

٧-ئەمیش یەکێك بوو لە هاورێکانم و بەبیروباوەر سەر بە (حزبی شیوعی) بوو، دانیشتنمان بەیەکەوە زۆر

بازینی بەفرەکە شتێکی تریان نەوت، کاتی نیوەڕوان لەگەڵ دووکاندارەکانی دراوسێمدا، دوو دوو، سێ سێ، هەموو نیوەڕۆیەك دەچووین بۆ نانخواردن (والی و ئەنوەر) وتیان: مامۆستا نەچین نان بخۆین؟ وتم: ئەم نیوەڕۆیە لەگەڵتانا نایم، دەعوەتم... (مامۆستا سامان) هاتەوە، پەردەم بەدووکانەکەدا گێڕاو بە (قادر)م وت: دەڕۆم ئاگات لە دووکان بێت، خەمت نەبێت نارۆم تا (والی و ئەنوەر) نەگەڕێنەوە، لەسەر شەقامی کاوە سواری تاکسییەك بووین بۆ گەڕەکی مامۆستایان و ماڵی سامان،

چووینە ماڵەوە، وتی: نان پێگەیوە؟ (نیشتمان)[1]وتی: ئامادەیە بۆتان تێکەم؟ سامان: بۆ نا. سفرە راخرا و نان تێکراو بەیەکەوە نانمان خوارد، بەپەلە سەرو دوو چامان بەسەردا کرد، چووینە سەر شەقامی مامۆستایان و تەکسییەك گەیاندینییە قوتابخانە، کاتبەکان و (مامۆستا هوشیار)[2]و چەند مامۆستایەك هاتبوون و لە نیدارە دانیشتبوون، بە گەیشتنمان بۆ ناو ژوورەکە دەستمانکرد بە ئامادەکردن و جیاکردنەوەی دەفتەرو پرسیاری تاقیکردنەوەو مامۆستاکان، هەریەکەیان بەشە دەفتەری خۆی وەرگرت و بەسەر ژوورو هۆڵی تاقیکردنەوەدا دابەشبوون (مامۆستا رەئووف بێگەرد) هەر هات بێتاقەتی شەو بوو. وتی: ئەگەر مامۆستا هەیە من دامەنێ، ماندووم و دەڕۆمەوە، تاقیکردنەوە نەبوایە نەدەهاتم، ئەو رۆیشت، تەنها دەفتەرەکانی مامۆستا (قادری شێخ عەبدولڕەحمانی) خالەم مابوو، هەر دیارنەبوو، پاش دە دەقیقە ناچار دەفتەرەکانم دا بە مامۆستایەکی دیکە، دوای تێپەڕبوونی نیو سەعات پەیدابوو.. کە پێم وت لەبەرئەوەی درەنگ هاتی دەفتەرەکانم دا بەمامۆستایەکی دیکە پێی ناخۆشبوو، توورە بوو، وتم: حەقی توورەبوونت نییە، تاقیکردنەوە وەکو وانە وتنەوە نییە، دەبێت لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبیت، ئەگەر نا ناتوانم، نەك لەبەر تۆ لەبەر هیچ کەسێك تاقیکردنەوە دوابخەم، لەکاتێکدا ئێمە بە دوو وەجبە تاقیکردنەوە دەکەین، بەتوورەیی رۆیشتەوە، وەجبەی یەکەم تەواوبوون، پاش وەرگرتنەوەی دەفتەرەکان، دەفتەرو پرسیاری وەجبەی دووەممان دابەشکردەوەو بەسەر ژوورو هۆڵەکاندا دابەشبوون و خوێندکاران هاتنە ژوورەوەو قوتابخانە هێوربووەوە.

---

بوو، ماڵی لە عەربەتە.

١-خێزانی مامۆستا سامانە، بەداخەوە ماوەی چەند ساڵێکە نەخۆشیی کەنەفتی کردووە.

٢- هوشیار بەگ: جێگری بەڕێوەبەری ناوەندیی زانستیی بوو.

## لەناو ژووری ئیدارەی قوتابخانەدا ئەنفالکرام

لەگەڵ کاتبەکان و (مامۆستا هۆشـیار)دا خەریکی ڕێکخستنی دەفتەرو پرسیاری ڕۆژی دوایی بووین، تاقیکردنەوەی ئەو وەجبەیە وانەی (مامۆسـتا هۆشـیار) بوو، وتم: بۆ ناچیت بەسەر خوێندکارەکاندا بگەڕێیت؟ وتی: با ماوەیەکی پێ بچێت دەچم.

لەسـەر کورسـی و مێزەکەم دانیشـتبووم، بەبێ لەدەرگادان، دوو کەس خۆیان بەژووردا کرد، بەجۆرێکی سەیر هاتنە ژوورەوەو یەکسەر ڕوویان کردە بەردەم مێزەکەی من، یەکێکیان ئەسمەرێکی مامناوەندیی نە باڵابەرز نە باڵا کورتو ئەوی دیکەشیان قەڵەوێکی تێکسمراوی سـەر ڕووتاوەی نەختێك سوورکار بوو، بەبێ ئەوەی سەلام بکەن، پرسییان بەڕێوەبەر کێیە؟ فەرموون، منم، تۆ (شێخ محەمەدی)؟ بەڵێ، فەرموون دانیشن! دانانیشین، دوێنێ تەلەفۆنمان بـۆ کردیت... لێرە نەبوویت، ڕاسـتە چووم بۆ پرسـە، فەرموون چیتـان دەوێت؟ میلاکی مامۆسـتاکانتان چەندەو چەند خوێندکارتان هەیە؟ میلاك تەنها ئەم مامۆستایەمان هەیە، ئەویـش (معاون مدیرە) ئەوانی دیکە هەر هەموویان مامۆسـتای موحازرن، جارێکی دیکە وتم فەرموون دانیشن، نا، دانانیشین، خوێندکاریش سەرجەمتان دەوێت یان بەپێی پۆلەکان؟ وەڵامیـان نەدایەوە، هەندێك ئیشمان پێتە، لەگەڵمان وەرە دەرەوە، با سەر مێزەکە کۆکەمەوە، دەرگای دۆڵابەکە داخەم، پێویست ناکات، کلیلەکانم دانا، مێزەکەم بە پەرشوبڵاویی جێهێڵا. وتم: مامۆسـتا هۆشیار ئەوە کلیلەکانە ئاگات لەسـەر مێزەکە بێت، پرسیارەکانی لەسەرە، وتی: خەمت نەبێت. لەگەڵیان ڕۆیشـتم... کە لە دەرگای ژوورەکە چووینە دەرەوە، ویسـتم بیانبـەم بۆ ناو قوتابخانە، وتیان با بۆلای دەرەوە بڕۆین، لەکاتی ڕۆیشـتنمان بە ڕاڕەوەکەدا خـسـتیانمە بەینی خۆیانەوە، هەسـتم کرد وەکو ئەملاوئەولام لێ بگرن وابوو، پێش ئەوەی بگەینـە بەر دەرگای هۆڵی چوونە دەرەوە، هەریەکەیان دەسـتێکیان گرتم. کە گەیشـتینە هۆڵـی چوونـە دەرەوە، یەکێکیان وتی: وامانزانی ڕاتکردووە، بـۆ ڕادەکەم؟ یەکێکی تریان وتـی: دەچین بۆ مونەزەمە کۆبوونـەوەی بەڕێوەبەرەکان هەیە، نیو سـەعاتێکت پێدەچێت، بەدەم قسـەکردنەوە، قۆڵیان بادام و لە دەروازەی دەرەوە بەسەر قادرمەکاندا بەپەلە بردیانمە خوارەوە، هەر ئەوەندە لە دەرگای حەوشـەکە چووینە دەرەوە، سەیرمکرد بەرازیلییەکی سوور ڕاوەستاوە، دەرگای دواوەیان کردەوەو سواریان کردم. ئەسمەرە گەنم ڕەنگەکە ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوری، تێکسـمراوەکەش لە پێشـەوە دانیشـتبوو. دووانیش لەملاولامەوە سواربوون، یەکێکیان دەمانچەیەکی لەسـەر بناگوێم دانا، یەك ورتەت لە دەم دەرچێت کەللەی سەرت هەڵدەگرم.

# شەقامی شارو بیرکردنەوە

هــەر ئەوەندەی ســـواریان کـــردم و کەوتنــەرێ، ئۆتۆمبیلەکە وەکو گوللــە دەرچوو. لە چاوتروو کانێکدا فولکەی ســـجن دیارنەما، تێکسمراوەکە وتی: برادەرەکانت لامانن، وەلامم نەدایەوە، دووبارەی کردەوە، برادەری چی؟ ئەوان بەو رۆیشـــتنە خێرایە بە شــەقامی ســجن، قەنات، کانیســـکان و ناو عەقاریدا رێیاندەکرد، منیش کەوتمە بیرکردنەوە، ئەمە چی بوو؟ بـــۆ کوێم دەبەن؟ دەبێت چی بووبێت؟ برادەری من کێ بێت لای ئەمان بێت؟ دەبێت بۆ کوێم بەرن؟ ئەمان وتیان دەچین بۆ مونەزەمە. بەدەم بیرکردنەوەو تاووتوێی ئەم شـــتە کوتوپڕەدا، دوا ســـەرەنجم بە ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکاندا دەدا وەکو بۆ دواجار خواحافیزییان لێبکەم وابوو، کە لە ئاستی مونەزەمە تێپەڕین، وتم: نەتانوت دەچین بۆ مونەزەمە؟ یەکێکیان وتی: ئـــا... دەتبەین بۆ لای هاورێکانت میوانی ئێمەن، بەناو عەقاریداو بە تەنیشـــت حامییەداو بەرەو ئەمنەســـوورەکە ملیاننا، لە دلی خۆمدا وتم: ئەمرۆ ئەو رۆژە بوو لێی دەترسام، چۆن کەوتمە داوەکەوە، دیارە لە دوێنێوە بەدوامدا دەگەڕێن. گەیشتینە ئاستی ئەمنەسوورەکە، بە کۆلانێکدا لایاندا، لەناو کۆلانەکەدا قەمســـەلەیەکی عەسکەریی مغاوێرییان دا بەسەرمدا، لە چرکەساتێکدا کردیانم بەناو حەوشەی ئەمندا، کاتێکمزانی ئۆتۆمبیلەکە راوەستا، هەر لە ئۆتۆمبیلەکەدا بە پەڕۆیەك توند چاویان بەستمەوە، لەدواوە کەلەبچەیەکیان کردە دەستم.

# شەوی (٢٤-١٩٩٠/١/٢٥)و دۆزەخێکی سارد

دایانبەزاندم، هەر ئەوەندەم خۆشبوو گەیاندیانمە ئەو شوێنی تاوان و ریشەکێشکردنی مرزۆڤە، بەناو غەلبەغەلبێکی زۆردا دایانبوومە پێش، پەلەیان لێدەکردم، هەستم دەکرد، چەند کەسێك لەملاولاو دوام و پێشەوەم دەرۆن، گەیەنرامە شوێنێك و رایان وەستانم، وەکو گەلەگورگێکی برسی چۆن ئاسکێکیان بکەوێتە بەر دەست و دەم. ئاوا تێم وروکان، کەوتنە پشکنینی گیانم، چەند دەست هەریەکە لەلایەکەوە، گیان و گیرفانمی دەپشکنی، بەئارەزوویان گیرفانم نەمابوو دووجار و سێ جار نەگەڕێن، قۆندەرەکانیان داکەندم، گۆرەوییەکان و ناو قۆنەرەکانیشم گەڕان، هەرچی لەگیرفانەکانمدابوو لە پارەو دەفتەری بەرباخەڵ و تەلەفۆن، قەلەم و ناسنامەو وەرەقەو کلیل و مەدالیاو دەسرو بە سەعاتی دەستیشمەوە هەر هەموویان دەرهێناو بردیان و دەرپێکەشمیان بەوردیی پشکنی، کە لەو کارەیان بوونەوە، پاڵیکیان پێوەنام، یەك لەترم دا خۆم نەگرتایەتەوە بەدەمدا دەکەوتم، دایانمە پێش لەبەردەم دیوارێکداو روو لە دیوارەکە رایانگرتم، بە شەقێك و کێبلێك بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردم، هەستم دەکرد یەك دوو کەس بەدیارمەوە راوەستاون، هەستم کرد کەسێك هات، لێیان پرسی، ئەوە؟ گوێم لێبوو بەسووکیی وتی: بەڵێ، ئەوە. ئەو کاتەی گیرام قەڵەوبووم، کێشم (٨٨) کیلۆ دەبوو. ئەوەی لام وەستابوو، فەرمانی پێدام دانیشم، دانیشتم، وتی: هەڵسەرەوە، ئەم دانیشتن و هەڵسانەوەیە بەشەقەوە کردیانە وەرزشێکی سەعاتیی، دیاربوو سەرەتای جۆرێك بوو لە ئەشکەنجەو شەری دەروونیی. من لەبەرئەوەی قەڵەوبووم، پانتۆلم لەپێدابوو، بەو هەڵسان و دانیشتنە زۆر ئازارم خوارد، بەتایبەتی لەکاتی هەڵسانەوەکاندا. دوای ئەو وەرزشە ناخۆشە یەکێك پێی وتن، بەو موحاجەرەیەوە بیبەستنەوە، بە کەلەبچەکەو بە زنجیرێك بە ئاسنی موحاجەرەکەوە بەستیانمەوە، ماوەیەك بەو بەستراوەییەوە بە موحاجەرەکەوە مامەوە. هەستم دەکرد جمووجووڵێکی زۆر لەو ناوەدایە، جارجارە دیاربوو، هەر بۆ ئارەزوو شەقێکیان تێهەڵدەدام یان کێبلێکیان دەدا بە پشتمدا، قاچم تەواو سڕبوو، پشتم خەریکبوو دەتەقی، دەستم بە کەلەبچەکەوە زۆر ئازاری دەدام.

بە مەزەندە زیاتر لە سێ سەعاتێك بەو حاڵە مامەوە. گوێم لێبوو یەکێك فەرمانی دا بمکەنەوە. کردیانمەوە. بەپاڵ و بەشەق و کێبڵ تێسرەواندن دایانمە پێش، بردیانمە شوێنێك رایانگرتم، بۆن ساردێکی زۆر ناخۆشی لێدەهات، بۆ یەکەمجار گوێم بە مۆسیقای زرەزری زنجیرو کلیل ئاشنا بوو، هەر ئەوەندەم زانی دەرگا کرایەوە. بەپاڵێك و کێبلێك لەو دەرگایە کردیانمە ژوورێکەوە، کەلەبچەکەیان لە دەستم داکەند، چاویان کردمەوە، خڕ دەرگاکەیان داخست و زرەزرەکە رۆیشت، لەوێدا تێگەیشتم ئەو مۆسیقا ناخۆش و نەگریسە ئاهەنگی کردنەوەو داخستنی دەرگاکانە.

لەبەرئەوەی چەند سەعاتێك بوو بە راوەستان و بەستنەوە ماندوویان کردبووم، دانیشتم،

کەوتمە سەرنجدانی نـاو ژوورەکە، درێژیی دوو مەترێك و پانیی مەترو نیوێك دەبوو، بە بنمیچەوە گڵۆپێکی شەستیی دەسووتا. دوو بەتانی یەکێك ڕەش و یەکێك بازووی تێدابوو، سەتڵێك و دوو قوتووی ماست دوو سەموونی ڕەق و چەند دەنکە خورمایەك و چەند پوولی دۆمینەیەك کەلێیان وردبووەمەوە، لە هەویری ناو سەموون دروستکرابوون، تێدابوو، لە دیواری ژوورەکە وردبووەمەوە، دیوارێکی چڵکن و لە هەندێ شوێنی شتی لەسەر نووسرابوو، باش نەدەخوێنرانەوە، دەرگاکە ئاسن بوو. پەنجەرەیەکی بچووکی لەسەرەوە تێدا بوو لە دیوی دەرەوە دادەخرا، هەستم هەڵخست بزانم چی هەیەو ئێرە چییەو کوێیە؟ تێگەیشتم یەکێك لەبەردەرگاکەمدا دانیشتووەو ئەم ژوورە ژووری ئینفرادییە، جوولەو جارجارە کۆکەی ئەو کەسەی لەبەردەرگاکەدا دانیشتبوو، بەر گوێم دەکەوت، وەکو هەستم کرد لە تەنیشتی ژوورەکەوە ژوورێکی دیکە هەبێت و خەڵکی تێدا بێت، ورتەورت و جارجار کۆکەیەکم دەبیست، یەکێك هاتە بەردەرگاکەو پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوەو تێی خوڕیم سەموون و قوتوویەك ماستی هێنابوو وەریگرم، وەرمگرت، دیاربوو بۆ شێوی ئێوارە بوو خڕ پەنجەرەکەی داخستەوە، برسیم نەبوو، نیوەڕۆ لە ماڵی سامان بەئارەزووی خۆم نانم خواردبوو. کەوتمە بیرکردنەوە، ئەمە چی بوو؟ بۆ گیرام؟ لە قوتابخانەو بە ڕێگاوە وتیان هاوڕێکانت لامانن، وامانزانی ڕاتکردووە، دەبێت کێ گیرابێت، هاوڕێکانم کێبن؟ (حەمەڕەحیم) دەمێکە گیراوە، هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخستنمان بەیەکەوە نەبووە، تەنها یەکمان ناسیووە. (مامۆستا ئەحمەد)یش زۆر دەمێکە گیراوە، هاوڕێی یەك بووین، بەڵام کاری ڕێکخستنمان لەگەڵ یەکدا نەکردووە.

هاوڕێ (زانا) کە(عەتای حاجی ئەحمەد)بوو لەگەڵ هاوڕێ (پۆلا)و (پەسەند). کە (وەستا بەکرو کامل سابیر بوون و گیرابوون)، کەسیانم نەدەناسی و ئەوانیش منیان نەدەناسی، ئەوانە سەرو سۆراخیان نییە، باوەڕناکەم هەر مابن، دەبێت کەسێکی نزیك بە من لەمڕۆژانەدا گیرابێت؟ نەمبیستووە، ئەمڕۆ (حەمەڕەشید و حەمەنووریم) لابوو، باسی هیچیان نەکرد، بە ڕۆژانی پێش گرتنمدا چوومەوە،. سەردان و دانیشتنەکانم هێنانەوە بەرچاو، کەسەکانم دەوردەکردنەوەو کەوتمە خوێندنەوەیان. ڕۆژانە لە دووکان کێ دەهات بۆلام، قسەم لەگەڵ کێدا دەکرد؟ لە دووکاندارەکان لەگەڵ کێیاندا هەڵسوکەوت و مامەڵەم دەکرد؟ کامیان جێی گومانن؟ ڕۆژانە لە قوتابخانە لەکاتی دانیشتنمان لە ژووری ئیدارە، قسەی چیمان دەکرد؟ لەگەڵ مامۆستایان و کاتب و فەراشەکان و لەکاتی وانە وتنەوە، چ قسەیەکم بۆ خوێندکارەکان کردووە؟ ئەو شەوانەی بەمیوانیی دەچووین بۆ شارەزوورو هەندێ ماڵی برادەران لەناو شاری سلێمانی و دانیشتنمان لەنادی و شەوانی خواردنەوەمان هەر هەموویم هێنانەوە بیر خۆم، بەچاوی دڵ لە یەکەیەکەی کەسەکانم دەڕوانی. تەنانەت نزیکترین سەردان و شەو، کە شەوی ڕابردوو بوو لە ماڵی (حەمەدی) لە تەیناڵ تاوتوێ کرد، لە هیچ شوێن و بوارو جێگایەکدا شتێکم نەهاتەوە بیر، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە جۆرێك قسەم کردبێت دژی

رژێم، یان سەرانی، یان باسی شۆڕش و یەکێتی و پێشمەرگەم کردبێت، هەتا کەسێکی سەر بە رژێم لەسەری کردبم بەماڵ، ئەوەم لە مێشکی خۆمدا خستە بەرچاو کە دەمزانی رژێم دوای ئەنفال، بەنیازی ئەنفالی رێکخستنەکانی ناو شارەکانە، بۆ ئەمەش زیاتر گومانم بۆ کەسانێك یان پێشمەرگەیەك دەچوو، کە لە کاتەکانی پێش ئەنفالدا منی لە شوێنێك لە شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بینیبێت و هاتبێتەوەو زانیاریی دابێتە دەزگاکانی رژێم.

لەگەڵ بیرکردنەوەکانمدا سەیری دیوارو بنمیچ و بەتانییەکانی ناو ژوورەکەم دەکرد. ژوورەکە زۆر سارد نەبوو.. هەموو گیانم بووبوو بەگوێ و بۆ ورتەیەك، قسەیەك کۆکەیەك و گوێم هەڵخستبوو، شوێنەکە ئەوەندە بێدەنگ و کپ بوو، (لە ئاشی ئاوکەوتوو دەچوو)، جگە لە جووڵە جووڵی جەندرمەکەی بەردەرگاکەم. سووسەی هیچی ترم نەدەکرد. کەوتمەوە بیرکردنەوەو بەشەوی رابردوودا چوومەوە، ئەوەم هێنایەوە یاد خۆم دوێ شەو لەکوێ بووم؟ لە چ نازو نیعمەتێکدا دەژیام لە خواردن و خواردنەوە لەگەڵ کێ دانیشتبووم؟ ئەمشەو لەکوێم و لە چ شوێن و ژوورو جێگاو حاڵێکدام؟ شەوەکە بەراستیی شەوێك بوو لەو شەوانەی بەئاشکرا چنگی لە تەمەنم گیرکردبوو، هەڵیدەلووشیم و دەستی دەخستە بینەقاقام. شەوێك بوو لەوشەوە هەرە ناخۆشانەی ژیانم و شوێنەکەش لەو شوێنانەبوو، کە من لە ژیانی سیاسیمدا لێی دەترسام و بەوپەڕی وریاییەوە لە رۆژانی ئیشکردنمدا خۆم لێدەپاراست و جەختم دەکرد رێگامی تێنەکەوێت، ئەنجامیش وا بوومەتە میوانی ئەم چوار دیوارە رەش و پیسە، ئەو شەوە خۆی بۆ نابوومەوەو دەیویست خۆشی هەموو شەوانی ژیانم لێبکاتەوە. خەو لە چاوەکانم تەریبوو. ئێ خەوی چی؟ چۆن بخەوم؟ پێش چەند ساڵێك هاوڕێیەکمان گیرابوو. کە ئازادکراو دوای ماوەیەك راپۆرتێ سەبارەت بە دەزگای ئەمن و شێوەو شێوازی ئازارو ئەشکەنجەکانی بەرزکردبووەوە، هاتەوە یادم کە چەند شتێکی لە بارەی ئەمنەوە نووسیبوو، وەکو رێنمایی وابوون بۆ هەرکەسێ بکەوێتە بەردەستیان. لەو شتانەی نووسیبووی هەوڵدان بوو بۆ قسەنەکردن، خۆ بووراننەوە، راکردن لە وەڵامی پرسیارەکانیان بوو، منیش لە دڵی خۆمدا بڕیارمدا ئەگەر بانگ بکرێم ئەشکەنجە بدرێم پەیڕەوی ئەو رێنماییانەی ئەو هاوڕێیە بکەم. ویستم رابکشێم کاتێکمزانی مۆسیقا نەگریسەکە بە ئاوازە ناخۆشەکانی وریای کردمەوە، راکشانەکەو بیرکردنەوەکانمی هەر هەموو لێکپچڕان و رەواندەوە. ئاوازە ناخۆشەکە لەبەردەم دەرگای ژوورەکەم نزیك و نزیکتر بووەوە، لەپڕ دەنگە دەنگەکە لە رێگای هەڵگرتنی قفلەکەوە خۆی بە ژوورەکەمدا کرد، دەرگا کرایەوە، بە دەنگێکی زۆر ناسازو ناشارستانییانە پێم وترا هەستە، دەی زووکە، هەر هەستام کەلەبچەیەکیان لەپشتەوە کردە هەردوو مەچەکم و بە پارچە پەڕۆیەك توند چاومیان شەتەك دا، بە کەلەبچەکە رایانکێشامە دەرەوە. بەهەموو هێزی یەك کێبلی تێسرەواندم و یەك پاڵی توندی پێوەنام، دایمە پێش و پەلەی رۆیشتنی لێدەکردم، سەیرە، دەست کەلەبچە کراوە، هەردوو چاوم توند شەتەکدراوە، باشە چۆن پەلەبکەم و بەئارەووی جەنابی خێرا بڕۆم؟

بەدەم ڕۆیشتنیشەوە جارجارە شەقێکی مزرم تێهەڵدەدا، کێبلێك گازەرای پشتمی دەخوران، لە قادرمەیەك سەرسمم داو خەریکبوو بە دەما خپ بم، بە کەلەبچەکە راستی کردمەوە، شەوێکی سەیرە، دنیایەکی نامۆیە، شوێن و جێگایەکی مەترسیدارە، ڕۆیشتنێکی نەخوازراو، ڕۆیشتنێکی نائاساییە، تێخوڕینێکی سەرسەرییانەیە، چارەنووسێکی ڕەشی نادیارە، قادرمەیەك دووان، سیان، چوارو لەترێك و سەرسمێکی زۆر ناخۆش، لەپڕ کەلەبچە ڕاکێشراو بە تێخوڕین، راوەستە، راوەستە، راوەستان بەناچارییە، بزانم چی دەبێت...
ڕایانگرتم، پاش چەند دەقیقەیەك، بردیانمە ژوورەوە، رایان وەستانم. زۆری پێ نەچوو گوێم نێبوو پرسییان ئەوە؟ یەکێك وەڵامیدایەوە، بەڵا، ئەوە دوای ئەوە چاوم کرایەوە، کەلەبچەکەیان لە دەستم داکەند، لە بەردەمی ژوورەکەدا راوەستابووم، ژوورەکە بۆن ساردی لێدەهات، چاوم ورد دەکردەوە، لە ژوورەکەدا مێزێکی ئاسن و سێ کورسی ئاسنی تێدایە، دووکەس یەکێك لە پشتی مێزەکەوەو ئەوی دیکەیان لە تەنیشتی مێزەکە دانیشتبوون. دوو جل بەنەکیش لەملاولەولامەوە راوەستاون، ژوورێکی پۆخل و هەر چوار دەوری دیوارەکە بە ساج داپۆشراوە. لە ناوەراستی ژوورەکەداو دوو مێزی ئاسن، گەورەیەك و بچووکێك دانراون، لە بنمچی ژوورەکە بە بۆرییەکی ئەستووری ئاسن دوو سێ قولاپی قەسابی شۆڕبوونەتەوە، ئەو دووکەسەی لە پشت و لاتەنیشتی مێزەکە دانیشتبوون، ئەوانەبوون کە هاتن بۆ گرتنم لە قوتابخانە، دانیشتووی پشت مێزەکە وتی: (محەمەد) لەسەر ئەو کورسییە دانیشە، کورسییەکە لەبەردەمی مێزەکەدا بوو، دانیشتم ئەوەی لە تەنیشت مێزەکە دانیشتبوو، کەوتە پرسیاری ناو و ناونیشان و وەرگرتنی زانیاریی، ... دەینووسینەوە کە لە تەواوی پرسیارەکان بووەوە، ئەوەی پشتی مێزەکە کەوتە قسەکردن، لە قسەکردنەکانیدا منەتی ئەوەی بەسەردا دەکردم، کە پلەی وەزیفیم بەڕێوەبەری قوتابخانەم و مووچەی مانگانە لە حکومەت وەردەگرم، لە کۆتایی قسەکانیدا دەیویست بەم شێوەو شێوازە چی داوایەکی لێکردم، من بەبێ پێچ و پەنا هەر هەمووی بەگوێ بکەم، لە قسەکانیدا ئەوەی پێڕاگەیاندم کە ئەوان هەموو زانیارییەکیان لەسەر من هەیە، ئەگەر بەپێی خواستەکانیان قسە بکەم، وەڵامی وەکو دەیانەوێت راستیان بدەمەوە! ئەوە هەر ئەمشەو دەمنێرنەوە ماڵەوە، وەکو ئەوەی ئەوان منیان هەر بۆ گۆڕینی شوێن هێنابێت و ئەوەندە مرۆڤانەو مرۆڤدۆستبن، ئەگەر من کۆمەڵێك زانیاریم پێدان، ئەوان بێ سێ و دوو، بەبێ ئەوەی لە گوڵ کاڵترم پێ بڵێن، دەمنێرنەوە ماڵەوەو داوای لێبووردنم لێدەکەن!!
نەیاندەزانی ئەو خورمایەی ئەوان خواردوویانە ناوکەکەی لە گیرفانی مندا قایم کراوە.
کە ئەو لە قسەکانی تەواو بوو، (خۆم کردە کەڕەی شەربەت)، وەکو ئەو هەر لەگەڵ منی نەبوو بێت و یان گوێم لە فەرمایشتەکانی نەبووبێت وابوو، هیچ قسەیەکم نەکرد، بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکەم، سەیری هەردووکیانم دەکرد، لەسەر خۆ پێی وتمەوە قسەبکەم و سوێندی بەسەری سەدام و بە ڕەمزی بەعس و تەلاقی خوارد، ئەگەر ئەو داوایانەی ئەو

داوایکردووەو دەیکات بەراســتیی وەلاّمیان بدەمەوەو جێبەجێ بکەم، هەر شەو دەمنێرێتەوە بۆ ناو ماڵ و مندالّم!!

بەکورتی... ئەوەی من بەوم وت لەبارەی خزمەتی مامۆســتایی و دڵسۆزیم بۆ حکومەت و دائیرەکەم، بەگوێیدا نەچوو، کەوتەوە قسەکردن و لە قسەکانیدا باسی چاکەکانی بەعس و سەدام و حکومەتەکەیانی بۆ کردم، دەیویست ئەوەم پێ بسەلمێنێت کە بەعس و سەرزکەکەی بەوپەڕی دڵســۆزییانەوە بۆ گەلی کورد کاریان کردووەو کار دەکەن، ناکرێت حزب و سەرۆك و حکومەتێك ئەوەندە دڵســۆزی هاوڵاتییان و وڵات و نیشتمانەکەیان بن، کەسانی رۆشنبیرو خوێنــدەوار لــە دژی، کاری خراپ و تێکدەرانــە بکەن، بەپێچەوانەوە دەبێت ئەوکەســانەی لەمرۆدا حکومەت و حزب و شۆڕش و سەرۆك رێزیان لێدەگرێت و پلەی وەزیفی و مووچەی مانگانەیان دەداتێ، دڵسۆز بێت بۆ گەل، وڵاتەکەی، حزب، حکومەت و سەرۆکەکەی، نابێت کاری تێکدەرانەی دەرهەق بکات و ناپاکیی دەربارە بکات. وتی: ئێمە حەزدەکەین لە دەمی خۆتەوە راســتییەکان ببیستین، بەمەت وەفاو دڵسۆزیت بۆ حزب و سەورە دەسەلمێنیت!! هیچ کەســێك لە دژایەتیکردنی حکومەتەکەیدا سوودمەند نەبووە، بەڵکو زیانی گەورەی بەخۆی گەیاندووە!

دوای رامانێکــی بــاش، وتم: من نازانم لەســەر چی و بۆچی منــتان بــۆ ئێرە هێناوە؟ لە ئیشــوکارمدا هیچ کەموکورییەکم نییە، بەوپەڕی دڵــسۆزییەوە کارەکانم جێبەجێ دەکەم، تا ئێســتا ئینزاریشــم نییە، رەخنەیەکم لێ نەگیراوە، ئەوە ئێوەو پەروەردە، برۆن پرسیار بکەن، بزانن هیچ کەموکورییەکم هەیە.

ئێمــە دەمانەوێــت رێــزت لێبگریــن و یارمەتیت بدەیــن و بتنێرینەوە بۆ نــاو ماڵ و منداڵەکانت... ئێمە دەزانین لەرووی کاری وەزیفیتەوە هیچ کەموکورتییەکت نییە، بەلاّم تۆ دژی حزب و ســەورە کارو رەفتار دەکەیت و بەڵگەی تەواومان لایە، ئەگەر ئەو راســتییانەی لاتە پێمان بڵێیت و بەڵێن بدەیت دژی حزب و ســەورە لەمەو دوا رەفتار نەکەیت، ئەوە ئێمە هاوکاریت دەکەین و نایەڵین تووشی زەحمەت و نارەحەتیی بیت.

وتــم: گوێم لێدەگرن؟ وتیان بۆ نا. هەر زۆر بــاش گوێت بۆ دەگرین، ئەی ئێمە بۆ تۆمان بۆ ئێرە هێناوە؟

من هەرگیز دژی حزب و سەورە نە بەقسە، نە بە رەفتار، کارێکم نەکردووە. بەپێچەوانەوە، مــن شــەوانە لەگەڵ ئەو هەمــوو قوتابییــەی شــەو زەحمەتی زۆر دەبینم، کێشــەو گرفتی هەمەجــۆرم رووبــەڕوو دەبێتەوە، لە هەمــوو روویەکەوە خزمەتی قوتابخانــەو قوتابییانو مامۆستایان دەکەم، بچنەوە قوتابخانەکە لە یەکەیەکەی مامۆستاکان بپرسن بزانن ئەوەندەی سەرە دەرزییــەك من کەموکوریم هەیە، ئەگەر هەمبوو، بزانن لە چ روویەکەوەیە؟

من چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بەهۆی ماندووبوون و ســەرکەوتنم لە کارەکانمدا، (شــوکرو تەقدیرم) بۆ بنێرن، بانگ بکرێم دیاریم بدەنێ، کەچی لەبری ئەوە، منتان لە پێش چاوی ئەو

هەموو مامۆستاو قوتابییە، راپێچی ئێرەتان کردم و بە تاوانی دژی حزب و سەورە تاوانبارم دەکەن! لەمە سەردەرناکەم، من زۆر دڵخۆشبووم کە وتتان دەچین بۆ (مونەزەمە) کۆبوونەوەی بەرێوەبەرەکانە، وتم: لەوێ باربۆمان دەکەن، دەستخۆشیمان لێدەکەن، کەچی مونەزەمە بوو بە ئێرەو لە ئێوارەوە ئازاری من دەدەن. من نازانم ئێوە چیتان لە من دەوێت؟

هەر ئەوەندەم وت: ئەوەی لە پشتی مێزەکە دانیشتبوو، هەستایە سەر پێ و بەتوورەییەوە وتی: ئێمە دەمانەوێت یارمەتیت بدەین و بەزەییمان پێتا دێتەوە، دیارە تۆ غەشیمی یان نیمە؟! پێت دەڵێم هەر ئێستا ئەوەی دەیزانیت هەر هەموو راستییەکانمان پێ نەڵێیت، خۆمان دەزانین چۆن راستییەکانت پێ دەدرکێنین. پێت دەڵێم نە خۆت بخەرە ژێر ئازارو نارەحەتییەوە، نە ئێمەش ماندوو بکە، هەموو شتەکانی تۆمان لایە، خۆت گێل مەکە.. خۆت نەبیت کەس لێرە فریات ناکەوێت، ئەوەش بە درکاندنی راستییەکانە!!

لام سەیرە ئێوە بۆ باوەڕ بە من ناکەن؟ من بەم تەمەنەوە پیاوی درۆو کەسی دژ بەحزب و سەورەم؟!

تا هێزی تێدابوو، بە ئارەزووی دڵی خۆی یەك زللەی لێدام و بە کێبڵ بەربووە گیانم، گاڵ-تەمان پێدەکات! دەیەوێت خۆیمان لێ گێل بکات! بە خەیاڵی خۆی بەم شێوەیە بۆی دەچێتە سەر، دیارە ئەمە بەزەیی بە خۆی و منداڵەکانیدا نایەتەوە، نازانێت جەماعەتەکەی هەر هەموو لێرەن و هەموو شتێکیان لەسەر وتووە، بەتوورەییەوە، هەستە، دەی هەستە، خورییە جل بەلەکەکان، ئادەی ئەو دنیای پێشان بدەن، وەکو مژدەیان لە بەهەشتەوە بۆ هاتبێت، دەستیان دایە پەلم و هەڵیانسانم و جلەکانیان لەبەر داکەندم، تەنها دەرپێکەیان لەپێما هێشتەوە، لەپشتەوە کەلەبچەیان کردەوە دەستم، بردیانم بۆ لای مێزی ناوەراستی ژوورەکە، بەدوو کەس هەڵیانگرتم خستیانمە سەر مێزە ئاسنەکە، ئەو کاتە قەڵەو بووم و کێشم لە (٨٨) کیلۆدا بوو..

هەر چەندیان کرد کەلەبچەکەی دەستم نەگەیشتە قولاپی بۆری بنمیچەکە، دایانگرتمەوە، مێزە ئاسنە بچووکەکەیان خستە سەر مێزە گەورەکەو ئەمجارە بەوپەری توورەیی و رقەوە خستیانمەوە سەر هەردوو مێزەکەو کەلەبچەکەیان گەیاندە قولاپەکەو شەقێکیان لە هەردوو مێزەکە داو من هەڵواسرام.. ماوەیەکی باش خوولامەوە، لەژێرەوە بە کێبڵ پیایاندا دەکێشام و تێیان دەخوڕیم قسەبکەم، راپۆرتی هاورێکەم هاتەوە یادو چەند لێیاندام و خوولامەوە، قسەم نەکرد، ماوەیەکی زۆر بەهەڵواسراویی مامەوە، ئەوەی پشتی مێزەکەو هەردوو جل بەلەکەکان و ئەوەی تەنیشتی مێزەکە، بەدەورمدا دەخولانەوەو لێیان دەدام و دەیانقیراند بەسەرمدا قسە بکەم، وەکو بێتەوە یادم ئەم هەڵواسینەم سەعاتێکی زیاتر خایاند. خوێنەر بیهێنێتە بەرچاوی خۆی بزانێت لاشەیەکی زیندووی هەشتاو هەشت کیلۆیی بەرووت و قووتیی، بە کەلەبچەکراویی، بە قولاپێکی قەسابی بنمیچی ژوورێکی ساردو سڕدا، لە چلەی زستانێکی تۆفدا هەڵواسرابێت و لەژێرەوە بە سێ و چوارکەس بە ئارەزووی خۆیان بە کێبڵ دایبگرنەوە، پەیتا پەیتا پرسیاری لێبکەن و داوات لێبکەن قسە بکەیت، قسەکردن و وەڵامدانەوەش بۆ ئەوە

بێت خوێنی خۆت بکەیتە کاســەوە، بە قــەی حۆت خۆت بەخنکاندن بدەیت، ئەو کێبلانەی پێشــتر لێیاندەدام ئەوەندە ئازاری نەبوو، بەڵام ئەمانە زۆر بەئازاربوون و هەر کێبلێکم پێدا دەکێشرا، کسپە لە جەرگمەوە دەهات، ئیتر هەڵواسین و شلپەی کێبڵ هەر یەکەیان لەلایەکەوە کفنی مەرگیان بە بەرما دەکرد ئارەق لە تەوقی ســەرمەوە بۆ بەری پێم دنیای گیانکێشــان بۆ سەر تابووتی گۆڕستانیان لەبەردەکردم، گیان لە شوێنێکی سەختدایەو هەر وا بەئاسانیی دەرناچێت، ئەوان لە یەکپێ دەیان رێســاو منیش وەکو گوێڕم بۆ بژمێرن وابوو، بڕیاری خۆم دا، کــە ئەوان هەرچــی بکەن من نووتق لە خۆم ببڕم و هیچ قســەیەك نەکەم و نەکەم، بەو ســەرمایەو بەو چلەی زستانەو لەو ژوورە ساردەدا، گیانم کەوتە سەرئاو و بە هەموو گیانمدا ئارەق دەچۆڕایەوە، دڵم ســت بوو، بەڵام ئاگام لەخــۆم بوو، خۆم بوورانەوەو بە قولاپەکەوە شــلبووم، یەکێکیان وتی: ســەیدی... بووراوەتەوە، بەپەلە لە قولاپەکەیان کردمەوە، هەر ئەوەندە دەســتم لە قولاپەکە کرایەوە، یەکسەر لەو بنمیچی ژوورەوە بەربوومە خوارەوەو بۆیان نەگیرامەوەو کەوتمە ســەر چیمەنتۆی ئەرزەکە، گیانم بەرووتیی ئەوەندەی کێبڵ پیاکێشرابوو، هەستم بە ئازاری کەوتنەخوارەوەکە نەکرد، هەڵیانسانمەوە بردیمیانە بن دیوارەکە دایاننام، ئارەق لە گیانم دەچۆڕا، وتی: پێتخۆشە وا لە خۆت دەکەیت؟ وەڵامم نەدایەوە. خستیانمە سەر کورسییەك، ئێســتا دەڵێی چی؟ پێمان دەڵێیت ئەوانەی لەگەڵتدا کاردەکەن کێن و ئیشیان چییە؟ یان رێگای دیکەت لەگەڵدا بەکاربهێنین؟ ئارەزووی خۆتانە چیم لێدەکەن بیکەن، من ئــەوە نیــم کە ئێوە بە منی دەڵێن، خورپیە یەکێك لەو جــل بەلەکانە بە ناوی (جومعە) برۆ (*) بیهێنە، قسە مەکە هەر ئێستا لە بەردەمی خۆتدا هەموو راستییەکانی تۆ باس دەکات، لەم قسەیە سەرم سوورما! ئەو کەسەی دەیلێیت دەبێت کێ بێت؟ دەبێت راست کات؟ قسەی لەســەرم کردبێت؟ کاتێکمزانی و بەرامبەر رایانوەســتان، یەك موچڕکە بە تەوقی سەرمدا هات و لەبەری پێمەوە دەرچوو، کەسەیرمکرد وەکو باری تەندروستی باش نەبێت وابوو، دوای ئــەوەی گفتوگۆیەك لەنێوانماندا بوو، ئەویان بردەوەو منیش وەکو ئاســکێکی بریندار هەر چوارپەل بەســتراو لەبەردەمی راوچییە چاو برسی و بێویژدانەکاندا مامەوە... هەڵواسینەوەو کێبڵ لێدان، داگرتــن و کارەبالێدانیان کردە یاریی شــەویان و بە هەڵواســین و کێبلەکان گیانم خۆشــەبوو، بوورانەوەو هۆشــهاتنەوەکانم. بەر کارەبایەی کە دەیاندا لە پەرەی گوێم و (ســەری زەکەرم) شەرابی مەرگی پێدەنۆشــیم و ئاواتی ئەوەم بوو، هەر زوو گیانم دەرچێت، لە جارێکی هەڵواســینمدا بەهۆی مانەوەی زۆرم بەهەڵواســراویی و کێبڵ لێدانی زۆر دڵم ســت بوو ئەوەندەم هۆش هەبوو، یەکێك وتی: بووراوەتەوە، دایانگرتم و داگرتنەکەم ئاسایی نەبوو، هەموو جار بەردەبوومەوەو دەکەوتمە ســەر چیمەنتۆکە، لەبەر ئازاری گیانم هەســتم بەو کەوتنە خوارەوەیە نەدەکرد، رایانکێشــام و بردمیانە بن دیواری ژوورەکە، گیانم سەراپا ئاوی لێهەڵنیشــتبوو، سەرماشمەو دانەکانم لە سەرمانا یەکناگرن، کورسییەکەو کارەباکەو ئەمجارە ســەر زمانم و سەری زەکەرم، دەمم وشــکبوو، هێز لەگیانما نەما، وەکو بەروو لە

دەمیدا تەقیب-یێت بەرسست جنێوی ناشیرینی دەدا. کارەباکە بەتەواویی دڵمی سستکردو ئەسەر کورسییەکەش بەربوومەوە. راستییانکردمەوەو وامدەزانی ئەندامەکانی لەشم هەر هەمووی لێکترازاون، خستیانمەوە سەر کورسییەکە.

وتی: ئێمە ئیشمان چییە، تابەیانی بەدیارییەوە دادەنیشین، لە (پێرەمەگروون و بەرانان و ناوێسەریان) دەپرسی و منیش بەو بڕیارەی خۆم، کەمترین وەڵامم دەدایەوەو نازانمم کردە وێردی سەر زمانم و ئەوانم پێ قارس و توورە دەکرد، لە دڵی خۆمدا دەموت جا با هەر توورەبن و رقیان هەڵسێت، ئەمانە چین من بەگوێیان بکەم و وەڵامی پرسیاری بێ واتاو جنێوی ساردو سووکیان بدەمەوە، با هەر پرسیار بکەن و جنێوی خۆیان بدەن، هاوڕێکانت هەموو لێرەن لەبەر دەستماندان، کە ناوی چەند کەسێکیانی هێنا، تێگەیشتم ئەنفالی ڕێکخستنەکانی ناوشار دەستی پێکردووە، چونکە ناوهێنانی کەسەکان خۆی لەخۆیدا پێچانەوەی هاوڕێیانمان بوو، تەزوویەکی سارد بەلەشما هات. لە دڵی خۆمدا وتم ئەمڕۆ ئەو ڕۆژە بوو لێی دەترساین.

کارەبایان لێدامەوە، قورگ و دەم و زمان و لێوەکانم وشکبوون، وام هەستدەکرد ناوسابن، دەمارەکانی لەشم وەکو کوونبووبن وابوون، دڵم تەواو سست بوو، جارێکی دیکە هەڵواسینەوەو ماوەیەك بوورانەوە، کە هۆشم هاتەوە جەندرمەکان کەوتنە لۆمەکردنم، باش دەکەی وا لە خۆت دەکەیت؟ بۆ وا بەخۆت دەکەیت؟ تەمەن و منداڵت هەیە، بەزەییت بەخۆت و منداڵەکانتدا بێتەوە، دیاربوو، ئەو دروانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکردم بێتاقەت بووبوون ویستیان پشوویەك بدەن کۆیانکردمەوەو جلەکانیان کردەوەبەرم، زۆرم سەرمابوو، کەلەبچەکەیان کردەوە دەستم و چاویان بەستمەوە، دایانمە پێش، بە قادرمەیەکدا سەریانخستم، دوای قادرمەکان رایانوەستانم، دەرگایەکیان کردەوە، فرێیاندامە ژوورەوە، ژووری چی سیخنابوو لە ئینسانی کورد، هەبوو راکشابوو، هەبوو هەڵتروشکابوو، هەبوو دوو دوو شانیان بەیەکەوە دابوو، بۆ یەك قسەیان دەکرد، هەشبوو خەوتبوو، کە چاوم بەناویاندا گێڕا، سەیردەکەم هاوڕێ (عەلی ساڵح و مامۆستا شێخ عەزیز) هەر یەکەیان لەلایەکەوە دانیشتوون، سەرم سووڕما ئەمانە بۆ لێرەن؟ دوو ڕۆژ پێش ئێستا (مامۆستا شێخ عەزیز) م لە فولکەی سجن بینی و قسەمان کرد... (مام عەلی) بانگی کردمە لای خۆیەوە، پرسی کەی گیراویت؟ ئەمڕۆ ئێوارە، ئەی ئێوە، ئەمڕۆ، (مامۆستا شێخ عەزیز) کفری دەکرد، ئەوەندە ئەمامەوە تا بزانم چەند کەس لە ژوورەکەدان، ئەوانەشی گیراون کێن؟ جوق و مۆسیقای زنجیرو کلیل پەیدابوو، دەرگایان کردەوەو بانگیانکردمەوە، بەردەرگاو کەلەبچەو چاوبەستنەوە، ژووری گیانکێشان خۆت بگرە وا دێمەوە بە میوانیت، چاویان کردمەوە، لەسەر ئەو کورسییەی هاوڕێی ئامێری کارەباکەبوو، دایاننام، وەکو بلێی لەو ئازارو ئەشکەنجەیەی پێش نیو سەعاتیان پەشیمان بووبنەوە! یان خۆیان بەشەرمەزار بزانن! یان بابلێین بیریانکردبێتەوە بووبن بەپیاو!! زۆر لەسەرخۆو بە زمانێکی شیرین، کەوتنە قسەکردن

لەگەڵما، لە قسەکانیاندا وایاندەردەبڕی دڵیان پێم دەسووتێ و پێیان ناخۆشە، کە دووچاری ئەو ئەشکەنجەیە کراوم! چیت بوێت بەسەر سەر بۆت دەکەین! کەوتنە وەسف و ستایشی سەرۆك و حزب و سەورەو حکومەت، لەڕووی ئەوەی کە چەند خزمەتی کورد دەکەن، چەند بایەخیان بە گەلی کوردو ناوچەی حوکمی زاتی و مەجلیسی تەشریعی و خەڵکی کوردستان داوە! بەدوای ئەم قسانەدا بە بەراورد کەوتە هەڵدانەوەی لاپەڕەی مێژووی ژیانی (مام جەلال و نەوشیروان)و دەیویست بەهەمرو شێوەیەك وا بکات لای من سووکیان بکات، دەیان تاوان و تاوانباری خستە ئەستۆیان، دەیوست ئەوە بسەلمێنێت کە لە هەموو حاڵەتەکاندا سەدام و رژێمەکەی لە (مام جەلال و نەوشیروان)و ئەو شۆڕشەی بەرپایانکردووە باشترەو ئەوەشیان رادەگەیاند، کە ئەوان واتە (مام جەلال و کاك نەوشیروان) دەتوانن چی بکەن ئێستا کە من گیراوم بابێن فریام بکەون!!

دیارە ئەم هەموو راوە رێوییەیان بۆ ئەوەبوو، بم خەڵەتێنن و لەخشتەم بەرن، کورد وتەنی (ئەو خورمایەی ئەوان خواردبوویان ناوکەکەی لە گیرفانەکانمدابوو)، بۆیە وەڵامی من پێداگرتنم بوو لە خزمەتکردن لە رێگای وەزیفەمەوە بە حکومەت و سەورەو حزب.

لە ئەنجامی هێنان و بردنم لەو شەوەدا، زانیم کە ئەوەی لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا دەکات ناوی (ماجد)ەو ئەوی دیکەیان (جەبار)ی ناوە، جەندرمەکەش یەکێکیان ناوی (جومعە)یە.

بە وەڵامەکەم (ماجد) زۆر نارەحەت بوو. رقی هەڵسا گاڵیدایەوە گیانکێشانەکە دەست پێبکەنەوە، هەر بەبیستنی گاڵدانەکە، پەلاماردرامەوە، وەکو جارەکانی پێشوو، رووتکرامەوە، هەڵواسین، داگرتن، کارەبا لێدان دوو کێب[illegible] بەدەستیش حەزیان دەکرد کێبلەکانیان رانەوەستێت و بەئارەزووی خۆیان هەڵیسووڕێنن. ئەم جەولەیەش بە سێ جار هەڵواسین و کارەبالێدان و کێب[illegible] پیاکێشان کۆتایی هات، کە بێ ئومێدبوون لەوەی بەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەو جنێوەیان شەرمەزاریان دەکەم. (ماجدو جەبار) شەقیان لە قنگی خۆیان هەڵداو بە جومعەو هاوەڵەکەیان سپاردم. دوای ئەوەی بارودۆخی گیانم هێوربوودوە، کۆیانکردمەوەو کەلەبچەیان کردەوە دەستم، چاویان بەستمەوە، دایانمە پێش و بردیانمەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، کە خستیانمە نەو دیوی دەرگاکەوە، دەرگاکەیان داخستەوە (جومعە)، وەکو ئەوەی ئامۆژگاریم بکات، یان بابڵێین بەزەیی پێمابێتەوەو لە خەممدا بێت، وتی: ئاو مەخۆرەوە! یاریی بەدەستەکانت بکە، دەرگاکەیان کلۆمدایەوەو ملیان شکان. ژوور تەنگەبەرو سارد، گیان شەکەت و ماندوو، دەستەکانم سڕ بوون، قاچ و سمت و پشت هەستم دەکرد ئاوسابن و بریندار بن، لام سەیر بوو، وەکو لەسەر (کاریزی چنارە)[1] دانیشتبم پێم دەڵێت ئاو مەخۆرەوە! ئاوی چی؟ ئاو لە ژوورەکەدا هەیە؟ هەرچەندە کە ناوی ئاوی هێنا زۆرم حەز لە ئاو بوو، چونکە بەڕاستیی

---

١- کاریزی چنارە، کاریزو ئاوێکە لە سنووری گوندەکەمان (سوڵە)، یەکێکە لەو کاریزانەی ئاوێکی ساردو سازگاری چاوقرشانگی هەیەو لەنێوانی سنووری قەرەداغ و بازیاندایە. لە ساڵی (١٩٦٣)دا بنکەیەکی پێشمەرگەی لێدانرابوو.

تینووم بـوو، کەمێك قاچەکانم جوولاند، دەسـتەکانم هەندێ باداو بەو ئـازارو توونێتی و ماندووبوونەوە، خەوم لێکەوت، زرەی زنجیرو کلیل خەبەری کردمەوەو هەستام، کاتێکمزانی زرەزرەکـە لە بەردەمی ژوورەکەمدا دەنگی نەماو دەرگایان کردەوە، تێیان خوڕیم هەسـتم، هەسـتام، وەرە دەرەوە، کـە چوومە دەرەوە، وەکو ئێوارە کە بانگیـان کردمە دەرەوە چاویان بەسـتمەوەو کەلەبچەیان لە دەستم کرد، ئەمجارە نە چاوم بەستراو نە کەلەبچە کرایە دەستم بە ورديی سـەرنجی شـوێنەکەم دا، لەو ژوورەی منی تێدا بووم بەریـز چەند ژووری دیکە هەبـوو، لەبەردەمی ژوورەکانـدا دیوارێك هەبوو ڕێك بەرامبـەری ژوورەکان بوو، لەو دیو دیوارەکەشەوە چەند ژووری دیکە هەبوو، بە هاوشانی یەکێکیان دەڕۆیشتم گەیاندمیـانە لای (مەغسەل و ئاو دەستێ)، هەر گەیشتمە لای مەغسەلەکە، یەکسەر بەلوعەم کردەوە تێر ئاوم خواردەوە، هەرچەندە نەدەبوو ئاو زۆر بخۆمەوە، بەلام چی نەخۆمەوە، من بەدرێژایی شەو ئاو نەگیانم ڕۆیی بوو، ئاو لەگیانما نەمابوو، کردیانمە ئاودەسـتەکەوە. لەکاتی سەراوکردنمدا زۆر پەلەیان دەکرد، هەرچەندە بەئارەزووم نەمتوانی لە ئاودەسـتەکەدا بمێنمەوە، بەلام هەر باش بوو، ئاهێکم پێداهاتەوە، تۆزێك حەوامەوە، جوولەیەك کەوتە گیانم بەوردیی سـەرنجی شوێنەکەم دا، تێگەیشتم ئەم ژوورەی منی تێدام هەر یەك ژوور نییە، بەلکو چەند ژوورێکەو هەر ژوورەی یەکێکی تێدایە، لەنێوانی ژوورەکاندا کە بەرامبەری یەك بوون دیوارێك هەیە، بردیانمەوە بۆ ناو ژوورەکە، دەرگاکەیان داخسـتەوەو دوای من کەسانی دیکەی ژوورەکانیان یەك یەك برد بۆ سـەر ئـاو، کە لە هێنان و بردنـی زیندانییەکانی ژوورەکان بۆ سـەر ئاو تەواو بوون، پاش ماوەیەك کاتێکمزانی سـەموونێك و قووتوویەك ماستی مەسلەحەیان لە پەنجەرەی دەرگاکەوە بۆ شۆڕکردمەوە، تێیان خوڕیم وەریان بگرم و قووتوویەکیان بدەمێ بۆ چا، هیچ نەبوو بیاندەمێ بۆ چا.

سـەموون و ماسـتم نەخوارد، نان چۆن دەخورێت؟ من هێشـتا ئـازاری گیانم هێدیی نەبووەتەوە، دەسـتەکانم بەحاڵەحاڵ دەجولێن، دوای دابەشـکردنی ئەو نان و چایەی بەیانی سـەعاتێکی نەبرد هەسـتمکرد دەرگایەکیان کردەوە، یەکێکیان لێهێنایە دەرەوە، ئەو ناوەی پێ پاکدەکەنەوە، هەر گوێم لە کەسـەکە بوو، لەگەڵ جەندرمەکەی دیکە قسـەی کرد، کە گوێم لە قسەکانی بوو، بە دەنگیدا لە (مامۆستا ئەحمەدی سەناعە) دەچوو، بەوەی کە گوێم لە دەنگی بوو زۆر دلخۆشـبووم، کە زانیم مـاوەو لەناونەبراوە، لەکاتێکدا کە نەگیرابووین، هەوالـەکان بەزۆریی وای دەگەیاند، کە (مامۆسـتا ئەحمەد) هـەر زوو لەناوبرابێت، تا ئەو خەریکـی پاککردنەوەی شـوێنەکەبوو، جوولەیەك لەناو شـوێنەکەدابوو، بە تەواوبوونی و کردنەوەی بۆ ناو ژوورەکەی کپی و بێدەنگیی هەست پێدەکرا.

کەوتمە بیرکردنەوە... وا زانیم (عەلی سـالح و مامۆسـتا شـێخ عەزیز) ئەو برادەرەی تر گیراون. دەبێت کێی ترو چەند کەسی تر گیرابن؟ ئەم شالاوی گرتنە دەبێت چی بێت؟ کەوتمە تاوتوێی وەزعەکە، هەرچەند سـەرم دەهێناو دەبرد پەیم بە وەزعەکە نەدەبرد، دەمزانی پێش

مانگێك چەند برادەرێك گیراون، (مامۆستا شێخ عەزیز) ترسی هەبوو، بۆ ماوەیەك خۆی شاردەوە. لە مێشكی خۆمدا تاوتوێی زۆر شتم دەكردو نەخشەم دادەنا بۆ جەولەكانی داهاتوو، دەمزانی بەم شێوەیەو بەم ئەشكەنجەیە تەواو نابم و ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەكێشێت. من لەم خەون و خەیاڵانەدا بووم، زرەی زنجیرو كلیل، زنجیرەی خەیاڵ و بیركردنەوەی گۆڕیم و زۆری پێنەچوو گەیشتە لای ئێمە. دەرگایان هەڵگرت یەكێكیان وتی: سەتڵێكمان بدەرێ. سەتڵێكی ماستی لێبوو، سەتڵەكە چەندێكە لەم ژوورە پیسەیە، نازانم؟ دامە دەستیان لەوكاتەدا، وەكو غەلبە غەلبێ پەیدابوو، دیاربوو ئەوەش ئەوەبوو كە لە زیندانییەكان خەڵكیان دەركردبوو، بۆ هەڵگرتن و دابەشكردنی خواردن بەسەر زیندانیی ژوورەكاندا، پاش ماوەیەك سەتڵەكەیان هێنایەوە دەرگاكەیان كردەوە خستیانە ئەمدیو دەرگاكەوەو دەرگاكەیان داخستەوە لە سەتڵەكەدا شلەو برنج كراون بەسەر یەكدا بەحیساب ئەوە خواردنی نیوەڕۆیە، سەتڵەكەم داناو دەستم بۆ نەبرد، هەستم بە برسێتی نەدەكرد، دڵم گیرابوو، بەكورتی ئەو ژەمەش نانم نەخوارد، دوای دابەشكردنی خواردنەكە، جموجوڵی، ئەو ناوە كەمبووەوە، بەڵكو هەر هیچ ورتەیەك نەدەبیسترا، جگە لە جوڵەجوڵی ئەو پۆلیسەی لەبەردەمی ژوورەكەمدا دانیشتبوو. كاتێك سەرنجی ئەو سەتڵەم دەدا كە خواردنەكەی تێكرابوو، شلە بەسەر برنجدا كرابوو، رۆژانی سەربازیی و سەربازگەی راهێنانی كەركوكی ساڵی (١٩٧٢) م دەهاتەوە یاد، كە (قەزعەیان) بۆ تێدەكردین، بەهەمان شێوە شلەكەیان دەكرد بەسەر برنجەكەداو بۆهەر (٣-٤) سەرباز دەفرێكی فافۆنی قوڵفداری لاكێشەیان دەداینێ، ئەوەی كەوچكی خۆی پێنەبووایە بە دەست دەیخوارد، بەڵام ئەم خواردنە لە سەتڵێكی قووڵ و بەبێ كەوچك بۆ منیان دانا.

ماوەیەك بەسەر كاتی نانخواردندا تێپەڕی، مۆسیقا نەگریسەكە ئارامیی شوێنەكەی شڵەژان و رێك بەردەرگای بەمن گرتەوە، دەرگا هەڵگیراو بەتێخوڕین ئاگاداریكردم هەستم. هەر هەستام، وتی: پشتم تێكە. هەر پشتم تێكرد كەلەبچەكەی پێشكەشی مەچەكم كردو لای پێكردمەوەو بە پەرۆیەك چاوەكانی شەتەك دام. دایمە پێش و جارجار بۆ ئەوەی پەلە لە رۆیشتنا بكەم كێبلێكی تێ دەسرەواندم. لە قادرمەیەك سەرسمم دا، بە كەلەبچەكە گرتیمییەوەو نەیهێشت بكەوم، راوەستان و چاوكردنەوەم یەك بوو. شوێنەكە ژوورێك بوو، لە ژوورەكەی دوێنێ جیاوازبوو، سێ مێزو كورسی و چەند كورسییەكی دیكەی تێدابوو، ماجد لەسەر مێزی ناوەراست و جەبارو یەكێكی تر هەریەكەیان لەسەر مێزەكانی تر دانیشتبوون، جەبار پێی وتم دانیشم. لەسەر كورسییەك بەرامبەریان دانیشتم، جەبار كەوتە وەرگرتنی زانیاریی لەسەر ناو، ئیش، تەمەن، ساڵی خزمەت، شوێن و جێگا، گەڕەك و ماڵ، وەرگرتنی ناوی كەسە نزیكەكان، منداڵەكان و ناوی خێزان... ژوورەكە رووناك بوو، پەنجەرەی لەدوای ماجدەوە تێدابوو، پاكوخاوێن بوو، بەكورتی لە ژووری كاركردنی فەرمانبەران دەچوو، دەركەوت كە ژووری لێكۆڵینەوەیە، لەكاتی وەرگرتنی زانیارییەكاندا،

جگە لە جەبار کەسـی تریان لەگەڵما قسـەیاننەدەکرد، کە لێبووەوە روویکردە ماجدو وتی: گـەورەم تەواو... ماجد بە زمانێکی هێمن کەوتەوە پرسـیارکردن، وای دەردەخـست گوایە دەیەوێت یارمەتیم بدات سـەبارەت بەڕێکخستن و کاری ڕێکخراوەیی و پەیوەندیی و شێوەی کارکردنم پرسـیار بەدوای پرسـیاردا دەیکرد، منیش نازانم کردبووە چەکی خۆدزینەوە لە وەڵامی پرسیارەکانی، وتی: ئەگەر راسـتییەکانمان پێبڵێیت هەر ئەمرۆ دەتنێرینەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکانت!! ئەوەی دەدا بەگوێمدا کە هاوڕێکانم قسـەیان لەسـەرکردووم و هەموو زانیارییەکیان لەبەردەسـتدایە! کە لەدوای ئەو هەموو پرسـیارو قسە درۆیانەی جارێکی تر وتم نازانم، وەکو فیشـەکە شـیتە هەسـتاو هەڵگژاپیامار تا هێزی تێدابـوو، یەك زللەی پیاکێشـام و شـەقێکی ناپیاوانەی تێهەڵدام و گاڵی (جومعە)ی دا، بمبات بۆ شوێنی گیان کێشانەکەو پێی وت ئەمرۆ تا گیانی دەرنەکەن، وازی لێمەهێنن، جومعەش وەکو مەدالیای شـەرەف بکات بە یەخەیدا، لە خۆشیاندا پەلاماریدام و چاوەکانمی بەستەوەو خۆی ئاسا بە کێڕ و شـەق دایمییە پێش و تاگەیاندمییەوە ژووری گیانکێشـانەکە. هەر گەیشتینە ئەوێ بەدوامانـدا جەباریـش گەیشـت، پێش ئەوەی دەسـت بەهەڵواسـین بکەن، جەبـار کەوتە ئامۆژگاریکردنـم و گوایە ئەو بەدڵسـۆزیی و حەزناکات ئازار بدرێم و بە قسـەیان بکەم و ئەوەی ئەوان داوای دەکەن وەکو پیازی پاککراو پێشکەشـیان بکەم، کە ئەو قسانەشـم لەو نەبیست، کەلەبچەکەیان داکەندم چاویان کردبوومەوە. جلەکانیان داکەندمەوەو کەلەبچەیان کردەوە دەسـتم، کەوتنە هەڵواسـینم، بە کێبڵیش لەژێرەوە قاچ و سـمتم مـاچ دەکەن... (ماجدیـش) وەکو هار پەیدابوو، جنێوی لەسـەر رەقەم پێدەدام، منیـش نقەم لەخۆم بڕی، ئەوان دەیانزیـاو منیش خۆم کردبووە مردوو، گوێکانم یەك قسـەیان نەدەبیست. ئیتر ئەو رۆژە هەڵواسـین، کارەباڵێدان و جنێوی سـووك و ناشـیرین، بوو بە خۆراکی رۆژەکەم و بە (ماجـد)م وت: بۆ جنێو دەدەیت؟ وتی: پێت ناخۆشـە وتم جنێودان عەیبە. ئەوە من و ئێوە، هـەر زۆر لێـم بەقینی ریـزێ گوللەم پێوەنێ و بم کـوژەو جنێومەدە، وتـی: دیارە زۆرت پێناخۆشـە کە جنێـوت پێدەدەم، وتی: سـەگی کوری سـەگ بەنیازی هەروا بەئاسـانیی بتکوژین، خەیاڵت خاوە دەبێت زمانت لە سـەرتەوە دەربهێنن، ئەوەندە بەئازارەوە بتکوژین، کە هەر سـات و رۆژێکت مردنێك بێـت... من لە رۆژانی لێکۆڵینەوەو ئەشـکەنجەداندا پەیرەوی قسەی ئەو هاوڕێـیەو ئەو برادەرانەم دەکرد کە لێم بیستبوون و بۆیان گێرابوومەوە، لەکاتی گرتندا لەهەر دەزگایەکی رژێمدا باشـترین شت و بێبەلاترین شت ئەوەیە، کە ئەوان چەند پرسـیار بکەن، تۆ هەوڵبدەیت کەمترین وەڵامیان بدەیتەوەو لەسـەر قسـە نەرۆیت و باشـترین چەکیش بۆ زیندانـی (نازانم)ە، بۆیە ئـەوەم کرد بە بەرنامـەو بڕیارمدا کەمترین وەڵامیـان بدەمـەوەو وەڵامەکەشـم (نازانـم) بێت. دوای ئەوەی تێگەیشـتن هەڵواسـین و ئەشـکەنجە سـوودی نییە، زانیشیان زۆر بێتاقەت و شـپرزەم، بۆیە وازیان لە هەڵواسین و کارەبـاو ئەشـکەنجەدان هێنا، جلەکانیـان لەبەرکردمەوە، کەلەبچەیان کـردەوە مەچەکم،

بردیانمــەوە بۆ ژوورەکە وەکــو جاران پێیان راگەیاندم کە یاریی بە دەســتەکانم بکەم و ئاو نەخۆمەوە، خەریکی یاریکردن بووم بە دەســتەکانم هەرچەنــد تینوم بوو، زۆر حەزم لە ئاو دەکــرد، بەڵام ئاو نەبوو، حەزەکەم لە شــوێنی خۆیدا نیشــتەوەو یاریکردنەکەش ئەوەندەیتر تینــووی دەکــردم، راکشــام زەنگــە ناخۆشــەکە پەیدابــووەوە، کەوتنە دەرگــا کردنەوەو راســتبوومەوە، دانیشــتم چاوەروانم دەکرد بزانم ئەمجارە بۆ پەیدابوونــەوە؟ نەمدەزانی کە ئێوارەیــەو زیندانییــەکان لــە ژوورەکان دەردەکەن بۆ ســەراو ماوەیەکی پێچــوو دیاربوو زیندانییەکیان دەرکردبوو، تا ئەویان نەخســتایەتەوە ژوورەوە یەکێکی دیکەیان دەرنەدەکرد.
دیاربوو ئەو تەواو بوو دەرگای لای منیشــیان کردەوە، تێی خوڕیم هەســتم و بچمە دەرەوە، دەســت و چاوم نەبەســترایەوە، پاڵێکی پێوەنام بە مەبەستی ئەوەی پەلەبکەم بۆ چوونە سەر ئاو، لەکاتی چوونە ســەر ئاومدا چەندجار لە قاپییەکــەی داو تێیدەخوڕیم پەلەبکەم و بێمە دەرەوە، گوێم نەدایە بەراســتیی ســەراوێکی خۆش بوو، بەو ســەراوە، حەوامەوە لە نیوەڕۆژە پێویســتم بەسەراو بوو، جا چی لە سەراوێك خۆشترە کە تەنگاوبیت؟ ئەو چەند لە دەرگاکەی دەدا مــن گوێم پێنەدا، بەئــارەزووی خۆم دانیشــتم، ئارامی لێبڕاو دەرگاکــەی پاڵپێوەناو کردییەوە، بۆئەوەی هەستم بێمە دەرەوە، هاتمە دەرەوە، لەو (مەغسەلەی) لەبەر ئاودەستەکەدا بوو، دەموچاوێکم پشــیلە شۆر کرد، دوو سێ مست ئاوم خواردەوە، نەشموێرا زۆر بخۆمەوە، نەکو شــەو شــپرزە ببم و لەو کاتەدا دەموچاوم دەشــۆرد، ئەوەی بەدیارمەوە راوەستابوو، تا هێزی تێدابوو، یەك شــەقی تێهەڵدام، وتی: بەســەو پشــتی ملی گرتم و رایکێشام و بەپاڵ بردمییــەوە بــۆ ژوورەکەو پاڵێکی پێوەنام بۆ ناو ژوورەکە، خڕ دەرگاکەی داخســتەوە. گوێم گرت ئــەو جموجوولە تــا درەنگ دەوامی کــرد، کــە جموجوولەکە تەواوبوو، شــوێنەکە هێوربووەوە، پاش ماوەیەك زرەی زنجیرو کلیل پەیدابووەوە، دەرگایان کردەوە، داوای دەفریان کرد بۆ شێوی ئێوارە، ئەو سەتلەکەی خواردنەکەی نیوەڕۆی تێدابوو، دامە دەستیان، ئەوەیان رشــت و شــلەیەکی وەکو پیــازاوی تێکــرد، لەگــەڵ ســەموونێکدا خســتیانە ژوورەوە، سەموونەکەم پێوە خوارد. راکشــام و کەوتمە لێکدانەوەو خەفەتێکی زۆر دایگرتم، کە لەو دوو رۆژەو شەوەدا ئەو برادەرانەم بینی و نەمدەزانی چەندی تر گیراون؟ دەبێت وەزعیان چۆن بێت؟ چی گیرابێت و ئەم شــاڵاوەی گرتنە هۆیەکەی چی بێت؟ هەر چەند سێ و دووم دەکرد، تێــی نەدەگەیشــتم، ئەمە چی بوو؟ چــۆن بوو؟ کەوتمــە بیرکردنەوە لە حاڵــی (زەینەب و منداڵەکان)، دەبێت ئێســتا بارودۆخی ژیانیان چۆن بێت؟ لە ماڵی کێ بن و چۆن پەرتەوازە بووبن؟ منداڵەکان لە قوتابخانە دەبێت چۆن دەوام بکەن؟ بەخشــی لە موسڵ ئێســتا دەبێت حاڵی چۆن بێت؟ (کاکەم و محیدین) دەبێت چەند شــپرزەبن؟ چۆن هەڵپەیەك بکەن؟ خەمی زۆرم بــوو بــەوەی (زەینەب) چۆن ئەو نووســراو و نامەو راپۆرتانەی لە ماڵەوە لە شــوێنی تایبــەت دامنابوون، ئەو شــوێنەکانی دەزانێ چی لێکردبن و چۆنی گواســتبنەوە؟ دەبێت فریــای ئــەوە کەوتبێت تا بییانشــارێتەوە؟ لە ماڵی خۆمان دووری بخاتــەوە؟ ئیتر کەوتمە

بیرکردنەوەیەکی ئێجگار زۆرو دەیان شت بەمێشکمدا هاتوچۆیان دەکرد، لەلایەك خەمی زەینەب و منداڵەکان) لەلایەکی دیکە خەمی ئەو شتانەو لەسەر هەمووشیانەوە گرتنی برادەران بوونە کۆڵێکی گەورەو بەسەر دڵ و مێشك و بیرکردنەوەمەوە، بیرم لە (شەنگە)و تەمەنی دوومانگەی و تەندروستییم دەکردەوە، بیرم دەکردەوە زەینەب هەردەم لە نارەحەتیی و ناخۆشیدا ژیانی بەسەربرد، ساڵانێك من لە بەغدا، ساڵانێك پێشمەرگایەتی، پێنجوێن، بیارە، ئێران و ئۆردووگاو گەڕانەوەو ڕەوانەکردن بۆ خوارووی وڵات، پێنج ساڵ ئاوارەیی و گیرانم بە سەربازو دواجار جەیشی شەعب-ی و وا ئێستاش گرتنی من، کە گەورەترین کێشەو گرفت و ناخۆشیی ڕووبەرووی بووەتەوە، (حەوت منداڵ) یەکێك لە موسڵ، دووان لە شەش دەربچن دەبێت بچنە کولییە، دووان لە ناوەندیی (شێنێ) لە تەمەنی پێنج ساڵی و شەنگە) دوو مانگان، دەبێت ئێستا زەینەب لە چ حاڵ و وەزعێکی ناخۆشدا ژیان بەسەر بەرێت، کێ دەبێت لای لێ بکاتەوە...؟ چۆن سەروکاری منداڵەکان بکات...؟ ئەمانە هەر هەمووی لەدوای ئەو سەموون خواردنەوە بووبوونە فەرهەنگی شەوەکەم و لە دنیای بیرکردنەوەدا نقووم بووبووم، کاتێکمزانی زرەزری کلیل و زنجیر، رایەڵەی بیرکردنەوەی شڵەژاندم و بەر دەرگایان پێگرتمەوە، دەرگا هەڵگیراو بە پێلەقەیەك ئاگاداری کردم کە هەستمە سەرپێ، هەر هەستام توووند هەردوو چاوم بەسترایەوە، کەلەبچە وەکو دەروێشێکی حاڵی لێهاتوو بە هەردوو مەچەکما نووساو بە کەلەبچەکە پەلکێشی کردم، بە کێلا و پێلەقەو جنێودان دایمە پێش و ژووری ئەشکەنجەی بێ دەرگاو پەنجەرە. سەرپشك بە بەنارەزووی خۆت گیان و لەشم هەڵلووشە، ئەو شەوەش ژووری ئەشکەنجە کردی و من کردم، نە گیان دەردەچوو، نە دەتکوژن بەئێجگاریی و رزگارت بێت، نە وازیشت لێدەهێنن، لەم شەوەدا کە بردیانمەوە، لە ژوورەکە چاویان نەکردمەوە، ئەو پەرۆیەی بە چاومەوە بەسترا زۆر ئەستوور نەبوو، تارماییم لێوە دەبینی، رایان وەستانم، یەکێکیان هێنایە بەرامبەرم... لێیان پرسی، ئەوە؟ وتی: بەڵێ، ئەوە. کە گوێم لەم گفتوگۆیە بوو بۆم روانی. کەسەکەم ناسییەوەو لای خۆمەوە پەنجەم بەداخەوە گەست و هەناسەیەکی خەماویم هەڵکێشاو تێگەیشتم کە من بارم چەند قورسە، چۆن بار قورس نابێت کەسێك چەند ساڵ بێت بەیەکەوە کاری رێکخستن بکەیت، بە دەیان جار لە ماڵی ئێمەو ماڵی ئەوان کۆبوونەوەمان کردبێت... خێزانم بناسێت، یەك یەك منداڵەکانی ناسیبێت و وەزعی ماڵ و حاڵم بزانێت... لە زۆربەی کێشەکانم ئاگاداربێت، بەسەدان قسەمان لای یەك کردبێت، رۆژێك پێش دەستگیرکردنەکەم داوای وەرگرتنی زانیاریم لێکردبێت لەسەر ئەو پێشمەرگانەی کە کەوتنە کەمینی (عەلەلوتماسییەوە)، هەواڵی گیرابێتەوە کە ماون و لە ئەمنن... کەسەکە هاورێی بەناو کۆمەڵەو ئەندامی کەرت بێت لەگەڵتدا، چەندین جار لەو قوتابخانەیەی ئەوی تێدا مامۆستایە، شتمان تێدا شاردبێتەوە... بەڵێ، ئەو مامۆستا نا مامۆستایە (ش) بوو، هەر ئەو چاکەتەی لەبەردابوو، کە هەموو جار پێوەی دەهات بۆ ماڵمان، چەندم

لاقـورس و گـران بوو، كه وتی: بەڵێ ئـەوە، ئەو (ش)، لەكاتی خۆیدا لـە قۆناغی ناوەندیی بەیەكەوە دەمانخوێند... لەدوای هەرەس و لە سـاڵی ١٩٧٦-دا، لە قەزای حەیەوە بەسەردان گەڕابوومەوە بۆ سلێمانی، ڕۆژێك لەگەڵ (مامۆستا جەمال تاهیر) لە كۆڵانەكانی كانێسكان بەیەكەوە پیاسـەمان دەكرد، باسی شۆڕش و بارودۆخەكەمان دەكرد، لەكاتێكدا ئیشەكانمان بە پیاسـەكەوە تەواوكرد، لەلای مزگەوتی قامیشـانەوە هاتینە سـەر شەقامی كانێسكان، لووتمـان تەقـی بەلووتـی (ش)دا... هەردووكمانـی دەناسـی سـڵاوێكی لێكردیـن و وەڵامماندایەوە، مامۆستا جەمال وتی: دەیناسیت؟ وتم: بەڵێ، لە قۆناغی ناوەندیی بەیەكەوە دەمانخوێند. وتی: ئەمە ئێسـتا شـینە بەعسـییەكی زۆر خراپە، یەكێكە لەوانەی كە لە قائیمەی نەقابەی مامۆسـتایاندایە، ساڵ هات و ڕۆیی و لە سـاڵی (١٩٨٠)دا من گەڕامەوە سـلێمانی، سـەرقاڵی كاری ڕێكخسـتنی نهێنی بووم لـە ڕیزەكانی كۆمەڵـەو یەكێتیی مامۆسـتایاندا، لەدوای سـاڵی (١٩٨٦)ەوە، گۆڕانكارییەك لە ڕێكخستنەكان و هەندێك لە هاوڕێیـان ئاڵوگۆڕیـان پێكرا، هەندێك بەش و پۆل و شـانە بەرپرسـەكانیان گۆڕدرا، من ڕاسـپێردرام كە هاوڕێیەكی نوێ كە ژمارەیەك هاوڕێی لایە ببینم و لای خۆم ڕێكی بخەم و كاری لەگەڵـدا بكەم، كە چووم بۆ بینینی بەپێی ئەو پەرلەیەی دانرابوو، كەسـەكە (ش) بوو، كە بینیم خۆم لێ گێلكردو پەیوەندیم پێوە نەكرد، دواجار ناچاركرامەوە كە پەیوەندیی پێوە بكەم و لای خۆم ڕێكی بخەم، جا من ئەوكاتە لەو برادەرە دەترسـام، ترسـەكەم لەجێی خۆیدا بوو، قسـەكەی مامۆسـتا جەمالی ڕەحمەتی ڕاست بوو، ئەو شینە بەعسی بوو، چۆن خزابووە ناو ڕیزەكانی ڕێكخسـتنەوە، ئـەوە چیرۆكێكی دوورە. بۆیە لێـرەدا كە ئەوم بینی مێشـكم خەریك بوو دەتەقی، لە ناخی خۆمەوە سـەد تفم لەو جۆرە بەناو مامۆستایەو ئەو كەسە دەكرد، كە لەكاتی خۆیدا نا مامۆستایەكی وای وەرگرتووە، خزاندوویەتە ناو ڕیزەكانی كۆمەڵـەوە، دوای ئـەوەی ئەو ئەمنانـەی دڵنیا كرد كە من كێم، ڕۆیشـت و ئینجا چاویان كردمـەوە. ژوورەكـە ژووری دانیشـتن و لێكۆڵینەوەی ماجد بوو، لەسـەر كورسـییەك دایاننام.

ماجد وتی: (محەمەد) ئێمە مەعلوماتی تەواومان لەسەر تۆ هەیە، هەموو بەڵگەكانمان لەبەردەسـتدایە، قسـەنەكردنت و وەڵامدانەوەمان بـە نازانم لێت قبـووڵ ناكەین، ئەگەر ڕاستییەكانمان بەدەمی خۆت پێ نەڵێیت، ئێمە زۆر خراپتر لەگەڵدا دەكەین، حەز ناكەین ئەوەنـدە ئازارت بدەیـن، ئێمەش ئەوەندە ماندوو مەكە، هاوڕێكانت هەموو شـتیان وتووە، لەسـەر تۆش هەموو مەعلوماتێكی ڕاسـتیان داوە... خەیاڵ مەكـە، كەس لێرە فریای تۆ ناكەوێـت، تەنهاو تەنها خۆت نەبێت، كە ئەوەی دەیزانیت پێمان بڵێیت! بۆئەوەی بتنێرینەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەكانت، پێم وتن: ئێوە هەرچی دەزانن و كێ چی وتووە لەسـەرم و چیتان لە بەردەسـتدایە لەسـەر من، ئەوە پەیوەندیی بە منەوە نییە، مـن نازانم كێ مەعلوماتی لەسـەر من داوەو یان قسـەی لەسەر كردووم، من خۆم خۆم دەناسـم ئەوانەی ئێوە بەگوێی

مـنیدا دەدەن، هیچی راسـت نییە، ئاگام لەهیچ کارێکی لەوجۆرە نییە، نە کەس دەناسم، نە کارێکم دژی حکومـەت کردووە. ئەگەر بەزۆریش بتانەوێت تاوانبارم بکەن، ئەوە دەکەوێتە سەر ویژدانی خۆتان، خواش لێتان قبوول ناکات بەخوت و خۆرایی تاوانبارم بکەن.

راوەسـتا تا قسـەکانم تەواوکرد، لەپڕ وەکو فیشەکە شـێتە راپەڕی، هەستایە سەرپێی، قمـستی دەکرد لەو شـوێنەدا بە ناخی ئەرزدا بمباتە خوارەوە، تاهێزی تێدابوو یەك شەق و زلـەی لێدام، گالی جەندرمەکانـی دا، هەر ئەوەندەم خۆش بوو، لەو ژوورە دەریانکردم، بە دەردی شـەوانی پێشووترو زۆر خراپتریان پێکردم، ناکرێت هەموو جارێ ئەو زرمە زلیێەیان بگێرمـەوە. هەر ئەوەندە دەڵێم تا لە پەل و پۆیان نەخسـتم وازیان لـێ نەهێنام بەو ئازارو شـەکەتی و کەنەفتەییـەوە بردیانمەوە ژوورەکە، وەکو هەموو جارێـك پێیان راگەیاندم ئاو نەخومەوەو یاریی بە دەسـتەکانم بکەم، هەر گەیشـتمەوە ژوورەکە، لەتاو ئازاری باڵ و شان و گیانـم کەوتـم بە ئەرزاو خۆم راکێشـا، زۆرم تینـوو بوو، ئاو نەبـوو بیخۆمەوە، هەندێ جارم بە دەستەکانم کردو لێی راکشامەوەو نووستم، بەڵام زوو زوو بەهۆی ئازاری گیانمەوە حەبـەرم دەبـووەوە، بەیانی جەولەی چوونە سـەر ئاو و بەناو دەموچاو شـۆردن و بەرچایی دەستی پێکردەوە، دوای چەند سەعاتێك دوای بەرچایی کاتێك خواردنیان هێنا، زانیم دیسان نیوەرۆیە، دوای نیوەرۆ زۆری پێنەچوو بەچووق و مۆسیقای زنجیرو کلیل بانگیان کردمەوە، گەیاندمیانەوە ژووری لێکۆلینەوە... هەر چاویان کردمەوە لە بەرامبەرم (ش) راوەسـتابوو، بێشەرمانە وتی: (کاکە شیخ) ئەوانەی کە بەیەکەوە کردوومانە، ئەو برادەرانەی کە لامانن لە کورو کچ پێیان بڵا، چونکە ئەمان هەموو شـت دەزانن و بەڵگەی تەواویان لایە، حەز ناکەم وا لە خۆت بکەیت و (کاکە شـێخ) بۆ کێی دەکەیت؟ مندالەکانت کێ لایان لێدەکاتەوە؟ چ حزبێك لە بەعس باشـترو پێشکەوتووترە؟ چ حکومەتێك لەم حکومەتە دلسۆزتری مللەتی کـوردە؟ تکات لێدەکەم با ئەوەندە ئازار نەدرێیت، ئەوەی داوات لێدەکەن پێیان بلێ، ئەمان زۆر بـە بەزەیین، ئەگەر راسـتیان پێ بلێیت دلنیابە بـەرت دەدەن، وەکو من، منیش گیرام، چونکە راسـتییەکانم پێوتوون، بەریاندام. وتم: چیت پێ بلێم، باشـە من کەی تۆم ناسیوەو کەی رۆژێك لە رۆژان لە یەك شـەقامدا بەیەکەوە رۆیشتووین؟ ئەم قسانە چییە دەیکەیت؟ عەیب ناکەیت؟ لام سـەیرە چۆن مامۆسـتایەکی...؟ بە پێکەنینەوە وتی: من دلم بە خۆت و زەینەب خان و مندالەکانت دەسـووتێت، تکات لێدەکەم بەگوێم بکە، رقم هەسـتاو وتم: داوەشـێیت نەدیونەناس لە بەرامبەرمدا قووتبوویتەتەوەو قسـەی نابەجێ دەکەیت. ماجد زانی قسـەکانم توورەیی پێوە دیارە، یەك کێبلی بە سـەرمدا کێشـاو جنێوێکی خەسـت و خۆلی پێدام و (ش)یان بردو گالیدا، وتی: بیبەن وەکو سـەگ بیتۆپێـنن، ژووری گیانکێشـان خۆت بگرەو هێنامیانەوە، بەهەمان شێوەی جارانی تر تا بێزاربوون بێزاریان کردم و لەهۆش خۆم چووم، کاتێك هۆشـم هاتەوە (جومعە) راوەسـتابوو، پەلێکی گرتم و هەلیسانم، وتی: تا کەی وا دەکەیت؟ مردین ئەمەندەمان هێنایت و بردی بۆ قسـە ناکەیت؟ خۆت و ئێمەش

نەجات بدەیت!! چی وەڵامی جومعە بدەمەوە؟! کۆیکردمەوەو کەلەبچەیان توندکردو چاویان شەتەکدام، بە کێڵ و شەق و پاڵنان بردیانمەوە بۆ ژوورەکە، مردنم بە ئاوات دەخواست، بە مۆسیقا ناخۆشەکەی کلیل و زنجیر دەرگاکردنەوە بۆ سەر ئاو، زانیم ئێوارەیە. جار لەگەڵ جار لەسەر ئاودا خراپتریان لەگەڵدا دەکردم، دوای ئەو جەولەی سەراوە، پاش تۆزێ سەموونێك و هێلکەیەکیان دامێ، برسیم بوو، هێلکەو سەموونەکەم خوارد، بەلامەوە خواردنێکی خۆشبوو.

# مەرگەساتی شەوێکی دیکە

دوای چەند شـــەوێك، گواســـتیانمەوە بۆ ژوورێکی ئینفرادیی هەر لەو شوێنە، کەیەکێك لەهاورێکانمـــی تێدابوو، من وامزانی ئیتر لەو ژوورە بەتەواویی دەمگوێزنەوە بۆ ئەم ژوورەو پێمخۆشبوو، لەو شوێنە پیاو هاودەنگێکی هەبێت خۆشترە، دوای کەمێك دانیشتن پێکەوە، کەوتینە قسەکردن و گەردەشەی ئەو حاڵەی وا رووبەڕوومانبووەتەوە... لەو بارەیەوە قسـەمان کردو باســـی چۆنێتی گرتنەکەی بۆ کردم، ماوەی نیو سەعات زیاتر بەیەکەوە ماینەوە، هاتن جیایانکردینەوەو منیان دەرهێناو ئەویان هێشتەوە، بەهەمان شێوەی جارەکانی دیکە چاویان بەســـتمەوەو کەلەبچەیان کردم و دایانمەوە پێش و بردیانمەوە بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، چاویان کردمەوە لەســـەر کورســـییەك دایاننام، (ماجد) وتی: چوویتە لای برادەرەکەت، حەز دەکەم بزانیت ئێمە هەموو مەعلوماتێکمان لەسەر تۆ لەبەردەستدایە. ئینکاریکردن هیچ سوودێکی نییـــە، ئێمە دەزانـــین هاورێکانت کێن و چین و لەکوێن. لەمـــەودوا ئیتر لێت قبووڵناکەین، بەشـــێوەیەکی دیکە مامەڵەت لەگەڵدا دەکەین، دەی قسـەمان بۆ بکە. پێمان بڵا پەیوەندیت لەگـەڵ کێدایە؟ ئەوانەی کۆبوونەوەت پێکردوون، کێ بـوون و ناویان چییە؟ پلەی حزبیت چییە؟ کێ دەناسی لەســـەروو خۆتەوە، مانگانە ئابوونەت چەند داوە؟ لەم جۆرە پرسیارانەی کردو وتی: (جەبار) چی وت بیاننووسە.

وتـــم: ئێـــوە دەتوانن گوێم لێبگرن؟ وتیان: بۆ نـــا...، دەی وا گوێت بۆ دەگرین. وتم: من وەکـــو جارەکانی دیکە پێم وتوون پەیوەندیم بەهیچ لەو کەســـانەوە نییـــە کە بەرەو رووتان کردوومەتەوە، (ش) هەر ناناســـم. (*) لە حەفتاکاندا لە بەغدا لە بۆنەیەکدا یەکمان ناسیوە، لەو کاتەوە نەمدیوەتەوە، ئەویش منی نەبینیوە. من پێنج ســـاڵ لە جنوب بووم، یەك دەزگا گلەیی لێم نەبووە، وەکو مامۆستایەك واجب-ی خۆم بینیوە، وا چەند ساڵیشە هاتوومەتەوە، وەکو مامۆســـتاو بەڕێوەبەر ئەرکی سەرشـــانم لە خزمەتی حکومەتدا جێبەجێکردووە، من ســەرســـامم بۆ منتان گرتووە؟ بەم شـــێوەیەم لەگەڵدا دەکەن؟ خۆم بە تاوانبار نازانم، چونکە هیـــچ کارێکی خـــراپ و دژ بە حکومەتم نەکـــردووە. ئەگەر هەر بتانەوێـــت بەزۆر بمکەنە تاوانبـــار، ئەوە ئـــارەزووی خۆتانە. من لەبەردەســـتی ئێوەدام و هیچ دەســـەڵاتێکم نییـە، بە ئـــارەوای دەزانم و خـــوا لێتان قبووڵ نـــاکات وام لەگەڵدا دەکەن. ئەمە چەند رۆژو شـــەوە هەرچی خراپە لەگەڵتانا کردووم، چیتریشـــم لەگەڵدا دەکەن، ئارەزووی خۆتانە، دەتوانن هەر ئێستا بمکوژن زۆر حەزیش دەکەم ریزێك فیشەکم پێوە نێن و بەم شێوەیەم لەگەڵدا نەکەن، گوێیان گرت تا لە قسەکانم بوومەوە، دایانە قاقای پێکەنین بەگاڵتەجارییەوە وتی: دەیەوێت بمانخەلەتێنێـــت! خۆیمان لێ غەشـــیم دەکات! وا دەزانێت بەم قســـانەی دەڵێین ئامین. ئیتر وازی لێدەهێنـــین، ماجد وتی: ئێمە بەزەییمان پێتا دێتەوە! ئەوەی ئەم چەند رۆژە کردوومانە

لەگەڵتدا، حەلواخواردن بووە، بزانــە لەمەودوا چیترت پێدەکەین، چۆن گیانت دەر دەکەین، بانگــی (جومعەو حەمەی) کرد وتی: بیبەن دەمەوێت بەتەواویی گیانی دەربکەن، بە جەباری وت: لەگەڵیدا بچۆ بە بێدەنگییەکەی تێ مەکەوە، بەزەییت پێدا نەیەتەوە. پەلامارددرامەوەو ژووری ئەشکەنجەدانیان بۆ واڵاکردم، هەڵواسین، هەڵواسین، کاتێکمزانی ماجد پەیدابووەوە، نــاردی (*)یان هێنا بەرەو رووی یەکــتر رایانگرتینــەوە هیچمان قســەمان نەکرد، گالیاندا هەردووکیان بەیەکەوە هەڵواسن، هەڵیانواســین لە هەڵواسینەکەماندا هەردووکمان سەیری یەکمان دەکردو پێدەکەنین کە زانییان بە هەڵواسینشــیمان کەڵك وەرناگرن، ئەویان داگرت و بردیانەوەو منیش بەهەڵواســراویی مامەوە. منیش خۆم کرد بەمردوو... ئەمجارە ئەوەندە ئازارو ئەشــکەنجەیان دام بەهەڵواســین و کێبڵ پیاکێشــان و کارەبا لێدان... بەراســتیی بوورامەوەو دەڵم لەســەرخۆی چوو، ئیتر نازانم چۆنیان داگرتبووم کاتێك هۆشــم هاتەوە لە ژوورێکدا رایانکێشابووم، ئاویان بەسەرما دەکرد، قاچ و دەستیان دەجووڵاندم، چاوم هەڵبڕی (جومعەو حەمە) بەســەرمەوە راوەستابوون، جومعە وتی: ها ئەمەت پێخۆشە؟ هەڵیانــاندم و کەلوپەلیان لەبەرکردمەوەو لەسەر کورسییەك دایاننام، ماجد هات، ئەمەت حەز لێبوو؟ بە قسەمان ناکەیت؟ هێشتا لەکوێتە. بردیانمەوە، ئەم هێنان و بردن و ئەشکەنجەدان و راو و رێــوی خوێندنەوەیەو کارەبا لێدانە وەکو بزانم زیاتر شــەش تا حەوت رۆژی خایاند. کە بە بەردەوامی بە رۆژو بە شەو لە هێنان و بردنمدا بوون. دەیانویست بەو شێوە ئەشکەنجەدانەو بەو شــەڕی دەروونیی و هێنان و بردنە کارم تێبکەن و بەئارەزووی ئەوان هەر چییان دەوێت بۆیان هەڵڕێژم، منیش لای خۆمەوە بڕیاری ئەوەم دابوو، ئەگەر گیانیشــم بکێشــن، بەهیچ جۆرێــك ســەرەداوێکیان پێ نەڵێم و نەڵێم و نەڵێم، بۆیە ئــەو رۆژانە ئەوان کردیان و من و ئازارو ئەشکەنجەو شــەڕی دەروونیی کردم، بۆیە ئەو رۆژانە لە بانگکردن و ئەشکەنجەدانم خــاو نەدەبوونەوە، پەیتا پەیتا بانگدەکرام، شــەوێکیان کە بانگیان کردم و بردیانمە ژووری لێکۆڵینــەوەوە، چاویــان کردمــەوە، (ش)یان هێنایــە بەرامبەرم و رایانگــرت، کە کەوتە قســەکردن و لە قسەکانیدا ئامۆژگاریی دەکردمەوە، باسی خێزان و منداڵەکانی بۆ دەکردم، کە لەوکاتەوەی من گیراوم ئەوان چەند شــپرزەو بێکەســن و کەس لێیان ناپرسێتەوە... پێی دەوتم: ئێمە هەڵەبووین لەگەڵ ئەوانەدا ئیشــمان کرد، لەدژی ئەم حکومەتە نیشــتمانییە، فەرموو ئەوە تۆ گیراویت کێ فریای منداڵەکانت دەکەوێت؟ من زۆر هەوڵمداوە کە بیانبینم و یارمەتییان بدەم وا خۆیان شاردووەتەوە، نەمتوانی بیانبینمەوە، بۆیە تکات لێدەکەم لەمە زیاتر با ئازارت نەدەن، کە بەم شێوەیە دەتبینم خەریکە گیانم دەرچێت، ئاخر تۆ بۆ وا لەخۆت دەکەیت؟ وتی: ئەمان چییان دەوێت پێیان بڵێ... تۆش نەیڵێیت ئەمان هەموو شت بەباشی دەزانن، دەزانن تۆ بەرپرســی چی بوویت و کێ بوویت، ناوی (کەرتی شەهید لەیلا)و هەندێ لە ناوە نهێنییەکان و ناوی یەکێکیانی بەناو هێنا، دوایی ناوی یەکێکی دیکەی هێنا کە لە پۆلێکی دیکە لەگەڵمابوو، وتی: دەزانن لەکوێیە، جا باشتر ئەوەیە بۆ ئەوەی چیتر ئەشکەنجە

نەدرێت، هەر ئەوانەیان پێبڵێ ئیتر وازت لێدەهێنن، من بەڵێنم لێوەرگرتوون کە یارمەتیت بدەن و ئازادت بکەن، ئەو شەوە بەتەواوەتی تێگەیشتم کە ئەو تاوانبارە، بەهۆی ئەوەی کە بەیەکەوە کارمان دەکرد، لە کۆبوونەوەکاندا، راپۆرتی پۆل و کەرتی شەهید لەیلامان دەخوێندەوە، ناوی زۆربەی زۆری برادەرەکانی دەزانی و دیاربوو هەر هەمووی پێدابوون، لە قسەکانی بووەوە، (ماجد) وتی: گوێت لێبوو؟ ئەو پیاوە چەند بەدڵسۆزیی قسەی بۆ کردیت، چەند لە خەمی تۆدایە؟ وتم: گوێم لێبوو، بەڵام من ئەو کەسە نە دەناسم و نە دەزانم باسی چی دەکات، ئەوەی ئەم باسی دەکات من هەرگیز لێی ئاگادار نیم، کەسێکی واشم لە ژیانمدا نەناسیوەو کە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەم، ئەو چی دەڵێت بۆ خۆی وتی و با هەزار قسەی وام بۆ بکرێت، من گوێی لێناگرم، چونکە پەیوەندیی بە منەوە نییە.

(ش) وتی: چۆن وا دەڵێیت (من ناناسیت)؟ لەگەڵ مندا کارت نەکردووە؟ کەوتە گێرانەوەی چەند کارێك کە گوایە بەیەکەوە کردوومانە، زیاتر پێی لەسەر درکاندنی زانیارییەکان داگرت و چەند ناوێکی دیکەی هێناو وتی: من خەریکە بۆ ئەم حاڵەت ئاگرم تێ بەردەبێت، تکات لێدەکەم خاوەنی خێزان و منداڵیت و سەرگەردانیان مەکە، بە قسەی ئەم پیاوانە بکە، ماجد وتی: سوپاس و ئافەرین، من وەڵامم نەدایەوەو هیچ قسەیەکم نەکرد، ئەویان بردو من مامەوە، ژوورەکە ژووری لێکۆڵینەوە بوو، ماجد کەوتەوە قسەکردن، لەسەرخۆو بەجۆرێك ئامۆژگاریی دەکردم گوایە دڵسۆزە بۆ من، درێژەی بەقسەکردن داو وتی: بەڵێنت دەدەمێ کە ئەگەر بەقسەمان بکەیت و ئەوی داوات لێدەکەین بەراستیی پێمان بڵێیت، ئایەڵم دووشەوی دیکە لێرە بیت و بەرت دەدەین، ئەو پیاوەش لە بەرژەوەندیی تۆ قسەکانی کردو حەزدەکەم بەگوێی بکەیت، ئەو پیاوە پیاوێکی نیشتمانپەروەرو دڵسۆزەو زۆر خەمی تۆیەتی، وتم ئەو پیاوە لەخۆیەوە قسەدەکات و چۆن دەڵێت بابڵێت، من کارم بەو نییە، کەوام وت، وەکو فیشەکە شێتە هەڵبەزییەوە، وتی: ئەوەی قسەی بۆ کردیت لەگەڵ خۆتدابووە، چەند ساڵە بەیەکەوە لەدژی حکومەتی نیشتمانیی کاردەکەن، وتی: ئێستا دەڵێی چی؟ راستیمان پێدەڵێیت یان نا؟ هیچ راستییەکم لا نییە بەو شێوەیەی کە ئێوە دەتانەوێت، بانگی (جومعەو حەمە)ی کرد، وتی: بیبەن ئەمشەو یان ئێمە دەبین یان ئەمە، دەبێت وەکو سەگ بیتۆپێنم.

بردیانم و بە قادرمەیەکدا بردیانمە خوارەوە، چەندجار سەرسمم داو هەڵکەوتم و کاتێکمزانی بە قادرمەیەکدا بەپەلە سەریانخستم و بردیانمە ژوورێك، یەکەمجاربوو، بمبەنە ئەم ژوورە، چاریان کردمەوە، رووتیان کردمەوە، بە کێبڵ، ئەوەندەی توانایان بوو کوتییانم، ماجد هات وتی: کۆڵی لێمەدەن و مەیەڵن یەك دەقیقە بحەوێتەوە، هەموو گیانی بشکێنن، بەنۆرە لێیان دەدام، فەلاقەیان دەکردم لەبنی پێمەوە تا تەوقی سەرم ئەوەندەیان لێدام و فەلاقەیان کردم لەهۆش خۆم چووم، لەراستیدا هیچ ئاگام لەخۆم نەما، بە رژاندنی سەتڵێك ئاوی سارد بەسەر گیانمدا داچلەکیم، چاوم کردەوە ماجد وتی: سەتڵێکی دیکەی پێدا کەن، سەتڵێکی دیکەیان پیداکردم بەو ئاوپیاکردنەدا، هۆشیان هێنامەوەو راستیانکردمەوە. سەتڵی ئاوی دیکەیان

بەسـەرما کرد، لە سەرماندا هەڵدەچۆقیم خەریکبوو ڕەق بمەوە، دانەکانم یەکیان نەدەگرت. ماجد وتی: هێشتا لە کوێته ئەمشەو کۆتایت پێدەهێنن، نابێت جاریکی دیکە منداڵەکانت ببینیتەوە، بەقسەمان مەکە، بەو قین و قارەوە، بەو ڕووت و قووتی و گیان تەڕییەوە، بە کێبڵ تێم بەربووەوە، تا توانای هەبوو لێیدام و جومعە لە دەستی وەرگرت و ئەویش بەردەوام بوو، بەو حاڵەوە لەو ژوورەوە گواسـتیانمەوە بۆ ژووری ئەشکەنجەی یەکەم، ئەوەندە هەڵیانواسیم و کارەبایـان لێدام، دیسـان بوورامـەوەو لەهۆش خۆم چوومەوە، کاتێك هۆشـم هاتەوە لە ژوورێکی بچووك ڕایانکێشـابووم... (جومعەو حەمە) بەسەر سەرمەوە وەستابوون، کە چاوم هەڵبڕی (جومعە) وتی: چەندت پێ دەڵێین بە قسەمان ناکەیت؟ بزانە چیت بەخۆت کرد، ئەم حاڵە باشـە؟ وتم: زۆر باشە ئەوپەڕی بەم حاڵەوە دەمرم، مردن خۆشترە لەم حاڵە، لەڕاستیدا تەواو تەواو شپرزەبووم، باری تەندروستی گیانم تەواو خراپ بوو... ئەو شەوە تێگەیشتم ئەو زانیارییانەی کە لەسـەر برادەرانی (پۆلی شـەهید جەعفەرو کەرتی شەهید عەزیزو کەرتی شەهید لەیلا) هەر هەمووی لەلایەن ئەو تاوانبارەوە درابوو پێیان.

دوای ئـەوەی گیانم هەندێ هێوربووەوە، ڕاسـتیانکردمەوە جلەکانیـان لەبەرکردمەوەو کۆیانکردمەوە، کەلەبچەکەیان کردەوە دەستم و چاویان بەستمەوە، دایانمە پێش، نەیانبردمەوە بۆ ژوورە ئینفرادییەکە، بردیانم لەبەردەم ژوورێکدا ڕایانگرتم، کەلەبچەکەو چاویان کردمەوەو دەرگای ژوورەکەیان کـردەوەو فڕێیاندامە ژوورەوە، ژوورەکە پێیان دەوت (قاعە) یان ژووری (دوو)، دیاربوو بۆیە بردیانمە ئەو ژوورە، لەبەر ئەوەبوو، ئەوەندەیان ئازارو ئەشکەنجە دابووم، چیـتر نەمدەتوانی لە ژوورێکی ئینفرادیدا بەتەنها بژیم، بۆیـە بردیانمە ناو ئەو زیندانییانە بۆئەوەی بەپیرمەوە بێن و یارمەتیم بدەن.

# لە ئینفرادییەوە بۆ ژووری (٢)

هـــەر فرێیاندامە ژوورەوە، (جومعە) بە زیندانییەکانی ناو ژوورەکەی وت: ئاوی مەدەنیێ، باڵ و شان و ملی بشێلن و وەرزشی پیێ بکەن... بە گەیشتنم بۆ ناو ژوورەکەو داخستنەوەی دەرگاکـــە، زیندانییەکان، لیێـم کۆبوونەوەو پەلاماریان دام، بردیانمە ناوەراســتی ژوورەکە، یەکێکیان لەسەرخۆ دەستیکرد بە شێلانم و وردە وردە باڵەکانی دەجووڵاندم، بەدەم شێلانەوە پرســیاری لێدەکردم، کەی گــیراوم؟ لەکویێ گیراوم؟ بە تۆمەتی چی گیراوم؟ ناو و پیشـــەی ئیپرسیم، پیشەکەم پیێ وت: وتم چەند رۆژێکەو لەناو قوتابخانەکەمدا گیراوم، نازانم لەسەر چی گرتوویانم، دەمی خســـتە بناگوێم وتی: مامۆستا تیگەیشتم، گرتنەکەی تۆش هەروەکو گرتنەکەی ئیمەیە، وتم: ئیوە لەســـەر چی گیراون؟ وتی: لەســـەر سیاسەت، مەترسە، من (لە پیشمەرگەکانی مەفرەزەکەی هەورامانم) داچلەکیم، مەفرەزەکەی هەورامان؟ ئەوانەی لەگەڵ حەمە ســیاســین؟ وتی: بەڵێ، بەڵێ. وتم: ماون، وتی: ئا... ئا...، ئەی ئەوە نییە ماوین. ئەوە منم ناوم (فەخرەدینە) ئەوە (کاکە حەمەیە) ئەوە (دکتۆر مەحمودە) ئەوە (ســەرکەوتە) ئەوەش (کەمالــە) هەرهەمووومان زرت و زیندوو ماوین. یەکێکی دیکــە لیێم نزیکبووەوە، ئەویش کەوتە شــێلانی پشــت و گیانم، دەمی خستە بناگوێم وتی: مامۆســتا منیش (عەتا)م، واتە هاوریێ (زانا)، کورەکەی (حاجی ئەحمەدم)، وتم: (عەتا) ئیوەش ماون، وتی: مامۆستا... ئا... ئیمەش ماوین و زۆر باشــین... یەکێکی دیکە لە زیندانییەکان، هەر سەرنجی دەدام و وردە وردە لیێم هاتە پیشەوە، وتی: ئەریێ تۆ (شیخ محەمەد) نیت؟ وتم: کام. وتی: (شیخ محەمەد بەرزنجی) کە کاتی خۆی لە بەشــی کوردی کۆلیژی ئادابی بەغدا بوویت؟ وتم: بەڵێ، ئەوم؟ ئەی تۆ کییت؟ وتی: من (حەسەن عوسمان)م، ها ئەوکاتە لە کۆلیژی وەرزش بووم، بەردەوام سەردانی یەکمان دەکرد، زۆر کارمان بەیەکەوەبوو، ئەویشم ناسییەوە.

(فەخرەدین) لیێی پرســـیم مامۆســـتا بۆ وات لیهاتووە؟ زۆر ماندوو دیاریت، وەزعت زۆر خراپ دیتە بەرچاوم. وتم: کەســێك بکەوێتە بەردەست ئەم ســەگبابانە چۆن باش دەبێت... نازانیت لەو رۆژەوەی گیراوم چی بە من دەکەن؟ بە شــەو و بە رۆژ مۆڵەتیان نەداوم، ئەوەی ئەمانــە بەمنیان کردووە، بــاوەر ناکەم لە دنیادا بەکەس کرابیێت، بە لیێدان و هەڵواســین و کارەبالیێدان و فەلاقەکردن...

وتی: مامۆســـتا کە هەڵتدەواســن تۆ چی دەکەیت؟ وتم: چی بکەم؟ چەند هەڵمدەواســن قسەناکەم و نقە لەخۆم دەبرم. وتی: هاواریش ناکەیت؟ نەوەڵلا، هاواریش ناکەم، هاواری چی بکەم ئەمانە گویێ بە هاوارکردن دەدەن؟ نەوەڵلا، نە هاوارو نە قســـە ناکەم. وتی: مامۆستا ئەگەر وا بکەیت و وا بروات هەر بە ئەشکەنجەدان لیێرە دەتکوژن، لەمەودوا کە بانگیانکردیت و هەڵیانواسیت، هەر کەلەبچەکە گەیشتە قوولاپەکەو میزەکەیان لەژیریپیێت لابرد، یەکسەر

دەســـتبکەرە هاوارو هاواربکە بەدەنگی بەرز. کە واتکرد دەترســـن و یەکسەر داتدەگرن. ئەو شـــەوە دوای ئەوەی یەکەیەکە قۆڵ و شـــان و گیانیان بەباشی شـێلام، دوای ماوەیەکی زۆر، ئاویاندامـــێ، لێم کۆبوونەوە هەریەکە جۆرە پرســـیارێکیان دەکرد، هەریەکە لە شـــتێکیان دەپرسی، منیش پرسیاری زیندانییەکانم کرد، بۆیان روونکردمەوە، کە لە گیراوەکاندا هەیانە لەسەر یەکێتیی و هەیانە لەسەر حزبی شیوعی و هەیانە لەسەر حسك گیراون... (فەخرەدین) وتی: ئیرەیان کردووە بە (جەبهەی کوردستانی) ئەو برادەرانە، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر بوو گیرابوون، هەموو جۆرەکانی ئازارو ئەشـــکەنجەدرابوون. بەتەواوی شارەزاییان لەناو ئەمندا پەیداکردبوو، بووبوونە خاوەنی ئەزموون و دەوری مامۆســـتاو شارەزایان دەبینی، رێنماییان دەدا بە تازەگیراوەکان، (فەخرەدین) کە ئەو رێنماییانەی کردم، هەرچەندە من مامۆســـتابووم، بەڵام من مامۆستای خوێندکاران بووم لە دەرەوەی ئەمن، بەڵام ئەو بووبووە مامۆستای من لەناو ئەمندا، بۆیە لەو ئامۆژگارییانەی زۆرزۆر کەڵکم وەرگرت، کاتێك کە بانگیاندەکردم، بەپێی رێنماییەکانی ئەو یەکســـەر هاوار هاوارم بەدەنگی بەرز دەستپێدەکرد، ئەوانیش وەکو ئەو وتی، یەکســـەر دایاندەگرتم. بەم رێگایە زۆر ســـوودمەندبووم، هەڵواســـینەکان زۆریان ماندوو نەدەکردم، لەبەرئەوەی زوو دادەگیرام.

ژووری دوو ژوورێـــك بـــوو بەناو ئینفرادیی نەبـــوو، بەڵام لـــە زۆر رووەوە لە ئینفرادیی ناخۆشـــتربوو، ژوورەکە (٥×٣)بوو، ئاودەســـتێکی تێدابوو، دەرگای نەبـــوو، بەتانییەکی بۆ کرابوو بـــە دەرگا، یەك پەنجەرەی هەوایـــی تێدابوو، ئەویش ســـاحیبەیەکیان تێدا دانابوو، گڵۆپی سەدی لە بنمیچی ژوورەکە بە بەردەوامی دەسووتا. (کەمال) شوێنەکەی لەپاڵ دیواردا بوو. کە من چووم شـــوێنەکەی خۆی دا بە من، وا رێکخرا، کە من و ئەو لەلای یەکەوە بین و بەیەکەوە بنوویـــن، لە ژوورەکەدا بەتانی دووقات راخرابـــوو، دوو قات داخرابوو، زۆربەی زیندانییەکان ســـەرو بەتانییان هەبوو، بۆ خۆداپۆشـــین... تەنها منو کەمال یەك بەتانیمان هەبوو. بەتانییەکەمان خۆشـــبەختانە دووکەســـییەکی گەورەی ئەســـتووربوو، سەرینی ژێر سەرمان پێلاو قەمسەڵەو کارتۆنی تەبەقی هێلکە بوو. بۆ نانخواردن دوو دوو و سێ سێ تا چوار چوار بەیەکەوە دانرابوون، منیان خستە لای (کاکە حەمەو سەرکەوت و د.مەحمود)، واتە بووینە چوار کەس. یەکەم شەو بەهۆی بینینی ئەو برادەرانەو قەرەباڵغی ژوورەکەوە، ئازاری گیانـــم بیرچووەوە، زۆر دڵم خۆشـــبوو، لەکاتێکدا لە ئینفرادیـــی دەمم بۆ گەنی دەکرد، خۆم جارجار دەســـتم دەجووڵاند، لەم ژوورە زیندانییەکان دەبنە کورو براو لەوان زیاتر بەدەنگتەوە دێن، خزمەتت دەکەن، یارمەتیت دەدەن. هەر ئەو شەوە (مامۆستا حەسەن) باسی جەماعەتی (حســـکی) بۆکردم، منیش باســـی ئەوەم بۆ کرد، کە ئەو شەوەی بۆ بەیانی کە گیرام لە ماڵی (حەمدی برای نیزامەدین گلی) بووین.

ژووری دوو بـــۆ مـــن جۆرێك بوو لە حەوانـــەوە، لەبەرئەوەی لـــە ژوورێکی بچووکی زۆر ناخۆشـــەوە کە تەنها بەیانییان و ئێواران دەریان دەکردم بۆ ســـەراو لەکاتی دەرکردنیشـــدا،

زۆر پەلەیـــان لێ دەکردم، لـــەم ژووره ژمارەیەکی زۆر زیندانیی تێدابوو، ئاودەســـتی لەناو خۆیدابوو، ئاو هەبوو، بەشەو و بە رۆژ لەگەڵ ئەو زیندانییانەدا قسە دەکرا، دەم بۆگەن بوون و هەمیشە بیرکردنەوە لەکوێ؟ قسەکردن و گاڵتەکردن و گۆرانیوتن و نانخواردنی بەکۆمەڵ و بوونی ئاودەست و ئاو لەکوێ؟

لە ئینفرادیی کەسێك نەبوو دەستیّ بە باڵما بێنێت، لە ژووری دوو یەك نا، دوو، سێ یەك بەدوای یەکدا یارمەتییان دەدام، لە ئینفرادیدا نەمدەزانی دەنگوباسی ناو ئەمن چییە و چی نییە؟ لەم ژووره زۆر هەواڵ و دەنگوباســـم ســـەبارەت بە ئەمنەکە وەرگرت، زانیم (مامۆستا ئەحمەدی ســـەناعە) ماوە، (وەســـتا بەکر)و ئەوان لەکوێن، ئەمانە بۆ من زۆر بەکەڵك بوون، ئەوەی کە لە ئینفرادیی شـــوێنەکەی پاکدەکردەوە، کە گوێم لە دەنگی بوو، بەمەزەندە زانیم (مامۆســـتا ئەحمەدی ســـەناعەبوو) کە چوومە ژووری دوو وەکو بێتەوە یادم ئەم کەسانە لە ژوورەکە بوون:

١- فەخرەدین عەبدوڵلا ٢- محەمەد رۆســـتەم ٣- ســـەرکەوت فایـــەق ٤- د. مەحمود کاکەبرا ٥- کەمال ســـادق ٦- عەتای حاجی ئەحمەد ٧- حاجی رەشـــید ئەحمەد سیاگوێزی ٨- مامۆستا حەسەن عوسمان ٩- خەلیل سەیفوڵلا عەلی (خەڵکی بەغدا بوو) ١٠- عەباس فارس ١١- عوســـمان حەمە سەعید ١٢- نەجمەدین حەمە سەعید ١٣- هۆشیار سەعید ١٤- بەهمەن عەبدولکەریم ١٥- ڕێبوار حەمەد بەگ ١٦- ســـەید محەمەد)و چەند کەســـێکی دیکە کە ناویانم لەبیر نەماوە.

پاشان منیش وەکو بیرم بێت بەرودوا ئەمانەشیان هێنا:

١- حەمەڕەحیم حەســـەن ٢- عەریف تالیب مۆریاســـی ٣- رزگار محەمەد عەبدوڵلا ٤- فەرەیدوون دارتاش ٥- حەمە ســـەعید (ســەعەرەش)و کەســـانی تریشیان هێنا، بەڵام ناویانم لەبیر نییە.

ئەوانەی لە ژوورەکەدا بوون بە منەوە ژمارەمان دەگەیشتە (٢٧) کەس، کە هەریەکەو یان هەر چەند کەســێك بە تاوانێك دەستگیریان کردبوون، ئەوەی بیرم بێت بەم شێوەیە بوو:

(فەخرەدین، محەمەد، سەرکەوت، د.مەحمود، کەمال) مەفرەزەی پێشمەرگەی (یەکێتی) بوون، نێردرابوون بۆ ناو شاری سلێمانی بە مەبەستی ئەنجامدانی چالاکی و لە دەوروبەری شاری سلێمانی و لای (گوندی قرگەو ویلەدەر) کەوتبوونە ناو کەمینی جاشە خۆفرۆشەکانی (عەلە لووتماسی)یەوە، مەفرەزەکە (٦) کەس بوون و حاجی رەشید بە هۆیانەوە دەستگیرکرابوو.

(مامۆستا حەســـەن و خەلیل) بەتۆمەتی ئەوەی لەگەڵ حزبی سۆشیالیستدابوون، لەگەڵ جەماعەتی (مەجیدی ئەوقافدا) گیرابوون، لەم جەماعەتی (حسك)ە لەپێش گرتنی ئێمەداو لە ناوەڕاســـتی مانگی ١٩٨٩/١٠-دا ئەمانەیان لە ئەمنی سلێمانی بە بڕیاری (لیژنەی ئەمنیی) گوللەباران کردبوو.

١- مەجید حەمید کە ناسرابوو بە (مەجیدی ئەوقاف).

٢- جەمال محەمەد نووقڵە.
٣- محەمەد مەحمود حەسەن (نابینا) بوو.
٤- ئیسماعیل مەحمود حەسەن، ئەم دووانە برابوون.
٥- دادە گوڵە، خەڵکی قەڵادزێ بوو.
٦- مەحمود خدر، خەڵکی قەڵادزێ بوو. ئەم دووانە دایك و کوڕ بوون.
جگە لەمانە، ئەمانەشیان گیرابوون:
١- محیدین شێخ حەمە ئەمین داراغایی. ٢- مهابادی شێخ عومەری عەواڵ. ٣- نەوال عەزیز (خێزانی مەجید)ی ئەوقاف. ٤- مامۆستا شێخ عەزیز ئەحمەد، خەڵکی سلێمانی.
٥- نیزامەدین گلی.
(نیزامەدین گلی و مامۆستا شێخ عەزیز) لە ئەمن ئازادکرابوون، (مامۆستا حەسەن و خەلیل و مەهابادو نەوال و محیدین) دوای چەندجار جەلسەی (مەحکەمەی سەورە): مامۆستا حەسەن و خەلیل بە موئەبەد و مەهاباد بە پێنجساڵ حوکمدرابوون (محیدین و نەوال)یش لەبەرئەوەی هیچیان لەسەر ساغ نەبووبووەوە، ئازادکرابوون.
(عەتا) یەکێتی بوو، لەناوشاردا گیرابوو، لەگەڵ یەکێکی دیکە کە ناوی (حەمە زاهیر) بوو لە ژوورێکی دیکە بوو.
(عەریف تالیب، فەرەیدوون دارتاش، رزگار محەمەد، عەباس، سەید محەمەد، حەمەرەحیم و بەندە) لەسەر یەکێتیی دەستگیرکرابووین.
(عوسمان و نەجمەدین و هۆشیار) لەسەر حزبی شیوعی دەستگیرکرابوون.
(بەهمەن و ڕێبواری حەمەدبەگ) کەسانی سەر بە حکومەت بوون و کوڕی حەسەن بەگیان رفاندبوو بۆ پارەو لەسەر ئەوە گیرابوون لەسێدارەیان دان.
(حەمە سەعید) لەسەر موستەشارێك گیرابوو کە رایکردبوو، پێش راکردنەکەی چووبووە ماڵیان لە سەرچنارو لە ئەنجامی بەدواداچوونی ئەمن بۆ راکردنی موستەشارەکە، دەرکەوتبوو، کە چووەتە ماڵیان و ئەمنی ئاگادار نەکردووە. کە حەمە سەعدیان هێنا و کردیان بەژووردا سەیرمانکرد پیاوێکی رەشتاڵەی قەڵەو وەزعی زۆرخراپ بوو، دیاربوو بە فەتارەتیان بردبوو، (فەخرەدین) لێی چووە پێشەوەو لێی پرسی لەسەر چی گیراویت؟ یەکسەر باسیکرد، فەخرەدین وتی: ئەم راستییەت بەوان وتووە؟ وتی: زۆریان لێدام و لەتاو گیانم وتم راستە... فەخرەدین کەوتە ئامۆژگاریکردنی، وتی: هەر بردیتیان بۆ هەڵواسین خۆت بدە بەسەر مێزەکەداو دەست بکەرە هاوار هاوارو پێیان بڵا من ئەوکەسە نە دەناسم و نە هاتووەتە ماڵم و نە ئاگام لە کاری وا هەیە، کە بردیانەوە بۆ لێکۆڵینەوە، دوایی گەڕایەوە. وتی: زۆر کەڵکم لە قسەکانت وەرگرت، ئەوەشم رەتکردەوە کە ئاگام لەوکەسە بێت...
(حەمە سەعید) گیانی ئارەقی زۆری دەکردو بۆنی عەرەقەکەی گیانی ئێجگار ناخۆشبوو... بەشێوەیەك بوو هەمووومان بۆنمان دەکرد، بۆیە هەموو جار فەخرەدین و برادەرێکی دیکە

دەیانبردە ناودەستەکەو دەیانشۆرد. لە ژووری دوو بە بەردەوامی لە (٢٤-٢٧) کەسی تێدابوو، ئەوانەی دەهێنرانە ژوورەکە هەمەجۆر بوون و ژوورەکە بووبووە تێکەڵەیەك، لەگەڵ ئەوەشدا هەرهەموو ڕێزی یەکتریان دەگرت و لەگەڵ یەکدا وەکو برابوون، زۆر بە کەمیی لەنێوانماندا کێشە دروست دەبوو. لەکاتی ئەشکەنجەداندا هەرهەموو بە خەمی یەکترەوە بووین.

# هێنانی (حەمەڕەحیم) لە ئەمنی عامەوە بۆ ئەمنی سلێمانی

لە هەفتــەی یەکەمی مانگــی دوودا، کاتێکمانزانی ئێوارەیــەك زرەی زنجیرو کلیل لە دەرگای ژوورەکە نزیکبووەوەو دەرگاکەیان کردەوە، یەکێکیان کردە ژوورەوە. هەر گەیشــتە ناو ژوورەکە هێشــتا پێڵاوەکانــی دانەکەندبوو، بــە پێکەنینەوە ســڵاوێکی کرد. زۆربەی زیندانییەکان دەیانناســی، بۆیە بەگەرمیی پێشوازییان لێکرد، هەر دانیشت چاوێکی وردی بە یەکەیەکەماندا گێڕاو لەســەر من چاوی ڕاگرت!! من خۆم لێ گێل کرد، بەڵام ئەو وتی: (مامۆستا) تۆ بۆ گەیشتوویتە ئێرە؟!

(حەمەڕەحیــم) چەند مانگ بوو، بەهۆی پوازیکەوە لە کەلار گیرابوو، ســەرو ســۆراخی لــە هیچ لایەکــەوە نەبوو، وەکــو ئاگاداربووم، بــرادەران هەوڵــی زۆریاندابــوو، بۆئەوەی بیدۆزنــەوە، هەوڵێکــی بەربوونی بدەن، لەبەرئەوە ماوەیەکی زۆربــوو لە زینداندا بوو، ئەو ڕەنگە گەنمڕەنگییەی ســپی بووبوو، یەکەمجار من نەمناسییەوە، کە ناسیمەوە نەمویست وابزانرێت یەکتر دەناســین، بە هاتنی زانیم (حەمەڕەحیم)ەو ماوە، زۆردڵم خۆشــبوو، وتم: برا منیش چەند ڕۆژێکە گیراوم، تازە هێنراومەتە ئەم ژوورە، ئێمە لە دەرەوە زۆر لە خەمی تۆو چەنــد برادەرێکدابووین، واماندانابوو کە لەناوبــراون و نەماون، مادام لێرەش تۆم بینییەوە زۆر زۆر دڵخۆشم.

(فەخرەدین) لێی پرســی چۆن وا هاتوویتەوە بۆ ئێرە؟ وتی: هیچم لەســەر ساغنەبووەوە. ئەوەندەیان هێنام و بردم ئەوەندەیان ئازارو ئەشــکەنجەدام، ئەمنی ئەم شــارو ئەو شارییان پێکردم، کە زانییان هیچم لەسەر نییە، وا لە ئەمنی عامەوە هێناومیانەتەوە بۆئەوەی ئازادم بکەن، هەرچی ڕاســپاردەیەکتان هەیە لەئێســتاوە پێم بڵێن با بۆتانــی بگەیەنم، ڕوویکردە من وتی: مامۆســتا هەرچیت دەوێت هەر ڕاســپاردەیەکت هەیە پێم بڵێ، هەر چوومە دەرەوە یەکسەر لەگەڵ برادەرەکانی هەردووکمان مەبەستی (حەمەڕەشیدو حەمەنووری) بوو، سەر لەماڵەکەتــان دەدەم هەواڵی تۆیان پێدەگەیەنم، لەکاتێکدا ئەم قســانەی دەکرد زۆر بەدڵنیایی و بەدڵخۆشــییەوە قەناعەتی وابوو کە ئازاد دەکرێت! لەگەڵ فەخرەدیندا کەوتنە تاوڵەکردن. دوای شــێوی ئێوارەو لەوکاتەی کە یارییان دەکرد، شــەو کاتێکمانزانی زرەی زنجیرو کلیل پەیدابــوو، گەیشــتە بەردەمــی ژوورەکەمان، ڕاوەســتاو دەرگایان کردەوە. هــەر یەکەمان چاوەڕوانی بانگکردنی خــۆی دەکرد، کە دەرگایانکردەوە (حەمەڕەحیم)یان بانگکرد، لەکاتی چوونەدەرەوەیــدا بەچاوەکانــی، بەڕووی، بەدەمی، خواحافیزی لێکردیــن، ئێمەش هەروەها، دەرگاکەیان داخستەوە، یەکســەر (فەخرەدین) هەســتاو لە پەنجەرەی دەرگاکەوە سەیری کرد، وتی: کاکە حەمەیان کەلەبچە کردو چاویان بەســتەوە، بە زاتی خوا ســا بانگکردنەکەی بۆ بەربوون نییە. ماوەی زیاتر لە دوو ســەعاتی پێچوو، کە هێنایانەوە (جومعە) بەپاڵ کردییە ژوورەوەو وتی: بیشێلن و ئاوی مەدەنێ.

(فەخرەدین و عوسمان و عەتا) چوون بەپیرییەوە، وتی: لێمگەڕێن، فێرم و شێلانم ناوێت، چووە شوێنەکەی و خۆی ڕێك ڕاکشا، دەستی کرد بە قسەکردن و جنێودان، وتی: چەند مانگە ڕەنج دەدەم، هەرچی نەشیا پێیانکردم، زەفەریان پێنەبردم، لە هەموو شتێك دەربازبووبووم، ڕەنجیان بەبا دام. ئەوەندە پەستبوو، ڕەنگە سپییەکەی ڕەش داگیرسابوو، دەستی بە ئەژنۆکانیدا دەداو ئاخی قوڵی هەڵدەکێشا... فەخرەدین لێی پرسییەوە بۆ وادەکەیت؟ چیتە بۆ پێمان نالێت؟ چی ڕوویداوە؟ وتی: وازم لێبێنە دەسەڵاتم هەبووایە هەر ئێستا خۆم دەکوشت، زۆری لەگەڵ خەریکبوو. وتی: کاکە من بە تەنیا گیرام، کەسم لەگەڵدا نەبوو، ئێستا کە هێناومیانەتەوەو بۆ ئەوەیە لەگەڵ ئەمانەی تازە گیراون تێکەڵاوم بکەن، تازە بەتازە لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا دەکەن و ئەشکەنجەم دەدەنەوە. نازانم چارەنووسم بۆ کوێ دەچێت، بەچی دەگات؟ منیش چوومە لایەوە، وتم: کاکە حەزدەکەم ڕاستیم پێ بڵێیت مەسەلە چییە؟

تۆ کەهاتیت وتت بۆ بەربوون هاتوومەتەوە، زۆر دڵت خۆشبوو، ئێستا ئەمە چییەو بۆ وادەکەیت؟ وتی: مامۆستا ڕاستت دەوێت من لەهەموو شتێك ڕزگارم بووبوو، تەحقیقیم تەواو کردبوو، ئەمن گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە من هیچم لەسەر نییەو بەرم بدەن، کە منیان لە ئەمنی بەغداوە هێنایەوە، وامزانی بۆ ئازادکردنە، کەچی ئێستا شتم لەسەر زیندووکراوەتەوەو لەسەرم کراوە بەماڵ، ئەم حاڵە بەڕاستیی کارەساتە، لەو باوەڕەدام کەسمان دەرناچین و هەرهەمووومان لەناودەبرێن، دڵم زۆر دایەوە، هەر هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیوت مامۆستا تووخوا تۆ دەبوو بگیرایتایە؟ بۆم دەرکەوتووە گرتنەکەی تۆش چۆنە، پێم وت: کاکە... تۆ یەکەم جارت نییە دەگیرێیت و یەکەم جاریشت نییە ڕووبەڕووی ئازارو ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە دەبیتەوە، دڵنیام چۆن ئەو چەند مانگە خۆڕاگرو بەتوانا بوویت و ئەشکەنجەت بەهیچ نەزانیوە، لەم جارەشدا هەر وا دەبیت، گوێ بە قسەی کەس مەدە. لەم قسانەدا بووین زرەی زنجیرو کلیل پەیدابووەوە، دەرگایان کردەوەو بانگیان کردەوەو ڕۆیشتەوە، ئەمجارەیان زیاتر لە دوو سەعاتی پێچوو. کە هێنایانەوە دیاربوو ئەشکەنجەی زۆر بە هەڵواسین و کارەبالێدان درابوو. جومعە بە جنێو پاڵ کردیە ژوورەوە، وا دەرکەوت لە جومعە هەڵگەڕابووەو قسەی کردبوو، برادەران بەپیرییەوە چوونەوە ئەمجارە زیاتر و زیاتر کفری دەکردو جنێوی دەدا. هەر دانیشت پەلاماری شەترەنجەکەی داو وتی: یاللا، فەخرەدین با شەترنجێك بکەین، فەخرەدین وتی: دەتوانیت؟ وتی: بۆ ناتوانم. من ئەمشەو ئەوە چوار سەعاتە بە ئارەزووی خۆیان هەڵمدەواسن و کارەبام لێدەدەن و بە کێبڵ گیانم دەکوتن! ئێستا ناتوانم زاری شەترەنج و پوولەکانی بجوڵێنم؟ کەوتنە یاریکردن. بەدەم یاریی و لەبەرخۆیەوە هەر بۆڵەی دەهات و جارجارە هەناسەیەکی هەڵدەکێشاو بە ئارەزووی خۆی جنێوێکی خست و خۆڵی دەداو نەفرەت و تفی لەو حاڵە دەکرد. ناهەقی نەبوو، لە یەکەم شەوەوە بووینە هاوڕێ بۆ بانگکردن و ئازارو ئەشکەنجەدان و لێکۆڵینەوە. زۆربەی

شـــەوەکان وارێکدەکـــەوت بەجیاجیا هەردووکمانیـان بە بەرودوای یەکـــتردا بانگ دەکرد. بە ئارەزووی خۆیان ئازارو ئەشـــکەنجەیان دەداین. زۆرجار بە رۆژو لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆ یان ئێوارەو لەکاتی شێوکردندا بانگیان دەکردین.

گەلێك جار کە منیان لە ئەشـــکەنجەدان دەگێڕایەوە، کاکـــە حەمەو فەخرەدین و عەتاو عوســـمان پەلاماریـــان دەدام و شـــان و مـــل و باڵ و گیانیان دەشـــێلام. لەکاتی شـــێلاندا لەبەرخۆیـــەوە دەیـــوت: خوا رووی ئەوە رەشـــکات کە تۆی گەیاندە ئەم شـــوێن و وەزعە... ئاخر تۆو ئەم تەمەنەو ئەم شـــوێنەیان وتووە؟ بەڵام کە خۆیان لە ئەشـــکەنجە دەگەڕاندەوە، نەیدەهێشت کەس بیشێلێ دەیوت: فێرم... گیـانم راهاتووە، تەعزیب بۆ من بووەتە وەرزش، هیچ هەست بە ئازارو نارەحەتیی ناکەم، لەشم بەتەواویی خۆشەبووەو لێم گەڕێن. کاکە حەمە هەمـــوو جار بەتووڕەییـــەوە دەیوت: تا ئەمجارە ناوی تەواو و شـــوێن و جێگایان نەدەزانیم، کەچی کە هاتمەوە هەموو زانیارییەکیان لەســـەرم هەبوو. کاکە حەمە لەپێش مندا وازیان لە ئەشـــکەنجەدان و لێکۆڵینەوە هێنا، هەر لە مانگی (٢)دا ئیفادەی لێوەرگیراو بانگکردن و ئەشـــکەنجەدانی نەما. لەدوای ئیفادەوەرگرتـــن حەوایەوە، بەڵام بانگکردن و لێکۆڵینەوەو ئەشـــکەنجەی من بەردەوامبوو، کە ئیفادەیان وەرگرت، وتی: مامۆســـتا ئومێد دەکەم تۆش بەزوویی ئیفادەت وەربگرن و لەم بانگکردن و ئەشکەنجەدانە رزگارت بێت. وتم: کاکە من مێردەزمەیەکم بەســـەرەوەیە، وازم لێناهێنێت رۆژانە شتم لەسەر دەدۆزێتەوە، تا ئەو لەسەر ئـــەو ناپیاوییەی بەردەوام بێـــت، بانگکردن و لێکۆڵینەوەی من تـــەواو نابێت و لەم ئازارو ئەشکەنجەیە رزگارم نابێت.

لەڕاســـتیدا هۆی درێژەکێشانی لێکۆڵینەوەو ئەشـــکەنجەدانم چەند هۆیەك بوو. یەکەم: لە دەرەوەی ئەمن کەســـێکم بەســـەرەوەبوو هەموو زانیارییەکی لەســـەر من هەبوو، پیاوی ئەمن بوو. دووەم: لەناو ئەمنیشـــدا زانیاریم لەســـەر درا بوو. سێیەم: چەند بەڵگەنامەیەك گیرابوو لـــە بەڵگەنامەکاندا ناوی منـــی تێدابوو. چوارەم: ئەوان لەســـەر ئەو زانیارییانەی لەبەردەســـتیاندابوو دانپیانانیان دەویســـت، منیش ئەوان چییان دەکرد نەدەچوومە ژێری و ئینکارییم دەکرد.

# شەوێکی زۆر ناخۆش

شەوێك لە شەوەکانی بانگکردن بۆ لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدان لە کاتژمێر (١٢)ی شەو کە بانگیان کردم، چاو بەسترایەوەو دەستەکانم کەلەبچەکرانەوە. (حەمەو جومعە) دایانمەپێش... ئەوەندە بە رق و قینەوە دەیانبردم، قەســتیان دەکرد بکەوم و ملم بشــکێت و لەوێدا بمرم. بردیانمە ژوورێك... ماجد لە پشــتی مێزێك و جەبار لە پشتی مێزێکی دیکە دانیشتبوون، (مامۆستا ئەحمەدی سەناعەش) لەسەر کورسییەك دانیشتبوو. منیشیان لەسەر کورسییەك دانا. (مامۆســتا ئەحمەد) بۆ یەکەمجاربوو لە ئەمن یەکتر ببینین. من سەیرێکی ئەوم کردو ئەویــش بە چاوەجوان و گەشــەکانی ســەیرێکی وردی منی کرد، هەناســەیەکی خەماویی هەڵکێشــا، نە من قســەم کردو نە ئەویش، وامان دانا یەکتر ناناســین. هەرچەندە بەو شێوە بینینە زۆر ناڕەحەت بووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا دڵــم زۆر کرایەوە، کە دوای زیاتر لە (٨) مانگ دیارنەمانی وا لێرە بینیمەوە، کە واماندەزانی نەماوە. ماجد وتی: ئەحمەد دەناسیت؟ وتم: نەخێر. بەمامۆســتا ئەحمەدیشی وت: ئەی تۆ محەمەد دەناسیت؟ ئەویش وتی: نەخێر. وتی: محەمەد باشــبزانە هەرچی بەڵگەنامەی ڕێکخستنتان هەیە لەبەردەستماندان یەکێك لەوانەی کە ناوی تێدایە ناوی تۆیەو ناوی تەواوت و نهێنیت و ئابوونەو مەسئولییەتی تێدایە، جا بۆیە هێناومی بۆ ئێرە بۆئەوەی لەبەردەمی (ئەحمەد)دا راســتییەکانمان پێ بڵێیت، چیتر نە ئێمەو نە خۆت ماندوو نەکەیت. (مامۆســتا ئەحمەد) وەرەقەیەکی لەسەر کۆشی دانابوو، جەباریش لەســەر مێزەکە وەرەقەیەکی بەدەستەوەبوو، مامۆســتا ئەحمەد بە چاو ئیشارەتی کردم ســەیری وەرەقەکەی سەر کۆشی بکەم، سەیرمکرد لیســتی ناو بوو، ناوی (مامۆستا محەمەــدی مەلا حســێنم) بینی یەکەم ناو یــان دووەم ناو بوو، ناوی خۆشــم (٦)م ناوبوو، ئەوەشی بەدەست (جەبار)ەوە بوو کلیلی ڕێکخستن بوو. لەو دانیشتنەدا بەراوردیان دەکرد، کە ماجد قسەی بۆ دەکردم هیچ ئاگام لەخۆم نەمابوو، بەهۆی ئەوەی کە ئەو حاڵەم بینی. ماجد هەستی بەوە نەکرد کە من سەرنجی ئەو لیستەم داوە، ڕووی تێکردمەوەو وتی: سەگی کوڕی ســەگ تا کەی گاڵتەمان پێدەکەیت؟ هەر ئێستا هەموو راســتییەکانمان پێ نەڵێیت، هەر ئەمشــەو دەتکوژم و دەتکەمە عیبرەت بۆ هەموو هاوڕێکانت، ئێوە سەیرن نازانم چیتان لە من دەوێت؟ هەر ئەوەندەم وت، هەســتایە سەرپێی و بەئارەزووی شانی یەك کێبلی سرەواندە پشــتی ملم و بەشــەق و شــەپازللە تێم بەربوو، بانگی حەمەی کرد، وەرن بیبەن، تا روحی دەرنەچێــت وازی لێمەهێنن. حەمە بەکەلەبچەکە رایکێشــام، هــەر زوو گەیاندمیە ژووری ئەشــکەنجەو هەڵواسین. نە وەستانە سەرهاتنی ماجد. ڕووتیانکردمەوە، هەڵیانواسیمەوە... هەر گەیشــتمە قوولاپەکەو خولامــەوە بەدەنگی بەرزو بەهەموو ئارەزووی خۆم دەســتم بە هــاوار هاوار کرد... ماجد پەیدابوو، کــە گوێی لە هاوارەکەم بوو، وتی: دایگرن، دایانگرتم بە حەمەو ماجد ب کێبڵ خۆیان ئاســا کەوتنەوە ویژەم، کردیانە نۆرە ئەو لەوی دەســەندەوە،

جاریکی دیکە هەڵیانواسیمەوەو هەر هاوارم کرد دایانگرتمەوە، کارەبایان لێدامەوەو لەهۆش خۆم چووم... کە هۆشــم هاتەوە، جلەکانم کرابووەوە بەر. ماجدی لێنەمابوو، تەنها جومعەو حەمە بەدیارمەوە مابوون، کەلەبچەکەیان کردمەوەو چاویان بەستمەوەو بردیانمەوە بۆ ژووری دوو، لەگــەڵ دەرگا کردنــەوەدا پاڵێکیان پێوەنام بۆ ناو ژوورەکەو دەرگاکەیان داخســتەوە، وتیان بیشێلن، ئاوی مەدەنێ.

فەخرەدین و کاکە حەمەو عەتا گەیشــتنە لام، بردیانمە ناوەراستی ژوورەکە، دەستیان بە شــێلانی گیانم کرد. فەخرەدین وتی: زۆریان هەڵواســیت؟ وتم نا، نا... بە قسەی تۆم کرد هەر گەیاندمیانە قوولاپەکەو هەڵیانواســیم دەستم بەهاوار هاوار کرد، یەکسەر دایانگرتم و چەندجار هەڵیانواسیم هەر وامکرد، بەلاّم کارەبایان زۆر لێدام و بە کێبڵ و شەق و شەقازللە ئەوەندەیــان لێدام لەهــۆش خۆم چووم، ئەوەی زۆر کاری تێکردم ئەو حاڵە بوو کە لە یەکەم ژوور (مامۆستا ئەحمەد)م بینی، لیستی ناوەکانم بینی و چۆنم دیبوو بۆم گێرانەوە. فەخرەدین وتی: بەراســت ئەوانــە دەبێت لەکوێ گیرابن و لەکوێ و لای کێ دەســتیان کەوتبێت؟ وتم: بەپێی ئەو لیســتە بێت هەموو برادەرانمان دەگرن و دەیانهێننە ئێرە. ئەو شەوە بەقەدەر ئەو شــەوەی حەمەرەحیمیان هێنایەوە، من خەفەتم خواردو مێشك و ویژدانمی دەرزی ئاژنکرد، چونکە بەلامەوە کارەســات بوو، ئەو رێکخســتنە تۆکمەو چالاك و ئیشــکەرە، بەو هەموو رۆڵە شۆرشــگێرو خاوەن ئەزموونەوە، رووبەرووی دیاردەی بەو شــێوەیە ببێتەوەو ڤایرۆسی کوشندەی دوژمن تەشەنەی تێدا بکات، لەم حاڵەدا بیرم لە سەرەتاو دەستپێکردنەوەی شۆرش و کارەساتی دەستگیرکردنی هاوڕێیانی کۆمەڵە دەکردەوە، کە بەشێوازێکی لەمجۆرە کەوتنە بەر شالاّوی گرتن.

# تەلەفۆنیش مێردەزمەیەکی دیکە بوو

دوای چەنـد ڕۆژێـك، ئێوارەیەك لەکاتی شـێودا کە خەریکی نانخـواردن بووین، زرەی کلیل پەیدابووەوەو بەرەو ژوورەکەمان هات و دەرگا هەڵگیراو بانگکرام، بەناچاریی نانەکەم بەجێهێـڵاو بەدەنگیانەوە چـووم، ئەمجارەیان ڕەحیم بوو، کە لـە دەرگاکە چوومە دەرەوە، پەڕۆیەکی بە چاومەوە بەسـت و کەلەبچەکەی کردە دەسـتم، پەڕۆکە ئەسـتوور نەبوو، زۆر ئەسـەر چاویشم نەیبەسـتبوو، بەئاسـانی بەرپێی خۆم دەبینی، زۆر لەسەرخۆو بەبێ ئەوەی هاوار بکات و جنێو بدات و کێبلم پیابکێشـێت و پاڵم پێوە بنێت، بەیەکەوە کەوتینە ڕێ. یەکەمجاربوو ئەو ڕێگاو شـوێنانە بەو شێوەیە ببینم و بزانم لەکوێوە دەمانبەن و بۆ کوێمان دەبەن، نەیبردم بۆ ژووری ئەشـکەنجەدان، ڕوویکـردە ژووری لێکۆڵینەوە، کە دەڵێم ژووری (ئەشـکەنجەو لێکۆڵینەوە) لەڕاسـتیدا دوو ژووری جیا بوون. ژوری لێکۆڵینەوە کورسی و مێـزی ڕێکوپێکی تێدابـوو، لە ژووری فەرمانبەران دەچوو، ژوورێکی ئاسـایی بوو، بەڵام ژووری ئەشـکەنجە ژوورێکی تایبەت بوو بە ئەشکەنجەدان و هەرچی تێدابوو شتی ئاسایی نەبوو، بەڵکە هەمووی شتی ترسناك و پڕبوو لە ئامێری جۆراوجۆری ئازارو ئەشکەنجەدان. تەنانەت ئەو مێزو کورسییانەی تێدابوو، لە کورسی و مێز نەدەچوون.

کە بردمییە نـاو دەرگای ژوورەکە، وتی: چاوی بکەنـەوە، ڕەحیم چاوی کردمەوە. ماجد دانیشـتبوو، وتی: دانیشە، دانیشتم وتی: (محەمەد) (ئەرشـەد) کێیە؟ ئەرشەد؟ وتی: ئا... ئەرشەد!!

وتی: ئەرشـەد پەیوەندیی بەتۆوەیە بەدواتا دەگەڕێت، لەکوێ بەدواما دەگەڕێت؟. یەعنی نازانیـت؟ ماڵەوماڵ بە تەلەفۆن لە هەواڵ پرسـینتایە. چەندجـار تەلەفۆنی بۆ ماڵتان و قوتابخانە کردووە، ئیشی پێت بووە. دەبێت پێمان بڵێیت ئەو ئەرشەدە کێیەو ئیشی چییەو بۆ تەلەفۆنی بۆکردوویت؟ لە دڵی خۆما وتم: تێگەیشتم کە لە گرتنمەوە تەلەفۆنی قوتابخانەو ماڵەوەمـان چاودێریی خراوەتە سـەر، دیارە هەر کەسـێك تەلەفۆنیان بـۆ بکات، تۆماری دەکەن، بیرم کردەوە ناکرێت لەمە خۆم بدزمەوە، ڕاسـتتان دەوێت (ئەرشـەد) پوورزامە دیارە کە بیستوویەتی گیراوم تەلەفۆنی کردووە بۆ هەواڵپرسـینم، ئیشی چییەو سەر بە چ حزبێکە؟ فەرمانبەرە خاڵۆزای پارێزگاری سـلێمانییەو شـەو و ڕۆژ لە ماڵی یەکن و دیارە دەزانن کە پارێزگار[1*] کێیە؟ چۆنە چەند دڵسۆزی حکومەت و حزبە. وتی: جا چۆن ئێمە بەم قسەیەت باوەڕبکەین، تۆ قسـەیەکی ڕاسـتمان پێ ناڵێیت، لەمەدا تاقیـم بکەنەوە، بزانە من ئەوەی دەیڵێم ڕاستە یان درۆیە، چۆن؟ پرسیار لە پارێزگار بکەن بزانن ئەو (ئەرشەدە) خاڵۆزای ئەو و پوورزای من نییە؟ ئەگەر وا نەبوو، واتە هەرچی دەیڵێم و وتوومە ڕاستم نەکردووە.

---

١-ئەوکاتە پارێزگاری سلێمانی (شێخ جەعفەر شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی) بوو (ئەرشەدی شێخ حەسەن) خاڵۆزای بوو، پوورزای منیش بوو.

ئەمجارە زۆر لەگەڵما توند نەبوون و ئازاریان نەدام و نەیانناردم بۆ ژووری ئەشکەنجە، ماجد وتی: ئێمە بەدوای ئەم قسەیەتا دەچین، ئەگەر وا نەبێت، ئەوا مەگەر خوا بزانێت چیت پێدەکەینەوە، ئەو (ئەرشەدەش) دەگرین و بەدەردی تۆی دەبەین، رازیم، رەحیم بەهەمان شێوە چاوەکانی بەستمەوەو وردە وردە لەسەرخۆو بەبێدەنگیی بردمیەوە بۆ ژوورەکەو زۆر بە ئەدەبەوە دەرگاکەی هەڵگرت و پەرۆکەی لەچاوم کردەوەو کەلەبچەکەی بەسووکیی کردەوەو دایکەندو وتی: مامۆستا فەرموو بچۆ ژوورەوە. کە چوومە ناو برادەران بەبێ ئازارو بەئاسایی دانیشتم، لایان سەیربوو. فەخرەدین وتی: چی بوو؟ وتم: چووزانم تەلەفۆنیش بووەتە مێردەزمەیەکی تر بۆم... مەسەلەکەم بۆ باسکردن کە وتم راستییەکەم پێوتن، وتی: چاکت کردووە ئەوە بۆ تۆ زۆرباشە، بەشکم بچن بۆلای موحافیزو ئەو پرسیارەی لێ بکەن؟ وتم: لام سەیربوو، کە بە قسەکەم قەناعەتیان کرد. ئەم جارە ئازارو ئەشکەنجە نەدرام و باسی (رەحیمم) بۆ کردو ئەویش زۆر بەباشی باسی رەحمیی کرد. دکتۆ مەحمود وتی: مامۆستا خواردنەکەمان بۆ هەڵگرتووی، وەرە بیخۆ با زیاتر سارد نەبێتەوە. سەبارەت بەو تەلەفۆنەو ناوهێنانی (ئەرشەد) بەو شێوەیە مەبەستم لەوە بوو، ئەگەر بتوانن پرسیار لە (پارێزگار) بکەن، ئەوەی من پێم وتبوون ئەویش ئەو راستییە دەسەلمێنێت بۆیان، بۆ ئەو ئینکاریکردنەم لەکاتی تەحقیقدا بەکەڵك دەبێت بۆم.

# بانگکردن و ئامادەبوونی (ش)

ئێوارەیەك دوای شێو بە مەزەندە لە دەوروبەری کاتژمێری نۆدابوو، زرەی کیل پەیدابووەوە، فەخرەدین وتی: خێربێت، دەرگایان هەڵگرت و بانگیان کردم. ئەمجارەیان (جومعەو رەحیم) بەیەکەوەبوون، هەر گەیشتمە ئەو دیوی دەرگاکە جومعە زۆر بەتوورەیی و رقەوە کەلەبچەکەی کردە دەستم و بە پەرۆیەکی رەشی ئەستوور هەردوو چاومی شەتەك دا... دایانمەپێش، زۆر پەنەی لێدەکردم و جنێوی دەداو قسەی دەکرد. گەیشتمە شوێنێك پەلەی زیاتری لێکردم، پێی دەوتم: خێرا برۆم. لە رۆیشتنەکەمدا کاتێکمزانی ناوچەوانم دای بەدیوارێکدا، ئاگر لە هەردوو چاوەکانم بووەوە، زۆر زۆر ئازارم گەیشت، ئەوەندە بەخێرایی و بەتوندیی ناوچەوانم بەر دیوارەکە کەوت، بەرەو دوا گەڕامەوە، جومعە لەجیاتی ئەوەی پۆزش بهێنێتەوە، وتی: دەبخۆ دەی موستەحەقی ئەوەی. رەحیم لێی توورەبوو، وتی: عەیبە، عەیب ناکەیت وا رەفتار لەگەڵ ئەم پیاوەدا دەکەیت؟ بۆ وات لێکرد؟ چی لەم شێوە رەفتارەت دەبەستیتەوە؟ ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی: من ئارەزووی خزمەو ئەمانە کوردنین؟ کورد دوژمنی ئێمەن، قەستەکەم ئەگەر بۆم بکرێت خوێنیان بخۆمەوە. رەحیم وتی: چاك ناکەیت لێم نزیکبووەوەو وتی: مامۆستا گوێی مەدەرێ خوا کەریمە. دوای ئەوەی ئەوان لەو ورەورو قسەکردنە بوونەوە، ئینجا منیان خستەوە رێ و کردیانم بە ژوورێکداو لە پەنا دیواری ژوورەکەدا رایانگرتم، کاتێکمزانی چاویان کردمەوە وتی: مامۆستا بهێنن. مامۆستا (ش)نیان هێنا بەرامبەرم رایانوەستان. لێیان پرسی، محەمەد چییە؟ وتی: کۆمەڵەیەو سەر بە یەکێتییە، پلەی چییە؟ وتی: ئەندامە بەرپرسە؟ بەرپرسی کێیە؟ لەگەڵ مندایەو بەرپرسی رێکخستنی ژنانە؟ لێیان پرسی ژنەکان کێن ناوی نهێنی هەندێکیان دەزانین و ناوی یەکێکیانی بەناوی خۆی دەزانی؟ دەیزانی لەکوێ کاردەکات وتی: ئیشوکاری ئەوە دەکات؟ روویان کردە من وتیان، وایە؟ وتم: نەخێر وانییەو ئەو لەخۆیەوە ئەم قسانە دەکات. بەدوای قسەکانی مندا هەڵیدایەو وتی: من خۆم لەگەڵیدا نەبووم، قابیلە من درۆ بکەم؟ لێیان پرسی نەی لەگەڵ ئێوە کێی لەگەڵدایە؟ ناوی هەندێکیانی ئاشکراکرد. وتی: ئەم پیاوە پیاوێکی زۆر چاکەو بنەماڵەیەکی ئایینی ناوداری شارەکەن. خۆشی مامۆستایەکی زۆر دلسۆزو چاکەو بەرێوەبەرێکی سەرکەوتووە، مـن داواتان لێدەکەم رێزی لێبگرن و ئازاری مەدەن و داواش لەم دەکەم، کە لەگەڵتاندا راستگۆ بێت، وتی: هیچ نەماوە ئێوە نەیزانن، ئێوە هەموو زانیارییەکانتان لەبەردەستدایە، با کارێك نەکات خۆی و منداڵەکانی تێدابچن. وتی: ئەمان شێخی ئیرشادن، ئیتر لەم بابەتە زۆری رست و وتی: یەکێکیان پێی وت سوپاس و بردیانەوە.

ئەو رۆیشت. ماجدو جەبارو یەکێکی دیکە دانیشتبوون ماجد، وتی: بەگوێی خۆت گوێت لێبوو هاورێکانت چۆن لەسەر تۆ زانیارییان لایەو سەلماندیان کە تۆ چیت و سەر بەچیت و چی دەکەیت، حەز دەکەم دانیشی و ئیتر لەمە زیاتر ئازارمان نەدەیت و ئەو راستییانەی

هاوڕێکەت پێی وتیت لە زمانی خۆتەوە بۆمان باسبکەیت، ناوی یەکەیەکەی برادەرەکانت و ئەو ڕێکخستنی ژنانەمان بدەیتێ، چەندو چوونمان لەگەڵدا نەکەیت. ئەوە زیاتر لە چوار هەفتەیە درۆ لەگەڵ ئێمەدا دەکەیت. من نازانم وتم ئەم مامۆستایە بۆ وا لەگەڵ مندا دەکات؟ دیارە ڕاسپێردراوە کە ئەو تۆمەتانە بۆ من دروستبکات. ئەوانەی ئەو وتی تەنها یەك شتیان ڕاست بوو، ئەویش کە بنەماڵەکەمان ئاینییەو شێخی ئیرشادین و هەموو خەڵکی شار دەیزانی، ئەوانی تر هیچیان وانین و ئەوە تاوانەو هەرهەمووی دروستکراون، من ئاگام لەوانە نییەو نەبووە. وتی: دەستتکردەوە بەدرۆکردنەکە؟. دەتانەوێت درۆتان بۆ بکەم بەڕاست؟ من درۆناکەم و ڕاستیی دەڵێم لەوانە لە هیچی ئاگادارنیم، ئەو برادەرەش نازانم کێیەو چییەو نایناسم و ئەو قسانەشی لە گیرفانی دەرهێناوەو بەبێ ویژدانیی قسە دەکات.

لە قسەکانم نەبووبوومەوە، کاتێکمزانی شڵپە لە پشتمەوە هەستاو بە کێبڵ و شەق و جنێودان داگیرامەوەو خوریبە جومعە هەر ئێستا ببەن تا گیانی دەرنەچێت وازی لێ مەهێنن، چاویان بەستمەوە بە کەلەبچەکە ڕایانکێشام، تا ژووری ئەشکەنجە بە پاڵ و شەق و کێبلەوە دایانمەپێش.

هەر گەیاندمیانە ژوورەکە، چی کەلوپەلی بەرم هەبوو، دایانکەندەوە، تەنها دەرپێکەم لەپێدامایەوەو کەلەبچەیان کردەوە دەستم و هەڵیانواسیمەوە. هەر گەیشتمە قووڵاپەکە هێشتا نەسووڕابوومەوە، دەستمکرد بە هاوار، هاوار، بەدوای هاواردا بە دەنگی بەرز. کارێکی وام کرد گوێم لێبوو، ڕەحیم وتی: دە دایگرە، ویژدانت بێت دەمرێت، بەسەرتا ساغ دەبێتەوە. دایانگرتم، یەك سەتڵ ئاوی ساردی پیاکردم. ڕەحیم وتی: بۆ وا بێ ویژدانیت، ئەو ئاوە ساردەت بۆ پیا کرد؟ دەیکەم، سەید ماجد پێی وتووم ئەمشەو یان ڕۆحی دەردەکەین یان دەبێت قسە بکات، مردین بەدەستییەوە، ئەوەندەمان هێناو برد، لەم قسانەدابوون، ماجد و جەبارو یەکێکی دیکە پەیدابوون، من لە سەرما دانم یەکی نەدەگرت، هەڵدەچۆقیم. وتی: ئەوە بۆ وازتان لێهێناوە بۆ هەڵیناواسن؟ گەورەم هەڵمانواسیوەو دامانگرتووەتەوە، نابینیت ئاوی ساردیشمان پێداکردووە، بەزەییتان پێدا نەیەتەوە، ئەمشەو یان دەبێت دان بەهەموو تاوانەکانیدا بنێت، هەرچی هەیە پێمان بڵێت، یان گیانی دەردەکەین...، هەڵیواسنەوە، هەڵیانواسیمەوە. ڕاسپاردەکەی فەخرەدین، ئەگەر لە سەعاتێکدا دە جارم هەڵواسن، هەر ئەو هاوار هاوارە دەکەم. کەوتمە هاوارکردن، بە دەنگی بەرز لەگەڵ هاوارکردنەکەدا ماوەیەك هێڵامیانەوە، کە هەر بێدەنگ نەبووم و هاوارەکەم زیاتر دەکرد. ناچاربوون دامگرنەوە. هەر دایانگرتم و سەتڵێکی دیکە ئاوی ساردیان پیاکردمەوە، یەکسەر کارەباکەی خستەکارو کارەبایان لە پەرەی گوێ و سەری زمانم دا، ئەو شەوە تا ئەوان بێتاقەت نەبوون لە هەڵواسین و کارەبالێدان وازیان لێنەهێنام، کە زانییان ڕەنجەکەیان بەهەدەرچوو، ئەوەی ئەوان دەیانویست پێی نەگەیشتن، وازیانهێناو زۆرم سەرمابوو، گیانم وەکو شۆڕەبی هەڵدەلەرزی، لەکاتی هەڵواسینەکاندا، ماجد ناوی نهێنی کچەکانی یەکەیەکە دەهێناو بە وشەی ناشیرین و

قـەی هەلەق و مەلەق بەدەنگی بەرز دەیدا بەگوێمدا. کۆیانکردمەوە، ماوەیەك لە رارەوەکە دەیانبردم تا هەڵڵەرزینەکەم هێوربووەوە... ماجدو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون رۆیشتن، جومعەو رەحیم مانەوە. رەحیم هاتە لامەوەو وتی ماموستا باشبوویت؟ سەرماکەت نەما؟ سوپاس باشم، جومعە... دەی... دەی هەستە... هەڵسام کەلەبچەکەیان کردەوە دەستم و چاویان بەستمەوەو بردیانمەوە بۆ ژوورەکە. کردیانمە ژوورەوە، جومعە بە زیندانییەکانی ژوورەکەی وت: بەباشی بیشێلن و جارێ ئاوی مەدەنێ... کەگەیشتمەوە ناو برادەران، خۆیان ئاسا فەخرەدین و حەمەرەحیم، عەتا، عوسمان، ماموستا حەسەن، کەمال و ئەوانی دیکە دەوریان لێدام..، دیاربوو ئەمجارە وەکو جارەکانی دیکە نەبووم... وەزعم لەبەرچاویان باش نەبوو. هەریەکە لەلای خۆیەوە شوێنێکی دەشێلام و وەرزشی پێدەکردم، فەخرەدین وتی: ئەمشەو بۆ وابوویت؟ دەلێی هاوارەکانت نەکردووە؟ وتم: کردم زۆرم کرد، بەڵام بە جارو دووجار لێم رازی نەبوون و کارەباشیان زۆر لێدام و ئەمشەو ئاوی ساردیان دووجار بەرووتی پیاکردووم.

فەخرەدین وتی: مەسەلە چی بوو. وەزعەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەنجام، وتم: هەر وەکو جارەکانی دیکە بوو، هیچیان هەڵنەکران و سەوز نەکرد. وتی: دەبا هەر ئاوی ساردمان پێدابکەن، دەبێت کۆڵیان پێ بدەین. ئەوشەوە لەبەرئەوەی زۆریان ماندووکردبووم کە خەوتم تا بەیانی خەبەرم نەبووەوە. کە هەستام کەمال وتی: ماموستا ئەمشەو کفت بوویت و تا بەیانی نەجوولایتەوە.

## بانگکردن لە شەوێکداو بەڵگەنامەیەکی چاوەڕواننەکراو

شـــەوێك لـــە دەوربەری کاتژمێر نـــۆدا، وەکو هەموو جارەکانی دیکە بـــە زرەی زنجیرەوە دەرگای ژوورەکە کرایەوەو بانگیان کردم، کەلەبچەو چاوبەســـتنەوەیان پێشکەش کردمەوە، بردیانم. لە دڵی خۆمدا دەموت ئەمشەو دەبێت کێ تەلەفۆنی کردبێت؟ یان کێیـان هێنابێت بۆ بەرەورووبوونەوەم؟ گەیاندمیانە ژوورێك و چاویان کردمەوە، ژووری لێکۆڵینـەوەی جاران نەبوو، گەورەتربوو. ماجد دانیشتووە، (مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن)، لەسـەر کورسییەك دانیشتبوو، منیشیان لەسەر کورسییەك داناو کاتێکمزانی (مامۆستا شێخ عەزیزو مامۆستا ئەحمەد سالح)یشیان هێناو ئەوانیشیان لەسەر کورسی دانا. یەکەمجار بوو، لەو ئەمنە چوار کەسمان بەو شێوەیە بەرامبەری یەکتر دابنێن. وەرەقەیەك بەدەستی ماجدەوە بوو، ناوی لەسـەر نووســـرابوو، پیشانیداین پەیوەندیی (بە کۆنفرانســـی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستانەوە) بوو، لەســـەر راپۆرتەکە ناوی نهێنی هەبوو، لەپاڵ نـــاوە نهێنییەکانەوە بە قەڵەمێکی رەش نـــاوی تەواوی هەر چوارمان نووســـرابوو، ناوی نهێنی (بلێســـە) لە تەنیشـــتییەوە ناوی من نووسرابوو. دیاربوو ناوی مامۆســـتا محەمەدو مامۆستا عەزیزو مامۆستا ئەحمەدیش هەر وا نووســـرابوون. ماجد وتی: ئەمە وەســـیقەیەکە پەیوەندیی بەئێوەوە هەیە. لە منی پرسی مامۆســـتا محەمەد دەناسیت. وتم: نەخێر، لە مامۆســـتا محەمەدیشی پرسی تۆ محەمەد دەناســـیت، ئەویش وتی: نەخێر، بە منی وت: مامۆســـتا عەزیز دەناســـیت، وتم: نەخێر... بەویشیان وت کە من دەناسێت ئەویش وتی: نەخێر. بەهەمان شێوە پرسـیاریان لە مامۆستا (ئەحمەد)یش کردو هەر بەو جۆرە وەڵامدرایەوە، وتی: ناوی ئێوە لەســـەر ئەم وەسیقەیەیە... هەر چوارمان ئینکاریی ئەوەمان کرد کە ئەو ناوانە ناوی ئێمە بن.

بەراســـتیی من زۆر سەرسامبووم لە دووشـــت. یەکەم: ئەو وەسیقەیە لەکوێ بووە؟ چۆن گیراوەو لای کێ بووە؟ دووەم: ئەم وەســـیقەیە ناوی نهێنی لەسەر بووە، کێ ناوی کەسەکانی لەلای ناوە نهێنییەکانەوە نووسیبوو؟

یەکەممان بۆ دەرکەوت کە ئەو وەســـیقەیە لە ماڵ و ئەرشـــیفی هاورێیاندا گیرابوو، بەڵام تائێستاش بۆم ساغ نەبووەتەوە کێ ئەو ناوانەی لەگەڵ ناوە نهێنییەکاندا نووسیبوو؟ لەدوای ئـــەو بانگکردنەوە جارێکـــی دیکە بانگیان نەکردینەوەو لەســـەر ئـــەو بەڵگەنامەیە لێیان نەپرســـینەوە. ئەوەش دەگەرایەوە بـــۆ ئەوەی کە هەرچوارمان ئینکاریـــی ئەوەمان کرد، کە یەکتر دەناسین و هەرچوارمان وتمان یەك ناناسین، ئەگەر لەو رووبەڕووبوونەوەیەدا یەکێکمان زەلـــەو هەڵەیەکی بکردایەو بمانوتایە یەك دەناســـین، یان ئەو نـــاوە نهێنییانە ئێمەین، بەو جارە بانگکردنە کۆڵیـان لێنەدەداین، بەڵکو رووبەڕووی ئەشـــکەنجەو ئازاریان دەکردینەوە، لەکاتێکدا هەر چوارمان لە کۆمەڵەو لە (ی.ن.ك)دا بەیەکەوە کارمان کردبوو.

# نازانم ئەو نامەیە بۆ گەیشتە ئەمن؟!

شەوێك لە دەوری کاتژمێری نۆدا، زرەی زنجیرو کلیل و دەرگا کردنەوە پەیدابوو. بانگیان کردم. وەکو جارانی تر چاو بەسـتـرایەوە، کەلەبچەکرامـەوەو دایانمەپێش و بە قاردمەیەکدا سەریانخسـتم و گەیاندمیانە بەر دەرگایەك، بردیانمە ژوورەوەو چاویان کردمەوە ژوورەکەی نەقیب ماجد بوو، سـەیرمکرد (هاوڕێ جەبار) لەسەر کورسییەك دانیشتووە. پیانوتم لەسەر ئەو کورسییە دانیشم... لەگەڵ (هاوڕێ جەبار)دا بەکەم و زۆر هیچ قسەیەکم نەکرد، ئەویش هەروەها، بەڵام بەچاو ئیشـارەتێکی دامێ... لەوە گەیشتم شتێك هەیە پەیوەندیی بە من و ئەوەوەیە، دەبێت ئاگامان لەخۆمان بێت لە قسەکردندا.

(نەقیب ماجد) پرسـی جەبار دەناسیت؟ وتم: نەخێر، نایناسم. چۆن نایناسیت؟ بەرپرستان بووە؟ من چی بووم تا بەرپرسـم هەبێت؟ ئەم وا ناڵێت، دەڵێت دەیناسـم. من ئەو ناناسـم. بە هاوڕێ جەباری وت: راسـت دەکات ناتناسـێت؟ بەڵا، قەت هاوڕێی یەك نەبووین و یەکتر ناناسین.

جەبار دەڵێت: لەبەرئەوەی تۆ بەرپرسـی رێکخستنی ژنان بوویت نامەیەکیان ناردووە بۆ یەکێـك لە ژنەکان بەرێگای تۆدا. من و نامەو رێکخسـتنی ژنان؟ ئـا... بەڵا، تۆ!! ئەگەر باوەڕ دەکەن من نە رێکخسـتن بووم و نە ئاگاداری رێکخستنم و نە نامەی واشم ئاگا لێیە. خۆت گێل مەکە، بەڵگەمان لەبەردەستدایە تۆ (ئاوێسەر)نیت... (شێخ محەمەد)ت ناو نییە؟ بەرێوەبەری ناوەندیی ئێواران نیت؟ شـێخ محەمەدو بەرێوەبەرم، بەڵام (ئاوێسـەر) نیم. جەبار دەڵێت: نازانم جەبار ناناسـم و لە هیچ بۆنەیەکدا یەکمـان نەبینیوە، چۆن وا دەڵێت؟ جەبار وانییە؟ نا من ئەوانە نازانم، ئێسـتا دەزانم ئەوە (شـێخ محەمەد)ە. پیمان بڵێ ئەو نامەیەت لەکێ وەرگرت و دات بەکێ؟ دەڵێم ئاگام لە نامە نییە. جەبار وایە؟ منیش دەڵێم ئەم ئاگای لەوە نییە، ئەی بۆ ناوی ئەم دراوەو دەڵێن ئەو نامەیە لە تۆوە نێردراوە بۆ ئەو کچە کە ناوی (جەمیلە)یە بەناوی نهێنی (کۆژین)؟ نامە نێردرابێتیش بۆ ئەم نەنێردراوە.

لەسـەر مێزەکەی هەستاو بەرەو لام هات، راستمان پێ بڵێ و بەس درۆمان لەگەڵدا بکە، جنێوێکی ئەمنانەی دا، بەهەمـوو هێزی یەك زللەی سرەواندە بنـاگوێم و بەشەق هەڵیساندم. ئەمشەو هەمـوو راستییەکانمان پێنەڵێت بەکوشتن دەتکوژم، هەی سەگبابی خائین. (جومعە) بیبەن... وەکو هەوشـاری برسـی پەلاماریانـدام چاویان بەسـتمەوەو گەیاندمیانە ژووری گیانکێشـانەکە، جەولەی هەڵواسـین و کێبڵ لێدان و کارەبا لێدان دەسـتی پێکردەوە، ماجد وەکو هار بەچواردەورمدا دەسووڕایەوە، بە کێبڵ لێیدەدام و لێپرسینەوەی لێدەکردم بە جنێوی ناشیرین جنێو لەسەر جنێوی پێدەدام.

هاوار هاوارەکەم بەبێ وەڵام دایانگرتم، بە گەیشـتنم بۆ سەر ئەرزی ژوورەکە، یەکسـەر بۆ سەر کورسی کارەبا لێدان. لەگەڵ کارەباکەدا وەکو گەڵای دار جنێوی لەدەم دەهاتە دەرەوە.

وتم: جنێو مەدە... ئەوەندەیتر زمانی بەرەڵلا بوو، پێت ناخۆشە؟!

ئەو شــەوەش وەکو شەوەکانی دیکە لەسەر ئەو نامەیە ئەوەی لەتاقەتیاندابوو بەرامبەرم، کردیــان و بردیانمەوە بــۆ ژوورەکەم. (فەخرەدین) وتی: مامۆســتا ئەمیــان چی بوو؟ وتم: لێمگەڕێن با خۆم نەکوژم و مەســەلەکەم بۆ باســکردن. من نازانم ئەو نامەیە بۆ هاتبووە نــاو ناوانەوە؟ بەڵام ئەوەم لا روون بوو، کە مامۆســتا (ش) لەو نامەیە ئاگاداربوو. تەنانەت کە مامۆســتا (محەمەدی مەلا حسێن) نامەکەی بۆ هێنام و ناوەکەو ناونیشانەکەی بە هەڵە نووســرابوو، ئەوەم لای ئەو باســکردبوو، دەیزانی ئەو کەســەش کە نامەکــەم داوەتێ ناوی (جەمیــلە)یەو نــاوە نهێنییەکەی (کۆژین)ەو لە کارگەیەکــی درووون کاردەکات، دەیزانی ئەو کچەی مامۆســتا (عومەر بەرزنجی) خوێندکاری زانکۆیە لە هەولێرو ســەر بە رێکخستنەو ئەو نامەیە بۆ ئەو نێردراوە.

ئەوشــەوە کە (هــاورێ جەبار)م بینی لەلایــەك بەبینینەکەی دڵخۆشــبووم، چونکە لەو کاتەوەی کە گیرابووین یەکترمان نەبینیبوو، نەشــمدەزانی لــەچ ژوورێکە. هەر چەندێ ئەو رۆژانەی کە لەئینفرادیی بووم، تێگەیشــتم کە (ئەو و مامۆســتا ئەحمەدی سەناعەو هاورێ عەبدولعەزیــز) لەو ئینفرادییەبوون، دیاربوو هەریەکەشــیان لە ژوورێکدا بوون. وەکو من، کە بۆ ئەو مەسەلەیەش رووبەرووی یەکیان کردینەوە، حەزم دەکرد بمردمایەو ئاوا یەکترمان نەبینیایــە، هەرچەندە هەردووکمان کارێکمان کرد کە ئەوان لەهیچ روویەکەوە ســوودمەند نەبن و چەواشەیان بکەین.

## نامەکە چی بوو؟

مەسـەلەی ئەو نامەیەش وابوو، خوێندکار (تـارا عومەر بەرزنجی) کە ناوە نهێنییەکەی (سـایە)بوو، لە زانکۆی سەلاحەدین دەیخوێند، ڕێکخراو بە حوکمی ئەوەی بەرپرسی (کەرتی شەهید لەیلا) بووم، ئەو کچەش سەر بە کەرتەکەبوو. داوای لێکردم کە وا بکرێت خانوویەك لە هەولێر بگیرێت، ئەو بچێتە ناو خانووەکە، کرێی خانوو مەسرەفەکەی ڕێکخراو بیدات، ببێتە شـوێنی کارکردنی نهێنی. نامەیەکی بۆ ئەو مەبەستە نووسیبوو، بە (مامۆستا محەمەدی مەلا حسـێن)دا کە بەرپرسـی من بوو، بۆیان ناردبووم و نامەکە دەبوو لەسەری بنووسرایە بۆ هاوڕێ (سـایە)، بەڵام نووسـرابوو بۆ هاوڕێ (کۆژین) کە نامەکەی دامێ وتم: نامەکە بۆ (کۆژیـن) نییە بۆ (سـایە)یە. وتی: تازە نایگەڕێنمەوە خۆت چاکـی بکە، ئەو نامەیەم ناردو گەیاند. ئیتر نازانم ئەم نامەیە بۆ هاتبووە ناو ناوانەوە؟ بۆ باسـکرابوو؟ دیارە بەپێی ئەوەی کە نامەکەیان لەبەردەستدا نەبوو، نامەکە نەگیرابوو یان با بڵێین دەستییان نەکەوتبوو، بۆیە مەزندەم دەکرد کە ئەو زانیارییەش هەر مامۆستا (ش) ئاشکرای کردبێت، بەمەبەستی ئەوەی کارێك بکات فشار بخرێتە سەرم و ناوی ئەندامانی کەرتەکە ئاشکرا بکەم.

## تەلەفۆنێکی ترو بانگکردنێکی تر

ڕۆژێ دوای نانخواردنـی نیوەڕۆ، زرەی زنجیر پەیدابـووەوەو ڕووی لە ژوورەکەمان کرد، دەرگایان کـردەوەو بانگیان کردم. تەنهـا جومعە بوو. بەرقـەوە کەلەبچەی کردم و چاوی بەستمەوە. بەپاڵ و قسەپێوتنەوە دایمی پێش. گەیاندمیە ژووری لێکۆڵینەوە. ماجدو جەبار دانیشتبوون.

ماجد، پێمان ناڵێیت (شـێخ نـووری) کێیەو بۆ تەلەفۆنی بۆ کردوویت؟ نازانم چ شـێخ نوورییەکە، شێخ نووریمان زۆرن، شێخ نووری قازانقایە، ئەوە حاجی شێخ نووری قازانقایەیە، پیاوێکـی بەتەمەنەو لەجێدا کەوتووە، نەخۆشـەو زۆر تەندروسـتی خراپە، بۆ تەلەفۆنی بۆ کردوویت؟ خزممانە دیارە بیسـتوویەتی کە گیراوم بۆ هەواڵ پرسین تەلەفۆنی کردووە. چۆن بزانین کە پیرەو نەخۆشـەو خزمتانە؟ ئەوە خۆتـان دەزانن، من هەر دەتوانم ئەوەتان پێ بڵێم، باوەر دەکەن بیکەن، ناشـی کەن ئەوە ئارەزووی خۆتانەو دەتوانن بپرسـن بزانن وایە یان درۆ دەکەم. لەسـەر ئەوەش زۆر نەڕۆیشـتن و وازیان هێناو بردیمانەوە بۆ شوێنی خۆم، بۆیە وام پێراگەیاندن دەمزانی تەلەفونەکە کراوە ئەگەر بشچن بۆ ماڵیان بەڕاستیی خاڵە شێخ نووری نەخۆشبوو لە جێگادا کەوتبوو.

## بردنەوەم بۆ ماڵەوەو بینینی ئازاد

دوای زیاتر لە (٢٥) رۆژ لە دەســـتگیرکردن و بـــێ ئومێدبوونیان لێم و ئەو هەمـوو ئازارو ئەشکەنجەیەیان، سوودیان لێوەرنەگرت. رۆژێك دەوروبەری کاتژمێر نۆی بەیانی بانگکرامـەوە بردیانم بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، ماجد دانیشتبوو، بەهەڕەشەوە وتی: دەبێت ئەمرۆ ماڵەکەت وێران بکەین و ژن و کوڕو کچەکانت هەر هەموو بگرین و بیان هێنینە ئێرە. ئەوەندە تووڕە بـوو ئاگری لێدەبووەوە. وتی: دەبێت لەپێش چاوت لەبەردەمی خۆتدا ئەوەی پێت ناخۆشـەو خراپــە لەگەڵیاندا بکەین. منتان بـەلاوە تاوانبارە، ژن و منداڵ گونـاه و تاوانیان چییە؟ لەبەرئـەوەی تۆ تاوانباریت دەبێـت ژیانی ئەوانیش بخەینە دۆزەخـەوە. گرنگ نییە ئەگەر ویژدانتان رێتان دەدا. ژیانیان لە ژیانی من زیاتر نییە، بەئارەزووی ویژدانتان چیتان دەوێت بیکەن. لەبەردەســتی ویژدانی ئێوەدان ئێستا دەیبینیت. بە جومعەی وت بیبەرە ئەو ژوورە. لــە ژوورێك دایانـنـام، گوێم لێبوو تەلەفۆنی بۆ (مولازم عەلی)یـەك کرد. زۆری پێنەچوو دیاربوو ئامادەبوو. بانگیانکردم، لە حەوشـەی پشـتـەوەی ئەمن سـواری خانەی ناوەڕاستی ئۆتۆمبێلێکی لاندکرۆزەریان کردم، دوو عەسکەر لەملاولامەوە سواربوون. (مولازم عەلی) یەکەش لە پێشـەوە سـواربوو. ناسـیمەوە ئەو (مولازم عەلییە) کە زۆر جار دەهاتە بازاڕی (قەیســەری نەقیب). هەر سـوار بوو، ئۆتۆمبێلەکە دەرچوو، لایکردەوە، ناسـیمییەوە وتی: ئەوە تۆیت؟ تۆ دووکانداربوویت چیت دابوو لەم بەزمە؟ بۆیە چەند رۆژە دیارنیت، بە ناحەق و لەخۆڕایـــی گــیراوم. ئێمە بە ناحەق و بە خۆڕایی کەس ناگرین، پێم ناخۆشـەو دەبوو وات نەکردایە، کەسـێك لەو بازاڕی نەقیبە دووکانی هەبێت چۆن کاری خراپ دەکات. بەدەم ئەم وتوویژانەوە کاتێکمزانی گەیشـتینە گەڕەکی مامۆسـتایان و بۆ کۆڵانی ماڵمان لایان دا... لەناو کۆڵانەکەدا، هێشـتا مابوویان بگەنە بەر ماڵمان، لەپێشـمانەوە (ئازادی کوڕم) بینی بەرەو ماڵ دەڕۆیشـتەوە. دڵم داخورپاو خۆزگام دەخواسـت نەچوایەتەوە بۆ ماڵەوە. لەم کاتەدا ئــازاد لە قۆناغی ئامادەیی دەیخوێندو زۆر خەمم بوو بیگرن، خوێندنەکەی لەکیس بچێت، گەیشـتنە بەر ماڵمان و لەبەردەرگای ماڵی محیدینی برامدا راوەسـتان، پرسیاری ماڵیان کردین، (حەپســەی براژنم) بینی و گوێم لە قیژەیەك و هەیڕۆیەکی بوو. یەکسەر سەریان پێ دانەواندم، قاچییان خستە سەر ملم و ئۆتۆمبێلەکە بەخێرایی گەڕایەوە بۆ دائیرەی ئەمن، دیار بـوو تەنها هەر ئەو ئۆتۆمبێلە نەبوو کە منیان سـوارکرد، چەند ئۆتۆمبێلی دیکەش بوون. کە گەیشـتـینەوە ئەمن، چاویان بەستمەوەو دایانگرتم و کەلەبچەیان کردمەوە. لە ژوورێکدا دایانـنام، ئەو رۆژە بەلامەوە رۆژێك بوو لە رۆژە هەرە ناخۆشەکانی گرتنم، بیرم لەوە دەکردەوە (زەینەب و کوڕەکان و بەهار) لەماڵەوەبن و بیانگرن. یان کە ماڵیان پشکنی لەماڵەوەو لە کتێبخانەکەمداو لەو شـوێنەی کە شتم تێدا دەشاردەوە، (کە بۆفییەکی ژێر تەلەفزیۆن بوو، (تەها)ی خزمی (مامۆسـتا ئەحمەد) بۆی دروستکردبووم، شوێنی شت شاردنەوەکە لەدواوەو

چەکمەجەیەکی شـاراوە بوو)، لەڕاستیدا شتی زۆری تێدابوو. دەمزانی کاسێتمان لەماڵەوە هەیە، بەڕاسـتیی ئەوەندەی لـەو ژوورەدابووم، هەر بیرم لەوانە دەکـردەوە، لە دڵی خۆمدا دەموت تائێسـتا گیانم بەوەبوو هیچم پێنەگیرابوو، ئەگەر شت لەماڵماندا بگرن، بەتەواویی دەمکوژن. دوای دوو سـێ سەعات، هاتن و بردیانم و بردیانمە ژوورێك، لەو ژوورانەی جاران نەبوو، (نەقیب ماجد) دانیشـتبوو، لە کتێبـی کتێبخانەکەم دنیایەك کتێبیان هێنابوو، لە ژوورەکە لەسەر مێترو سەر ئەرزەکە هەڵیانچنیبوو. کە کتێبەکانم بینی کـپە لە جەرگمەوە هات بۆ کتێبەکانم. وتی: دەبینیت لە ماڵتان چیمان گرتووەو هێناوە؟ ئەوە چەندین بەڵگەی نووسـراویان تێدایە، هەر هەمووی دەیسـەلمێنن کە سـەر بە (جەلال و نەوشیروان و ئێران و یاخیبووانیت) ئێسـتا دەڵێیت چی؟ لەمانەش هەر رادەکەیـت و ئینکاریی دەکەیت؟ نازانم چیتان لەماڵمان هێناوە یان گرتووە؟ دڵنیام هیچ نووسراوێکی قەدەغەکراوم نییە، لە قۆناغی ناوەندییـەوە دەخوێنمەوەو کتێب و گۆڤاری کوردی و عەرەبی دەکرم و یەك کتێبـی قاچاغم نییە. تەسجیلێکی لاوە بوو، دەستی نا بە دووگمەی تەسجیلەکەدا، شریتێکی لێدا. شریتەکە ئەو شـریتەی (مام جەلال) بوو، کە بەبۆنەی (جەبهەی کوردسـتانییەوە) تەسجیلکرابوو. ها ئەمــەش رادەکەیت؟ رەنگە بڵێیت ئەمەش هی من نییە؟ ئەمــە بەڵگەیەکە زۆر تەواوە کە هەر چیت لەسـەر وتراوەو دەوترێت راستە... نەخێر ئەو شریتە هی من نییە، لەماڵەوە هیچ جۆرە شـریتێکم نییە. تاشـریتی وام لە ماڵدا بێت... هەر گیز گوێم لە شـریتی وا نەبووە، واتـە ئێمە درۆدەکەین؟ دەڵێم ئەم شـریتە هی من نییە، لە ماڵی مندا شـریتی وا نەبووە. کۆمەڵێك کتێبـی نیشـاندام لە ناویانـدا، گۆڤاری (رۆژی نوێ، سـلێمانی، هیوا، هەتاو، بلێسە)و چەند کتێبێکی کوردی، ئەمانە چین؟ ئەوانە گۆڤارن، بەمۆڵەتی رەسمیی دەرکراون و قەدەغە نین، ئەو کتێبانەش کوردین و بەڕەزامەندیی وەزارەت چاپکراون. مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردیم و ئیختیساسـم کوردییەو چوار پێنج ساڵ لە بەغدا بووم، مانگانەو ساڵانە هەمەجۆر کتێبـی کوردی و عەرەبیم کریوە، لەگەڵ ئەوەشـدا یـەك کتێبـی قەدەغەکراوم نییە. چەند کتێبێکی نیشاندام ناوی خۆمیان لەسەر بوو، ئەمانە هی کێن؟ هی منن، بەڵام خۆ قەدەغەکراو نین. ئێسـتا ئەم هەموو کتێبەو ئەم شـریتەمان لەماڵتان گرتووە، هێشتا هـەر ئینکاریمان لەگەڵدا دەکەیـت؟ بەدڵنیاییەوە پێتان دەڵێم ئەو شـریتە هی من نییە. ئەو کتێبانەشـدا ئەگەر یـەك کتێبـی قەدەغەی تێدابوو، ئامادەی هەموو سـزایەکم. ئەوە زۆر منداڵەکانمان هێناویت!! ئێسـتا بانگیان دەکەین، ئەوەی خراپە لەبەردەمی خۆتا لێیان دەکەین، ئارەزووی خۆتانەو لەبەردەستی ئێوەدام. (جومعەی) بانگکردو بێسوودە بیبەن بزانم چی پێدەکەن.

ئەم تەحقیق، پشـکنین، هێنان و بردن و هەڵواسـین و کارەبالێدانە تا شـەویی خایاند... کـە مایەپووچ بوون لـە هەوڵەکانیان گێڕامیانەوە بۆ ژوورەکەمـان. کە کردیانمە ژوورەوە کەلەبچەکەیان لە دەسـتم دانەکەندو بە کەلەبچەوە کردیانمە ژوورەوە. (فەخرەدین) کە بینی

کەلەبچەکەیـــان دانەکەندووە، بانگیکردن کە کەلەبچەکەی لەدەســـت دامـــاوە، لە وەڵامدا دوای دێنـــــەوە دایدەکەنـــین کلیلمان بیرچووە، لەدوای بەرچاییەوە نـــە نانم خواردبوو نە ئاوم خواردبووەوە، لەڕاستیدا تینوو و برسیم بوو.

هاوڕێکانم بەشـــەخواردنی هەردوو ژەمەکەیان بۆ هەڵگرتبـــووم، لەبەرئەوەی کەلەبچەم لەدەســـتدابوو نەمدەتوانی نان بخۆم. هەندێك لە بـــرادەران خەریکی کەلەبچەکەبوون بۆیان نەکرایـــەوە. (فەخرەدین) بە نەعلێـــك کەوتە هەوڵدان و توانی کەلەبچەکـــە بترازێنێت و لە دەستمی داکەنێت. بە کردنەوەی حەوامەوەو نانم خواردو هۆشـێکم هاتەوە بەر. ئەو شەوە هەر دەنگـــی کلیل بهاتایە فەخرەدین پەلاماری کەلەبچەکەی دەدا بیکاتەوە دەســـتم. وای لێهات ئەو شەوە سەجانەکانی ئەمن لەو ناوەوە گوزەریان بکردایە، فەخرەدین بۆئەوەی من دووچاری ئەشـــکەنجەو قســـە پێوتن نەبم، پەلاماری کەلەبچەکـــەی دەدا کە بیکاتەوە دەســـتم... لە دەوروبەری سەعات یەکدا زرەی کلیل پەیدابوو، فەخرەدین هەر زوو گەیشتە لام و کەلەبچەکەی کردەوە دەستم، بەڵام سەجانەکان نەهاتن و دەرگایان نەکردەوە، دیسان کەلەبچەی داکەندەوە، بەیانییەکەی پێش بەرچایی زرەی کلیل دەســـتی پێکرد، بەردەمی دەرگای ژوورەکەی گرتین. پێش ئەوەی دەرگاکە بکەنەوە فەخرەدین کەلەبچەکەی کردەوە دەستم، هەر دەرگایان کردەوە. بانگیان کردم و چاویان بەســـتمەوە، گەیاندیانمەوە ئـــەو ژوورەی کتێبەکانی لێدانرابوو، کە چاوم کرایەوە، سەیرمکرد (ماجدو جەبارو یەکێکی دیکە) دانیشتبوون سەرنجم دا ژمارەیەکی زۆر لە کتێبەکانی کتێبخانەکەم لەسەر مێز ریزکراون و دانراون.

مـاجـــد وتییـــەوە دەزانیت ئەم کتێبانە هـــەر هەمووی لە ماڵتاندا گـــیراون؟ ئەو کتێبانە هەموو کتێبـــی کتێبخانەکەمن، پێم وتیت من مامۆســـتای زمانی کوردیم، لە منداڵییەوە کتێـــب دەکڕم و کۆیان دەکەمەوەو دەیانخوێنمەوە. کتێبەکان کوردی و عەرەبین و ژمارەیەك گۆڤاریـــان تێدایە، یەك لەو کتێبانە قەدەغەکراو نین. لە چاپخانەی عیراق چاپکراون... هەر ئەوانە نین کتێـــبی موخرەبین و دژی حکومەتیشـــیان تێدایە، بەدڵنیاییەوە دەڵێم کتێـــبی وا لە کتێبخانەکەمدا نەبووە، کتێبێکی خـــــتە بەردەســـتم ئەی ئەمە چییە؟ هەرگیز ئەوە لە کتێبخانەی مندا نەبووە، کتێبـــی وام نەبووە. پەنجەی نایەوە بە تەســـجیلەکەداو شریتەکەی مام جەلالی لێدایەوە، گوێ بگرە، هەر شـــریتەکەی رۆژی پێشـــوو بوو. دوێنێش پێم وتیت ئەوە هی من نییە. وتی: هی کێیە؟ لە ماڵەکەتدا گیراوە، لە ماڵی مندا شریتی وا نەبووە تا بگیرێت، هەر ئینکاریی دەکەیت؟

ئینکاریی لەوە دەکەم کە ئەوانە هی من نین... تووڕە بوو، بەو تووڕەییەوە، کەوتە جنێوی پیس پیس و قســـە پێوتنـــم... بۆ جنێو دەدەیت؟ جنێو عەیبە؟ وتی: پێت ناخۆشـــە؟ ئەگەر دەتەوێـــت بمکوژەو ڕەمیم بکە، بـــەڵام جنێو مەدە. وتی: وا بەئاســـانی ناتکوژین... گاڵی جەندرمەکانی دا ئادەی بیبەن. بەزەییتان پێدانەیەتەوە، تا گیانی دەرنەکەن وازی لێ مەهێنن و بشـــچن ژن و منداڵەکانی بهێنن تا ئەوە نەکەین، ئەم سەگبابە تەمێ نابێت. کە وای وت،

تێگەیشــتم کە زەینەب و منداڵەکانیان بەردەســت نەکەوتــوون و نەیانهێناون، بەئارەزووی دڵیان چەند تاقەتیان بوو، هەڵیانواســیم و کارەباو کێبڵیان لێدام، دوای ئەوەی لێم بێتاقەت بوون بردیانمەوە بۆ ژوورەکەمان نانی نیوەڕۆ خورابوو، بەشی منیان هەڵگرتبوو.. فەخرەدین کە ســەیری گیان و پشتی کردم، هەر هەمووی شین و مۆربووبوووەوە خوێنیان تێزابوو، وتی: کورینە وەرن سەیر بکەن بزانن بەچی دەردێکیان بردووە، بەپێکەنینەوە وتی: مامۆستا وایان خۆشــەکردووی ئەو شینەوەبووانەی لەشــت لەوە ناچێت بەهی خۆت بزانیت؟ خەمت نەبێت هەردەبێت ئەوان کوڵ بدەن.

لێرە بەپێویســتی دەزانم ســەبارەت بەپشــکنینی ماڵەوە دوای (٢٥) رۆژ دەســتگیرکردن ئاماژە بەوە بکەم، لام ســەیربوو، دوای بیســتوپێنج رۆژ گرتن و چەندین جۆری لێپرسینەوەو ئەشکەنجەدان، منیان بۆ ماڵەوە بردەوە، وای بۆ دەچووم ئەمن وەکو پێویست ئەو زانیارییانەی لەسەر شوێن و ڕێگامان نەبووبێت، یان ئەگەر هەیانبووبێت لەبەرئەوە نەیانویستووە بچن ئەو مامۆســتایەی لەگەڵمدابوو و پەیوەندیی بە دەزگاکانی رژێمەوە بوو، وەکو شاهید دەیانهێنایە سەرم، لەلایەن دائیرەی ئەمنەوە، ڕێنمایی کراوە، کە بەوردیی چاودێریی ماڵمان بکات، سەر لە ماڵمان بدات، بۆئەوەی بزانێت کێ هاتوچۆمان دەکات، خێزانم ببینێت و قسەی لێدەربهێنێت، کارێك بکات قســەی خۆی ســەرخات و باری من گرانتر بکات. ئەمەش دوای حوکمدانمان و چوونمــان بــۆ ئەبوغرێب، کە زەینەب و منداڵەکان و کەســوکارمان هاتن بۆ لامان، هەندێ پرسیارم لە زەینەب کرد لەو بارەیەوە، ئەویش ئەوەی بۆ باسکردم کە هەر دوای دەستگیرکردنم شەو (مامۆستا ئەحمەد ساڵح) چووە بۆ ماڵەوە، پێی وتووە هەرچیت لایە لە نووسراو و نامەو نامیلکە بمدەرێ. وتی: منیش ئەوانەی شــوێنەکانم دەزانی هەرهەموویانم کۆکردەوەو دام بە مامۆســتا ئەحمەد، (مامۆســتا ئەحمەد) پێی وتم: دوای منیش بگەڕێن هەرچیتان دۆزییەوە لەناو ماڵدا یان لەناو کتێبەکاندا، کۆی بکەنەوەو لە ماڵی خۆتان دووری بخەنەوە. لەراستیدا ئەو هاتنەی (مامۆســتا ئەحمەد) بۆ ئێمە زۆر باشبوو، چەند ڕێنمایی کردین، شلەژانەکەمانی هێورکردەوە، وتی: مامۆســتا(ش) دوای دوو سێ رۆژ سەری لە ماڵمان داوەو پرسیاری ئەوەی لێکردووە کە کەس دەچێت بۆ ماڵمان و هیچ یارمەتییەکمان دەدەن؟ رۆژێك لە پاسدا (ژیر)ی کوڕم بینیبووی کە سواری پاسی مامۆستایان بووەو بەنیازی چاودێریی بەو ناوەدا ڕۆیشتووە، لــە دابەزیندا (ژیر) خۆی لێ دزیوەتەوەو پێی وتــووە دەچمەوە بۆ ماڵەوە، لەکاتێکدا (ژیر) لە ماڵی خۆمان نەبووە لە ماڵی (مامە عوســمان)ی بووەو کەســیش لەماڵــدا نەبووە، ئەویش دانەبەزیوە بەنیازی ماڵمان ملی ڕێگای گرتووە. ئەمانە دەریدەخەن ئەو ئەرکەیان بەو سپاردبوو کاتێکیش لە ئەنجامی لێپرســینەوەو ئەشکەنجەدان لەگەڵمدا نەیانتوانی هیچ سەوز بکەن، ئینجا ڕێگای پشــکنینی ماڵەوەیان گرتەبەر. ئازاد ئەو کاتە من دیم دەچووەوە بۆ ماڵەوە، لە ماڵی (مامە لەتیف)ی بوو، چوو بوو ســەرێك لە ماڵەوە بدات و کەوتبوو بەسەر ئەو حاڵەداو بە ئامادەبوونی ئازاد ماڵەکەیان پشکنیبوو.

# شیعرێکی دڵسۆزو بانگکردنم

دوای هەرەســـی شۆرش لە ســـاڵی (١٩٧٥)دا. بۆئەوەی لە کوردستان دوورمان بخەنەوە، بـــە خێزانەوە رەوانەی خوارووی عیراق کرام و لە (قەزای حەی ســـەر بە پارێزگای واســـت) گیرســـامەوە، پاش چەند مانگێك نفوسەکەشـیان گواســـتینەوە.

بەو هۆیەوە زۆرێك لە خزم و کەســـی دڵسۆز پەرۆشـــمان بوون، هەیانبوو ئەگەر توانای هەبووایە دەهاتە ســـەردانمان و چەند شـــەو و رۆژێك لەو ئاوارەییە لامان دەمانەوە.

هەشبوو نەیاندەتوانی سەردانمان بکەن، بەرێگای نامەناردن بۆمان، لێیان دەپرسینەوەو نامـــەکان دەبوونـــە میوانمان و چەندجار بۆ (زەینەب و منداڵەکانـم) دەخوێندەوە، یەکێك لەو خزمە پەرۆشـــانەمان (مامۆستا شێخ ئیسماعیلی خالە شـــێخ محەمەدی دێلێژە)بوو. کە خالۆزای باوکم و مامۆســـتام بوو لە قۆناغی دەستکردنم بە خوێندن خێزانەکەی (باجی خەجیج) پوورزام بوو، لەو ســـاڵانەی لە بەکرەجۆ مەلابوو، ماوەی ساڵێك لە ماڵیان بووم، بۆ خوێندن و هەر ئەویش هانیدام بچمە قوتابخانەو بردمی بۆ لای (مامۆستا جەلالی مەلا کاکە حەمە) کە ئەوکاتە (بەرێوەبەری قوتابخانەی زانستی سەرەتایی ئیواران) بوو، لەرێگای تاقیکردنەوەیەکەوە خســـتمیە پۆلی چواری ســـەرەتایی. دیارە لێرەدا ئەمە بۆیە باسدەکەم مەبەســـتم دڵســـۆزیی و پەرۆشـــیی مامۆســـتا بوو بۆ من، لەگەڵ (برایم- بلە)ی کوڕیدا هاورێی خۆشەویســـتی یەك بووین، لە خوێندنی زانکۆماندا لە بەغدا بەیەکەوەبووین.

مامۆستا شاعیربوو، زۆربەی ئەو نامانەی کە بۆ دۆست و خۆشەویستانی دەنووسین، هەر هەمووی بە شیعر دەنووسین، ئەوەی من ئاگاداریبم، ژمارەیەکی زۆر نامەی شیعریی هەیە. نازناوی شیعری (دڵسۆز) بوو، دیارە مامۆستا کە من و محێدینی برام لە کوردستان دوور خراینەوە، دوورخستنەوەکەشـــمان لەسەر مەســـەلەیەکی پیرۆزی (کوردایەتی)بوو، ئەویش دڵی زۆر بە شۆرشی گەلەکەی خۆشبوو، یەکێك لە ئاواتەکانی سەرفرازیی گەلەکەی بوو، دیارە مامۆســـتا بەهەر هۆیەکەوە بوو، مۆڵەتی ئەوەی بۆ نەرەخسابوو، کە لە سلێمانییەوە بگاتە قەزای حەی و بێت بۆ سەردانمان. دڵیشی لامان بوو، (چ من، چ محێدین و زەینەب و حەپســـەی) زۆر خۆشدەویست. بۆیە نامەیەکی بە شیعر بۆ رازاندبوومەوە، بۆی ناردبووم: لـــە نامەکەدا هێمای بۆ ئەوە کردبـــوو، کە لەو دوورە وڵاتییە رزگارمان دەبێت و بە خاکی نیشـــتمان شـــاد دەبینەوە، نازانم نووسخەی ئەو نامەیە لە ئەرشـــیفیدا ماوە یان نا؟ ئەگەر مابێت و دەســـتم بکەوێت دەیکەمە بەڵگەیەکی بەهێـــز بۆکتێبەکەو بڵاوی دەکەمەوە، لە نامەکەیدا ئەوەی دەرخســـتبوو کە ئاواتی ئەوەیە لە دوورە وڵاتییەوە بگەرێینەوەو بەخاك و نیشتمانی خۆشەویستمان شاد بینەوەو دەست لە ملی ئەو و خزم و براو کەسانی دڵسۆزمان بکەینەوە، شاییلۆغانی گەرانەوەمان سازبکرێت. بەمەش سەرکەوتنی گەلەکەمان مـــزگەر دەکرێت، نامەکە لەنامە هەرەخۆش و بەچێژەکان بوو، شـــەوانەو رۆژانە دەمانخوێندەوە.

ئەم نامەیە کە ئێمە لە پارێزگای واستەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و بە خاکی نیشتمانەکەی وەکو مامۆستا نووسیبووی، شادبووینەوە، لەناو کتێبی کتێبخانەکەمدا بوو، کاتێك چووبوون بۆ پشکنینی ماڵەکەمان، ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان لە کتێبەکانم هێنابوو. بۆ ئەمن و کە لە ئەمن ناو کتێبەکانم گەڕابوون، ئەو نامەیەیان بەردەست کەوتبوو. وەکو هەنگیان لە کلۆرەداردا دیبێتەوە، بۆئەوەی بیکەنە بەڵگەیەك لەسەرم، دوای خوێندنەوەیان شەوێك دەرگاکرایەوەو بانگیان کردم، کە بردیانمە ژووری لێکۆڵینەوەی نەقیب ماجد). سەیرمکرد (ماجدو جەبارو یەکێکی دیکە) لە ژوورەکەدا دانیشتبوون، وەرەقەیەکیان بەدەستەوەبوو. ماجد وتی: دەزانیت بەڵگەی دیکەمان لەسەرت دۆزییەوە لە کتێبەکانتدا؟ وتم: بەڵگەی چۆن؟ وتی: ئەم نامەیە کە بە شیعر لە دڵسۆزەوە بۆتۆ نووسراوە... لە شیعرەکەدا باسی گەڕانەوە بۆ خاکی نیشتمان دەکات، وای دەردەخات تۆ لە وڵات دوورخراویتەوە. وەڵامی ئەم پرسیارانەمان بدەرەوە... یەکەم: ئەو (دڵسۆز)ە کێیەو لەکوێیەو ئیشی چییە؟ ئەو دڵسۆزە مەلایەکی ئایینی و شاعیربوو، ئەو ساڵانەی کە من لە قەزای حەی مامۆستا بووم ئەو نامەیەی بۆ ناردبووم، خۆی هەر نامەیەکی نووسیایە بۆ هەرکەس بەشیعر دەینووسی، خاڵۆزای باوکمە کاتی خۆی لە دێکەی خۆیان لە (دێلێژە) دادەنیشت، زیاتر لە دە ساڵە کۆچی دوایی کردووە. وتی: بەچی بزانین کە کۆچی کردووە؟ وتم: ئەوە دێلێژەیە دەتوانن بنێرن بزانن لەوێ نەنێژراوە؟ ئەی بۆ بە ناوی خۆیەوە نەینووسیوە، ئەو شاعیر بووە، لەقەبی شیعری (دڵسۆز)بووە، وەکو هەموو شاعیرێکی کلاسیکی لەقەبی شیعریی هەبووە. دووەم: مەبەستی لە گەڕانەوەتان بۆ خاکی نیشتمان و دوورە وڵات چی بووە؟ من خەڵکی ناوچەی قەرەداغم لەوێ لەدایکبووم. واتە (مسقط الرأس)مە، خاکی نیشتمان مەبەستی شوێنی لەدایکبوونمەو دوورکەوتنەوەش لە وڵات مەبەستی ناوچەی سلێمانییە، کە لێی دوورکەوتوومەتەوە، لە شوێنێکی وەکو (پارێزگای واست) نیشتەجێبووم، وتی: بۆ خاکی عیراق بە وڵاتی خۆت نازانیت؟ دوورکەوتنەوەت لە سلێمانی بۆ واست بە دوورکەوتنەوە دەزانیت لە نیشتمان؟ ئەی عیراق نیشتمانی هەموو عیراقییەکان نییە؟ وتم: ئەوانە وایە، بەڵام ئەو مەبەستەکەی بەو شێوەیەنەبووە، کە ئێستا لێکی دەدەنەوە... نامەکەی دایە کەسی سێیەم، پێی وت نامەکەی بۆ بخوێنەوە. ئەویش سەرپاکی نامەکەی خوێندەوە، لەکاتی خوێندنەوەی نامەکەدا دڵم کرایەوە. کۆمەڵێك یادگاریی بەمێشکمدا تێپەڕی کردو گەشتێکی بەناو قەرەداغ و سۆڵەو دێلێژەو دەربەندی بازەڕەی پێکردم و ئاهێکم پێداهاتەوە. ئەوەی نامەکەی خوێندەوە کوردبوو، لێی پرسی قسەکەی وایە؟ وتی: گەورەم قسەکەی وایە، مەبەستی تری لەپشتەوە نابینم، ئەو شاهیدییەی ئەو کوردە ئەمنە یارمەتیدام و قەناعەتیان بە قسەکانم کرد، ئەمجارەش بە سەلامەتیی قوتاربووم، کە گەڕامەوە بۆ ژوورەکە، فەخرەدین و برادەران هاتن بەپیرمەوەو کە لێیان پرسیم و مەسەلەکەم بۆ باسکردن و فەخرەدین وتی: جا ئەو مەلایە مردووە؟ وتم:

مردنی چی زرت و زیندوو ماوەو لە سلێمانییەو مەلای مزگەوتە، بۆیە بەو شێوەیە باسی ئەو شیعرەو مامۆستام کرد، چونکە نامەکە گیرابوو. دەمزانی کە بۆ تاقیبی قسەکانم ناتوانن بگەنە گوندی دێلێژە.

# رزگار محەمەد و ژووری (٢)

ژووری دوو هەرچەنـدە زینداني زۆری تێدابوو، لەگەڵ ئەوەشـدا بـەردەوام زیندانیی دیکەیان بۆ دەنارد گوێیان بەوە نەدەدا کە ژوورەکە لەو ژمارەیە زیاتر هەڵناگرێت. لە کۆتایی مـانگی دوودا رۆژێك دەرگا کرایەوەو کوڕێکی رەشـتاڵەی لاوازی باڵابەرزیان کردە ژوورەوە، سـەجانەکان هیچ قسەیەکیان لەبارەوە نەکرد وەك ئەوەی بیشـێلن. ناوی مەدەنی، بەکردنە ژوورەوەی یەکسـەر دەرگیان داخسـتەوە، برادەران چوون بەپیریەوە، خۆی ناسـاند کە ناوی رزگار محەمەد عەبدوڵلا)یەو لەسـەر کۆمەڵەو (ی.ن.ك) گیراوە، لە روویدا هیچ سیمایەکی نەشـکەنجەدان و نازاردانی پێوە دیار نەبوو... کە برادەران تێگەیشـتن کە ئەویش لەسـەر (ی.ن.ك) گـیراوەو لەگـەڵ هاورێیانی ئێمەدایە زۆر ڕێزیان لێنگـرت. من رزگارم لە دەرەوە نە هیچ روویەکەوە نەدەناسـی، ئەویش هەروەها منی نەدەناسی. وتی: من کوڕی (مامۆستا محەمەد عەبدوڵلا ژاژڵەییم)و رەنگە لەگەڵ باوکمدا یەکتر بناسـن. لەراسـتیدا لەبەرئەوەی مامۆسـتا محەمەد) مامۆستای سـەرەتایی و لەتەمەندا زۆر لە من گەورەتر بوو، ئەویشم وەکو پێویست نەدەناسی، بەڵام ناوەکەیم لا نامۆ نەبوو، باسی ئەوەی کرد کە (فەرمانبەرە لە دائـیرەی کارەبای دووکان)و لەناو دائـیرەدا گیراوە. وتی: منـیان بردووەتە لای (هاوری جەبار)، رزگار) کە رۆژانە رۆژنامەی سـەورەمان بۆ دەهات بەنۆرە لەگەڵ (مامۆستا حەسەندا) بۆیان دەخوێندینەوە، لەبەر هەندێ لە برادەران کە عەرەبییان نەدەزانی، بۆیان دەکردن بەکوردی... رزگار زۆرجار کە باسـی لە ژیان و بەربوون و ئیشـوکارو چوونە دەرەوەو پێشمەرگە دەکرا، دەیوت من ئەگەر ئازادکرام ئەشچمەوە سەرَ وەزیفەکەم بۆیاخێکی زۆر باش دەزانم، دووکانی بۆیاخچیێتـی دادەنێم. فەخرەدین لای سـەیربوو، کە ئەو لە ئەمن لەسـەر (ی.ن.ك) گیراوەو ئەگەر بەربێت لەناوشـاردا دەمێنێتەوەو بیر لەچوونە دەرەوەو پێشمەرگایەتی ناکاتەوە!! هەر کەبوو بە سـتافی ژوورەکە، کەرچکی پێدراو لەگەڵ دووکەسـی دیکەدا کرایە سەفەرداش...

هاوریٚ رزگار رۆژێك دوو بەدوو باسـی چۆنێتی گرتنەکەی و هۆیەکەی بۆ باسـکردم. وتی: من لەلایەن (هاوریٚ جەبار)ەوە بەریدی سـەرکردایەتیم پێسپێردرابوو، هەموو جار لەرێگای ئابینەوە دەمبرد. من لەسـەر ئەوە گیراوم. باسـی (کویسـتانی) خوشـکی کرد کە ئەویش پەیوەندیی بە هاوریٚ جەبارەوە بووە، کە هاوریٚ جەبار گیراوە ئەو خۆی شـاردووەتەوە. رۆژێك لای ماڵی خۆیان لەکاتی چوونـەوەی بو ماڵەوە درکی بەوە کردووە، کە چاودێریی دەکرێت. ئۆتۆمبێلێـك لە تاقیبیدایەو کە زانیویەتی خۆی دەربازکردووە، بەردەسـت نەکەوتووەو لەو رۆژەوە خۆی شاردووەتەوە.

# شاندەرچوون و شەوێکی پڕ ئازار

شەوێك هەر ئێوارەو دوای شێوکردن، زرەی زنجیرو کلیل و هەڵگرتنی دەرگا پەیدابووەوەو دەرگاکردنەوەو بانگکردنم یەك بوو، هەر گەیشـتمە نـاو دەرەوەی ژوورەکە پەرێو کەلەبچە ئامادەبـوو. ئەمجارە (جومعەو رەحیمو حەمە بوون)و (جەبار)یـان لەگەڵدابوو. (جومعە) بە پالێکەوە بیکە بە خاتری خوا شـل و کول بووین بەدەسـتتەوە، خـۆت و ئێمەش رزگار کە، مردیـن مرد... بردیانمەوە بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، چاویان کردمەوە. لەسـەر کورسـییەك دایاننام، مامۆسـتا (ش) دانیشتبوو، (نەقیب ماجد) وتی: مامۆستا قسەی بۆ بکە... کەوتە قسەکردن و داوای لێدەکردم بە قسەیان بکەم، ئەوەندە ئازاری خۆم نەدەم و بەزەییم بە خێزان و منداڵەکانمدا بێتەوە، لە قسەکانیدا ئەوەی رووندەکردەوە، کە ئەوان هەموو زانیارییەکیان لەبەردەسـتدایە، ئەو برادەرانەی لەگەڵما گیراون، قسەیان لەسەرم کردووە، ئەو قسەی رست و من کەمم بیسـت، چونکە ئەگەر بە قسەی (ش)بووایە دەبوو رۆژانە لە ئەمن لەگەڵ چەند هاورێمدا رووبەرووی یەك بکرایەنەتەوە، لەکاتێکدا جگە لە یەك هاورێ، لەگەڵ کەسی دیکەدا نەبرایـنـە بەرامبەر یەکتر، نەقیب ماجد وتی: خـۆ بەگوێی خۆت گوێت لێبوو ئەو برادەرەت چی وت؟ ئەو لەبەر تۆیەتی قسەم نەکرد... قسەکانی ئەو برادەرە لەناخەوە دەیخواردمەوە... جنێوم بەو کەسـە دەدا کە بە یەکیان ناسـاندین، بۆ قسە ناکەیت؟ هەر قسەم نەکرد، گاڵیدا مامۆسـتایان لە ژوورەکە بردە دەرەوە، هەر ئەو رۆیشـت نەقیب ماجد هەسـتایە سـەرپێ، بـە کێبڵ و بە شـەق و بە بۆکس بە جنێوی پیس پیس تێم بەربـوو. کاتێکمزانی بە کەلەبچە هەڵیانسـاندم و دایانمەپێش، حەمـە بەهەموو هێزی خۆی بە شـەق تێیهەڵدەدام و بە کێبڵ لە پشـت و سـەرو گیانمی داگرتەوە، بردیانمە ژووری فەلاقەکردن، واتە ژووری هەڵواسـین نـا. ژوورێکی دیکە بوو لـەو ژوورە گەورەتربوو، جومعە گرتبوومـی و حەمە لێی دەدام، ئەوەندەیان ئازاردام لەهۆش خۆم چووم.

کاتێك هۆشـم هاتەوە لە ژوورێکی بچووکدا رایانکێشابووم، جومعە هاتە لامەوە. ئەمە باشـە وا لە خۆت دەکەیت؟ بـە پاڕانەوە لێم دەپاڕایـەوە، راسـتییەکانیان پێبڵێم، دەیوت دەبێت بزانیت تا قسـەت پێنەکەین وازت لێناهێنین، ئێمـەش و خۆت قوتار بکەو رۆحمان لەگەڵتا دەرهات، هەڵیانساندم، ماجد پەیدابووەوە، ژووری ئەشکەنجە خۆت بگرەو گەیشتنم و هەڵواسـینم یەك بوو، لەبەرئەوەی ئەوشـەوە ئازاری زۆر درابووم. لە هەڵواسـینی جاری سێیەمدا هەستمکرد (شانم) دەرچوو کە دایانگرتم لە هۆش خۆم چووم لەبەر ئازاری شانم.

بەبێ هۆشـیی هەڵیانگرتبووم بردبوویانمەوە ژوورە بچووکەکە. کە هۆشم هاتەوە (رەحیم) بەسـەرمەوە راوەسـتابوو، وتی: مامۆسـتا چۆنی؟ وتم: زۆر خراپم... هەسـتدەکەم شـانم دەرچـووە، (جومعە) پەیدابـووەوە، جلەکانیان کردەوە بەرم، بەڵام بـەچ حاڵێك دەردی کورد دەڵێت (حاڵی سـەگەرەش) شان داکەوتووە، کەلەبچەم لەدەستدایە، لەتاو ئازاری هەر ئەوەتا

کێنم دەرناچێت. گەیاندیانمە ژوورەکەم. چییان گەیاند مردوویەك، لە هەموو جارەکانی دیکە خراپترو بێتاقەتتر، کە هەر گەیشتمە ناو ژوورەکە، یەکسەر دانیشتم و لەتاو ئازاری شانم خەریکبوو گیانم دەردەچوو، برادەرەکان دەورەیان لێدام وتم: لێمگەڕێن... شان و قۆڵم مەجوولێنن، شانم دەرچووە، کە سەیریان کردم قسەکەم ڕاست دەرچوو، (مامۆستا حەسەن) مامۆستای وەرزش بوو، هاتەلامەوە، وتی: بزانم هەوڵێك نادەم بیبمەوە شوێنی خۆی؟ زۆر هەوڵیدا ئەنجامی نەبوو، هەموو برادەرانی ژوورەکە خەم دایگرتن، منیش لەگەڵ ئازاری شانمدا سوپاسم دەکردن... بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر شانم نەچێتەوە جێی خۆی، شانم سەقەت دەبێت... ئەو شەوە تا خەوتن ئازار کردی و من کردم.

کاتی خەوتن نەمدەزانی لەسەر چ لایەك ڕاکشێنم، ئەوان خەوتن جگە لە (کەمال و فەخرەدین و حەمەڕەحیم و عوسمان) وەکو ئازارەکەی من بەوانەوە بێت وابوو نەدەخەوتن... بە مەزەندە لە دەوری سەعات (٣)دا بوو خەوم لێکەوت، تا بەیانی خەبەرم نەبووەوە. کە خەبەرم بووەوە، هەستم کرد. شانم چووەتەوە جێی خۆی، ئەو ئازارە زۆرەی شەویم نەماوە. دەستم لەشانم دا تێگەیشتم کە چووەتەوە جێی خۆی. یەکە یەکە پرسیاریان لێدەکردم، کە دەمووت شانم چووەتەوە جێی خۆی خۆشحاڵ دەبوون (مامۆستا حەسەن) هات سەیری شانی کردم و بەراوردی کرد لەگەڵ شانەکەی دیکەمدا، دەستێکی بەڕیشیدا هێنا و وتی: حەمد بۆ خوا چووەتەوە جێی خۆی.

دوای ئەو بانگکردن و شاندەرچوونە لەوە دەترسام بانگم بکەنەوەو ئازارم بدەنەوە، شانم دەربچێتەوە، بەیەکجاریی دەمرم و شانیشم بەدڵنیایی سەقەت دەبێت.

خواو ڕاستان بۆ چەند ڕۆژو شەوێك بانگکردن نەما... (فەخرەدین) وتی: مامۆستا دیارە ئەم شاندەرچوونە بووە خێرو بەرەکەت بۆت. هەر باشە دیارە وازیان لێت هێناوە، ئەموت کۆڵیان پێدەدەین؟ دەستخۆش کۆڵت پێدان. لەو ژوورەدا (فەخرەدین) زۆر لە خەمی مندا بوو، ئەگەر (بەخشی کورم) لەگەڵدا بووایە، ڕەنگە هەر ئەوەندەی ئەو خەمی بخواردمایە، لەگەڵ ئازارو ژانەکانمدا بووایە، بۆیە چاکەی (ئەو و کاکە حەمەو عەتاو عوسمان و کەمال و مامۆستا حەسەن و برادەرەکانی دیکەشم) هەرگیز بیرناچێتەوە.

# مامۆستا فەرەیدوون دارتاشیش هێنرایە ژووری (٢)

رۆژێك کاتێکمانزانی یەکێکیان بەپاڵ فرێدایە ژوورەوە، کەسەکە پیاوێکی چاویلکە لەچاو بوو، هەر هاتە ژوورەوە رۆژباشی کرد. یەکەمجار من نەمناسیبەوە، کە جێگایان بۆ کردەوەو دانیشت خۆی بە برادەرانی ژوورەکە ناساند، ئینجا تێگەیشتم کە ئەمە مامۆستا فەرەیدوون دارتاشە. لەراستیدا لە دەرەوە زۆر لە یەکەوە نزیك نەبووین و هاورێی یەك نەبووین... من دەمزانی کە مامۆستا فەرەیدوونە، پێش گرتنمان بە ماوەیەك شەوێك لە یانەی پزیشکان کە لەخوار سجنەوە بوو. لەگەڵ کۆمەڵێك هاورێی مامۆستامدا دانیشتبووین و هەر ئەوشەوە هاتە لامان و ماوەیەك دانیشت هەر ئەوەندە لە دەرەوە لەنزیکەوە یەکمان ناسیبوو، باسیش نەکرابوو، کە پەیوەندیی بە رێکخستنی کۆمەڵەوە هەیە، یان رۆژێك لە رۆژان لە شانەو هێلێکدا رێکەوتی نەکردبوو بەیەکەوە ئیش بکەین و لە بیروڕای یەکتر تێبگەین و لەو باوەڕەدابووم ئەویش هەر ئەوەندە منی دەناسی کە مامۆستام. لەو شەوەدا زانی کە بەرێوەبەری ناوەندیی زانستی شەوم. کە بوو بەکەسێکی ژوورەکەو قسەی بۆ کردین، بۆمان دەرکەوت کە ئەمیش لەسەر پەیوەندیی بە رێکخستنی کۆمەڵەوە دەستگیرکراوە، واتە سەر بە (ی.ن.ك)ە.

ئەمیشیان زۆر بانگدەکرد بۆ لێکۆڵینەوە، بەلام لەبەرئەوەی نەخۆشیی دڵی هەبوو ئازاری جەستەییان نەدەدا، تەنها شەڕی نەفسییان لەگەڵدا دەکرد، زۆر جار چاویلکەکەیان لێدەسەند و بەبێ چاویلکەش ئەو نەیدەتوانی هەنگاو بنێت، زورجاریش هەڕەشەی هێنانی ژن و کچەکانیان لێدەکرد. مامۆستا فەرەیدوون بەردەوام داوای حەبی زەخت و دڵی دەکرد، (جومعەو حەمە) لەسەر ئەو داوای حەبانە زۆری لێ توورە دەبوون، مامۆستا فەرەیدوون بوو بەسەفەرداشی دوو برادەرو کەوچکیان بۆ پەیداکرد، لە مرناقەشەو قسەکردنەکاندا بەزۆریی بەشداریی دەکرد، تەحلیلاتی بۆ بارە سیاسییەکە دەکرد. لەکاتی دۆزینی گیانماندا ئەو لە زۆریی ئەسپێ لە جلەکانیدا بەشی شێری هەبوو. فەخرەدین و برادەران بۆیان دەژمارد، بەلام ئینکاریی دەکردو دانی بەزۆریی ئەو ئەسپێیەدا نەدەنا کە لێیان دەدۆزی.

## حەمە سەعیدو هێنانی بۆ ژووری (٢)

شەوێك لە شەوەكان كاتێكمانزانی جومعە دەرگای كردەوەو پیاوێكی قەڵەوی رەشتاڵەیان فڕێدایە ژوورەوە. بەپێی نەریتی ژوورەكە برادەران بەپیریەوە چوون. لێیان پرسی لەسەر چی گیراوەو ناوی چییەو خەڵكی كوێیە؟

وتی: ناوم (حەمە سەعید)ە، خەڵكی ناوچەی پێنجوێنم، لەسەر موستەشارێك گیراوم كە چووەتە دەرەوەو بووەتە پێشمەرگە.

(حەمە سەعید) پیاوێكی ئێجگار فەقیرو زۆر قەڵەوبوو، كە هێنایانە ژووردوە نارەق لە دەموچاوی هەڵنیشتبوو، فەخرەدین و حەمەرەحیم و عوسمان لێی كۆبوونەوە، بەوردیی زانیاریی تەواویان لێوەرگرت، تێگەیشتن كە ئەو لەسەر راكردنی موستەشارێك گیراوە، كە ئەم یارمەتیداوە لە راكردنەكەیدا. كەوتنە تەمێكردن و ئامۆژگاریكردنی. زۆریان قسە بۆكردو رێ و شوێنیان بۆ داناو تێیانگەیاند كە ئازارو ئەشكەنجە چەند رۆژێكەو كۆتایی دێت، گرنگ ئەوەیە ئەو دان بەخۆیدا بگرێت و ئەوەی لەسەری گیراوە دانی پێدانەنێت و نێنكاریی تەواوی لێبكات.

## (حەمەڕەحیم و فەخرەدین و عوسمان) شۆردیانم

ماوەی زیاتر لە (٢٥) ڕۆژ بوو دەستگیرکرابووم. لەو ماوەیەدا شەو و ڕۆژ بە بەردەوامی ئازارو ئەشکەنجە دەدرام، چەندین شەو گیانم ئارەقی کردبووەوەو وشکبووبووەوە، لەشم تەواو چڵکن بووبوو، بەهۆی چڵکنییەوە تاك و تەرا ئەسپێم تێدابوو، بۆیە گیانم زۆر دەخووڕا.

ڕۆژێك دوای نیوەڕۆ (حەمەڕەحیم و فەخرەدین و عوسمان) وتیان: مامۆستا بۆ نەتشۆین؟ هەرچەندە ئاوەکە ساردە، بەڵام بۆ ئێستای تۆ خۆشۆردنێ بەو ئاوە ساردەش دەبێتە هۆی حەوانەوەت، ئەو ئاڵۆشەی گیانیشت نامێنێت، (حەمەڕەحیم) وتی: مامۆستا من تا نەگیرابووم هەموو هەفتەیەك خۆم باوکم دەشۆرد، تۆش ئێستا وەکو باوکمی، وتم: جا چۆن؟ (حەمەڕەحیم) وتی: من دەتشۆم و فەخرەدین ئاوت پێداکات، تۆش خێراخێرا دەست لە گیانت بخە باگیانت بجووڵێت بۆئەوەی سەرمات نەبێت، منیش بە داواکەیان ڕازیبووم، بردیانمە (ئاودەست-حەمامەکە) چۆنیان وت وایان کرد، لە ماوەیەکی کەمدا لەو حەمام ئاودەستەدا شۆردیانم. کاکە حەمە بەو حەرەکەی دەستەی بە پەلەپەل دەستی سابوونی لێدەدام و فەخرەدینیش ئاوی پێدادەکردم بەهۆی ئەوەی هەرسێکمان حەرەکەمان بەگیانم دەکرد سەرمام نەبوو، هەستم بەوە نەکرد سەرمایە، (عوسمانیش) جلەکانی ژێرەوەی بۆ شۆردم، بەو خۆشۆردنە گیانم حەوایەوەو تەواو گیانم سووك بوو. خرووی لەشیشم کەمبووەوە، بەڵکو هەر نەشما... ئەوەی ئەوان کردیان پەرۆشیی و دڵسۆزییان بوو بۆم.

# (عەریف تالیب) میوانێکی رۆحسووک بوو

دوای مانـــەوەم بۆ ماوەیـــەك لـــە ژووری دوودا، ئێوارانێك دەرگایان کـــردەوە، پیـــاوێکی بەتەمەنیـــان کرد بەژووردا... بە گەیشـــتنی بۆ ناو ژوورەکە ســـلاویکردو بەپیریـــەوە چوون و پێشـــوازییان لێکرد، لەنێوانی مامۆستا حەسەن و ســـەرکەوتدا جێیان بۆ کردەوە... کەم کەســـی ژوورەکە دەیانناســـی، بە تەنها کەسێك بیناســـێت من بووم. منیش هەر لە کۆنەوە وەکو (عەریف تالیب مۆریاســـی) دەمناسی و دەمزانی لە شۆرشی ئەیلوولدا پێشمەرگەبووە، لە شەســـت و چواردا سەر بەبالی (مەکتەبی سیاســـیی) بووە، جێگاو شوێنی لەناو شۆرشدا دیاربـــوو. بەهۆی ئەوەی دووکانی لە بەرامبەری خانەقای مەحویەوە هەبوو. منیش لەســـەر (شەقامی چوارباخ) ئێواران دەچوومە دووکانێك کە هی (تەهای ئامۆزام)بوو، جارجار یەکمان دەبینی و سلاومان لە یەك دەکرد، بەلام وەك ئەوەی بلێیت لە ڕێکخستندا بەیەکەوە کارمان کردبێت. یان ئاگاداری یەکبووبین لە کاری ڕێکخســـتندا ئەوە نەبوو، بەلکو نە ئەو و نە من هیچمان لەرووی کاری ڕێکخراوەییەوە ئاگاداریمان لە یەك نەبوو.

کە دانیشـــت و لێی نزیکبوومـــەوەو بەخێرهاتنم کردو لێمپرســـی (کاك عەریف تالیب) دەمناسیت؟ یەکسەر وتی: تکایە پێم مەلا (عەریف تالیب)... با نەزانن من (عەریف تالیبم). ئینجا وتی: بەخوا بە باشـــی ناتناســـمەوە، وتم: فلانم. وتی: ئەی تۆ بۆ گیراویت؟ منیش وتم: ئەی تۆ بۆ؟ وتی: کەواتە یەك دەردین. لێم پرســـی لەگەل ئازارو ئەشـــکەنجەداندا چۆنیت؟ وتـــی: من چەند رۆژێکە دەســـتگیرکراوم و لە ژووری یەك بـــووم، ژووری یەك زۆر خۆش و فراوانە، وەکو ئەم ژوورە نییە، (دارای کوێخا عەبدوللاشـــیان) گرتبوو. نەمدەزانی لەســـەر چی گیراوە، باســـی ئازاردانت کرد، هەر چەندە نەخۆشـــیی دلیشم هەیە بەبێ ویژدانانە ئازارم دەدەن، زوو زوو بانگم دەکەن. وتی ئەی تۆ؟ وتم: ئەم برادەرانە دەزانن پرســـیار لەمان بکە، ئەوســـا دەزانیت من بەچی دەردێك براوم. بەهەرحال جارێکی دیکە بەسووکیی پێی وتمەوە، کـــە بانگت کـــردم مەلا (عەریف تالیب) هەر بـــلا (مام تالیب). با ئەم ســـەگبابانە نەزانن، بۆئەوەی شـــتی کۆنم لەســـەر زیندوو نەکەنەوە، دیارە ئەمیش بوو بە یەکێکی تری ســـەر بە ڕێکخستنەکانی کۆمەلەو (ی.ن.ك)، (مام تالیب) بەڕاستیی پیاوێکی رۆحسووك و قسەخۆش و لەسەرخۆو بەهیمەت بوو. ئەویش چاوی باش نەبوو، خرایە پال من و مامۆستا فەرەیدوون و حاجی رەشـــیدو مامۆســـتا حەســـەن، بۆ جیاکردنەوەی لە ســـەردی حاجەت شۆردن و جل شۆردن، بۆ ئەســـپێ دۆزنیش رووبەرووی (سەرکەوت و عەباس) کرایەوە، ماوەیەکی زۆر لەو ژوورەدا بەیەکەوەبووین. هەرچەند ناو ئەمن بوو لە بارێکی نالەبارو ناخۆشدا دەژیاین، بەلام ئەو ماوەیەمان بەخۆشـــیی بەســـەر برد، رۆژگارە تالەکەمان کردبووە رۆژگارێکی خۆش و پڕ ئومێد.

# دوا شەوی ئەشکەنجەدانم

دوای ئەو شەوەی کە لە ئەنجامی ئەشکەنجەی جۆراوجۆرو دەرچوونی شانم، خۆشبەختانە چەند شەوێك بانگنەکرام. شەوێك (جومعەو رەحیم) هاتن بردیانمەوەو دیارە هەر وەکو جارەکانی دیکە کەلەبچەو چاوبەستنەوە هەبوو. جومعە پەلەی زۆری لێدەکردم. لەدواشەوە کیبل بەدوای کێبلدا تێی دەسرەواندم و پەیتا پەیتاش جنێو و قسەی ناشیرینی پێدەوتم. سەربازێکی ئەمن چی وەڵامدەیتەوە؟ وام حیسابکرد رووم لە دیەك کردووەو سەگم پێدەوریت.

دیاربوو رەحیم لەو رەفتارە زۆر قارس و پڕبوو... بۆیە پێی وت: عەیب ناکەیت بەم شێوەیە تۆ رەفتار لەگەڵ ئەم پیاوەدا دەکەیت، ویژدانت بێت ویژدان؟

لە وەڵامیدا جومعە وتی: بۆ وای لێنەکەم؟ ئەمە چەند مانگە ئیمەی دارزاند ئەوەندەمان هێناو برد کولبووین و گیانمان دەرچوو، بۆ دان بە تاوانەکانیدا نانێت. خۆیشی و ئیمەش رزگار ناکات؟ وا دەزانێت بەم قسەنەکردنەی رزگاری دەبێت. دەستی بە ئاسمانەوە بێت چارەنووسی هەر ئیعدامەو ئیعدام دەکرێت. بەم قسەو گفتوگۆیەوە ژووری ئەشکەنجەدانیان بۆ رازاندبوومەوە. هەر ئامێرێکی ئەشکەنجە لەلایەکەوە ملی قوتکردبووەوە. لە ئامادەباشیدا بوون بۆ ئازاردانی گیانم، نەقیب ماجدیش بە غەزەبەوە راوەستابوو، بۆ پێشوازیکردنم. هەر چاویان کردمەوە نەقیب ماجد وەکو سەگی هار دەمی پیسی کرایەوە، وەکو گەڵای داری پایز جنێوی لەدەم هەڵدەوەری. لەگەڵ جنێوداندا ئاهەنگی هەڵواسین و کارەبالێدان ژووری ئەشکەنجەدانی رازیکرد. هاوار هاوارەکانم ناچاریکردن دامبگرنەوە، ماجد بەدەم کارەبالێدانەوە، هەرەشەی دەکردو دەیوت: ئەگەر جەماعەتەکەت هەر هەموو بەربدرین، تۆ هەر دەبێت ئیعدام بکرێیت، خوا بەقوربانی سەرۆك سەدامتان بکات کە بریاری داوە لێرە نەتانکوژین، بتان نێرین بۆ مەحکەمەی سەورە... ئەگینا هەر زوو هەر هەمووتانمان لێرە لەناو دەبرد وەکو ئەو هەموو تاوانبارانەی تر کە لەنارمانبردن

ئەو شەوە وەکو بڵێی دوا شەوی ئەشکەنجەدانیان بێت، بیانەوێت بەتەواویی داخی دڵیان بڕێژن. هەرچییان بۆکرا لە جۆری ئازارو ئەشکەنجەدان کردیان. کە داخی دڵیان رشت و ناچاربوون کۆڵ بدەن گێرامیانەوە بۆ شوێنی خۆم. هەر گەیشتمە ناو ژوورەکە یەکسەر (فەخرەدین و عەتاو عوسمان) پەلاماریاندام، دیاربوو زۆرم پێچوو بوو بۆم بێتاقەت بوون، وتیان زۆرت پێچوو، لەوە دەچێت زۆریان ماندووکردبێت؟ وتم: وازم لێبهێنن ئەوەی ئەمشەو پێیانکردووم مەگەر شەوەکانی کە تازە گیرابم پێیان کردبم. لام سەیر بوو ئەو شەوە شانم دەرنەچووەوە، وابزانم ئەو هەڵواسینە بەتەواویی شانی بردەوە شوێنی خۆی و قایمی کردەوە، کەوتنە شێلانم بەدەم شێلانەوە کە دەستیان بۆ شانم برد خۆشحاڵبوون کە دەرنەچووەتەوە. بەڵام گیانم، هەر هەموو دەی زریکاند، پشتیان هەڵدامەوە، فەخرەدین بانگی برادەرانی کرد، وتی: وەرن وەرن سەیری پشت و گیانی بکەن، بزانن ئەم خوانەناس و بێویژدانانە چییان

ێکردووەتـــەوە. دیاربوو هەر هەموو شـین و مۆر بووبووەوە خوێنـــی تیژابوو. لەبەرئەوەی هاوڕێکانی ژوورەکەم، هاوڕێگەلێکی دلـــسۆزو باشـــبوون، هەرچەندە ئازاری شان و پشت و گیانم زۆربوو، دەربەست نەبووم، پەرۆشییان ئازارەکانمی هێوردەکردەوە، وام نیشاندەدان کە هەر هیچ ئازارم نییەو گیانم نایەشێت.

ئەم بانگکردن و ئاشکەنجەدانە لە ڕۆژی گرتنمەوە بەردەوام بوو تا سەرەتای مانگی چوار ئەوەی بەپێویـــستی دەزانم باسێکی کورت و ســـەرپێیی بکەم، ئێمە ئەو کۆمەلە هاوڕێیەی لــە ســالی ١٩٨٩و مانگی یەکــی ١٩٩٠-ەوە بەردەوا گیراین، هەر هەمووشـــمان بە تاوانی کارکردنمان لە ڕێکخســـتنی نهێنی ناوشــارو ســـەر بە (کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستان)و (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) گیرابووین. هەمانبوو پێش من بە چەند ڕۆژو هەشبوو دوای من، هەشبوو لە شەو و ڕۆژی گرتنی مندا گیرابوو. ئەو هەموو هاوڕێیە کە لەو ئەمنەدابووین، زۆرێکمان وەکو جاریتریش باســـمکردووە، لەپێـــش گرتنماندا بەیەکەوە کارمانکردبوو، بەلام خۆشـــبەختانە کەسمان ڕووبەڕووی یەك نەکراینەوە، ئەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو هاوڕێیانە چەند خۆگرو بەتوانا بوون لەو ئەمنەدا.

(مامۆســـتا ئەحمەدی سەناعە - هاوڕێ گمۆ) زیاتر لە هەشت مانگ بوو لە پێش ئێمەدا گیرابوو، ئەوەی بەو کرابوو، لەڕاســـتیدا بە کەســـمان نەکرابوو. بوو بوو بە پالەوانی ئەمنی ســـلێمانی و زیندانیی نەبوو باسی ئازایەتی و خۆراگریی نەکات، لەگەل ئەوەی ڕاستەوخۆ لە دەرەوەی ئەمن کەسێکی بەسەرەوەبوو، لەو مەخبەئەی لە ژێرزەمینی مالەکەیدا بوو، بەهۆی ئەو تاوانبارەی کە لەدەرەوە بەســـەرییەوە بوو. چەندین نووســـراو، ڕاپۆرت، نامە، بەیاننامە، نامیلکە، ئامێری چاپ و شتی نهێنی ڕێکخستن گیرابوون. هێشتا بەخۆراگریی بەرگریی لە خۆی و لە هاوڕێیانی کردبوو. لەو هەموو زانیارییانەی لایبوون لەسەر هاوڕێیانی ڕێکخستن و هێلەکانی پێشمەرگەی ناوشارو تەتەرو زۆرکاری نهێنی شۆرش، هەر هەمووی پاراستبوون و نەیدرکاندبوون.

# بانگکردنم بۆ ئیفادە وەرگرتن

بەیانییەك لەدوای نان و چاو لە دەوری سەعات نۆدا بوو، زرەی زنجیرو کلیل و قفلکردنەوەو بانگکردنم یەك بوو، ئەوەی هاتبوو بەدوامدا رەحیم بوو، کەلەبچەکەی لەپێشەوە کردە دەستم، یەکەمجار بوو کەلەبچە لەپێشەوە بکەنە دەستم، لام سەیربوو، بە پەرۆیەکی تەنك چاوی بەستمەوە بەئاسانی بەرپێی خۆم و دارو دیوارو شوێن و ڕێگای رۆشتنەکەم دەبینی...

بەبێ پەلەکردن زۆر لەسەرخۆ وردە وردە بردمی، ئەمجارە بەرەو شوێنی ئەشکەنجەو لێکۆلینەوە نەرۆیشتین، چووینە حەوشەکە، وتی: مامۆستا شوکر تەواو بوویت، دەتبەم بۆ ئیفادە وەرگرتن. لای حاکم، وتم: حاکم؟ وتی: ئا حاکم هاتووە دەیەوێت ئیفادەت وەرگرێت، دوای ئیفادە وەرگرتن ئیتر بانگکردن و ئازاردانت نامێنێت.

چوومە ڕارەوێك، لە ڕارەوەکە بردمییە بەردەرگای ژوورێك پێش چوونە ژوورەوە، چاوی کردمەوەو کەلەبچەی لە دەستم داکەند، هەندێك ڕێکیخستم و چووە ژوورەوە، سەلامێکی کردو هاتەوە دەرەوەو منی لەگەڵ سەلامێکی خۆیدا بردە ژوورەوە.

حاکم وتی: با لەسەر ئەو کورسییە دانیشێت. دانیشتم حاکم لە پشتی میزێکەوە دانیشتبوو، رەحیم چووە دەرەوە، حاکم کەوتە پرسیارو لێپرسینەوە، لە ناو و ئیش و تەمەن و ئەو شتانە هەر هەمووی وەرگرت. پرسیاری ئەوەی کرد ئازاردراوم؟ وتم: لە مانگی یەکەوە تا هەفتەیەك پێش ئێستا بەردەوام ئازارو ئەشکەنجەی زۆر خراپ دەدریم. وتی: ئەشکەنجەی وەکو چی؟ وتم: چی باسبکەم؟ هەڵواسین، کارەباڵێدان، فەلاقەکردن، بەبێ بەزەییانە ئازار دەدریم. وتی: هیچ شوێنێکت ئازاری پێگەیشتووە؟ وتم: شانم لە ئەنجامی هەڵواسین دەرچووە. وتی: حەزدەکەم خۆت باسی خۆتم بۆ بکەیت، من حاکمم و مەحکەمە لەسەر ئەم ئیفادەیە مەحکەمەت دەکات، لای من باسی ئازاردانت کرد لەشوێنی دیکەو لە مەحکەمە باسی مەکە.

ئیفادەی لێ وەرگرتم، من بەشێوەیەك ئیفادەکەم دا زیاتر باسی کۆنم بۆ کردو ئەمەشم بۆ ئەوە کرد لە مەسەلەکە دووریبخەمەوە. وتی: بەپێی ئەو زانیارییانەی لە بەردەستی مندایە تۆ تاوانباری بەوەی دژی حکومەت و سەرورەو حزبی بەعس کارت کردووە، وتم: ئەو شتانە ئەوان نووسیویانەو درۆیان کردووە من کارێکم دژی حکومەت نەکردووە. حاکم بەو قسەیەم قارس و تووڕە بوو، خۆی گرژکردو ویستی حاکمییەتی خۆی لە دەست بدات، وتی: ئەگەر بەڕاستیی هەموو زانیارییەکانم پێنەڵێیت، ناچار دەبم ئیفادەکەت وەرنەگرم و بتنێرمەوە تا بەشێوازێکی دیکە مامەڵەت لەگەڵدا بکەن.

وتم: جەنابت حاکمی، ئەگەر حاکمی بکەیت، حەق وایە گوێم لێبگریت و لەخۆم ڕاستییەکان وەربگریت. بشم گێڕیتەوە بۆ ئازارو ئەشکەنجەدان باکم پێی نییە، بەتەواویی لەگەڵی ڕاهاتووم، من ئەوە چەند مانگە بەوپەڕی بێویژدانییەوە ئازار دەدریم. ئەگەر تۆش وەکو حاکم

وام لەگەڵدا بکەیت، ئیتر بۆ ناردووتە بەدوامدا بۆ ئیفادەوەرگرتن؟ سەیرمکرد هێوربووەوەو قسەکانی خاوکردەوە. وتی: من حەزناکەم ئازار بدرێیت و پێشم ناخۆشە ئازاردراویت، دەستی کرد بە پرسیارکردن منیش بەپێی پرسیارەکانی چۆن لەکاتی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەداندا بەرگریم دەکرد. لە وەڵامی پرسیارەکانی حاکمیشدا هەمان بەرگریم کرد. لەماوەی نیو سەعاتێکدا ئیفادەی وەرگرتم، لێبووەوەو ئیمزایەکی لەسەر ئیفادەکە پێکردم، زەنگی لێداو رەحیم هاتە ژوورەوە، بەهەمان شێوەی پێشوو کە بردمییە ژوورەوە، بەهەمان شێوە بردمییە دەرەوە.. رەحیم هەستم کرد زۆر خۆشحاڵ بوو، کە ئیفادەیان لێوەرگرتم و وتی: مامۆستا رزگارت بوو لە بانگکردن و ئەشکەنجەدان. پشت بەخوا لە دادگاش بەسەلامەتی دەرباز دەبیت. بەدەم رێگاوە کە دەیبردمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم قسەی بۆ دەکردم، ئەوەی باس دەکرد کە زۆر خەمی منی بووە، دەسەلاتیشی نەبووە. گەیشتینە بەردەرگاو دەرگای کردەوە، کردمییە ژوورەوە، هەر چوومە ناو ژوورەکە هێشتا رەحیم دەرگاکەی دانەخستبووەوە، برادەران بە پیرمەوە هاتن، دەیانویست بزانن ئەم جارە بۆ بانگکراوم؟ کە وتم حاکم هاتبوو، ئیفادەی لێوەرگرتم، هەرهەموو دلخۆشبوون و پیرۆزباییان لێکردم. فەخرەدین وتی: مامۆستا تەواو، ئیتر با هەر بۆ خۆیان سیربخۆن و زوورنا لێبدەن، بەخوا لە حەقمان نایەن و دەرەقەتمان نایەن. ئاخ چی لە کەسانی ناپاك و خائین و زۆڵەکورد بکەین لێمان ناگەرێن. وتی: ئیتر ئەگەر ئەو ناپیاوانە وازت لێبهێنن و شتی دیکەت لەسەر زیندوو نەکەنەوە، ئیتر تۆش وەکو ئێمە چاوەروانی (مەحکەمەی سەورە) دەکەیت... دیارە ئەم ئیفادەیەی کە لێم وەرگیرا لە کۆتایی مانگی سێ و سەرەتای مانگی چواردا بوو.

# ژیانی ژووری (٢)، چۆن بوو؟

ئـەم ژووره لەگەڵ ژووره ئینفرادییەکان تەنهـا جیاوازیی ئەوەبوو، کە ئەم خەڵکی زۆری تێدابوو، بەو هۆیەوە زیندانیی بێتاقەت نەدەبوو. ئەگینا ژوورێکی بچووك بوو. لەچاو زۆریی زیندانییـەکاندا، لەگەڵ ئەوەشـدا، بەردەوام زیندانییـــان تێدەخزاند. ژوورەکە لەباری درێژی پێنج مەترێك و لەباری پانیی (٣)مەترێك دەبوو. ئاودەسـتی تێدابوو. ئاودەسـتەکە لەسەر ژوورەکە بوو. وەکو (ئاودەسـت، حەمام، شوێنی قاپ شۆردن، دەموچاوشۆردن، جل شۆردن)، بەکاردەهێنرا. دەرگای نەبوو، بەتانییەکیان وەکو پەردەیەك بۆ کردبوو بەدەرگا. هەرکەسێك بچوایەتە ئاودەسـتەکە، بچووکترین بای لێنبەربووایەتـەوە، هەرهەموومان گوێمان لێدەبوو. بەسەرە دەبوو بۆ سەراو و دەموچاو شۆردن و جل شۆردن و خۆشۆردن بچووینایە. (سەید محەمەد) لای ئاودەسـتەکەوە بوو، (عەباس) لای دەرگـای دەرەوەی ژوورەکە بوو، لەبەرئەوەی ژوورەکە بچووك بوو، ژمارەمان زۆر بوو، ناچار دەبووین بۆ کاتی خەوتن شەوانە شوێنەکانمان بەبەست بەش بکردایە، زۆرجار یەکی یەك بستمان بەردەکەوت، لەبەرئەوە نەماندەتوانی لەسەر پشت راکشێین، دەبوو لەسەر لایەکی شان بخەوتینایە. قاچمان تێکەڵاوی یەکتری دەبوو. راخەرمان بەتانی بوو، چەند بەتانییەك بەسـەریەکدا داخرابوون. یەك گلۆپی (١٠٠)یی. یەك پەنجەرەی بچووکی تێدابوو، سـاحیبەیەکی تێدا دانرابوو، شەو و رۆژ ئیشی دەکرد. گلۆپەکەش بەشەو و رۆژ نەدەکوژایەوە. شەو لەکاتی خەودا، کە دەردەکەوتم (کەمال) دایدەپۆشیمەوە. (عەباس) بەتانییەکەی هەڵدووریبوو، لەکاتی خەوتندا دەچووە ناوی. لەسـەرەی سەراودا (رێبوار) تاکە کەس بوو کە چاوەروانی سـەرەی نەدەکرد، هەرجارێکیش دەچووە سەرئاو، پێش ئەوەی بگاتە ناو ئاودەسـتەکە، بای گەورەی لێنبەردەبووەوەو زۆرجار ریزی دەکرد. هەرهەمووومان بەو حاڵەی راهاتبووین و گوێمان پێ نەدەدا!

# سیستمی ژووری (٢)

بۆ چۆنیتی ژیان سیستمێك دانرابوو. هەموو کارێکی ژوورەکە بەپێی ئەو سیستمە دەچوو بەڕێوە، کە ئەویش بەم شێوەیە بوو:

١- چاودێر (مراقب): بۆ ژوورەکە دانرابوو، دانانەکەش بەڕای هەموو زیندانییەکان دانرابوو، چاودێرەکە (مامۆستا حەسەن عوسمان)بوو. ئەرك و کاری چاودێر، پەیوەندیکردن بە ئیدارەی ئەمنەوە، بۆ هەرکێشـــەو حالەتێکی نائاسایی، وەك نەخۆشی و شتی لەم جۆرە، دابەشکردنی خواردنی ژەمەکان، دانانی بەرنامە بۆ پاککردنەوەی ژوورو ئاودەست و تەکاندنی بەتانییەکان، دانانی بەرنامە بۆ حاجەت شۆردن، کە هەر جارەی (٢) کەس دەبوو بیانشۆن، دانانی بەرنامە بۆ خۆدوزین، دابەشـکردنی زیندانییـەکان بەســەر چەند گرووپێکدا بۆ نانخواردن و لەکاتی هاتنی زیندانیی نوێدا دانانی لەگەڵ گرووپەکان.

٢- نانخواردن: بــۆ نانخواردن زیندانییەکان کرابوون بەچەنــد گرووپێکەوە، هەبوو دوو کەس و هەبوو ســێ کەس و هەشــبوون چوار کەس بوون. دابەشکردنی زیندانییەکان بەپێی گونجانی زیـندانـییەکان لەگەڵ یەکدا. واتە هەر گرووپە لە هەرسێ ژەمەکە بەیەکەوە نانیان دەخوارد.

٣- دابەشکردنی خواردنی ژەمەکان: بەیانییان و نیوەڕوان و ئێواران خواردن دەهێنرا.

● بەیانییان: دوو جۆر خواردنیان بۆ دەهێنناین، بەیانییەك (نیســك)ر ســەموون، ئەو بەیانییەی (نیســك) بووایە چای لەگەڵدا نەبوو، بەیانییەك ســەموون و بەرچایی وەکو (ماســت، کەرە، پەنیر، هێلکەی کوڵاو، مرەباو چا)، واتە لەم بەیانییەدا چا هەبوو. بۆیە ئــەو رۆژەی کە چامان دەبوو، زیندانییــەکان دەیانوت دوو بەیانی چایە، لەبەرئەوەی چا هــەر ئەو ژەمە ئەماندرایــە، زۆر تامەزرۆی چا بووین. چاودێــر بەیارمەتی یەکێك لە زیندانییەکان هەموو ژەمێکی بەیانی خواردنەکەی بەســەر گرووپەکاندا بەیەکســانیی بەپێی ژمارەی کەسەکانی گرووپەکە دابەشدەکرد. گرووپەکانیش، جگە لە نیســکێنەکە کە بەیەکــەوە دەیانخوارد، (کەرە، ماســت، پەنیر، هێلکەو مورەبایــان) لەناو خۆیاندا دابەشدەکرد.

● نیوەڕوان: هەموو نیوەڕۆیەك خواردن برنج و شلەبوو، لە شلەکەدا، هەفتانە جارێك دوو جار بەناو گۆشــتیان تێدەکرد، هەفتانەش رۆژێك گۆشتی مریشك هەبوو، شلەکە: (ســلق، شــێلم، پیازاو، بایجان، کولەکە) لە هەفتەیەکدا جارێك یان دوو جار فاســۆلیا دەبوو، بە شــلەی فاســۆلیاکە زۆر دلخۆش دەبووین، بەراســتیی هــەر هەموومان زۆر حەزمان لێدەکرد، لەبەرئەوەی بۆن و تامی گۆشــتی دەدا. مامۆستا بەپێی گرووپەکان و نەفەرەکانی، برنج و شــلەو گۆشتەکانی دابەشدەکرد، کەسەکانی گرووپەکانیش لەناو خۆیاندا گۆشتەکانیان بە عەدالەت دابەشدەکردو سەموونیان لەگەڵدا دەهێنا.

• ئێـــواران: خواردنی ئێـــواران واته (شـــیو)، ئەمانەیان دەداینـــێ (پەتاتەی کوڵاو، ســـوورەکراو، هێلکەی کوڵاو، چلفرای) چلفرایەکە هەر بەناو گۆشتی تێدەکرا، بەزۆریی پیازو دۆشـــاو پەتاتەبوو. ســـەموونیان دەداینێ، (مامۆســـتا حەســـەن) بـــە عەدالەت خواردنەکەی دابەشدەکرد.

• مـیوە: زۆرجـــار (میوەیان) دەهێنا. هەفتەی جارێك خورمایـــان دەهێنا، خورماکە خورمای قەسب و خورمایەکی باش نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی پێویستمان بەشیرینی بوو، بەلامانەوە خۆشبوو، ئەوەی بەکەڵك بهاتایە دەمانخوارد.

٤- قاپ و کەوچك و پیاڵە: لە بنی ئەو ســـەتڵی ماســـتانەی کە خواردنیان بۆ تێدا دەهێنانـــێن، کەوچك و قاپیان لێ دروســـتکردبوو، هەر گرووپە دووقاپ بۆشـــلەو برنج، بەپێی کەســـەکانی گرووپەکان کەوچك دروستکرابوو. بەردەوام کەوچك دروست دەکراو لای چاودێر دادەنرا، بۆئەوەی کە یەکێك تازە دەهات یان کەوچکەکەی دەشکا بیانداتێ. قوتووی ماست کرابوو بە پیاڵە بۆ چاخواردنەوە.

٥- قاپ شـــۆردن: بۆ قاپ شۆرین، وەکو بلێن خشـــتەیەك دانرابوو، هەر رۆژەی (٢) کەس هەموو قاپەکانیان دەشۆرد، لەو خشـــتەیەدا بەتەمەنەکانیان دانەدەنا، وەکو بیرم بێت (مامۆستا فەرەیدوون، حاجی رەشید، مامۆستا حەسەن، بەندەیان) دانەنابوو.

٦- پاککردنەوەی ژوورو ئاودەست: هەفتانە رۆژێك دانرابوو، کە لەو رۆژەدا، وەکو چۆن دەڵێت جێگا هەڵگرتنە، ئاوهاش بەکۆمەڵ و بە کۆمەکی هەموو، زیندانییەکان جگە لە بەتەمەنەکان، بەتانییەکانی کە راخرابوون هەڵدەگیران. لە ئاودەســـتەکەدا دەتەکێنران، ناو ژوورەکەو ژێـــر بەتانییەکان جوان پاکدەکرایەوە، بەتانییەکانیان رادەخســـتەوە، ناو ئاودەستەکەیان دەشۆردو پاکدەکردەوە.

٧- ئەســـپێدۆزین: لەبەرئەوەی بەباشی چڵك لە گیانمان نەدەبووەوە، بەهۆی ساردیی ئاوەکەوە، پیسیی بەتانییەکان، ئەســـپێی زۆر دەچووە گیانی زیندانییەکانەوە، بۆئەوەی ئەو ئەســـپێیە تووشـــی خورانی لەشـــمان نەکات، بەرنامە دانرابوو، هەر دوو سێ رۆژ جارێـــك جل و بەرگی هەمـــوو زیندانییەکان دەدۆزران، بۆ ئەمـــەش هەندێکمان چاوی نەدەبینـــا، بۆیە بۆ هەریەکێك یەکێکی بۆ دانرابوو، بۆ نموونە: (مامۆســـتا فەرەیدوون و من و حاجی رەشـــید) گەنجەکان دەیاندۆزین. هەر کەس بدۆزرایە یان خۆی بدۆزیایە قوورتووی ماســـت دادەنرا بە ژمارە ئەســـپێکانی تێدەکرا. هەبوو گیانی ئەســـپێی زۆر دەگرتە خۆی، رێدەکەوت کەســـی وامان هەبوو (٤٠ بۆ٥٠) ئەسپێیان لەگیانیدا دەدۆزی. مـــن بەهۆی ئەوەی کراســـێکی خوریم لەبەردابـــوو، دیاربوو ئەســـپێ نەیدەوێرا بچێتە ناوی، لەناو کراســـی خوریدا نەدەژیا. لەبەرئەوە ئەســـپێی کەمم تێدادەبوو. بەو دۆزینە زیندانییەکان دەحەوانەوە.

٨ تایـــد: مانگانـــە یان هەر (١٥) رۆژ جارێك تایدیان بـــۆ دەهێنناین. تاید بۆ حاجەت

شــۆردن جیادەکرایەوەو لای (سەید محەمەد) دادەنرا، ڕۆژانە دەیدایە ئەوانەی کە قاپ و حاجەتەکانیان دەشۆرد. هەر یەکەشمان تایدی بەسەردا دابەشدەکرا بۆ جلشۆردن.

٩- حەمامکردن و جلشــۆردن: خشتەیەك بۆ جلشۆردن و خۆشۆردن بۆ زیندانییەکان دانرابوو، بەپێی خشــتەکەو بەسەرە ئەو شــتانە دەکرا. نەدەبوو کەس نۆرەبڕیی لەیەکتر بکات. تەنانەت بۆ چوونە ســەر ئاویش، بە بەرنامەو بەسەرە بوو، تەنها (ڕێبوار) نەبێت دایمە شپرزەبوو، لەسەر سەرە ڕانەدەوەستا.

١٠- خەوتنی شەوانە: دەبوو هەموو شەو لە سەعات (١٢)- هەمووومان بنووستینایە، ئەگەر نەنووســتینایە سەجانەکان دەهاتنە سەرمان. لەبەرئەوە شەوانە پێش نووستنمان شوێنەکەمان بەش دەکرد، هەر کەسە دەبوو لەوەندەدا بنوێت کە بەری دەکەوت. ئەوانەی بە مەبەستی گاڵتەو بۆ پێکەنین لەگەڵ ڕاکشاندا بەتایبەتی لە ڕیزی ئێمەدا کە (حاجی ڕەشیدو نەجمەدینی) لێبوو، (فەخرەدین و کاکە حەمە) دەیانکردە جوولەجووڵ شانبادان و کارێکیان دەکرد، (حاجی ڕەشــیدو نەجمەدینیان) تووڕە دەکرد، زۆر شــەو نەجمەدین جنێوی دەداو حاجی ڕەشید هەڕەشەی شکاتکردنی دەکرد.

١١- وەرزش: زۆربەی زیندانییەکان، بەیانییان کە هەڵدەســان وەرزشیان دەکرد، بەو وەرزشــە دەحەوانەوە وەرزشەکەش (مامۆستا حەسەن، فەخرەدین، عەباس، کاکە حەمە، عوسمان، دکتۆرو سەرکەوت)و ئەوانی دیکەش دەیانکرد، تائێســتاش دیمەنی فەخرەدینم هەر لەپێش چاوە، کە هەموو بەیانییەك بە قەمســڵەیەکی عەسکەرییەوە، دەچووە بەر دەرگاکەو وەرزشی دەکردو لەگەڵیدا پێدەکەنی.

١٢- یاریکردن: زیندانییەکان بۆ ئەوەی کات بەســەربەرن، لە مقەبا خانەی شەترەنج و لەناوی ســەموون زارو پوولی شــەترەنج و تاوڵەو پوولی دۆمینەیان دروستکردبوو، زۆربەی کاتەکانیان بەیاریکردن بە ڕۆژو بە شەو بەسەردەبرد.

١٣- تەزبیح دروستکردن: زیندانییەکان بۆ کات بەسەربردن خۆیان بە دروستکردنی دەنکی تەزبیحەوە خەریك دەکرد، لە ئێســقانی مریشــك دەرزییان دروست دەکردو لە موقەباو دەزووی بەتانی، دەنکی تەزبیحیان دروست دەکرد.

١٤- خوێندنەوەی ڕۆژنامە: ڕۆژانە ڕۆژنامەیەکی (سەورەیان) بۆ دەهێنان، ڕۆژنامەکە بەزۆریی (مامۆستا حەسەن)و (ڕزگار محەمەد) دەیانخوێندەوە، زۆربەیان بۆ زیندانییەکان دەکردە کوردی بۆ ئەوەی تێبگەن.

زۆرجار لەســەر هەندێك وتار، موناقەشە دروســتدەبوو، ڕای جیاواز دەهاتە ئاراوە، ئەو سەردەمە، سەردەمی (پرۆستریکابوو) لە سۆڤێت، عیراقیش دەیویست لاسایی ئەوان بکاتەوە، لەوبارەیەوە زۆر دەنووسراو هەندێکمان ڕامان وابوو، کە عیراقیش دەیەوێت بەو ڕێگایەدا هەنگاو بنێت، زۆریشمان نەدەچووە عەقڵمانەوە بەعس و ڕژێمی بەعس بڕوای بە پرۆســەی لەو جۆرە هەبێت، ڕۆژێ لە ڕۆژان پیادەی بکات، هاتنی ئەو ڕۆژنامەیە بۆ

ئەوکات و ساتەمان زۆر باشبوو، ئێستاش لەبیرمە چەندجار (عەزیز حاج) وتاری لەسەر (پرۆستریکا)و گۆرانکاریی دەنووسی، هەواڵی پردەکەی دووریانی تاسلوجەو دووکان بڵاودەکرایەوە. کە تەواو نەبووە ئیشی لێدەکرێت، سەیر لەوەدابوو ئەو پردە کە ئێمەش ئازادکراین هەر تەواو نەبووبوو. وا لەم ساڵانەدا تەواوکراوە.

١٥- ریش تاشین: هەردوو هەفتە جارێك ریشمان دەتاشی، ئەو رۆژەی کە لە ئەمنەوە دەهاتن بۆ لامان بۆئەوەی ریشمان بتاشین، دوو دوو دەیانبردینە دەرەوەو لە بەردەمی ژوورەکەدا کە راڕەوێك بوو، رایاندەگرتین، هەریەکە مەکینەیەکی خراپ و گوێزانێکی لە هەرە خراپەکان و ئاوێنەیەکی زۆر بچووکی بەرباخەڵ و ئاوی ساردو سابوونیان دەهێناو دەیاندایێ، بۆئەوەی ریشمان بتاشین. بەسەرمانەوە رادەوەستان، پەلەیان لێدەکردین، شەقیان تێهەڵدەداین، کێبلیان پێدا دەکێشاین، ئەو حاڵە وای دەکرد، زۆر لە زیندانییەکان روومەتیان دەبری و خوێنی پێدا دەهاتە خوارەوە. من لەبەرئەوەی چاوم باش نەبوو، هەموو جار لەگەڵ (حەمەرەحیم) دەبرامە دەرەوەو ئەو ریشی بۆ دەتاشیم.

١٦- سەیرکردنی دەرەوە: ئەو پەنجەرە هەواکێشەی کە ساحیبەکەی تێدا دانرابوو، لە بنمیچی ژوورەکە بۆ دەرەوە، هەندێك ماڵی لێ دیاربوو. زیندانییەکان زۆر رۆژ دەچوونە سەرشانی یەکترو سەیری دەرەوەیان دەکرد، بەو سەیرکردنە زۆر دەحەوانەوە.

١٧- کەڵەشێری بەیانییان: زۆر بەیانی کەڵەشێر لە ماڵەکانی دەوری ئەمن دەیانخوێند. دەنگی ئەو کەڵەشێرانەمان زۆر پێخۆشبوو. بوو بوو بە دەنگی مەلای مزگەوت و بە خوێندنەکەی دەمانزانی کە شەو تەواو بووەو رۆژ بووەتەوە.

من کە بردیمانە ئەم ژوورە، لێکۆڵینەوەم تەواو نەبووبوو، بەڵکو بەردەوام بەشەو و بە رۆژ بانگدەکرام و ئەشکەنجەیان دەدام. وەکو وتوومە رۆژانەش بەبێ ئەوەی گوێ بدرێتە ئەوەی کە ئەو ژوورە بچووکەو زیندانیی زۆری تێدایە، بەردەوام زیندانی دیکەیان تێدەخزاند، بەرای ئەوانەی لەپێش منەوە لەو ژوورە بوون، ئەو ناردنەش جۆرێك بوو لە سزاو ئەشکەنجەدانی زیندانییەکانی ئەو ژوورە، بۆئەوەی شوێن و جێیان نارەحەت بێت و بە باشی نەحەوێنەوە.

## بیرکردنەوەیەکی حەمەڕەحیم

جارێك لە جارەکان، لەکاتی ریشتاشیندا (حەمەرەحیم) وتی: مامۆستا بەوردیی و بەباشی سەرنج بدە لەم ڕاڕەو و دەرگایە، کە چووینەوە ژوورەوە قسەت بۆ دەکەم. کە ریشمان تاشی و چووینەوە ژوورەوە، وتی: مامۆستا ئەگەر برادەرانمان لەم ژوورەدا هاوکاریم بکەن و نەترسن، دەتوانین زۆر بەئاسانی لەم ئەمنە دەربازبین و بچینە دەرەوە، وتم: چۆن؟ وتی: خۆ بە باشی سەرنجی دەرگای دەرەوەت دا؟ وتم: هەر زۆر بە باشی لێی وردبوومەوە، وتی: ئەو دەرگایە دەچێتە سەر حەوشەکەو شکاندنی هەر زۆر ئاسانە، ئەگەر بەقسەم بکەن شکاندنی دەرگای ژوورەکە گران نییە، هەردوو دەرگاکە دەشکێنین، هەر ئەوەندەمان زەحمەتە بگەینە ناو حەوشەکە. لەحەوشەکەدا زۆر بەئاسانی دەتوانین دەربازبین، وتی: با نەخشە دابڕێژین و بە برادەران بڵێین بزانین دەڵێن چی؟ وتم: جا ئەگەر رازی بن و بتوانین ئەوە بکەین، چ کارێك لەوە باشترو خۆشترە؟ نەخشەکەی دارشت و بە فەخرەدینی وت، دوای ئەوەی کە تاوتوێی یەك بە یەکی زیندانییەکانمان کرد. نەتوانرا لێیان پشتنەستووربن و نەخشەکەیان پێ بڵێن، دەترسان لەوەی کە نەخشەکە ئاشکرا بکەن و ریسەکە بکەنەوە بەخوریی، بۆیە بێدەنگیمان لێکرد.

## ڕەحیم لە سەجانی ئەمن نەدەچوو

ڕەحیم، ڕاستە سەجان بوو، لەگەڵ ئەو جەندرمە ڕەفتاردڕندانەدا بوو، بەڵام تا حەزکەیت کوڕێکی لەسەرخۆو بەئەدەب و لەهەموو شتێك دەچوو لەپیاوی نار ئەو دائیرەی ئەمنە نەدەچوو. کەس نەبوو لێی نارازیبێت، ڕێزی لە زیندانییەکان دەگرت، نەیدەویست نازارو نەشکەنجەی کەس بدات، جنێوو قسەی ناشیرینی نەدەزانی، توورەبوونی نەبوو، کەلەبچەی بەرقەوە نەدەکردە دەست و داینەدەکەند، چاوی شەتەك نەدەداو کوێری نەدەکردیت، وای دەبەست کە بەئاسانی بەرپێی خۆت ببینیت، بەکورتی لەهەموو ئەوانەی لەبەردەستی ئەو جەللادانەدا بوون وەکو (حەمە قەلەو جومعە) چاکترو باشتربوو.

## رۆژنامەی سەورەو ژووری (٢)

لە مانگی دوودا، رۆژانە رۆژنامەیەکی سـەورەمان بـۆ دەهات، رۆژنامەکە بۆ ئێمە نـەوکات و رۆژەداو لەو ژوورە تەنگەبەرو پڕەدا شـتێکی خۆشـبوو. بەهۆیەوە هەواڵی دنیاو عـێراق و بارودۆخی جیهانمان دەزانی، هەرچەنـدە رۆژنامەکە (زمانحاڵی حزبی بەعس) بوو، بەڵام لە کۆمەڵێك زانیاریی و هەواڵ و باری سەرنجی سیاسیی ناو عێراق و دەوربەرو دنیا، خالیی نەبوو.

ئەوانـەی دەیانتوانـی لـەو ژوورەدا بەئاسـانی رۆژنامەکە بخوێننـەوە، دووکەس بوون (مامۆسـتا حەسەن عوسـمان)و (رزگار محەمەد عەبدوڵلا) بوون رۆژانە بە نۆرە دەیانخوێندەوە، لەسەر بابەتەکان رۆژانە موناقشە دروست دەبوو، لەسەر راو بۆچوونەکان رای جیاواز دەهاتە ئاراوە، هەڵبەزینەوە دەخوڵقا... زیاتر لەسـەر ئەوەش سـەردەمەکە سەردەمی (پرۆستریکابوو)، لە (سـۆڤییەت) گۆرانکارییەکی گەورە سەری هەڵدابوو... زۆر برادەرمان رایان وابوو. کە (حزبی بەعـیش) سیاسـەتی (پرۆسـتریکا) دەگرێت و گۆرانکاریـی لە سیاسـەتیدا دەکات، هەندێك برادەریشـمان رایـان وا بوو کە بەعس هەر بەعسـەو درۆ لەگەڵ خۆیدا نـاکات و هەرگیز نەخۆی و نە سیاسـەتی ناگۆرێت، ئەگەر هەموو دنیا بگۆرێت. بۆیە زۆرجار لەسـەر ئەوە موناقەشـە دروسـت دەبوو، لە موناقەشەکەدا لەسەر رای جیاواز گرژیی و توورەبوون دروست دەبوو. (مامۆستا حەسەن) بەردەوام رای جیاوازی هەبوو، زۆربەمان رامان وابوو کە سیاسەتی بەعس ناگۆرێت.

## مامۆستا (ش)و چۆنییەتی پەیوەندیکردنمان

مامۆستا (ش)م لەکاتی قوتابیتیی و خوێندنی قۆناغی ناوەندیدا، وەکو قوتابییەك یەکمان دەناسی، بەلام ناسینی هاورێیەتی و هەلسوکەوتکردن لەگەل یەکدا نا... دەمزانی بووەتە مامۆستای وەرزش دوای هەرەسی سالی ١٩٧٥-و گەرانەوەمان و رەوانەکردنم بۆ پاریزگای واست و پەیوەندیکردنم بە ریزەکانی کۆمەلەو (ی.ن.ك)ەوە، لە سالەکانی (١٩٧٥و ١٩٧٦)دا لە هاوینی ١٩٧٦-دا لە قەزای (حەیەوە) گەرامەوە بۆ سلێمانی، بە مەبەستی یەکتربینین لەگەل (مامۆستا جەمال تاهیر)دا بۆ ئالوگۆری بیروراو ئەرك و کارەکان، رۆژێك لەبەر (کتێبخانەی سلێمانی) بەیەك گەیشتین و وتی: با بچین پیاسەیەك بکەین، باشترین شوێن کە هەلبژارد بۆ پیاسەکە، ناو کۆلانەکانی کانیسکان و پشتی مزگەوتی قامیشان و مزگەوتی گەورە بوو... دوای پیاسەیەکی ورد بەدەم قسەکردن و باسکردنی بارودۆخەکەو ئەرك و کارەکان و وەرگرتنی چەند نووسراو، بلاوکراوەیەك. لەلای مزگەوتی قامیشانەوە، چووینە سەر شەقامی کانیسکان، یەکسەر لووتمان تەقی بە لووتی مامۆستا (ش)دا سلاوی لیکردین و وەلامماندایەوە. (مامۆستا جەمال) وتی: دەیناسیت؟ وتم: لە قۆناغی ناوەندیدا بەیەکەوە لە قوتابخانەیەك بووین، تەنها وەکو قوتابی دەمناسی، وابزانم ئیستا مامۆستای وەرزشە. وتی: هەروایەو مامۆستای وەرزشە، مامۆستایەکی زۆر خراپەو ئیستا (پالێوراوی لیستی نەقابەی مامۆستایانە، شینە بەعسییەکی زۆر خراپە)و حەز دەکەم بیزانیت.

لە سالی (١٩٨٠) کە لە کوتەوە گوێزرامەوە بۆ سلێمانی، کەوتمە ئیشکردن لەناو ریزەکانی رێکخستنی (کۆمەلە)و (یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان)دا لە سالەکانی(١٩٨٦-١٩٨٧) بەهۆی ململانێکانی ناو (ریزەکانی رێکخستن و سەرهەلدانی عیراقچیتی و ئالای شۆرش و کوردستانیتی) کیشەی زۆر لەناو رێکخستنەکاندا پەیدابوو بوو. دەستکرابوو بە ئالوگۆری بەرپرسی پۆل و کەرتەکان. لە (رێکخراوی سلێمانییەوە) پییان راگەیاندم کە هیلێکی رێکخستنمان هەیە، وەکو بیتەوە یادم (هیل و کەرتی شەهید کرێکار) بوو، هاورێیەك تائیستا سەرپەرشتی دەکات، پەیوەندیی بەو هاورێیەوە بکەم. وتیان کە بینیت دلنیاین یەکتر دەناسن. چونکە مامۆستایە، ناوی (نهێنی)یان پێ وتم: پەرلەو شوێن و رۆژو کاتی یەکتربینین دانرا... شوێنەکە (مەوقیفی پاسەکانی عەقاری) خوار (فولکەی ناسکەکە)و ژوور (فولکەی تۆپەکە) بوو. پەرەلەکەمان من (گۆڤارێکی کاروانم) بەدەستەوە بێت و ئەویش (عەلاگەیەکی سەوزو رۆژنامەی) تیادابێت بەدەستییەوە بێت. هەر کە چووینە مەوقیفەکە ئەو پرسیاری سەعاتم لێبکات و منیش ناوی نهێنی ئەو بدرکێنم، بەو شێوەیە پەیوەندیی بەیەکەوە بکەین و بەرنامەی کارکردن دابنێین.

رۆژو کاتی دیاریکراو چوومە شوێنەکە. کە سەیرمکرد (ش) راوەستابوو، عەلاگەیەکی بەدەستەوەبوو رۆژنامەی تێدابوو، منیش (گۆڤارەکەم) بەدەستەوە بوو. هەر گەیشتمە مەوقیفەکەو منی بینی، یەکسەر پرسیاری سەعاتی لێکردم. وەلامم دایەوە، بەلام خۆم پێ نەناساندو خۆم ئاشکرا نەکرد، یەکسەر تەکسییەکم راگرت و رۆیشتم. هەر ئەو رۆژە خۆم گەیاندەوە هاورێکەی کە پێی راگەیاندبووم بچم پەیوەندیی پێوەبکەم. پرسی بینیت؟ وتم: بەلا بینیم، بەلام خۆم لێ دزییەوەو خۆم پێ نەناساند، وتی: بۆ؟ باسی سال و رۆژەکەی شەقامی کانیسکان و بینینمان لەگەل مامۆستا جەمالدا بۆکردو گێرایەوە. وتی: هاورێ ئەو هاورێیە دەمێکە لە ریزەکانی رێکخستنی کۆمەلەدا وەکو ئەندامێکی چالاك کاردەکات. چەند پۆل و شانەی لایە. دلنیام وا نەماوەو دەبێت گۆرابێت. هاورێیان متمانەی تەواویان پێیەتی. وتم: من وەکو ئەمر دەچم پەیوەندیی پێوە دەکەم، بەلام لەراستیدا متمانەم پێی نییە، بۆ دوا رۆژ ئەنجامەکەی بەباش نازانم. جارێکی دیکە مەوعید دانرایەوەو یەکترمان بینی و بەرنامەی چۆنێتی کارکردنمان دارشت. ماوەی چەند سالێك بەیەکەوە کارمان کرد. لەو رێکخستنانەی لای بوو یەکێکیان برازایەکی خۆی بوو، کۆبوونەوە نەبوو، بەخراپی قسە لەسەر ئەو برازایەی نەکات و بە کەسێکی خراپی دانەنێت. هەموو جار پێمان دەوت هاورێ تۆ وەکو (مام و مامۆستاو لەو گەورەتر) قسەی لەگەلدا بکەو هەولی لەگەلدا بدە با بەرێی خراپدا نەروات. ئەو گەنجە پێویستی بەرێنمایی و ئامۆژگاریی هەیە، هەرچەند ئێمە لەو بارەیەوە قسەمان بۆ دەکرد، ئەو دانی خێری بەو برازایەیدا نەدەنا، بە کەسێکی خراپ و سەر بە رژێمی دادەنا. تا رۆژێك لەمیانەی باسکردنەکەیدا پێمان وت باشە، چی لێبکەین؟ خۆ ناکرێت بەبێ بەلگە بریاری لەناوبردنی بدرێت؟ لەمەدا وەلامی پێنەبوو. مامۆستا بە بەردەوامی بە بۆنەی کاری وەرزشەوە هاتوچۆی بەغدای دەکرد. ئەندامی (یانەی سیروان) بوو. زۆرجار لە بەغداوە (پاقلاوەی صەباغی) بە دیاریی بۆ دەهێنام. دوو سێ جار دیارییەکەم لێ قبوول کرد، بۆ جارەکانی دیکە پێم وت یان دەبێت پارەکەم لێوەرگریت، یان ئەو دیارییە وەرناگرم و رازیش نابم ئیتر لەو جۆرە دیارییانەم بۆ بهێنێت.

کۆبوونەوەکانمان دابەشکردبوو، هەر جارەی لە مالێکمان دەکرا. ئەو جارانەی کە دەچووینە مالیان بەبێ ئەوەی پرسمان پێ بکات (نانی نیوەرۆی) دروست دەکرد. لەسەر ئەو نان دروستکردنە نارازیبووین، بەتوندیی رەخنەمان لێدەگرت و پێماندەوت ئەو نانکردنە زیادەیە، ئێمە کاتەکەمان دیاریکراوە، خوا خوامانە زوو لێبینەوەو بلاوەی لێبکەین. تەنانەت تا کار گەیشتە ئەوەی کە نیوەرۆیەك خواردنی زۆری دروستکردبوو، نانمان نەخواردو خواردنەکەمان بەجێهێشت و خۆمان لێ تووڕەکرد.

مالی ئێمە خانوویەکی دووقات بوو، قادرمەکەی پێیدا سەردەکەوتین لە دەرگای چوونە ژوورەوەی مالەوەمان دووربوو. زۆر جار بۆ کۆبوونەوە یان بۆ کارێکی دیکە

دەهات بۆ مالمان پێلاوەکانی لە سەربانەکە دادەکەن، بەپێی پەتی دەهاتە ژوورەوە، هەموو جار پێم دەوت مامۆستا مالی ئێمە (مزگەوت نییە) تکایە پێلاوەکانت بهێنەرە ژوورەوە، بۆ ئەوەی لە ژوورێشەوە لە شوێنی تایبەت دابنرێن ئەگەر میوانێکمان هات پێلاوەکان نەبێتە هۆی پرسیاری میوانەکە.

ئەمانە بۆیە دەگێرمەوە، کە من لە هەلسوکەوت و رەفتارەکانی بەگومان بووم. کاتێك هاوڕێ (عەبدولعەزیز عومەر) بووە بەرپرسمان، ئەم شتانەم بۆ هاوڕێ عەزیز باسکرد، بڕیارمان دا کە تەنها کۆبوونەوەکان لە مالی ئێمەو لە مالی مامۆستا بکرێت و نەچینە مالی (هاوڕێ عەزیز)، واش بکەین مالەکەیان هەر نەزانێت، زۆرجار کە بۆ کۆبوونەوە دەچووینە مالیان، دەیبردینە ژوورێکی سەرەوەی مالەکەیان، کە قەرەوێلەی تێدابوو. سەیرمان دەکرد، راپۆرت و بلاوکراوەکانی لەژێر دۆشەکی قەرەوێلەکاندا دەردەهێنا، لەسەر هەلگرتنی ئەو بەلگەنامانە، چەندجار پێمان دەوت هاوڕێ ئەوە کارێکی زۆر خراپەو نابێت شت لەم شوێنانەو بەو شێوەیە دابنرێت، ئەو گوێی پێنەدەداو دەیوت بێخەم بن و ترستان نەبێت، خوا کەریمەو مالی ئێمە جێگای گومان نییە.

پێش ئەوەی بگیرێن، چەند مانگێك بوو (مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لە هەورامانەوە هاتبوون بۆ ناو شاری سلێمانی و لە پشتی قرگەو وێلەدەرەوە کەوتبوونە کەمینی جاشەکانی عەلە لوتماسییەوەو گیرابوون) پێیان دەوتن (مەفرەزەکەی هەورامان) و مەفرەزەیەکی دیکەش هاتبوون بۆ ناوشار چەند پێشمەرگەیەکیان لێ گیرابوو، لە مەفرەزەکە یەکێکیان لەناو شاردا مابووەوە. نازانم چۆن مامۆستای دەناسی پەیوەندیی پێوەکردبوو، کە رێگایەکی بۆ بدۆزێتەوەو دەریکرێتە دەرەوە. واتە لە رێگای رێکخستنی ناوشارەوە. لەکاتێکدا رێکخستن ئاگادای لە هاتنی ئەو مەفرەزەیە نەبوو.

چەند رۆژێك پێش دەستگیرکردنمان هات و مەسەلەی ئەو پێشمەرگەیەی باسکرد، ئێمە لەراستیدا کەوتینە گومانەوە، هیچ رێ و شوێنێکمان بۆ ئەو داوایە دانەناو نەمانویست بە دەنگییەوە بچین، پێمان راگەیاند کە ناتوانین هیچ کارێکی لەو جۆرە بۆ هیچ کەسێك بکەین. خۆی چۆن هاتووە با واش بڕواتەوە دەرەوە، هەر لەو سەرودەمەی پێش گرتنماندا، لە ناوەندەوە داوا لە (رێکخراوی سلێمانی) کرابوو، کە بەهەموو شێوەیەك هەولبدرێت سوراخی ئەو مەفرەزەیەی هەورامان بکرێت. بزانن ماون یان لەناوبراون؟ ئەمە بۆ رێکخستنەکان پەخشکرابوو، ئێمە کە ئەوەمان پێراگەیاند، ئەو نەو رۆژەی پێمان وت بۆ رۆژی دوایی هەوالی مەفرەزەکەی هێنایەوە، کە لە ئەمنی سلێمانین و ماون، راپۆرتێکی نووسیبوو، وتی: بەیانی و دوو بەیانی راپۆرتەکە بەتەواویی زانیارییەکانەوە بۆتان دەهێنم. ئێمە نەگەیشتینە ئەوەی راپۆرتەکەی لێوەرگرین، هەردووکمانی بەسەرداگیراین، ئەمەم هەر بۆ راستیی بۆچوونەکانم لەسەر ئەو بەناو هاوڕێیە گێرایەوە! کاتێك کە ئێمە دەستگیرکراین تێگەیشتین کە بۆیە ئەوەندە پێی لەسەر برازاکەی دادەگرت، تا ئێمە را

لێبکات کە ئەوەندە دڵسۆزە تەنانەت لەسەر برازاکەشی قسەدەکات، بۆم دەرکەوت کە ئەو برازایەی ئاگاداری قسەکانی مامی نەبووە، هەرگیزیش بیری لەکاری خراپەی وەکو ئەو دەیوت نەکردبووەوە، بەڵکو بەدڵسۆزیی کارەکانی خۆی کردووە... کە نانی دروستدەکرد هەر بۆ ئەوە بوو، ئێمە چەواشە بکات، یان ئەو نووسین و راپۆرت و بڵاوکراوانەی کە لەژێر دۆشەکی قەرەوێلەکەدا دایدەنا خۆی دەیزانی هیچ ترسێکی نییە، کە دەشهات بۆ ماڵی ئێمە پێڵاوەکانی لەسەر قادرمەکان دادەناو پاقلاوەی لە بەغدا بۆ دەهێنام، هەر هەمووی سیناریۆیەك بوو، بۆ لەخشتەبردنم و ئەو کارانەشی بۆیە دەکرد هەر هەمووی پێی سپێردرابوو و نەخشەی بۆ دانرابوو.

## مولازم ئەحمەد دووری و نیوەشەوێك

شەو درەنگانێك و لەنیوەشەوێکدا، کاتێکمانزانی دەرگای ژوورەکەمان کرایەوە، سێ کەس خۆیان بەژووردا کرد. یەکێك لەو سێ کەسە (مولازم ئەحمەد دووری) تاوانباری ئەمن بوو. هەر هاتنە ژوورەوە هەرسێکیان لوتیان گرت، (مولازم ئەحمەد) بەبێ هیچ هۆیەك، هەر بەئارەزوو دەستی بەجنێودانمان کرد. ئێمە هەر هەموو بەپێوە راوەستابووین، ئەوانیش لەلای دەرگاکەوەو لەبنی دیوارەکەدا رووبەروومان راوەستابوون. لە سەرخۆش دەچوون. بەئارەزووی دڵی خۆی تێر جنێوی کردین، ماوەی زیاتر لە دە دەقیقەیەك مانەوە، دەرپەڕینە دەرەوەو شەقێکیان لە قنگی خۆیان دا. دیاربوو لوتیان بۆیە گرتبوو، بۆنی ژوورو شوێنەکەمان ئەوەندە ناخۆشبوو، ئەوانی بەو دە دەقیقەیە بێزارکردبوو. ئێمە راهاتبووین و هەستمان بەو بۆنە ناخۆشەی ژوورەکەمان نەدەکرد، دیاربوو بۆ ئێمە رەوا بوو، لەناو ئەو بۆن و بەرامە ناخۆشەدا شەو و رۆژ ژیان بەسەربەرین، بۆ ئەوانیش تاوان بوو تەنها بۆ (١٠) دەقیقە ئەو بۆنە ناخۆشە هەڵمژن.

## نەقیب ماجلو بەهمەن

شەوێك لەنیوە شەودا کاتێکمانزانی وەکو شەوەکەی پێشووتر، سێ کەس خۆیان بەژووردا کرد، کەسەکان (نەقیب ماجدو مفەوەز جەبارو جومعە)بوون. لەبەردەمی دەرگاکەوە راوەستان، بە هەر هەموویاندا روانیان، بەهەر یەکەمان قسەیەکیان وت، ماجد بە (بەهمەنی) وت: بەهمەن قەڵەوبوویت نابێت وا قەڵەوبیت، دەبێت بەتەواویی وا خۆت لاواز بکەیت کێشت بگاتە (٣٠ بۆ ٣٥) کیلۆ، ئەگەر هاتمەوەو وا نەبوویت زۆر خراپت پێدەکەم، پێی وت: لەم رۆژانەدا تۆ ژیانت کۆتایی دێت. دوای ئەو شەوە بەهمەن لەترسا زۆر بەکەمیی خواردنی دەخوارد، بۆئەوەی لاواز بێت، ئەگەر نەقیب ماجد هاتەوە بزانێت کە بەگوێی کردووەو بەتەواویی لاواز بووە، بەهمەن ئەوەندە ساویلکەبوو، وایدەزانی ئەگەر بەگوێی (ماجد)ی کرد سزاکەی کەمدەکرێتەوەو فەخرەدین لەو بارەیەوە بەگاڵتە شەوانەو رۆژانە پێی دەوت بەهمەن خۆت لاواز بکە تا نەقیب ماجد نەهاتووەتەوە، ئەگینا خراپت پێ دەکات! بەگاڵتەکانی فەخرەدین تووڕە دەبوو، فەخرەدینیش بەبێ گوێدانە تووڕە بوونەکەی بەهمەن پێدەکەنی.

# شەوان و زنجیرە درامای پێشمەرگایەتی

لەو ژوورە ناخۆش و جەنجاڵەدا، لەو ژوورە بێپەنجەرەو ڕووناکییەدا، لەو ژوورە پڕ لە زیندانییەدا، لەو ژوورە ئەسپێ هەڵگرو پیس و پۆخڵەدا، لەو ژوورە بێ ئاودەستی جیاو بێ حەمام و ناوی گەرمەدا، لەو ژوورە بێ قاپ و قاچاغی نانخواردنەدا، لەو ژوورە بێ تیشکی خۆرو ئەشکەوتئاسایەدا، لەو ژوورە قەرەباڵغ و بێ هەوا گۆڕینەدا، بەهۆی گەشبینیی و پتەویی بیروباوەڕەوە، بووبووە تەلارێکی خۆش و قەشەنگی ژیانی شەوانەو ڕۆژانەمان و شەو و ڕۆژ هەروەکو لەناو ژوورێکی دائیرەی ئەمندا نەبین وابوو. بێ ترس و سڵەمینەوە هەموو قسەو باسێکمان تێدا دەکرد، باوەڕ بکەن کە لەدەرەوەی ئەو ئەمنەبووین، نەماندەتوانی بەو ڕاشکاوییە لەگەڵ یەکدا قسە بکەین و ڕاو سەرنجمان بۆ یەك دەربڕین. (محەمەد سیاسیی و فەخرەدین و د.مەحمود) شەوانە لەدوای سەعات دەی شەوەوە، وەکو زنجیرە درامایەك شەوانە دەستیان بەگێڕانەوەی ڕۆژانەی پێشمەرگایەتی و سەختیی ژیانیان و ڕۆژانی شاڵاوەکانی ئەنفالی بەدناویان بۆ دەکردم. باسی ئەوەیان دەکرد، کە لە ڕۆژانی ژیانی پێشمەرگایەتییاندا لەبەر بێ دەرامەتیی و نەبوونی و سەختیی ڕۆژانی ژیانی پێشمەرگایەتی و نەبوونی نان و خواردن، ناچاربووبوون کە ڕاوی بۆق، داڵ، بەراز، ڕێوی و چەقەڵ بکەن و بە کوڵاندن و برژاندن بە ناچاریی بیخۆن، بۆئەوەی درێژە بە ژیانیان بدەن، بەشێوەیەك باسی ئەو بۆق خواردنەیان دەکرد، لەو سات و شەوانەدا بەتەواویی حەزم لێدەکردو خۆزگەم بە ژیانی پێشمەرگایەتی دەخواست، قەستم دەکرد مەنجەڵا لەو مەنجەڵە بۆقانەم لەبەردەستدابووایەو تێرم لێبخواردایە.

یان کە باسی ڕۆژانی ئەنفالی قەرەداغ و پەلاماری سوپای دوژمن و کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگەو سەرلێشوایی و بێ سەروبەری هێزەکەو نەزانینی چارەنووس، بێ خواردنی و بێ فیشەکی و شلەژانی پێشمەرگەیان دەکرد، لەو شەوە زەنگی ئەمنەدا، ئەوەندەی تر دنیات لێ تاریك دەبوو، قین ئەستوورترو ئەستوورتر دەبوویت، تفت لە خائینان و خۆفرۆشان و جاشە پێشڕەوەکەی سوپاکەی بەعس دەکرد، قەستت دەکرد لەو شوێنەدا ببیتە قوومبەلەیەك و لەو ئەمنەدا بتەقیتەوەو گیانی خۆت و ئەوانەشی لەو ئەمنەدان هەپروون بەهەپروون بکەیت و بەسەر یەکدا بیانسووتێنیت، کە باسی کیمیابارانی هەڵەبجەو دێهاتەکانی قەرەداغیان دەکرد، مەرگەساتی ئەو چەکە قەدەغەکراوەیان دەگێڕایەوە، ئاواتت دەخواست لە پێستی خۆت بێیتە دەرەوە، ڕوو لە ویژدانی هەموو مرۆڤایەتی و ئازادیخوازانی دنیا بکەیت، نەفرەت لە ویژدانی نامرۆڤانەیان و بێ هەڵوێستییان بەرامبەر بە مەرگەساتی گەلەکەمان بکەیت... ئەو گێڕانەوەو باسکردنانە بووبوونە ئەلقەی دراما یان فیلمێکی شەوانەی بێکۆتایی، شەوانە بگەیشتینایەتە هەر شوێنێك شەوی دوایی لەوێوە دەستپێدەکرایەوە.

هەندێك شـــەو (عەتای حاجی ئەحمەد) چیرۆکی خۆی و ژیانی پێشمەرگایەتی و کاری نهێنی ناوشـــارو چۆنیێتی گیرانی و جۆرەکانی ئەشـــکەنجەو ئـــازاری دەگێڕایەوە، ئەگەر بمتوانیایە بیاننووســـمەوە خۆی بۆ خۆی دەبووە چیرۆکێکی بێکۆتایی و کە باسی خۆی و حەمە زاهیری دەکرد، کە چۆن چەندین رەفتاری ناشیرین و نامرۆڤانەیان لەگەڵدا کردوون، شـــتی وای باس دەکردو دەگێڕایەوە پێستی ســـەری مرۆڤ دەئاوسـاو تف و نەفرەتت لەو دەزگا سـەرکوتکەرانەی ئەو رژێمەو سیاسەتەکەی دەکرد.

# مانگی رەمەزان بوو بە جەژنی ئێمە

ئەو کاتەی کە لە ژووری دوو بووم، مانگی رەمەزانی بەسەردا هات، دائیرەی ئەمن بەحیسابی خۆیان دەولەتی عیراق دەولەتێکی ئیسلامییەو بەعس و رژێمەکەشی پەرۆشی ئاینی ئیسلام و مەراسیمەکانی ئاینن، بەعس ئیدعای عروبەیەتی و سەدام ئیدعای خەلیفەی ئیسلامی دەکرد، لاف و گەزافی وای لێدەدا کە دەیەویێت ببێتە سەرۆکی هەموو عەرەب، لەم رێگایەوە ئاینی ئیسلام زیاتر بچەسپێنێت و عروبەو عەرەبچێتی بەدنیا بسەلمێنێت. بۆیە لەکاتی مانگی رەمەزاندا، لەکاتێکدا ئەوان لە دائیرەی ئەمن ئەوەی ناحەقیی و دژ بەمرۆڤ و مرۆڤایەتی و ئاینی ئیسلامە پەیرەوییان دەکرد، بە ناڕەوا خەلکیان دەگرت، بەبێ دادگاو زالمانە گوللەبارانیان دەکردن. ئەنفالی کوردیان کردبوو، کیمیابارانی هەلەبجەو ناوچەکانی دیکەی کوردستانی کردبوو بەبێ ویژدانانەو فاشییانە، کوردستانیان سووتماککردبوو. بەرەسمیی جینۆسایدی کوردیان کردبوو، کەچی بۆئەوەی خۆل بکەنە چاوی خەلکی ساویلکەو نەزان لە مانگی رەمەزاندا، ئەو خواردنە خراپەی رۆژانی پێشوویان گۆری بە خواردنی باشتر. رۆژانە برنج و شلەی باش و گۆشتی حەیوان و مریشك و میوەو شیرینی وەکو پاقلاوەو خورمای زۆریان دەداینێ. بۆ ئەوانەی بەرۆژوو نەدەبوون، بووبووە جەژن. بەراستیی مانگی رەمەزان ئاهێکمان پێداهاتەوەو هەندێك شیرینی و شەربەت و پاقلاوەو خواردنی باشمان خوارد. خوا خێری رەمەزان بنووسێت، کە بۆ گاڵتەکردن بە مانگی رەمەزان لایەکی باشمان لێکرایەوە، خوا لەخێری دەرنەکات ناوسکمان ئاوەدان بووەوەو ئاهێکمان پێداهاتەوە. ئەوانەی لە رەمەزاندا بەرۆژوودەبوون ئێواران و شەوانە نوێژیان بە جەماعەت دەکرد، (مامۆستا حەسەن) پێشنوێژیی دەکردو ئێمەش لەپەنا دیوارەکانەوە خۆمان مت دەکردو دوور دادەنیشتین تا لێدەبوونەوە.

# مواجەهەی مامۆستا حەسەن

(مامۆستا حەسەن عوسمان) مامۆستای وەرزش بوو، خەڵکی بەغدا بوو، بەهۆی ئەوەی پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی (حسك)ەوە بوو، لەگەڵ (مەجیدی ئەوقاف)و (جەمالی حەمە نورقلە) ئەویش کەتبووە بەر شاڵاوی گرتن و لە هاوینی ساڵی ١٩٨٩-دا دەستگیرکرابوو.

لە برادەرانی حسك (٦) کەسیان بە بڕیاری (لیژنەی ئەمنی پاریزگای سلیمانی) لە ئەمنی سلێمانی گوللەباران کرابوون، (مامۆستا حەسەن و خەلیل و محیدین و مەهاباد) لە ئەمن مابوونەوە بەر ئەو بڕیارە نەکەوتبوون. (مامۆستا حەسەن و خەلیل) لە ژووری دووبوون، هێشتا نەبرابوون بۆ مەحکەمەی سەوردو چاوەڕوانی مەحکەمەیان دەکرد.

برایەکی مامۆستا حەسەن کە ناوی (ئیبراهیم) بوو، ئەفسەری فرۆکەوانیی بوو لە بەغدا، بەو هۆیەوە چەندجار توانیبووی مواجەهەی بکات و یەکتر ببینن. پێش ئەوەی من بچمە ژووری دوو، مواجەهە کرابوو، کە منیش چووم ڕۆژێك بانگیان کردو بردیان، ماوەیەکی زۆری پێنچوو ئینجا هاتەوە. کە هاتەوە دلی خۆشبوو، کۆمەلێك شتی لەگەڵ خۆی هێنابوو. وتی: براکەم لەگەڵ دایکم هاتبوون بۆ بینینم، باشبوو ماوەیەك لەگەڵیان دانیشتم، ئەو شتانەشیان بۆ هێنابووم، ئەوەی هێشتبوویان بیهێنێتە ژوورەوە، وەکو خواردنەکەی ئەمن بەسەرماندا دابەشیکردو بەو مواجەهەیەی مامۆستا حەسەن دڵمان خۆشبوو.

# جەژنی نەورۆزو ئەمن

هـەر چەنـدە ئێمە گیرابووین و لەنـاو دائیرەی ئەمنی سـلێمانیدابووین، لە هەموو رووبەکەوە سـەرەچەنگیان دەداین، بەلاّم لەناو ئەو ئەمندا، رۆژانەو شەوانە راشکاوانەو بەبێ ترس و سڵەمینەوە، گفتوگۆمان لەسەر مەسەلە سیاسییەکان، شۆرش، کێشەکان، درندایەتی دامودەزگاکانی رژێم و سیاسـەتی رەگەزپەرسـتانەی بەعس دەکرد. لەسەر کێشـەکانی گەلەکەمان دەدواین. مانگی سێ و بیسـتویەکی مانگی نەورۆز بوو، بە بۆنـەی نـەورۆزەوە، جەژنی نەورۆزو ئاهەنگـی نەورۆزمان گێڕا (عوسـمان) بە دەنگە خۆش و حەزینەکەی ئەم رۆژی سـاڵی تازەیەی بـۆ وتین. ئێمەش لەگەڵیدا دەمانوتەوە، هەر یەکەمان لای خۆمانەوە دلخۆشـبووین (فەخرەدین) بە پێکەنینە خۆشـەکەی و بە دەنگی بەرز گۆرانیی نەورۆزی لەگەڵدا دەوتەوە. (مامۆسـتا حەسەن) کەوتە گێرانەوەی یادەوەرییەکانی ساڵانی حەفتاکان و باسکردنی نەورۆزەکانی ساڵانی بەغداو ئاهەنگەکانی نەورۆز لە (سـەدری قەنات و قاعەی خولدو کۆلیژی ناداب و قاعەی ساطع الحصري) و شوێنەکانی دیکەمان.

## پەنجەرە هەواکێشەکەو تەماحی برادەران

ژوورەکــە تەنها یــەك پەنجەرەی هەواکێشــی تێدابوو، ئەویش هەواکێشــێکی تێدا دانرابوو، بە بەردەوامی شەو و رۆژ نەدەکوژایەوەو ئیشی دەکرد. پەنجەرەکە بە بنمیچی ژوورەکەو لەبن ســەقفەکەدابوو، لەرووی خۆرئاواوە بوو، زۆر رۆژ برادەران هەولیاندەدا بچنە سەرشــانی یەکترو لە کونی ئەو پەنجەرەیەوە سەیری دەرەوە بکەن. بۆ ئەم رۆژانە دوو دوو سێ سێ سەرەیان دەگرت و دەچوونە ســەر شانی یەکترو بەنۆرە سەیری دەرەوەیان دەکرد، رۆژێك (حەمەرەحیم) وتی: مامۆســتا بۆ نایەیتە قەلاندووشــکانم و ســەیرێکی دەرەوەو شار بکەیت. هەرچەندم کرد نەمتوانی بچمە سەرشانی کاکە حەمە. برادەرەکان بەو ســەیرکردنە زۆر دەحەوانەوە، لەو پەنجەرەیەوە خانووەکانی (گردی عەلی ناجییان) دەبینی، بە بینینی ماڵەکان هەســتیان بەخۆشــیی دەکردو لــەو پەنجەرەیەوە دەچوونە دنیای ئازادیی و خۆشیی سلێمانی و سەربەستی ماڵەکانەوە.

# نووکتەکانی ژووری (٢)

لە جێگاو شـــوێنێکی وەکو دائیرەی ئەمندا، لە ژوورێکی بچووکی پڕ لە زیندانیداو شـــەو و ڕۆژ ئـــەو هەموو خەڵکە لە چواردیـــواری ژوورێکی وا تەنگەبەردا، دانیشـــتن و نانخـــواردن و نووســـتن و هەڵســـوکەوتی بەردەوام، ناکرێت لـــە بارێکی وا نالەباری ژیاندا، تەنها بە خەمخواردن و داخ هەڵڕشـــتن بەســـەر ببرێت، دیارە خەم و ناخۆشـــیی لەلایەك و دڵخۆشـــکردن و گەشبینیش لەلایەکی دیکەوە، باوەش بەیەکدا دەکەن، هەر یەکەیـــان دنیای تایبەتی خۆیان هەیە. بۆیە لـــەو جۆرە ژیانەدا بمانەوێت و نەمانەوێت، قسەی خۆش و نەستەق و نووکتەی جۆراوجۆر، دروست دەبێت. بۆیە بەپێویستی دەزانم هەندێـــك لەو قســـەخۆش و نووکتانەی کە لە ڕۆژانی ژیانـــی ژووری دوودا بیرم ماون، یان بۆیانگێڕاومەتەوە، ئەمەش وەکو شـــەوچەرەیەکی بەچێـــژ بۆ کتێبەکەو خوێنەرانی ســـوودمەند دەبێت. (حاجی ڕەشـــید) کە بەهۆی پەیوەندیی بە پێشمەرگەی یەکێتییەوە گیرابـــوو. پیاوێکی بەتەمەن و خەڵکی دێی (ســـیاگوێز)بوو. موختاربوو لە ئۆردووگای (نەسەر) دادەنیشت.

لـــە شـــەوانەی ژیانی ژوورەکەدا هەندێك شـــتی دەکرد دەبوونە نووکتـــەو برادەرانی دەخـــستە پێکەنین.

- (حاجی ڕەشید) دیاربوو پێش دەستگیرکردنی کە لەدەرەوەی ئەمن بووبوو، بۆیاخی سەری کردبوو سەری ڕەشکردبووەوە، کە گیرابوو (فەخرەدین) زانیبووی ئەو (قژە ڕەشە) هی تەمەنی ئەو نییە، لێی دەپرســـێت کاك حاجی قژی سەرت هەروا ڕەشە یان بۆیەتکردووە؟ لە وەڵامدا وتبـــووی... نا... قژم هەروا ڕەشـــەو بۆیاخی چی؟ دیاربوو بـــە خەیاڵی ئەو کە گیراوە چەند ڕۆژێك دەمێنێتەوەو فریای ئەوە دەکەوێت بە قژی ڕەشـــەوە بچێتە دەرەوە، بۆیەکەی ســـەری کاڵنابێتەوە، کە ماوەیەکی زۆر لە ئەمن دەمێنێتەوە، وردە وردە بۆیەکەی سەری کاڵدەبێتەوەو ڕەشـــییەکەی نامێنێت. فەخرەدین پێی دەڵێت (کاك حاجی) خوا ڕووی ئەم ئەمنە ڕەش کات کە ڕەشی سەری تۆی ئاشکرا کرد.
- (حاجی) لەبەر پیریی دانی خۆی نەمابوو، تاقمی کردبوو، نەیدەویست برادەران بزانن کە دانی خۆی نییەو تاقمە، کە لێیان دەپرســـی (کاك حاجی) ئەو دانانەت هی خۆتن یان تاقمن؟ دەیـــوت نا... دانی خۆمەو تاقم نییە. کاتێك دەیشـــۆرد یان پاکی دەکردەوە وا دەیخســـتەوە دەمی کەســـێ لە ژوورەکە هەستی پێنەدەکرد. دیاربوو، شەوانە لەکاتی نووستندا بەدزییەوە دەریدەهێناو دەیخـــستە ژوور سەری. بەرێکەوت بەیانییەك بیری چووبوو، کە تاقمەکەی لەژێر سەریدا داناوەو نەیخستووەتەوە دەمی. بۆ نەگبەتی حاجی، فەخرەدین تاقمەکەی دەکەوێتەبەر دەستی و پێی وت (حاجی. حاجی) ها ئەوە تاقمی دانەکانتە ـــا بیرت چوون بیخەیتەوە دەمت. وتی: حاجی ئەم ئەمنە هەرچی شتی تۆیە لێت ناگەڕێت تا ئاشکرای نەکات.

• رۆژێــك ژوورەكەمان زۆر گەرمبوو، زیندانییەكان لەبــەر گەرما زۆر بێتاقەت بوون، فەخرەدین بە (حاجی رەشــیدی) وت: حاجی تۆ خــۆت ببوورێنەوە، ئێمەش لە دەرگا دەدەین، كــە هاتن دەڵێین حاجی لەبەر گەرما بووراوەتەوە. بەشــكم كە هاتــن و چاویان بەتۆ كەوت چارێكمــان بكەن، حاجی بەقســەی كردو خۆی بوورانەوە، لە دەرگــا دراو (جومعە) هات بە دەنگــی دەرگاكەوەو پرســی چییە؟ وتیان حاجــی لەبەر گەرما بووراوەتــەوەو حاڵی خراپە. وتی: (كلاوچییەو راســت ناكات)و رۆیشــت، دیســان لە دەرگایان دایەوە، ئەمجارەیان هاتن و حاجییــان برد، پاش ماوەیەك هێنایانەوە، لە ژوورەكەشــدا هــەر خۆی بوراندبوودوەو خۆی كردبــوو بەمردوو. (فەخرەدین) چووە لایــەوەو پێی وت: (حاجی... حاجــی) من فەخرەدینم جومعە نیم بۆ لێرەش خۆت بووراندووەتەوە؟

• شــەوانە كاتی نووســتن (فەخرەدین و حەمەرەحیم) بەزمێكیــان بۆ حاجی و نەجمەدین دەنایەوە، دەیانزانی حاجی و نەجمەدین بەجوولەجووڵ توورەدەبن، حاجی لەنێوان فەخرەدین و حەمەرەحیمدا بوو، نەجمەدین لەو لای فەخرەدینەوە بوو، هەر رادەكشاین بۆ نووستن، دەستیان بەشان جوولان و خۆبادان دەكرد. ئەوەندە دەجوولانەوە، تا نەجمەدین و حاجی رەشیدیان توورە دەكرد، حاجی و نەجمەدین هەڵدەسان و جنێویان دەداو هەرەشەی شكاتكردنیان دەكرد.

• (ئەســپێ) بووبــوو بە هاورێی گیانــی بەگیانیمان، هەر چەند هــەر رۆژ نا رۆژێك یان بــە چەند رۆژجارێك خۆمــان دەدۆزی، بەڵام بێســوود بوو، هەروەكو لــە گیانماندا یان لە ژوورەكەدا (شــاری ئەســپێ) هەبێت، چەندمان دەدۆزی و لەناومان دەبرد بێســوود بوو، بە دوو رۆژ ئەوەنــدەی تر لــە گیانماندا پەیدا دەبووەوە، (حەمەرەحیم) ئەســپێ تێیدابوو، بەڵام هــەردەم لەگەڵ (فەخرەدین)دا ئینكاریی ئەوەی دەكرد كە ئەو ئەســپێی تێدایەو توورە دەبوو كە پێیان دەوت ئەسپێت تێدایە، رۆژێك دووبەدوو یارییان دەكرد، منیش لەگەڵیاندا سەیری یارییەكەم دەكرد. (فەخرەدین) ســەیری لامل و شانی (حەمەرەحیمی) كرد، ئیشارەتی بۆ من كرد كە ئەســپێیەك بە لاملییەوەیە، بەڵێ، كە سەیرمانكرد راست ئەسپێ بوو دەجووڵایەوە. (فەخرەدیــن) وتی: (كاكە حەمە) ئەوە ئەســپێیەكە بە لاملتەوە، دەســتێكی بۆ لاملی بردو ئەســپێكەی تەكان و ونی كرد، وتی: نا ئەسپێ نییەو من ئەسپێم تێدانییە، فەخرەدینیش بە پێكەنینەوە وتی: بەخوا ســا ئەســپێ بوو، نەتهێشت بیدۆزین و ونت كرد، توورەبی و نەبێت سا ئەسپێی بوو.

• (بەهمەن عەبدولكەریم) خەڵكی تەوێڵەی ناوچەی هەورامان و نامرســرییەی جاش بوو، لەگەڵ (رێبواری حەمەد بەگ)دا منداڵێكیان رفاندبوو، بەمەبەســتی پارەوەرگرتن لە باوكی منداڵەكە، كەشــف بووبوون گیرابــوون. دیاربوو لە لێكۆڵینەوەدا دانیــان بە تاوانەكەیاندا نابوو. پێی دەچوو ســزای قورس بدرێن، بۆیە زۆر دەترســا، لەبەرئەوە بەردەوام و بەتایبەتی لەكاتــی نوێژەكاندا نوێژی دەكردو دەپارایــەوە. فەخرەدینیش هەر خەڵكی تەوێڵەی ناوچەی هەورامان بوو، یەكترییان دەناسی و لەنێوانیاندا گاڵتەو گەمە هەبوو. هەرجارێك كە نوێژی

دەکرد، (فەخرەدین) لەکاتێکدا کە بەهەمەن دەچوو، سوجدە، بە لاستیکێکی زۆر باریکی ناو بەتانـــی لە پەڕەی گوێی دەداو دایدەچلەکاندو زۆرجار نوێژەکەی پێ دەبڕی و توورەی دەکرد، یـــان دوای نوێژ کە لەگەڵ فەخرەدیندا تێکدەچوون، بەڵام فەخرەدین بەتووڕەبوونەکەی قارس نەدەبـــوو، گوێی پێنەدەداو بەپێکەنینەوە وەڵامی دەدایەوەو ئەو گەمەیەی فەخرەدین لەگەڵ بەهمەندا بووبووە گەمەیەکی رۆژانەو شەوانە لەکاتی نوێژکردنیدا.

-٢-

# گواستنەوەم لە ژووری (٢)ەوە بۆ هۆڵی (٥)

وەك بیتــەوە یــادم لە کۆتایی مانگی چوارو ســەرەتای مانگی پێنجــدا بوو. بەیانییەك دەرگایان کردەوە، (رەحیــم) بانگیکردم و وتی: خۆت کۆبکەرەوە، جاچی کۆبکەمەوە؟ ئەوەی هەمبــوو کەلوپەلەکانی بەرم بوو، قەمســەلەم کردبوو بە ســەرین و لەگــەڵ کارتۆنێکی تەبەقی هێلکە لەژێر ســەرمدا دامنــابوون... بەتانی تەنیام نەبوو. ئەوەی هەبوو بەتانییەکی دووکەسیمان لەگەڵ (کەمال)دا هەبوو، بەتانییەکەش هی من نەبوو. کە چوومە ژووری دوو، کەمال ئەو بەتانییە دووکەســییەی هەبوو. خۆی لەبن دیواربوو. شوێنەکەشــی دامێ و لە بەتانییەکەشدا شەریکی کردم، لەبەرئەوە نەدەبوو من ئەو بەتانییە بەرم. پێڵاوەکانم جوتێك پووت بوون، لای دەرگاکەوە بوون. رەحیم وتی: پەلە بکە. لەگەڵ خۆکۆکۆکردنەوەدا، خواحافیزیم لــە یەکەیەکەی برادەران کرد. نە ئــەوان دەیانزانی بۆ چییەو نە منیش، لەگەڵ خواحافیزیدا لــە ژوورەکە چوومە دەرەوە. چاوم نەبەســترایەوە. کەلەبچە نەکرایە دەســتم، (نەقیب ماجد) لەبەر دەرگاکە راوەســتابوو، پێش خۆیان دام بەرارەوێکی کورتداو یەکسەر بە قادرمەیەکدا سەریانخستم. قادرمەکان ئەو قادرمانە بوو، کە لە یەکەم شەوی گرتنمدا بۆ چەند سەعاتێك بە موحاجەرەکانییەوە بەســتیانمەوە، بە قادرمەکاندا سەرکەوتین، لەسەر قادرمەکانەوە، بە رارەوێکی درێژدا رۆیشــتین، لە کۆتایی رارەوەکە لەبەر دەرگایەکدا راوەســتاین و دەرگایان کردەوە، (نەقیب ماجد) وتی: بچۆ ژوورەوە.

هەر چوومە ژوورەوە، دیاربوو، لەکاتی دەرگاکردنەوەو قسەکردنی (ماجدا) زیندانییەکانی ژوورەوە بەئاگــا هاتبوونــەوە، لەچاوەڕوانییــدا بوون، بزانن بۆ ئەو دەرگایــە کرایەوە؟ ئەوەی کرایە ژوورەوە کێ بوو؟ بۆیە بە گەیشــتنم بۆ ناو ژوورەکە (مامۆســتا شــێخ عەزیز) یەکەم کەس هات بەپیرمەوە، وتی: (شــێخە) ئەوە تۆی؟ باوەشــمان بەیەکدا کرد تێر ئەملاو ئەولای یەکمــان ماچکرد، ریزم بە هاوڕێیاندا گرت، ئەوانەی دەمناســین و نەشــم دەناســین لەگەڵ هەرهەموویانــدا ئەملاو ئەولای یەکمان مــاچ دەکردو بەگەرمیــی بەخێرهاتنیان دەکردم. بەتایبەتی کە دیم (مامۆستا جەمال عەزیز، کاك عەبدولعەزیز، بەختیار عومەر، محێدینی شــێخ حەمە ئەمین و مامۆستا شێخ عەزیز) لەم ژوورەدان و تەمەنێکی زۆرمان لە رۆژانەی ژیانماندا بەیەکەوە بەسەربردبوو، زۆر زۆر دڵخۆشبووم، کە ئەو هاوڕێیانەم بینی، وام دەزانی ئازادبووم و چوومەتە دەرەوەی ئەمن، بە بینینیان کۆمەڵێك بیرەوەریی بەمێشکمدا گوزەری کرد. ئای! چ رۆژێکی خۆشــبوو، ئــەو هاوڕێیانەم بینییەوە، ئــای! چەندێ ناخۆش بوو، کە

هاوڕێکانی ژووری دووەم جێهێشت و لێیان دابڕام. لەڕاستیدا ئەو هاوڕێیانەی ژووری دوو هاوڕێی ڕۆژانی تەنگانەم بوون، یارمەتی لە ڕادەبەدەریان دابووم، ناتوانم چاکەو پیاوەتی و جوامێرییان هەرگیز لەیاد بکەم، چونکە لەوباوەڕەدام ئەگەر (بەخشی کوڕمم) لەگەڵدا بووایە، هەر ئەوەندەی (فەخرەدین، کاکە حەمە، عوسمان، عەتاو کەمال) خزمەتی دەکردم. یان هەر ئەوەندەی (کەمال) شەو بە خەممەوە دەبوو، (کاك مەجید سەلیم) چاودێر بوو، لەسەر هاوکاریی شۆڕش خۆی و سالاری کوڕی و خێزان و منداڵەکانی گیرابوون. سالارو خێزان و منداڵەکانی ئازادکرابوون. کاك مەجید مابووەوە. لەڕاستیدا لەو ژوورە بە باشی یەکمانناسی. هۆڵی (٥) سێ ژووری گەورەی بەسەر یەکەوەبوون بەبێ دەرگا، (کاك مەجید) بردمییە ژووری دووەمی هۆڵەکەی خۆی تێدابوو دایاننام، بە چوار دەورمدا کۆبوونەوە، پرسیاری برادەرانی ژووری دوویان لێدەکردم، کە کێی تێدایەو ژوورەکەو باری ژیان تێیدا چۆنە؟ ژووری چوار بەرامبەری ژووری پێنج بوو. لەو ژوورەش چەند هاوڕێیەکی خۆمانی تێدابوو. دیاربوو ئەوانیش چاوەڕوانی ئەوەبوون، بزانن ئەوەی هێنراوە بۆ ژووری پێنج کێیە؟ بۆیە (شێخ عەزیز) لە پەنجەرەی دەرگاکەوە بانگی (حەمە تاهیر)ی کردو پێی وت: (شێخە) یە، کە هەستام منیش لە پەنجەرەکەوە چاکوچۆنیم لەگەڵ (حەمە تاهیر، مامۆستا ئەحمەد، عەلی سالح، شیخ عەبدول)و ئەوانی دیکەدا کرد.

کە دانیشتمەوە سەرنجی ژوورەکەمدا لەچاو ژووری دوو، کە ژوورێکی تەسك و ئاودەستەکەی لەسەربوو. موبەریدەی تێدا نەبوو. ئێجگار گەرم و ناخۆشبوو، ئەم وەکو هۆڵێکی گەورەو کرابێتە سێ ژوور، وابوو. ژوورەکان پان و فراوان بوون، لەنێوانی هەرسێ ژوورەکەوە ڕاڕەوێکی بچووك هەبوو، کە دەتوانرا بەبێ ئەوەی قاچت بەر قاچی کەس بکەوێت، پێیدا هاتوچۆ بکەیت، لە هەردوو بەری ژوورەکان زیندانییەکان دابەش بووبوون، ڕاستە خەڵکی زۆری تێدابوو، بەڵام لەبەر گەورەیی و فراوانیی پێوەی دیار نەبوو. جگە لەم سێ ژوورە چەند ئاودەست و حەمامی لەسەر ڕاڕەوێك تێدابوو. پەنجەرەیەك لە ڕاڕەوەکەدا بەسەر ڕاڕەوی بەردەم ژوورەکەدا دەیڕوانی بەرامبەری دەرگای ژووری (سێ) بوو... پاش ئەوەی بە ژوورەکاندا گەڕام، هەموو زیندانییەکان بەخێرهاتنیان کردم. لەناویاندا (کامل سابیر) کە برادەری خۆمان بوو، یەکترمان نەدەناسی. محێدینی پوورزام لەبن دیواری ژووری ناوەڕاستدا بوو. یەکسەر شوێنەکەی خۆی بۆ چۆڵکردم، منی خستە شوێنی خۆی (کاك مەجید سەلیم)، بۆ (سەفەرداشی)، واتە نانخواردن لەگەڵ مامۆستا (جەمال و عەبدولعەزیز) دانیام. لەو برادەرانەی خۆمان کە لەدەرەوەو پێشتر یەکترمان نەدەناسی (کامل سابیرو کامەرانی مەلا عەزیز و کاك مەجید سەلیم) بوون. دیارە سیستمی ئەم ژوورە هەروەکو سیستمی ژووری دوو بەڕێوە دەچوو. خواردنیش هەروەکو ژووری دوو بوو. قاپ و قاچاخی نانخواردنیش هەر هەمان کەرەسە بوو، من ئەوەی کە دەبوو لە ژووری دووەوە لەگەڵ خۆمی بەرم. کەوچکەکەم بوو، لەگەڵ خۆمم هێنابوو، لەم ژوورەش چەند کەسێك لەبەر تەمەنیان قاپ و قاچاخ

شــتنیان بۆ دانەنرابوو. منیشـــیان حســـتە تەك ئەو برادەرانە. ئیتر بوومە ستافی ژوورەکەو تێکــەڵاوی دەنگوڕەنگی بووم. بەبرادەرانم وت: ئێوە وەکو لەدەرەوە بن وایە، شــوێنەکەتان فــراوان و خۆشـــە، ئێمە لە ژوورێکــدا بووین بەقەدەر نیوەی یەکێك لـــەم ژوورانە دەبوو بە ئاودەستەکەشییەوە. لەم ژوورەدا کەسانی سەر بەم لایەنانەی تێدابوو، (ی.ن.ك) کە وەکو بیرم مابێت ئەم تیکۆشەرانە بوون:

١- مەجید سەلیم. ٢- مامۆستا جەمال عەزیز. ٣- عەبدولعەزیز عومەر. ٤- مامۆستا شــیخ عەزیـــز محەمەد. ٥- بەختیاری عومـــەر ئەولییە. ٦- کامل ســـابیر. ٧- کامەرانی مەلاعەزیز.

(حسك) تەنها (محیدینی شیخ حەمەئەمین) بوو.

## لایەنی ئیسلامیی ئەمانەبوون:-

١- (حەمەســـوور) بەناوبانگ بوو بە (حەمە حەرەکـــە)و خەڵکی رانییە بوو. ٢- (فەرحان) ناوێك خەڵکی حەدیسەو عەرەب بوو. ٣- (عەبدولڕەحمان) خەڵکی کەرکوك و عەرەب بوو. ٤- (عەلی) عەرەب و خەڵکی تکریت بوو.

جگە لەمانە چەندیتریش لە ئێرانی و ئەوانەی بە تاوانی جۆراوجۆر دەســـتگیرکرابوون، لە ژوورەکە بوون.

# سیستمی هۆڵی (٥)

وەك لەپێشەوە باسمکردووە، سیستمی ئەم هۆڵەش هەروەکو ژووری (٢) بوو، چاودێر (موراقب)ی هەبوو، (کاك مەجید سەلیم) بەپێی تەمەنی و زووتر گیرانی کرابووە چاودێر. لە ژووری دوو، یەك ئاودەست هەبوو، کە ئاودەست و حەمام و شوێنی خۆشۆردن و حاجەت و جلشۆردن بوو، لەناو ژوورەکەدا بوو، یان دەتوانین بڵێین بەشێك بوو لە ژوورەکە. بەپێچەوانەوە لەم هۆڵە چەند ئاودەستی تێدابوو، دووربوون لە ژوورەکان، بەجیا حەمام هەبوو، کە بۆ خۆشۆردن و حاجەت و جلشۆردن بەکاردەهات. لە ژووری دوو ئاوی گەرم نەبوو، لەم هۆڵە ئاوی گەرم هەبوو، لە ژووری دوو موبەریدەو پانکە نەبوو، بەڵام لەم هۆڵە موبەریدە هەبوو بە بەردەوامی ئیشی دەکرد، لەم هۆڵەش بە تەمەنەکان لە ئیشکردن بەخشرابوون، هەرچەندە ئاودەستەکان دووربوون، بەڵام لەکاتی چوونە سەرئاودا جارجارە دەنگی وەکو (رێبوار) دایدەچڵەکاندین، (مامۆستا جەمال عەزیز) بەو دەنگە رادەپەری و دەیوت ئا!! (ئاسانە نەیەڵین ئەو دەنگە بێت، دەیوت لچی کۆمی بگرێت دەبێتە هەراو فشەی دێت). بۆ خۆشۆردن بەرنامەیەك دانرابوو، لە هەفتەیەکدا هەموو زیندانییەکان جارێك خۆیان بە ئاوی گەرم دەشۆرد. کە زانییان من ئەو چەند مانگە هەر بە ئاوی سارد خۆم شۆردووە، سەرەیان دامێ بۆ یەکەمجار بەئاوی گەرم خۆم شۆرد. ئەو سەرەو بەرنامەیەیەی دانرابوو، جیاوازیی تێدا نەدەکرا، بە یەکسانی جێبەجێدەکرا. خواردنیش هەموو ژەمەکان هەروەکو ژووری دوو بە یەکسانی و بەپێی نەفەری گرووپەکان دابەشدەکرا... لەم هۆڵەش شەترەنج و تاولە دروستکرابوو. ئەوانەی تاقەتیان لەو یارییانەبوو، بە بەردەوامی یارییان دەکرد. لە ڕاڕەوی بەردەمی ئاودەست و حەمامەکەدا برادەران دوو دوو، سێ سێ، وەرزشیان دەکرد. من بەزۆریی لەگەڵ مامۆستا جەمال عەزیزو شێخ عەزیزدا یاریم دەکرد.

بەرنامەی وەرزشەکە وا دانرابوو، نەبێتە قەرەباڵغی و بەپێی جێگار شوێنەکە بوو لەو پەنجەرانەی لە دەرگاکانی ژوورەکان و ڕاڕەوی بەر ئاودەستەکاندا بوو، برادەران ڕۆژانە لەگەڵ برادەرانی هۆڵی چوارو هۆڵی سێدا قسەیان دەکرد. بۆ ئەمەش وا دەکرا قسەکردنەکە لەکاتێکدا نەبێت کە پۆلیسەکانی ناو ئەمن لەوناوەدا بن.

کاتێك (عەتا حاجی ئەحمەد)یش لە ژووری دووەوە گوێزرایەوە بۆ هۆڵی (سێ)، زۆربەی بەیانییان (عەتا) لە هۆڵی سێ-وە بەگۆرانیی (مەشخەڵان) قسەکردنی وەکو ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان ڕاڕەوی بەردەم هۆڵەکانی دەکردە شانۆی ئاهەنگی ئازادیی و هەر هەموومانی بەئاگا دەهێنایەوە، بەدەگمەن بەیانییەك ڕێکدەکەوت بەو دەنگە زوڵاڵەی مێشك و گیانمان ئاوازەرێژ نەکات.

زۆرجار لە هەفتەیەکدا شووتییان دەهێنا، شووتییەکە (کاك مەجید) بە هاوکاریی هەندێك لە برادەران بەسەر زیندانییەکاندا دابەشی دەکرد. زۆرجار (مامۆستا جەمال عەزیز)و بانگی

منی دەکردو دەچووینە سەر تویکلی شووتییەکان و دەمانکراندنەوە. باوەر بکەن لەناوی شووتییەکە زۆر بەتامترو بەچیژتر بوو، لەسەر بەشیش نەبوو. (مامۆستا شیخ عەزیز) رۆژانە لە پەنجەرەی دەرگاکەوە شەرە جنیوی لەگەڵ (حەمە تاهیردا) دەکرد.

### هینانی مامۆستا فەرەیدوون دارتاش

دوای ئەوەی منیان لە ژووری دوو گواستەوە، پاش ماوەیەکیش ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم رەنگە دوای هەفتەیەك مامۆستا فەرەیدوونیشیان لە ژووری دووەوە گواستەوە بۆ هۆڵی پینج کە هات لەبەر تەمەن و باری تەندروستی منیش جیگاکەی خۆم دایە، واتە ختمە بن دیوار. بۆ نانخواردن و سەفەرداشی لەگەڵ (کامەران و بەختیار)دا دانرا. من بۆیە ئەو جیگایەی خۆمم دایە بە مەبەستی ریزگرتنی بوو، رۆژانە لەسەر خواردن لەگەڵ (بەختیارو کامەراندا) کیشەی هەبوو. لەم هۆڵەش بەهەمان شیوەی ژووری دوو زۆر داوای حەبی دەکرد.

# کاك مەجید سەلیم

'کاك مەجید سـەلیم) بەهۆی لەدەمەوەدانی لەلایەن (پوازێکەوە)یان بابڵێین خائینێکەوە
ـەوەی کە وەکو دەوڵەمەندێکی شار، بەپارە یارمەتی شۆڕش دەدات. لە ١٩٨٩/٦/١٦ لەگەڵ
ـالار)ی کوری و خێزانەکەیدا گیرابوون. کە من گیرام و چوومە ژووری پێنج (سالار)و خێزانی
ئازادکرابوون، تەنها کاك مەجید مابووەوە، ئەویش بەتەمای ئازادبوون بوو. حەزدەکەم پێش
ئەوەی باسـی بەربوونەکەی بکەم، باسـێکی ئەو کەڵەپیاوەی کە لە هۆڵی پێنج لەگەڵماندا
بوو، بکەم. پیاوێکی هەمیشـە رووخۆش، دەم بەپێکەنین، تا حەزکەیت بیرتیژ. بەتوانابوو لە
گێڕانەوەی رووداو و بیرەوەریی و لە باسکردنی خەڵکانی شار و بنەماڵەو پیاوە ناودارو قسەخۆش
و نووکتەبازەکانی شـاردا، نووکتەو قسـەی خۆشـی بە بەردەوامی لابوو بۆی دەگێڕاینەوە.
بـۆ هەر رووداو و بۆنەیەك مەسـەلەیەکی کوردی دەگێڕایەوە. ئـەم پیاوە خاوەنی دووکان و
حوسـێنگەو کارگەو کاری بازرگانیی بوو، باری ئابووریی زۆر باشبوو. دەوڵەمەندێکی چاك
و بەخەم و دەسـتکراوەو بەتواناو لەخۆبردوو بوو، یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی ئەوکاتەی
شـار. دەیان جار شۆڕش پێویستی بە پارەو یارمەتی دەبوو، جوابیان بۆ دەنارد، ئەو داواکەی
بـۆ جێبەجێ دەکردن. لەو کاتی زیندانییەیدا لەگـەڵ ئەو هەموو زیان و زەرەرەی کردبووی
لـە ئەنجامی گرتنەکەی بێباك و بێخەم بوو. ئەوەی پێوە دیارنەبوو کە گرتنەکەی خەمبارو
دۆشـداماوی کردبێت نارەزایی دەربڕێت، قسـەیەکی بەجۆرێك بکات کە بەهۆی شۆڕشـەوە
تووشی زیان و زەرەر بووە، رووگرژیم لێنەدی. بێئومید نەبوو. ئەوەی دەرنەدەبری کە زیان بە
بەرژەوەندییەکانی کەوتووە، فەرهەنگێکی شـەو و رۆژی هۆڵەکە بوو. بە دەیان شتی سەیرو
کۆنـی بۆ دەگێڕاینەوە. کە (سـالار) بەربووبوو. ئەمـنەکان دەچوونـە دووکانەکەی و ئەویش
یارمەتی دەدان، بۆیە هەموو جار بە ئەمنەکاندا هەندێك شـتی بۆ باوکی دەنارد، لە گەزۆو
نووقڵ و پێداویسـتی دیکە، هەمووجار بەدزییەوە شەوانە گەزۆیەکی دەدامێ. ئەو گەزۆیە لەو
شـوێنەدا بۆ من تامی یەك پاکەت (پاقلاوەی صەبـاغ)ی دەدا. جارجارەش دەنکێك نووقڵی
دەخسـتە دەستمەوە، بەراستیی ئەو گەزۆو نووقڵانەی باشـترین و بەتامترین دیاریی ئەو بوو
لەو شـوێنەدا بۆم. شەو و رۆژ لەگەڵ مامۆسـتا جەمالدا نووکتەی خۆش و قسەی خۆشیان
دەگێڕایەوە، ئەم بۆ ئەو ئەو بۆ ئەمیان دەسـەندەوە. بەراسـتیی ئایشارمەوە کەشوهەوای ئەو
رۆژگارەیان خۆشـکردبووین (کامەرانی مەلا عەزیز)یش هاوکارێکـی بەردەوامیان بوو. لە
نووکتەو قسەی خۆشدا. کامەران لە گێڕانەوەی قسەو نووکتەکانیدا خۆی پێنەدەکەنی.

## بانگکردنم بۆ ئیمزای وەکالەت

لــە مانگی پێنجــدا بەیانییەك رەحیم هــات و بانگیکردم و چوومــە دەرەوە کەلەبچەو چاوبەســتنەوە نەبوو. لەگەڵیدا چوومە خوارەوە، بردیانم و ماوەیەك دایاننام. نەمدەزانی بۆ چییــە. دیاربوو رەحــیمیش نەیدەزانی، بانگیانکــردم. لە پەنجەرەیەکەوە وتیان ئەم وەرەقەیە ئیمــزا بکە. نەمزانی ئیمزاکە بۆ چییە؟ پرســیم ئەم ئیمزایە بۆ چییــە؟ وتیان بۆ وەکالەتی وەرگرتنــی مووچەیە، تا مانگانە خێزانەکەت نیوەی مووچەکــەت وەربگرێت، کە زانیم بۆ ئەوەیە ئیمزام کرد، لە دڵەوە زۆرم پێخۆشــبوو بــەوەی ئەگەر منداڵەکان نیوەی مووچەکەم وەربگــرن بێ خەرجیی نابن. لەلایەکی دیکەوە، ئەو ئیمزاکردنــەم بەڵگەی ئەوەیە کە ئێمە ماوین و لەناو نەبراوین وەکو بزانم ئەو وەکالەتە لە نیوەی مانگی ٥ی ١٩٩٠-دا بوو.

کە گەرامەوە لە رارەوەکەی قاتی سەرەوە لە ژوورەکانەوە برادەران لە پەنجەرەی دەرگاکانەوە چاوەڕوانــی منیان دەکرد، تــا بزانن ئەو بانگکردنە بۆچی بوو؟ کە تێگەیشــتن بۆ کارێکی وابوو. پێیان خۆشــبوو، دیاربوو ئەو وەکالەتە بۆ زۆرێك لە هاورێیانمان کرابوو. هەر تەنها بۆ من نەبوو.

# ئازادکردنی کاك مەجید سەلیم

لەبەرئەوەی کاك مەجید هیچی لەسەر ساغ نەبووبووەوە دەبوو ئازادی بکەن، بۆیە کاتێکمانزانی رۆژی ١٩٩٠/٥/١٩ کاك مەجیدیان بانگکردو پێیان راگەیاند خۆی کۆبکاتەوە، هەر کە بانگکرا زانیمان بۆ ئازادبوونە. خواحافیزیی لە یەکەیەکەمان کرد، راست رۆیشت و نەگەرایەوە بۆ لامان و ئازادیان کردبوو. بەراستیی بۆ ئازادبوونەکەی زۆر خۆشحاڵبووین، چونکە پیاوێکی وا کوردپەروەرو نیشتمانپەروەرو پاك زۆرمان پێناخۆشبوو، بەوشێوەیە گیرابوو. دەربازبوونی یەکێکیشمان لە کونەرەشی گیانکێشان مایەی دڵخۆشیمان بوو. لەلایەکی دیکەوە خەمباری کردین. چونکە بەراستیی بەرۆیشتنی شوێنەکەی زۆر بەباشی لەهۆڵەکەدا بۆ ئێمە دیاربوو، دەنگێکی زوولاڵمان لێ ونبوو.

پێش ئەوەی کاك مەجید ئازادبێت، کۆمەڵێك راسپاردەم کردبوو. کە ئەگەر ئازادبوو بچێتەماڵەوەو (زەینەب) ببینێت و راسپاردەکانی پێ بڵێت. یەکێك لە راسپاردەکان ئەوەبوو، کە پێیان بڵێت ئاگاداری مامۆستا (ش) بن، هەوڵبدەن نەیانبینێت، ئەگەر سەریشی لێدان هیچ جۆرە قسەو باسێکی لەگەڵدا نەکەن، هەرچییەکی سەبارەت بە من پێ وتن گوێی پێنەگرن. تا دەتوانن خۆیانی لێ بدزنەوەو هەوڵبدەن نەیانبینێت و نەزانێت لە کوێن.

دووەم راسپاردەم ئەوەبوو. ئاگاداری (زەینەب) بکات ماڵمان لەژێر چاودێریدایەو چاودێرییەکەش رەنگە دوولایەنە بێت. لایەنێکی مامۆستای ناوبراو، لایەنەکەی دیکە لەلایەن ئەمنەوە بێت، بۆیە هەوڵبدەن بەهیچ جۆرێك هاورێیان هاتوچۆی ماڵمان نەکەن. راسپاردەی سێیەم مەسەلەی تەلەفۆن بوو. پێم وت پێیان رابگەیەنێت تەلەفۆنی ماڵەوەو قوتابخانە لەژێر چاودێریدان، هەرکەسێك تەلەفۆن دەکات تۆماری دەکەن، با تەلەفۆنەکە لەناو ماڵدا ببڕن، بۆئەوەی هیچ تەلەفۆنێك وەرنەگیرێت. راسپاردەی چوارەمم ئەوەبوو کە زەینەب ئاگادار بکات ئەو خۆشکانەی (کەرتی شەهید لەیلا) لە چەند لاو شوێنەوە ناوی کەرتەکەو ناوی نهێنی ئەندام کەرتەکان و ناوی من دراوە کە بەرپرسیانم و ناوی (جەمیلە) بەناو هاتووە، ئەوەش پەیوەندیی بەو (سێخورەوەیە) کە لە کۆبوونەوەکاندا ناوی زانیبوو با ئاگاداری خۆیان بن، چەند هەوڵیان لەگەڵ مندا داوە نەیانتوانیوە هیچ نهێنییەکم لێوەربگرن و پاراستوومن.

پێنجەم: (بەئازادو بەهار) بڵێن با ئەمساڵ بەشداریی تاقیکردنەوەی سەری ساڵی پۆلی شەش (بەکالۆری) نەکەن.

### بەختیار کرایە چاودێری ژوور

دوای ئازادبوونی (کاک مەجید) (بەختیار عومەر) کرایە چاودێری هۆڵەکە، بەختیار یەکێك بوو لەو زیندانییانەی زۆر دەنووسـت، ئیتر ئەو ئەرك و کارانەی کە پێشـتر لە ئەستۆی (کاك مەجید)دا بوو، ئەو گرتییە ئەسـتۆ و لەکاتی بەختیاردا کۆمەڵێك گۆڕانکاریی هاتە پێشەوە، کە دەمەوێت هەریەکەیان بەجیا باسبکەم.

# مواجەیەکی چاوەڕواننەکراو

ڕۆژێــك بەیانییەکەی (ڕەحیم) هات و بانگیکردم، وتــی: خۆت ڕێکخەو وەرە دەرەوە. خۆ ڕێکخســـتن دەبێت چۆن بێت؟ هەیەو نیمە ئــەو جلانەیە کە لەبەرمدایە. بەهەر حاڵ چوومە دەرەوە. کەلەبچەو پەرۆی بەدەستەوە نەبوو، چاوی نەبەستمەوەو کەلەبچەی نەکردم. بەیەکەوە بەڕارەوەکەدا کەوتینە ڕێ و لە قادرمەکان چووینە خوارەوە، پرسیم ئەم بانگکردنە بۆ چییە؟ وتی: کەســـوکارت هاتــوون. موچڕکێك بە گیانمدا هات و ترســـی ئەوەم بــوو (زەینەب و منداڵەکانیان) گرتبێت. لەخوارەوە لەســـەر ڕیحلەیەکی قوتابخانە دایناوم. چوو ئاوێنەیەکی بچووك و مەکینەیەکی تەراش و گوێزانێك و سابوونێك و هەندێك ئاوی لە جامێکدا هێنا. لەبەردەممدا دایناو وتی: ڕیشت بتاشە. وتم: خێرە بۆ ڕیشم بتاشم؟ وتی: مواجەهەت هاتوەو خێزانت و کوڕەکەت هاتوون بۆ لات. هەواڵەکە ئەوەندە خۆشبوو، باوەڕم نەدەکرد. لە ئەمن و ڕێگا بدرێت کەســـوکارمان بێنە سەردانمان و چاویان پێمان بکەوێت؟! ڕیشم زۆر هاتبوو، دەمێك بوو ڕیشـــمان نەتاشـــیبوو. کە کەوتمە ڕیش تاشـــین زۆر بەزەحمەت دەتاشرا، چونکە ئاوەکە ســـاردو مەکینەکەش زۆر خراپ و ئاوێنەکەش بچووك بوو، شـــتێك نەبوو لەســـەری دابنرێت و ڕیشیشـــم زۆر هاتبوو بە هەزار حاڵ ڕیشـــم تاشـــی. لەکاتی تەراشەکەدا هەندێك شـــوێنم بڕی و خوێنیان لێهات. دوای ڕیشتاشین وتی: هەســـتە بابڕۆین. ماوەیەك ڕۆیشتین و تاگەیاندمییە شـــوێنێك ڕاڕەوێك بوو، ڕاڕەوەکە ئەو ڕاڕەوە بوو، کە زۆرجار بۆ لێکۆڵینەوەو بەرەو ڕووبوونەوە دەیانبردم، چەندجار (ش)یان دەهێنایە ئەو شـــوێنە. کە سەیرمکرد (زەینەب و ئازاد) لەســـەر قەنەفەیەکی دار دانیشتوون، هەر منیان بینی ڕاپەڕین بەرزەپێ بەرەو ڕووم هاتن. وەکو خەو ببینم وا بوو، باوەڕم نەدەکرد. ئەوانە (زەینەب و ئازاد) بن، باوەشمان بەیەکدا کرد، تێر ماچی یەکترمان کرد، لەگەڵ ماچکردن و دەســـتکردنە ملدا، پێم وتن: ناوی کەس نەهێنن، ئاگاتان لە قســـەکردن بێت و وریا بن. وتیان: خەمت نەبێت هەمووشـــتێکمان پێ وتراوە.

(نەقیـــب ماجد) بانگـــی ڕەحیمی کرد، وتـــی: بیانهێنـــەرە ژوورەوە، چووینـــە ژوورەوە، هەرســـێکمان لەسەر کورســـییەك لە بەرامبەری خۆیان دایاننایین، دەموچاوم دیاربوو، خوێنی پێوەبوو. ماجد وتی: (ئازاد) باوکت بەرە لەسەر ئەو مەغسەلە با دەموچاوی بشوات. لەسەر مەغســـەلەکەو لەکاتی دەموچاو شـــۆردندا بەئـــازادم وت: وریا بن ناوی کـــەس مەهێنن و ئاگاداری قســـەکردن و وەڵامدانەوەی پرســـیار بن، با دایکت قسە نەکات، هەر چییان پرسی تۆ وەڵامبدەرەوە، پرســـیم چۆنە وا ڕێگایان داون هاتوون بۆ لام؟ وتی: بە هەوڵی (کاك برایم و ئەوان) ئەم چاوپێکەوتنە ڕێکخراوە، (ڕەحیم) بەدیارمانەوە ڕاوەســـتابوو، نە قســـەی دەکردو نە پەلەشی دەکرد. کە دەموچاوم شۆرد، چووینەوە ژوورەوە.

کە دانیشتینەوە. سەرنجم دا، جگە لە (ماجدو جەبار یەکێکی دیکە) دانیشتووە. (نەقیب

ماجد) بە کەسی سێیەمی وت: کە قسەیان بۆ بکات، دیاربوو کورد بوو، بە قسەکانیدا خەڵکی خانەقین بوو. کەوتە باسکردنی باری ژیانمان باسی باشیی خواردن و بوونی موبەریدەو رۆژانەی رۆژنامەو هەفتانە ریشتاشین و ئاوی بەردەوام بۆ خۆشۆردن. بەکورتی وای باسکرد لەناو ئەمندا هیچ جۆرە کەموکورییەکمان نییە، هەموو شتمان بۆ دابینکراوەو باری ژیانمان لەوپەری باشیدایە، (ماجد) لێی پرسیم (محەمەد) وانییە؟ وتم: بەڵێ... لەکاتی پرسیاری منداڵ و کەسوکارداو هەواڵپرسینی دایکم و ئەوەم لەنێوانی قسەکاندا پێوتن کە (محیدینی کاك حەمە ئەمین) لێرەیەو بەیەکەوەین و زۆرباشە. زەینەب لە دەمی دەرچوو، وتی: ئەم چاوپێکەوتنە (کاك برایمی) بەغدا سازیکردووە. کورەکە گوێی لێبوو، وتی: ناوی کەس مەهێنن و باسی چی دەکەن قسەی وا مەکەن.

ماجد گوێی لە ناوی (برایم و بەغدا) بوو. وتی: بەغدای چی و ئیبراهیمی چی؟ وتم: هەواڵی دایکم پرسی نەخۆشبووە، بردوویانە بۆ بەغداو بردوویانەتە لای (دکتۆر ئیبراهیم تەها) روویکردە مفەوەزە کوردەکە وتی: وابوو؟ وتی: بەڵێ وابوو... ئیتر وازیهێنا. چاوپێکەوتنەکە تەواوبوو.

(ئازاد) وتی: کەلوپەل و خواردن و میوەمان بۆ هێناوە، بیدەینێ؟ ماجد وتی: ئا بیدەنێ، شتەکانی بۆیان هێنابووم زۆر بوو، دایانە دەستم رەحیم لەگەڵمدا هەڵیگرت. من و رەحیم بەرێی خۆماندا گەراینەوەو (زەینەب و ئازاد)یش بەرێی خۆیاندا لە ئێمە جیابوونەوەو نەمزانی چۆن لەبەر چاوم ونبوون و لەکوێوە چوونە دەرەوە. کە چووینە ژووری حەرەسەکان لەسەر ریحلەیەك دامانانم. سەیری شتەکانیان کرد. وتیان: خواردن نابێت بەریتە سەرەوە، دەتوانیت لێرە خواردنەکەت بخۆیت. وتم: (نەقیب ماجد) رێگای داوە. وتیان: نابێت و قەدەغەیە. وتم: ئەگەر نەیبەمە سەرەوە خۆشم بە تەنها لێرە هیچ ناخۆم، خواردنم نەخوارد، ئەو شتانەی بۆیانهێنابووم، جگە لە خواردن (بیجامە، کراس، دەرپێ و فانیلە، نەعل، قۆندەرە، دەسر، سابوون، بۆن، فلچەو دەرمانی دان و تاقمی تەراش و گوێزان)و چەند جۆر میوەیان هێنابوو، وتیان جگە لە (تاقمی تەراش و گوێزانەکە)، ئەوانی دیکە هەر هەموویان بەرە سەرەوە. (رەحیم) لەگەڵمدا هات و بردمییەوە بۆ سەرەوەو شتەکانی لەگەڵدا هەڵگرتم، بەدەم رۆیشتنەوە پیرۆزبایی ئەو چاوپێکەوتنەی لێکردم، وتی: زۆرم پێخۆشبوو. کە چاوت بە دایکی منداڵەکانت و کورەکەت کەوت. ئەوانیش چاویان بە تۆ کەوت، وتی: لەکاتی وەکالەتی مووچەکەشت هەر ئەوان هاتبوون، بەڵام رێگایان نەدان بێنە سەرەوەو یەکتر ببینن، وتی: ئەوکاتەش شتی زۆریان بۆ هێنابوویت وەریانگرت، بەڵام نەیانگەیاندە تۆ، هەر هەموویان لەناو خۆیاندا بەشکردو خواردن و میوەکەشیان خوارد. حەزدەکەم بزانیت من لەو خواردنەی تۆ هیچم نەخوارد، لەو شتانەشی بۆت هاتبوو، هیچم وەرنەگرت، کە چوومە سەرەوە دیاربوو، جگە لە هۆڵی خۆمان برادەرانی هۆڵی چوارو سێ لە چاوەروانیدابوون تا بزانن بۆ بانگکراوم؟ کە پرسییان، وتم: مواجەهەم هاتبوو. کە چوومە ژوورەوەو برادەران

ــــەیریان کرد، ریشم تاشیوەو کۆمەڵێك شتم لەگەڵ خۆمدا هێناوەو رەحیم دەیداتە دەستیان و خۆشــم دەستەکانم پڕەو دەموچاوم خۆشیی و پێکەنینی پێوە دیارەو رەنگی زەردم سووریی تێکەوتووەتــەوە، هەر هەموو بە گەرمـــی بەخێرهاتنەوەیان کردم، لە ناوەراســتی خۆیاندا دایاننـــام. بە وردیی و دوورو درێژیی باســـی چاوپێکەوتنەکەم بۆ کردن. زۆر دڵخۆشـــبوون بەوەی کە ئەم چاوپێکەوتنەو رێگادانە نیشانەی ئەوەیە وەزع باشەو گۆڕانکاریی لە سیاسەتی رژێمدا بووە، دەیانوت ئەمە هەنگاوێکی تازەیە، کەلوپەلەکان جگە لەوەی کە بۆ خۆمم دانا، ئەوانی دیکەم دابە(موراقیب) بەســـەر برادەراندا بەپێی پێویستیی دابەشیانکرد، میوەکەش وەکو بیتەوە یادم ئەوەی هێنابوویان (ترێ، قۆغ، هەرمێ)بوو، ئەوەشـــیان بە یەکسانی بەسەر هەموو زیندانییەکاندا دابەشکرد. تەنانەت (دەسری کلێنکسە)کەش دابەشکراو بۆنی کاغەزی ســـابوونەکەمان زۆر لاخۆشبوو، بۆنمان دەکرد. لەخۆشیی فلچەو دەرمانی دان یەکسەر دانم شــۆرد. هەندێك لە برادەرەکانیش بە دەرمانەکە دان و ناودەمیان شۆرد. ئەو رۆژە بەراستیی رۆژێکی نێجگار خۆشــبوو لە ژیانمدا. هەرگیز بیرم ناچێتەوەو تا هەتایە ئەو دیمەنە لەپێش چاوم لاناچێت، کە چوومە ژوورەوەکەو بینیم (زەینەب و ئازاد) لەســـەر قەنەفەیەك دانیشتوون و کــە منیان بینی بەرزەپێ ڕاپەرین و پەلاماری یەکترمان دا، چونکە دوای دابرانێکی چەند مانگە لە خێزان و منداڵەکانم و لەو شوێنە مرۆڤکوژە سامناکەدا (زەینەب و ئازاد) ببینم و ماچیان بکەم و هەواڵی منداڵەکانی دیکەو دایکم و کاکەم و براکانم بزانم. ئەو چاوپێکەوتن و بینینەم هەروەکو خەو دێتەوە یادو بە خەوم دەزانی.

# ئازادبوونی محیّدینی شیخ حەمەئەمین

(محیّدینـــی شـیخ حەمەئەمین) پوورزای باوکم بـــوو. کاتی خۆی مالـــی باوکی لە دێی (داراغا) بوو، سالانێکی زۆربوو هاتبوونە سلێمانی و ماوەیەك لە گەڕەکی خەبات نیشتەجێ بوون. خوشکەزای (خالە جووتیار)، (شێخ عومەر شێخ حەسەن)ی عەوالْ بوو. خالە جووتیار پێشمەرگە بوو، لە(حسك)دا ئەندامی سەرکردایەتی بوو. پیاوێکی کوردپەروەرو خاوەن کەسێتی ناو کۆمەلی کوردەواریی بوو، لەکۆنــەوە پەیوەندیی گەرممان هەبوو. بەتایبەتی و پێــش ئەوەی لە شۆرشــی نوێدا بچێتە دەرەوە. بە بەردەوامی لە دووکانەکەی (قەیســەری نەقیب) ســەردانی دەکردم و هەرجارە پارچە شــیعرێکی خۆی دەهێنــاو بۆی دەخوێندمەوە. هاوڕێی (کاك حەمەرەشــیدی حاجی شەریفی باریکەیی)و (کاك حەمەنووری حاجی ئەحمەدی گەرمیانیش) بوو. هەرجار بەهاتایەتە لام پرســیاری دەکردن، ســێ قۆلیش شەوێك لە عەوالْ بووینە میوانی. بەداخەوە لە ســالانی دوا تەمەنیدا بەهۆی نەخۆشیی قورگییەوە نەیدەتوانی قســە بکات، قسەت لەگەلدا بکردایە هەرچی بویستایە دەبوو بە نووسین بینووسیایە، چەند سالێك دوای ئازادیی کوردستان کۆچی دوایی کرد.

لە ڕێکخســتنی نهێنی ناوشــاری (حســك) چەند برادەرێکیان گیرابوو، کە ئەوەی بیزانم ئەمانە بوون. (مەجیدی ئەوقاف، جەمالی حەمە نووقلە، دوو ژنبراو کچێکی شــیخ عومەرو محێدینی خوشــکەزایی، دایك و کوڕێك لە قەلادزێ، زاوایەکی شێخ حەمە ئەمینی باوکی محیدین، نزامەدین گلی، مامۆستا حەسەن عوسمان و خدلیل ناوێك) کە لە بەغدا دادەنیشت. لەو کەسانە (٦)یان لە ئەمنی سلێمانی لە سالی (١٩٨٩)دا گوللەباران کرابوون. کە دووانیان دایك و کوڕو دووانیان برابوون، (نیزامەدین گلی و مامۆستا عەزیز) ئازادکرابوون، (مهابادی شــیخ عومەر) بە (٥) سالْ حوکمدرا، مەهاباد ئەندامی کۆمەلەو سەر بەکەرتی شەهید لەیلا بوو، بەلام لەسەر حسك گیرابوو.

(محیّدین)یش دوای چەندجار بانگکردنی بۆ (مەحکەمەی ســەورە)و بۆ هەولێر، کە بۆیان دەرکەوت ئەو تۆمەتەی خراوەتە پالی، ڕاســت دەرنەچووبوو. لە ڕۆژانی ١٢-١٣/٦/١٩٩٠-دا بانگیــان کرد، کە بردیان نەهاتەوە بۆ ژوورەکەو نیتر نەمان بینییەوە، لەبەرئەوەی دلنیابوو، لــەوەی کە ئازاد دەکرێــت، بەتایبەتی کە بینی (کاك مەجید ســەلیم) ئازادکــرا. بۆیە ئەو ڕاسپاردانەی کە دامە کاك مەجید بەمیشم دایەوە. هەندێك شتمان ئالوگۆڕ کرد. کراسێکی خوریی ئەســتوورو جووتێك پووتم هەبوو، دام پێی، ئەویش بەتانییەکەو کراسێکی هاوینەی داپێم. دواجار وەکو زانیمان کە بردبوویانە مەحکەمە بڕیاری (ئیفراجکردنی)درا بوو، هەر لە مەحکەمەوە ناردبوویانە ناو بەغداو ئازادکرابوو.

هەرچەندە بۆ من خزمێکی دلسۆزو خۆشەویستم بوو، پێش ئەوەی دەستگیربکرێم و کاتێك کــە ئەو دەســتگیرکرا چەندجار ســەرم لە باوك و دایکــی دا، دەمبینی زۆر شــپرزەن و لە

ناخیانــدا وەکو مەنجەڵ دەکوڵان. ئەوان لەو خەیاڵەدا نەبوون و خۆشــم بەهەمان شــێوە لە خەیاڵی گرتندا نەبووم، نە ئەوان دەیانزانی من دەستگیردەکرێم و لە ئەمن دەچمە ئەو ژووررو شــوێنەی محێدینــی لێیە، نە منیش هەرگیز لــە بیری ئەوەدا بــووم بگیرێم و بگەمە لای (محێدین)، بۆیە بە ئازادبوونەکەی زۆر خۆشــحاڵبووم. لەبەرئەوەی کوڕێکی سەلارو گونجاو بوو، برادەرانی ناو هۆڵەکە هەر هەموو خۆشیان دەویست، بە ئازادبوونی شادمان بوون. بۆیە ئازادبوونەکەی جەژنێکی ئێجگار خۆشبووە بۆ (دایکی و باوکی)، لەو باوەڕەدام کە بینیویانە محێدین چووەتەوە ناویان تەمەنیان ســەرلەنوێ نووســراوەتەوە. دڵنیابووم لەوەی کە ئازاد دەکرێت هەر زوو خۆی دەگەیەنێتە زەینەب و دایکم و کاکەم و منداڵەکانو هەواڵی تەواوی منیان دەداتێ. راســپاردەکانیش وەکو خۆی دەگەیەنێت. بەتانییەکەی ئەوم لەگەڵ خۆم برد بــۆ ئەبوغرێب. کە ئازادیش کرام ئەو بەتانییەم نەبەخشــی، بەڵکو وەکو یادگاریی ئەمن و دیارییەکــی (محێدین)، کاتێــك ئازادکرام لەگەڵ خۆمدا هێنامەوە بــۆ ماڵەوە. بەپێی ئەو وتەیەی کە دیاریی نابەخشرێت، دیارییەکەش لە شوێنێکی وەکو ئەمندا بێت.

بەتانییەکــە تا ئەم ســاڵانەی دوایــی مابوو. بەداخــەوە لەکاتی ٣١/ئابــی/١٩٩٦دا کە کەلوپەلێکی ناو ماڵی باشــم لەناوچوون، ئەو بەتانییــەش یەکێك بوو لەو کەلوپەلانەی کە لەناوچوون.

## گواستنەوەی مامۆستا ئەحمەدو هاوڕێ جەبار

بەرپرسانی ئەمنەکە لەو ئالوگۆڕەی لە هاویندا لەناو ئەمندا کردیان بۆ جێگۆڕکێی زیندانییەکان. (مامۆستا ئەحمەدی سەناعە) لە ئینفرادیی لە خوارەوە بوو. لە تەنیشتی هۆلی پێنج بەرامبەری هۆلی چوار ژوورێکی بچووك هەبوو، لەو ژوورەدا سێ زیندانیی تێدابوو (کەمالی مەلا محەمەد- کە بە کەمالی مەلا ناسرابوو- کارزان ئیسماعیل و حاجی عەلی گەلاڵی)، کەمال لەسەر (پاسۆك)و کارزان لەسەر (یەکێتی)و حاجی عەلی لەسەر (پارتی) گیرابوون، رۆژێك (مامۆستا ئەحمەد)یان لە ئینفرادییەوە گواستەوە بۆ ئەو ژوورە. دوای هاتنی مامۆستا ئەحمەد بۆ ژوورەکە، رۆژانە بۆ سەراو و دەموچاو شۆردن ئەمنەکان دەهاتن و یەکەیەکە ئەو چوار کەسەیان رۆژی دووجار دەهێنایە هۆلی پێنج.

دوای هەفتەیەك (هاوڕێ جەباری حاجی رەشید)یشیان گواستەوە بۆ هەمان ژوورو بوونە (٥) کەس، ئەو (٥) زیندانییە وەکو وتم: رۆژانە یەکەیەکە دووجار دەهێنرانە هۆلی پێنج و لەبەر دەرگاکەو لەناو هۆلەکەدا بەدیاریانەوە رادەوەستان تا تەواو دەبوون، زیاتر لە دوو هەفتە بەوشێوەیە دەیانهێنان و دەیانبردنەوە. دیاربوو، ئەو هێنان و بردنەیان بەلاوە ئاسان نەبوو، یان بەگونجاویان نەدەزانی، بۆیە وەستاو کرێکاریان هێناو بەدیاریانەوە وەستان تا دیواری بەینی ژوورەکەو هۆلەکەیان کونکردو دەرگایان تێخست، کە تەواویان کرد، قفلێکی گەورەیان لە دیوی هۆلەکەوە لێداو کلیلەکەیان دایە دەست (موراقب)ی هۆلەکە، کە (بەختیار عومەر) بوو، بۆئەوەی لە جیاتی ئەمنەکان ئەو کارە ئەنجامبدات، کە رۆژانە دووجار دەرگایان بۆ بکاتەوە، تابێن بۆ سەراو دەموچاو شۆردن پێویستی دیکەیان. ژوورەکەیان بوو بە بەشێك لە هۆلی پێنج، ئەو برادەرانەو ئێمەش ئەمەمان زۆر پێ خۆشبوو، چونکە ئیتر ئەو مێردەزمانە رۆژانە بەردەرگایان نەدەگرت و نەدەبوونە هۆی ئەوەی ئەو ماوەیەی ئەوانیان دەهێناو دەبرد، بە حەزەرەوە قسە بکەین ئەو برادەرانەش رۆژانە بە ئارەزووی خۆیان کاری سەراو، دەموچاو شۆردن، خۆشۆردن، جلشۆردن، قاپ شۆردنیان دەکردو دەیانتوانی لەناوماندا بمێننەوەو قسە بکەن و قسەیان لەگەڵدا بکەین.

## یەکتربینینمان لەگەڵ (مامۆستا ئەحمەد، کارزان و جەبار)دا

- (کارزان ئیسماعیل) لە هەشتاکاندا خانوویەکی (مامۆستا عومەری) دراوسێمانیان بەکرێ گرت. ئەو کاتە (کارزان)و چەند برادەرێکی دیکەبوون وابزانم دیانخوێند. کورگەلێکی هەلارو بێ کێشەبوون لە گەڕەکدا، هەرچەند کەسانی سەلت و زگورتی بوون، بەڵام لەوە دەچوو کە خانووەکە لە گەڕەکەکەدا خێزانێکی بێدەنگی تێدابێت. لەبەرئەوەی دەرگامان بەدەرگاوە بوو، لەگەڵ هەموویاندا پەیوەندیمان خۆشبوو. هەرچەند نەدەهاتنەماڵمان، چی ئێمە نەدەچووینە لایان، بەڵام ڕۆژانە بەیانییان و ئێواران و نیوەڕوان یەکترمان دەبینی و سڵاو و چاکوچۆنی و ڕۆژباشمان لەنێواندا هەبوو. لەوکاتەوە، کارزانم دەناسی، من نەمدەزانی ئەوان سەر بە چ لایەنێکی سیاسین و ڕەنگە ئەوانیش هەروەها، بەڵام لەوە دڵنیابووین، کە هەردوولامان کەسانی خراپ و سەر بەرژێم نین. ماڵی ئێمە بەردەوام برادەران بۆ کاری ڕێکخستن) دەهاتن، ڕۆژێك نامەیەك کە بۆ هاورێیەکمان نووسیبوو، ئێستا نازانم چۆن ئەو نامەیە کە بەشێوەی (چکلێت) پێچرابووە، لە بەردەرگای ئێمە کەوتبوو. (کارزان) بینیبووی، هەڵیگرتبوو، زانیبووی کە نامەی (چکلێتی) (نامەی نهێنی و کاری ڕێکخستنی سیاسی)یە، نامەکەی چۆن هەڵگرتبووەوە هەرواش گەیاندبوویەوە ماڵی ئێمەو دابوویە دەست (زەینەب) پێی وتبوو ئەمە لەبەر دەرگاکەی ئێوەدا کەوتبوو. دەبێت هی ئێوە بێت، پێی وتبوو لەم جۆرە کارانەدا بەئاگابن، چونکە ئەمە دەست کەسانی خراپ بکەوتایە کێشەمان بۆ دروست دەبوو، بە مامۆستا بڵێ با لەم ڕووەوە وریا بێت.

کە چوومەوە ماڵەوە (زەینەب) ئەو دیاردەیەی پێ وتم و سەیری نامەکەم کرد زۆرم لا سەیربوو. چووم و لە دەرگام داو کارزانم بانگکردو سوپاسم کرد. ئەو کاتە چ من و چ ئەوان تێگەیشتین کە هەردوولامان سەرقاڵی کاری سیاسین، بەبێ ئەوەی دوای یەك بکەوین بزانین سەر بەچ لایەنێکین، بەڵام متمانەی تەواومان لەنێواندا دروستبووبوو. کاتێك کە من چوومە ژووری پێنج و باسی کارزانیان دەکرد، لەڕاستیدا نەدەهاتەوە یادم کام کارزانەیە. ژوورەکانیشمان بەرامبەر یەك نەبوو، تا دەمو چاوی یەك ببینین و یەکتر بناسینەوە، ئەو لای برادەران وتبووی مامۆستا دەناسم.

کاتێك یەکەم ڕۆژ کە دەرگایان بۆ کردەوە، هەر هاتە ژوورەوە چاوم پێکەوت، یەکسەر ناسیمەوەو ئەملاو ئەولای یەکمان ماچکرد، ئینجا لە یەك دەرکەوتین کە هەردووکمان سەر بەیەك ڕێکخستن و یەك ڕێباز بووین، هەریەکەمان لە هێڵی خۆمانەوە کارمان دەکرد، کارزان کە منی بینی دوو سێ جنێوی خەست و خۆڵی دا، جا سەیر لەوەدایە تائێستاش ئەوەی کارزان خامۆش دەکاتەوە ئەو جنێوانەیە کە بەردەوام دەیدات، بە جنێوەکانی ئاوێکی فێنك بە هەناویدا دەکات. کاتێك بەتەواویی و بەجووتەو لەگەڵ هاوڕێ (جەبار)یشدا، کەوتینە قسەکردن و کە باسی هاورێیان (حەمەڕەشیدو حەمەنووری و وەستا لەتیف)مان

کـرد. دەرکەوت کە (کارزان) یەکێـك بووە لەو چەند هاورێیەی کە لە گواسـتنەوەی (کاك ئـازادی سـەگرمەدا) لە گەرمیـانەوە بۆ سـلێمانی و دواجار بۆ قەلادزێ و هێنانەوەشـی بۆ سـلێمانی و تا رەوانەکردنی بۆ بەغدا، زۆر چەسـوورانەو بەبێ ترس بە ئۆتۆمبێلەکەی رۆلی بەرچاو و پەرۆشانەی هەبووە، ئەمەی کە دەیلێم بە دانپیانانی هاورێ جەبارو دواجاریش دوای ئازادبوونمان هەردوو هاورێی شـەهید (حەمەنووری و حەمەرەشید) بەزۆریی باسیان دەکردو بەدەمیانەوەبوو، بەداخەوە کە ئێسـتاکە ئەو (٣) هاورێیە شـەهیدبوون. بەبێ ئەوەی گوێ بە (کاك ئازادی سـەگرمە، وەستا لەتیف، هاوری سامان مەولود، کارزان ئیسماعیل، د. خەسرەو گول محەمەد) بدەن زۆر کەس خۆی دەکاتە خاوەنی ئەو نەبەردییە بێ وێنەیە.

- (مامۆسـتا ئەحمەد) لەکۆنەوە یەکمان دەناسی ناسینەکەمان لە سالی ١٩٧٦-١٩٧٧-ەوە بوو. (مامۆسـتا ئەحمەد) لەبەرئەوەی خەلکی سـیوەیل بوو، سـەردەمی بەیانی یانزەی ئازار (کاك حەمەرەشـیدی باریکەیی) کە بە مەلا رەشـید ناسـرابوو، بەرپرسی (رێکخراوی سـیوەیلی) ئەو کاتەی (پ.د.ك) بوو، لەگەل (مامۆستا ئەحمەد)دا یەکتریان ناسیبوو. لەگەل ناسینەکەشدا بووبوونە هاورێیەکی زۆر نزیکی یەکتر. ئەو کاتەی کە من و کاك حەمەرەشید) لە ناوچەی قەرەداغ بووین. زۆر باسی مامۆستا ئەحمەدی دەکرد، لەرووی زیرەکیی و وردیی سەلیقەی نیشکردنەوە، هەمووجار پێی دەوتم زۆرم حەزدەکرد یەکتر بناسن.

لـەو رۆژانـەی شۆرشـی (١٩٧٤-١٩٧٥)دا هەلمان بۆ نەرەخسـابوو یەکتر بناسـین. دوای هەرەس و لە پشـووی هاوینی سـالی ١٩٧٧. کە لە خـوارووی ولات گەرابوومەوە، لەگەل (کاك حەمەرەشـید)دا یەکمان بینی و هەردووکمان تامەزرۆی هـەوال و دەنگوباس بووین، من ئاگاداری کۆمەلێك شـت بووم لەرێگای (مامۆسـتا جەمال و مامۆستا عەزیزو فەهمی قەرەداغی)یەوە پەیوەندیم بە کۆمەلەو بە یەکێتییەوە هەبوو. وتی: با بچین بۆ لای (مامۆستا ئەحمـەد) بزانـین ئەو چی لایە. دلنیام شـتی زۆری پێیە. چووین بـۆلای و لەو چوونەماندا یەکترمانناسـی و لەو یەکترناسینەشەوە بووینە هاورێ. ئەو رۆژە کە بەیەکەوە دانیشتین زۆر شتی باسکرد، دیاربوو بەتەواویی ئاگاداری بارودۆخەکەو هەلگیرساندنەوەی شۆرش بوو. لەو دانیشـتنەماندا کۆمەلێك قسەی دا بەگوێماندا. قسەکانی ئەوەی دەگەیاند کە هەردووکمان کاربکەین و لە هەلگیرسـانەوەی شۆرشدا بەشـداریی بکەین. لێرەدا نامەوێت زۆر بچمە ناو وردەکارییەکانەوە. دوای ئەو جارە چەند جاری دیکە یەکمان بینییەوە، بەراسـتیی تێگەیشتم ئەو کەسەبوو کە (کاك حەمەرەشید) بە بەردەوامی باسی دەکرد.

لـە سـالی (١٩٨٠)دا کە نەقلی سـلێمانی بوومـەوە، لەگەل (کاك حەمەرەشـیدو کاك حەمەنـووری) نزیکبوومەوە، زۆرجار سـەرمان لێدەداو لەبیرمە سـالێك لـە خانوویەکی دووقاتی گلدا بوو (لە گەرەکی مەلکەندی) بەرامبەری (قوتابخانەی سـوورکێو)، کە چووینە مالیان. هەر دانیشـتین کەوتە دەرهێنانـی ئەدەبیات، هەر ئەوەندەمان دەزانی سـەتلێکی برنجی یان سـاوەرو نۆکی رادەوەشاندو نامیلکەیەك یان بلاوکراوەیەکی لێ دەردەهێنا. (کاك

حەمەڕەشـید) بینی مامۆستا ئەم شتانەی بەو شێوەیە هەڵگرتووە، پێی وت: مامۆستا چۆن شت وا هەڵدەگیرێت؟ وتی: ئەم جۆرە شوێنانە باشترین شوێنن بۆ هەڵگرتن.

(مامۆسـتا ئەحمەد) لە ساڵانی هەشتاکاندا خانوویەکی لە بەختیاری دروستکرد، زۆرجار لەکاتی خەریکبوونی بەخانووەکەیەوە، سەرمان لێدەداو کە تەواویش بوو، چەندجار لەو خانووە دەچووینە سەردانی، ڕۆژێك وتی: بابچینە ژێر زەمینەکەمان و حەزدەکەم بیبینن. ژێر زەمینێکی باشم دروستکردووە، دەرگای ژێر زەمینەکە لەناو خانووەکەو پاشەوەی خانووەکە بوو، بە قادرمە چووینە خوارەوە، چەند شوێنێکی پیشاندایین وتی: ئەمانەم بۆ کاری نهێنی و شت شاردنەوەم دروستکردووە، شوێنەکانی بەڕاستیی زانستییانەو وردبینانە دروستی کردبوون.

پێش دەستگیرکردنەکەی بەچەند ڕۆژێك سەرمان لێداو نانی نیوەڕۆشمان بەیەکەوە خوارد، لە قسەکانیدا هەستمان پێکرد ترسێکی لا دروستبووەو گومانی لە کەسێك هەبوو. کەسەکەش هەر لەو گەڕەکەی خۆیان بوو. وتی: حەزناکەم بتان بینێت. دوای چەند ڕۆژێك لەو یەکتربینینە هەواڵمان پێگەیشت کە مامۆستا ئەحمەد دەستگیرکراوە. لەدواجاردا دەرکەوت کە دەستگیرکردنەکەی بەهۆی ئەو کەسەوە بوو کە خۆی ترسی لێی هەبوو. ئێمە لەدەرەوە بەتەمای نەمابووین و بەهەموو بۆچوونێکمان وام دانابوو کە لەناویان بردووە، پێش گرتنم لە ڕێگای چەند مامۆستایەکەوە کە لە گەڕەکەکەیان بوون هەواڵی ماڵەکەیانم دەزانی، کە چەند جار چوونەتە ماڵی و پشکنیویانەو شتیشیان تێداگرتووە.

کە ئێمەش دەستگیرکراین، وەکو لەپێشەوە باسمکردووە، لەکاتێکی زۆر نائاسایی و ناخۆشدا بۆیەکەمجار لە (ئەمنی سلێمانی) یەکمان بینییەوە، لەو یەکتربینینەماندا، هیچمان بەقسە قسەمان لەگەڵ یەکدا نەکرد، تەنها بەچاو سەیری یەکمان کردو لەناخەوە داخمان هەڵدەڕشت. جاری دووەم کە هێنایانە ئەو ژوورەو باوەشمان بەیەکداکردو بە دڵی خۆمان یەکمان ماچ و بۆنکرد، لەم جارەدا فریای قسەکردنی زۆر نەکەوتین. لەیەکتر بینینەکانی دیکەماندا، باسی چۆنیەتی گرتن و دەستکەوتنی ئەو لیست و کلیلەی ڕێکخستنەی بۆ کردم، کە هەندێکیان لە ماڵاندا گیراون، هەندێکیشیان لەلایەن ئەندامێکی ڕێکخستنەوە، کە سەر بە (دائیرەی ئەمن) بووەو لەکاتی گرتنی ئێمەدا دابوویە ئەمن، وەکو بەڵگەیەك لە بەرامبەرمان بەکارییان دەهێنا، ڕۆژەکانی دیکە هەرجارە کە بەیەکدەگەیشتینەوە باسی شتێکی دیکەمان دەکرد، کە هەواڵی نەشتەرگەریی (کاك حەمەڕەشید)م دایەو لە تەندروستی دڵنیامکردەوە، زۆری پێخۆشبوو... باسی جۆرو شێوەی ئەشکەنجەدانەکەی بەوردیی بۆ کردم، باسی ئەو پوازو کەسەشی کرد کە لەبەرامبەری چی کردووە، باسی ئەوەی کرد کە چەندجار بردوویانەتە شەستییەکە بەنیازی ڕەمیکردن تەقەیان بەسەرداکردووەو گێڕاویانەتەوە. باسی ئەوەی کرد کە چەند جار بەڕووت و قووتی بە هۆڵ و ژوورەکاندا گێڕاویانە، وەکو ئیهانەکردن و شکاندنی لەپێش چاوی زیندانییەکان.

- (هــاوڕێ جەباری حاجی ڕەشــیداو یەکتربینــینمان. پێش گرتنمان لە کۆنەوەو لەســاڵی ١٩٧٠-ەوە لەگەڵ (کاك جەبار) بەهۆی (پارتی و یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە) یەکترمان دەناســی، هەردووکمان لە یەك قۆناغی خوێندنی زانکۆدا بووین، ئەو لە زانکۆی سلێمانی و من لە زانکۆی بەغدا.

لە ساڵی ١٩٧٤-و شۆڕشدا (کاك جەبار) هاتە ناوچەی پێنجوێن و لەوێش یەکمان بینییەوە. دوای هەرەســـی شــۆڕش کە من ڕەوانەی خوارووی عیراق کرام، هاوینان کە دەهاتمەوە لەو چێشــتخانەیەی لە (ئەسحابەســپی) هەیبوو، یەکترمان دەبینی. لە هەشــتاکاندا کە نەقڵی سلێمانی بوومەوە، بەردەوام لە زۆر بۆنەدا یەکمان دەبینی، من نەمدەزانی ئەو لە کۆمەڵەدا ئیش دەکات، بەڵام دیاربوو ئەو زانیاریی ئیشکردنی لەسەر من هەبوو.

دوای ســاڵانێك لە ئەنجامی سەر قاڵیم لە ئیش و کارەکانی ڕێکخستنداو بەهۆی ناسینی زۆرێك لە هاوڕێیان، لە ڕیزەکانی ڕێکخســتندا، بەتایبەتی لەو دووساڵەی گفتوگۆی شۆڕش و ڕژێــم لــە ســاڵانی (١٩٨٣-١٩٨٤-١٩٨٥)دا بەتەواویی زانیم کــە (کاك جەبار) کادیرێکی پێشــکەوتووی کۆمەڵەیەو لە پلەی لێپرســـراوێتیدایەو زۆر بەپەرۆشەوە کاردەکات، لەدوای چوونە دەرەوەی هاوڕێیان (سەلیم)، واتە (دلێری ئەحمەد شوکری) و (ئیبراهیمی حەمە عەلی) کە هەردووکیان یەك بەدوای یەکدا (لێپرسراوی ڕێکخراوی سلێمانی) بوون، دەزانرا کە هاوڕێ (جەبار) بەرپرسی ڕێکخراوە، سەردەمی هاوڕێ (جەبار) کارکردن ئێجگار قورسبوو. ڕژێم وەکو هار لە هەموولایەکەوە پەلاماری دەدا، هەڕەشەی دەکرد. بەهەموو جۆرە چەکێکی کوشندەو قەدەغەکراو گوندەکانی ژەهرڕێژ دەکردو کیمیابارانی هەڵەبجەو کوردستانی خاپوور دەکرد ئەوەی کە بەســەلامەتی مایەوەو نەرووخێنراو وێرانەکرا، شارەکانی (سلێمانی، چەمچەماڵ، هەولێــر، دهۆك، ئامێدی، عەقرە، زاخۆ، ڕانیە، کۆیە، دووکان، کەلار، کفری، دەربەندیخان، عەربەتو زەرایەن) بوون، ئا لەو ســاڵانەدا داخ و ڕقی شــەڕی چەند ساڵەی لەگەڵ کۆماری ئیسلامیی ئێرانداو لەگەڵ ڕاگرتنی شەڕی نێوانیان، هەر هەمووی بەسەر کوردو کوردستان و بزووتنەوەی کورد دا ڕشــاندەوە، ئەو شــارانەی بە ســنوورێکی دیاریکــراو لە بازنەیەکدا قەتیســکردبوون، لە دەیان ئۆردووگای زۆرەملێدا خەڵکی ســڤیل و بێ دەســەڵاتی کوردی کۆکردەوە، بەرێگای دەزگا ئەمنییەکانی کەوتە ویزەیان. لە بارودۆخێکی وادا هەموو جووڵەو کارکردنێك لەناو شــاردا لە دژی سیاســەتی ڕژێم، بۆ شۆڕش ئێجگار قورس و گران بوو. لە ڕۆژگارێکی وادا شــۆڕش لە ناوچەکانی کوردســتاندا هەڵکەندرا بێــت، یەك بنکە و بارەگا نەما بێت، ئیزگە وەستابێت، ســەرکردایەتی لەودیوی سنوورەوە چاودێریی ڕەوشی سیاسیی و پێشــمەرگایەتی و شــارو شــارۆچکەو ناوچە خاپوورکراوەکان بکات. سەراپای کوردستان و ڕێگاوبانــەکان بەئەلغام و مینی جۆراوجۆر چێنرابێت، شــاری ســلێمانی وەکو زیندانێك بەچەندین شــێوە ئابلۆقە درابێت. هەموو کۆڵانەکانی دەهاتنە سەر شەقامەکانی (مەولەوی، کاوە، پیرەمێرد) بە بەرزی سێ مەتر بەبلۆك هەڵچنرابێت، ئەو شەقامانە بوو بوونە (لوولەی

مەسینە)و نەدەتوانرا لێیانەوە لابدەیت. ئیتر کارکردن و دەمدان لەکاری ڕێکخراوەیی چۆن ڤە نابێت، ئەو هاوڕێیانەی کە لە سەردەمانێکدا بەدلسۆزیی لە ڕێکخستنەکاندا کاریان دەکرد، کە بینییان بەچاوی خۆیان کوردستان لەچەند ئۆردووگایەکدا کۆکراوەتەوە، دەنگ و ڕەنگی شۆڕش کپ بووە، سەرلێشێواێکی ئێجگار مەترسیدار رووی لە گەلەکەمان و بزووتنەوەکەی و خاکی نیشتمانەکەی کردووە. ترووسکاییەك بەدی ناکات، ئیتر چۆن پێی بەجەرگی خۆیدا دەنێت و دەیەوێت ململانێ لەگەڵ ئەو ڕژێمە مرۆڤکوژەدا بکات؟ بۆیە نابێت بیشارینەوەو دەبێت ڕاشکاوانە بیدرکێنین کە زۆرێك لە هاوڕێیان لە ریزەکانی ڕێکخستن کشانەوەو بڕیاری وازهێنانیان دا. ئەوەی مابووەوە ژمارەیەکی دیاریکراو بوو. کە ئەوانیش رقیانگرتبوو، چاونەترسانە ملیان لە چەقۆو پەتی سێدارە دەسوو. مانەوەو کاریان دەکرد. (هاوڕێ جەبار)و ئەو ژمارە هاوڕێیەی کە لە ئەمنی سلێمانی و ئەمنی هەولێرو کەرکوك و بەغداو ژمارەیەکی دیکە کە بەر شاڵاوەکە نەکەوتبوون، کاریان دەکرد. دەبێت بۆ مێژوو بوترێت ئەوەی ئەو هاوڕێیانە لەو رۆژگارە سەخت و ناهەموارەدا دەیانکرد لە دژی سیاسەتی ڕژێم، زیندووکردنەوەی مەفرەزەکانی پێشمەرگە، سەرپەرشتیکردنیان و بەڕێوەچوونیان، مەگەر هەر ئەوانە توانیبێتیان بیکەن، ئاخر چۆن وانییە لە ساڵانێکی زۆری شۆڕشدا (مەکتەبی عەسکەریی)و (سەرکردایەتی سیاسیی شۆڕش) سەرپەرشتی هێزی پێشمەرگەو چالاکی و بەرگریی و دەست وەشاندنیان دەکرد، کە لە ناوچەی ئازادکراوی کوردستاندا بنکەو بارەگایان هەبوو. لە رۆژگارێکی دوای ئەنفال (ڕێکخراوی سلێمانی)و ئەو هاوڕێیانەی لە سنووری ئەو ڕێکخراوەدا خەباتیان دەکرد. لەناوشارو شارۆچکەکاندا، لەژێر دەست و چاوی ئەو هەموو دامودەزگا جۆراوجۆرەی ڕژێمدا، لەجیاتی (مەکتەبی عەسکەریی و سەرکردایەتی) سەرپەرشتی مەفرەزە پارتیزانەکانیان لە گەرمیان، قەرەداغ، چەمی ریزان، دۆلی جافەتی و شوێنەکانی دیکە دەکرد.

ئەگەر ئەمە مل لەچەقۆسوین و خۆ ئامادەکردن نەبێت بۆ بەر پەتی سێدارە، چیتر دەگەیەنێت؟! ئێستاش بەداخەوە چ سەرکردایەتی و چ ئەو هەڤاڵانەی لە مەفرەزەکاندا بوون، کە زۆر بە باشی ئەو ڕاستییانە دەزانن، لەمرۆدا ئەو ڕاستییانە باس ناکەن و بچووکترین ماف و حەق بەو هاوڕێیانەیان نادەن، کە لە ڕۆژگارە سەختەکاندا (کەباب و شفتەیان بەگەرمی پێدەگەیاندن)، بە بەردەوامی نەیاندەهێشت (بێ جگەرەو بێ فیشەك و تاقمی تفەنگ و میوەو کەلوپەل بن)، هەرچییان دەبینیت هەر باسی پاڵەوانێتی خۆی و ماندووبوونی خۆی دەکات، چەندین کەسیان بەهۆی دەست بەسنگەوەگرتن و تەکەتوول و دەستەگەریی و ناوچەگەرییەوە کردووەتە تێکۆشەرو خاوەن خەباتی نەپساوەو بەرپرسی درۆو بێ بنەما، لە هاوشانیان قوتیان دەکەنەوەو شاهیدی ناڕەوایان بۆ دەدەن، بۆ دەیان پۆستی حکومیی و حزبیی و ڕێکخراوەیی کاندیدیان دەکەن و بەرزیان دەکەنەوە. ناچارم و ڕاشکاوانە لێرەدا ئەوە بڵێم، ئەو هاوڕێیانەی سەر بە ڕێکخستنەکانی ناوشار لەو بارودۆخەدا لە هیچ ڕوویەکەوە لەو

پێشمەرگەو سەرکردەو بەرپرسە تێکۆشەرانە کەمتر نەبوون، کە لەناو هێزی پێشمەرگەداو لە ناوچە رزگارکراوەکاندا خەباتیان دەکرد. بەڵکو زۆر ئازاترو لێهاتووترو خەمخۆرتر بوون، کە لەدوای ئازادیی کوردستان و گرتنەدەستی دەسەڵات پەراوێزخراون، مەگەر بەزۆرو زۆرداریی هەندێکیان لە چەند ئۆرگان و دەزگایەکی حکومیدا جێگای خۆیان کردبێتەوە، ئەگینا وەکو ئەوەی خەبات و ماندووبوون و چاونەترسییان لەپێش چاو بگیرێت، نەگیراوە، بەڵکو وەکو کەسانێکی نامۆ لەدوورەوە سەیری حزب و حکومەتەکەیان دەکەن.

دیارە ئەم بابەتە زۆر زۆر لەمەزیاتر هەڵدەگرێت، کە لەسەری بنووسرێت، بەڵام لێرەوە کۆتایی بەو بابەتە دێنم و دێمەوە سەر ئەو رۆژانەی کە لە ئەمنی سلێمانی چۆن لەگەڵ هاوڕێ جەباردا یەکترمان بینییەوە؟

من لە گەرمەی لێکۆڵینەوەو بانگکردن و هاتوچۆو هێنان و بردنی ئازارو ئەشکەنجەدابووم، وەکو لەپێشەوە باسمکردووە، کە نامەوێت جارێکی دیکە باسی بکەمەوە، بۆ یەکەمجار لەگەڵ (کاك جەبار)دا یەکترمان بینی.

جاری دووەم لە گوێزانەوەی بۆ ژوورەکەی تەنیشتمان و کە بۆ سەر ئاو دەیانهێنا لە هۆڵی پێنج، یەکترمان بینییەوە، بە تامەزرۆیی باوەشمان لەیەکدا... یەکسەر وتی: هەردوو هاوڕێ خۆشەویستەکەت ناوی نهێنییان لێرە هەیە. بەڵام نازانن کێن و پارێزراون. ترست لێیان نەبێت، ئەو هەواڵەی وەکو مژدەیەك پێدام، چونکە باش دەیزانی کە (من و کاك حەمەرەشیدو کاك حەمەنووری) بە بەردەوامی بەیەکەوەبووین. تەندروستی (کاك حەمەرەشید)یش بەهۆی چاندنی گورچیلەوە باش نەبوو. من دەترسام ئەگەر ئەوان بگیرێن (کاك حەمەرەشید) لەم ئەمنە لەپاش چەند رۆژی بەبێ ئەوەی ئەمن بیکوژێت خۆی دەمرێت. ئیتر لەو هاتوچۆیانەدا کەرۆژانە دەیانکرد بۆ ژوورەکەمان کەیەکمان دەبینی قسەمان دەکرد، جارێکیان وتی: من بۆ مێژوو پێت دەڵێم زۆر زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کەتوانیت بەرگەی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە بگریتو خۆتگرتو ئەندامانی (کەرتی شەهید لەیلا)تو ئەو برادەرانەیترت پاراست، وەکو لایەنەکانیترمان بەسەر نەهات. کەچەند ژنو کچیان هێنایە بەردەستی ئەم ئەمنانە، وتی ئەگەر بمێنم ئەمە وەکو خۆی باسدەکەم، خۆراگریت بەراستیی باسدەکەم. وتی من ئەمە بۆیە دەڵێم چونکە ناوەکانی ئەندامی (کەرتی شەهید لەیلا) بەناوی نهێنی گیراوەو لەبەردەستیاندایە. یەکێکیان جگە لەناوە نهێنییەکەی ناری خۆشی هاتووە، دەشزانن کەتۆ لێپرسراویان بوویت، بەڵام خۆشبەختانە شوێنو ناوی تەواوو جێگاو ئیشیان نازانن، خەمت نەبێت هاورێکانت ناگیرێن دیارە لێرەدا مەبەستی دوو هاورێکەم (حەمەرەشیدو حەمەنووری) بوو. وتم من هەرخەمی(کاك حەمەرەشید)مە ئەگەر بگیرێت تیا دەچێت، خەمی ئەو کچانەمە ئەگەر بگیرێن زیانی زۆر دەکەین و تاهەتایە بیرناچێتەوە، وتم: ئەوە (مەهابادی شێخ عومەری عەوال) لەگەڵ برادەرانی (حسك)دا گیراوە، هاورێی خۆمانەو سەر (بە کەرتی شەهید لەیلایە) چۆن لەسەر حسك گیراوە، نازانم؟ ئەوە دەگێرنەوە ئەوەی بەو کچەیان کردووە، ئیسرائیلیەکان

بەرامبەر بە فەلەستینییەکان نەیانکردووە. ئەو ماوەیەی کەوا لەو ژوورانەدا بەددەم یەکەوە بووین. کاتێکی زۆرخۆش و باشبوو بۆمان، کۆمەڵێك شتمان بۆ روونبووەوەو لە زۆر شتی تریش گەیشتین.

## شاڵاوی دەستگیرکردنی کۆمۆنیستەکان

لە سەرەتای مانگی (٦)دا دائیرەی ئەمن شاڵاوێکی دەستگیرکردنی لەناو شاری سلێمانی و کەرکوك و شارۆچکەکانی دیکە دەستپێکرد، بۆ دەستگیرکردنی (ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق)، دیاربوو ئەو شاڵاوەیان بەدەستەوە بوو، بۆیە کەوتنە زیادکردنی زۆری ئینفرادیی. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ژمارەیەکی زۆریان لە ئەندامانی ئەو پارتە چەپە گرت. کە کەسانی بەرپرسی پارتەکەیانی تێدابوو. بەداخەوە لەبەر کەمئەزموونییان هەر زوو هەگبەکانیان هەڵرشت و خاڵیی کردەوە، بووەهۆی راپێچکردنی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانیان، بە پیاو و ژنەوە. بەداخەوە لەو شاڵاوەی ئەمنیدا زۆر راپۆرتی کۆبوونەوەیان بەئیمزاو ناوەوە گیرابوو.

ئێمە کە دەمانبیست ئەو برادەرانە حاڵیان وایە لای خۆمانەوە زۆر خەفەتمان بۆ دەخواردن، بەرێکەوت چەند کەسێکیان کەوتنە لای برادەرانی ئێمە لە ژوورەکان و یەکێك لە بەرپرسەکانیان کە وابزانم ناوی (حسێن)، بوو کەوتە ژووری هاورێیان (مامۆستا ئەحمەدی سەناعەو جەبارو کارزان) ئامۆژگاریی و رێنمایی زۆریان کرد، بەو ئامۆژگارییانە گۆرانکاریی لە لێکۆڵینەوەکاندا روویدا بە قازانجی ئەندامانیان گەرایەوە.

# گواستنەوەی زیندانییەکانی هۆڵی (٤) بۆ هۆڵی (٥)

ئەمنی سـلێمانی دیاربوو شـاڵاوێکی گرتنی زۆری لە شـاری سـلێمانی و دەوروبەری بەدەسـتەوەبوو. ژووره ئینفرادییەکانی ئەمنەکە بەشی گیراوەکانی نەدەکرد. بۆیە لە مانگی حەوتـدا زیندانییەکانـی هۆڵی چواریان بۆ هۆڵی پێنج گواسـتەوە. ئەوانـەی لەیادم مابن و هەندێك هاوڕێ بیریانخسـتبمەوە ئـەم زیندانییانە لە هۆڵی چـوارەوە هاتنە هۆڵی پێنج (شـێخ عەبدول، عەلی سالح، سامان مەولود، حەمەڕەحیم، مامۆستا ئەحمەد، حەمە زاهیر، حەمە تاهیر، رزگار، کاکە زیاد، حەمەجان، هۆشـیار، برایمە عەرەب، نەوزاد گرگاشـەیی). ژوورەکەمان بەتەواویی قەرەباڵغ بوو. بەسەر هەرسێ ژوورەکەی ناو هۆڵی پێنجدا دابەشبوون و بۆ نانخواردنیش گرووپ گرووپ جیاکرانەوە.

دائیرەی ئەمن کەوتـە نۆژەنکردنەوەی ئەو ژوورەو ئەوەی بەدەمییەوە بوو، کردیان بەچەند ژوورێکـی ئینفرادیی، لـە پەنجەرەی دەرگاکانەوە دەموچاوی کرێکارو وەسـتامان دەبینی، ئەوانیش ئێمەیان دەبینی و هەردوولامان ملەقوتێمان بۆ یەکتر دەکرد. بە مەبەسـتی ئەوەی ئێمە بزانین وەسـتاو کرێکارەکان کێن و کەسی ناسیاویان تێدایە؟ ئەوانیش دەیانویست بزانن ئەوانەی لەم ژووره زیندانیکراون، کێن و ئایا کەسیان دەناسن؟ ئەم سەیرکردن و ملەقوتێیە لەکاتێکدا دەکرا کە ئەمنەکان لەئارادانەبوونایە.

ئەو زیندانییانەی کە لە هۆڵی چوارەوە گوێزرانەوە بۆ هۆڵی پێنج، جگە لە (وشیارو برایم) و ئەوانی دیکە هەرهەموو، سەر بەرێکخستنی کۆمەڵەو (ی.ن.ك)بوون، لەگەڵ گرووپەکەی ئێمەدابوون، جگە لە (حەمەجان و نەوزاد) کە زووترو بەجیا لە ئێمە گیرابوون، لە هۆڵی پێنج ئێمە بووینە زۆرینەو واماندەزانی بۆ کۆنفرانسـێك یان کۆبوونەوەیەکی فراوان کۆکراوینەتەوە. بەهاتنی ئەو هاوڕێیانە زۆربەمان گەشـاینەوە، کەوا لەو ناو ئەمنەدا بەهەر هۆیەکەوە بوو، توانیمان یەکتر ببینینەوەو بەیەکتربینینمان دەیان بیرەوەریی لە مێشـکماندا وەکو شـریتی سینەما لێدەدرانەوەو رۆژانی بەیەکەوە کارکردنمان دەهاتەوە یاد.

## شەوێکی پشکنین و زللەکانی حەمە

دوای مواجەهەی یەکەم، کە (زەینەب و ئازاد) هاتن بۆلام، کۆمەڵێک کەلوپەل و پێداویستی لە فلچە، دەرمانی دان، سابوون، خاولی، بیجامە، دەرپێ، فانیلە، نەعل، پێڵاو و میوەیان بۆ هێنابووم. ئەوەی کە زۆر دڵم پێی خۆشبوو (فلچەو دەرمانی دانەکە)بوو، چونکە هەموجار دەبوو بە پەڕۆیەکی زبر دانم بشۆم و فلچەو دەرمان نەبوو. شەوێك لەنیوەشەودا کاتێکمانزانی (جومعەو حەمەقەلەو) خۆیان بەژووردا کرد، کەوتنە پشکنینی جێگاکانمان، زۆر شتیان لە جێگای زیندانییەکاندا دۆزییەوەو گرتیان. کە گەیشتنە لای من و شوێنەکەم گەران فلچەو دەرمانەکەیان دۆزییەوە. وتیان: ئەمە چییەو لەکوێت بوو؟ نازانیت قەدەغەیە؟ وتم: ئەمە لەکاتی مواجەهەکەمدا بۆیان هێنابووم و خۆتان ڕێگاتان دا بیهێنمە سەرەوە. من زۆرم وت و ئەوان کەمیان بیست. بەپێوە وەستابووم، لەم قسەکردنانەدا بووین هەر ئەوەندەم زانی (حەمەقەلەو) تا هێزی تێدابوو دوو زللەی سرەواندە ئەملاو ئەولام، زللەکان ئەوەندە بەهێزبوون گێژی کردم و بەپێوە یەکسەر دانیشتم، دیاربوو بەوە دڵیان ئارام بووەوەو فلچەو دەرمانەکەشیان برد، ئەو دوو زللەیە بەقەدەر شەوێکی نەشکەنجەدان ئازاریدام.

### خەڵەف و مامۆستا جەمال عەزیز

شەوێکی دیکە لە نیوەشەودا هەستمان کرد، جموجوڵێك لە ڕاڕەوەکە پەیدابوو، هەر ئەوەندەمان زانی دەرگایان کردەوە، کۆمەڵێك خۆیان بەژووردا کرد، (خەڵەفی بەڕێوەبەری ئەمن و نەقیب ماجدو مولازم ئەحمەدو چەند جەندرمەیەکی دیکە) بوون. لەگەڵ هاتنەژوورەوەیاندا بەڕیز لەلای دەرگاکەوە دەستیان بە پرسیار لە یەکەیەکەی زیندانییەکان کرد، تاگەیشتنە لای (مامۆستا جەمال عەزیز) لێی پرسی ناوت چییە؟ کارت چی بووە؟ ناوەکەی پێوتن و وتی: بەڕێوەبەری ناوەندیی بووم، وتی: بەڕێوەبەری ناوەندیی بوویت؟ وتی: بەڵێ، بەعسی بوویت؟ وتی: نەخێر، وتی: چۆن بەعسی نەبوویت و کراویت بە بەڕێوەبەر؟ ئەی بەنیازی چی بوویت؟ دەتەوێت ببیتە بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردە؟ ئەوەندە لە وەڵامەکانی (مامۆستا جەمال) قارس و توورەبوو، لەگەڵ ناوهێنانی ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە بەخراپی، بەسەر من و مامۆستا شێخ عەزیزو عەبدولعەزیزو ئەوانی دیکەدا تێپەڕی و پرسیاری لە کەسی دیکە نەکردو بەتوورەییەوە چوونەدەرەوە.

## گەرانێکی سەدام، مواجەهەی لێکەوتەوە

لە مانگی حەوتی ساڵەکەدا، (سەدام حسێن) وەکو سەرۆك کۆماری عیراق. کەوتە گەران بە دائیرەکانی ئەمنی پارێزگاکاندا، لە یەکێك لە دائیرەکانی ئەمن کە سەردانی زیندانییەکانی ئەمنەکەی کردبوو. بریاریدابوو، هەر گیراوێك کە لێکۆڵینەوەی لە ئەمن تەواودەبێت، مواجەهە بکرێت، ئەو راگەیاندنە بووە بریارو بەسەر هەرهەموو دائیرەکانی ئەمنی پارێزگاکاندا بڵاوکرایەوە. بریارەکە دائیرەی ئەمنی سلێمانیشی گرتەوە. بۆیە لە مانگی (هەشتی ساڵەکەدا) زۆربەی زۆرمان مواجەهەکراین، جگە لە هاورێیان (جەبارو مامۆستا ئەحمەدی سەناعە)، لەبەرئەوەی ئەوان خێزانەکانیان فەرمانی گرتنیان هەبوو، نەیانتوانی مواجەهە بکرێن. ئیتر رۆژانە یەکەیەکە مواجەهەمان دەکراو ئەو مواجەهەیە بۆ ئێمە لە ئەمن دیاردەیەکی دڵخۆشکەربوو، کەڵکی زۆرمان لێوەرگرت.

# من و دووەم مواجەهە لە ئەمن

ئەو مانگەی مواجەهە دەستی پێکرد، چەند برادەرێك مواجەهەیان کرا، سەرە هاتە سەر من، ڕۆژێك بانگیان کردم، بردیانمە خوارەوە. (نەقیب ماجد) چاوەڕوانی دەکرد، وتی: کەسوکارت هاتوون دەیانەوێت بتبینن مواجەهەتە. لەگەڵمدا کەوتە ڕێ. بەناو حەوشەی ئەمندا تاگەیشتینە شوێنی مواجەهەکە. شوێنەکە ژوورێك بوو، لەناو دائیرەی ئەمندا، بردیانمە ژوورەوە، جگە لە (نەقیب ماجد) یەکێکی دیکە لە ژوورەکە دانیشتبوو، کورد بوو، بە کوردی وتی: ئێستا کەسوکارت دێنە مواجەهەت، پێیان بڵێ ئێمە وەزعمان باشەو خواردنی باشمان دەدەنێ و بەباشی مامەڵەمان لەگەڵدا دەکەن، موبەریدەمان هەیە، جێگامان ناخۆش نییە، هیچ کەموکورییەکمان نییە. کۆمەڵێك لەم قسانەی کرد، ئینجا ئەوانەی کە هاتبوون بۆلام، بانگیان کردن بێنە ژوورەوە، کە هاتنە ژوورەوە سەیرمکرد (کاکە عوسمان و زەینەب و هێرشی شێخ حەسەنی پوورزام و لە منداڵەکانیش ئازادو بەهارو ژیرو بلێسە) بوون، بەبێ بەخشی، دەستی بیجامەی سپیم لەبەردابوو، ئەو بیجامەیە بوو، کە لە مواجەهەی یەکەمدا بۆیان هێنابووم. دیاربوو ڕەنگم سوورێتیی نەمابوو، بەتەواویی سپی بووبوومەوە، زۆر لاوازبووبووم، خۆم بە خۆمم نەدەزانی، بۆیە منداڵەکان (نە ژیرو نە بلێسە) نەیانناسیمەوە. ژیر دەیوت ئەوە باوکم نییە، دوای ئەوەی چاك و چۆنیم لەگەڵ یەکە یەکەیاندا کرد، ئەملاو ئەولای یەکمان ماچ کرد، منداڵەکانم ماچکردو دانیشتین پرسیاری دایکم و خزمانم لێکردن، کاکەم لە ناوهێنانی دایکم سڵەمییەوە. نەمزانی بۆ؟ بەباشی وەڵامی نەدامەوە، لەدواییدا بۆم دەرکەوت، کە کاتی خۆی دایکم بۆ وەرگرتنی ئیجازەی سەربازیی محێدین کە لە بەسرە بوو، شەهادەی وەفاتم بۆ کردبوو، وای بۆچووبوو ئەوان ئەوە دەزانن و چۆن پرسیاری تەندروستی بکەم؟ لەم قسانەدابووین هێشتا بەچاو وەکو پێویست لە یەکمان نەڕوانیبوو، منداڵەکان بەتەواویی دڵنیا نەبوون کە من باوکیانم. هێرش کەوتە قسەکردن لە قسەکردنەکەیدا وتی: (ئینشائەڵڵا وەزع باش دەبێت، بەمزووانە بەردەبن). هەر ئەو وشەی بەربوونەی لەدەم دەرچوو، (نەقیب ماجد) وەکو فیشەکە شیتە ڕاپەڕی و وتی: چووزانیت؟ هێرش کردی بەمەکرەمەی سەید ڕەئیس و ئەو ئەوەی بەگوێدا نەچوو، بەتووڕەییەکی زۆرەوە، وتی: مواجەهە تەواو، هەرچەند کاکەم هەوڵیدا بێسوود بوو، ئەوانیان هەڵسان و بردیانە دەرەوە، منیشیان دایەوە پێش بۆ شوێنەکەی خۆم، کاکەم پێیوتن خواردن و کەلوپەلمان بۆ هێناوە.

هەندێك لەو کەلوپەل و شتانەی کە ڕێگایان دا بیبەمە سەرەوە (شیرینی، میوە، دەسر، فلچە، دەرمانی دان، دەسری کلینکس، فانیلە، دەرپێ، بیجامە، خاولی و سابوون) بوون، خواردنیان هێنابوو وتیان لە خوارەوە خواردنەکەت بخۆ، وتم: نەیبەمە سەرەوە نایخۆم و خواردنم نەخوارد. کە چوومە سەرەوە شیرینی و میوەکەمان بەسەر برادەراندا دابەشکرد، لە کەلوپەلەکانیش ئەوەی کە لێم زیادبوو، دام بەو کەسانەی پێویستیان پێی بوو، یان بێ

کەلوپـــەل بوون، مـیـوەکـــە هەرچەند کەمبوو. بەلام بۆ ئەو کاتە تـــام و چیژی خۆی هەبوو، بەلامانەوە زۆر تاســـوق و خۆشـــبوو، سابوونەکە بۆن خۆشـــبوو، کاغەزەکەیمان هەڵگرت و دەمان خســـتە ژێر ســـەرمان و بۆنمان دەکرد. فانیلەو دەرپێ و پیجامەو خاولی و دەرمان و فلچەی دان و سابوون بۆ ئەو رۆژو شوێنە ئێجگار بەنرخ و بەکەڵك بوون.

دەســـری کلینکسەکەمان بەیەکســـانی بەسەر زیندانییەکاندا دابەشـــکرد، هەرچەندە ئەو مەواجەهەیە بەهۆی ئەو قـــەیەی هێرشـــەوە زۆر زوو کۆتایی پێهێنرا، وەکو خەوێك وابوو بۆم، بەڵام سوودی زۆری لەڕووی دەروونییەوە هەبوو. بـیـنـیـنـی (کاکەم و مـنداڵەکان و هێرشی پوورم) لەو شـــوێن و رۆژەدا کەم نەبوو، چ بۆ من چ بۆ ئەوان، هەرچەندە (بەخشی و شێنێ و شەنگە)یان نەهێنابوو، بەڵام بینینەوەی (زەینەب و کاکەم و مـنداڵەکانی دیکەم) بۆ ئەوکاتە ئێجگار خۆشبوو.

## ریشتاشین، وەرزش، سەرتاشینمان، پێکەنینمان بەیەك و هەندێ شتی هۆڵی (٥)

- بەپێــی ئــەو بەرنامەیەی دائیرەی ئەمن دایناو، هــەر ١٥ رۆژ بۆ ٢٠ رۆژ جارێك، دوو دوو و ســێ ســێ دەیانبردینە رارەوی بەردەم ژوورەکان، بە مەبەستی ریشتاشین، ئاوێنەیەکی بچووك و موســێك و مەکینەیەکی خراپ و ئاو و ســابوونیان دەهێناو دەیاندا بە خۆمان، بۆ ئەوەی ریشــمان بتاشــین. دوای چەندجار بەمشێوە ریشتاشــینە لەجارێکیاندا وام پێباشبوو لەگەڵ ریشــمدا سمێڵیشــم بتاشم، ریش و سمێڵم تاشــی و کە چوومەوە ژوورەوە، هەریەکە لە برادەرەکانم قــســەیەك و تەعلیقێکی دا. (مامۆســتا جەمال) کەسەیری کردم وتی: (شێخ محەمەد) باوەڕ بکە ئێستا رێك لە (کوێخا سمایلی تەلان) دەچیت.

- لەجارێکی ریشتاشیندا (عەبدولعەزیز عومەر) لەبەر پەلەپرۆزێ لەگەڵ تەراشکردنەکەدا دەستکاریی سمێڵی کردبوو. پێی نەزانیبوو لایەکیانی خراپ دەستکاریی کردبوو، بەکورتی ســەقەتی کردبوو، کە هاتەوە ژوورەوە هەر هەموو کە بینیمان پێمانوت بۆ وات لە ســمێڵت کردووە؟ وتی: جومعە پەلــەی لێدەکردم. (کاك مەجید) وتی: وەڵڵا کاك عەزیز عاجز مەبە خۆت نابووتکردووە.

- هەر لەمیانەی ریشتاشــیندا رۆژێك دوو دوو و سێ سێ بانگیانکردین. هەرکەس دەچووە دەرەوە (جومعەو حەمە قەڵەو) رێك سەریان دەتاشی و دەیانکردەوە ژوورەوە، ئیتر تێنەگەیشتین لەبەرخۆمان بوو، لەبەرپاکوخاوێنی و زۆریی تووکی ســەرمان بوو، ســەریان تاشــین، یان ئەمەش وەکو ســزایەك بوو. بەهەرحاڵ برادەرێك دەچووە دەرەوە ســەری دەتاشراو دەگەڕایەوە ژوورەوە هەر هەموو پێی پێدەکەنین، بەکورتی کەسمان نەما بە کەسمان پێنەکەنین.

- زیندانییەکان بۆ کات بەسەربردن و خۆخەڵەفاندن لەناوی سەموون زارو پوولی تاوڵەی و شــەترەنجیان دروستکردبوو، لە مەقەبا نەخشەیان کێشابوو. شەوانەو رۆژانە ئەو یارییانە دەکران و بە باشــی زۆربەمانــی دەخلەفاند، بێ ئاگای ئەمنی دەکردین، مامۆســتا جەمال و کامــەران و برادەرانی دیکەی وەکو مامۆســتا عەزیز بەرنامەیەکی وەرزشــییان دانابوو، بەزۆریی بەیانییان و عەســران لە رارەوی بەر ئاودەستەکاندا، دوو دوو و سێ سێ وەرزشمان دەکرد، لە وەرزشــکردنەکەدا ماندوو دەبووین و ئارەقمان دەکــردەوە، ئەو جموجووڵە بۆ ئەو کات و شوێنە زۆر بەسوود بوو بۆمان.

- هەندێك جار شــووتییان بــۆ دەهێناین کە لەتیان دەکــرد توێکڵەکەیان جیادەکردەوە، مامۆســتا جەمال بانگی دەکردم و وتی: شێخ محەمەد وەرە بچین ئەو توێکڵانە بکرێنینەوە، لە شوتییەکە خۆشترەو لەسەر بەشیش نییە.

ئیتر توێکڵ کرانەوە بوو بە بەرنامەو لە هەموو جارێکی شووتی هێناندا خۆمان بۆ ئامادە دەکرد، برادەرانی تریشمان پێوە نیشت، تا وای لێهات ناچاردەبووین توێکڵەکەشمان لەنێوان خۆماندا بەش بکەین.

- شـەوانە دوای دوانزەو یەکی شـەو هەرکەس لەجێگای خۆی بۆ خەوتن رادەکشاین، کە زۆربەمـان خەومان لێدەکەوت و هۆڵەکە خامۆش دەبـوو. لەپڕێکدا بایەکی بەرز زۆرمانی خەبەردەکـردەوە، هەندێك لەوانەی کە بایان لێبەردەبووەوە بە (سـەلیە) باکانی بەردەدایەوە. دیارە ئەوەش دیاردەیەکی نائاسایی بوو، بۆ هەندێك لە زیندانییەکان و بە هەوەسی خۆیان و بە ئاگایان نەبوو.

- زۆر شـەو لە سەعات دوو یان سێ بەدواوە وەیان بەیانییان لە سەعات چوار لە دەنگی قورئان خوێندنی ئەو برادەرە ئیسلامییانە کە نوێژکردنیان بە دەنگی بەرز دەکرد، زۆربەمانی بەئاگا دەهێنایەوەو خەوەکەیان لێ تێکدەداین و دەزراندین. لەم حاڵانە زۆرجار ناچار دەبووین، کە لەو برادەرانە تووڕە ببین و هەڵبەزینەوە لەنێوانماندا دروست دەبوو، زۆر برادەر جوێنیشی دەدا.

- ئـەو بـرادەرە ئیسـلامییانە قورئانی بچووکیان پێبوو. زۆرجار لە ترسـی پشـکنین و ئاشـکرابوون لەلایـەن ئەمنەکانـەوە لەناو پێڵاوەکانیـان و لەژێر پێیانـداو زۆرجار لە ئاودەستەکاندا دەیانشاردەوە بۆئەوەی نەیگرن.

- (بەختیارو کامەران و مامۆستا فەرەیدوون) سەفەر داشبوون، بەیەکەوە نانیان دەخوارد. هەموو ژەمێك کامەران و بەختیار بەهەڵپەتر بوون و لە مامۆستا فەرەیدوون، بۆیە تا فریای خـۆی دەکەوت خواردنەکە تەواو دەبوو، لەسـەر ئەو دیاردەیە بۆڵەبـۆڵ و نارەزایی لەلایەن مامۆسـتا فەرەیدوونەوە دروسـت دەبوو. تا وای لێهات ناچار خواردنەکەیان بە یەکسـانی لەنێوان خۆیاندا بەش دەکرد.

- ئەو برادەرانەی سەر بە ئیسلامییەکان بوون، لەو خورما خراپەی بەسەرماندا دابەشیان دەکـرد، لەبەر خراپیی نەدەخورا، ئەوان بیریان لەوە دەکردەوە کە ئەو خورمایە فڕێنەدرێت و کۆیان دەکردەوەو دەیانکرد بە سرکە. لەراستیدا سرکەیەکی زۆر خۆشی خورمایان لەو خورما خراپە دروست دەکرد، کە هەر هەموومان حەزمان دەکرد چێژی لێ بکەیەن.

- (عەبدولرەحمان) سـەر بە ئیسـلامییەکان و خەڵکی کەرکوك، کوڕێکی چوارشـانەی تێکسمڕاوبوو، تا بڵێیت کوڕێکی چاك بوو. من زۆرجار پشتم دەیەشا، یان گیانم تێکدەچوو. ئەورەحمان بە شـێلانێکی زۆر وردی خۆی ئاسـا گیانمی نەرم دەکردم و ئەو ئازارو ئێشـەی گیانمـی خاو دەکردەوە، جگە لەوەی پشـتم و باڵم و سـنگ و شـانمی دەشـێلا، پووزم و قاچەکانیشمی زۆر بەوردیی وەستایانە دەشێلا. بەو شێلانە ئارامییەکی زۆر خۆشی بە گیانم و جومگەکانی گیانم دەگەیاند... ئەو کوڕە هەر لەخۆیەوە زۆر پەرۆشـی من بوو. بەردەوام لە تەندروستی دەپرسیم و زۆر بە خەممەوە بوو.

- (کامەرانی مەلا عەزیز) لەمیانەی گاڵتەجارییەکانیدا، بۆ ئەوەی ئارامیی بە مێشك و جەستەی بگەیەنێت. زوو زوو لە ڕارەوەکەی بەر ئاودەستەکان دەستی من و چەند برادەرێکی دەگرت و هەڵپەڕکێی دروستدەکرد، لە هەڵپەڕینەکەدا سەرچۆپی دەگرت و چەند تەمسیلێکی

سەیری لەو سەرچۆپییەدا دەکرد، کە پیاوی سەرسام دەکرد ئەو تەمسیلییە لاسایی جاش و چەکدارە لەخۆباییەکانی رژێمی دەکردەوە.

- لەسەر هەندێك کێشەو راوبۆچوون (من و مامۆستا جەمال) لەگەڵ مامۆستا فەرەیدووندا تێکچووین و گرژیی کەوتە نێوانمان، قسەمان لەگەڵ یەکدا نەدەکرد.

- دائیرەی ئەمن کردبوویە بریار، دەبوو هەموو رۆژێك رۆژنامەیەکی سەوورەمان بۆ بێنن، رۆژنامەی سەورە سەرچاوەیەکی باشبوو، هەر دەیانهێنا ئەوانەی چاویان باشبوو، دەکەوتنە خوێندنەوەی وتارەکانی کە پەیوەندییان بە بارو دۆخی سیاسیی دنیاو عیراق و ناوچەکەوە بوو. ورد دەکرایەوەو راوبۆچوونەکان لەگەڵ یەکدا تاوتوێدەکرا، هەریەکە راوبۆچوونی خۆی دەردەبری ئەو رۆژنامەیە هەرچەندە (رۆژنامەی سەورەو زمانحالی بەعس) بوو، بۆ ئەوکاتەی ئێمە زۆر باشبوو، بووبووە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیمان لەگەڵ دەرەوەی ئەمنەکەدا هەبێت، ئاگاداری بارودۆخی ناو عیراق و گۆرانکارییەکانی جیهان بین، بەتایبەت کە سەردەمەکە سەردەمی گۆرانکاریی بلۆکی شەرق و (پرۆستریکای) ولاتی سۆڤییەت و شوعییەت بوو.
وتارەکانی (عەزیز حاج) دەینووسین موناقەشەی زۆری لەسەر دەکرا، بەکورتی بووە هۆیەك کە ئەو ناو ئەمنە سوورەدا رۆژانە ماوەیەك کاتمان پێ بەسەر دەبرد. لەبیرمە زۆرجار کە یەکێك دەیخوێندەوە، لە عەرەبییەکەدا بەهەڵە بیخوێندایەتەوە (مامۆستا جەمال) هەڵیدەدایەو بۆی راست دەکردەوە. زۆرێك لە برادەران رایان وابوو، بەو گۆرانکارییانەی سۆڤییەت عیراقیش چاو لەو دەکات، بە سیاسەتیدا دەچێتەوەو لە سیاسەتی کوشتن و برین و زوولمکردن و دکتاتۆرییەت وازدەهێنێت، هەنگاو بەرەو دیموکراتییەت دەنێت، بەکورتی زۆرمان بە پرۆستریکاو گۆرانکارییەکانی سۆڤییەت دلمان خۆشبوو، بەوەی لەو روانگەیەوە عیراقیش دەگۆرێت، ئەوەش لەوەوە سەرچاوەی دەگرت رۆژانە وتار لەسەر ئەو گۆرانکارییەو پرۆستریکا لە رۆژنامەی سەورەدا دەنووسرا.

## ئەمن نەیتوانی لە سیاسەت دوورمان بخاتەوە

خوێنەر لای سەیر نەبێت ئەگەر لێرەدا باسێکی خۆمان و ناو ئەمن لە رووی قسەکردن و تاوتوێی بارودۆخی سیاسیی و کوردو شۆرش و بزووتنەوەی کوردایەتی و هەڵسەگاندنەکانمان بکەم. ئێمە کە لە دەرەوە بووین و هێشتا نەگیرابووین، بەحیساب کە دەممان لە سیاسەت و باســکردنی بارودۆخی کوردو بزووتنەوەی کوردایەتییەوە دەدا. زۆر بە نهێنی و لای کەسانی متمانە پێکراو نەبووایە قسەمان نەدەکرد، لە ترسی داموەدەزگای ئەمن و رژێم، بە کوردی بە ترســەوە باسی سیاسەتمان دەکرد، بەڵام لەناو دائیرەی ئەمنداو لەو کونەتاریك و ناخۆشانەدا بەبێ ترس و ســڵەمینەوە باســی سیاســەت و شــۆرش و بزووتنەوەی کوردایەتیمان دەکرد. هەرچەندە رژێم ئێمەی لەســەر سیاسەت و کوردایەتی لەو ئەمنە توندکردبوو، کەچی لەناو ئەو زیندانەداو لەو ژوورە پیس و پۆخڵ و تاریك و بێ هەواو مرۆڤکوژەدا، زۆر لە دەرەوە باشترو چاونەترســانەتر قسەمان دەکرد، موناقەشــەی هەمەلایەنەمان دەکرد. ئەوەندەی شەو و رۆژ لەو ئەمنەدا قسەمان لەسەر دۆزی گەلەکەمان، هەمەلایەنەی سیاسەت، شۆرش و بزووتنەوە شۆرشگێرییەکان دەکردو دەدواین، هەرگیز لەدەرەوە نەماندەتوانی بەو شێوەیە قسە بکەین و بدوێین. زۆرجار کە موناقەشــەمان دەکرد وامان هەست دەکرد کە لە شانەیەکی رێکخستندا دانیشتووین و کۆبوونەوە دەکەین و قسە لەسەر بابەتەکانی کۆبوونەوەکە دەکەین.

# مانگی (٨)و گرتنی کوەیت

بەیانییەك زۆربەمان خەوتبووین، لە دەنگی سروودو گۆرانیی بەئاگا هاتین و هەستاین، ئەمو موکەبەرەی هێنابوویانە سەرەوە. دەنگێکی زۆریان دابوویە، لەم هەراو هوریایەی تێنەدەگەیشتین. هەریەکە لەو بارەیەوە بۆ چوونێکی هەبوو. هەمان بوو وای بۆ دەچوو بڕیاری ئێبووردن دەرچووەو بەرمان ئازادمان دەکەن. هەبوو دەیوت لەوانەیە ئینقلاب بووبێت و حکومەت گۆڕابێت، بەکورتی تێی نەدەگەیشتین ئەمە چییە؟ تا درەنگانێك ئەمنەکان هاتنە سەرەوەو پرسیمان چییە؟ وتیان کوەیتمان گرتووەو ئێستا بووەتە پارچەیەك لە عیراق، ئیتر لە ئێستگەشەوە وەك مژدەیەك هەواڵەکەی جار بەدوای جاردا بڵاودەکردەوە، بە سەرکەوتنێکی گەورەیان دەزانی و زۆر بەلایانەوە گرنگ و خۆشبوو. بەو بۆنەیەوە شیرینییان بۆ هێنایین، ئەو ڕۆژە بەسەرماندا دابەشیانکرد، دوو ڕۆژێکیش خواردنی باشیان بۆ دەهێنایین. ئێمە کەوتینە هەڵسەنگاندنی ئەو پەلامارە، ئەو گۆڕانە، ئەو دەستدرێژییەی سەدام و حزبی بەعس... لە وتووێژەکانداو تاوتوێکردنی ئاروودۆخە سیاسییەکەو هەڵوێستی وڵاتانی عەرەبی و وڵاتانی دنیا، بەتایبەت ئەمریکا ڕاشکاوانە قسەمان دەکرد. وامان دانا کە ئەو پەلامارە بۆ داگیرکردنی دەوڵەتی کوەیت دەبێتە کێشەیەکی گەورەی وڵاتانی ناوچەکەو جیهان، چونکە بەزاندنی سنووری دەوڵەتێك و پەلاماردانی بەهێزی سوپایی بەمەبەستی داگیرکردنی، کارێکی ئاسان نابێت و ئەم شایی و لۆغانە هەڵوێستی بۆ وەردەگیرێت، ئەوە قبوولنەکرێت. لەم ئاروودۆخەی ئێستای جیهانداو دەستدرێژیی لەم شێوەیە قبوولبکرێت و سەروەریی و سەربەخۆیی وڵاتێك پێشێل بکرێت و دەست بۆ سیادەی ببرێت، لەکاتێکدا هەموو دنیا دەیزانی کە کوەیت یەکێکە لەو وڵاتە عەرەبییانەی کە سەر بە ئەمریکایەو لە ئەمریکاوە زۆر نزیکە.

بۆیە ئەم عەنتەرییاتەی بەعس و ڕژێمەکەیمان پێخۆشبوو. بەوەی کە لەمەوە هەڵوێست بەرامبەر بە عیراق وەردەگیرێت، دەبێتە هۆیەك بۆ ڕووخان و لەناوبردنی. ڕۆژانە چاوەڕوانی ڕۆژنامەمان دەکرد، تا بە باشی هەواڵی گرتنی کوەیت بزانین و شتەکانمان بۆ ڕوونبێتەوە، وامان دانا کە ڕژێم خۆی بەدەستی خۆی پەتی قەنارەی کردە ملی خۆی، ئەنجامیش هەروا دەرچوو. هەر لەو دەستتێوەردان و سنووربەزاندنەوە گوشار بۆ سەر ڕژێم دەستپێکردو بەسەرۆکایەتی ئەمریکاو بەریتانیا گەلەکۆمەکییەکی نێودەوڵەتیی لەسەر عیراق و ڕژێمەکەی و سەرۆکەکەی سەدام کۆکرایەوە بۆ تەمێکردنی و گەڕانەوەی لە کوەیت.

# مانگی (٩)و کۆکردنەوەمان بۆ مەحکەمەی سەورە

بەیانـــی رۆژی (١٩٩٠/٩/٩)، برادەرانمـــان کە ناویان نابووین بـــە (جەماعەتی جەبار) لە ژوور و هۆڵەکان دەریانکردین، لـــە پانتاییەکەی خوارەوەی بینای ئەمنەکە کۆیانکردینەوەو رایانگرتین.

کە هەرهەموو کۆکراینەوەو بەرامبەری یەك و بەریز رایانگرتبووین، یەك سەیری یەکترمان دەکرد، تیاماندا بوو تا ئەو رۆژە لە ئەمن یەکمان نەبینیبوو، هەشمانبوو یەکمان نەدەناسی، لەوە تێگەیشـــتین کۆکردنەوەمان بە مەبەســـتی بردنمانە بۆ شـــوێنێك. هەر هەموو پێمان خۆشـــبوو، دەمان وت هەر لەم ئەمنە نەمان هێڵن ئەگەر ئیعدامیشمان بکەن دەربەست نین تەنها لێرە دەرمان بکەن.

زۆری پێ نەچوو (نەقیب ماجد) هاتە ناوەراستەوەو هەندێ قسەی کردو پێی راگەیاندین، کە دەمانبەن بۆ (مەحکەمەی سەورە) دوو دوو کەلەبچەیان کردین، ئۆتۆمبێلیان لە حەوشەکەی ئەمنـــدا ئامادە کردبـــوو. هەموومانیان خزاندە ناو (ئۆتۆمبێلێکی ئەســـعافی قەپاتەوە)، کە ژمارەمان (٣٠ بۆ ٣٢) کەس دەبوو. (من و کاك شـــێخ عەبدول) بەیەکەوە کەلەبچە کراین... لـــە گەرماداو لەبەر بـــێ پەنجەرەیی و قەپاتیی ئۆتۆمبێلەکە، زۆربەمان شـــپرزەو بێتاقەت بوویـــن، زۆرمان لێ بوورایەوەو لە هۆش خۆیان چوون. بەهـــۆی ئەو بارە ناهەموارەمانەوە، جوولاندنی کەلەبچە لە دەســـتماندا توندبوو. بەو توندبوونە (کاك شـــێخ عەبدول) ئێجگار بێتاقەت بوو. سووچی توندبوونەکەی دەدایە پاڵ من. لەو ئۆتۆمبێلە قەپاتەداو لەبەرئەوەی هیچ شوێنێکی نەبوو دەرەوەی لێوە ببینین نەماندەزانی بۆ کوێ دەچین و دەگەینە کوێ و بەچ شارێك و شوێنێکدا دەرۆین. تا لە شوێنێك راوەستاو دەرگای دواوەیان کردەوە. شوێنەکەمان ناسییەوە کە (شـــاری دووزخورماتوو) بوو. پۆلیس و ئەمنەکان لەبەر ئاوخواردنەوەی خۆیان لایانـــداوەو لەو راوەســـتانەدا ئاویان بۆ ئێمـــەش هێنا، بەو دەرگاکردنەوەیە هەناســـەیەکمان دەرچوو، هەوایەکمان هەڵمژی. دیارە زۆر رانەوەستان و دەرگایان داخستەوەو کەوتینەوە رێ. دوای ماوەیەکی باش رۆیشـــتن جارێکی دیکە ئۆتۆمبێلەکە وەستایەوە، کە دەرگای دواوەیان کردەوە، ســـەیرمانکرد لە بەردەمی چایخانەو چەند دووکانێکدایە، ناســـیمانەوە کە شـــاری (خاڵسە)و پۆلیس و ئەمنەکانی لەگەڵماندا بوون لەبەر خۆیان لایاندابوو. ئاویان بۆ هێناین. یەکێـــك لە ئەمنەکان هات و وتی: کێ پارەی پێیە بماندات با میوەو خورماتان بۆ بکرین. من بە رێکەوت لەکاتی پشکنینندا لە پارەکانی گیرفانم (یەك دیناری کاغەز) بەجێمابوو. لە گیرفانی قەمســـەلەکەمدا دەرمهێناو چەند برادەرێکی تریشمان یەکێك نیو و یەکێك رووبع و یەکێك دیناریـــان دەرهێناو دامانە ئەمنەکەو چوو بەپێـــی پارەکەمان خورماو میوەی بۆ کریـــن و بۆی هێنداینەوە، ئـــەو خورماو میوەیە بۆ ئەو کاتەمان ئێجگار خۆش و بەتام و باش بوو، بە خواردنیان ئاهێکمـــان پێداهاتەوە. دوای ئەوەی ئەمنەکان بەتەواویی نانیان خواردو

حەوانەوە، دەرگای دۆزەخ قەپاتکرایەوەو کەوتینەوە ڕێ، دوای ماوەیەك ڕێبڕین، کاتێکمانزانی ڕایانگرتین و ڕاگرتنەکەمان لەبەر (دەمی ئەمنی عامەدا) بوو، تێیاخورین کە هەرهەموومان لەو شوێن و ڕاوەستانەدا سەرمان دابنەوێنین. لەبەر تەنگەبەری شوێنەکەو ئازاری کەلەبچە، گەرمای بەغدا، سەردانەواندنمان و ڕاوەستانێکی زۆر، هەرهەموومان تەواو بێتاقەت و شپرزەبووین. دوای ڕاوەستانی زیاتر لە کاتژمێرێك گوێمان لێبوو، بەو ئەمنانەی کە لەگەڵماندابوون، پێیان ڕاگەیاندن کە ئەو شوێنە خەریکی نۆژەنکردنەوەن، جێگای تێدا نییەو هیچ زیندانییەك وەرناگرن، ناردیانین بۆ (ئەمنی کەرخ)، کە دایانبەزاندین، بەسەر چەند ژوورێکدا دابەشیانکردین (من و مامۆستا جەمال و مامۆستا ئەحمەد ساڵح) بەر ژوورێك کەوتین. کە چووینە ژوورەوە تەنها ژوورەکە زیندانییەکی عەرەبی تێدابوو، دوای قسەکردن لەگەڵیدا، بۆمان دەرکەوت کە لەسەر (شیوعیەت) دەستگیرکراوە. زۆر بە دەربەستەوە نەبوو، گاڵتەی بەگرتن و ئەمن دەهات، پێی دەچوو لەگەڵ ئەمنەکان خۆی ڕێکخستبێت، بە زەبری پارە پەیوەندیی لەگەڵیاندا دروستکردبوو. بۆیە بۆ شێوی ئێوارە ناردی لەدەرەوە نانیان بۆ هێنا، خواردنەکەی بۆیان هێنابوو (مریشکی برژاو، نان، سەموون، لەگەڵ ترشیات و پیازو تەماتە و خەیار)بوو. خواردنەکەی ئامادەکرد، فەرمووی لێکردین، یەکەمجار نەمانویست داواکەی قبووڵ بکەین، کردی بەهەراو سوێندی خوارد، کە دەبێت لەگەڵی بخۆین، وای دەردەخست کە لەبەر ئێمە داوای ئەوخواردنەی کردووە، وەکو بێتەوە یادم (مامۆستا ئەحمەد) یان لێی نەخوارد یان زۆر کەمی خوارد. بەڕاستیی خواردنێکی ئێجگار خۆش و بەتام بوو. دوای زیاتر لە (٧) مانگ یەکەمجاربوو، خواردنی لەم جۆرە بخۆین. مریشکەکە هەر زۆر بەتام و ترشیات و پیازو تەماتەکە هەر زۆرخۆشبوون. ئەو شەوە دوای شێو ئەو پیاوە زۆر قسەی لەسەر ئەمن و جۆرەکانی ئەشکەنجەی بۆکردین، قسەی خۆش و نووکتەشی لابوو. وا قسەی دەکرد کە ئێمە وا لێ بکات کە سامی مەحکەمەو ئەمنمان لابشکێت، بەجۆرێك لە جۆرەکان گاڵتەی بە سیاسەتی ڕژێم دەهات، وەکو بێتەوە یادم ئەو حوکمەی بەسەریدا درابوو، (ئیعدام) بوو.

شەو درەنگانێك خەوتین، بەیانی ڕۆژی ٩/١٠ لە ژوورەکان دەریانکردین و کۆیانکردینەوە، سواری هەمان ئۆتۆمبێلیان کردینەوەو کاتێکمانزانی ڕاوەستان و دەرگای دواوەی ئۆتۆمبێلەکەیان کردەوە، سەیرمانکرد لەبەردەمی تەلارێکدا ڕایانگرتووین. دوو دوو دایانبەزاندین و کەلەبچەکانیان لە دەستمان کردەوەو لە دەرگایەك و بە پلیکانەیەکدا بەڕیز هەرهەموومانیان بردە خوارەوە بۆ ژێرزەمینێك... لە ژێرزەمینەکە، یەك بۆنی ناخۆش بەسەرماندا هات، شوێنەکە گەورە بوو. لە ناوەڕاستیدا چەند قەنەفەیەکی تەختەی درێژ هەبوو، بەسەر قەنەفەکان و هۆڵەکەدا بڵاوبووینەوە، لە سوچێکی هۆڵەکەدا بەلوعەیەکی ئاو و شوێنێك هەبوو بەحساب ئاودەستەو، شوێنی دەستبەئاوگەیاندن و دەموچاو شۆردن و ئاوخواردنەوەیە. بەمەبەستی دەستبەئاوگەیاندن ڕووم لەو شوێنە کرد. شوێنی چی؟ تا

حەزبکەیت پیس و پۆخڵ. بۆنێکی ئێجگار ناخۆشـی لێدەهات، پیسـایی وشـکبووبووەوە، بۆگەنی کردبوو. شوێنێکی نەبوو لەسەری دانیشیت، بۆ دەستبەئاوگەیاندن. بەلوعەکە ئاوی تێدابوو. دیاربوو ئەو بۆنە ناخۆشـەی هۆڵەکە هەرهەمووی هی ئەو بەناو ئاودەسـتە پیسـە بوو.

ماوەی کاتژمێرێك زیاتر ئێمە لەو شـوێن و ژێرزەمینەدا دوو دوو و سـێ سـێ بەیەکەوە قسـەماندەکردو لە چارەنووسـی نادیاری خۆمان دەکۆڵییەوە، هەریەکەمان رایەکی هەبوو. دادەنیشـتین هەڵدەسـاین و پیاسـەمان دەکرد. کاتێکمانزانی لەپڕ ئەفسەرێکی پۆلیس لە دەرگایەکەوە هاتە دەرەوە، لەسـەر پلەی سەرەوەی قادرمەی بەردەمی دەرگاکە راوەستاو تێی خوڕیـن، بێدەنگبن و گوێ بگـرن و وتی: لەگەڵ خوێندنەوەی ناوەکاندا ناوی هەرکەسـێك خوێندرایەوە سەرکەوێتە سەرەوە، کە کەوتە خوێندنەوەی ناوەکان، بەپێی ریزبەندیی ناوەکان لە لیستەکەدا یەك بەدوای یەکدا بە قادرمەکاندا سەرکەوتین، لە دەرگاکەوە دەچووینە ژوورەوە. لەناو ژوورەکەشـدا پۆلیس هەبوو، بەدوای یەکدا ریزیان دەکردیـن لە قەفەزێکی گەورەدا. وەکو بیتەوە یادم من حەوتەم کەس بووم لەناو قەفەزەکەداو یەکەم ناومان (هاوڕێ جەبارو بە دوایدا، ئەحمەدی سـەناعە، عەبدولعەزیز، محەمەدی مەلا حسێن، مامۆستا ئەحمەد ساڵح، حەمەرەحیـم، بەندە) بووین، وەکو بزانم هەرهەموومـان لە قەفەزەکەدا جێگامان نەبووەوەو هەندێکمان لە دەرەوەی قەفەزەکە بوو.

## ژووری مەحکەمەی سەورە چۆن رێکخرابوو؟!

قەفەزێکـی گەورە بەلای دەرگای هاتنـەژوورەوەو دەرگای چوونە دەرەوەی کە ئێمەی تێدا ریزکرابووین. لە بەرامبەری قەفەزەکە چەند کەس بەرەورووەمان بوون، کەسـەکان سـیانیان لەسـەر کورسی و مێز دانیشـتبوون. دیاربوو ئەوەی ناوەراسـت (عەواد بەندەری) سەرۆکی دادگاکەبوو، لە خواریانەوە دووکەسـی دیکە لەسەر دوو کورسی و مێز دانیشتبوون. لەلای خۆرئاواوە دوو تا سـێ کەس دانیشـتبوون. کورسـی و مێزێك لای خۆرهەڵاتەوە بەچۆڵیی دیاربـوو... زۆری نەبرد کاتێکمانزانی کابرایەکی شـەل، خۆی بەژووردا کردو خۆی گەیاندە سەر کورسی و مێزەکە، بە گەیشتنی مشکێك لێی راپەڕی و بەگاڵتەجارییەوە سڵەمانییەوەو ترسـاندی و زۆری نەمابـوو بیگلێنێت، کـە ئێمە ئەو دیمەنەمان بینـی هەریەکەمان لای خۆمانـەوە پێدەکەنین. دیاربـوو، ئەو (تەیموری لەنگە) بەناخێری گیانـی پارێزەرمان بوو!! ئەوانەی خۆرئاوا مودەعی عام و ئەوانەی خوارەوەش حاکمی ستافی مەحکەمە بوون.

## دەستپێکردنی مەحکەمەو دادگاییکردنێکی سەیر

دوای ئەوەی بەتەواویی ڕێکیانخستین، ئەوانیش هەریەکەیان جێگای خۆیان گرت. بەڕیز یەك بەدوای یەکدا کەوتنە پرسینەوە، پرسیارەکەشیان بۆ هەر یەکێکمان ئەمە بوو (تاوانباریت یان تاوانبار نیت؟) یەکەمجار هاوڕێ جەبار ڕێگایان دا چەند چرکەیەك و دەتوانم بڵێم ڕەنگە یەك دەقیقەو نیو قسە بکات، قسەکردنەکەش هەر هەموو بەرگریی بوو لە هەرهەمووومان، ئەوەی ڕوونکردەوە، کە ئەو بە ئاگاداری (موکەڕەم تاڵەبانی)و بۆ دروستکردنی ڕایەڵەیەکی پەیوەندیی لەنێوانی (شۆڕش و ڕژێمدا) ئەم کارانەی کردووە. بەدوای هاوڕێ جەباردا، بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکە زۆر ڕانەدەوەستاو دەیگوێزایەوە بۆسەر یەکێکی دیکەمان، من لە وەڵامدا کە وتم تاوانبارنیم و هیچ کارێکی تاوانباریم نەکردووە، ئەوانەی لە خۆرئاواوە دانیشتبوون یەکێکیان دەستی بەرزکردەوەو هەڵیدایەو وتی: نەخێر، تاوانبارە بە بەڵگە بۆ مەحکەمەی دەسەلمێنین. کاسێتێکی گرت بەدەستەوەو وتی: ئەم کاسێتە وتەی جەلال تاڵەبانییەو دژی حزب و سەورە قسەی کردووەو لە ماڵەکەیدا گیراوە. شاهیدی لەسەرە کە بەرپرسی (هێڵی ڕێکخستنی ژنان و هێڵی دیکەی جەلال تاڵەبانییە). لیستێکی بەرزکردەوە، وتی: ناوی لەم لیستەدایە کە گیراوەو لامانە.

حاکم پرسی دەڵێیت چی؟ وتم: وا نییە هیچ لە ماڵمدا نەگیراوەو لە کەسیش بەرپرس نیم. شاهیدەکەش درۆ دەکات ئەوانە دائیرەی ئەمنی سلێمانی لە خۆیانەوە نووسیویانەو داویانەتە پاڵم. ئەو شەلەی کە لەسەر کورسی و مێزەکەی لای خۆرهەڵاتەوە دانیشتبوو. دەستی بەرزکردەوە، وتی: داوا لە جەنابی حاکم و مەحکەمە دەکەم ئەگەر تاونباریشە ڕەحمی پێبکرێت. ئا لەوێدا بەتەواویی بۆمان دەرکەوت ئەو شەلە جەنابی پارێزەرمانە!! ئەم پرسیارو وەڵامدانەوەیە لە هەرهەموومان کراو هەر برادەرێکمان بەپێی توانای خۆی وەڵامی گونجاوی دەدانەوەو داکۆکی لە خۆی و ناڕاستیی دائیرەی ئەمن دەکرد. دیاربوو کەس بەدوای کەسدا پرسیارەکە بە پەلەترو لە وەڵامەکەی بێ گوێگرتن دەبوون. بە مەزەندەی من، ئەو مەحکەمەیە لەو هۆڵەدا بۆ هەر سی کەسەکەمان لە سنووری (٣٠ بۆ ٣٥) دەقیقە دەوامی کرد، بە پرسیارو وەڵامدانەوەمانەوە. ئینجا دوای پرسیارو وەڵامەکان. (عەواد بەندەر) بڕیاری مەحکەمەی خوێندەوە، لە ژمارە یەکەوە تا ژمارە (١٩)ەمان هەرهەموو بە حوکمی ئیعدام و ئەوانی دیکەش بە موئەبەد حوکمدراین، هەرچی ئەموالی مەنقوولەو غێر مەنقوولەمان بوو، موسادەرە کرا. بەدوای خوێندنەوەی بڕیارەکەدا بەڕیز یەك بەدوای یەکدا لە هەمان دەرگای لێوەی هاتینە ژوورەوە، کراینەوە دەرەوەو کەلەبچەیان کردینەوەو گێرانیانینەوە بۆ (ئەمنی کەرخ)و هەرسێکمان چووینەوە هەمان ژوورو (هاوڕێ جەباریش) لە ژوورێك لە بەرامبەری ژوورەکەی ئێمە دانرا. شوێنەکە وابوو، هەرچەند چاومان لە یەك نەبوو، بەڵام دەمانتوانی لەگەڵ یەکداو لەگەڵ کاك جەباردا قسە بکەین.

بەیانی رۆژی ٩/١١، بەهەمان شێوەی جاران سواری هەمان ئۆتۆمبێلیان کردینەوەو بەرەو سلێمانی گەڕاندیانینەوە، کە گەیشتینەوە ناو ئەمنی سلێمانی، هەرهەمووومانیان بەیەکەوە خستە (هۆلی یەک)ەوە.

# هۆڵی (شیراتۆن)ی ئەمنە سوورەکە

(هۆڵی یەك) یەکێك بوو لە هۆڵە گەورەکانی ئەمنە سوورەکە، لەبەر (گەورەیی، فراوانیی، بوونی ئاودەســت و گەرماو) زیندانییەکان ناویاننابوو (شــیراتۆن). ئەم هۆڵە پێکهاتبوو، لە دوو هۆڵــی یەك بەرامبەر بەیــەك و لە نێوانیاندا ڕاڕەوێکی گەورە هەبوو. کە هەردوو بەری ڕاڕەوەکە بە جامخانەی ئاسن و شووشە نێوان کرابوو. دەرگای هەردوو هۆڵەکە دەهاتنەوە سەر ڕاڕەوەکە. بەکەمیی دەرگاکان دادەخران. لە ڕاڕەوەکەوە بە دوو ســێ قادرمە سەردەکەوتیت و دەچوویتــە ڕاڕەوێکی پان کــە لەمبەرو ئەو بەری ڕاڕەوەکە دوو ریز گەرماو و ئاودەســت هەبوو. هەردوو هۆڵەکە کە بووبوونە جێگای زیندانییەکان. هۆڵەکان فراوان بوون لە ڕووی پانیــی و درێژییــەوە، دەتوانرا بە دوو ریز و ســێ ریز جێگا دابخرێت لەســەر باری درێژیی و پانیــی، زیندانییــەکان کە قاچی هیــچ زیندانییەك لەکاتی خەوتن و ڕاکشــاندا بەر یەك نەدەکەوت، واتە وەکو ژووری دوو یان هۆڵکانی دیکە نەبوو، کە دەبوو قاچت تێکەڵاوی یەك بکردایە. هۆڵەکە لە نهۆمی خوارەوە بوو. شێوە ژێرزەمینێك بوو هیچ زیندانییەك سەبارەت بە ســەراوکردن و خۆشۆردن و جلشــۆردن کێشەی نەبوو. بەبێ ســەرە دەکران. موراقیبــی ژوورەکە ناوی (شــێخ محەمەد)بوو. خەڵکی (سۆڵەی چرچە قەڵا)ی قەرەداغ بوو. کاتی خۆی لە زانکۆ فەراش بووبوو. نەمدەزانی لەســەر چی گیراوە. کەســێکی دەمهەراشی قەرەباڵغی خۆبــەرە پێشــەوە بوو، لەگەڵ ئەمنەکانــدا ڕێك بوو. ئێمە کە چووینــە ژوورەوە ئەو کەوتە دابەشکردنمان بەســەر هەردوو هۆڵەکەدا، خۆی لەهۆڵی لای خۆرهەڵاتەوە لە سووچ (زاویە) دا شوێنی هەبوو. (من و حەمەرەحیم) لە هۆڵی لای خۆرئاواوە بە تەنیشت یەکەوە جێگامان داخســت، برادەرانی دیکــەش دوو دوو بەدەم یەکەوە لەمبــەرو ئەوبــەری هۆڵەکان جێگایان بووەوە، (هاوڕێ جەبار) چووە هۆڵی بەرامبەرمان، (مامۆستا ئەحمەدی سەناعە) لە هۆڵەکەی لای ئێمە لە ســووچێکدا کەناری گرت. من لەو هۆڵەوە (وەســتا بەکری دارتاش، موحسینی مەلا حەمە ئەمین، ئەردەڵان عومەر، عەلی شەهید محەمەد)و چەند هاوڕێی دیکەم ناسی...

هۆڵەکە کە ئێمە چووینــە ژوورەوە زیندانیی دیکەی تێدابوو، بەڵام لەبەر گەورەیی هۆڵەکە پێوەی دیارنەبوو. بەڕاســتیی لەچاو ژووری دوو و هۆڵی پێنــج-دا دیوەخانێك بوو بۆخۆی، بۆیە ناویان نابوو (شــیراتۆن). چوونە ژوورەوەی (٣٠) کەسی خاوەن یەك بیروباوەڕو ڕێباز، کام ڕێبازیش ڕێبازی (کۆمەڵەو یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتان) هەروا ئاســایی نەبوو، بۆیە بــۆ هۆڵەکە. بەتەواویی بوونــە زۆرینــە، هەموو بڕیارێك لەو هۆڵەدا لە دەســەڵاتی ئێمەدا مایەوە... (شێخ محەمەدی موراقیب) تاك و تەرا دەیانناسی و ئەویش هەندێکمانی دەناسی. دیاربوو بە چوونی ئێمە بۆ هۆڵەکە دڵخۆش نەبوو، بەڵکو زۆری لاگران و ناخۆش بوو، چونکە دەیزانی کە لەوەودوا ناتوانێت وەکو جاران بەســەر زیندانییەکانی هۆڵەکەدا بخوڕێ... ئەو دوو ڕاڕەوەی نێوانــی هەردوو هۆڵەکە، ڕاڕەوی بەردەم ئاودەســت و حەمامەکان گەورەبوون،

جێگای پیاسـەی هەبوو. دەتوانرا لە هەریەکەیاندا چەند کەس بە تاك و بە دوو دوو تیایاندا پیاسە بکەن.

دیارە بەرنامەی خواردنی ژەمەکان هەر هەمان سیستمی هۆڵ و ژوورەکانی دیکە بوون، کە پێشتر تیایاندا بووین، بەیانییان بەرچایی ڕۆژێك نیسك و سەموون و نان بەبێ چاو ڕۆژەکەی دیکە چاو ماسـت و شـتی دیکە بوو... بەهۆی گرتنی کوەیت و دروسـتبوونی ئابلۆوقەی ئابووریی لەسـەر عیراق، بارودۆخی عیراق سەراپا گۆرانێکی سەرتاسەریی بەسەردا هاتبوو. دیاربوو هاوڵاتییانی عیراق بەگشـتیی لە بارێکی ناهەمـواری ژیاندابوون، لەبەر کەمیی و نەبوونی پێداویستی ژیان و خواردنی ڕۆژانە... ئەو دیاردەیە کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر ئێمـەو ژیانـی ئێمە کرد، لەو ئەمنەدا، کە بۆ ئێمە ئێجـکار قورس و گران بوو. لەوهۆڵەدا نزیکەی (٥٠) زیندانیی تێدابوو. ژەمی نیوەڕوان چەند سـەتڵێکی ماسـت لە برنج و شلەیان بۆ دەهێنناین، لەکاتی دابەشـکردنیدا موراقیب و ئەوانەی کە دانران لەگەڵیدا نەیان دەزانی چۆن بەشـی بکـەن، ئەوەندە خواردنەکە کەمبـوو. یەك کەس نەبوو کە دەیخوارد هەسـت بـەوە بکات نانی خواردووە، ئێوارانیش بەهەمان شـێوە یەکی یەك سـەموون و جەرتاوێك یـان هێلکەیەکیان بۆ دەهێنناین، کە سـەموونەکە ئەوەندە بچووك بوو باوەڕت نەدەکرد ئەوە سەموون بێت و ئەوەندەی کێکێکی بچووك بوو.

(شـێخ محەمـەدی دەڵاڵ) کـە موراقیب بـوو. دەیویسـت جیاوازیی لەنێوانـی ئێمەو زیندانییەکاندا بکات، بۆیە برادەرانمان گەیشـتنە ئەو بڕیارەی کە دەبێت لێیدەین و تەمێی بکەیـن، ئەوەی لەبیرم مابێت یەکێك لەو برادەرانەمـان (کاك حەمەرەحیم)بوو، کە زۆر زۆر سـووربوو لەسەر کوتانی. ئێمە نەماندەزانی ئەوپیاوە بە ئێمە بۆ قارسەو رقی لێمانە. وەکو بێتـەوە بـیرم هاوڕێ جەبار بانگی کردو بەجیا قسـەی زۆری بۆ کردو بـە کوردی بۆ ئەوەی بیرکاتەوەو عاقڵ بێت، بەو شێوەیە هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا نەکات. هەر ئەوەش بوو وایکرد برادەران لە لێدانی سـاردبوونەوەو وازیان لێهێنا. زیندانیمان نەبوو بەردەوام برسی نەبێت و سکی لەبرسا قوڕەی نەیەت.

هـاوڕێ جەبـار، دوای گەڕانەوەمان لە مەحکەمە ئومێدی زۆری بـەوە بوو کە ئیعادەی تەحقیقمان بۆ بکرێتەوە. لەڕاستیدا من لێم ڕوون نەبوو، لەسەر چ بنەمایەك ئەو بۆچوونەی هەیە کـە ئێمە دوای بڕیاری مەحکەمە جارێکی دیکە ئیعـادەی تەحقیقمان بۆ بکرێتەوە؟! بەپێی ئەو زانیارییانەی لەناو زیندانییەکانی ئەمنی سـلێمانیدا بوو. هەرکەس و گرووپێك کە ئیعادەی تەحقیقیان بۆ دەکرایەوە، دەنێردرا بۆ (ئەمنی هەولێر)، کاك جەبار ڕۆژێك بانگی کـردم و دووبەدوو لە ڕاڕەوی نێوانی ئاودەسـتەکان و حەمامەکاندا کەوتینە پیاسـەکردن. بانگکردن و پیاسـەکەی بەمەبەسـتی ئەو ئیعـادەی تەحقیقەوە بوو، کە ئومێدی لەسـەر هەڵچنیبوو. لە پیاسـەکەماندا کەوتە باسـی چۆنێتی گرتنی و گرتنـی برادەران و وەزعی هەندێك لە برادەران، وای دەویسـت من لەگەڵ ئەو برادەرانەی کە دەیەوێت قسەیان لەگەڵدا

بکەم، بۆئەوەی لەو ئیعادەیەدا کارێك بکرێت، کە بە قازانجی هەموومان بێت و بەناو، ناوی برادەرەکانی پێ وتم و وتی: بە بەرنامە حەزدەکەم لەگەڵ یەکەیەکەیاندا قسە بکەیت. منیش پێم وت: کاکە گیان ئەم کارەی تۆ بە منی دەسپێریت، قورسەو کارێکی ئاسان نییە، چونکە هەر یەك لەو برادەرانە هاورێمن و زۆربەشمان لە یەك تەمەنداین، من سیفەتێکم نییە تا بتوانم بەو راشکاوییە لەگەڵ ئەو هاورێیانەدا گفتوگۆو قسە بکەم، تەنها ئەوەندە دەتوانم لە هەریەکەیان نزیك ببمەوە، لە میانەی قسەکردنماندا ئەوە باس بکەم کە ئەگەر ئیعادەی تەحقیقمان بۆکرایەوە، ئەو ئیعادەیە دەبێتە فرسەتێکی باش بۆمان، تا بتوانین هەریەکەمان بەرگریی زیاتر لەخۆی بکات و وەڵام و ئیفادەی باشتر بداتەوە، ئەگەر شتێکمان لەسەر کرابێت بەماڵ، لەسەر خۆمانی لابدەین. ئەوەش نەك وەکو ئەوەی لەلایەن تۆوە راسپێردرابێتم. پێم وت: بەرای من، تۆ خۆت بە حوکمی بەرپرسێتیت دەتوانیت ئەو کارە بەئاسانیی بکەیت. لە ئەنجامدا وتی: من لای خۆمەوە هەنگاوی بۆ دەنێم، تۆش وەکو خۆت وتت لای خۆتەوە کاری بۆ بکە. هاورێ جەبار هەر لەو پیاسەو قسەکردنەماندا سەبارت بەهەندێك نهێنی رێکخستن و هۆی گرتنمان و کێشەکانی ناو ئەمن و چەند برادەرێکی بۆکردم و وتی: ئەمانە با لای خۆت بن.

## (مامۆستا ئەحمەدی سەناعەو پێشنیازێکی بوێرانە)

(مامۆســـتا ئەحمەدی ســـەناعە) لە رۆژی مەحکەمەوە زۆر بێتاقەت بوو. شـــەوێك وتی: مامۆســـتا با پیاســـەیەك بکەین. لەپیاسەکەدا وتی: مامۆستا من پێشـــنیازێك بۆتۆ دەکەم و تـــۆش بـــە کاك جەباری بڵێ. وتم: فەرموو. وتی: من وای بەباش دەزانم لەم شـــوێنەو لەم هۆڵە کە ئێســـتا هەرهەموومانی تێدا کۆکراوینەتـــەوە، مەحکەمەیەك بۆ خۆمان دابنێین و یەکەیەکە خۆمـــان مەحکەمە بکەین، بۆ ئەوەی هەر لێرە هەموو راســـتییەکان دەربکەون، ئەگەر ئێمە لێرە ئەمەمان کرد سبەینێ ئەگەر (هەرچەندە باوەڕم نییە کە من ئازادبم) چووینە دەرەوەو لەم ئەمنە رزگارمان بوو. کەس ناتوانێت خۆی بەســـەر ئەوی تردا با بدات، چونکە من دڵنیام ئەگەر چووینە دەرەوە (کە هەرچەندێ من سوور دەزانم من جارێکی دیکە دەرەوە نابینمەوە)، ئەو برادەرانەی پشـــتیان دەبێت و لە برادەرانەوە نزیك دەبن و دەیانکەنە پاڵەوان و دەســـت بە پشتیاندا دەدەن‌و پێشـــیان دەخەن، ئەوانەشی شـــەرمیان بەخۆیانەو پاڵپشتیان نابێـــت. کەنـــار دەخرێن و رەنج بەخەســـارو مایەپووچ دەبن. وتی: من ئامـــادەم لەبەردەمی هـــەر هەمووتاندا چی کەموکورتیی و تاوانێکم دەرحەق بە برادەران و رێکخســـتن کردبێت و ساغبووەوە، هەرچی ســـزایەکم بەسەردا بدرێت، رازیم، تەنانەت بەوەش هەر لەم زیندان و ئەمنە لەجیاتی جێبەجێکردنی بڕیاری مەحکەمەی ئەم فاشـــییانە، بە مەحکەمەی خۆمان لەناوم بەرن، با ئەمە بکەینە نەریتێکی شۆڕشـــگێڕیی و تەحەدای هەموو یاســـاو رێسایەك بکەیـــن، ئەم بڕیارەمان دەنگبداتەوە، کە چەنـــد زیندانییەکی کۆمەڵەو (ی.ن.ك) لە ئەمندا خۆیـــان مەحکەمەی خۆیان کردووەو لەســـەر بڕیاری مەحکەمە، چەنـــد هاوڕێیان ئیعدامی شۆڕشگێڕانە کردووە، ئەوانەشـــی بێگوناه و سەربەرزانە دەردەچن، ببنە قارەمانی زیندان و بکرێنە نموونەی تێکۆشەری سەردەم. بەراستیی من لای خۆمەوە پێشنیازو بۆچوونەکەیم زۆر بەلاوە پەسەندو گونجاو بوو، بەڵام ئێستێکم لەسەر ئەوەبوو، کە ئێمە وەکو (کاك جەبار) دەیوت ئیعادەی تەحقیقمان لە پێشەوەیە. بۆیە پێم وت: مامۆستا جا ئێستاو لێرە کاری وا دەکرێت؟ وتی: بۆ نا؟ نەشـــکراوە با بیکەین... وتم: ئەگەر کاری وامان کرد سوودی چی دەبێت؟ ئێمە ئەگەر لەناومانبەرن هەرهەموومان لەناودەبەن. وتی: نا هەموومان لەناو نابرێین، ئەگەر بە بڕیاری مەحەکەمەش بێت ئێمە تا نۆزدە کەســـمان بڕیاری ئیعدامکردنمان دراوەو (١١) یانزە کەســـمان دەمێنینـــەوەو ئەوانە هەر ئازاد دەکرێن. رامواییە گەر ئـــەوەی من دەیڵێم بیکەین، ئەگەر چەند کەسێکیشـــمان بمێنێت راســـتییەکان و ئەو مەحکەمەیە باســـدەکات، بۆ ئێمە دەبێتە (نەریتێکی نوێی شۆڕشـــگێڕیی)و تا هەتاهەتایە باســـدەکرێت... دوای ئەم گفتوگۆو قسەکردنە قەناعەتی پێکردم. چووم لەگەڵ کاك جەبار قسەمکردو راسپاردەو پێشنیازەکەم پێگەیاند. کاك جەبار وتی: (ئا ئەمە گەورەیی و پاڵەوانیتی مامۆســـتا ئەحمەدە). تا ئێســـتا کـــێ لە دەزگاکانی ئەمن و ئیســـتخباراتی رژێمدا بیری لە نەریتـــی وا کردووەتەوە؟ ئەمەش

دەچێتە سەر هەڵوێستە جوامێرانەکانی، کە ئەوە زیاتر لە ساڵ و نیوێکە گیراوە، هەرچی مرۆڤ پێی ناخۆشبێت و نامرۆڤانە بێت لەگەڵیدا کراوە، ئەو هەموو بەڵگانە لە ماڵەکەیدا گیراوەو بەردەوامیش لە دەرەوە کەسێکی نزیك لێوەی بەسەرییەوەیەتی و قسەی لەسەر دەکات و لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی ڕێکخراوەیی و برادەرانی پاراستووە، لەگەڵ ئەو هەموو نالەباریی باری تەندروستییەیدا خۆڕاگرو پاڵەوان بووە. وتی: من دەزانم ئەم پێشنیازەی بەهۆی چییەوە سەرچاوەی گرتووە، بە مامۆستا بڵێ، من سەد دەرسەد لەگەڵ پێشنیازو بۆچوونەکەیدام، ئەوەی وتوویەتی زۆر ڕاستە، بەڵام ئێمە بەنیازین ئیعادەی تەحقیقمان لە هەولێر بۆ بکرێتەوە، دەترسم کارێکی وا لەم کاتەدا بکەین، هەندێ هاوڕێ بە قورسی بزانن و قبوولی نەکەن، پێیان ناخۆشبێت و زیانی زۆر بە ئیعادەی تەحقیقەکەمان بگەیەنێت. پێی بڵێ سنگی فراوان بێت گوێ بەهیچ قسەو قسەلۆکێك نەدات، خەم لە هەڵوێست و ڕەفتاری کەس نەخوات. ئەگەر من بمێنم هەموو ڕاستییەکانم لایە، دڵنیابێت بەڕاستیی و دروستیی بۆ هاوڕێیانی دەگێڕمەوە. هەروەکو چۆن لەو ڕۆژەوەی من و تۆ لە یەك نزیکبووینەتەوەو لەم ئەمنە چەند ڕاستییەکەم پێوتوویت و بۆ باسکردوویت و زۆر شتی تریشم بە هەندێك لەبرادەرانی تر وتووە. هەروا‌ش ئەوکاتە ئەگەر خواکردی و بارودۆخێك ڕەخساو هاتەپێشەوە، ئازادکراین، هەرچی ڕاستییەك لام بێت بەڕاستیی وەکو خۆی باسیدەکەم، چوومەوە بۆلای، قسەو بۆچوونەکانی (کاك جەبار)م دەقاودەق پێ وت و بۆ باسکرد، بە نابەدڵییەوە وتی: باشە ئەو چۆنی پێباشە با وابێت، مادام ئەو ڕای وایە من لەمڕۆوە تا ئەو ڕۆژەی لەم ئەمنەو بشچینە هەر شوێنێکی دیکەی ئەمنیی یان زیندانیی، لەسەر ڕای خۆم سوورم. ئەم بیرۆکەیەی مامۆستام بۆ (کاك حەمەڕەحیم) باسکرد، ئەویش بە بیرۆکەیەکی ئیجگار باشی زانی و وتی: من لەگەڵیدام و ئەمەش دەبێتە تازەگەرییەکی دیکەی نوێی کادیرەکانی کۆمەڵەو یەکێتی لە خەباتی شۆڕشگێڕیی گەلەکەمانداو پێشنیازەکەشی جێبەجێ نەکرێت ئەو ئەمە دەسەلمێنێت کە چەند لە زینداندا خۆڕاگرو قارەمان بووە.

## دوای دادگاش بانگکرامەوە

دوای گەڕانەوەمــان لە مەحکەمەو جێگیرکردنمان لە هۆڵی یەکی ئەمنی ســلێمانی. پاش چەنــد ڕۆژێك عەســرانێك کاتێکمزانی بانگکرامــەوە. بانگکردنەکەم لا ســەیربوو. چوومە دەرەوەی هۆڵەکە. کەلەبچەیان نەکردم و چاویشیان نەبەستمەوە، بردیانمە ژوورێك سەیر دەکەم (نەقیب ماجدو مفەوەز جەبار) دانیشــتوون، وتیان دانیشــە. ماجد وتی: چوویتە مەحکەمە؟ وتم: ئەی نەتان ناردین؟ وەکو بزانم مەحکەمە حەقی تاوانباریتانی دانیٚ؟ قســەم نەکرد. وتی: ئێمە چەند پرســیارێکت لێدەکەین. تۆ تازە تەواو حوکم دراوی و حەقی خیانەتی کردارەکانت وەرگرتووە. ئەی ئێستا پێمان نالێیت (تەها) کێیە؟ وتم: مەبەستتان لەم پرسیارە چییە؟ وتی: ئەم ناوە کێیەو چی تۆیە؟ وتم: ئامۆزامەو زاواشمە، ئیشی چییەو لە کوێیە؟ کاتی خۆی ئیشی بۆیاخی دەکرد لە ســلێمانی دادەنیشــت. ئەی ئێســتا لە کوێیە؟ چوار پێنج ســاڵ پێش ئێستا کۆچــی دوایی کرد، بەچی مرد؟ (یەکســەر گەڕامەوە بۆ ئەوکاتەی کــە (تەها) لە ڕووداوێکی ناخــۆش و چاوەڕوانەکراودا کاتێك (پێشــمەرگەی بزووتنەوەی ئیســلامیی) بوو، لە ناوچەی شــارباژێڕ لەلایەن چەند پێشمەرگەیەکی (ی.ن.ك)وە شەهیدکرا، ئەم ڕووداوەم لەکاتی خۆیدا بۆ (مامۆســتا (ش) گێڕابووەوە، باســی ئەو ڕووداوەم بەتەواویی بۆ کردبوو، وتم: لە ئەنجامی کاری بۆیاخکردن تووشــی نەخۆشــیی چاو بوو. لێرە چارەسەریان بۆنەکراو بردم بۆ بەغداو لە ئەنجامــدا کۆچی دوایی کرد. وتی: وا نییــە راســتمان پیٚ بڵێ، وەك جــاران درۆمان لەگەڵدا مەکە. وتم: ڕاستییەکەی هەر ئەوەیەو بەیانی شەهادەی وەفاتی لە ماڵەوەیە. وتی: پێت دەڵێم ئەوەی دەیلێیت ڕاســت نییە (تەها) کوژراوە... بۆ کوژراوەو کێ کوشتویەتی؟ خۆی چی بووەو سەر بە چ لایەنێك بووە؟ وتم: من ڕاستییتان پێدەڵێم سەر بەهیچ لایەك نەبووە. تەنها خەریکی کارو کاســبی بووە، نەشــکوژراوەو بە نەخۆشــیی خوا مردووە، ئەوەی ئەو درۆیانەی کردووە بێویژدانە، نەدەبوو ئێوە گوێی لێبگرن. وتیان: ئێمە دڵنیاین ڕاستە، بەڵام تۆ درۆمان لەگەڵدا دەکەیت، وەکو شــتەکانی دیکە ناتەوێت ڕاســتیمان پیٚ بڵێیت. بەکورتی ئەوان زۆریان وت و من کەمم بیســت، لەسەر قسەی خۆم سووربووم. ماجد ڕووی تێکردم و وتی: حەزدەکەم پێت بڵێم تۆ ئەگەر دەستت بە ئاسمانەوە بێت ئەگەر لە جەماعەتەکەتان دوو کەس ئیعدام بکرێت، تۆ یەکێکیان دەبیت. وتم: خوا کەریمە، ئەگەر موستەحەقی ئیعدام بم، با ئیعدام بکرێم. وتی: دەربەســت نیت؟ دەربەســتیش بم بەچی دەچێت. بۆ ئەوەی داخی خۆی بڕێژێت چەند جنێوێکی خۆی ئاســای دایــەوەو زللەیەکی پێداکێشــام، ڕەوانەی هۆڵەکەیان کردمــەوە. کە گەڕامەوە باســی بانگکردنەکەم بۆ (کاك حەمەڕەحیم)و چەند برادەرێکی دیکە کرد، وای بۆ دەچووم ئەو ناپیاوە بۆیە بەردەوام شــتی لەســەر من دەکردە ماڵ، حســابی بۆ ئەوە کردبوو کە ئەگەر من ئیعدام نەکرێم، لە زیندان دەربچم ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوەو گەیاندنی ئەو ڕووداوەشی لە بووخچەدا هەڵگرتبوو، چۆنم بۆ گێڕابووەوە ئاوها بۆی گێڕابوونەوەو پێی گەیاندبوون.

## مانگی (۹)و بردنەوەمان بۆ مەحکەمەی سەورە

دوای گەڕانەوەمــــان لە مەحکەمەی ســــەورەو هــــەر لە مانگی نۆداو لــــە بەیانیی رۆژی (۹/۲۱)دا هەرهەمووومانیان جارێکی دیکە بانگکردە دەرەوەو لە بۆشــــاییەکەی بەردەم ژووری زیندانییەکاندا بە ریز رایانوەســــتانین و دوو دوو کەلەبچەیان کردینەوە دەســــت و پاســــێکی گەورەیان هێناو هەرهەمووومانیان خستە ناوی و لە پێشەوەو دواوەو ناوەراستی پاس پۆلیس و ئەمن لەگەڵماندا ســــواربوون. پاســــەکە جامەکانی تاریکبــــوون، ئێمە دەرەوەمان دەبینی، بەڵام لە دەرەوە ئێمە نەدەبینراین. ئەم ئۆتۆمبێلە لەچاو ئەوەی پێشــــوودا وەکو لە ســــۆپەردا ســــواربوویێتین، وابوو. بە لای جامێکەوە بەرووی دەورەوەدا سوار بووم. یەکێك لە برادەرانم لاوە بوو نایەتەوە یادم کامیان بوو کە دەســــتمان دەدایە بەر خۆرەکە سەیرماندەکرد دەستمان سپی سپی بوو بوو. گەیاندیانینە بەغداو بردیانینە (ئەمنی بەغدا) ئەو شەوەمان لەو ئەمنە بەسەر برد. بەیانی ۹/۲۲ کەلەبچەیان کردینەوەو سورایانکردین و بردیانین بەرەو (مەحکەمەی سەورە). بەلامانەوە خۆشبوو، کە بەناو بەغدادا دەڕۆیشتین و شەقام و شوێنەکانمان دەبینی، بەو ئۆتۆمبێلەو بەو شــــێوەیە گەشــــتێکمان بەناو شــــەقامەکانی بەغدادا کرد تا گەیشتینە تەلاری مەحکەمە. وەکو جاری یەکەم ئۆتۆمبێلەکە لەبەردەم مەحکەمەدا راوەســــتاو ریزیان کردین، بردیانینەوە (ژێر زەمینە حەیاتەکە)ی جاری پێشوو.

تــــا نیوەرۆ بەبێ ئەوەی پرســــیارێکمان لێ بکەن، یان بۆ نــــاو ژووری مەحکەمە بانگمان بکەن، لەو شــــوێنەماینەوە. لە نیوەرۆدا بەهەمان شێوە سواری ئۆتۆمبێلەکەیان کردینەوەو بەرەو ســــلێمانی گەڕاینەوە، ئێوارە گەیشــــتینەوە ئەمنی سلێمانی و بردیانینەوە هۆڵی یەك. وەکــــو بۆمان دەرکەوت بردنی ئەمجارەمان بــــۆ مەحکەمە تەنها بۆ ئەوەبوو. مەحکەمە ئەو کەسانەی بەسەرمانەوە شاهید بوون بانگیان کردبوون و ئیفادەیان لەسەر ئێمە لێوەرگرتبوون شاهیدییەکەیان لە مەحکەمە لەبەردەمی حاکمدا تازە کردبووەوە لەدوای ئەم سەفەرەمانەوە. رۆژ لــــەدوای رۆژ لە رووی خواردن و کەمییــــەوە ژیانمان خراپتر دەبوو... کەمیی خواردن و مامەڵەی ئەمن کاری راستەوخۆی کردە سەر ژیانمان و هەموومانی شپرزەکردبوو.

### مانگرتنمان بۆزیادکردنی خواردن

بۆئەوەی خواردنمان بۆ زیاد بکەن. لەناو خۆماندا مشتومڕمان کردو بڕیارمان دا کە مان بگرین و ئەو خواردنەی بۆمان دێنن، وەرینەگرین و نەیخۆین. بڕیارەکەمان جێبەجێکرد. (شێخ محەمەدی موراقیب) بەم مانگرتنە زۆر قارس بوو. لە دەرگای داو بانگی ئەمنەکانی کرد، مانگرتنی پێڕاگەیاندن، پۆلیسەکان چوون دائیرەیان ئاگادارکرد. شەو (نەقیب ماجدو مولازم ئەحمەد)و ژمارەیەك پۆلیس و ئەمنیان لەگەڵدابوو. دەرگایان کردەوەو لەسەر قادرمەکانەوە.

تیـانخوریـن چیتان دەوێت، بۆ مانتان گرتووە؟ (کاك جەبار) چووە پێشـەوەو بەناوی ئێمەوە پێی وتن: خواردنەکەمان زۆرکەمەو رۆژانـەش کەمتردەکرێتەوەو ئیدارەی پێناکەین، ئەگەر بۆمـان زیاد نەکەن و وا نەکەن کە بە باشـی بەشـمان بکات، ئەوا مانگرتن ناشـکێنین تا هەموومان لەم شـوێنەدا دەمرین... (مولازم ئەحمەد) کەوتە قسەو وتی: خەڵکی بەشەرەف و هاوڵاتییان لەدەرەوەو لەناو شارەکان نان نییە بیخۆن، نیوەی تاوانبار دژ بەخاك و میللەت خواردنیشـتان دەدەینێ و نایەڵین رۆژانە بێ خواردن بن، هێشـتا نارازین و ماندەگرن...؟ مان بگرن خوای دەکرد هەر هەمووتان لەبرسـانا دەتۆپین، خواردن هەر ئەوەیە زیاد ناکرێت و لەگەڵ کۆمەڵێك جنێوی خەسـت و خۆڵدا شـەقێکیان لەخۆیان هەڵداو رۆیشتن و چوونە دەرەوە، بە (شێخ محەمەد)یان وت: هەرکەس زیادەرۆیی کرد ئاگادارمان بکەرەوە. بزانەچییان لێدەکەین. کە رۆیشـتن هەر هەموو کەوتینە سەرو گوێلاکی شێخ محەمەدو ئەوەی نەشێت پێـی کراو بەنیازبوو ئەمنەکان بانگ بکات، هەرەشـەیان لێکرد یـەك ئەمن بانگ بکات دەیکوژن، بەڵام کە چوونە دەرەوە بەهەرەشەو قـەکەی خۆیان نەکردو دیاربوو ناچاربوو بوون کـە خواردنیان نارد، خواردنەکە بەزیدەوە بنێرنـەوە، وایان ناردەوە هەرهەموومان تێربووین و ژەمەکانی رۆژانی دوایشـیان زیادکرد، ئەو مانگرتنەمان لە دوو لاوە رۆڵی گرنگی بینی. ١- خواردنەکەمـان گۆرا. ٢- ســەلماندمان کە رازی نابین بـە ناجوامێرانە لەناو ئەمندا بە سیاسەتی برسیکردن بمانکوژن.

# بانگکردنمان بۆ نامەنووسین

دوای گەڕانەوەمان لە مەحکەمە ڕۆژێك بەیانییەکەی (کاك جەبار) بانگکرا. کە ڕۆیشت زۆری پێچوو. کاتێك هاتەوە بە (مامۆستا ئەحمەدی سەناعەی) وت: تۆش خۆت ئامادە بکە بانگکت دەکەن. لێی کۆبووینەوە لێمان پرسی بانگکردنەکە بۆچی بوو؟ وتی: داوایان لێکردم نامەیەك بۆ (کاك نەوشیروان مستەفا) بنووسم و لە نامەکەدا قسەی پێ بلێم، پرسیمان نووسیت؟ وتی: بەڵێ، نووسیم زۆری پێنەچوو، مامۆستا ئەحمەدیش بانگکرا... ماوەیەکی پێچوو، کە هاتەوە، دەرکەوت بۆ هەمان مەبەست بوو. لێمان پرسی تۆش نووسیت؟ وتی: نەخێر، نەمنووسی، پێشم باش نییە کەس بینووسێت. بەدوایدا (مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن) بانگکرا، ئەویش گەڕایەوە کە لێمان پرسی وتی: نەخێر، نەمنووسی. بەڕاستیی ئێستا نایەتەوە یادم ئەوانەی بانگکران کێ بوون؟ ئەوەندە دەزانم (٥ تا ٦) کەسانیان بۆ ئەو مەبەستە بانگ کرد، کە منیان بانگ کرد، کاغەزو قەڵەمیان خستە بەردەستم و داوایان لێکردم کە نامەیەك بۆ (کاك نەوشیروان مستەفا) بنووسم. دەستم بۆ قەڵەمەکە نەبرد. وتم: (نەوشیروان) ناناسم و نازانم کێیە؟ وتیان: چۆن نایناسیت؟ ئەو قائیدی ئێوەو عەمیلی ئێران نییە؟ وتم: نازانم کێیە. ماجد وتی: برادەرەکانت نووسیویانە تۆ بۆچی نایینووسیت؟ وتم: هەرکەس لەخۆی بەرپرسیارە، دوور نییە ئەوان بیناسن، بەڵام من نایناسم. وتی: ئەگەر ئەم نامەیە بنووسیت هەرچیت لەسەر بێت، دەسڕێتەوەو ڕزگار دەبیت. نەشی نووسی بەخراپ لەسەرت دەکەویت و ئۆبالی خۆت بەملی خۆت. ئێمە بۆیە تۆمان بانگ کردووە تا یارمەتیت بدەین. وتم: خراپ، یان چاك لەسەرم بکەویت، من نامەی وا نانووسم، کەسێك نەناسم نامەی چی بۆ بنووسم؟ ئەوان چەند پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە من ئەو نامەیە بنووسم، منیش زیاترو زیاتر پێم داگرت کە نەینووسم، ئەنجام نامەکەم نەنووسی. ماجد جارێکی دیکە وەکو دوا تفی خۆی بکات، یەك ڕیز جنێوی پێدام و زللەیەك و پاڵێکی پێوەنام و ڕەوانەی کردمەوە. کە گەڕامەوە، منیش بە هاوڕێیانم ڕاگەیاند کە ئەو نامەیەم نەنووسیوە و پێشم باش نییە کەس بینووسێت. بەدوای مندا (مامۆستا فەرەیدوون دارتاش) بانگ کراو ماوەیەکی پێچوو، کە گەڕایەوە وەکو بزانم نەینووسیبوو.

لەسەر مەسەلەی ئەو نامەنووسین و نەنووسینە. لەنێوانی برادەراندا مرناقەشەیەکی گەرم کرا، من ڕام وابوو نووسینی ئەو نامەیە بەڵگەیەکی خەتییە بۆ سەلماندنی قسەکانیان و دەتوانن بینێرنە مەحکەمەو لەسەر ئەو نامەیە هەرچییان بوێت لێمان بکەن، حوکممان بەسەردا بدەن. ئەوانەی نامەکانیان نووسیبوو، هەریەك بەجۆرێك باسی نووسینی نامەکەی خۆی دەکرد، نووسینیان بەلاوە باشبوو، منیش و زۆری تر لە برادەران بەلامانەوە کارێکی زۆر خراپ بوو. کە نەدەبوو هیچ کەسێکمان بینووسێت.

## مانگی (١٠)و بردنەوەمان بۆ مەحکەمەی سەورە

دوای جەلسەی یەکەمی مەحکەمەو گەڕانەوەمان بۆ ئەمنی سلێمانی لە ١١/٩/ ١٩٩٠-و یەکخستنمان لە هۆڵی یەکی ناو ئەمن و جێگیرکردنمان لەو هۆڵەداو بردنەوەمان بۆ مەحکەمە بۆ جاری دووەم لە ٢١/٩-و گەڕانەوەمان و مانەوەمان لە هۆڵی یەکی ئەمنەسوورەکە، دوای (٣٢) ڕۆژ بۆ جاری سێیەم لە ئەمنە سوورەکەوە براینەوە بۆ مەحکەمەی سەورە.

بەیانی ڕۆژی ١٣/١٠ دەرگای هۆڵی یەك کرایەوە، بەناوی (جەماعەتی جەبار) بانگ کراینەوە، کە خۆمان کۆبکەینەوەو ئامادە بین بەڕیزو یەك بەدوای یەکدا ناوەکانیان خوێندینەوە، هەرکەسە ناوی دەخوێندرایەوە بە بەتانی و کەلوپەلی خۆیەوە دەچووە دەرەوە، هەرکەس دەچووە دەرەوە لەبەردەم هۆڵی یەکدا پانتاییەك هەبوو، لەو پانتاییەدا ڕیزیان کردینەوە، تا هەر (٣٠) کەسەکەمان لە هۆڵی یەك هێنرانە دەرەوە. دوو ئۆتۆمبێل ئامادەکرابوو، یەکێك بچووك وابزانم لانکرۆزەرێکی کورت بوو، ئەوی دیکەیان پاسێکی جام تاریك بوو، هاوڕێیان (جەبار، ئەحمەدی سەناعە، حەمەڕەحیم، عەتاو وەستا بەکری دارتاش)یان لە ئۆتۆمبێلە بچووکەکەدا سوارکرد، ئێمەشیان سواری پاسێك کرد، بەردەرگاو لە دواوەی چەند پۆلیس و پاسەوان و ئەمن لەگەڵماندا سواربوون، دوو دوو کەلەبچە کراینەوە، لە ئەمنە سوورەکە دەرچووین بەرەو کەرکوك و بەغدا کەوتینە ڕێ تا گەیەنراینە ناوشاری بەغداو بردیانین بۆ (ئەمنی عامە)، لەبەردەم ئەمنی عامەدا دایانبەزاندین و کەلەبەچەکانیان داکەندین و بەڕیزو بەدوای یەکدا بە قادرمەکاندا بۆ نهۆمی دووی زیندان سەریانخستین. لەبەر دەرگاو سەرقادرمەکان چەند ئەمن ڕاوەستابوون، هەر هەموو ڕووگرژو دەموچاو ترشی و ڕقاویی بوون. لە یەکەم ئەمن سەلامم کرد، لەجیاتی وەڵامدانەوە جنێوێکی ئەمنانەی پێدام، هەرهەموو چووینە ئەو نهۆمەی کە بۆیان تەرخانکردبووین.

## -٣-

# ئێمەو ئەمنی عامە

کــە چووینە ژوورەوە. زیندانییەکانی نهۆمەکە کە بینیان گرووپێکی گەورەی (٣٠) ســی کەســی بوون بە میوانیان، لەبەر زۆرییەکەمان و ســەرو ســیمای تەمەنی زۆرمان سەرسام بوون، هەر هەموو لە شــوێنی خۆیەوە پێشــوازیی لێدەکردین... بەهۆی ئەو سیستمەی لە ئەمنەکاندا پیادەکرابوو. موراقیبــی هۆڵەکە هەر زۆر زوو بەپێرمانەوە هات و دوای هەندێك حەوانەوە دەستیکرد بە دابەشکردنمان بەسەر ژوورەکاندا دوو دوو و سێ سێ دابەشی کردین. رۆژانی ١٣-١٤-١٥/١٠ تا بەیانی رۆژی ١٦/١٠ لەو شوێنە ماینەوە.

### هۆڵی ئەمنی عامە چۆن بوو؟

ئــەم هۆڵــە هۆڵێکــی درێژی پان و گــەورە بوو. لەمبــەرو ئەوبەرییەوە ئاســن یان بە ئەلەمنیۆم بوو، ژوور بەریز دروستکرابوو، ژوورەکان سەقفیان بۆ نەکرابوو. واتە، ئەو ئاسنە یان ئەو ئەلەمنیۆمە نەگەیشــتبوونە ســەقفی هۆڵەکە. هەر ژوورە جێگای (٤ بۆ ٥) کەسی تێدا دەبووەوە. لەنێوانی ژوورەکاندا رارەوێکی درێژو پانی (٢-٣)مەتر لەمســەر تا ئەوسەری هەبوو. پێش ژوورەکان و بە تەنیشتی دەرگای هاتنە ژوورەوەداو بەرامبەری هۆڵی ژوورەکان، ریزێك ئاودەست و حەمام بوو. بە بەردەوامی ئاوی گەرم هەبوو. زیندانییەکانی ناو هۆڵەکە هەمەجۆر بوون (عەرەب، کورد، تورکمان)ی تێدابوو، تەنانەت زیندانییەکی شێتیشی لێبوو. ئێمە لە ئێوارەوە نانمان نەخواردبوو. زۆرمان برســی بوو، زۆر ماندوو و هیلاك بووین، هۆڵ و ژوورەکان پاکوخاوێن بوون. کە ســەیرمان دەکرد لەچاو ئەمنی ســلێمانی و ئەمنی کەرخ و بەغــدادا ئێجگار جیاوازبوو. هەر دابەش بووین و حەواینــەوە، زیندانییەکان هەریەکەیان لای خۆیــان و ژوورەکانیانەوە، میوەو خــواردن و خورمایان بۆ هێنناین، بۆ ئێوارەش، برنج و شلەیان هێنا، برنج و شلەکە وەکو ئەمنەکانی دیکە نەبوو، یەکەم زۆرو دووەم باش لێنرابوو. بەراستیی تاموچێژێکی خۆشی هەبوو، دیارە زیاتر لەبەر ئەوەبوو، دەمێك بوو خواردنی وامان نەخواردبوو. ئاهێکمان پێداهاتەوە. موراقیب پێی راگەیاندین، ئەمشــەو حەمام تەرخانە بۆ

ئێوه، هەرهەموو خۆتان بشــۆن، زیندانییەکان فانیلەو کراس و شــتیان بۆهێناین، بۆئەوەی کە خۆمان شــۆرد لەبەری بکەین. ئەو شــەوە هەرهەموو خۆمان شۆردو حەواینەوە. دەمێك بوو خواردن و میوەی وامان بەو شــێوەیە نەخواردبوو، شــێتەکە زوو زوو دەچوو بۆ سەر ئاو، پیاوێکی کەتەو زل بوو (مامۆســتا جەمال عەزیز) لەکاتی سەرئاودا دەچوو بۆ لای و بانگی دەکردین بۆئەوەی ئێمەش بچین بۆ سەیری.

# بینینی سەید محەمەدی گەرمیان

(سەید محەمەد) فەرماندەیەکی پارتیزان و پێشمەرگەیەکی لێهاتوو بوو. لەدوای ئەنفال ناوچەی گەرمیانی چۆڵ نەکردبوو لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی دیکەدا مابوونەوە. تا گەڕانەوەی مەفرەزە پارتیزانەکان، بەرپرسی دەستەی پێشمەرگەی پارتیزان بوو. لە سنووری کفری و کەلاردا... بەپیلانێکی دوژمنانەی نامەردانە خرابووە ناو کەمینەوەو دەستگیرکرابوو. ئەوکاتەی دەستگیرکرا (کاک حەمەنووری و کاک حەمەرەشید) باسیان بۆ کردم و زۆر زۆریان خەم بوو. سەرسامییان دەردەبڕی کە چۆن ئەو فەرماندە ئازاو زیرەکە، رازی بووە بەوەی کە بە قسەی ئەو خۆفرۆش و جاسووسە هەڵخەڵەتاوەو ریگای بەخۆی داوە کە بیبینێت و بەگوێی بکات و بیخاتە داوەوە؟ کە بەو نامەردیی و ناجوامێرییە بەبێ هۆشیی تەسلیمی دەزگای ئەمنی بکات؟ لەراستیدا بەتەمای نەمابوون. هەولیان دەدا بەهەر ریگایەك بێت تاقیبی بکەن و بە هەرنرخێك بووە هەولی بۆ بدەن. لەهیچ لایەکەوە سەرو سوراخی نەبوو. لە گرتنەکەیەوە بێسەرو شوێن کرابوو. من لە نزیکەوە (سەید محەمەد)م نەدەناسی. کاك حەمەرەشیدو کاك حەمەنووری ئەوەندەیان باسی قارەمانێتی و ئازایەتییان بۆ کردبووم، وەکو یەکتر بناسین وابوو. کاتێکیش گیرا ئەوەندە بۆی بەداخبوون منیش لەگەڵیاندا خەمم دەخوارد.

کە چووینە هۆڵەکەو دابەشبووین، یەکەم کورد هات بۆلام (کەمال دۆڵپەمووییی) بوو. لەگەڵ کەمالدا لە ساڵی (٧٤)ەوەو لە شۆڕشی ئەیلولدا یەکمان دەناسی. ئەوکاتە من لە ناوچەی قەرەداغ بووم، ئەویش لە هێزی خەبات پێشمەرگە بوو. دیارە یەکسەر یەکمان نەناسییەوە. لەبەر ئەوەی هەردووکمان رەنگ هەڵپەڕیوی ئەمن بووین. کە هات بۆلام و خۆی پێناساندم و منیش خۆم پێناساند هەردووکمان باوەشمان بە یەکدا کرد. تێگەیشتم ئەو لەگەڵ برادەرێکی دیکەیدا کە ناوی (فەتاحەسوور) بوو لەسەر ئیسلامیی دەستگیرکراون، بەو تۆمەتە تاوانبارن و چاوەڕوانی مەحکەمەی سەوردیان دەکرد. دوای ئەوەی کە زانی من لەسەر (یەکێتی) گیراوم. وتی: پێشمەرگەیەکی یەکێتی لێرەیە. لە دەستەکانی پێشمەرگەی گەرمیانە، بە پیلانێك گیراوەو ئێستا حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا دراوە. وتم ناوی چییە؟ وتی: ناوی (سەید محەمەد)ە، کە ناویم بیست زۆرم پێخۆشبوو کە لێرەیەو هێشتا ماوەو یەکسەر چووم بۆلای، خۆم پێناساند کە من بەهۆی کاك حەمەرەشیدو کاك حەمەنوورییەوە تۆ دەناسم و ئاگاداری گرتنەکەشتم. سەید محەمەدی چی؟ پیاوێکی باڵابەرزی سمێڵ گەورەو بەهەیبەت دەست و پەنجەکانی گەورەو تووکی قژ: سەری رەش و پڕو جوان. کە ناوی ئەو دوو برادەرەم هێنا یەکسەر باوەشی پێداکردم، وتی: تۆ ناوت چییەو چۆن ئەو هاوڕێیانەم دەناسیت؟ وتم: (شێخ محەمەد)م و بەهۆی ئەم رێبازەوە نزیکی یەکترو زۆر هاوڕێی یەکین. وتی: هاتەوە یادم زۆرجار باسی تۆیان دەکردو ناویان دەهێنایت. لەو یەکتر بینینەوە زۆر

لەیەك نزیكبووینەوە، بەدووڕو درێژیی باســـی پیلانی گرتنەكەی بۆ كردم، كە چۆن بە درۆو ســـوێندخواردنی ئەو جاسووســـە كە پێیان دەوت (حەمەی عیســـا) كەوتووەتە داوەكەوەو بە بێهۆشـــی گەیاندوویانەتە دەزگای ئەمن. وتی: ئەی ئێوە كێن و بۆ بەم زۆرییە گیراون؟ باسی رێكخراوی سلێمانی و برادەرانم بۆكرد كە ناوی (هاوڕێ جەبار)م هێنا سلەمییەوەو وتی: ئەو پیاوەش گیراوە؟ وتی: من كە بەبێ هۆشـــیی گرتیانم و كاتێك هۆشم هاتەوە لە ژوورێكی بێ پەنجەرەدا بووم. ئەوكاتە تێگەیشتم كە ئەو میواندارییەی ئەو خائینە بۆ قەستی سەرم بووەو پیلانەكەشـــی ســـەركەوتووبوو. وتی: من ئەوە چەند مانگە هەرچی مرۆڤ پێی ناخۆشبێت لەگەڵیاندا كردووم و لە (مەحكەمەی ســـەورە) بە حوكمی ئیعـــدام حوكمدراوم، چاوەڕوانی ئیعـــدام دەكەم. ئەوەندە بێباك بوو، كە قســـەی دەكردو هەڵســـوكەوتی لەگەڵماندا دەكرد، وات دەزانی چاوەڕوانی بەربوون دەكات. بیری لە مردن و ســـێدارەو ژن و منداڵ و كەسوكار نەدەكـــردەوە. تەنها بیری لەوە دەكـــردەوەو دەیوت تۆ بڵێیت رۆژێك بێـــت بتوانرێت خائین و ناپاكانـــی گەلەكەمان لەلایەن شـــۆڕش و میللەتەوە دادگایی بكرێن و بە ســـزای خیانەتیان بگەن؟ ســـیماو قســـەو هەڵســـوكەوتی زۆر لە (كاك حەمەڕەحیم حەســـەن) دەچوو، تەنانەت قســـەكردن و بێباكیشـــی لە زۆر رووەوە چووبووەوە ســـەر ئەو و لەزۆر خەسڵەتیاندا لەیەك دەچوون. وتم: بەڕاســـتیی بە بینینت و ناسینت لە نزیكەوە ئێجگار دڵخۆش بووم، بەڵام بەو هەواڵەی كە حوكمی ئیعدام دراویت، زۆر نیگەرانم، ئەو رۆژانە وەكو بزانم زۆربەی هاوڕێیان، لێی نزیكبوونەوەو لەگەڵیدا قســـەیان كرد، بەتایبەتی (هاوڕێ جەبار) كە بەیەكەوە قســـەی زۆریان كردو چیرۆكی كەوتنە داوی بە دووڕو درێژیی بۆ ئەویش باســـكردبوو، كاك جەباریش هەموو هەوڵەكانی خۆیانی بۆ سۆراخی ئەو بۆ باسكردبوو. لەماوەی ئەو دوو سێ رۆژەدا زۆر نهێنی و شـــتی شاراوەی بۆ باســـكردم. ئەویش بەگرتنی ئێمە ئێجگار دڵگران بوو، دەیوت: رێكخســـتنی نهێنی ناو شـــارەكانمان ئەنفالكراوە، ئەو یەك دوو رۆژو شـــەوە بە بەردەوامی و زۆرجار لە راڕەوەكەدا، بەیەكەوە پیاســـەمان دەكرد، زۆر باســـی ژیانی پێشـــمەرگایەتی بۆ كردم.

## (١٩٩٠/١٠/١٦)و حوكمدانمان

بەیانـــی رۆژی ١٩٩٠/١٠/١٦، یەکەیەکە ناویـــان خوێندینەوەو لەبەر دەرگای نهۆمی یەك، دوو دوو کەلەبچەیان دەکردینەوە دەســـت و سواری ئۆتۆمبێلەکانیـان کردین و بەناو بەغدادا بەرەو مەحکەمەی سەورە رفاندیانین، لەبەردەمی مەحکەمە دایانبەزاندین و کەلەبچەکانیان لەدەست کردینەوە بردیانینە ژێرزەمینە بۆگەنەکە. بەناو هۆڵی ژێرزەمینەکەو سەر کورسییە دارەکانیـــدا دوو دوو و ســـێ ســـێ بڵاوەمان لێکـــرد، لەگەڵ یەکدا لە چارەنووســـی خۆمان دەکۆڵییەوە، زیاتر لە ســـێ بۆ چوار ســـەعات بەبێ لێپرســـینەوە لەو ژێر زەمینەدا ماینەوە دەوروبەری کاتژمێر دووی نیوەڕۆ ئەفســـەرەکەی هۆڵی دادگا دەرگای رووی ژێر زەمینەکەی کردەوە.

یەکـــەم وەجبەی نـــاوی خوێندینەوە، کە ئـــەم هاوڕێیانە بوون: (جەباری حاجی رەشـــید، مامۆســـتا ئەحمەدی ســـەناعە، حەمەڕەحیم حەسەن، وەســـتا بەکری دارتاش، عەتای حاجی ئەحمـــەد)...، بەریـــزو یەك بـــەدوای یەکدا ســـەرکەوتن و لەو دەرگایەی کـــە چوونە هۆڵی مەحکەمەوە، نەگەڕانەوە، بە دوایاندا ئەفســـەرەکە ناوی ئێمەشی بەریزو یەك بەدوای یەکدا خوێندەوە، یەکەیەکەو بەدوای یەکدا ســـەرکەوتین و چووینە هۆڵی دادگا، کە هەر هەموومان ریزکراین لە قەفەزەکەی مەحکەمەدا، بێ پرسیارو لێپرسینەوەو زۆر بەپەلە بڕیاری حوکمیان بـــۆ خوێندینـــەوە، کە چووینـــە ژوورەوە هەر هەموومـــان یەکەیەکە چاومان بـــۆ ئەو پێنج هاوڕێیەمان دەگێڕا، سەیرمان کرد لە هۆڵی مەحکەمە نەمابوون، دیاربوو بڕیاری حوکمیان بۆ خوێندرابووەوەو لە دەرگایەکی دیکەوە کرابوونە دەرەوە، ئێمەش وەکو وتم: بەبێ پرسیارو لێپرسینەوەو زۆر بەپەلە بڕیاری مەحکەمەیان بۆ خوێندینەوە، کە من و سیانزە هاوڕێمان بە حوکمی مونەبەدو بە موسادەرەکردنی ئەموالی مەنقوولەو غەیرە مەنقوولەو (٩) هاوڕێشمان بە حوکمی دە ســـاڵ و موسادەرەکردنی ئەموالی مەنقوولەو غەیرە مەنقوولەو ئیفراجکردنی دوو هاوڕێمان، کە (مامۆستا جەمال عەزیزو کامەرانی مەلا عەزیز) بوون، خوێندەوە.

لەگـــەڵ تەواوبوونی خوێندنەوەی بڕیارەکە، یەکســـەر بانگی چوونـــە دەرەوەو چۆڵکردنی مەحکەمەیـــان لێکردیـــن، بەهەمان دەرگاو قادرمـــەی لێوەی ســـەرکەوتین، چووینەوە ژێر زەمینەکـــە، دوای ماوەیەك هەر لەو شـــوێنە کەوتنە بانگکردنمـــان و لە هەریەکێکمان ئەو زانیارییانەی دەیانویســـت لێیان وەرگرتـــین، ئیمزاو پەنجەمۆریان پـــێ دەکردین. ئەو پێنج هاوڕێیەمـــان نەهێرانە ژێرزەمینەکەوە لەگەڵ ئێمە بـــۆ وەرگرتنی زانیاریی و ئیمزاو پەنجە مۆر، ئەم کاری وەرگرتنی زانیاریی و ئیمزاو پەنجەمۆرە نزیکەی سێ سەعاتی خایاند.

ئێمە لەداخی ئەو پێنج هاوڕێیەمان، کە لە ئێمە جیاکرانەوەو حوکمی نارەوایان بەســـەردا دان، هەرهەمـــوو دڵتەنگ و خەمبار دەجووڵاین، حوکمی خۆمان بیر چووبووەوە، بەگشـــتیی وەکو خۆڵ و دۆ بەســـەرماندا کرابێت وابوو. بەو خەم و خەفەتەوە بەریز بردیانینەوە دەرەوە.

که سەرنجمان دا هەر پێنج هاورێکەمان لە هەمان ئۆتۆمبێلە بچووکەکەی کە پێی هاتبوون سوارکراون. ئێمەشیان سواری پاسەکە کردەوەو (مامۆستا جەمال و کامەران) خواحافیزیان لەو پێنج هاورێیەو ئێمە کرد، بە قوولپی گریانەوە بەجێیان هێشتین و ئازادکران. ئێمەش رفاندیانین بۆ(بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکامە قورسەکان) ئێمە چاوەروانی ئەوە بووین بمانبەن بۆ (ئەحکام خاصە)، کە تایبەت بوو بە زیندانییە سیاسییەکان. بەلام بۆئەوەی سزایەکی دیکەمان بدەن، بریاری ئەوەش درابوو کە نەنێردرێینە ئەحکام خاسە، بەلکو وەکو عقوبەیەکی دیکە نێردراینە (ئەحکام سەقیلە)، کە جێگای دزو پیاوکوژو بەدرەوشت و تاوانباری جۆراوجۆری کۆمەلایەتی بوون، بەدەر بوون لە بیروباوەری سیاسیی. لەراستیدا بۆ ئێمە ئێجگار قورس و ناهەموارو ناجۆر بوو.

کە گەیشتینە ئەبوغرێب هەر هەموومانیان دابەزاندو ئەو پێنج برادەرەشیان دابەزاند بە کەلەبچەکراویی، کە چووینە ناو بەندیخانەکەوە. ئەو پێنج هاورێیەیان لە ئێمە جیاکردەوە خستیاننە ژوورێکەوەو ئێمە بەریزو یەك بەدوای یەکدا دایە پێش. لەو کاتەی کە بەریز و بە بەردەمی ژووری پێنجی هاورێکەماندا دەرۆیشتین یەکەیەکە سلاوەکان لێدەکردن و بە قوولپی گریانەوە دواخواحافیزیمان لێدەکردن و بەدوای ئێمەدا (مامۆستا ئەحمەد سالح) هەلی بۆ رێککەوتبوو رێگایان دابوو چووبووە ژوورەکەیان و لەگەل یەکە یەکەیاندا قسەی کردبوو و وەسیەتی هەریەکەیانی بەدەمیی وەرگرتبوو. لە مێشکیدا تۆماری کردبوون.

## دەبێت پەرۆشیی و هەوڵی دڵسۆزان لەبیر نەکرێت

کە دەستگیرکرام، بیرم لەوە دەکردەوە، دەبێت کێ پەرۆشی خۆم و منداڵەکانم بێت؟ کێ بەدەنگیانەوە بچێت و لایان لێبکاتەوە؟ دەبێت کێ بۆ ئازادبوونم ناچاربێت لە دەرگای دەستڕۆیشتووانی حکومەت بدات؟ دەبێت کێ داخم بۆ بخوات و بەگرتنەکەم شپرزەو نیگەران بێت؟ دەبێت کێش پێی خۆشبێت و دەست بەسەر دڵیدا بێنێت، کە کەوتوومەتە داوەکەوەو لەپێش چاویان نەمارم؟

باسی ئەوانە ناکەم، کە بەدڵ پێیان خۆشبوو گیراوم، بەڵام بەجێی خۆی دەزانم، لەم هۆڵەی ئەمنی سلێمانییەوە، باسی ئەو هاوڕێ و کەس و خزم و دڵسۆزانە بکەم کە لە ئەنجامی هەوڵی دڵسۆزانەیان گۆڕانێکی گەورە بەسەر باری دەروونیمدا هات و باروودۆخی ژیانمی لەناو ئەمنی سلێمانیدا گۆڕی.

هاوڕێ و خزم و کەسە دڵسۆزەکانم وەکو بزانم ئەمانەبوون:

١. كاك حەمەرەشیدی حاجی شەریفی باریکەیی، شارەزووریی.

٢. كاك حەمەنووری حاجی ئەحمەدی سەوزبڵاخی، گەرمیانی

٣. كاك سەرحەدی خەلیفە یونسی دسکەرەیی.

٤. كاك ئیبراهیمی عەلی رەزای خانەقینی.

٥. كاك داود سلێمان کەمال (مەلا داودی) خانەقینی.

٦. كاك حاجی شێخ ئیبراهیمی شێخ محەمەدی قادر کەرەمی بەرزنجی

٧- كاك حاجی شێخ عوسمانی شێخ عەبدلکەریمی سۆڵەیی برام.

٨- محێدینی شێخ عەبدولکەریمی سۆڵەیی برام.

٩- مامۆستا سامانی شێخ سالحی خزم و خۆشەویستم.

١٠- كاك هیوای شێخ مستەفای کۆیك.

١١- مامۆستا سەلامی مەلا غەفووری بارویی. مەنسی.

١٢- خاتوو نیگاری حاجی ئیبراهیمی قادرکەرەم.

١٣- كاك عوسمانی حەمەئەمین عەربەتی (عوسمان سەر سپی نانەوا).

١٤- كاك لەتیفی شێخ عەبدولکەریمی برام.

١٥- خاتوو ئەمیرەی خێزانی کاك داود.

ئەو بەرێزانەی سەرەوە لەپێش گرتنمدا هەیانە خزم و هەشیانە هاوڕێی ئاسایی رۆژانی ژیانم و هەشیانە هاوڕێی هەڵگری یەك بیرو باوەڕبووین.

ئەو خاوەن ڕێزانە لەگەڵ دەستگیرکردنی مندا هەریەکەیان بەشێوەیەك لە شێوەکان هەوڵیان بۆ ئازادبوون و سووککردنی باری گرانی من لە ڕێگای خۆیانەوە دابوو، کە ناکرێت و نابێت باسیان نەکەم و ئەو هەوڵانەیان لەپێش چاو نەگیرێت و پێی نەزانم.

-(کاك حەمەرەشـــیدو کاك حەمەنـــووری[1]، بەنـــدە) ســـێ هاورێی گیانـــی بەگیانی یەك بوویـــن. زۆربەی کاتە خۆش و ناخۆشـــەکانمان بەیەکەوە بەســـەر دەبـــرد. رازو نیازمان لای یەکتر دەدرکاند. بێ پەردەو بێ شـــاردنەوە لەسەر رووداو و پێشهاتە هەنووکەیی، ئایندەکان، گۆرانکارییە سیاسیی، کۆمەلایەتی، پێشمەرگایەتی، رووناکبیریی، ئەدەبیی و مێژوویـیەکان قســـەمان دەکرد. زۆری شـــەوانی هەینی لە مالی یەکێکمان کۆ دەبووینەوە، زۆر سەیران و ســـەردانمان بەیەکەوە دەکرد، ســـەردانی دێکان و برادەرانی پێشمەرگەمان دەکرد. سەرنج و بۆچوونمان لەگەل یەکدا ئالوگۆر دەکرد. گەلێك شەو جگە لە خۆمان لەگەل چەند برادەری دیکەدا شەوانمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد، زۆرجار لەگەل کاك سەرحەددا دەبووینە چوارقۆلیی و سەیرانمان لەگەل (ئەحمەد کولکنی)دا دەکرد، دانیشتنمان لەگەل (عوسمان حەمە ئەمینی عەربەتی)دا دەکرد. ســـەیر لەوەدابوو هەرســـێکمان لە ســـنووری یەك (رێکخراوی حزبیی)، کە (رێکخراوی پێرەمەگروونی کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردســـتانی «ی.ن.ك») بوو. لە یەك رێبازی سیاســـیی کۆببووبووینەوەو خەباتمان دەکرد، هەریەکەشـــمان بەپێی کارو خەباتی ئەو رۆژگارە ئەرك و کارو بەرپرســـیارێتیمان لەئەســـتۆدا بوو. کە سیشمان رۆژێك لە رۆژان لە ئەرك و کاری یەکترمان نەدەپرســـی. تەنانەت ئەو رۆژەی کە بۆ ئێوارەکەی دەســـتگیرکرام، (کاك حەمەرەشـــیدو کاك حەمەنووری) لە بـــازاری نەقیب هاتن بۆلام و پێیان راگەیاندم کە بۆ بەیانی شـــەوەکەی دەچین بۆ عەربەت میوانی (عوســـمان سەرســـپی) دەبین. ئێمە ئەوەندە لەرووی خێزانییەوە تێکەلاوی یەکتربووین، خێزانەکانەمان (ســـەبری، عەینە، زەینەب)و کچ وکوری هەرســـێکمان وەکو ئێمە خۆشەویســـتی لەنێوانیاندا پەیدابووبـــوو. رێزی یەکتریان لابوو. کە دەچووینە مالی یەکتر سەربەســـت و ئازادانە لەناو مالەکانماندا هەلســـوکەوتمان دەکرد. ئەم دوو هاوڕێ دلســـۆزە بە گرتنی من زۆر نارەحەت و شـــپرزە بووبوون، لەپێناوی فریاکەوتنم سەریان بەکۆشی چەندین کەسدا کردبوو، بە بەردەوامیش دەستیان بە مندالەکانم و کێشەکانیانەوە بووبوو.

-(کاك ســـەرحەد) لەکۆنـــەوە هاورێی یەکترو خۆشەویســـتی یەکترین. خـــۆی و کوری و خێزانەکانی بەوپەری رێزەوە سەیری من دەکەن رێزم لێدەگرن. منیش جگە لە کاك سـەرحەد کە رێزو خۆشەویســـتییەکی تایبەت لەنێوانماندایە. یەکەیەکەی کورەکانیم وەکو کورەکانی خۆم خۆشدەوێت و رێزی زۆرم بۆ (خاتوو عەینەو خاتوو شەفیقە) هەیە، کە دایکی مندالەکانین. (کاك ســـەرحەد) لەو رۆژو رۆژگارەی کە رژێم دێکانی دادەگرت، دسکەرەش یەکێك بوو لەو دێیانە کە داگیراو رووخێنرا، بە بەردەوامی بۆ هەموو شتێك پرسی پێدەکردین و بە ئاگاداریی ئێمە چووە دەرەوە، بوو بە پێشـــمەرگە (تیپی خەنجەر)ەیان لە ســـنووری مەلبەندی یەك لە

---

١- کاك حەمەرەشید لە ٢٠٠١/١٠/١٩، بەهۆی نەخۆشیی وەستانی گورچیلەوە شەهید بوو.

-کاك حەمەنووری لە ٢٠٠٥/٤/٨ لە خۆرهەلاتی گوندی سەوزبلاخی قەزای خانەقی لە رووداوێکی ناخۆشدا شەهید بوو.

قەرەداغ بۆ کردەوە، ئەو ماوەیەی کە لە ناوچەی قەرەداغ بوو. لەگەڵ (کاک حەمەڕەشیدو کاک حەمەنووری و حاجی عەبدوڵڵای حەمەعەلی) سەردانمان کردن و چەند شەو و رۆژ لایان ماینەوە، دوای ئەنفالیش کە کاک سەرحەد گەڕایەوە لە بیناى خوێندنگایەکدا لە عەربەت دادەنیشت، بەردەوام سەردانمان دەکرد، بە کوردی هەردەم بەخەم و لە خەمی یەکتردابووین. ئەویش بەهەمان شێوە شێرزەی من بووبوو، لەگەڵ کاک حەمەڕەشیدو کاک حەمەنووری و کاک برایمدا بە بەردەوامی لە هەوڵدا بووبوون.

-(کاک ئیبراهیم عەلی رەزا). لەدوای هەشتاکانەوە بەهۆی (کاک حەمەڕەشیدو کاک حەمەنووری)یەوە یەکترمانناسی، خەڵکی خانەقینە بوو. دوای هەرەسی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥-دا، لەبەرئەوەی کادیرێکی سیاسیی ئەو سەردەمەی شۆڕش بوو. بارودۆخی خانەقین لە رووی سیاسییەوە لەبار نەبوو، تا تێیدا دانیشنەوە، بۆیە بەماڵەوە لەگەڵ براو ئامۆزاکانی و خزم و هاوڕێکانی چووبوونە بەغداو لە گەڕەکی (شەعبی بەغدا) نیشتەجێبووبوون. هەر ئەوەندەی یەکەمجار ناسیم، پاش ماوەیەکی کەم بووینە هاوڕێ و خۆشەویستی یەکتر. بە بەردەوامی سەردانی یەکترمان دەکرد، زۆربەی جارەکان کە دەچووینە بەغدا لە ماڵیان دەماینەوە، ئەوانیش کە دەهاتن بۆ سلێمانی لە ماڵی ئێمەو کاک حەمەڕەشیدو کاک حەمەنووری و کاکە سەرحەد دەمانەوە. بەتایبەتی لەو ساڵەی کە (کاک حەمەڕەشید) دووچاری نەخۆشیی گورچیلە بوو، لە (نەخۆشخانەی خەیال) لە بەغدا نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلەیان بۆکرد. ئەو رۆژانەی کە لە بەغدا دەماینەوە، شەو دەچووینەوە ماڵیان، ماڵەکەیان وەکو ماڵی خۆمان وابوو، بەراستیی زۆر برایانەو دڵسۆزانە یارمەتیدەرمان بوو، لەو کاتی نەخۆشییەی (کاک حەمەڕەشید)دا ئەوەی ئەو و ئەو برادەرانەو خزمانەی دەیانکرد. مەگەر هەر برای باش ئەوە بۆ برای بکات. من هەرگیزاوهەرگیز ئەو شەو و رۆژو کاتانەم بیرناچێتەوە، خۆزگا مرۆڤ لە ژیاندا لەکاتی هاوڕێیەتیدا وەکو ئەو برادەرانە لەگەڵ هاوڕێیانیدا هەڵسوکەوتیان بکردایە، ئێمە لەو ساڵانەدا دەیان شەو و رۆژمان لە بەغداو سلێمانی و شارەزوورو خانەقین بەیەکەوە بەخۆشیی بەسەربردبوو، لە گرتنەکەمدا بەوپەڕی پەرۆشیی و دڵسۆزییەوە هەمەلایەنە هەوڵی دابوو بۆئەوەی (بارم) لە زیندان سووک بکات.

-(کاک داود) لەگەڵ کاک برایمدا هەر بەهۆی ئەو هاوڕێیانەوە ئەویشم ناسی کە لەپێشەوە باسم کردوون. (کاک داود) بەراستیی پیاوێکی کراوەو قسەخۆش و هەردەم دەم بەپێکەنینەو دڵسۆزە بۆ هاوڕێ. لە هەر چوونێکماندا بۆ بەغدا، لە هەرهاتنێکیان بۆ سلێمانی لەگەڵ کاک برایم و ئەو برادەرانەی دیکەدا بەیەکەوە کاتمان بەسەر دەبرد. نموونەی هاوڕێی دڵسۆزو پاک و چاکە، کە بەبێ هیچ بەرژەوەندییەك حەزی بە هاوڕێیەتیمانە، بەهەمان شێوەی کاک برایم لەکاتی نەشتەرگەریی (کاک حەمەڕەشیدا) بەوپەڕی پەرۆشیی و دڵسۆزییەوە مامەڵەی دەکردو بەخەمەوە بوو. دیارە لەگەڵ ئەم دوو هاوڕێیەم لە بەغداو بە هۆیانەوە ئەم بەڕێزانەشم ناسی و ئەوانیش بوونە هاوڕێی خۆشەویستم و تێکەڵاوی یەکتربووین، دۆستایەتی و خۆشەویستی

لەنێوانماندا زۆر گەرم بوو، (کاك ئیبراهیم عەلی ویگ و کاك مستەفا موسا کۆزاد، فارس ئەحمەد ئەکبەر، فازل شامیرزا، ئەحمەد محەمەد، (ئیسماعیل و حسێن) براکانی کاك برایم عەلی رەزا)و خزمەکانیان لە بەغدا بووبوونە جێگای متمانەو خۆشەویستیمان و (کاك مەجید ئیبراهیم) ناسراو بە (مەجید مەشرووتە) (ئەبو مهدی) دانیشتنەکانمان پێ گەرم دەکرد. بەو قسانەی کە دەیکردو لە سەیرکردنێکی کاك برایمدا یەکسەر دەگەرایەوەو قسەکەی بە بارێکی دیکەدا دەگۆری. دیارە (کاك داود، کاك برایم، کاك مستەفاو کاك مەجید) لە شۆرشی ئەیلوولدا پێشمەرگە بووبوون و هەریەکەیان لە بوارێکی شۆرشدا خەباتیان کردبوو لەیەکدانەدەبران و لە تەگبیرو رای یەکدا بوون.

زۆرجار لە دانیشتنەکانماندا (ئەبو مەهدی و کاکەولامان) بەرامبەری یەك دادەناو بە هەردووکیان بە قەرەبالغییان کەشو هەوایەکی خۆشیان دروست دەکردو دەبوونە هۆی پێکەنین و بەسەربردنی کاتەکەمان. کاك داودیش لە گرتنی مندا باری خەمی هەلگرتبوو، هەولی خۆی دابوو.

- (حاجی شێخ ئیبراهیمی قادرکەرەم)[1] پیاوێکی روناکبیرو ئەدەبدۆست و زمانزان و دەرچووی پەیمانگای ئەندازیاریی بوو. شارەزاییەکی باشی لە زمانەکانی (کوردی و عەرەبی و فارسی) دا هەبوو. بەردەوام دەیخوێندەوە، شێخی ئیرشادبوو، لەسەر تەکیەی (شێخ حەسەنی قەرەچێوار) جێنشین بوو، خەلیفەو دەرویش و موریدی زۆری لە کوردستان و عیراقدا هەبوو. پیاوێکی ئایینی و کۆمەلایەتی بەتوانابوو، کەسایەتییەکی ناودارو دیارو بەناوبانگ بوو. رێزی لە خەلك دەگرت و خەلکیش خۆشیان دەویست و رێزییان لێدەگرت، تەکیەکەی بە بەردەوامی لە موریدا جمەی دەهات بەهۆی تەکیەو تەریقەتەکەیەوە، کە تەریقەتی قادری بوو. سەرانی حکومەت لێی نزیك دەبوونەوە دەیانویست سوود لە کەسێتی وەربگرن. بنەمالەی شێخانی قادرکەرەم لە سەردەمی باپیرانمانەوەو لە سەردەمی باپیری حاجی شێخ ئیبراهیمەوە بەحوکمی خزمایەتی و شێخایەتی و خاوەن تەکیەتی زۆر لە یەکەوە نزیکبووین و پەیوەندییەکی توندو بەردەوام لەنێوانماندا هەبوو. ئەو پەیوەندییە درێژەی بۆ سەردەمی (حاجی شێخ و کاکەم حاجی شێخ عوسمان) کێشابوو. هەر جارێك بهاتایەتە سلێمانی لە مالی کاکەم میوان دەبوو، یان سەردانی کاکم و مالمانی دەکرد. پەیوەندییەکی رێزو خۆشەویستی لە نێوان من و ئەودا هەبوو، لە زۆر دەمێکەوە حسابی تایبەتی بۆ دەکردم، مەشورەتی پێدەکردم، گوێی بۆ راوبۆچوونەکانم دەگرت، هەر راوبۆچوونێکیشی هەبووایە بەراشکاویی بەبێ سلەمینەوە بۆی باس دەکردم. من بەپەرۆشەوە گوێم بۆ دەگرت و حیسابم بۆ راوبۆچوونەکانی دەکردو بەهەند وەرم دەگرتن، لەناخەوە زۆر دلسۆزی خاك و گەلەکەی بوو، حەزی بە سەرکەوتنی شۆرش و بزووتنەوەی گەلەکەی دەکرد. زۆر پێشنیازی دۆستانەی دەکردو حەزی دەکرد ئەو پێشنیازانە بگەنە شۆرش و سەرکردایەتی. هەستم دەکرد بەرادەیەکی زۆر خۆشی دەوێم و حەز بە بەختەوەریم دەکات.

---

١- لە ٢٠٠٥/١٠/٢٤ لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

(عززەت دووری) جێگری سەرۆك كۆمار خۆی بە دەروێشی حاجی شێخ دەزانی، ساڵانە سەردانی دەكردو لە تەكیە دەمایەوە. حاجی شێخیش سەردانی دەكردو پەیوەندیی شێخ و دەروێشیان گەیشتبووە رادەیەك، كە تێكەڵاویی خێزانییان پەیداكردبوو. بەهۆی نزیكییانەوە زۆر كاری خەڵك و هاوڵاتییانی پێ جێبەجێ دەكردو خزمەتی پێ دەكرد، هاتوچۆی ماڵی یەكتریان دەكرد. خێزان و منداڵی حاجی شێخ دەچوون بۆ ماڵیان و خێزان و منداڵی عیززەت دووریش دەهاتن بۆ ماڵیان. حاجی شێخ و منداڵەكانی بە (ئەبو ئەحمەد) ناویان دەبرد.

دوای هەرەسی شۆرش لە ساڵی (١٩٧٥)دا من رەوانەی پارێزگای واست كرام و لە قەزای حەی بوومە مامۆستا، پێنج ساڵ بوو لەو قەزایە بووم. هەموو ساڵ فۆرمی گواستنەوەم پێشكەش بە وەزارەتی پەروەردە دەكردو داوای نەقلم دەكرد. كاتێك قائیمەی نەقل دەردەچوو ناوی منی تێدا نەدەبوو.

ساڵی (١٩٨٠) چوومە وەزارەتی پەروەردە بۆئەوەی بزانم ناوم دەرچووە. كە چوومە بەشی كارگێریی و خۆیەتی، بەرپرسی بەشەكە پێیان دەوت (ئەبو نەغەم) لەراستیدا ناویم لەبیرنەماوە، دانیشتبوو. پرسیارم لێكرد وتی: بەداخەوە ئەمساڵیش ناوتی تێدا نییە، ویستم برۆم، لەگەڵمدا هاتە دەرەوەو چووینە پەنایەكەوە. دڵسۆزانە پێی وتم: مامۆستا حەزدەكەم راستییەك هەیە پێتی بڵێم، بەڵام كە پێت دەڵێم هەردەبێت خۆت بیزانیت لای كەس باسی نەكەیت، چونكە ئەمەی من پێتی دەڵێم زۆر نهێنییە گەر بزانرێت من پێم وتوویت، دووچاری لێپرسینەوەو سزادان دەبمەوە. وتی: تۆ لە (ئەمنی كوت و بەغداو ئەمنی ناو پەروەردەوە) راپۆرتت لەسەرەو بەپێی ئەو راپۆرتانە تۆ نەقل نابیتەوە. ئەگینا بەپێی مەرجەكان دوو ساڵە تۆ دەبوو نەقل بكرایتایەتەوە. جا بۆیە ئەمەت پێدەڵێم بچۆ لای خۆتانەوە لە رێگای ئەنجوومەنی تەشریعییەوە، یان كەسێكی قسە رۆیشتوو، لە سەروو وەزارەتی پەروەردەوە هەوڵێك بدە بۆ نەقلەكەت. قسەكەم بە ئەمانەتەوە لێوەرگرت و گەرامەوە بۆ سلێمانی، بریارم دا ئەگەر نەقل نەبمەوە، بچم ماڵەكەم بهێنمەوە، واز لە وەزیفە بهێنم، بەرەو ژیانێكی دیكە هەنگاو بنێم، كە گەیشتمە ماڵەوە (زەینەب) هات بەپیرمەوەو بەتەمای ئەوەبوو، مژدەی گواستنەوەی بدەمێ. كە سەیری رەنگ و رووی كردم، تێگەیشت ئاسایی نیم، پرسی چیت كرد؟ وتم: هیچ نەقلەكەم نەبووە. (كاكەم) هات بۆلام ئەویش دوای بەخێرهاتنەوە پرسیاری كردو وەڵامی ئەویشم دایەوە. رێكەوت وابوو (كاك حاجی شێخ ئیبراهیم) لە سلێمانی بوو. كاكەم وتی: حاجی شێخ لێرەیەو پرسیاری كردیت، حەز دەكات بتبینێت. بەیانی لە ماڵی (كاك سدیق) دەعوەتەو من و تۆش بانگكراوین، كە یەكمان بینی پرسیاری نەقلەكەی لێكردم، وتم: راستت دەوێت پێیان راگەیاندم كە نەقل ناكرێمەوە. وتی: هۆی چییە؟ وتم: ئەوە خۆیان دەیزانن. منیش بریارم داوە بچمەوە بۆ حەی ئەگەر ماڵەكەم بۆ هاتەوە، دەیهێنمەوە، ئیتر ناچمەوەو واز لە دەوام دەهێنم و خەریكی ئیشێكی دیكە دەبم. یەكسەر تێگەیشت كە بریاری چیم داوەو بەنیازی چیم. وەرەقەیەكی دەرهێناو بە دوو دێر داوایەكی بەناوی منەوە

بۆ (سـەید النائب عیززەت دووری) نووسی و بۆم ئیمزاکرد. وتی: من ئەمرۆ دەگەڕێمەوە بۆ کەرکوك بەیانی دەچم بۆ بەغداو بەنیازم (ئەبو ئەحمەد) ببینم. ئەو پیاوە دڵسۆزە ئەو داوایەی پیشکەشـی عیززەت دووری کردبوو، یەکسەر بڕیاری نەقلەکەی دەرکردبوو، بەو هۆیەوە من نەقلی سـلێمانی بوومەوەو نەچوومە دەرەوەو ببمە پێشـمەرگە لە ١٩٨٠/٨/٢٥ عەریزەکەم نووسی، ١٩٨٠/٨/٢٦ فەرمانی گواستنەوەکەم دەرچوو بۆ گرتنەکەشم بەو پەڕی پەرۆشییەوە هەولیدابوو.

-(مامۆسـتا سامانی شـێخ سـاڵح) لەگەڵ ئەوەی خزمی یەکین، لە ناوەندییەکەی منی لێبووم، مامۆسـتای محازر بوو، مامۆستای سـەرەتاییە، ئەو ڕۆژەی گیرام نیوەڕۆ لە ماڵی ئەوان نانم خوارد. خزمێکی زۆر دڵسـۆزەو زۆرم خۆشدەوێت، ئەویش وەکو (بەهادین)ی برای سـەیری من دەکات، باوکیان خۆشەویستی مامە سەیدگوڵم بوو، بەعسییەکان لە شەست و سێدا شـەهیدیانکرد، هاوکارێکی زۆر باشـم بوو، لە خوێندنگاکە. زۆر بە دڵسۆزیی کاری دەکـرد. دەوری معاون مدیرێکی دەبینی. هاتـوو چۆی ماڵی یەکمان دەکردو منداڵەکانمان یەکتریان خۆش دەویست.

مامۆسـتا سامان چوار بران، هەرچواریان من و کاکەمیان لە جێگەی باوکیان داناوە. بۆ هەموو بۆنەیەکیان دەبێت ئێمە بانگهێشت بکەن، بەگرتنی من شپرزەو نیگەران بووبوو.

-براکانم (کاکەم حاجی شـێخ عوسـمان) لە جێگەی باوکمانە. زۆر دڵسـۆزمانە. خۆم و زەینەب و منداڵەکانمی زۆر خۆشدەویست، حیسابی تایبەتیم بۆ دەکات، لە هەموو کارێکیدا مەشـۆرەتم پێدەکات، گوێی بە قسـەو شـتی لاوەکیـی نییە. برایە بەحـەق برایە. منیش حیسابی برایەکی گەورەو خەمخۆرو دڵسۆزی بۆ دەکەم، وام داناوە کە لە شوێنی باوکمە، بە دەستگیرکردنی من تەواو شپرزەو نیگەران بووبوو، لە ڕێگای ئەوانەی دەیناسین هەوڵی زۆری دابوو، بەتایبەتی لە ڕێگای (حاجی شـێخ ئیبراهیم و شـێخ جەعفەری شێخ عەبدولکەریمی قادرکەرەم)ەوە.

- محێدین برای بچووکمانە. چەرمەسـەریی زۆری بەسەر هاتووە، ئەمیش بەخێزانەوە لە سـاڵی ١٩٧٦-دا ڕەوانەی خوارووی عیراق و ناسریە کرا، دوای چەند ساڵێك نەقلی سلێمانی بووەوە، فەرمانبەری دائیرەی زراعەیە، کە من نەقل بوومەوە، دوو زەویمان هەبوو، کە ئەویش حاجی شـێخ برایم بۆی وەرگرتبووین، هەردووکیانمان فرۆشت و دووکانێکمان لە (قەیسەری نەقیب) پیَ کری بە شـەراکەت، واتە بەرژەوەندیمان تێکەڵاوبوو. لە ناخەوە ئەوەندە دڵسۆزە. حەزینەدەکرد گەنەتایەك بگرم. ژنەکانمان خوشـکن دڵسـۆزی زەینەب و منداڵەکانمە، بە دەستگیرکردنی من سەری دنیای لێهاتبووە یەك و هەوڵی خۆی دابوو.

-(کاکە لەتیف)م لە من گەورەترە. کە دەسـتگیرکرام خەمی زۆری لێخواردووم، ترسـی ئەوەی هەبوو لەناوم بەرن، لەبەرئەوەی نەخوێندەوارەو زۆر سـەربەدەرەوە نییە، وەکو کاکەم خەڵکی ناناسیَ و خەڵکیش نایناسن. ئەوکەسانەی کاکەم دەیتوانی بچێت بۆلایان، ئەم نەیان

دەگەیشتیّ، خەمی منی لە میّشکی خۆیدا شەو و رۆژ خواردبووەوە.

بۆیە وا بەکورتی باســی ئەو بەرێزانەم کرد، چونکــە دەمزانی من کە گیرام هەر ئەمانەو چەند کەسێکی دیکە لە خەمی خۆم و منداڵمدا دەبن، کاتێك چوومە هۆڵی پێنج جگە لەوەی چەند هاورێیەکی خۆشەویســتم لە هۆڵەکەبوون بە دیداریان شادبوومەوەو ژیانی هۆڵەکەیش لەچاو ژیانی (ژووری دوو)دا وەکو نێوانی ئاســمان و زەوی بــوو. برادەرانی ژووری چواریش گوێزرانەوە بۆ هەمان هۆڵ و هاورێیان (جەبارو ئەحمەدو کارزان)یش کە لە ژووری تەنیشتی هۆڵەکەوە بوون بە دەرگایەکی جیاواز خرایە سەر هەمان هۆڵ و بە دیداری یەك شادبووینەوە.

بــۆ وەرگرتنی نیوەی مووچەکــەم، وەکالەتێك بۆ زەینەب کرابــوو، وەکالەتەکەیان هێنایە دائــیرەی ئەمن و بانگیانکردم و وەکالەتەکەیان پیّ ئیمزاکردم. زۆری پێنەچوو، بانگکرام بۆ مواجەهــەو لە مواجەهەکەدا (زەینەب و ئــازاد) هاتبوون، ئەم گۆرانکارییانە هەرهەموویان کاریگەریی راستەوخۆی لەسەر باری دەروونیم کرد.

وەك (کاك ئیبراهیــم عەلــی رەزا) بــۆی باســکردم، هەوڵەکانی ئەو و چەنــد هاورێیەك کاریگەرییان لە گۆرینی بریاری لە سێدارەدانمدا بۆ موئەبەد زۆر بووەو هاورێکانیش ئەمانە بــوون: (کاك حەمەرەشــید، کاك حەمەنووری، کاك ســەرحەد، کاك ئیبراهیــم عەلی رەزا، کاك داود ســلێمان)، ئەوانیش لە رێگەی ئەم کەســانەوە بووە: (محەمەد شامیە) خەزووری حســێنی برای کاك برایم، (حەیدەر عەبد عەلی)و (مســتەفا زۆراب)و (عمر هشام تکریتی)و لەســەرروویانەوە (ســەباح میرزا)وە کرابوو (ئەمیرەی خێزانی کاك داود) لەو هەوڵانەدا پشکی خــۆی هەبووەو حاجی شــێخ ئیبراهیمی قادرکەرەم لە رێگای عیــززەت دووری و بە هەوڵی (خاتــوو نیگــاری کچی حاجی ئیبراهیم). هەوڵی ئەم بەرێزانــە نابێت و ناکرێت لەپێش چاو نەگیرێت و پێی نەزانم. من خۆم بە قەرزاری یەکەیەکەیان دەزانم و خۆزگا تواناو دەسەڵاتێکی وام دەبوو، کەم تا زۆر لە خزمەتیاندا بوومایە. (مامۆستا سامان) چۆن دەبێت لەیاد بکرێت، لەگەڵ ئەو هەموو گوشــارو چاودێرییەی لەســەر ماڵ و خێزانم بووە. چاونەترسانە مانگانە پێداویســتی گەیاندووەتە زەینەب و منداڵەکانم. یان چۆن دەبێت ئەو هەســتی دڵسۆزیی و خزمایەتیی و دۆســتایەتییە لەیاد بکەم کە (کاکە هیوای شــێخ مســتەفای کۆیك)و (کاك ســەرحەدی خەلیفە یونس) بەفەردە لەو رۆژگارە ســەختەی ژیانــی کوردەواریدا گەنمیان بۆ زەینــەب و منداڵەکانــم ناردووە. یان چۆن دەبێت دڵســۆزیی و پەرۆشــیی هاورێیانم (کاك حەمەرەشیدو کاك حەمەنووری) پێی نەزانرێت کە بەردەوام و مانگانە لەو ئازووقەو خواردنەی وەریانگرتووە، بەشــی منداڵەکان و بەشی بەندیخانەشیان دادەناو بۆیان ناردووم، خەمخۆری ئەمانە هەرهەموو هەڵوێستی پیاوی جوامێرو بەوەفان.

کــە ئازادکرام (کاك ئیبراهیم عەلی رەزا) بۆی گێرامەوە. کاتێك کە چووەتە لای (خەڵەفی بەرێوەبەری ئەمنی ســلێمانی)و باســی منی بۆ کردووە، پێی وتووە ئەوەی تۆ باسی دەکەیت بەرپرسە لە (خەتی رێکخستنی جەلال تاڵەبانی)و بریارە لە سێدارە بدرێت. مادام تۆ وا باسی

دەکەیت، ئەو کەسانەی تۆیان بۆ لای من ناردووە، من تەنها ئەوە دەتوانم لە سێدارەدانەکەی بۆیکەم بە (حوکمی موئەبەد)، ئەویش بەوەی بۆ دادگای بنووسـم (لکبر سنە، لکثرت عیالە، لسـمعتە زینة) لەسـێدارە نەدرێت، بە موئەبەد حوکم بدرێت. خۆزگە زووتر بهاتیتایەتە لام دەمتوانی ئیشی باشتری بۆ بکەم و یارمەتی زۆری بدەم.

هەروەها (کاک داود) بۆی گێڕامەوە. کاتێك (مسـتەفا زۆراب) چووەتە ماڵیان و لەبارەی منەوە قسـەیان لەگەڵدا کـردووە، ئەویش بەڵێنی داوە کە لەرێگـای خۆیەوە هەوڵی جدیی بدات، پێشـی وتوون بۆ ئەم هەوڵە دیاریی باشی دەوێت. (خاتوو ئەمیرەی خێزانی کاك داود) پێی وتووە، خەمی ئەوەت نەبێت ئەگەر ئالتوونەکانم فرۆشـتووە، ئەوەی پێویستبێت و داوا بکرێت، جێبەجێی دەکەین، یەکسـەر (مستەفاش) وتوویەتی مادام وایەو لەسەر کورد گیراوە چیم بۆ بکرێت بۆی دەکەم.

کاکم گێڕایەوەو وتی: بۆ وەرگرتنی هەواڵی تۆ چوومەوە بۆ ماڵی (حاجی شـێخ ئیبراهیم) شـەو (نیگاری کچی) کە ناردبووی بۆ ماڵی عیززەت دووری، گەڕایەوە. بەدزییەوەو بەچرپە بە باوکی وتبوو پێیان راگەیاندووە، کە تۆ تەواو لە سـێدارە دەدرێیت. (حاجی شـێخ) هاتەوە سەر بەرماڵەکەی و سەرنجم دا، وەکو مەنجەڵ دەکوڵێت و گیانی دەلەرزێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەستی بەرزدەکاتەوە دەپاڕێتەوە، لێم پرسی (حاجی شێخ) بۆ وادەکەیت؟ هیچی خراپ روویداوە؟ چەنـد جار ئەم پرسـیارەم لێکرد، وەڵامی هەر نەدامەوە، تا خۆم پێم وت دیارە مەسـەلەی محەمەـدی برامە. وتی: بەڵێ، خەمی (کاکە حەمەیە) منیش وتم: (حاجی شـێخ) برای من خوانەخواسـتە لەسەر دزیی و بەدڕەوشتی و پیاوخراپیی نەگیراوە. لەسەر مەسەلەیەك گیراوە خۆی باوەری پێی بووەو دیارە هەر ئەوەندەی تەمەن لە ژیاندا بۆ نووسراوەو هەرچی لێبکرێت بۆ ئێمە سەربەرزییە.

-کاك هیوای شێخ مستەفای کۆیك. ئەم پیاوە، ئەم خزمە دڵسۆزو خاوەن هەستە، کاتێك مـن گیراوم ئەوەنـدە لە خەمی مندا بووە، تەنها ئەوەندەی پێکراوە، لەو رۆژگارە سـەختەی خەڵکی کوردسـتاندا، توانیبووی (فەردەیەك گەنـم) بنێرێت بۆ منداڵەکان، کە بۆ ئەو رۆژە لاکردنەوەیەکی ئێجگار زۆربوو.

-خاتوو نیگاری حاجی شـێخ ئیبراهیمی قادرکەرەم. نیگار کچەگەورەی حاجی شـێخە. بەهـۆی زیرەکییەوە زۆربەی کارەکانی باوکی دەکرد، لەسـەر راسـپاردەی باوکی چەندجار سـەردانی ماڵی (عیزەت دووری) کردبوو، بۆئەوەی وابکات (ئەبو ئەحمەد) بە دەسەڵاتی خۆی هەوڵی سووککردنی حوکمەکەم بدات. لەدواجاردا کە چووبوو بۆلای (ئەبو ئەحمەد) ئاگاداری کردبوو، کە هیچ ناکرێت و من لەسـێدارە دەدرێم، بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە گەڕابووەوەو ئەو هەواڵەی بە باوکی راگەیاندبوو.

- کاك عوسـمانی حەمەئەمینی عەربەتی، ناسـراو بە (عوسـمان سەرسپی و عوسمانی نانەوا)، کاك عوسمان ئەوکاتە هاورێمان بوو، زۆر شەو لە ماڵی یەك یان لە نادی بەیەکەوە

دادەنیشـــتین، بەبیرو باوەر ســـەر بە (حزبی شـــیوعی)بوو، بەلام ئێمە هەرچوارمان، واتا (من و کاك حەمەرەشـــیدو کاك حەمەنووری و کاك عوســـمان) بەبێ گوێدانە جیاوازیی بیروباوەر لەگەڵ یەك هەڵســـوکەوتمان دەکرد، کاك عوســـمان پیاوێکی کاسب بوو، بۆ بژێویی ژیانی خۆی و ماڵو منداڵی هەموو جۆرە کارێکی دەکرد، پیاوێکی سەخی و دەستکراوە بە تەبیعەت و قســـەخۆش و نووکتەگێڕەوەو زیـــرەك بوو، ئەوکاتەی من گیرابووم (وەکالەتی شـــەریکەی ئەفریقی) هەبوو، بۆئەوەی کەلوپەلی ماڵم موســـادەرە نەکرێت، لەسەر وەسڵی وەکالەتەکەی ئەو ئەشیاو کەلوپەلانەی هەمبوون لە ماڵەوە، هەرهەمووی بەوەسڵ کردبوو بەناوی (زەینەب) ەوە، چونکـــە زانیبوویان ئەگەر بەناوی خۆمەوە نەبێت موســـادەرە ناکرێت، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکـــەوە وەکو (کاکە حەمەنووری و کاك حەمەرەشـــید) بۆیان گێڕامەوە لەو دوو ساڵەی کە من گیرابووم، ئەو بە ئۆتۆمبێلەکەی لەگەڵیاندا چەند سەفەری خانەقین و بەغداو شوێنی دیکەی کردبوو، وەکو ئەوان شپرزەی من بووبوو.

-خاتوو ئەمـــیرە نەریمان خێزانـــی کاك داود. ئەوکاتەی کاك مســـتەفا زۆراب چووبووە ماڵیان، بۆئەوەی کارێکم بۆ بکرێت، ئامادە بووبوو کە ئاڵتوونەکانی ملی بۆ من بفرۆشێت، لەکاتێکـــدا وەکـــو بیرم بێـــت هەرهەمووی من دووجـــار (ئەمیرەم) نەدیبـــوو، ئەویش منی نەدیبوو.

-مامۆســـتا ســـەلامی مەلاغەفووری بارزیی، کە بە مامۆستا (ســـەلام مەنمی) ناسراوە. مامۆســـتا سەلام نووســـەرو چیرۆکنووسە، پســـپۆڕە لە زمانی عەرەبیدا. لە کۆنەوە هاوڕێی یەکـــین و باوکی لەگەڵ باوکم و کاك عوســـمانمدا زۆر نزیکی یەك بوون و ڕێتریان لای یەك هەبووە. ساڵانە دوو سێ جار دەهاتە ماڵمان لە سۆڵەو چەند ڕۆژێك دەمایەوە، ئەو ڕۆژانەمان بەخۆشیی لەگەڵدا بەسەردەبرد. مامۆستا سەلام لەکاتی خوێندنی فەقێیەتی چەند وانەیەکی پێ وتووم. پیاوێکی بەهەڵوێســـت و کوردپەروەرە. لە پۆلی یەکی ناوەندیش ســـاڵێك وانەی عەرەبی لە ناوەندیی جەمهوری پێ وتووم.

کاتێك من گیرابووم. ئەوکاتە (بەهار و ئازاد) لە پۆلی شەشـــی ئامادەیی بوون. مامۆستا ســـەلام نەترســـانەو بێگوێدانە چاودێریی دەزگاکانی رژێم. ماوەیـــەك ڕۆژانە چووبوو وانەی عەرەبی پێ وتبوون. بەلای منەوە ئەو هەڵوێســـت و لەخۆبردوویی و پەرۆشیبوونە بۆخۆم و منداڵەکانم، هیچ کات لەبیر ناکرێت.



تەلاری خوێندنگەی مەڵکەندی سەرەتایی (ناوەندیی زانستیی ئێوارانی ئەوکاتە دەوامی تێدا دەکرد لەم خوێندنگایەدا دەستگیر کرام)



تەلاری بەندیخانەی ئەمنە سوورەکە



ئەمنە سوورەکە
کاتی بەستنەوەی زیندانییەکان، لەکاتی دەستگیرکردنیاندا، لەسەر قادرمەکان



ئەمنە سوورەکە - ژووری ئینفرادیی



دائیرەی ئەمنی سلێمانی - ئەمنە سوورەکە
ژووری فەلاقەکردن



دائیرەی ئەمنی سلێمانی - ئەمنە سوورەکە
ژوورەکانی ئینفرادی



دائیرەی ئەمنی سلێمانی - ئەمنە سوورەکە
ژووری هەڵواسین و ئەشکەنجەدان



دائیرەی ئەمنی سلێمانی- ئەمنە سوورەکە
ژووری ئەشکەنجەو هەڵواسین و کارەبا لێدان



ئەمنە سوورەکە
ژووری (٢)



ژوورێکی تایبەت دوایئەشکەنجەدان و بوورانەوە



حەوشەی بەردەم ژوور و هۆڵەکان بۆ ڕەوانەکردنی زیندانیان بۆ دادگا



دەروازەی ئەمنە سورەکە



تەلاری بەریوەبەرو فەرمانبەرانی ئەمنەسوورەکە



شەهید حەمە نوري حاجی ئەحمەد سەوزبلاّخی (ه.موراد)
هاوڕێیەکی دلسۆز و خەمخۆر لەکاتی گرتنمدا



**خوالێخۆشبوو حاجی شێخ ئیبراهیمی شێخ محەمەدی**
**قادر کەرەمی بەرزنجی**
**یەکێکە لە خەمخۆرە دڵسۆزەکانی لەکاتی گرتنمدا**



**شەهید حەمە ڕەشیدی حاجی شەریفی باریکەیی**
**شارەزووری (هـ. عادل) هاوڕێیەکی**
**دڵسۆزو خەمخۆر لەکاتی دەستگیرکردنمدا**

# ئەبوغرێبیش چیرۆکی خۆی هەیە

## -١-

## بەندیخانەی ناو بەندیخانە

کاتێك لە دادگای سەورەوە. بە دوو ئۆتۆمبیێل ئێمەیان گواستەوە بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکامی سەقیلەو لەبەر دەرگای بەندیخانەکە دایانبەزاندین، بەریز بەدوای یەکدا کردیانین بە ناو بەندیخانەکەدا، کە چووینە ژوورەوە لە رووکاری دەرگای دەرەوە شوێنێك هەبوو. بە چیمەنتۆ شوێنی دانیشتنی تێدا دروستکرابوو. شوێنەکان زۆر بوون، ماوەیەك لەسەر ئەو شوێنە دایاننایین، ئینجا لە دەرگایەکەوە بردیانینە ناو زیندانەکەوە. بە رارەوێکدا بردیانین، هاورێیان (جەبار، مامۆستا ئەحمەد، حەمەرەحیم، وەستا بەکرو عەتا) لە پێشمانەوە بوون. هەر چووینە رارەوەکە ئەوانیان کرد بە ژوورێکداو لە ئێمەیان دابرین، ئێمە بە بەردەمی ژوورەکەیاندا تێدەپەرین. نەیان دەهێشت لایان بوەستین و تەنها بەدەست خواحافیزیمان لێدەکردن. تەنها مامۆستا (ئەحمەد سالح)یان رێگە دا بچێتە لایان و قسەیان لەگەڵدا بکات، هەر هەموویان یەکەیەکە راسپاردەیان بە مامۆستا ئەحمەد گەیاندبوو... بەپێی گێرانەوەی مامۆستا هەرهەموویان لەوپەری ورەبەرزیدا قسەیان کردبوو. پێیان وتبوو ئێمەیان حوکمی لە سێدارەدان داوە، ئێمە دەرۆین، بەڵام ئێوە دەرباز دەبن و راسپاردەمان بۆتان ئەوەیە کۆڵ مەدەن، رێبازی (کۆمەڵەو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) درێژە پێ بدەن و لەسەر خەبات بەردەوام بن، تا گەلەکەمان بە ئاواتەکانی دەگات، پێیان وتبوو تاوانی گەورەیان بەرامبەر ئێمە کرد. ئێمە دڵخۆشین کە ئێوە لەو بریاری تاوانە رزگارتان بوو. لەپێش چاومان بوو کە بەم شێوەیەمان لەگەڵدا دەکەن...

ئێمەش کە بە بەردەمی ژوورەکەیاندا تێدەپەرین بەدەست و چاو سڵاومان لێدەکردن و بەقوڕلپی گریانەوە دەرۆیشتین. لە سی کەسەکەمان. (٢٣) کەسمان مابووینەوە. لە رارەوەکەوە چووینە رارەوێکی دیکەی زۆر درێژ کە بۆ خۆرهەڵات و خۆرئاوای بەندیخانەکە درێژبووبووەوە بەو رارەوەدا کەمێك رۆیشتین، بە پلیکانەیەکدا سەریان خستین بۆ شوێنێك، کە دەیکردە نهۆمی دووەم، لەو نهۆمەدا چووینە رارەوێکی بچووکەوە. لەمبەرو ئەوبەری رارەوەکەدا ژووری چۆڵ هەبوو. بەسەر ژوورەکاندا خۆمان دابەشکرد. کات ئێوارەیەو لە بەیانییەوە لە ناو

زیاتر هیچی دیکەمان نەخواردووە. تەواو برسیمان بوو. دیاربوو ئەو شوێنەی ئێمەیان تیا دانا (بەندیخانەیەك بوو لەناو بەندیخانە گەورەکەی ئەحکام سەقیلەی ئەبوغرێب)دا. ژوورەکان هیچیان تیانەبوو. ئەو بەتانییانەی لە ئەمنی سلێمانییەوە لەگەڵ خۆمان هێنابوومان. دامانخستن و کەوتینە چاوەڕوانی بۆئەوەی یەکێك بێت و لێمان بپرسێتەوە، ئێمەش پێی بڵێین نان‌مان نەخواردووە، برسیمانە.

ھێندەی پێنەچوو، دووکەس دەرگایان کردەوەو هاتن بۆلامان. وتیان خواردن نەماوە. نازانین هیچتان خواردووە، یان نا؟ پێمان وتن لە بەیانییەوە لەئاو زیاتر هیچی دیکەمان نەحواردووە، گەڕانەوەو پاش تۆزێك هاتنەوە، وتیان بەڕێوەبەر بڕیاریدا خواردنتان بۆ دروست بکەین، دەبێت چاوەڕوان بکەن تا خواردنەکە پێدەگات. هەواڵەکەمان بەلاوە خۆشبوو. وەکو بیتەوە یەدم دوای سەعاتێك بۆ سەعات و نیوێك، یەك مەنجەڵ برنجیان هێنا، لەگەڵ برنجەکەدا بەلەمی فافۆن و کەوچك و نانیان بۆ هێناین، چونکە برنجەکە تازە لێنرابوو. بەجوانیی و باشیی لێیان نابوو. برنجێکی ئێجگار بەتام و خۆش بوو. وەکو برنجی ئەمنی عامە وابوو، جا هی ئەوەبوو ئێمە ماوەی نۆ مانگ بوو خواردنی وامان نەخواردبوو، تامەزرۆی ئەو جۆرە برنجە بووین، یان هەر بەڕاست برنجەکە خۆش و باش لێنرابوو. هەرهەموومان بە تێرو تەسەلیی تێرمان خواردو لێشمان مایەوە. باوەڕ بکەن من تا ئێستاش خۆشیی ئەو برنجەم هەر لەیاد ماوەو بەلامەوە تامۆچێژێکی تایبەتی هەبوو. ئەم بەندیخانە بچووکە زۆری وەکو بیتەوە بەرچاوم سێ ژووری گەورەو ڕاڕەوێکی بچووك و ئاوودەست و حەمامی تێدابوو. ژوورەکان پاك بوون. ناخۆش نەبوون. بە باشی جێگامانی تیادەبووەوە. لە ئەمنی سلێمانی و لە ژووری پێنج (من و مامۆستا جەمال عەزیز) لەگەڵ (مامۆستا فەرەیدوون)دا تێکچووین و دەمەقاڵێمان بووبوو. بەو هۆیەوە لەگەڵ یەکدا قسەمان نەدەکردو لەیەك تووڕەبووین. یەکەم شەو هاوڕێیان ئەو قسەنەکردنەی ئێمەیان پێ خۆش نەبوو. کەوتنە هەوڵی ئەوەی کە ئاشتمان بکەنەوە. دوای ئەوەی لەگەڵ هەردووکماندا بەجیاجیا قسەیان کردو داوای پێکهاتنەوەیان لێکردین، هەردووکمان نەمانتوانی قسەیان بشکێنین و لەداواکەیان رابکەین، بۆیە هەر ئەو شەوە ئاشتبووینەوە. کەسمان نەبوو بە بەردەوامی داخ و خەفەت بۆ ئەو پێنج هاوڕێیەمان نەخوات. بەڕاستیی دڵمان زۆر ناخۆشبوو. بە بەردەوامی لە خەمیاندا بووین. وەکو بیتەوە بیرم (٤ بۆ ٥ شەو و رۆژ) لەو شوێنە ماینەوە. رۆژێك کاتێکمانزانی دەرگایان کردەوەو ریزیانکردین و لەو شوێنە گواستیانینەوە بۆ ژوورێکی دیکە لە خوارەوە ژوورەکە گەورەبوو، بەڵام پەنجەرەی بەرزی تێدا بوو. بەبێ گڵۆپ و تەنها رووناکی پەنجەرە بەرزەکان رووناکیان کردبووەوەو ئەو رۆژە تا ئێوارە لەو ژوورە هێشتیانینەوەو دوایی بردیانینەوە بۆ شوێنەکەی خۆمان. تێنەگەیشتین بۆ وا بەپەلەو کردیانین بە ژووردا. رۆژانە هەرسێ ژەمەکە خواردنیان بۆ دەهێناین، ئەو خواردنە پێیان دەوت خواردنی (کانە). وەکو بۆمان دەرکەوت ئەو شوێنەی کە ئەو رۆژانەی تێیدا ماینەوە، پێیان دەوت (مەحجەر)، واتە مەحجەر بەشێکی بچووکی ناو

بەندیخانەی ئەبوغرێب بوو. دیاربوو چەند جۆرە مەحجەریان هەبوو. کە لەیەك جیاواز بوون. ئەمەیان لە هەر هەموویان باشترو خاوێنترو خۆشتربوو. لەوێش مەحجەری ناو مەحجەریش هەبوو، ئەویش ئەو ژوورە تاریکە بوو، کە بۆ رۆژێك کردیانە مەحجەری ئێمە.

ئەبوغرێب
مانگی ١٢/١٩٩٠

## له مه‌حجه‌ره‌وه بۆ ئیستقبال

دوای به‌سه‌ربردنی ئه‌و چه‌ند رۆژه له‌و مه‌حجه‌ره. رۆژێك پێش نیوه‌رۆ ئاگاداریان کردین خۆمان کۆبکه‌ینه‌وه، خۆمان کۆکرده‌وه. ده‌رگایان کرده‌وه‌و به پلیکانه‌کاندا بردیانینه خواره‌وه، چووینه ناو راره‌وه درێژه‌که، به‌و راره‌وه‌دا به‌ره‌وخوار، واتا به‌ره‌و خۆرهه‌لاتیان کردینه‌وه، تا گه‌یاندیانینه کۆتایی راره‌وه‌که، له کۆتایی راره‌وه‌که شوێنێك بوو. پێیان ده‌وت (ره‌دهه‌ی یه‌کی ئیستقبال)، ده‌رگای ئیستقبالیان بۆ کردینه‌وه‌و چووینه ژووره‌وه، که چووینه ژووره‌وه ژماره‌یه‌ك زیندانیی دیکه‌شی تێدابوو له کوردو عه‌ره‌ب. هۆڵه‌که زۆر گه‌وره‌بوو، ژماره‌یه‌ك پایه‌ی تێدابوو، به‌رده‌می هۆڵه‌که حه‌وشه‌یه‌ك بوو به رووکاری حه‌وشه‌ی گه‌وره‌ی به‌ندیخانه‌که‌دا. دیسان له‌وێش بارمان خستوو، به‌سه‌ر هۆڵه‌که‌دا دوو دوو و سێ سێ به ته‌نیشتی یه‌که‌وه به‌تانیمان داخست. رۆژانه ده‌رگای سه‌ر حه‌وشه‌که ده‌کرایه‌وه. ده‌چووینه حه‌وشه‌که‌و پیاسه‌مان ده‌کرد. دیواری رووی راره‌وه‌که کونکون بوو. زیندانییه‌کان ئێمه‌یان ده‌بینی و ئێمه‌ش ده‌مانبینین و ده‌شمان توانی قسه‌یان له‌گه‌ڵدا بکه‌ین، به‌لای خوارووی‌دا به ته‌لی کونکونی زۆر به‌رز که به‌لای حه‌وشه‌ی گه‌وره‌ی به‌ندیخانه‌دا ته‌یمانکرابوو، رۆژی دوایی که چووینه حه‌وشه‌که، دیاربوو ده‌رگای هۆڵه‌کان کرابوونه‌وه، بۆیه زیندانییه‌کان ده‌هاتن و ده‌چوون هه‌شیانبوو شتی بۆ فرۆشتن دانابوو، شتیان ده‌فرۆشت. هه‌رچییان بفرۆشتایه‌و چه‌ند هه‌رزانیش بووایه ئێمه نه‌مانده‌توانی مامه‌ڵه‌ی بکه‌ین، له‌به‌رئه‌وه‌ی که‌سمان دینارێکمان پێ نه‌بوو. فلس له گیرفانماندا سه‌وزه‌له‌خانمی ده‌چری. زیندانییه‌کورده‌کان، که ئێمه‌یان ده‌بینی کوردین و به‌و ژماره زۆره هێنراوینه‌ته ئه‌بوغرێب، هه‌ریه‌که‌یان به‌جیا ده‌هاتن و پرسیاریان لێده‌کردین و ده‌گه‌رانه‌وه بۆ شوێنه‌کانی خۆیان و خواردن و نان و میوه‌یان بۆ ده‌هێنایین، به‌و خواردنه‌یان ئێمه‌یان حه‌وانه‌وه، به‌تایبه‌تی (کاکه حه‌مه) که یه‌که‌م رۆژ ئێمه‌ی بینی بانگی منی کردو پرسی ئێوه خه‌ڵکی کوێن و له‌سه‌ر چی گیراون؟ که پێم وت خه‌ڵکی سلێمانین، وتی: هه‌ڵبه‌ت دیاره له‌سه‌ر سیاسه‌ت گیراون، وتی: من (حه‌مه وسوم) خه‌ڵکی هه‌ڵه‌بجه‌م، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی (زه‌مانی) برای ره‌شه‌ی سالحه‌م کوشت به (١٥) ساڵ حوکمدراوم، من کاتی خۆی له‌گه‌ڵ (شێخ حه‌مه ئه‌مین)دا بووم و ئیتر که‌وته خزمه‌تکردنمان هه‌ر رۆژێك ساحه‌یان بووایه به‌پێی توانای خۆی شتی بۆ ده‌هێنایین. رۆژێك (قاله جاف)ی هێناو بانگیکردم، له‌گه‌ڵ قاله جافدا یه‌کمان ده‌ناسی که بینیمی یه‌کسه‌ر وتی: دیاره له‌سه‌ر (جه‌لالی) گیراویت. هه‌ر له‌وێدا (کاکه حه‌مه) چوو به‌گژییداو وتی: بۆ وا ده‌ڵێیت (جه‌لالی و یه‌کێتیی) چییانه؟ پیاو هه‌یه له‌م کوردستانه‌دا بڵێت (مام جه‌لالم). له‌و جاره زیاتر قاله‌جاف نه‌هاته‌وه بۆ لامان و تا له به‌ندیخانه‌ش بووم نه‌م بینییه‌وه. له ئیداره‌ی به‌ندیخانه‌وه رۆژانه سێ ژه‌مه خواردنی کانه‌مان بۆ ده‌هات و وه‌رمان ده‌گرت و ده‌مانخوارد.

مانگی ١٩٩٠/١٢

# مواجههەیەکی تایبەت

چەند رۆژێك بوو لە هۆڵی ئیستقبال بووین. رۆژێك بانگیان کردم و دەرگایان کردەوە، چوومە دەرەوە. ئەو سەجانەی هات بەشوێنمدا بە رارەوەکەدا کەوتە پێشم. لەو دەرگایەی کە یەکەمجار لیوەی هاتینە ژوورەوە، گەیاندمییە ئەو شوێنەی کە وەکو چەترێك و چەند کورسییەکی بە چیمەنتۆدروستکراوی لەژێردا بوو، لای دەروازەی بەندیخانەکە، سەیرمکرد چەندکەسێك لەسەر چیمەنتۆکان دانیشتوون. هەر منیان بینی هەموویان لە شوێنی خۆیان راستبوونەوە، یەکەیەکە باوەشیان پێداکردم. کەسەکانیش ئەمانە بوون (کاك ئیبراهیم عەلی رەزا، کاك مەلا داود سلیمان، کاك حەمەرەشید. کاك حەمەنووری. کاك مستەفا و کاك برایم عەلی). دیاربوو مواجهەکەیان بەتایبەت وەرگرتبوو. بە هەوڵی کاك برایم. بەراستیی مواجهەیەکی زۆر خۆشبوو. هەرچەندە ماوەکە بۆ من و بۆ ئەوانیش کەم بوو، شتی زۆریان بۆ هێنابووم. کە مواجهەکە تەواو بوو. ئەوانیان بەرێکردو بەمنیشیان وت شتەکانت کۆبکەرەوە با بچینەژوورەوە، شتەکانم زۆر بوون. بەتەنیا بۆم هەڵنەدەگیران. چوون عەرەبانەیەکیان هێناو خستمانە سەری و بەرەو شوێنەکەمان گەرامەوە، کە چوومە ژوورەوە برادەران بینییان ئەو هەموو شتەم پێیە، لێم کۆبوونەوە، منیش باسی مواجهەکەو کەسەکانم بۆکردن. خواردنی نیوەرۆمان بوو بەو خواردنەی بۆیان هێنابووم، ئەوەندە برنج و گۆشتی کولاویان هێنابوو، جگە لە خۆمان بەشی زیندانیی دیکەشمان دا. میوەکەشمان بەسەر خۆماندا دابەشکردو بەشی هەندێك زیندانیی تریشمان دا. ئەو کەلوپەلانەشی بۆیان هێنابووم. ئەوەی بۆ خۆم پێویست بوون دامنان و ئەوەشی زیادەبوو بەسەر هاوڕێیاندا دابەشمانکرد.

وەکو بیتەوە یادم جگە لە من چەند هاوڕێیەکی دیکەشمان لەو جۆرە مواجهەیەیان بۆ کرا، ئێستا نایەتەوە یادم کامیان بوون. لەم شوێنە، واتە (رەدهەی ئیستقبال) زیاتر لە هەفتەیەك تێدا ماینەوە.

مانگی ١٢/١٩٩٠

# دابەشکردنمان بەسەر بەش و ڕەدهەکاندا

دوای مانەوەمان زیاتر لە هەفتەیەك پێش سەری مانگی یانزە. لەلایەن بەڕێوەبەرێتیی بەندیخانەوە، کەوتنە دابەشکردنمان بەسەر بەش و ڕەدهەکاندا. بەش هەبوو تا (٦) کەس و هەشبوو دوو کەسی بۆ دەنێردرا.

(من و بەختیاری عومەری ئەولیبە) بەر بەشی (٨) کەوتین، کە ڕێك بەرامبەری ڕەدهەی ئیستقبال بوو. هەر چووینە بەشەکەوە ژمارەیەك لە زیندانییانی کورد کە لەوێ بوون هاتن بەپیرمانەوە. بەتایبەتی کاك حەمە وسوی هەڵەبجەیی و شێخ مارف و کامەران و جەبار، یەکسەر موراقیبیان بانگ کرد بۆئەوەی جێگامان بۆ دابین بکات. موراقیبەکە تورکمان و خەڵکی کەرکوك بوو. وەکو خۆمان بە کوردی قسەی دەکرد. بەرێزەوە هات بەپیرمانەوە. منی خستە ژووری (١٠)و بەختیاری خستە ژووری (١). لە ژوورەکەدا، چەند زیندانیی لە کوردو عەرەبو تورکمانی تێدابوو. کوردەکە یەکێکیان ناوی (مارف)و خەڵکی دەوری ماوەت بوو. ئەوی دیکەیان ناوی (جەبار)و خەڵکی سلێمانی بوو. (مارف) لەسەر دزیی حوکمدرابوو. جەباریش هەر لەسەر دزیی و ژنبرای (بورهان)ی سەر بە ئەمنی سلێمانی بوو. مارف شێخ بوو، پیاوێکی لەسەرخۆو باشبوو، نازانم چۆن دزیی کردبوو لەسەر دزیی دەستگیرکرابوو؟ هەڵسوکەوتی لە کەسێکی دز نەدەچوو. زۆر لەسەر خۆو هێمن بوو. جێگاکەی من کەوتە نێوانی قەرەوێڵەکەی ئەو و قەرەوێڵەی کوڕێکی تورکمانەوە. دەبوو لەسەر زەوی جێگا داخەم و بنووم و بەشەو دەبوو درەنگ جێگاکەم دابخەم و بە ڕۆژیش دەبوو هەر لەخەو هەستام جێگاکەم هەڵگرم و بیخەمە ژێر قەرەوێلەکەی مارفەوە. مارف نەیدەهێشت من لەسەر ئەرز بنووم، قەرەوێڵەکەی بۆ چۆڵ دەکردم. مارف لەگەڵ (کاك محەمەد وسوی هەڵەبجەیی) سەفەرداش بوون، واتە بەیەکەوە نانیان دەخوارد. کاکە حەمە هەر کە دانیشتین، خۆی پێناساندم. کە لە سەردەمی شەستەکانداو لە شۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بووبوو. لەکاتی جیابوونەوەی باڵی (م.س) لە ساڵی ١٩٦٤، لەگەڵ ئەو باڵەدا بووەو وەکو حیمایەی (شێخ حەمەئەمین هەڵەبجەیی) بە بەردەوامی لەگەڵ حیمایەکانی (هەڤاڵ مام جەلال) دا بووبوو. (مام جەلال)ی زۆر خۆشدەویست، لەسەر ئەوەی کە لەگەڵ مام جەلالدا بوو کێشەی زۆر تووشبووبوو. لە یەکەم دانیشتنماندا باسی خۆی و چۆنێتی گرتنەکەی بۆ کردم. ئەو ڕووداوەی ئەوی تێدا گیرابوو، چەند ساڵێك پێش گرتنمان لە هەڵەبجە ڕوویدابوو. من ڕووداوەکەم بیستبوو. ئەوکاتە ئەو ڕووداوە بە ڕووداوێکی سەیرو ئازایانە سەیر دەکرا. کەسێکی دووکاندار لەناو بازاردا لەسەر هەقی خۆی هێرش بکەنە سەری و ئەویش لە بەرامبەر ئەو هێرشە نارەوایەدا دەمانچە هەڵکێشێت و پیاوێکی حکومەت بە ناوی (زەمان) بکوژێت، کە (برای ڕەشەی ساڵحە)ی جاش بێت.

لەگەڵ ڕووداوەکەدا خۆی بگەیەنێتەوە ماڵەوە، بڕیاری بەرگریی و بەرەنگاربوونەوە بدات.

سوپا به مدرەعەو دەبابە چواردەوری ماڵەکەیان بگرن بە مەبەستی گرتنی، خۆی نەدا بەدەستەوە، تا بەڵێنی پێ نەدەن کە هیچی لێناکەن، ئینجا خۆی بەدەستەوە بدات. (کاکە حەمە) لەسەر کوشتنی ئەو جاشە دوای چەند جەلسەیەکی مەحکەمەو سووربوونی خۆی لەسەر ئەوەی کە خۆی کوشتوویەتی، بە (١٥) ساڵ حوکمدرابوو.

مارفیش لەسەر دزییەکەی (١٠)ساڵ حوکمدرابوو، منیش بە بڕیاری مەحکەمەی سەورە بە حوکمی موئەبەد حوکمدرابووم. کاکە حەمە بووە هاوڕێیەکی بەکەڵك و خەمخۆری زیندانم و بوومە سەفەرداشیان.

ئەبوغریب
مانگی ١٢/١٩٩٠

## -٢-

# بەشی (٨)، چۆن بوو؟

بەشی (٨) لە خوارەوە (١٠) ژوورو لە قاتی سەریشەوە (١٠) ژووری تیدایە، جگە لە ئاودەست و حەمامی گشتیی و ژووری موراقیب. هەر ژوورە (٧) قەرەویلەی تیدایە، بەلام کەم ژوور هەیە لە (١٠) زیندانیی کەمتری تیدابیت، هەموو ژووریك حەمامی تیدایە، بۆ خۆشۆردن و جلشۆردن.

بەشەکە دوو دەرگای هەیە. دەرگای سەر رارەوی چوونەدەرەوە، کە دەرگایەکی گەورەیە. رۆژانی چوونە دەرەوە بۆ ساحەکە، زیندانییەکان لێوەی دەچنە ساحەو حەوشەی گەورەی بەندیخانە، هەموو بەیانی و ئیوارەیەکیش بۆ مەستەر رۆژانی مواجەهەکان و هاتوچۆی ئیدارەو چوون بۆ دەورەکان و حانووت و نەخۆشخانە دەکریتەوە. دەرگایەکی دیکەی لەسەرەوە تیدایە. دەچیتە سەر حەوشەی بەشەکە، حەوشەکە پانتاییەکی گەورەیە، لەنیوانی بەشی (٧و ٨)دایە. بەیانییان دەکریتەوە تا ئیوارە داناخریٚ، کلیل لای (موراقیب)ە. لەم ساحەیە خواردنی هەموو زیندانییەکانی لێیە. کە هەرهەمووی لە فلینەی پر لە سەهۆلدا پاریزرابوون. زیندانییەکان بەپێی گونجانیان لەگەڵ یەکدا دوو دوو و سیٚ سیٚ و تا چوار چوار ریککەوتوون و بوونەتە (سەفەرداشی) یەکترو بەیەکەوە نان دروست دەکەن و دەخۆن. فلینی هەر گرووپیك لەلایەکەوە ریزکراوە، هەر گرووپە سەرەگۆزان و بتلی غازو قاپ و قاجاغی تەواویان هەیە. لە قاتی خوارەوەی بەشەکە لەسەری ئەوسەری تەلەفزیۆن دانراوە، شەوانە زیندانییەکان کورسی دەبەنە بەردەمی و کۆدەبنەوە، تا درەنگ سەیری تەلەفزیۆن دەکەن.

لە حەوشەکەوە دەتوانریٚ قسە لەگەڵ زیندانییەکانی بەشی حەوتدا بکریت... (کاکە حەمە) لە ژووری (٥)ە. شوینەکەی زاوییەیە. بەزۆریی دەچمە ژوورەکەی دادەنیشم.

ئەوەی دەبیت باسی بکەم و لەبیرم نەچیت ئەوەیە، کە لەم بەشەدا جۆرەها زیندانیی تیدا کۆبووەتەوە، لە کوردو عەرەب و تورکمان، جگە لە ژوورەکان لە تارمەی سەریشەوە زیندانیی دانراون. لەو هەموو زیندانییە تەنها (من و بەختیار) لەسەر بیروباوەری سیاسیی دەستگیرکراوین، ئەوانی دیکە لەسەر تاوانی جۆراوجۆری وەکو (دزیی، پیاوکوشتن، دەستدریژیی بۆ سەر کچ و دایك و براژن و پوورو فراندنی خەلکی) زیندانیکراون، هەیانە زیاتر لە (پەنجا) دەعوای هەیە. هەر دەعوایە کە بۆ مەحکەمە بانگیان دەکەن، بەچەند سالیك حوکم دەدرین، ئەوەی زۆرباش لەبیرمە، زیندانییەك ناوی (تەموز)ە، خەلکی بەغدایە، تا ئیمە

چووین بە (پانزە دەعوا) حوکمدرابوو، مانگانەش بۆدەعواکانی دیکەی بانگی دادگا دەکریٚ و حوکمی دیکەی بە سەردا دەدەن. ئەو دزییانەی کردوونی بەزۆریی لە ماڵە بەرپرسەکانی بەعس و حکومەت بوون... هەرجارێك بیبەن بۆ مەحکەمە، کە دەگەڕێتەوە هەواڵی دەرەوەی زیندان و کوردمان بۆ دەهێنێتەوە، بەشەکە گەورەو دوو قاتە. ژوورەکان بەمبەرو ئەوبەری بەشەکەوەن، سەری بەشەکە لەسەر قاتی دووەمە. قاتی یەکەم سەقفی بۆ نەکراوە. بە چواردەوری بۆشایی بەشەکەدا لە قاتی سەرەوە موحاجەرەی ئاسنە. لە دوو لاوە بە پلیکانە بۆی سەردەکەوین، ژوورەکان (٢٠) ژوورن. هەموو ژوورێك پەنجەرەی بەدیوی دەرەوە تێدایە. بە چواردەوری بەشەکەشدا لە قاتی سەرەوە پەنجەرە هەیە. کارەبای بەردەوام و ئاوی باشی هەیە. ڕۆژانە نیوەڕۆو ئێوارە خواردنی (کانە) دەهێنن، چەند کەسێکی زیندانیی بەتایبەتی ئەوانەی زۆر مابوونەوەو مواجەهەیان نایەت، یان هەیە لەبەر بێکەسیی و ڕەفتاری خراپی، کەس نایەت بۆ مواجەهەیان، وەری دەگرن، ئەوانی دیکە وەری ناگرن، لە خواردنی خۆیان خواردنی سێ ژەمە دروستدەکەن و دەخۆن. زۆر ڕۆژ میوەو سەوزەو تەماتەو بامیٚ و باینجان و کولەکە بە عەرەبانە بە ڕارەوی بەش و ڕەدهەکاندا دەگەڕیٚ بۆ فرۆشتن، زیندانییەکان لێیان دەکرن. لەناو زیندان حانووت هەیە. هەر پێویستییەکمان هەبێت، دەچین لە حانووت دەیکڕین. لە ساحە (واتە حەوشەکە) سیٚ ژەمە هەر جەماعەتێك خواردن بۆ خۆی دروست دەکات، یان گەرم دەکاتەوە...

هەفتەی چەندجار سەرجەمی دەرگای بەش و ڕەدهەکان دەکرێتەوە، زیندانییان دەچنە ساحە، واتە حەوشە گەورەکەی بەندیخانە، زۆربەی زیندانییانیش شتی جوان جوان و دەگمەن دروستدەکەن و دەیانفرۆشن. ئەگەر سەرنج بدەیت لەو ڕۆژانەی ساحەو ڕۆژانی مواجەهە (هەفتانە بازاڕێك) یان (مەزاتخانەیەك)ە بۆخۆی. (کاکە حەمە) یەکێکە لەوانەی بازاڕ دادەنیٚ و پیلی سەعات و زۆر شتی دیکەی وردە دەفرۆشێت، شتەکانی لە دەرەوە کوڕەکەی لە مواجەهەکاندا بۆی دەهێنێت، (کاکە حەمە) کاسبییەکی زۆر باش دەکات، زۆر حەزی لە جووڵان و ئیشکردنە. ڕقی لەوانە دەبێتەوە کە تەمەڵ و تەوەزل دادەنیشن و هیچ ناکەن و بە زۆریی دەخەون، کاکە حەمە هەر بۆئەوەی زیندانییە کوردەکان، بە تەمەڵی شەو و ڕۆژ لە بەندیخانەدا بەسەر نەبەن، پارەیان دەداتیٚ، بۆئەوەی کاربکەن و زۆریان پارەکەی دەخۆن، هەشیانە دوای ئەوەی بە پارەکەی ئەو پارەیەك پەیدادەکات، پارەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، لەم بەندیخانەیەدا چەند دیاردەیەك هەیە، کە کاری ڕاستەوخۆی لە کۆمەڵێك زیندانیی کردووە. (حەبخواردن) یەکێکە لەو دیاردە دزێوانەی کە زۆرێك لە زیندانییە گەنجەکان پێوەی ئالوودەن، دەتلێنەوەو ئیدمانیان لەسەر کردووە، کاریگەریی ئەو (ئیدمانی حەبانە) بەشێوەیەکە، کە زۆریان کەسێتی خۆیان لەدەست داوە بەردەوام دەنوون و وەکو بێهۆش وان، ئاگایان لە هیچ نییە. حەبەکە کۆمەڵێك کاسبی پێوە دەکەن، بەدزیی سەجانەکانەوە دەیفرۆشن و حەبەکانیش بەزۆریی لەکاتی مواجەهەکاندا. بەجۆرەها ڕێگا دەیانگەیەننە ناو بەندیخانەو دەست زیندانییەکان دەکەوێت. هەندێك لە سەجانەکانی

بەندیخانەش بەنهێنی کار بۆ هێنانی حەب و دابەشکردنی دەکەن. ڕۆژانە لە پەنجەرەی بەش و ڕەدهەکانەوە، کە لەسەر حەوشەی نێوانیانە. حەبخۆرەکان حەب لە حەبفرۆشەکان دەکرن. (بەڕێوەبەرێتیی بەندیخانە) بەردەوام لە حەبخۆرو حەبفرۆشەکان دەپرسێتەوەو دەگرێت و دەیانباتە مەحجەرو بۆ چەند ڕۆژێك دەیانهێڵێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی فێری بوون، مەحجەرو لێدانیش چارەی ناکات، هەر لە مەحجەر دێنە دەرەوە دەستپێدەکەنەوە.

دیاردەیەکی دیکە هەر بەهۆی ئەو حەبەوە ڕەفتاری زیندانییەکانی تێکداوە. کاتێك دەزانیت یەکێك بەلەسە دەبێت. چەند لەتێك گوێزان لە قاوغە شقارتەیەکدا ڕێکدەخات، وەکو شێت پەلاماری زیندانییەکان دەدا، بەو مووسە دەموچاو و گیانیان بریندار دەکات و دەیکا بە خوێن یان بەو مووسە بەردەبێتە گیانی خۆی و لەشی هەموو لەتلەت دەکات.

- قومارکردن: دیاردەیەکی دیکەیە. زۆرێك لە زیندانییەکان لە ژوورێك کۆدەبوونەوەو قومار دەکەن و قومارەکە زۆرجار کێشەی گەورە لەنێوان زیندانییەکاندا دروست دەکات، بەبۆنەی بردنەوەو دۆراندنەوە. بۆ ئەمەش زۆریان لە مەحجەر زیندانیی دەکرێن و سزا دەدرێن. بەڵام بێهودەیە.

-(نێربازیی): نێربازیی دیاردەیەکی زۆر دزێوو ناشیرینە. کۆمەڵێك گیراو، ماوەیەکە لە بەندیخانەدان. لە گیراوەکان هەیانە دەوڵەمەندە. هەر کوڕێکی گەنج بهێنرێتە ناو بەندیخانە، هەر زوو دەچن بەپیرییەوەو پێش ئەوەی چاوی بکرێتەوە، بە جۆرەها ڕێگا لەخشتەی دەبەن و کاری هەتیوبازیی لەگەڵدا دەکەن. لە بەندیخانەدا هەیە بەهۆی دەوڵەمەندییەکەیەوە، گەنجێك دەگرێت، کە ڕۆژانە خزمەتی بکات و مانگانە پارەی دەداتێ، هەیانە ئەو گەنجە بۆ دوو شت بەکاردەهێنێت، یەکەم: بۆ خزمەتکردنی خۆی، دووەم: بۆ کاری سێکسی. زۆرجار لەسەر ئەوگەنجانە هەراو ناخۆشیی لەنێوانی هەتیوبازەکاندا ڕوو دەدا، بەهۆی ئەوەی هەریەکەیان دەیانەوێت بۆ خۆیانی بەرن.

لەگەڵ ئەم دیاردە دزێوانەشدا هەندێك کاری باش لەناو زیندانییەکاندا بەدیدەکرێت و دەیانکەن.

-(ئیشی دەست) کۆمەڵێك زیندانیی شەو و ڕۆژ لە ژوورەکانیان خەریکی کاری دەست و دروستکردنی شتن، وەکو: جزدان، نووقلدان، گوڵدان، ملوانکە، شتی سەیرسەیر بە پوولەکە، زەنگیانە، ئەو شتانەی دروستی دەکەن لە ڕۆژی مواجەهەکاندا لە ڕارەوەکە دایدەنێن و دەیان فرۆشن، یان دەیاننێرێنە دەرەوە بۆ بازارەکان.

-(کاری هونەری شێوەکاریی) زیندانیی هەیە خاوەنی بەهرەی هونەری شێوەکارییە، بۆئەوەی بەهۆی گیرانەکەیانەوە هونەرەکەیان نەمرێت، لەناو بەندیخانە کاری هونەری شێوەکاریی دەکەن، چەندین تابلۆی جوان و سەرنجڕاکێش دروستدەکەن، لە ڕۆژانی مواجەهەکاندا دەیانفرۆشن. (عوسمان مەحوی) یەکێکە لەو زیندانییە شێوەکارانە کە وێنەیەکی (شێخ مەحمود)ی بۆ دروستکردم.

-(بازارو وردەفرۆشیی و چەرچیتی) ژمارەکی زۆر لەزیندانییەکان دووکانێکی بچووك لە سندووقێکدا دادەنێن، رۆژانی ساحەو مواجەهە وەکو چەرچی دەستگێڕ شتەکانیان دەفرۆشن و هەریەکەیان بۆ خۆیان بازارێکی باشیان هەیە.

ئەمجۆرە کارانە لەناو بەندیخانەدا وای کردووە، کە ئەوانەی سەرقاڵی ئەو کارانەن، پێویستیان بە کەسوکاریان نەماوە، تا مانگانە خەرجییان بۆ بنێرن، بە پێچەوانەوە ئەوانە خەرجیی ماڵیان بۆ ماڵ و منداڵیان دەنێرنەوەو یارمەتی کەسوکاریان بە باشی دەدەن.

لەگەڵ ئەمانەشدا زۆرێك لە زیندانییەکان ئەوانەی خوێندەوارن، یان نووسەرو رووناکبیرن، بەپێی بەرنامەیەك بەرنامەی خوێندنەوەیان بۆخۆیان داناوە. بە بەردەوامی دەخوێننەوە. هەشیانە نووسەرو وەرگێڕن، خەریکی نووسین و وەرگێڕانن. لەناو بەندیخانە کتێبخانەیەکی باش هەیە. جۆرەها کتێبی تێدایە. بە ئیستعارە دەدرێ بە زیندانییەکان بۆ خوێندنەوە، هەشە لە دەرەوە کتێبیان بۆ دەهێنن.

- دەورەکان لە بەندیخانە جارجار دەورە بۆ زیندانییەکان لەچەند بواردا دەکرێتەوە.

وەکو (دەورەی شوفێریی، دروومان، دارتاشیی و شتی دیکە) زۆر زیندانیی ناوی خۆی بۆ دەورەکان دەنووسی، بەپێی ماوەی دەورەکە دەوام لە دەورەکاندا دەکەن. ئەو دەوامی دەورانەش کارێکی زۆر باشە، بۆ زیندانییەکان لە چەند روویەکەوە. یەکەم: زیندانییەکان فێری ئەو پیشەیە دەبن کە دەورەکەی تێدا دەبینی، کە لە زیندان ئازاد بکرایێت بە پیشەیەکەوە دەچێتە دەرەوە. دووەم: ئەو ماوەی دەورەیە زیندانییەکە سەرقاڵی دەورەکەو کۆششکردن دەکات، کە دەبێتە هۆی ئەوەی بیر لە کاری لابەلا نەکاتەوە. سێیەم: بەهۆی دەورەکەوە دۆست و هاوڕێی پەیدا دەکات لە بەش و ڕەدهەکانی دیکە، کە دەچنە دەورەکەو ئەو هاوڕێیەتی و دۆستایەتییە بۆ زیندانییەکان کاریگەریی باشی لەسەریان دەبێت. چوارەم: لەماوەی دەورەکەدا رۆژانە لە کاتژمێر هەشتی بەیانییەوە تا (١)ی نیوەرۆ لە بەش و ڕەدهەکانیان دەچنە دەرەوە بۆ دەوام و ئەو چوونەدەرەوەو دەوامکردنە چاوکرانەوەو بای باڵێکی باشە بۆ زیندانییەکان.

## لە ژووری (١٠)ەوە شارەزای بەندیخانەی ئەبوغرێب بووم

وەکو لەپێشەوە باسمکردووە، کە لە ڕەدهەی یەکی ئیستقبالەوە بەسەر بەش و ڕەدهەکاندا دابەشیان کردین، (من و بەختیار عومەر) بەر بەشی هەشت کەوتین، کە ڕێك بەرامبەری ڕەدهەی یەکە. هەر چووینە بەشەکە کاك محەمەد وسوی هەڵەبجەیی و چەند کوردێکی دیکە بەپیرمانەوە هاتن و پێشوازییان لێکردین، موراقیبی بەشەکەیان بانگکرد، بۆئەوەی شوێنمان بداتێ. موراقیبی بەشەکە وەکو بەرپرسێکی بەشەکەیە، لە بەندیخانەکەدا، قسەی دەڕواو دەسەڵاتی خۆی هەیە. بۆ هەموو شتێکی بەشەکە لەلایەن ئیدارەوە بانگ دەکرێت، لەکاتی مەستەرەکاندا ئەو ئاگاداری زیندانییەکان دەکات، دەیزانێت لەکام ژوور جێگا چۆڵە، یان چ جۆرە زیندانییەکی تێدایە، زیندانییەکان بەباشیی دەناسێ و دەیزانێت کام ژوور باشەو بۆ زیندانیی خۆشە. بۆیە کە بانگیان کرد پێیان وت شوێنی باشمان بداتێ... موراقیبەکە تورکمان و خەڵکی کەرکوکە، کوردییەکەی وەکو خۆمانە، وتی: پێم باشە جارێ تا شوێنی باشیان بۆ دەدۆزمەوە، مامۆستا بچێتە ژووری (١٠)و بەختیار بچێتە ژووری یەك.

کە چوومە ژووی (١٠) سەیردەکەم حەوت قەرەوێڵەی تێدایەو هەرکەسە لە ئاستی قەرەوێڵەکەی ژوورەکەی ڕازاندۆتەوە. بە قەرەوێڵەکانەوە (٩) زیندانیی تێدایە. بە منەوە بووین بە (١٠) زیندانیی. منیان خستە نێوانی دوو قەرەوێڵەوە، کە یەکێکیان لای دیوارەوەیە، زیندانییەکی تورکمانە و ئەوی دیکەش لە ناوەڕاستدا زیندانییەکی کوردە. زیندانییەکانی ژوورەکە یەك تورکمانەو بەمنەوە (٣) کوردین (٦) عەرەبن. کوردەکان خەڵکی پارێزگای سلێمانین، عەرەبەکانیش هەر یەکەیان خەڵکی شوێنێکن، تورکمانەکەش کەرکوکییە. کوردەکان یەکێکیان ناوی (مەعروف و بە شێخ مارف) بانگ دەکرێت، کەوتوومە نێوانی ئەو و تورکمانەکەوە، دەبێت من جێگاکەم لەسەر ئەرز بێت و سیستەمی ژوورەکە وایە، دەبێت شەو کاتی خەوتن جێگاکەم دابخەم و بەیانی زوو هەڵیبگرم و کۆی بکەمەوە. کە کۆی دەکەمەوە، دەیخەمەوە ژێر قەرەوێڵەکەی (شێخ مارف). مارف لە پارێزگای سلێمانی خەڵکی ناوچەی ماوەتە. بەهۆی ڕاگواستنەوە ماڵەکەیان چووبووە بازیان خێزندارە. بە تۆمەتی دزیی بۆماوەی (١٠) ساڵ حوکمدراوە. ئەوەندە پیاوێکی سەلارو ڕێکوپێك و لەسەرخۆو بەئەدەبە. باوەر ناکرێت کە ئەوپیاوە دزیی کردبێت و لەسەر دزیی حوکمدرابێت، یان پەنای بۆ دزیکردن بردبێت... ئەوەندەی لە ژوورەکە بووم ڕێگای نەدا من لەسەر ئەرز بنووم، دەبێت لەسەر جێگاو قەرەوێڵەکەی ئەو بخەوم. (شێخ مارف) لەگەڵ (کاکە حەمە)دا سەفەرداشی یەکن. کاکە حەمە لە ژووری پێنج و لەسەری ئەوسەری بەشەکەیە. منیشیان کردە سەفەرداشی خۆیان. ئەوان هەموو شتێکیان هەیە. خواردن و شتی وشکەی وەکو برنج، نیسك، ڕۆن، چا و شەکر، هەروەها بتلی غاز، فلیین، قاپ، قاچاغی چێشتلێنان، نانخواردن، قۆری و پیاڵەی چاخواردنەوەیان هەیە... ئەو چەند ڕۆژەی پێش مواجەهە میوانی ئەوانم لەگەڵ ئەواندا

نان و چا دەخۆم. فلینەکانیان پڕن لە گۆشت و سەهۆڵ و جۆرەها خواردن و میوە، کە لە مواجهەکاندا بۆیان هاتووە.

کوردەکەی دیکە ناوی (جەبار)ەو خەڵکی سلێمانییە. یەکێکە لە قوتابییەکانم لە ناوەندیی زانستیی و وازی لە خوێندن هێنابوو. کە چووینە بەشو ژوورەکەیان یەکەمجار وەکو قوتابییەك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردم. ژنبرای (بورهان)ناوێکە، کە پێش گیرانم لە گوزەری قەیسەری نەقیب و گوزەرەکانی دیکە لە بازاڕی سلێمانی رۆژانە دەمبینی سەر بە دائیرەی ئەمن بوو، بەناوی ئەمنی ئیقتیسادەوە، ئازاری خەڵکی دەدا، سەرانەی لە خەڵك دەسەند، رۆژانە نانی لەسەر حیسابی خەڵکی بازاڕ دەخوارد، خەڵکی وەڕس کردبوو، زۆربەی دووکاندارەکان رقیان لێبوو، هەر کە پەیدادەبوو. دووکاندارەکان دەیان وت پەیدابووەوە. بەکورتی پیاوێکی خراپ بوو. ئەویش دەستگیرکرابوو. لە یەکێك لە رەدهەکاندا بوو. (جەبار) لەگەڵ ئەودا دەستگیرکرابوو، کە لەسەر دزیی دەستگیرو حوکمدرابوون، کە پێی وتم من ژنبرای ئەوم و لەگەڵ ئەودا دەستگیرکراوم، یەکسەر ئیستێکم کرد، کە لێرەش دەبێت لەم جۆرە کەسانە دوور بکەوینەوەو تێکەڵاویان نەبین، چونکە ئەم جۆرە کەسانە لە هەموو شوێنێك هەر دەبنەوە بە پیاوی ئەمن و رژێم. (کاکەحەمە) کاتێك ئێمە لە رەدهەی یەکی ئیستیقبال بووین، لە کونی دیواری سەر حەوشەی ئیستیقبال خۆی پێ ناساندم و رۆژانە چەند جۆر خواردن و میوەی بۆ دەهێناین، رۆژێکیش (قالە جافی) لەگەڵ خۆی هێنابوو، کە لەو کونانەوە قسەی لەگەڵ کردم و یەکترمان ناسییەوە، کە زانی لەسەر (یەکێتی) گیراوین، خۆشیی پێمان نەدەهات، وتی: ئێوە لەسەر (جەلالی و یەکێتیی) گیراون، (کاکەحەمە) یەکسەر لێی هاتە جواب و پێی وت: جا (جەلالی و یەکێتیی) چییانە؟ بۆ پیاو هەیە لە کوردستاندا شان بدات لە شانی (مام جەلال)، پێی وت: عەیبە ئەو قسەیە دەکەیت و لێی تووڕە بوو، ئیتر (قالە جاف) نقەی نەکردو رۆیشتن، من و قالە جاف زۆر بە باشی یەکمان دەناسی، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کێم و کوری کێم و خەڵکی کوێم، بەڵام لەخۆی نەگرت لەو رۆژانەدا هیچ جۆرە خواردنێکمان بۆ بهێنێت و جارێکی دیکە سەرم لێبداتەوە. ئەوەش لەبەر ئەوەبوو، کە ئەوکاتەی ئەو جاش بوو، لەگەڵ پێشمەرگەدا لە گەرەکی خەبات بەیەکدا هەڵپژابوون، پێشمەرگەیان شەهید کردبوو، لەوانیش جاش کوژرابوو، بەو هۆیەوە بوو بووە دوژمنی سەرسەختی یەکێتیی، بەڵام (کاکەحەمە) هەر چووینە بەشەکەیان، یەکسەر هات بۆلام هۆی دەستگیرکردن و چۆنیێتی گرتنی و حوکمدانەکەی (بۆ باسکردم). (کاکەحەمە) بە (١٥) ساڵ حوکمدراوە.

زیندانییە عەرەبەکانیش هەریەکەیان بە تاوانێکی دزیی و پیاوکوشتن حوکمی جۆراوجۆر دراون. لە ناویاندا پیاوێك هەیە، پێی دەڵێن (ئەبو عەباس) بە تاوانی پیاوکوشتن حوکمدراوە. (رەیس عورەفای شورتە)ە، پیاوێکی هەڵسووڕاو و بەدەمو پل و کراودیە، رۆژانەو شەوانە کار دەکات، بۆئەوەی خۆی لە بەندیخانەو منداڵەکانیشی لەدەرەوە بژێنێت. هەرچوومە

ژوورەکەیان و زانی لەسەر بیروباوەری سیاسیی کورد دەستگیرکراوم، کەوتە مامەڵەیەکی تایبەت لەگەڵمدا، هەستدەکەم ڕێزی زۆرم لێدەگرێت، دەیەوێت لەهەموو ڕوویەکەوە یارمەتیم بدات. دوای ماوەیەك مانەوەم لە ژوورەکەدا زیاتر لەیەك نزیکبووینەوە. زۆر ڕۆژ عەسران لە ساحەکە بەیەکەوە لەگەڵ (کاکە حەمەو شێخ مارف)دا پیاسە دەکەین. سەبارەت بە وەزعی بەندیخانەو کوردیش قسە دەکەین، دیارە لەگەڵ کاکەحەمەدا متمانەیەك لەنێوانیاندا هەیە، بۆیە لەیەك ناترسن و بەئاشکرا قسە لەسەر حکومەت دەکەن. کە بەتەواویی لە منیش شارەزا بوو، کە یەکێکم لەسەر مەسەلەی شۆڕشی کوردو گەلەکەم دەستگیرکراوم، ترسی لێم نەما، وەکو هەندێك لە زیندانییە کوردەکان کە لەناو بەندیخانەدا خۆیان ناشرین کردووە، تەنانەت زیندانییە عەرەبەکانیش لێیان دەترسن و دەیانبیترێنن و بە کەسانی خراپ سەیریان دەکەن. بۆیە ئەو ڕۆژانەی کە بە جووتە دەچینە ساحەکەو بەیەکەوە پیاسە دەکەین، یان لەکاتی خواردن ئامادەکردندا، کە دەچینە ساحەکە. دەست دەکات بە کفرکردن و قسە بە میللەتی خۆیان دەڵێت، دەڵێت: (ئایین درۆیە، خوا نییە، پێغەمبەر نەبووە. عەرەب مرۆڤ نییە، ویژان و مافی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هەر هەمووی درۆیە، نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و زەکات و سەرفترەدان هەرهەمووی زیادەیەو پێویست ناکات پیاو بەجێیان بگەیەنێت. ڕۆژوو و نوێژ بۆچی و بۆ کێی بکەم؟ ئەم قسەکردنەی ڕۆژانە دووبارەو سێبارە دەکاتەوە. لام سەیرە، ئەم پیاوە تەمەنێکی هەیە، خوێندەواریی ئەوتۆی نییە. ئیسلام و عەرەبە، لە سلکی شورتەدا بووە، لەسەر بیروباوەری سیاسیی نەگیراوە. بۆ وا بەهەموو شێوەیەك دژی ئەو شتانە وەستاوەو باوەری بەهیچیان نەماوە؟!

### ئەبو عەباس و ئەنفال

ڕۆژێك عەسر بەجووتە لە ساحەکە بەگیرم هێناو لێم پرسی: (ئەبو عەباس) تۆ بۆ وا (دژی ئایین و عەرەب) قسە دەکەیت؟ تۆ عەرەبیشی و ئیسلامیشی، هەر دەم هەڵدەهێنیتەوە بێباوەریی خۆت دەرحەق بەوانە رادەگەیەنیت؟ پێم ناڵێیت ئەم حاڵەتە چییە؟ تۆ پێش دەستگیرکردن لە (حزبی شیوعی) یان حزبێکی تر کارت کردووە؟ وتی: لەژیانمدا نەمزانیوە حزبایەتی چییە. لەبەرئەوەی شورتە بووم بە بەعسی ناویان نووسیبووم و ئابوونەیان لە مووچەکەم دەبری، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان نە کۆبوونەوەم کردووە، نە زانیوومە حزبی بەعس چییە. وتم: باشە هۆی ئەم دژایەتیکردنەت بەرامبەر بەوانە چییە؟ حەز دەکەم بۆم باسبکەیت. وتی: (ئەبو بەخشی) لێمگەری، تەنها پەیوەندیی بەخۆمەوەیە وازم لێبێنە. کە زانی وازی لێناهێنم، وتی: مامۆستا بۆت باسدەکەم، بەڵام نابێت لەم بەدیخانەیە لای هیچ کەس باسی بکەیت، تەنانەت لای (کاکەحەمەو مەعروفیش)، چونکە کاکەحەمە قسەی لەدەمدا

ناوەستێت و باسیدەکات. متمانەم بەتۆ هەیە وەکو ئەو کارەساتەی بینیومە بۆت باسدەکەم و تۆش لای خۆت بیپارێزە، چونکە ئەگەر ئەوەی من بۆت باسدەکەم، بکەوێتە دەم دەزگاکانی حکومەت و بزانن من باسم کردووە، هەر لەم بەندیخانەیەدا ملم لێدەکەنەوەو دەمکوژن.
وتم: بەڵێنت دەدەمێ لەخۆم بەولاوە ناهێڵم یەك کەس بیزانێت و لای هیچ کەسێك بەهیچ شێوەیەك باسی ناکەم، دڵنیابە لای کاکەحەمەش قسەناکەم.
کەوتە قسەکردن و وتی: گوێم بەباشی لێبگرەو جابزانە تۆش بیت وەکو منت لێنایەت؟
هەر کەوتە گێڕانەوەی کارەساتەکە، بینیم رەنگی گۆڕا، (رقی هەڵسا) بەدەم قسەکردنەوە (تفی لە عەرەب و ویژدانی عەرەب دەکرد، دەیوت عەرەب نە میللەتە، نە ئیسلامە، نە فڕی بەسەر مرۆڤایەتییەوەیە، ئەم حکومەتەی ئێمە دڕندەترین حکومەتە لەسەر رووی زەوی. من تا ئەوکاتەی ئەو کارەساتەم نەبینیبوو، نوێژم نەدەچوو، یەك رۆژی رەمەزانم نەدەخوارد. زەکات و سەرفترەم دەدا، بەنیازبووم بچم بۆ حەج، بەڵام لەو رۆژەوە وازم لە هەر هەمووی هێناوەو بە توخنیانا ناچم و باوەڕم پێیان نەماوە، نابینیت نوێژ ناکەم؟
دوای ئەم قسانە هێور بووەوەو وتی: (ئەبو بەخشی) بەباشی گوێم لێبگرە دەخیلت بم لای کاکەحەمە باسی نەکەیت. وتی: دەزانیت حکومەت لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا وڵاتەکەتانیان وێرانکردو هەزاران خەڵکی دانیشتووی گوندەکانتانی راپێچی سەربازگەو گرتووخانەکانی کرد؟. وتم: ئەوە راستەو حەزدەکەم تۆ بزانیت نزیکەی پێنج هەزار گوندمان خاپوور کراوە، هەرچی کانی و کارێزو گۆڕستانمان هەیە تەقێنراونەتەوە (١٨٢) هەزارمان ئەنفال کراوە...
ئێمە دەستمان لەو هەزاران کەسە شۆردووەو بەتەمایان نەماوین. بۆمان ساغبووەتەوە کە هەموو وڵاتانی عەرەبی پشتگیریی لە حکومەتی عیراقی دەکەن، ئەو قڕکردن و لەناوبردن و خاپوورکردنەی وڵاتەکەمان کە لەلایەن حکومەتەوە ئەنجامدراوە، بە رەواو حەقی حکومەتی عیراقی دەزانن. ئەو بڕیاری لەناوبردنەمان نە بەتۆو نە بەمن چارەسەر ناکرێت. پڕ بەسنگی هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو دەستی بە قسەکردن و گێڕانەوە کردەوەو وتی: من (رەییس عورەفای پۆلیس بووم) لە ساڵی (١٩٨٨)دا دەوامەکەم لە ناوچەی عەرعەرو سنووری سعودیە بوو، دوای تەواوبوونی قۆناغەکانی ئەنفال و زاڵبوون بەسەر بزووتنەوەکەتاندا، ماوەی چەند هەفتەیەك (بەردەوام) رۆژانە بەچەند (ماشێنی مونشەئەی گەورە)ی پڕ لە ژن، منداڵ، مێردمنداڵ، گەنج و پیری کوردیان دەهێناو پێش هێنانیان بە حەفارە چاڵی گەورە گەورەیان بۆ هەڵدەکەندن و ئامادەیان دەکرد، لەگەڵ مونشەئەکاندا ئەفسەرو سەربازیان دەهێنا، لەو شوێنەش کۆمەڵێك ئەفسەرو سەرباز بە چەکی کلاشینکۆفەوە ئامادە دەکران. کاتێك مونشەئەکان دەگەیشتنە شوێنەکەو رادەوەستان. یەکسەر هەرچی تێدابوو، دایان دەبەزاندن و ریزیان دەکردن. ئەفسەری لێپرسراوی سەربازەکان، یان بڵێین (جەللادەکان) فەرمانی دەدا بە سەربازەکان دەسترێژ لەو خەڵکە داماوە بکەن، گوللەبارانیان بکەن، لەگەڵ فەرمانی دا هەر سەربازی چەك بەدەست بوو، بە تفەنگەکەی دەستیان گوللەبارانی ئەو

خەڵکە هەژارو رەش و رووتەیان دەکرد. خەڵکەکە بەدەم گریان و هاوارو ئاخ و ئۆفەوە خەڵتانی خوێن دەکران، بەسەر یەکدا دەکەوتن و جەستەیان لەگەڵ خوێن و خۆڵدا تێکەڵاو دەبوو، جەللادەکانیش تا دوا فیشەکی چەکەکانیان تەقەیان لێدەکردن. دوای ئەنجامدانی ئەو تاوانە نا مرۆڤانەیە، بە شۆفڵ و گرێدەر فرێیان دەدانە ناو چاڵەکانەوەو خۆڵیان بەسەردا دەکردن، کە زۆربەیان هەر زیندوو بوون و بە هاوار هاوارەوە بەسەر دەمی شۆفلەکانەوە بۆ ناو چاڵەکان شۆڕدەکرانەوەو بەزیندوویی و بەبێ ئەوەی گیانیان دەربچێت، دایان دەپۆشین و زیندەبەچاڵیان دەکردن، دوای ئەنجامدانی تاوانەکە دەگەڕانەوە، ئەم تاوانە نامرۆڤانەیەم رۆژانە بەچاوی خۆم دەمبینی، لە پێش چاوم ئەنجامدەدراو رۆژانەش دووبارە دەکرایەوە.

لە رۆژانی ئەنجامدانی ئەو تاوانانەدا (دوو) رووداوی زۆر سەیرم بینیوە، هەرگیزاو هەرگیز وەك پاڵەوانیەتییەك بیرم ناچێتەوە. یەکەم: رۆژێك مونشەئەیەکی پڕ لە خەڵکیان هێناو دایانبەزاندن و ریزیان کردن. بە مەبەستی گوللەبارانکردنیان. لەوکاتەی جەللادەکان لە ئامادەباشیدابوون بۆ دەستپێکردن لێیان. (کوڕێکی گەنج) لەناو ریزکراوەکاندا، لەناکاو لە ریزەکە هاتە دەرەوەو کورانە پەلاماری چەکی یەکێك لە سەربازە جەللادەکانی داو لێی سەندو نەترسانە لوولەی کلاشینکۆفەکەی رووکردە سەربازە جەللادەکان و تا دوافیشەك نای بە سنگی سەربازەکانەوە. جەللادەکان ژمارەیەکیان ئەوانەی گوللەی کوڕە گەنجەکەیان بەرکەوت، بەسەر یەك و چەکەکانیاندا کەوتن، ئەفسەری لێپرسراو و سەربازەکانی دیکە هەر هەموو شڵەژان و شپرزە بوون، بەپەلە سەربازی دیکەیان هێنایە شوێنیان، ئەفسەری لێپرسراو فەرمانی دا تاوانی خۆیان ئەنجام بدەن و ئەوانیش بەهەمان شێوەی رۆژانی پێشوو ریزکراوەکانیان گوللەباران کرد، بەکوڕە گەنجەکەشەوەو بەپەلە چاڵەکانیان پێ پڕکردنەوەو دایانپۆشین، سەربازە کوژراو و بریندارەکانیان دوورخستەوە، وەکو بۆم دەرکەوت لە (پێنج) سەرباز زیاتریان لێکوژرابوو. کە ئەو نەبەردییەم لەو کوڕە گەنجە کوردە بینی، ئەوەندە دڵخۆشبووم وام دەزانی بە دەستی خۆم ئەو تاوانبارانەم کوشتووەو شپرزەم کردوون. چەند ستەم بوو، لەو کاتەی گوللەبارانکردنەدا هەرهەموویان خەڵتانی خوێن دەکران و بەدەم هاوارو بانگ و سەڵاو شایەتمانو پاڕانەوە، بەدەمی شۆفڵ کۆیان دەکرنەوە، دەیانخستنە ناو چاڵەکانەوە، لەو کاتەی خۆڵیان بەسەردا دەکردن، زۆریان گیانیان تێدا مابوو، بەدەم هاوارەوە بە خۆڵکردن بەسەریاندا بێدەنگیان دەکردن و بەزۆر دەیانمراندن.

دووەم: رۆژێکی دیکە مونشەئەیەکی پڕیان هێنا بە دەوریاندا وەستان، لەوکاتەی ویستیان دایانبەزێننە خوارەوە بۆئەوەی ریزیان بکەن و گوللەبارانیان بکەن. خەڵکی ناو مونشەئەکە مانیان گرت، هەرچەندیان کردو کۆشان نەهاتنە خوارەوەو دانەبەزین و بۆیان چوونە سەرەوەو لێیان دان و پەلکێشیان دەکردن، بەڵام دانەبەزین و دانەبەزین، گوێیان بە هەراو نەرەنەرو ترساندنی سەربازە جەللادەکان نەداو نەدا، لە مونشەئەکە نەهاتنەخوارەوە، بە ئارەزووی خۆشیان جوێنیان بە سەدام و بەعس و عەرەب دەدا... ئەفسەرەکەو ژمارەیەکی دیکەی

سەرباز جارێکی دیکە چوونە سەریان و پەلاماریاندان و داوایان لێکردن بۆ دابەزین. ئەوان لەسەر جنێودانی خۆیان بەردەوامبوون، گوێیان پێنەدان و دانەبەزین. ئەفسەری ئێپرسراو و سەربازەکان زانییان هەوڵەکانیان بێهودەیە، بەقسەیان ناکەن و لە مونشەئەکە نایەنە خوارەوە. ئەفسەرە جەللادو تاوانبارەکە، فەرمانی دا ئاگر لە مونشەئەکە بەردەن، لەناو مونشەئەکەدا بە ئاگر بیانکوژن و لەناویان بەرن. ئەو خوانەناسە عەرەب و بەناو موسڵمانانە بە هەلهۆلە بۆ بەعس و بە (ئەللاهوئەکبەرەوە) بەنزینیان بە مونشەئەدا کردو ئاگریان تێبەردا، ئەوەی لەناویدا بوو، جگە لە شوفێرو سەربازەکانی ناوی، هەر هەموویان سووتێنران، دوای دامرکاندنەوەی بە مونشەئە سووتاوەکەوە خستیانە چاڵەوەو دایانپۆشین. ئەو کارەساتە کارەساتێك بوو، لە رۆژی حەشر دەچوو، ژن و منداڵ و پیرو گەنج لەگەڵ شاڵاوی ئاگردا هاواریان بوو، دەگریان و باوکەرۆیان دەکرد. ئەو مونشەئەیە لەپێش چاوم سووتاو دامرکایەوەو دوایی بە شۆفلەکان تلدرایە ناو چاڵەوەو بەخۆڵ.

بەندیخانە رۆژانە دووجار (مەستەر) لە بەیانییان و ئێوارانیدا دەکات، دەمانبەنە رارەوی بەردەم بەشەکەمان. مەستەرەکە بۆ دڵنیابوونە لە زیندانییەکان، لەبەر دوو هۆ بوو.

یەکەم: بۆئەوەی بزانرێت کە هیچ زیندانییەك راینەکردووەو نەچووەتە دەرەوە.

دووەم: بۆ زانینی ژمارەی زیادبوون و کەمبوونەوەی زیندانییەکان، کە رۆژانە زیندانیی دیکە دەهێنرێنە بەشەکەمان و دەگوێزرانەوەو ئازاد دەبوون. بۆیە دەبێت هەموو زیندانییەك لەکاتی مەستەردا ئامادە بێت، موراقیب لەکاتی مەستەردا بانگ دەکات (مەستەرە). زۆر رۆژ هەندێك زیندانیی لەبەر نەخۆشیی یان پیرییان ناتوانن بێنە دەرەوەو ئامادەی مەستەر بن. ئیدارەی بەندیخانە بۆ ئەوکەسانە گوێ لە موراقیب دەگرن و وازیان لێدەهێنن. مەستەری بەیانییان بە بەردەوامی لە سەعات حەوت دەکرێت، جگە لە رۆژانی مواجەهە کە لە سەعات شەشدا دەکرێت و ئێوارانیش پێش خۆرئاوابوون و دوای عەسر دەکرێت.

لە بەشەکەی خوارەوەو لە رارەوی نهۆمی سەرەوەش لەبەردەم ژوورەکاندا زیندانیی دادەنرێن، لەبەر بێ جێگایی، واتە بەشەکە بە بەردەوامی لە دووسەد زیندانیی زیاتری تێدایە. لە بەشی خوارەوە. ژوورێك بۆ موراقیب، ژوورێك بۆ ئوتووکردن، چەند ئاودەست و حەمام بە ریزی یەکداو لە خۆرهەڵاتی بەشەکە هەیە.

لە (٣)ی مانگەوە تا (١٥-١٦/١١)و بەهۆی تێکەڵاوبوونمان بە زیندانییەکان. لە زۆر شتی بەندیخانە شارەزابووم. وردە وردە پەیوەندیم لەگەڵ زیندانییەکاندا پەیداکردووە، تێگەیشتووم کە ئەو خواردنەی رۆژانە لە ئیدارەی مەتبەخی بەندیخانەوە دێت بۆ بەشەکان پێی دەوترێت (خواردنی کان)ە، ئەو خواردنەش زۆرتر ئەوکەسانە وەریدەگرن کە زۆر ماونەتەوە لە بەندیخانە، یان ئەوکەسانەی کە کەمتر کەسوکاریان دێن بۆ مواجەهەیان. بۆیە ناچارن رۆژانە نان و خواردنی کانە وەربگرن، تێگەیشتووم کە لەم بەندیخانەیەدا (کتێبخانەو نەخۆشخانەو کارگەی دارتاشی و دروومان و میکانیکی سەیارەو حانووت و شتی دیکە) هەیەو (باحس

ئیجتماعی) لەدەرەوەی بەندیخانەوە دەهێنن و هەفتەی جارێك دووجار پزیشکی پسپۆری لە نەخۆشییەکاندا دێنە نەخۆشخانەو نەخۆش دەچێت بۆلایان... ئەو خواردن و میوەو شتانەی کە لە مواجەهەدا بۆیان هێنابووین، بەشی تا نیوەی مانگی بەباشی کردین.

ئێمە کە لە ئەمنەسوورەکەی سلێمانی بووین، عیراق پەلاماری کوەیتی دابوو، داگیریی کردبوو، هەر ئەوکاتە ئەو پەلامارەی سەدام و عیراقمان بەوە دانا کە کۆتایی دەسەلاتی رژێم نزیکبووەتەوە، ئەمریکاو ولاتانی عەرەبی و ولاتانی دنیا واز لەو سەرکێشییەی سەدام ناهێنن. کە هاتینە ئەبوغرێب ئەو کێشەیە گەورەتر بوو، ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی کەوتنە خۆکۆکردنەوەو هەرەشەکردن لە عیراق بۆ گەرانەوەی لە کوەیت... عیراقیش لەسەر داگیرکردنەکەی سوورە، گوێی نە بەرای عەرەبی و نە ئەمریکاو نە ولاتانی دنیا نەداو دەیەوێت ئەوە بە هەموو ولاتانی عەرەبی و جیهان بسەلمێنێت کە کوەیت پارێزگایەکە لە پارێزگاکانی عیراق، هیچ هێزێك نییە لەو بریارەی پەشیمانی بکاتەوە... ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لە کۆکردنەوەی هێزو راکێشانی دەولەتانی دنیادان، بەتایبەتی دەولەتە عەرەبییەکان بۆ پشتگیریی و هاوبەشیکردنیان لە لە شکرکێشی و فشارخستنە سەر عیراق بۆ کشانەوە لە کوەیت و جێهێشتنی، لە هەولدان لەگەل کۆکردنەوەی هێزو خۆئامادەکردنیاندا بۆ پەلاماری هێزەکانی عیراق لە کوەیت و دەوروبەری، هەلمەتێکی دبلۆماسی هەمەلایەنەیان دەستپێکردووە لە رێگای سەرۆکی دەولەت و رێکخراوە عەرەبییەکان و ولاتانی ئەورووپی و دۆستەکانی عیراقەوە، بە ناردنی وەفدو گفتوگۆکردن لەگەل سەدام و سەرانی رژێمەکەی، بە مەبەستی رازیکردنیان بەکشانەوەی هێزەکانیان لە کوەیت و تەسلیمکردنەوەی بە دەسەلاتدارانی کوەیتی، بەلام هەموو هەولە دبلۆماسییەکان لەلایەن سەدامەوە گوێیان لێنەگیرێت و کەلکێکی نییە، من و برادەرانمان و زۆرێك لە زیندانییەکانی بەندیخانە. بەوە دلخۆشین، کە سەدام رازی نەبێت، لە ئەنجامی کەللەرەقی و لەخۆباییبوونی بە هێزی سەربازیی، پەلاماری سوپاو هێزەکانی عیراق لە کوەیت و بەسرەو بەغداو شوێنەکانی دیکە بدرێت، ئێمە وای بۆ دەچین بەو پەلامارە سەربازییە رژێمی بەعس و سەدام کۆتاییان دێت و عیراق لە دکتاتۆریەتی فاشییانەی بەعس و سەدام رزگاری دەبێت. زیندانییەکان بەزۆری کوردەکان، لەبەرئەوەی منیان بە گیراوێکی سیاسیی و مامۆستا دەزانی، رۆژانە دەین بۆلام و لەگەلمدا پیاسە دەکەن و پرسیاری بارودۆخە ئالۆزەکەی عیراق و ولاتانی دنیام لێ دەکەن، دەیانەوێت بزانن ئایا ئەگەر عیراق لە کوەیت نەکشێتەوە، لێی دەدرێت؟ بەو لێدانە رژێمی عیراق دەرووخێت؟ ئەگەر عیراق رووخا چارەنووسی زیندانییەکان چی دەبێت؟ ئایا لەکاتی لێدانیدا پەلاماری بەندیخانەکان نادات و زیندانییەکان ناکوژێت؟ کوردو دۆزی گەلەکەمان بەرەو کوێ دەچێت؟ لەم جۆرە پرسیارانەم بە بەردەوامی لێ دەکەن و منیش لەوانەی ئارادەیەك دلنیام، بەپێی بۆچوون و هەلسەنگاندنم وەلامی پێویستیان دەدەمەوە.

# مانگی (١١- ١٢ی ١٩٩٠)و ئێمە لە ئەبوغرێب

ئێمە کە هاتینە ئەبوغرێب و گەیشتینە بەشەکان و جێگیربووین لەم بەندیخانەیە، وەکو زیندانییەك، مافی ئەوەمان هەیە وەکو هەموو زیندانییەکانی بەندیخانەکە مانگی دوو جار مواجەهە بکرێین، سەری مانگان و نیوەی مانگان. هەرچەندە لە پێشەوە باسی یەکەم مواجەهەم کردووە، بەلاّم بە پێویستم زانی لەم بابەتدا جارێکی دیکە باسی بکەمەوە، چونکە ئەو مواجەهەیەی ئێمە لە ١٩٩٠/١١/٢-دا یەکێك بوو لەو مواجەهانەی کە لە ژیانی ئەم بەندیخانەیەدا بەخۆیەوە نەبینیبوو. هیچ کەس و وەجبە زیندانییەك لە هیچ ساڵێکدا بەم شێوەیە مواجەهەیان نەکرابوو، مواجەهەکاران نەهاتبوون، بۆ ئەم بەندیخانەیە... بەیانی ڕۆژی ٢ی مانگە لە سەعات پێنجەوە بەخەبەرم و لە شەشەوە مەستەر کراوە لە حەوت دەرگای بەشەکەمان خرایە سەر پشت و هەرزیندانییەو چاوەڕوانی کەسی خۆی دەکات بێت بۆ لای. من و (بەختیار لەگەڵ کاکەحەمەو شێخ مارفدا) لە بەشەکەماندا پیاسە دەکەین. کاتێکمان زانی مواجەهەکارانمان پەیدابوون. یەك بەدوای یەکداو بە شێخ مارفم وت: تۆ لێرە بوەستە هەرکەس هات و پرسیاری کردم، ڕێنوێنیی بکە بۆ حەوشەکەو بۆلای خەیمەکەو منیش دەچمە حەوشەو لای خەیمەکە رادەوەستم. خەیمەو شوێنەکەم ڕۆژی پێشوو پاکمان کردەوەو چاکمانکرد، شوێنەکە زۆر گەورەیە. مواجەهەکاران ئەوەندە زۆرن لەو شوێنە جێگا نەدەبووەوە، ناچار ریزی دانیشتن بە بەردەمیدا درێژکرایەوە. لەبەرئەوەی خەڵکەکە ئێجگار زۆرن. ناتوانم بە تەواویی بزانم کەسەکان کێن، یەکەم مواجەهەشم بوو. شارەزاییم نەبوو. ئەوەندەم زانی: زەینەب، ئازاد، بەهار، بلێسە، ژیر، شێنێ، کاکەم، براژنم، ناهیدە، حەپسە، کاك سدیق، کاك جەلال، کاك حەمەرەشید، کاك حەمەنووری، ئەولاّ، کاك حسێن، کاك لەتیفەو براژنم، خوشکەکانم و منداڵەکانی (کاك حەمەلاوەو فەیمەخان)و لە خزمانی دیلێژەش زۆر هاتبوون من لەو مواجەهەیەدا هەر فریای بەخێرهاتنی خەڵك دەکەوتم و هەرکەس دەهات پەلاماری دەدام و تێر ماچی دەکردم، ئینجا فەرمووی دانیشتنم لێدەکردن. ئەگەر نەتوانم ناوی ئەو بەرێزانە لێرەدا بنووسم گلەیم لێنەکەن، چونکە ئەو مواجەهەیە لەبیری ئەوەدا نەبووم کە بزانم کێ دێت... دیارە هەمەجۆر خواردنیان هێنابوو. خواردنەکە ئێجگار زۆربوو. خواردنەکانمان بەریز دانا بۆئەوەی مواجەهەکاران لێی بخۆن، هەرهەموو نانیان خوارد زۆربەیان دەیانوت لە نیوەڕۆی ڕۆژی پێشووەوە نانیان نەخواردووە، حەزیشیان دەکرد ئەو نانە لەگەڵ مندا بخۆن (کاکەحەمەو مارف)یش لەگەڵ ئێمەدا نانیان خوارد. لەو مواجەهەیەدا ئەوەی پێویستم بوو، کە لە دەرەوە بۆم بهێنن، هەرهەموویم بۆ نووسین، بۆئەوەی لە مواجەهەی داهاتوودا بۆم بێنن. ئەوشتانەی بۆم هاتبوو لە گوێزو هەنگوین و دیاریی هەمەجۆر، ئەوەندەم لێ گلدایەوە کە بەشی (١٥) شەوە مواجەهەکەی دیکەم بکات. ئەوەش بەشارەزایی کاکەحەمە بوو، پێی وتم: لەبەرئەوەی جێگات نییەو شوێن نییە تیا

هەڵگرین، ئەوەندە شت گلبدەرەوە کە بەشی مواجەهەی داهاتووت بکات. بەکورتی زەینەب و کەسوکار کە هاتن باریان گران بوو، کە گەڕاشنەوە هەر باریان گران بوو. دوای تەواوبوونی مواجەهەو گەڕانەوەی خەڵکەکەو چوونە دەرەوەیان لە بەندیخانە، یەکسەر بانگیان کردین بۆ (مەستەر) بۆ دڵنیابوون لە ژمارەی زیندانییەکان. کە مەستەر تەواوبوو، چووینە ژوورەکەی کاکەحەمە... لەبەرئەوەی لەو قەرەباڵغییەدا نانی وامان نەخوارد. کاکەحەمەو مارف خواردنیان گەرم کردەوەو بەسێ قۆڵی نانمان خواردو بەدوایدا چاو میوەشمان خوارد. کاکەحەمە هەندێك گوێزو هەنگوینی جیاکردەوە، وتی: دەیدەمە (موراقیب)، خوارنەکانمان لە فلینەکانی کاکەحەمەو مارفدا جێکردەوەو هەندێك وشکەشمان لە ژوورەکەی خۆم و لەژێر قەرەوێلەی مارف و جەبارو تورکمانەکەدا داناو بەشی هەریەکە لە زیندانییەکانی ژوورەکەمان دا. ئەو رۆژە تا شەو زیندانییەکانی هۆڵەکە یەکەیەکەو دوو دوو دەهاتن بۆلام و خۆیان پێدەناساندم، کوردەکانیش زیاتر حەزیان دەکرد لێمان نزیکببنەوە، کە دەهاتن بۆلام، سەرسامیی خۆیان لە مواجەهەکە دەردەبڕی، یەکێك لە کوردەکان (کامەران ئەسعەد) بوو، خەڵکی (کۆستەی چەم) بوو. خۆی پێناساندم کە کوری (ئەسعەدە)و ئەو ئەسعەدەم لە زووەوە دەناسی و کاتی خۆی یەکێك بوو لەوانەی کە سەر بەباڵی مەکتەبی سیاسیی و مام جەلال بوو. بە ئەسعەدە شێت بەناوبانگ بوو... کامەران لەسەر دزیی و کاری خراپ گیرابوو. وەکو بۆیان باسکردم لە بەندیخانەش هەرخەریکی شتی خراپەو ناوبانگێکی باشی نییەو زیندانییە باشەکان پەنجەی خراپیی بۆ رادەکێشن. کاکەحەمە لەبەر رەفتارەکانی رقی لێی دەبووەوەو قسەی روو لەروو پێدەوت. وتی: من هەموو جار لای باوکی شکاتی لێدەکەم و پێی دەڵێم سەردانی مەکەن و پارەو شتی بۆ مەهێنن، بۆئەوەی بەخۆیدا بچێتەوەو چاك بێت. وتم: کاکەحەمە، کامەران دانیێ بۆ من. هەوڵی راستکردنەوەی دەدەم. ئەو مواجەهەیە بەراستیی بووژاندنییەوە، دوای (١٠) مانگ دابران و سەرنگومکردن لە خێزان، منداڵ، براو خوشك، کەسوکار، دۆست، هاوڕێ و خۆشەویستان. ماوەیەکی کەم نەبوو. بۆیە بە بینینەوەیان باری دەروونیم زۆر گۆڕاو ژیامەوە. کە چوومەوە ژوورەکەمان باس هەرباسی مواجەهەکەی من و بەختیاربوو. ئەو شەوە لەسەر قەرەوێڵەو جێگاکەی مارف بەباشی خەوتم. پێش خەوتنیش چەند نامەیەکم لە خزم و برادەرانەوە بۆ هاتبوو، کەوتمە خوێندنەوەیان، مواجەهەیەکی دیکەم لەگەڵ نامەکاندا کرد.

لە بەندیخانە رۆژانە نیوەڕوان و ئێواران (عەنقەرچییەکان) خواردنی کانە دەهێننە بەردەرگای هۆڵ و رەدهەکان، بەسەر ئەو کەسانەی خواردنی کانە دەخۆن، دابەشیان دەکەن. نیوەڕوان برنج و شلە دەهێنن، شلەکان: (سلق، شێلم، پەتاتە، پاقلەو پیازاوان. ئێوارانیش هەر شلە، یان هێلکە، یان پەتاتەیە.

# نیوەی مانگی (١١)، دووەم مواجەهەو کەرنەڤاڵێکی دیکە

مواجەهەی نیوەی مانگ لە ١١/١٦رۆژی پێش مواجەهە عەسرەکەی لەگەڵ شێخ مارف و کاکەحەمە چووینە حەوشەکەو شوێنمان پاککردەوەو خەیمەمان بەچواردەوریدا گێڕا... خەیمە بەچەند چەرچەف و بەتانی، کە شێخ مارف و کاکەحەمە پەیدایان کرد. ئێوارەش ریشم تاشی و شەو حەمامم کرد. شەو لەخۆشیی ئەوەی بەیانی کەسوکار دێن بۆ مواجەهەمان تا درەنگ خەوم لێنەکەوت، بەیانی لە سەعات (٥)ەوە خەبەرم بووەوە. هەستام و دەموچاوم شۆردو کەوتمە پیاسەکردن بە ڕاڕەوەکەدا. لە سەعات (٦) لەدەرگا درا بۆ مەستەرو موراقیب کەوتە بەئاگاهێنانی زیندانییەکان بۆ ئامادەبوونیان لە مەستەردا. مەستەر کراو هاتینە ژوورەوە.

سەعات (٧) دەرگای بەش خرایە سەرپشت و لەبەردەم دەرگاکەو بەناو ڕاڕەوەکەدا لەگەڵ شێخ مارف و کاکەحەمەو بەختیاردا پیاسەمان کرد. کاتێکمانزانی مواجەهەکاران پەیدابوون. ڕاڕەوی بەردەم بەش و ڕەدهەکان ئەو زیندانییانەی شتیان دەفرۆشت لەمبەرو ئەوبەری دووکانی دەستگێڕی خۆیان دانا. کاکەحەمە جلی کوردی لەبەرکردووە، مشکییەکی بەسەرەوە بەستووە، ئەوەندە لێی جوانە لە بەگزادەی جاف دەچێت.

کاتێکمزانی ئازاد پەیدابوو. بەدوایدا زەینەب، بەهار، ژیر، بلێسە، شێتی~ی لەگەڵدابوو. بەرەو ساحەکە ڕۆیشتین. ئازادم نارد بۆ بەردەرگا بۆئەوەی هەرکەس هات بیهێنێت بۆ حەوشەکە. لە سەعات (٧)ەوە تا سەعات (٨,٥ بۆ ٩) خەڵك هاتە ژوورەوە، ئەوەندە خەڵك و خزم و کەس و ناسیاو و برادەران هاتبوون، ئەو شوێنەی کە پاکمان کردبووەوە. بەتەواویی پڕبووەوە. بەردەوامیش دەستەدەستەو دوو دوو، خەڵك دەهاتن بۆلام، قەرەباڵغییەکە ئەوەندە زۆر بوو سەرنجی هەموو زیندانییەکانی ڕاکێشابوو. لەڕاستیدا کەرنەڤاڵێکی چاوپێکەوتن و سەردان و پرسینەوەو بەسەرکردنەوەی خزمانە، دۆستانە، نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرانەیە. ئەوەندە جۆری خواردن و میوەو دیاریم بۆ هاتووە، نەمدەزانی چیی لێبکەم، نانێکی بە کۆمەڵمان خواردو ئەو خواردنەی کە بۆیان هێنابووم. بەجیا زەینەب دایناو وتی: ئەمە هی خۆتە، وریای بە لە شوێنی سارد دایان بنێ، با نەترشێن و خراپ نەبن.

ئەو کەلوپەل و پێداویستییانەی داوام کردبوون هەر هەموویان بۆ هێنابووم. بۆکسێك و فلینەیەکی تەبەدۆزی گەورەو دوو دەست جلی لەبەرکردن و بیجامەو کەلوپەلی پێویستی ژێرەوەو چەرچەف و پشتی و دۆشەك و بەتانی... بەکورتی ماڵۆچکەیەکیان هێنابوو، باشترین شتیش کە هێنابوویان، باوەڵێکی ئاسنی گەورە بوو.

نامەیەکی زۆرم بۆ هاتبوو. کە زۆربەیان بە زەینەب بوو بەزیرەکی هەڵی گرتبوون. خواردن و شتەکان ئەوەی پێویستم بوو، گلم دانەوەو ئەوانەشی زیادبوون، بەمنداڵەکاندا ناردمنەوە. بەڕاستیی خەڵکەکە ئەوەندە زۆر هاتبوون لەیادم نەماون کێ بوون تا ناوەکانیان

بنووسم. لەدوای مواجەهەش هەرچەندم کرد بیرم نەکەوتنەوە تا لە دەفتەرەکەدا ناوەکانیان بنووسمەوە. ئەم مواجەهەیەش تەواو بوو. مواجەهەکاران چوونە دەرەوەو دوای تەواوبوونی مواجەهە. مەستەر کراو سەر ژمێرییان کردین و دڵنیابوون لە ژمارەی زیندانییەکان. دوای مەستەر، کاکەحەمە، وتی: با نانێك بخۆین. خواردنیان گەرمکردەوەو نان و چامان خواردو ئینجا کەوتینە ڕێکخستنی خواردنەکان لە بۆکس و فلینەکاندا. خواردنی وشکەشم خستە ناو باوەڵەکەو لەو شتانەی بۆم هاتبوون، بەشی زیندانییەکانی ژوورەکەم و موراقیب و هەندێك زیندانیی هەژار کە مواجەهەیان نەدەهات. دوایی سەهۆڵ هات و سەهۆڵمان کڕی و بەسەر فلینەکاندا دابەشمان کرد. بۆ شێوی ئێوارەش نانێکی باشمان لەو خواردنانەی بۆمان هاتبوو، سازکردو شێومان کرد. شەوەکەشم لەگەڵ کۆمەڵێك نامەدا بەسەربردو بوو بە مواجەهەیەکی دیکەو لە نامەکاندا زۆر شتیان تێدابوو کە زۆر رووداو و شتی رۆژانی رابردووی بیردەخستمەوە.

لەم مواجەهەیەدا کەلوپەلی تەواوم بۆهاتبوو. شەو هەندێك لەو جلانەی کە بۆم هاتبوو، تاقیم کردنەوە.

ئەو باوەڵەی بۆیان هێنابووم، شتی زۆری کۆکردمەوەو سوودی زۆرم لێبینی.

# هەواڵی لەسێدارەدانی پێنج هاورێکەمان

لە ٨-١١/٩/ پیاوێك لە ژووری (١٥)ەو عەرەببوو بە (ئەبو فەلڵاح) بانگیان دەکرد. هاتوچۆی دائیرەی دەکردو لە (دەورەی دارتاشی) دەوامی دەکرد. هەر لەخۆیەوە لەو ماوە کەمەدا، پەیوەندیی لەگەڵدا پەیداکردم. بەیانی و ئێوارە دێت بۆلام و بەگەرمیی چاکوچۆنیم لەگەڵدا دەکات، ئەو نزیکبوونەوەیەی وەکو بۆم دەرکەوت، بەهۆی مواجەهەکەمەوەیە. کە بینی لە مواجەهەدا خەڵکێکی زۆر هاتن بۆلام و خۆشی دیارە پیاوێکی باشە. کوردی خۆشدەویست لە دواجاردا کە خۆی باسیکرد، دەرکەوت خەڵکی ناوچەی (عەممارە)یەو کۆنە شیوعی بووە، گیانێکی نیشتمانپەروەریی تێدابوو. دوای نیوەڕۆ، لە دەرەوە هاتەوە چووە ژوورەکەی و گەڕایەوە خوارەوەو هات بۆلام. سەیرمکرد دەموچاوی ئاسایی نییەو شڵەژاوییەکی پێوەدیارە. وتی: با پیاسەیەك بکەین، کەوتینە پیاسەکردن و لەگەڵ پیاسەکەدا کەوتە پرسیارکردن. سەبارەت بەهۆی گرتن و حوکمدانمان، من لێی دڵنیانەبووم، وتی: لە من مەترسە من دۆستی کوردم و کۆنە شیوعیم و لەسەر قەتڵ گیراوم. خەڵکی عەممارە بەگشتیی کوردیان خۆشدەوێت و کوردێکی زۆری فەیلی لە عەممارە هەن. من چەند سەر دێنم و دەبەم ئێوە کەسێکی ئاسایی نین و لەسەر کاری خراپ نەگیراون، سیمای تۆ لەوە ناچێت خوانەخواستە لەسەر دزیی، یان پیاوکوشتن، یان شتی نابەجێ گیرابیت، تۆ لە پیاوێکی سیاسیی دەچیت. وتم: لەڕاستیدا هەروایە لەسەر سیاسەتگیراوین و سیاسەتەکەشمان مەسەلەی گەلەکەمانە. وتی: ئەوەندەی تر لام خۆشەویستترو بەرێزتربوویت. من لەخۆمەوە نەبوو خۆشەویستیم بەلاتا جووڵابوو، بەمواجەهەکەتاندا زانیم ئێوە کەسێکی ئاسایی نین.

وتی: ئێوە کەستان لەگەڵدا بوو حوکمی سێدارەدانی بەسەردا درابێت؟

وتم: بۆ دەپرسیت؟ وتی: ئیشم پێیەتی. وتم: لەو جەماعەتەی ئێمە (چەند)کەسمان بەحوکمی لەسێدارەدان حکومدراون. وتی: (٥) کەسن؟ وتم: بەڵێ، (٥) کەسن. پرسی یەکێیان باڵابەرزە؟ وتم: یەکێیان لەوانەی دیکە باڵای بەرزترە. وتم: سەیرەبێت بینیبێتن؟ هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: بەڵێ، بینیمن، بەڵام لەکوێ و چۆنم بینین؟ ڕۆژی چوارشەممە دەبوو ساحە بێت، ساحە نەکرایەوە دەزانی بەهۆی چییەوە بوو؟ وتم: نازانم. وتی: هۆیەکەی ئەوەبوو ئەو هاورێیانەتیان عەسرەکەی لە سێدارەدان. من لە شوێنێکەوە چاوم لێیان بوو. کە بەدوای یەکدا بردیانن بۆ بەردەمی سێدارە، سروودێکیان دەوت و ئەو باڵابەرزە لە پێشیانەوە بوو. وتم: دڵنیایت. وتی: دڵنیام، بۆیە هاتم بۆلات، بۆئەوەی هەواڵەکەت پێ بڵێم، بەڵام ئەم هەواڵە با هەرلای خۆت بێت و کارێك نەکەیت کە بزانن من بەتۆم وتووە. وتی: لەگەڵ ئەو (٥) کەسەدا کۆمەڵێکی دیکەشیان لە سێدارە دا، بەڵام کەسیانم نەبینی وەکو ئەو (٥)کەسە سروودو گۆرانیی بڵێن و بێدەربەست بن. بە هەواڵەکە سست بووم. وتم: نەچینە شوێنێك دانیشین. وتی: با، دەچین لەو بن دیوارەدا دادەنیشین، دەزانم زۆر بێتاقەتبوویت. لەڕاستیدا لە

ناخەوە دەکولاّم و نەم دەویست گریانەکە بە دەموچاومەوە دیاربێت. کەوتە دلّدانەوەم و وتی: ماموّستا محەمەد توّ کورە گەورەکەت ناوی چییە. وتم: (بەخشی). وتی: (باوکی بەخشی) ئەو جوّرە کەسانە مایەی شانازیی و سەربەرزییە بوّ گەل و بزووتنەوەکەتان، هیچ بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی و نیشتمانیی بەبیٚ قوربانیی نابێت و سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، ئێوەو ئەوانیش نموونەی زیندووی بزووتنەوەکەتان و پتەویی بیروباوەڕتانن. دان بەخوّتدا بگرەو کارێك مەکە ئەم هەواڵە لە هوّلەکەماندا بلاّوبێتەوە، چونکە ئەم بەعسییانە فاشستن، لە مرۆڤکوشتندا بالاّدەستن. چییان بە حزبی شیوعی نەکرد؟ ئەمانە لە بەرامبەری نەیارانی خوّیاندا سیٚ و دوو ناکەن، تەنانەت ئەگەر بەعسییەکیش بێت و لە بیروبوّچوونیاندا جیاوزایی هەبێت و ملکەچی سیاسەتیان نەبێت، یەکسەر لەناوی دەبەن. ئەمانە فاشین لە نازییەکانی ئەلمانیا زوّر نازیترن.

دوای ئەوەی هەستاینەوەو ماوەیەکی دیکە پیاسەمان کردەوەو زوّر دلّی دامەوەو داوای لێکردمەوە هەواڵەکە لای خوّم بپارێزم.

بەڕاستیی ئەم ئێوارەیە هەرچەندم کرد نانم بوّ نەخورا، هەرچەند (کاکەحەمەو مارف) هەولّیان دا نەمتوانی نان بخوّم. کاکەحەمە وتی: ئەم ئێوارەیە وەزعت ئاسایی نییە، کەوتە قسەی خوّش و گێڕانەوەی چەندین سەرگوزشتەی جوّراوجوّر. من هەر بەلێم بوّ دەکەم دلّم لای قسەکانی نییە. هەر لەبیرکردنەوەی (٥) هاوڕێیەکەماندام. شەو بەدەست خوّم نەبوو، بەدل گریام و دەیان بیرەوەریم لەگەلّ (هاوڕیٚ جەبار، شەماڵ، گموّ عەتا) هاتنەوە یادو پێیانەوە خێ نووستم.

ڕۆژی دوایی دوای مەستەر، ساحەیان کردەوە، کاکەحەمەو مارف هاتن و وتیان ساحەیە با بچینە دەرەوە بوّ ساحە، لە ساحەکە زوّربەی برادەرانم بینی... هەریەك باسی خوّی و مواجەهەکارانیان کردو کەس هەواڵی لەسێدارەدانی هاوڕێیانی باس نەکرد، دیارە هیچ کەسێکیان نەیانزانیبوو. منیش پێم باش نەبوو ئەم هەواڵەیان پیٚ بلێم، لەبەرئەوەی ئومێدم دەکرد کە هەواڵەکە ڕاست نەبێت و با جاریٚ هەر لەلای خوّم بێت، باسم نەکرد. کە ئەوانیش باسیان نەکرد. وای بوّ چووم ئەو هەواڵە لەو بەندیخانە گەورەیەدا دەبوو چەند کەسی دیکە بیبیستایەو باسبکرایە. لەبەرئەوە ئومێدێکم پەیداکردەوە بەوەی مابن و لەسێدارە نەدرابن. کە گەڕاینەوە لەساحە، دوای نیوەڕۆ ئەو پیاوە هاتەوە بوّلام و پرسی لە ساحە لەو بارەیەوە هیچ باس نەکرا؟ وتم: یەك برادەر لە برادەرەکانمان باسیان نەکرد. منیش باسم نەکردو حەزم نەکرد هەواڵێکی وا ناخوّش لە منەوە بلاّوبێتەوە، لێت ناشارمەوە ئومێدێکم پەیدا کردووەتەوە کە ئەوانەی لەسێدارەدراون، ئەوان نەبن. وتی: ئەوەی من پێم وتی جگە لەوانەی کە مەراسیمی لەسێدارەکە ڕێکدەخەن، کەسی دیکە ئاگای لێی نەبووە. بەشکم واش بێت و ئەوان نەبووبن، بەلاّم دلنیام کورد بوون و (٥) کەس بوون و سروودیان دەوت... لە (٨-٩)ی مانگەوە تا نیوەی مانگ دوو سیٚ جار چووینەوە ساحەو لەگەلّ برادەراندا یەکمان دەبینی و کەس لەو بارەیەوە هیچی باس نەدەکرد.

## گواستنەوەم لە ژووری (١٠)وە بۆ ژووری (١٢)

هەفتەی یەکەمی مانگی (١٢)، موراقیب هات بۆلام، وتی: مامۆستا شوێنێکم بۆ دۆزیویتەوە، بەمزووانە چۆڵ دەبێت و دەتگوێزمەوە بۆ ئەو شوێنە. وتم: لە کوێیە، وتی: ژووری (١٢)یە لە قاتی سەرەوە. ئا ئەو ژوورەی بەرامبەرمانە، کۆمەڵێك خەڵکی باشی تێدایە. ئومێد دەکەم تێیدا بحەوێیتەوە. وتی: بەڕاستیی لەو ڕۆژەوەی هاتوویت من لە هەوڵدام و چاو ورد دەکەمەوە شوێنێکت بۆ بدۆزمەوە، زۆرم مەراقتە، کە هەرچەندە خەڵکانی ژووری (١٠) زۆر خەڵکی باشن، بەڵام شوێنی خۆت خراپە... وتم:ماڵی (کاك مارف) ئاوابێت لەو ڕۆژەوە نەیهێشتووە من لە ئەرزدا بنووم. وتی: لەو ژووری (١٢)یە یەکێك حوکمەکەی تەواوبووەو ئازاد دەکرێت، هەر ئازاد بوو تۆ یەکسەر دەخەمە ژوورەکە، بەڵام بەپێی سیستمی بەندیخانەو ژوورەکان لەکاتێکدا یەکێك لەو ژوورە نامێنێت، گەر شوێنەکەی باشبێت یەکێك لە کەسەکانی ژوورەکە بەپێی کۆنییان دەچنە ئەو شوێنە، تۆش دەچیتە شوێنی ئەو. دوای ئەو قسانە بەچەند ڕۆژێك کابرا ئازادکرا، موراقیب هات و لەگەڵ خۆی بردمییە ژووری (١٢)، زیندانییەکانی ژوورەکەی یەکە یەکە پێ ناساندم و منیشی بەوان ناساند، وتی: کێ چووەتە شوێنی بەربووەکە؟ یەکێك یەکسەر جێگاکەی گواستبووەو چووبووە شوێنەکەی و منیش لە شوێنی ئەو لەسەر ئەو قەرەوێڵەیەی ئەوی لەسەر بوو، بۆم دەستنیشانکرا، کە قەرەوێڵەیەك بوو لە ناوەڕاستدا. گەڕاینەوە خوارەوەو کاکەحەمە هات و سوپاسی کردو منیش پێم وت دەوری خۆتت بینی. کەلوپەلەکانمان کۆکردەوە لەگەڵ مارف و کاکەحەمەو جەباردا گواستمانەوە بۆ ژووری (١٢)، ژوورەکە بەمنەوە تەنها (٧) کەسی تێدایە.

## ژووری (١٢)ش بووە سەرچاوەیەکی دیکەی وەرگرتنی زانیاریی

دوای مواجەهەی یەکەم، ئەو شتانەی پێویست بوون گلم دانەوەو ئەوەشی زیادبوون بە زەینەب و منداڵەکاندا ناردمنەوە. لەبەرئەوەی شوێنەکەم لە ئەرزدابوو قەرەوێڵەم نەبوو. بۆ هەڵگرتنی شتەکان بوومە بارگرانیی بەسەر (شێخ مارف)ەوەو هەندێك شت کاکەحەمە بردنی بۆلای خۆی. کاکەحەمەو شێخ مارف دوای مواجەهە کەوتنە هەوڵدان لەگەڵ موراقیبدا بۆئەوەی هەوڵبدات. لەهەر ژوورێك جێگایەك چۆڵ بوو، بم گوێزێتەوە بۆ ئەو ژوورە، بۆئەوەی قەرەوێڵەم هەبێت. موراقیبەکە یەکەم مواجەهەی بینی کە خەڵکێکی لە رادەبەدەر هاتبوون بۆلام و لە مواجەهەی دووەمی ١٦-١٧ مانگدا. بەهەمان شێوە بوو. تێگەیشت کە ئێمە زیندانییەکی ئاسایی و لە جۆری زیندانییەکانی دیکەی بەشی هەشت و ناو بەندیخانەی ئەبوغرێب نین، مواجەهەکانی ئێمە لەناو هەموو بەندیخانەدا دەنگیدایەوەو هەموو زیندانییەکان و سەرجەم سەجان و فەرمانبەرانی بەندیخانە سەرسام بوون... کە بۆیان دەرکەوت ئێمە بە تاوانی دزیی و پیاوکوشتن و تاوانی دیکەی کۆمەڵایەتی دەستگیرنەکراوین، بەڵکو بە تاوانی بیرو باوەڕی سیاسیی و لەسەر مەسەلەی میللەتەکەمان دەستگیرکراوین. بۆیە سەیریان پێدەهات کە بۆ ئێمەیان هێناوە بۆ ناو ئەم بەندیخانەیەو بۆ نەیان ناردووین بۆ بەندیخانەی خاسە کە تایبەت بوو بە زیندانیی سیاسیی.

موراقیب، زۆر رۆژ سەر لە ژوورەکەو شوێنەکەم دەداو دڵنیام دەکات، کە لە ماوەیەکی نزیکداو لە هەر ژوورێك قەرەوێڵەیەك چۆڵ بێت دەمگوێزێتەوە، هەموو جاریش داوای لێبووردنم لێدەکات. ئەوەش دەڵێت خەڵکی ژوورەکەت باشن و دڵنیام، کە هەر هەموویان یارمەتیت دەدەن، پێم دەڵێت: چاوەڕوان بکە، لە هەوڵدا دەبم بۆ دابینکردنی شوێنێکی باش... (کاکەحەمەو شێخ مارف). پێیان وتم، با هەندێك دیاریی بۆ بەرین. لەو شتانەی وەکو گوێزو هەنگوین و شتی تر کۆمەڵێك شتیان ئامادەکرد، بەبێ ئەوەی کەس بزانێت بۆیان برد... دیارییەکانی زۆر پێخۆشبوو. لە مواجەهەی نیوەی مانگ و سەری مانگی دوانزەشدا، شتیان بۆ جیاکردەوەو بۆیان برد، کاکەحەمە وتی: ئەم بەندیخانەیە بەردەوام زیندانیی دیکەی بۆ دێت و زیندانییش ئازاد دەکرێن. زیندانیی هەیە حوکمەکەی تەواو دەکات و ئازاد دەبێت، هەشە نەقل دەبێت بۆ خەفیفە یان بەش و رەدهەکانی دیکە، ئەوانەشی کە تازە دێن بەسەر ژوورەکاندا دابەش دەکرێن. لە ١٢/١٠ موراقیب هات و پێی راگەیاندم، کە لە ژووری دوانزە قەرەوێڵەیەك لە ناوەڕاستدا کە پێی دەڵێن (جەنازی)، چۆڵ بووە، دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شوێن و ژوورە. ١٢/١٣ خۆم کۆکردەوە. لەگەڵ (مارف و کاکەحەمەو جەبار)دا شتەکانمان گواستەوە.

مواجەهەی یەکەم و دووەم کاکەحەمەو مارف پێیانوتم هەندێك شتت پێویست دەبێت راسپێرێ لە مواجەهەکانی تردا بۆت بهێنن. لە مواجەهەکانی ١١/١٦و ١٢/٢دا شتەکانیان بۆ هێنام.

ژوورەکەمان لە رووی گەورەیی و قەرەوێڵەو حەمامەوە هەر وەکو ژووری (١٠)یە. تەنها جیاوازییەکەمان لەم ژوورە پەنجەرەیەکە بە رووی حەوشەی بەندیخانەدا، وەکو ژووری (١٠)ش قەرەبالغ نییە، زیندانییەکانیش هەموو عەرەبن، کەسەکانی ژوورەکەم ئەمانەن: (محەمەد حەنحون، سەعید، جاسم، حسێن، عامر، هانی)، بە منەوە ژمارەمان بوو بە حەوت کەس.

(محەمەد) کابرایەکی بە بنەچە نەجەفی و لە بەغدا دادەنیشت و دەوڵەمەندەو خاوەن کارگەو ئیشە، لەسەر کوشتنی ژنەکەی کە بەهەڵە و بە سەرخۆشیی تەقەی لێکردووە، حوکمدراوە. تەنها عەیبـی ئەوەیە حەزی لە(قومار، هەتیوبازی)یەو زۆر بە زەوق و خۆشییەوە باسی هەتیوبازییەکەی دەکات و پێی عەیب نییە... بووینەتە هاوڕێ لەبەرئەوەی هەردەم دژی بەعس و حکومەتەکەیان قسە دەکات. سەبارەت بە هەردوو رەفتارەکەی زۆر قسەی بۆ دەکەم، ئەویش زۆر قسەکانم بەهەندوەردەگرێت و گوێم بۆ دەگرێت و قسەکانم وەردەگرێت، کوڕو کچەکانی هەموو مواجەهەیەك دێن بۆلای و لە مواجەهەماندا منی پێناساندن، هەست دەکەم وردە وردە قسەکانم کاریگەریی خۆیان هەیە، لەدوای ماوەیەك بڕیاری دا کە واز لە هەردووکیان بهێنێت، کوڕێکی بە پارەیەکی مانگانە گرتووە. خزمەتی دەکات. کوڕەکە کوڕێکی گەنجی جوانە. هەموو مەسرەفێکی لەسەر ئەوە. وەکو بۆم دەرکەوتووە کاری سێکسیی لەگەڵدا دەکات، کوڕەکە کە دێتە ژوورەکەمان لەبەرئەوەی هەر هەموو دەزانن، زۆر بەشەرمەوە دێتە ژوورەوەو قسەمان لەگەڵدا دەکات. ئەوەندەم قسە لەسـەر ئەو دیاردە نامۆو ناخۆش و ناشیرینە بۆ کرد. کوڕەکەی ئیزن دا، وتی: ئیتر هەرگیز کاری وای لەگەڵدا ناکەم، کە ئیزنی دا، کوڕەکە دەستی بەگریان کرد. وتم: بۆ دەگریت؟ وتی: من ئیتر لەم بەندیخانەیە بەچی بژیم؟ کەسی وام نییەو کەس نایەت بۆلام و هیچ خەرجییەکم نییە. قسەم لەگەڵ (حەنحون) کرد، پێم وت: ئیزنی مەدە، با کارەکانت بۆ بکات، بەڵام دوو شت هەیە پێی مەکە، یەکەم: کاری سێکسیی لەگەڵدا مەکە. دووەم: هەندێك ئیش کە بەخۆت دەکرێت با ئەو بۆت نەکات، چونکە بەراستیی هەرچەند سەیری دەکەم لە (کۆیلە) دەچێت، لەم سەردەمەشدا کۆیلە زۆر عەیب و شوورەییە، ئەوەشی بەگوێ کردم. حەنحون پێی وتم: دە قسە بۆ کوڕەکەش بکە، با واز لەو رەفتارەی بهێنێت، چونکە پێم ناخۆشە کە من وازی لێدەهێنم و ئەو لەگەڵ خەڵکی دیکەدا کاری سێکسیی بکات. چەند رۆژیش قسەم بۆ کوڕەکە کردو کوڕەم گەیاندە ئاستێك کە بڕیاریدا، لەسەر قسەکانی منەوە، ئیتر بەهیچ جۆرێك پەنا بۆ ئەو رەفتارە نەباتەوە. زیندانییەکان کە هەستیانکرد رۆڵم لە راستکردنەوەی ئەو کەسەدا بینی. دەستخۆشییان لێکردم و ئەوەندەیتر لایان بەرێزترو خۆشەویستتربووم، دەڵێن ئا ئەمە (موسلحی ئیجتماعییە)و بەناو لە بەندیخانە موسلحی ئیجتیماعیمان هەیە.

(سەعید) یەکێك بووە لە بەرپرسانی هێزی تایبەت لە هەولێرو لەسەر پیاوکوشتن دەستگیرکراوە، پیاوێکی لەسەرخۆیە، قەرەوێڵەکەی لە زاوییەی لای پەنجەرەی سەر تارمەکەوەیە. لە هەڵسوکەوتیدا زۆر سەلارو بەئەدەبە. رێزی زۆرم لێدەگرێت، بەقسەکردنیدا

زۆر لە رژێم و کارەکانی رژێم و حزبی بەعس نارازییەو حەز دەکات زۆر لێم نزیکبێتەوە، کە زانی من لەسەر کوردو مەسەلەی گەلەکەم گیراوم. نهێنییەکی لابوو. دیاربوو لە ناخیدا گێنگڵی دەداو کە من چوومە ژوورەکەیان، بەهەلی زانی ئەو نهێنییەم بۆ باس بکات، رۆژێك دوو بەدوو چووینە ساحەکەو بەیەکەوە پیاسەمان کرد، وتی: باوکی بەخشی من کە لە هەولێربووم و یەکێك بووم لە سەربازانی پارێزگاری تایبەت لە هەولێر، کاتێك (بارزانییەکان)یان لە ناوچەکانیانەوە هێنا بۆ هەولێر، من لە هەولێر بووم، (بارزانییەکان)یان سەرجەم کۆکردەوە، بەچاوی خۆم بینیم و راوەستابووم، کە ژن و منداڵی وردیان جیاکردەوە، سەرجەمی کورو پیاویان لە تەمەنی (١٢) ساڵانەوە جیاکردەوە. ماشێنی گەورەو تایبەتیان بۆ هێنان و لەگەڵ چەند هێزێکی سەربازیی بۆ شوێنی نادیاریان بردن. کە ژمارەیان لە (٧بۆ٨) هەزار کەس دەبوون، ژن و منداڵەکانیان بەجیا خستە ناو ماشێن و ئەوانیشیان رەوانە کرد. ئەو کورو پیاوانەی کە بردیانن. سەریان بەدواوە نەهێنایەوە، هیچ کەسیش نەی دەوێرا پرسیاری چارەنووسیان بکات. چییان لێکردن، وتی: من وای بۆدەچم کە هەرهەموویان لەناوبرابن و بەکۆمەڵ کوشتبێتیانن. (سەعید) ئەم مەرگەساتەی وەکو بێویژدانییەك بۆ دەگێرامەوە. کە بەنارەوا بەرامبەر بە خەڵکانێکی کوردی موسڵمان کراوە، کە ئاگاداری هیچ نەبوون و خەڵکی هەژارو بێدەسەڵات بوون. تاوانەکەیان تەنها ئەوە بوو (کوردو بارزانی) بوون، دەیوت: لەو رۆژەوە من ئەم حزب و رژێمەم لەپێش چاو کەوتووە، بە حزبی شۆڤێنیی و رژێمێکی دکتاتۆرو زاڵم و دژ بە مرۆڤی دەزانم، پەشیمان بوو لەوەی کە چووبووە ریزی هێزێکەوە کە پێیان دەوت (هێزی پارێزگاری تایبەت) کە بۆ پارێزگاریی بەرپرسان و دەسەڵاتداران پێکهێنرابوو.

-(جاسم) یەکێکی دیکەی ژوورەکەمانە، قەرەوێڵەکەی لای پەنجەرەوەکەوەیە. پیاوێکی کورتە باڵاو زیتەڵەیە، لەپێش دەستگیرکردنیدا یەکێك بووە لە پیاو و پاسەوانە تایبەتییەکانی عەلی حەسەن مەجید (عەلی کیمیاویی تاوانبار). لە دەستەی پێشەوەی پاسەوانە تایبەتەکانی بووە. جێگای متمانەی بووە، بۆ هەر شوێنێك چووبوو ئەمی لە دەستەی پاسەوانەکانی لەگەڵ خۆی بردبوو. ئەمیش لەسەر پیاوکوشتن حوکمدراوە، ئەم وەکو (ئەبو عەباس و سەعید) باسی رووداوەکان ناکات. بەپێچەوانەوە، بەشانازییەوە باسی ئەو رۆژانەی دەکات کە وەکو خۆی دەیوت لەگەڵ (مامۆستا عەلی)دا بەسەری بردووە. ئەم باسی مەرگەسات و تاوانی رژێم، وەکو تاوان، ناکات، بەڵکو ئەم باسی تاوانەکانی کە دەرحەق بەخەڵکی عیراقیان کردووە، باسدەکردو بە خۆشییەوەو شانازیشی پێوە دەکات، بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکات ئەوانەی کراون و کردوویانە، تاوان بوون، دژی مرۆڤ بووە. یان هەست بەوە ناکات کە تاوان هەر تاوانە، بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان ئەنجام درابێت، یان بدرێت. تاوانی کوشتن و لەناوبردن و زیندەبەچاڵکردن، جۆرێکن لە تاوان، دەستدرێژیکردن بۆ ناموس و شەرەفی خەڵکیش جۆرێکی دیکەن لە تاوان.

(جاسم) زۆر بەخۆشییەوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو ساڵانەی کە لە دەستەی پاسەوانی ئوستاز. عەلی حەسەن مەجید) دابووم، زۆر شتی خۆشمان دەکردو دەبینی و ژیانمان زۆر بەخۆشیی بەسەر دەبرد، هەمووجار ئاخی بۆ هەڵدەکێشیٚ و دەڵێت: لە بەندیخانە تەواو بم دەچمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم. دەیگێڕێتەوەو دەڵێت:

(ئوستاز عەلی) هەموو پانزە شەو جارێك دەچوو بۆ پاریزگایەك لە پاریزگاکان... (ئوستاز عەلی) لەو چوونانەیدا (٢٠ - ٢٥) کەسمانی لەگەڵ خۆی دەبرد. هەموو کەلوپەل و کەرەستەیەکی پێویستمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، وەکو (کەرەڤانە، کەلوپەلی نووستن، حاجەتی خواردن)، پێش ئەوەی بکەوتینایەتە ریٚ، هەریەکەی برێك پارەی دەدایمیٚ. ئەگەر بۆ پاریزگای نزیکبووایە (١٠٠) دینار، بۆ ناوەراست (١٥٠) دینارو بۆ پاریزگا دوورەکانی وەکو بەسرەو موسل و سەماوە (٢٠٠)دینار.

لەهەر چوونێکماندا ئۆتۆمبیلێك پڕ دەکرا لە کچ و ژنی جوان و لەگەڵ خۆمان دەمانبردن، لە کچان و ژنانی ناو ئوتۆمبێلەکە ئوستاز عەلی سیانی هەڵدەبژاردو دەیبردنە لای خۆی. ئەوانی دیکەش بۆ ئێمە دەمانەوە. تا دەگەراینەوە لەگەڵیاندا رامان دەبوارد. لێم پرسی باشە ئەو کچ و ژنانەتان لەکویٚ کۆدەکردنەوە؟ دەڵێت: لە قوتابییانی دانشگاو ژنی ئەفسەرەکانی کە لەبەرەی شەرو واجبدا بوون. وتم: جا چۆن کەسوکاری ئەو ژن و کچانە رازی دەبوون کە لەگەڵ ئێوەدا بێن؟ وتی: ئوستاز عەلی پێی دەوتین هەر باوك و دایکێك یان کەسوکارێکی ژن و کچەکان نارازیبوون، یەکی (٥٠٠) دیناریان بدەنیٚ، ئێمەش وامان دەکرد. جا چ باوك و دایکێك دەیتوانی نارازیبێت؟ دەیزانی ئەگەر نارازیبێت و قسە بکات، چی لێدەکرێت، لەبەر ئەوە، هیچ کەسوکارێکی ئەو کچ و ژنانە قسەیان نەدەکردو بێدەنگییان دەکرد، ئێمەش ئەو برە پارەیەمان پێدەدان. دەڵێت: باوکی بەخشی بەراستیی هەر ئەو ساڵانە زانیم ژیان چییەو چەند خۆشە، ئەو ژیانە خۆشەم لەکیسی خۆم دا، باوەرناکەم کەس هەبووبێت وەکو ئێمە ژیابێت. باوەر بکە لەو سەفەرو سەیرانەماندا. بەچەند شێوە لەگەڵ ئەو ژن و کچانە رامان دەبوارد. لێم پرسی باشە ناخۆش نەبوو بۆتان ژنی ئەو ئەفسەرانەتان دەبرد کە لە واجبی سەربازیدا بوون و سەر بەخۆتان بوون؟ وتی: ئەو ئەفسەرانە بەمانگ و دورومانگ نەدەهاتنەوە بۆلای ژن و منداڵیان، زۆریان خۆیان داوایان دەکردو فێر بووبوون، ئێمەش زۆربەمان دەناسین و ناوی ئەفسەرەکان و ماڵ و شوێنیان لای ئوستاز عەلی بوو. تەلەفۆنیان بۆ دەکراو خۆیان ئامادەییان تێدابوو. وتم: ئەو ژنانە منداڵیان نەبوو؟ منداڵەکانیان چی لێدەکردن؟ وتی: زۆری ئەو ژنانەمان هەڵدەبژارد کە تازە شوویان کردبوو و منداڵیان نەبوو.

هەر (جاسم) بۆی گێرامەوە، لەکاتی هاتنی مەلیکی سعودیە کە لەگەڵ چەند سەرۆك دەوڵەتی عەرەبیدا هاتن بۆ عیراق. چەند کۆستەر ئافرەتی جوانمان ئامادەکردو بەپێی میوانەکان چەند کۆستەریان بران بۆ میوانەکان، ئەوانی دیکە بەسەر حیمایەکاندا دابەشکران. ئەو چەند رۆژەی ئەو میوانانە لە بەغدا بوون، ئێمە لەو پەری خۆشیی و رابواردندا بووین،

بەشێوەیەك باسی چۆنێتی رابواردنی خۆیانم بۆ دەكات، كە دەیگێڕایەوە لەداخا هەر ئەوە بوو نەدەگریا، كە لەو رابواردنەوە ئێستا لە ژوورێكی بەندیخانەی ئەبوغرێبدا بەناخۆشیی ژیان بەسەر دەبات، هەرداخ و ئاخ و هەناسە بۆ ئەو رۆژانەو رابواردنەكانی هەڵدەكێشێت. دەستەكانی دەدا بەیەكداو خەم لەوە دەخوات كە چۆن بە بێعەقلیی ژیانی خۆشیی لەخۆی تێكداوە.

-(عامر) سەرباز بووە، پلەی (مفەوەزی مومتاز) بووە لە سلكی موخابەراتی عەسكەریدا كاری كردبوو. لەسەر پیاوكوشتن بە (١٥) ساڵ حوكمدراوە. بەهۆی ئەو حوكمدان و بارودۆخەی بەندیخانەوە، زۆر وەرس بووە، رقی لە بەعس و رژێمەكەی دەبێتەوە، بەڵام نەیدەوێرا ئاشكرای بكات و جاروبار كە دوو بەدوو دەدوێین قسەم بۆ دەكات و دەڵێت: جێی شانازییە تۆ لەسەر مەسەلەی رەوای گەلەكەت حوكمدراویت. ئەم حزب و حكومەتەی ئێمە وەفایان بۆ كەس نییە، لەوەتی بەندكراوم یەك كەس لێی نەپرسیومەتەوەو بەلامدا نەهاتوون و سەرێكیان لە ماڵی كەسوكارم نەداوە، ئەوانەشی كە لەگەڵمدا بوون و خزمەتم كردوون، یەك كەسیان بەلامدا نەهاتوون. باسی كارەكانی خۆی دەكات، كە لە دانانی هەر بەرنامەیەكی شەرو پەلاماردانددا. پێش دەستپێكردنی بەرنامەكە چۆن رایاندەسپاردم كە برۆم و هەموو شوێنەكان بپشكنم و زانیاریی تەواو لەسەر سنوورەكان و هێزەكانی دوژمن كۆبكەمەوە، لەسەر رۆشنایی ئەو زانیارییانەم بەرنامەی هێرشكردن و شەڕكردن دابرێژن. شوێن نەبوو شارەزای نەبێت لە سنووری عێراق بەگشتیی و كوردستان بەتایبەتی. ناوی ناوچەكان و شاخ و گردو دەشتایی و چەم و رووبارو دۆڵەكانی هەر هەمووی دەزانی. یەكێكە لەوانەی كە لە ژوورەكەدا زۆر رێزم لێدەگرێت و بۆ هەموو ئیشێك بەدەنگمەوە دێت. زانیاریی زۆرم لەسەر زیندانییەكان دەداتێ. زۆر رقی لە رەفتاری (محەمەد حەنحون)ە، بەوەی كە قوماری دەكاتو خەریكی كاری هەتیوبازییە... لەگەڵ عامردا زۆر نێوانمان خۆشە. عامر زانیاریی لەسەر (حەنحون) دامێ و كە كارێكی وام كرد حەنوونم لە قومارو هەتیوبازیی دوورخستەوە، دەستخۆشیی لێكردم، وتی: بەحەق تۆ پیاوێكی مامۆستاو پەروەردەیی و سیاسییەكی سەركەوتوویت و تۆ موسلحی ئیجتیماعیت.

ئەم پیاوە لەكاتی راپەڕینەكانی كوردستاندا، كە بیستی سەربازێكی زۆر دەستگیركراوەو كەسوكاری زۆر لەناو ئەو سەربازانەدا بوو بە براشەوە، زۆر خەمی بوو. لێی پرسیم دەبێت چی لەو سەربازانە بكەن؟ تۆ بڵێیت هەموویان بكوژن؟ یان نایانكوژن؟ ئەی چۆن دەیانژیەنن؟ پاش ئەوەی كە شۆڕش ئەو سەربازانەی هەرهەموو ئازادكردو گەرانەوە بۆ شوێن و ماڵ و خێزانیان، لە مواجەیەهەكدا برایەكی كە لە رانیە گیرابوو، ئازادكرابوو، هات بۆ مواجەهەی. بەیەكی ناساندین و براكەی كەوتە وەسفی كوردو بەرپرسانی شۆڕشی كورد. بۆی دەگێڕاینەوە، كە چۆن گیراون و چۆن خزمەتكراون، چۆن ئازادكراون، بەلایەوە زۆر سەیربوو. براكەی پێی دەوت ئێمە بووینایە چۆن ئەو خەڵكە رەش و رووتانەمان لە ئەنفالەكاندا هەرهەموو لەناوبردو

ـە گازی کیمیایی لیماندان، ئەگەر پێشمەرگە ئاوا بەئاسانیی بکەوتنایەتە بەردەستمان، د:مانکوشتن، بەڵام ئەوان جگە لەوەی ڕێزیان لێگرتین، ئازادیشیان کردین. (عامر) دوای ئەوە ئەوەندەیتر حەز دەکات لێم نزیکبێتەوەو بە بەردەوامی وەسفی کوردی دەکات و قسە بە عەرەب و سیاسەتی ڕژێمەکانی عەرەب دەڵێت. لە مواجەهەکاندا هەرکەس دێت بۆلام، بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازیی بەخێرهاتنی دەکات و چاو و ئاویان بۆ دەهێنێت، کە کەسوکاری دێن یەکسەر منیان پێ دەناسێنێت و ئەوانیش بەڕێزی ئەو هەڵوێستەی شۆڕش کە بەرامبەر کورەکانیان و سەربازەکانیان کرابوو، ڕێزی زۆریان لە من دەگرت.

-(هانی) کوڕێکی گەنجە، ژنی نەهێناوە. خەڵکی ناو بەغدایە. بەپێی هەڵسوکەوتی، لە بنەماڵەیەکی خانەدان و دەوڵەمەندی ناو شاری بەغدایەو لە (بێت کهیە)یە، کەسوکارەکەی کە لە موجەهەکاندا دێن بۆ لای، هەست دەکەم وەکو عەرەبێکی ڕەسەنی بەغدایی زۆر ڕێزیان لە من و میوانەکانم دەگرن. (هانی) لەسەر پیاوکوشتن حوکمدراوە. گەنجێکی ڕوحسووکە، لە تەنیشتی منەوەیە. باوك و دایکی ماون، لە دوو مواجەهەدا جارێك دێن بۆلای. کە دێن دڵم پێیان دکرێتەوە، باوکی سیمایەکی زۆر جوانی هەیە، ڕیشێکی تەنکی هەیە، دیارە موسڵمانێکی ڕاست و خواناسێکی تەواوەو سیماو شێوەی زۆر بە باوکم دەچێ، دایکی هەرچەندە تەمەنی هەیە، بەڵام بەڕاستیی لە دایك دەچێت، کۆمەڵێك براو خوشك و براژنی باشی هەیە، کە دەگەنە ژوورەکە، نەحەسێنەوەو یەکسەر دێن بۆلام و تەوقەو چاکوچۆنی گەرمم لە گەڵدا دەکەن.

حەمامی ژوورەکە بێت هەموو هەفتەیەك پاك بکرێتەوەو شەوانی مواجەهەکانیش هەر دەبێت پاکبکرێتەوە، (هانی و عامرو سەعید) ڕێگای نادەن لەسەرەی خۆمدا من حەمامەکە پاك بکەمەوە، هەرجارە یەکێکیان لەجیاتی من پاکیدەکەنەوە.

# رادیۆو بانگکردنم لەلایەن ئیدارەوە

لەکاتـــی جەنگـــی (خەلیج)دا. رادیۆ زۆر گرنگ بوو، من داوام کرد کە بە هەرنرخێك بووە رادیۆ یەکـــەم بـــۆ بهێنن، بۆیان هێنام، شـــەوانە گوێ لە رادیـــۆ دەگرم و هەواڵەکانیـــان پێدەدەم. رادیۆ قەدەغەیە. بیگرن، ســـزای (مەحجەرکردن)ە... جارێك لەســـەر ئەخباریی (جەبارو کامەرانە سوور)، کە لـــە ژووری (١٠) بانگیان کردم، بـــەڵام زیندانییەکانی ژوورەکـــەم زۆر دیفاعیان لێکردم، نەك تەنها وازیان لێهێنام، بەڵکو رێزیان لێگرتم. دیســـان هەر ئەو کوردە جاسووســـانە جارێکی دیکە خەبەریان لێدامەوە، کە هاتن بۆ پشـــکنینی جێگاکـــەم،، رادیۆکەیان نەدۆزییەوە، چونکە بردبووم لای کەســـێکی دوور لە ژووری خۆمان دامنابوو. بانگیانکردم بۆ ئیدارە. یەکەمجار زۆریان قســـە کرد، منیش پێم وتن: من تەنها گومانم لە دوو کەســـە کە ئەم هەواڵە ناراســـتانە بەئێوە دەگەیەنن، ئەوانە کوردن و خەڵکی ســـلێمانین، ئەوانە لە سلێمانی پیاوی خراپ بوون، وا لێرەش بەهەمانشێوە خراپـــە دەکەن، کـــە ناوەکانیانم وت، من نەمزانی ( جەبار)یان لـــە ژوورێکی نزیك داناوە. بانگیان کـــرد، پێیـــان وت: بەچی دەیســـەلمێنیت کە ئەم پیاوە رادیـــۆی هەیەو هـــەواڵ بڵاودەکاتەوە؟ هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبوو. وتم: من حەزدەکەم ئەوانەی ژووری (١٠)و ژووری (١٢) هەرهەموویان بانگ بکەن و پرسیاری منیان لێ بکەن، ئەگەر قسەی خراپیـــان لەسەرم کرد، رازیم حوکمی خۆتان بـــدەن. ئەگەرنا دەبێت حوکم بەســـەر ئەمدا بـــدەن. منیان لە ژوورێك دانـــا، زیندانییانی هەردوو ژوورەکەیان بانگکرد، گوێم لە یەك بەکیان بوو، یەك کەســـیان بە وشـــەیەك باســـی خراپیی منیان نەکرد، بەپێچەوانەوە بەشـــێوەیەك وەســـفیان دەکردم، پێیان دەوتن خۆزگا هۆڵەکەمان چوار پیاوی تری وەکو مامۆســـتای تێدەهات.

کە لە بانگکردنی زیندانییانی ژوورەکان بوونەوە، (جەبار)یان بانگکردو قســـەیەکی زۆریان پێ وت و رەوانەی (مەحجەر)یان کرد، منیشـــیان بەرێزەوە ناردەوە بۆ شـــوێنی خـــۆم. لە گەرانەوەمدا (کامەرانە سوور) لە هاوشانم دەگەرایەوە بۆ هۆڵەکە. لەو ماوەیەدا هەرچی بەدەممداهات پێم وت، کە گەرامەوە ســـەیرمکرد (کاکەحەمەو شـــێخ مارف) چاوەروانی من دەکەن. هەر چوومە ژوورەوە. یەکســـەر (کاکەحەمە) بردمی بۆ ژوورەکەی خۆیان، هەر ئەوەندە زانـــی کە ئەو ئیخبارییە لەلایەن (جەبارو کامەرانە ســـوور)ەوە بووە. بەبێ ئەوەی پرســـم پێ بـــکات، کاتێکمزانی چووە دەرەوە، ئێمە قسەمان دەکرد، گوێم لە دەنگی کاکەحەمە بوو، دەرپەرینە دەرەوە. سەیرمان کرد لەبەردەم ژووری (١٠) چەقۆیەکـــی بەدەســـتەوەیەو جنێو بەکامەرانە ســـوور دەدات، پێی دەڵێت، بـــەم چەقۆیە ملت لێدەکەمەوە، هەی گەوادی ژن واوالیکراوی جاسووســـی ناپیاو. پێی گەیشـــتین و ساردمان کردەوە، بەڵام چۆن بەهەزار حاڵ تا رازیمان کرد، هەردەیوت تا ســـەری نەبرم وازی لێناهێنم.

زیندانییەکانـــی ژوورەکـــەم هەرهەموویان تف و نەفرەتیان لە جەبـــارو کامەران دەکرد، لەوەوە بۆیان دەرکەوت کە هەردووکیان پیاوی ســـەر بە ئیدارەن و لەناو هۆڵەکەدا قەیزەوەن بوون و کەس رێزی لێنەدەگرتن و بە ئاشـــکرا جنێوو قســـەیان پێدەوتن.

## دوای کپکردنەوەی راپەرینی شەعبان، بەعسییەکیان هێنایە ژوورەکەمان

دوای شەڕی هاوپەیمانان، راپەرینی شارو شارۆچکەکانی ناوەراست و خوارووی عیراق و کوردستان و قەتلوعامکردنی پیاوانی بەعس و رژێم لە شارەکانی نەجەف، کەربەلا، سەماوە، بەسرە، ناسریە، کوت، عەمارەو زۆر شوێنی ترو لێکترازانی دامودەزگاکانی بەعس و رژێمەکەی و تێکچوونی بارو دۆخی بەغداو عیراق بەگشتیی و پەیوەندیکردنی زۆرێك لە پیاوانی بەعس و دامودەزگاکانی رژێم بە راپەرینەوەو تێکەڵاو بوونیان بە جەماوەری داخ لە دڵی خەڵکی عیراق و زاڵبوونەوەی بەسەر راپەرین و خۆپیشاندەرەکاندا، سەرکوتکردنی راپەرینەکی نەجەف و کەربەلا بەدرندەترین شێوە. زۆرێك لەو بەعسی و کاربەدەستە بەعسییانەی کە چووبوونە پاڵ جەماوەری راپەریو، لەلایەن دەزگاسەرکوتکرەکانی رژێمەوە دەستگیرکران و لە گرتووخانەی (رەزوانیە) کۆیانکردنەوە بەپێی (مەحکەمەی تایبەتی حزبیی)و (مەحکەمەی سەورە)، کە تایبەت بوو بەو کەسانە، زۆریان حوکمی لەناوبردن و لەسێدارەدانیان بەسەردا دراو زۆرێکیشیان حوکمدران و رەوانەی بەندیخانەی ئەبوغرێب کران، لەوانە ژمارەیەکیان بەر هۆڵی ژمارە (٨) کەوتن و یەکێکیان بەر ژوورەکەمان و یەکێکیشیان لەبەر بێ جێیی لەبەردەمی ژوورەکەماندا جێگایان دایە. ئەوەی هاتە ژوورەکەمان ناوی (میپم)ە. ئەم پیاوە پێش دەستگیرکردنی پلەی مولازم و فەرماندە بووە، لە دەزگای ئاسایشی تایبەتی خوێنرێژو تاوانبار (سەدام حسێن). ئەم بەناو ئەفسەرە، یەکێك بووە، لەو ئەفسەرانەی کە بۆ کاری تایبەت لەلایەن رژێمەوە لەکاتی داگیرکردنی کوەیتدا نێردرابووە کوەیت و تا گرتنەوەو چۆڵکردنی، لەو وڵاتە داگیرکراوەدا بووە. باسی دەیان کاری تاوانباریی دەکات، کە لەوماوەیەی لە کوەیتدا بووە ئەنجامیداوە، هەرچی کاری بەدرەوشتی و نامرۆڤانەیە بەبێ ئەوەی شەرم بکات باسی دەکات دەیگێڕێتەوەو شانازیی پێوە دەکات. کە گەرابووەوە لەکاتی راپەرین و پەلاماردانی شارەکانی نەجەف، کەربەلاو شوێنەکانی دیکە بەوپەری ناجوامێرییەوە بەشداریی سەرکوتکردن و کوشتن و برین و ماڵوێرانی دەکرد. بەشانازیی و بە پاڵەوانیتی باسی دەکات. داخ لەوە دەخوات کە نەزانانە کەسێکی بەناحەق کوشتووەو لەسەر ئەو کەسە حوکمدراوە.

ئەم تاوانبارە یەکێکە لەوانەی لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا بەشداریی کردووە. کە باسی ئەنفال و بەشداریکردنی دەکات، وەکو راجبێکی حزبیی و نەتەوەیی و نیشتمانیی باسیدەکات، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین شتی بێ رەوشتیی دەگێڕێتەوە کە لەکاتی دەسەڵاتیدا بێشەرمانە ئەنجامی داون. دەیزانی کە من لەسەر کوردو مەسەلەی میللەتەکەم دەستگیرکراوم، خۆشی پێم نایەت، بەڵام ناچارەو لە ژوورەکەماندایە، هەر دەبێت هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکات، منیش کە زانیم کەسێکی وا تاوانبارو بەدرەوشتە، گوێم بەوە نەدا دەمەوێت خۆمی لێ نزیکبکەمەوەو هەوڵ بدەم بەشێنەیی ئەو بەدرەوشتییانەی کردوونی و ئەو تاوانانەی کردوونی

لێدەربێنم و لای خۆم بیبیان هێڵمەوە. ئەم هەرچی باسدەکات وەکو ئەبو عەباسی ژووری (١٠) و سەعیدی ژووری (١٢) نییە. ئەم وەکو جاسم باسی تاوانەکانی دەکرد، دووانەکەی پێشوو بە ناخۆشییەوە باسیان دەکردو رووداوەکانیان دەگێرایەوە، بەڵام ئەم بەشانازییەوە رووداوەکانی دەگێرێتەوەو ئەو تاوانانە بە مافی رەوا دەزانێت، منیش بەهێمنیی و لەو کاتانەی کە دەزانم دڵی خۆشەو حەزی بەقسەکردنە، لیی نزیك دەبمەوە... رۆژێك لیی پرسیم (قادر کەرەم) شارەزایت؟ وتم: تەنها ناویم بیستووەو شارەزاییم لیی نییە. وتی: رۆژێك لەگەڵ هێزێکدا چووینە ئەو ناوچەیە. سەردانی چەند گوندێکمان کرد. خەڵکی دێیەکان زۆریان خزمەت کردین، ئێمە لەکاتی بەرچاییدا، واتە نان و چای بەیانیدا، چووینە ناویان. خەڵکی گوندەکە یەکسەر بەپیرمانەوە هاتن و نان و چای بەیانییان بۆ ئامادەکردین و بۆیان هێناین، نان و چاکەیان بریتی بوو لە (کەرە، پەنیر، هەنگوین، ماست، چاو نانی گەرم)، منیش وتم: ئەی ئێوە دوای ئەو خزمەتە چیتان پێشکەشکردن؟ پێکەنی و بەگاڵتە جارییەوە هەر هەموومان گولریژکردن. وتم: نابێت خۆ هەر لە خۆتانەوە نەچوون بۆ ئەو گوندانەو بەخۆرایی شەوتان بە کۆڵەوە نەگرتووە. لە بەیانی زوودا چوونەتە سەریان و بوونەتە میوانیان. دیارە بەپێی فەرمانێك شەوتان بەدەمەوە گرتووە کاری زۆر پێویست و گرنگتان هەبووە. یەکێك لە زیندانییەکان لەگەڵماندا دانیشتبوو، بەپێکەنینەوە و بەگاڵتەجارییەوە، وتی: دیارە ئەمان خزمەتی مرۆڤانەیان کردوون! خزمەتی ئەمانیش دیارە دەرمانە بەناوبانگەکە بووە بۆیان...

وتی: نا... نا ئێجگار واش نا بەپێکەنینەوە، وتی: دیارە ئێمە بەپێی ئەو فەرمانەی پێماندرابوو. خزمەتی خۆمانمان پێشکەشکردن. بێگومان زۆربەی ئەو خەڵکە تاوانبارو کەسوکاری تاوانباران بوون، واتە (پێشمەرگە) بوون، یان یارمەتی تاوانبارانیان دابوو. بۆیە ئێمەش بە دەرمان نا، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە. وەڵامی خزمەتەکەیانمان دایەوە، زیندانییەکە وتی: من ناڵێم ئەمان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی چوون بۆ ئەو ناوچەیە!! ئیتر باسی چۆنێتی ئەنجامدانی تاوانەکەیانی نەکرد.

هەر ئەم تاوانبارە دەگێرێتەوەو دەڵێت: لەکاتی ئەنفالەکاندا، هەر لەو ناوچەیە ژمارەیەکی زۆرمان دەستگیرکردو زۆریش خۆیان تەسلیمکردین، کە زۆربەیان پیاوی پیرو کوڕی گەنج و مێردمنداڵ بوون، موقەدەم (باریق) ئامرمان بوو. فەرمانی پێداین و وتی: ئەو تاوانبارانە (پێنج پێنج و دە دە) بۆم ریزکەن و بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێمدراوەو ئەو راسپاردەیەی پێم راگەیاندراوە بۆ سزاو لەناوبردنیان، دەبێت جێبەجێ بکەم. ئێمەش هەموویانمان لەسەر فەرمانەکەی وەکو ئەو وتی ریزمان کردن. ئینجا موقەدەم باریق فەرمانی دا وتی: چۆنتان پێدەڵێم وا گوللەبارانیان بکەن و لەناویان بەرن. ئامۆژگاریی کردین بۆئەوەی یەکسەر گیانیان دەرنەچێت و بە ئەشکەنجەو ئازارەوە بمرن، چونکە ئەمانە زۆر ئازارو ئەشکەنجەی ئێمەیان داوە، چەند ساڵە بەدەستیانەوە گیرمان خواردووەو دەناڵێنین، داخ و مەراقیان لیدەخۆین بەزەییتان پێیانا نەیەتەوە، وتی: شێوەی گوللەبارنکردنەکەش ئەوەیە هەریەکەیان پێنج

کونەیان پێوە بنێن و گوللەکانیش یەك بۆ قولەپێ، یەك بۆ لولاق و پووزی، یەك بۆ کلاوەی ئەژنۆی، یەك بۆ ئێسقانی سمتی و یەك بۆ کلۆکی. واتە فنجانەی سمتی و کەمەری... ئێمەش بەوشێوەیە گوللەبارانمان دەکردن، دەمانکوشتن، بەسەر یەکدا دەکەوتن، پەلەقاژەیان دەکردو هاواریان دەکرد بەدرەنگ گیانیان دەردەچوو. بۆ دڵدانەوەی من دەڵێت: ئەوانە هەرهەموو کەسانی دزو جەردەو پیاوخراپ بوون.ماڵی خەڵکیان تاڵانکردبوو، حکومەت لەبەر خاتری دەوڵەتییان ئەوانەی بەو شێوەیە لەناودەبرد، بۆئەوەی چیتر ناحەقیان بەرامبەر نەکەن، منیش حکایەتەیەکی لەناو ناخەوە پێم وت: قابیلە ئێوەو جەنابی (موقەددەم باریق) خەڵکی بێگوناه بکوژن و لەناویان بەرن!!. دیارە هەر وابووە!! ئێوە هەمیشە لە خزمەتی مرۆڤایەتی و ئینسانی کوردا زەحمەتتان کێشاوەو خزمەتتان کردووە!! ئەم تاوانبارە زۆرجار بێشەرمانە دەڵێت: ئەگەر من دەسەڵاتم بەدەست دەبوو. کورد چەند ملیۆنە لە عیراقدا، هەرهەموویانم کۆ دەکردەوەو کچ و ژنەجوانەکانیانم لێیان جیادەکردەوەو ئەوانی دیکەیان هەر هەموو لە دۆڵێکدا کۆ دەکردەوەو بەنزینم بەسەردا دەکردن و ئاگرم تێبەردەدان، هەر هەموویانم دەسووتاندن، یان وەکو ئێران چۆن هەڵەبجەی کیمایاباران کردو قڕی کردن، منیش وام لێدەکردن و کیمیاییم بەسەردادەکردن. ئەم تاوانبارە رۆژانە بەدەمییەوەیەو دەڵێت: خەسارەیە من لە زینداندابم. من هەموو تەمەنم لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بووە، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە خزمەتی حزبەکەم و حکومەتەکەم و میللەتەکەم و وڵاتەکەم کردووە. گوناه نییە ئالێرەدا بم؟ لەو خزمەتانە بێبەریی بکرێم، رۆژانە لەو بەناو خزمەتانەی کە بەمرۆڤ و مرۆڤایەتی کردبوو، باسدەکردو دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: سەرکردایەتی دوای ئەوەی من تاوانبارێکم کوشت، ناردیانم بۆ گرتنی کوەیت، وەکو فەرماندەیەك نزیکەی (٣٠٠) کەسم لەگەڵدابوو، لە کەسانی سەر بەدەزگاکەمان، هەر هەموو شارەزابوون لە پیاوکوشتن و دڵرەق و بێ بەزەیی بوون، بەکارامەیی کاریان دەکرد. بۆ کۆکردنەوەو گواستنەوەی هەموو ئامێرە گرنگ و تایبەتەکانی تەلێکس و قەمەری سەناعی و ئیستخبارات و ئەمنییەکان لەناو دامودەزگاکانی کوەیت و ماڵەکانیاندا بۆ شوێنی تایبەت لە بەغدا. دوای چەند مانگێك لە کوەیت گەڕامەوە. دوای راپەڕینی خەڵکی ناوچەکانی پارێزگاکانی خوارووی وڵات، بە مەبەستی کوژاندنەوەو سەرکوتکردنی ئەو راپەڕینە، نێردرام بۆ شاری نەجەف و کەربەلا. فەرمانیان پێدام و منیش بەوپەڕی شانازییەوە گوێڕایەڵیم بۆ فەرمانی سەرکردایەتی کرد. هەر زوو خۆم کۆکردەوەو خۆم گەیاندە ئەو شارانە. بە مەبەستی خزمەتی حزب و حکومەت و وڵاتەکەم چووم بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی!! کە پەلاماری کەربەلامان دا دەستمان لە ژن و منداڵ و پیرو گەنج نەدەپاراست. تەڕو وشکمان بەیەکەوە دادەپاچی و دەسووتاند، لە هەرماڵ و گەرەکێك تەقەو بەرەنگاریی بکرایە. خانوو و گەرەکەکەمان بەخەڵکەکەوە تەخت دەکرد. دەڵێت: ئەو خەڵکە زۆر چاونەترس بوون. کاتێك ئێمە چووینە ناو کەربەلاوە، کچێك نارنجۆکێکی بۆ سەیارەیەك فڕێداو تەقییەوە. زیاد لە حەوت لێپرسراوی کوشت، کە لەو سەیارەیەدا بوون. دیسان

دەڵێت: کە لە کەربەلا گەرامەوە، نێردرام بۆ کوژاندنەوەی ڕاپەڕینی (مەدینەی سەورە)، کە لەوکاتەدا ڕاپەڕیبوون لە حکومەت یاخی بووبوون. دەسەڵاتیان پێدام کە بەئارەزووی خۆم مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکەم، لە کوشتن و لەناوبردن سڵ لە کەس و لە هیچ نەکەمەوەو دەست نەپارێزم. لە ئەنجامدانی ئەم کارەمدا سەرکەوتوو نەبووم. لە پەلاماری مەدینەی سەورەدا تەنها هەشتا کەسێکم بۆ کوژرا، دوای سەرنەکەوتنم، ناردیانم بۆ دادگا لەسەر کوشتنی ئەو پیاوە. ئاخر گوناه نییە من لێرەدا بم؟! لە مەحکەمەو لەبەردەمی حاکمدا باسی ئەو شتانەم بۆ دەکردن، حاکم کارەکانی بەهەند وەرنەگرت و جگە لەوەش رقی لێم هەستاو زۆری پێ ناخۆشبوو، کە من ئەو کارانەم کردووە. بۆیە بەبێ هێنان و بردن لەیەك جەلسەدا حوکمی (٢٠)ساڵی بەسەردا دام و هەرچەند هاوارم کرد، کەڵکی نەبوو.

ئەم تاوانبارە، لەگەڵ ئەوەی بە (٢٠) ساڵ حوکمدراوە، لە بەندیخانەشدا هەر داکۆکیی لە حزبی بەعس و ڕژێمەکەی دەکات، بە بەردەوامی هاتوچۆی ئیدارەی بەندیخانە دەکات. زیندانییەکان لەسەر ئەو ڕەفتارەی خۆشیان ناوێت، ئەم پیاوە بەعسییەی کە لە مەحکەمەی تایبەتدا حوکمدراوەو هێنابوویانە بەردەمی ژوورەکەمان. من خۆم لەگەڵدا نزیککردەوە بۆ ئەوەی هەندێك زانیاریی لەسەر ڕاپەڕین و بەندیخانەی (ڕەزوانیە)و چارەنووسیان وەربگرم. ئەویش، ڕۆژانە باسی ڕاپەڕینەکەو بێدەسەڵاتیی دامودەزگاکانی حکومەت و پەلاماری جەماوەری بۆ کردم، ئەوەی درکاند کە زۆربەی بەعسییەکان و کاربەدەستانی دامودەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات دەچوونە پاڵ جەماوەری ڕاپەڕیو، وازیان لە حزب و حکومەتەکەیان دەهێنا، باسی بەندیخانەی ڕەزوانییەی بۆ کردم کە بەهەزاران ئەندام و خاوەن پلەی حزبیی و حکومیی تێدا بەندکراوە، ڕۆژانە لە ڕێگای مەحکەمەیەکی تایبەتییەوە، بەسەدانیان لێ گوللەباران دەکرێن، زۆریشیان لەسێدارە دەدرێن و زۆریشیان بە حوکمی (٢٠) ساڵ و موئەبەد حوکم دەدرێن. باسی چۆنیتیی ژیانی ئەو بەندیخانەیەی بۆ کردم، کە چەند بە ڕەزالەت و لەوپەڕی ناخۆشیدا ژیاون، مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە. ڕۆژێك (میثم) پێی زانی کە لەگەڵمدا قسەو هەڵسوکەوت دەکات، دەیزانی کە بێزارە، بۆیە یەکسەر یەخەی پێگرت و پێی وت: (ڕەفیق) ئاگاداربە قسە بۆ ئەم نەکەیت، ئەم کوردەو سەر بەموخەربین بووە، لەسەر ئەوە حوکمدراوە. هەرچی بۆباس بکەیت، لەسەرت دەکەوێت. کابرا یەکسەر ئیستێکی کردو ترساو بەهەڕەشەی زانی لەدواجاردا پێی وتم: داوای لێبووردن دەکەم، با زۆر بەیەکەوە نەمانبینێت، دەترسم لەسەرم بنووسێت و تووشی بەڵایەکی دیکەم بکاتەوە...

# ژووری (١٢)ەو نووسین و چەند شتێك

دوای ماوەیەك تەنها من و کاکەحەمە بەسەفەرداشی یەك ماینەوە، شێخ مارف جیابووەوە. هەموو بەیانییەك کاکەحەمە دوای مەستەر چای لێدەنێ، دێت بۆ ژوورەکەم بەئەسپایی هەڵم دەستێنێ و پێم دەڵێت: چا پێگەیوەو بابچینە خوارەوە نان و چای بەیانی بخۆین.

لەم ژوورەدا مامەوە تا ئازادبوونم و لەم ژوورەدا بەزۆریی نامەو شیعرو شتم نووسیوە... لە قاتی سەرەوە دوو ژوور هەن وەکو کارگەی دروستکردنی شت وایە، ژووری پانزەو ژووری پانزە. لە ژووری پانزە چەند کەسێکی لێیە، بەهۆی هاتوچۆوە، پەیوەندیم لەگەڵیاندا پەیداکردووە. زۆر دەچمە ژوورەکەیان، سەیرمدەکرد هەریەکەیان بەکارێکەوە خەریکە، شەو و رۆژ ئەو کارەیان دەکرد، قوتووی نووقل و دەستەسرو ملوانکەو مەدالیاو جۆرەها کاری دەستیی دەکەن. هەموو کەرەستەیەکیان لایە. زۆر شتم لا بەکرد دان و بۆ منداڵەکان و بۆ هەندێك کەسی نزیك. ژووری پانزە بەهەمان شێوەیە، بەڵام زۆر ناچمە ژوورەکەیان. تەنیا یەك پیاویان تێدایە، کە لە سوپادا موقەدەم بووە، نازانم لەسەر چی گیراوە، ئەم پیاوە، ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی بووە، هەموو جار باسی (عوسمانی حەمەی نادر)م بۆ دەکات و باسی دووکانەکەی و وێنەی کەرەکەی و (حزبی کەرانی) دەکات. زۆر بە عوسمان سەرسامە. لێم پرسی لای عوسمان داخڵ بوویت؟ دەڵێت: نا...نا... زۆری هەوڵ لەگەڵدادام ببمە ئەندامی حزبەکەی، بەڵام رازیی نەبووم. هەفتانە سەرم لێدەداو ئەویش بەگەرمیی پێشوازیم لێدەکات. دوای چەند مانگێك محەمەد حەنحون ئازادکرا، قەرەوێڵەی بەردەمی حەمامەکەو لای دیوارەوە چۆڵ بوو، منیان خستە ئەو شوێنەو شوێنێکی خۆشە. لە جەنازی رزگارم بوو.

رۆژێك لە تارمەکەوە لای موحاجەرەکە راوەستابووم. کاتێکمزانی یەکێك بەلەسە بوو. هەرکەسێك بهاتایەتە رێی، شقارتەیەك مووسی بەدەموچاودا دەهێنا. لەو بەلەسەبوونەیدا زیاتر لە (١٠-١٢)کەسی خەڵتانی خوێن کرد. ئەم کەسە لەوجۆرە کەسانەیە. کە مودیمنە لەسەر حەب خواردن، وەکو سەرخۆشێکی بەدمەستی هەڵەشە چەند مووسێکی لە قاوغە شقارتەیەکدا ریزدەکردو دەیخستە ناو دەستییەوەو ئەو جۆرە کارانە دەکات، تا دەیگرن و قاوغە شقارتەکەی لێدەسەنن، چەند کەسێك بەفەتارەت دەبات و موراقیب لە دەرگا دەداو سەجانەکان دێن و تەسلیمی سەجان و ئیدارە دەکرێن و دەبرێتە مەحجەر، ئەوانەشی برینداربوون دەبرێن بۆ نەخۆشخانەو تەداوی دەکرێن و دەگەرێنەوە.

(محەمەد حەنحون) کە بووینە هاورێ، شەوانە بەیەکەوە دادەنیشتین و ئەو شوێنەکەی لە ژوورەکەدا زاویەیەو باشترین شوێنە لە ژوورەکەدا. باسی رابواردنی خۆیم بۆ دەکات، کە چۆن رای بواردووەو هەموو جار دەیوت خۆزگا ئازاد دەکراین و دەهاتی بۆ بەغداو میوانی من دەبوویت، بەراستیی پیاوێکی ئێجگار بەزەوق و هەمیشە کراوەو خاوەن نوکتەو

سەرگوزشتەی جۆراوجۆرە. چەند ژمارە تەلەفۆنێکی بۆ نووسبووم، بۆئەوەی کە ئازادبووین و چووم بۆ بەغدا، بەو ژمارە تەلەفۆنانە بیدۆزمەوە. رۆژگاری بەندیخانەو عیراق واکەوتەوە، کە نە من بەغدام وەکو پێویست بینییەوەو نە ئەویش توانی دوای ئازادبوونی سەردانی کوردستان بکات...

# مانگی (١٢)، مانگێکی ئاڵۆزە

لەنیوەی مانگی (١٢)دا کە کاتی مواجههەیە. لەبەر بارودۆخە ئاڵۆزەکەی عیراق و کوردستان و ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی، زۆر کەم، بەڵکو تاکوتەرا هاتوون بۆ مواجههە، ئەوانەشی هاتوون زۆربەیان خەڵکی بەغدان. ئێمە لە کوردستانەوە کەسوکارمان نەهاتوون، ئەوانەی هاتوون بۆلام هەردوو هاورێم (کاک حەمەرەشیدو کاک حەمەنووری)ین. (باسی هاتنەکەیان و راسپاردەکەیانم لە رۆژمێری زینداندا نووسیووە بەپێویستی نازانم لەم بەتەشدا بینووسمەوە).

لەدوای هەفتەی یەکەمی مانگی دوانزەوە، رۆژ بەرۆژ بارودۆخی عیراق گرژترو ئاڵۆزتر دەبێت، عیراق گوێی بەهەوڵ و هەرەشەو لەشکرکێشی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی نادات و سوورە لەسەر داگیرکردن و نەکشانەوەی لە کوەیت. هەموو شارەکانی عیراق شڵەژاون و دەیانەوێت لە شاری بەغداو بەسرەو شارە نەوتیی و پیشەسازییەکان دووربکەونەوە، بۆئەوەی کە لە عیراق درا، دووربن لە زیانی مرۆیی: واتە، بەگشتیی خەڵک دەربەستی ماڵ و خانوو و دووکان و بەرژەوەندییان نەماون، ئەوەی بەلایانەوە گرنگە، دەرچوونی سەریانە. خەڵك جگە لەوەی دەیەوێت خۆی دەرباز بکات لە مەرگ، دەیانەوێت بە هەرنرخێك بووە کەمێك ئازووقە پاشەکەوت بکەن و لەگەڵ خۆیاندا بیگێڕن، بۆئەوەی رووبەرووی برسێتی و مەرگی بێخواردنیی نەبنەوە، ئەو پوول و پارانەی هەیانە لەگەڵ خۆیان هەڵیگرن و بیکەنە هێزو پاڵپشتی ئابووریی بۆ رۆژانەی ژیانیان، لەکاتی لیقەومانیاندا، کە بەهۆی شەری کەنداوەوە تووشیان دەبێت، گرانیی و نەبوونی ئازووقەو خواردن بەشێوەیەکە، کە خەڵکی خاوەن ئیمکانییەت نەبوونایە، نەیاندەتوانی فەردەیەك گەنم بە پارە بکرن. دووکاندارەکان وەکو بازرگانی شەر خوردنیان شاردەوەو لە عەمباری نهێنیدا هەڵیانگرتووە، بۆئەوەی بەگران بیفرۆشن. بەکورتی چاوچنۆکانی بازارو دووکاندارە بێویژدانەکانیش لەلایەکی دیکەوە دەیانەوێت دەست بخەنە بینەقاقای خەڵکی هەژارەوە.

دیارە لە بارودۆخێکی وادا کوردستانیشی گرتووەتەوە، خەڵکەکە هەرهەمووی شپرزەی ئەو وەزعەن و کەسوکاری ئێمەش دیارە لەهەموو کەس زیاتر شپرزەترن، لەبەر بێکەسیی و بێدەرامەتیی، بەوهۆیەوە کەس لە کوردستانەوە نەهاتوون. کاك حەمەرەشیدو کاك حەمەنووریش لەم کاتەدا بۆکاری تایبەت هاتوون بۆ بەغدا، بەهەڵیان زانیوە، کە لەنیوەی مانگدا سەرێ لە منیش بدەن.

منداڵەکان رادیۆیەکیان بۆ هێنابووم. شەوانە لەکاتی خەودا کە بەندیخانەکە هێوردەبێتەوەو زیندانییەکان لە تەلەفزیۆن دووردەکەونەوەو بەرەو نووستن دەچن، لەژێر جێگا گوێ لە رادیۆکە دەگرم، بەزۆریی دەنگوباسی ئیزگەکانی (لەندەن و دەنگی ئەمریکاو مۆنتیکارلۆو ئیسرائیل) وەردەگرم. شەوانە سەعات بەسەعات هەواڵەکان دەگۆڕێن و دۆخەکە بەرەو گرژترو

گرژتر دەچێت.

شەوی وایە تا سەعات (٣)ی شەو ناَنووم و هەرگوێ لە رادیۆ دەگرم. زۆر شەویش بەیانییان زوو هەڵدەستم، گوێم لە هەواڵەکانی بەیانییان دەگرم. وەرگرتنی ئەو هەواڵ و گوێگرتنە لەوانەی کە لەسەر شەڕی کەنداو دەدوان، منیان خستووەتە دنیایەکی جەنجاڵەوە، بە بەردەوامی منیش لای خۆمەوە تاوتوێی مەسەلەکان و بارودۆخەکەی عیراق و کوردستان و بزووتنەوەکەمان دەکەم. بەهۆی بارە ئاڵۆزەکەوە لە مانگی دوانزەدا زۆر بەکەمیی ساحە دەکرێتەوە. دیارە ئەوەش بۆ ئەوەیە زیندانییەکان هەواڵ و دەنگوباس لەیەکتر وەرنەگرن، دۆخی بەندیخانە نەشلەژێت و تێکنەچێت. گیانمان بەوەیە، خواردنمان زورە. مانگەکە دەستمان پێوەگرت و تا سەری مانگ بەشیکردین.

لەسەری مانگی یەکدا بەهۆی سەری ساڵ و مواجەهەی سەری مانگ و شەشی کانوونەوە دەبێت سێ مواجەهە بکرێن...

بەڵام لەسەری مانگدا مواجەهە کراین کە بۆ ئێمە دەکاتە مواجەهەی پێنجەممان...

لەهاتنی مواجەهەکاراندا باسی دۆخی کوردستان و خەڵك و ڕێگاوبانیان بۆکردین و هۆی نەهاتنیان بۆ باسکردین (سەبارەت بەو مواجەهەیەش لە رۆژژمێرەکەمدا نووسیوومە. دەمەوێت لە رۆژژمێرەکەدا چۆن نووسراوە، هەر وابێت و لێرەدا باسی مواجەهەکەو ئەو کەسانەی هاتبوون بۆلام، باس ناکەم).

## مانگی (١٩٩١/١)، نزیکبوونەوەی وادەی جەنگ

ڕۆژ بەڕۆژ هەواڵەکان بەرەو دەستپێکردنی جەنگ و لێدانی عیراق گەرم دەبن، هەوڵە دیبلۆماسییەکانیش لە هەموو لایەکەوە چڕترو بەردەوامن... سەدام و ڕژێمەکەی سوورن لەسەر مانەوەیان لە کوەیت. ئەمریکاو هاوپەیمانانیش لەگەڵ هەوڵە دیبلۆماسییەکاندا، پەیتا پەیتا هێزی پڕچەك و کەشتی پڕچەك و سەربازییان ڕەوانەی دەریاکان و وڵاتانی دەوروبەری عیراق دەکەن.

ئازووقەو خواردنمان کەمبووە. بەتەمای ئەوەش نین کە لەسەری مانگ و بۆنەکاندا کەس بێت بۆ مواجەهەمان، بەڵام لە یەکی مانگداو لە ١/٦-دا مواجەهەمان هات، هەردوو مواجەهەکە هەرچەند نزیکی یەکن، بۆ ئێمە کاریگەریی خۆیان هەیە، چونکە کۆمەڵێك پێداویستییان بۆ هێناوم، کە بۆ ئەم کاتە زۆر کەڵکمان لێوەرگرت، خواردنی وشکەی هەمەجۆریان هێناوە. (چۆلەیەکی) نەوتی بچووکیان لەگەڵ یەك جلیکانە نەوت هێناوە. ئەو چۆلەیە بۆ کاتی نەمانی غاز کە چاوەڕوان دەکرا غاز نەمێنێت، بۆ ئێمە زۆر گرنگ و سوودبەخش دەبێت. لەڕاستیدا چ نەوتەکە چ چۆلەکە قەدەغەن بهێنرێنە ناو بەندیخانە، بەڵام چۆنیان دەربازکردووە، نازانم؟! گرنگ ئەوەیە هێناویانە، من دەڵێم ئەوە ئامێرێکی یەدەکی خواردن لێنانم لەجیاتی غاز هەیە، ترسی ئەوەم نەماوە، کە غاز نەما پەکمان بکەوێت. دەبێت (چ چۆلەکەو چ نەوتەکە) لە شوێنێ باش قایم بکەین. هەردووکیانمان لە ژووری کاکەحەمەو لەژێر قەرەوێلەکەیدا داناوە. باوەڵە ئاسنەکەم پڕکرد لە ئازووقەی وشك، دامنا بۆکاتی تەنگانەمان. وام داناوە کە ئەو ئازووقەیەمان هەر نییەو قفڵم لێداو لەژێر قەرەوێلەکەمدا دامناوە.

ڕادیۆیەکی بچووکی یەك مەوجیشیان بۆ هێناوم. هەرچەندە ڕادیۆیەکم هەیە. ئەویشم داناوە وەکو یەدەك نەوەکو ڕادیۆکەم بگیرێت. لە مانگی یەکدا ڕۆژانە هەواڵی جۆراوجۆر بڵاو دەبێتەوە لەسەر چۆڵکردنی بەندیخانە بەگواستنەوەمان بۆ شوێنێ دیکەو دوورخستنەوەمان لە بەغدا، یان ئازادبوونمان و ناردنمان بۆ خزمەتی سەربازیی و دابەشکردنمان بەسەر یەکەکانی سوپادا.

چوونە ساحە نەماوە... ئەوەی هەیە تەنها لەناو ژوورو هۆڵ و حەوشەی هۆڵەکاندایە.

نەك بۆ ئێمە، بەڵکو سەرپاکی زیندانییەکان بەوانەشی کە بەعسی و سەر بە دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی وەکو ئەمن، ئیستخبارات، موخابەرات و پلەداری سوپان، هەرهەموو بەئاواتەوەن لە عیراق بدرێت و بەندیخانە بشکێت و بچنە دەرەوە. کەس نابینی دڵسۆزیی بۆ بەعس و ڕژێمەکەی و سەرۆکەکەی مابێت. هەرهەموو لە چاوەڕوانیی ئەوەدان زرمەی لێهەڵستنن و لەگەڵ لێدانیدا ڕاپەڕین دروستببێت و خەڵك پەلاماری بەندیخانەکان بدەن و بیشکێنن...

لە مواجەهەی ٦ی مانگدا ئەوەیان پێڕاگەیاندین کە ئیتر رەنگە نەتوانن بێن بۆلامان و چاوەڕوانیان نەکەین، چونکە وەزعەکە لە کوردستانیش ئاسایی نییە، هەرهەموو خەلك بەنیازی راپەڕین و خۆسازدانی پەلاماردانی دامودەزگاکانی رژێمەو هەمەجۆر کار بۆ راپەڕین و پەلاماردان کراوە.

هەرچی چەکداری کوردی (جاشە) بەچەندین رێگا پەیوەندییان پێوەکراوەو رێکخراون، نەخشەیان بۆ داڕێژراوە. جگە لە موستەشارەکان و زۆربەی مەفرەزە تایبەتییەکانی سەر بەئەمن و ئیستخباراتیش پەیوەندییان پێوەکراوە، پەیوەندیی بە زۆر ئامیر فەوج و لیوای سەربازیش لە عەرەب و کورد کراوە. بەکورتی بارودۆخەکە بەشێوەیەك سازو ئامادەکراوە. چاوەڕوانی ئەوەدەکرا، لەگەڵ یەکەم زرمەدا، دۆخەکە وەکو بوورکانێك بتەقێتەوەو لەچەند رۆژێکدا هەرچی دامودەزگاکانی رژێم هەیە دەستیان بەسەردا بگیرێت و کوردستان لە دەسەڵاتداریی بەعس پاکبکرێتەوە.

ئێمەش هەموو خواست و ئاواتەکانمان لەسەر ئەو راپەڕینە هەڵچنیوەو دڵخۆشین، بەکورتی مانگی یەکی ساڵی ۱۹۹۱ مانگێکە، لەو مانگانەی کە ئێمەو هەموو خەڵکی عیراق و کوردستان بەتایبەتی، سیوپێنج ساڵە چاوەڕوانی دەکەین، کە لە مانگێکی وادا بەهۆی هێزی دەرەکیی و بەتایبەتی هێزەکانی ئەمریکاوە دەتوانرێت رژێمی بەعس و دیکتاتۆرییەتی سەدام برووخێنرێت، لەناوببرێت و تۆڵەی تاوان و زووڵم و رەفتاری فاشییانەی بەعس بکرێتەوە، کورد تۆڵەی کیمیابارانی کوردستان و ئەنفال بکاتەوە... بەراستیی مانگی یەك، مانگێکی ئێجگار چارەنووسسازە بۆ گەلی عیراق.

هەرچەندە ئێمەی زیندانیی مەترسی ئەوەمان هەیە، لەکاتی لێدانیدا پریشکمان بەربکەوێت و بکەوینە بەر شاڵاوی هەردوو هێزی شەڕکەری عیراقی و ئەمریکایی و هاوپەیمانان. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین خوا دەکات لێیدەدرێت و لەناو دەبرێت، ڤیروسیا لە ئێمەش، کۆمەڵێکمان تیابچین، گرنگ ئەوەیە خەڵکی عیراق لەدەست ئەم رژێمە دکتاتۆرو فاشییە رزگاری بێت.

چەندمان بەلاوە خۆشە، کە هەواڵەکان ئەوەیان دەگەیەنن کە سەدام و دەسەڵاتەکەی رازی نابن بەکشانەوەو لەئامادەباشی جەنگکردندان. هەرهەموو بە ئاواتەوەین کە هیچ هەوڵێکی دیبلۆماسییانە بۆ ئاشتی سەرنەگرێت و شەڕ دەستپێبکات.

چەند خۆشە، شەوی ١/١٧ هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمنان دەستیان بە لێدانی هێزەکانی عیراق کرد، لەهەموو قۆڵەکانەوەو سەر بەغدا ببوە چراخانی ئاگربارانی جۆرەها چەك و زرمەو دەنگی لێدانەکان بەشێوەیەکە، کە وای بۆدەچین بەغدا بەسەر یەکدا رووخابێت، رژێم دەست خرابێتە بینەقاقای و هێزو توانای نەمابێت، کە دەزگای راگەیاندنی رژێم لەکارکەوتن و دەنگیان نەما... ئەو رادیۆو تەلەفزیۆنانەی بە بەردەوامی پێش رۆژی ١/١٧ بانگەشەی شەڕو بەرگریی و پەلاماردانیان دەکرد، لەیەکەم زرمەدا کپ و بێدەنگکران و نووزەیان لێبڕا.

ئەم شەوە باوەڕناکەم کەسێك هەبووبێت لەم بەندیخانەیە خەو چووبێتە چاوی، هەرهەمورو بەئاگان و لەگەڵ هەر زرمەیەکدا هەرکەسە لە دڵی خۆیەوە ئافەرینی هێزی ئەمریکاو هاوپەیمانانیان دەکات. منیش گوێم بە رادیۆکەوە ناوە. پەیتا پەیتا لە ئیزگەکانی (مۆنتیکارلۆو لەندەن و دەنگی ئەمریکاو ئیسرائیل) هەواڵەکانی شەڕ وەردەگرم و لەگەڵ هەر هەواڵێکدا خوێنێکی تازە دێتە گیانمەوەو تەمەنم گەنج دەبێتەوە.

## لێدانی هاوپەیمانان و بەڕێوەبەری بەندیخانە

لە ناوەڕاستی مانگی یەکەوە، ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی، بەهەموو جۆرە چەکێك و لەهەموو لایەکی کوەیت و عیراقەوە، کەوتنە لێدانی سەربازگە، پرد، پرۆژەی ئابووریی، پیشەسازیی، دامودەزگا جۆراوجۆرەکانی ئەمن، ئیستخبارات، موخەبەرات، تەلەفزیۆن، ئیزگەو هەموو شادەمارە سەرەکییەکانی رژێمی عیراق، بنکە، بارەگا، سەربازگەو شوێنێکی ستراتیجی رژێم نەما بەخەستیی لێنەدرێت و خاپوورو وێران نەکرێت، لەماوەی ئەو کوتان و لێدانەدا، بەراسپاردەی سەرانی رژێم، ئیدارەی بەندیخانە، لەناو بەندیخانەی ئەبوغرێبدا چەند کارێکیان لەگەڵ زیندانییەکاندا کرد. لەوانە بەرێگای پڕکردنەوەی نووسینێك کە لەلایەن زیندانییەکانەوە پڕبکرێتەوە، داوایان لە زیندانییەکان کرد ئەو نووسراوە پڕبکەنەوە، بە مەبەستی ئەوەی دوای پڕکردنەوەی، زیندانییەکان ئازاد دەکرێن و بەندیخانە چۆڵ دەکرێت، لەو نووسراوانە ئەمانەیان نارد:

یەکەم:

**نقد**

**انی نزیل..... والمحکوم وفق المادة.... ق.ع، انقد نفی نقدا شدیدا کوني کنت متسترا علی... وانی أباء من عملی هذا المذکور اعلاه والي الأبد وسأعمل لخدمة العراق العظیم تحت رایة بانی نهضة العراق السید الرئیس القائد صدام حسین حفظه الله ورعاه**

**النزیل**

دووەم:

**السید الرئیس القائد صدام حسین حفظکم الله ورعاکم**

**م/ استرحم**

**انی النزیل..... المحکوم وفق الماده....... ق.ع ارجو التفچل بشمولی بعگفکم الابوی و رحمتکم بقرار العفو المرقم ٢٤١ فی ١٩٩١/٣/٢١ کونی صاحب عائله ولاشارك فی بناو العراق العظیم تحت رایه سیادتکم حفظکم الله ولکم جزیل الشکر والاحترام**

**النزیل**

رژێم دیارە ئەمانەی بۆیە دەکات، بۆئەوەی زیندانییەکانی بەندیخانە هێوربکاتەوەو کەس بیر لە شکاندنی بەندیخانەو راکردن نەکاتەوە... کاتێك ئەم نووسراوەیان هێنا، زیندانییەکان هەر بۆئەوەی ئازادبکرێن بەناچاریی پڕیانکردەوە...، بەڵام وەکو وتم ئەمانە تەنها بۆ

هێورکردنەوەیە، ئەگینا هیچ کاریکیان لەسەر نەکراو کەسێکیان لەسەر پڕکردنەوەی ئەو نووسراوانە ئازاد نەکرد. بۆیە کار گەیشتە ئەوەی لەناو بەندیخانەی ئەبوغریبدا، چەند کەسێك بیر لە هەڵاتن بکەنەوەو توانییان رابکەن و لە دەرەوەی بەندیخانە دەستگیرکرانەوە، کە دەستگیرکرانەوەو هێنایاننەوە ناو بەندیخانە، زۆر بەناشیرینی سەرو سمێڵ و برۆیان تاشین و بە رووتوقووتیی خستیاننە سەر عەرەبانەیەکی دەستیی و بەناو ڕاڕەوەکەو بە بەردەمی ڕەدهەو هۆڵەکاندا دەیانگێڕن و نامرۆڤانە ئیهانەیان دەکەن و لێیان دەدەن.

سێیەم:

هەر لەوسەردەمەی لێدانەدا، کەوتنە ناونووسینی ئێمەو وەرگرتنی زانیاریی، بەمەبەستی ئەوەی کە گوایە لە بەغداوە دەمانگوێزنەوە بۆ بەندیخانەی (بادوش) لە موسل... ناوی هەمووومانیان نووسی، بەڵام ئەو ناونووسینە نەبووە هۆی ئەوەی ئێمە لە بەندیخانەی سەقیلەی ئەبوغریبەوە بگوێزنەوە بۆ بەندیخانەی بادۆش لە موسل.

جگە لەمانەی سەرەوە چەندینجار بانگیان کردین و ناویان نووسین، گوایە بۆ مەبەستی ئازادبوونە، بەڵام هەر هەمووی بۆ خلەفاندن و چەواشەکردنمانە.

## مانگی (٣)و راپەرینەکان

لەگەڵ تێکشکانی هێزەکانی عیراق لە کوەیت و دەوروبەری و ناچارکردنی بەکشانەوەو پەرش و بڵاوبوونەوەی لە بەسرەو دەوروبەری، بەدوای راگەیاندنی وەستانی شەڕ لەلایەن هاوپەیمانانەوە لە ٢٥-٢/٢٦-ەوە خەڵکی داخ لەدڵ و رقنەستووری عیراقی شیعە، بڕیاری راپەڕینی جەماوەرییان دا، لە شاری بەسرەوە کەڵکی زۆریان لە پەرتەوازەیی و شکانی سوپای عیراق بینی، بە بەسرەوە رانەوەستا راپەڕینەکە زووربەی شارە شیعەنشینەکانی وەکو (نەجەف و کەربەلا)ی گرتەوە، هەر ئەو راپەڕینە تەشەنەی کردو بەغداو هەندێك لە شارە سووننی مەزهەبییەکانی بەرەو پەلاماردانی دامودەزگاکانی رژێم برد. بەپێی ئەو هەواڵانەی لە ئیزگەکانەوە وەریدەگرم، بەتایبەتی ئیزگەی تاران، زۆر بەگرنگییەوە باسی راپەڕینەکانی دەکات و هانی جەماوەر دەدا، کە پەیوەندیی بە جەماوەری راپەڕیوەوە بکەن. هەواڵەکان وا دەگەیەنن، بەعسقرانەو دەستیان لە سەران و بەرپرسانی حزبیی، ئەمنیی، ئیستخباراتی و حکومیی ناپارێزن، بەشێوەو شێوازێك راپەڕیوەکان پیاوانی بەعسیان بە سزای تاوانبارییان دەگەیەنن، کە دوورە لە (نەریتی شۆڕش و شۆڕشگێڕیی). بەتەورو قەمە سەربڕین و لەتوپەتکردن و هەڵواسینیان بە قەنارەی قەسابیدا. ئەوە هەموو ئەنجامی داخلەدڵیی جەماوەرەکەیە، لە مامەڵەو رەفتاری چەندین ساڵەی پیاوان و سیاسەتی ئەو رژێمەدا.

من کاتێك لە ئیزگەکانەوە گوێبیستی ئەم هەواڵانە دەبم، بست بست باڵام دەکەم و دەست بەسەر دڵمدا دەهێنم. ئەم راپەڕینە لەکۆتایی مانگی دووەوە تا ناوەراستی مانگی سێ هەر بەردەوامە، ناویشیان لێناوە (راپەڕینی شەعبان). راپەڕینەکە سەیر لەوەدایە هەر جەماوەرە رقنەستوورەکەی دژی بەعس نییە، بەڵکو بەهەزاران لە پیاوەکانی بەعس و حزبیی و حکومیی لە رۆژانی پەلاماردانی دامودەزگا حزبیی و حکومییەکاندا، پەیوەندییان بە جەماوەرەوە کردووە دەچنە پاڵیان، ئەوانیش هاوبەشی نەمانی بەعس و دەسەڵاتدارییان دەکەن.

# ئێمەو راپەڕینی کوردستان

رۆژانی (٣-٣/٤)یە، هاورێکەم جارجارە دەیهەژاندم بەوەی کە جەماوەرو (هێزی پێشمەرگەی کوردستان)، بەدەستییانەوەیە راپەڕن، دەیانەوێت هەلی ئەوە بقۆزنەوە، کە لە ناوەراست و خوارووی عیراق راپەڕین و جەماوەری شارەکان دەسەلاتدارانی رژێمیان شپرزەکردووەو کورسی فەرمانرەواییان خستووەتە جوولە، بەهۆی ئەو راپەڕینەوە زۆر زۆر سەرقالن و هەرچەند دەکەن راپەڕینەکەیان بۆدانامرکێتەوە. کوردیش داخ لەدڵەو دەیەوێت فرسەت بهێنێت و لە هاوشانی راپەڕینی عەرەبی شیعە مەزهەب راپەڕن و تۆڵەی ئەنفال و کیمیاباران و سووتماککردنی کوردستانییان لێبکەنەوە. ئیزگە بەدوای ئیزگەدا ئەم هەواڵانەیان رادەگەیاندو شەو دەنگی گەلی کوردستانم وەرگرت، هەندێك شتی بلاوکردەوە هەرهەمووی بروسکەئاسا. ئەوەیان دەردەخست کە بۆ رۆژانی راپەڕین چەند ژمارەو چەند هێماو دەستەواژەیەك دانراوە. شەوی ٣/٥ هەواڵەکان چڕبوونەوە شەوی ٣/٦ هەواڵەکان ئەوەیان گەیاند، کە جەماوەرو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە هاوکاریی هێزی پێشمەرگە لە شاری رانیەو حاجی ئاواو چوارقوڕنە راپەڕیون و بەهەزاران هەزار ئەفسەرو سەربازی سوپای عیراق خۆیان تەسلیمی جەماوەرو پێشمەرگە کردووە، هەرچی بارەگای حزبیی و رێکخراوەیی و دەزگاکانی حکومەتە لەو شوێنانە دەستیان بەسەرداگیراوە، ئەوەی بەرگریی کردووە کوژراوە، ئەوەشی خۆی تەسلیم کردووە، چەکەکەی لێوەرگیراوەو تێکلاوی تەسلیمکراوەکان کراون.

بەیانییەکەی گوێم لە رادیۆکەم گرتەوە، هەواڵەکان هەرهەموویان مژدەبەخشن، ئەو مژدانە ئەوانەن کە ساڵانێکی ئێجگار زۆرە چاوەڕوانمان دەکردن. چەندم بەلاوە خۆشە، کە گوێم لێیە، رایانگەیاند کە بەبێ بەرگریی ئەو هەموو سوپایەی کە لە رۆژانی ئەنفالدا، خۆی لەژوور دەسەلاتی خواوەوە دەبینی، کەچی زەلیل و شەرمەزار خۆیان تەسلیمی پێشمەرگەو جەماوەر کردەوە، بەوە رازیبوون کە نەکوژرێن، رایانگەیاند کە بەبێ بەرگریی ئەوهەموو سوپایەی کە لەرۆژانی ئەنفالدا کوردستانیان خاپوورکردبوو، بە سەرشۆڕیی لەژێر دەستی هێزو جەماوەری راپەڕیوی کورددان، کاتێك گوێم لەوە دەبێت، کە بلاودەکرایەوە، قوتابخانەکان و مزگەوتەکان سیخناخ کراون لەجیاتی ئەوەی ئەو سەربازانە سەرزەنشت و لاقرتی پێکردن بە کورد، لەو رۆژەدا خواخوای ئەوەیانە نەکوژرێن و نەیان نێرنەوە بۆ عیراق و دالدەیان بدەن. راپەڕینەکە بەدوای (٥و٦)ی مانگدا درێژەی کێشاو کاتێکمزانی لە ٧ی مانگدا سلێمانی بووەوە بەپێشەنگ و لە رۆژانی ٧-٨-٣/٩دا سەراپا بارەگاکانی حزبی بەعس، پارێزگا، ئەمنەکەی بەرامبەر کارگەی جگەرە، ئەنفالەکە، سەربازگەی سارداو، فیرقە، حامیە، حەتین، تۆپیو عوسمان و سەرجەم سەربازگەکانی دەورووبەری شارو لە هەموویان گرنگتر (ئەمنەسوورەکە)یە. هەرهەموو دەستیان بەسەرداگیراو سلێمانی بەتەواویی کەوتە دەستی پێشمەرگەو کۆمەڵانی خەڵکی راپەڕیوی سلێمانی. لەکاتێکدا کە ئەم

هەوالانەم گوێ لێدەبێت. ئاواتی ئەوە دەخوازم لە دەرەوەبوومایەو هاوبەشی ئەو هاوڕێیانەو جەماوەرەکەم بکردایە، هەرچەندە لە بەندیخانەم، بەلام لەو ڕۆژانەدا هەست بەسەرفرازیی و ئازادیی دەکەم. چەند دلخۆش دەبم گوێم لێیە کە ڕایانگەیاند: سەربازگەکان یەك بەدوای یەکدا بەبێ تەقە بەچەکەکانیانەوە خۆیان تەسلیمی پێشمەرگەو جەماوەر دەکەن، ئەو سوپا درندەو ئەنفالچییە ئێستا لە بەردەستی خەلکی داخ لەدل و ڕقئەستووری گەلەکەمدا بێ دەسەلات و سەرشۆڕە. کاتێك شەوانە ڕادیۆ خۆشەویستەکەم هەوالی تازەم دەداتێ کە هەلمەتی کۆمەلانی خەلکی ڕاپەڕیو و هێزی پێشمەرگە ڕۆژانە پێشرەویی دەکەن، هەر ڕۆژە ناوچەیەك و شارێك ئازاد دەکەن، بەعس و ڕژێمەکەی تێدا ئەتك و ڕیسوادەکەن. چەند خۆشە کە ڕۆژانی (١١-١٢-١٣-٣/١٤) گوێبیستی ئەوەم، کە سەراپای (بازیان، چەمچەمال، کفری، کەلار، دەربەندیخان، شارەزوور، هەولێرو دهۆك) هەرهەمووی ئازادکراون و بەعسی تێدا زەلیل و ڕیسوا کراوە. ڕۆژانە هەوالەکان دەدەمە ئەو کوردانەی کە لە هۆلەکەماندان، بەتایبەتی (کاك حەمە، بەختیار، مارف و کامەران). ڕاپەڕینی خوارو و ناوەڕاستی عیراقیش بەردەوامە، بەلام هەندێك هەوال لەبارەیەوە بلاودەکرێتەوە، کە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕژێم دەستی لە کوردستان شۆردووە. بۆیە تەنها هەولدەدا بە هەرنرخێك بووە، ڕاپەڕینی عەرەبەکان سەرکوت بکات و دایمرکێنێتەوە. وەکو بلاوکرایەوە زۆر بەدرندانە پەلاماری شارەکانی نەجەف، کەربەلا، بەسرەو شارەکانی دیکەی داوە، پەلامارەکەی بەشێوەیەکە، کە بەدرندەترین شێواز مامەلەی لەگەلدا کردوون. بەدەیان و گەرەکی بە خەلکەکەیەوە تەخت کردووە، بەهەزاران هەزار خەلکی کوشتووە، بەکورتی هەوالەکان وا دەگەیەنن کە داخی شکستەکەی لە کوەیت و دەستوەشاندنی ڕاپەڕینی جەماوەرەکەی، بە ئاگرو ئاسن لە خەلکە ڕاپەڕیوەکە دەکاتەوە.

# نەورۆزو چەند یادگارییەك

## نەورۆزی (١٩٩١)، ئەبوغرێب

ئەمرۆ نەورۆزە، ئەم نەورۆزە دوو نەورۆزە نەمتوانیوە جەژنانە بەسەر منداڵەکاندا دابەش بکەم. پار لە شاری هەڵمەت، ئەمساڵ لە شاری غەریبــی و دوور لە هەناسەی پاکی وڵات، بەڵام نەورۆزی ئەمساڵ جیاوازیی هەیە لەگەڵ پار، پار ئەم کاتە لەژێر ئەشکەنجەو سزای رۆژانەی ئەو شوێنەدابووین، کە خزاندبوویانینە ناو چەند کونێکی رەشی بێ تروسکاییەوە، دەنگمان بەخۆمان نەبوایە بەکەس نەدەگەیشت، چەند هاورێیەك لە ژوورێکدا سەرمان دەکرد بەیەکداو دڵی یەکترمان دەدایەوەو رێنمایی یەکترمان دەکردو پاشەرۆژمان بەخۆشی دەبینی... رۆژانە هەریەکەمان دەبرا بۆ زۆرخانەکە، چاوەروانمان دەکرد بۆ گەرانەوەی، تا پاش سزادانەکەی لەشی بشێلرێت و لەگەڵ شێلانەکەدا وردە وردە لێی بپرسین چییان پێ وتووە؟ چی وتووە؟

بەپێرەوەچوونی هاورێیان ئەرکێکی گەورەی سەرشانی ئەو برادەرە گەنجانە بوو، کە توانای شێلانیان هەبوو. تا هەتایە شێلانی دکتۆر، فەخرەدین، عوسمان، کاکەحەمەو کاکەعەتام[1] بیرناچێتەوە، کە بەسۆزانە لەگەڵ هەموو بانگکردن و گەرانەوەیەکمدا، دەوریان لێدەدام و دڵسۆزیی خۆیان دەرشت بەسەرمدا. ((کەماڵ))م[2]لەیادناچێت کە شەوانە من نەمدەتوانی بجووڵێمەوە، ئەو هەمووجار پشتی دادەپۆشیم و بەیانییان لەبەرئەوەی چاوم کزبوو، جلەکانی بۆ دەدۆزیم و تاکە تاکە ئەسپێیەکانی لەگیانم پاك دەکردەوە، هەمووجار جلە چلکنەکانی بۆ دەشۆردم. بەهەردووکمان یەك بەتانیمان هەبوو، برادەرەکانمان حەسوودییان پێ دەبردین، لەبەرئەوەی بەتانییەکەمان نەختێك گەورەو ئەستوور بوو. پار ئەم کاتە هەرچەندێ لە هاورێکان دووربووین و بەکەمیی دەنگمان بەیەکتری دەگەیشت، تەنها هەواڵزانینی یەکترمان لەرێگای گواستنەوەی یەکێکەوە بوو، لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی دیکە، بەڵام هەموو زیندووبووین و باوەرمان وابوو، کە کۆتایی بەسزاو زیندانەکانی دێنین و بەسەربەرزییەوە یەکتر دەبینینەوە. شەوانە ئەو رۆژنامەیەی بۆمان دەهات، دەورمان لێدەداو یەکەیەکەی وتارەکانیمان دەخوێندەوە، لێکۆڵینەوەو بۆچوونی خۆمان دەگۆرییەوە، سەیر ئەوەبوو، بۆچوونەکانمان هەمووی یەکیدەگرتەوە، تەنها بۆچوونی ((هەسەن))[3]نەبێت کە هەردەم

---

١-کاکە عەتا (عەتای حاجی ئەحمەد)ە کە لەسێدارە درا.

٢-کەماڵ (کەماڵ سادق)، کە دوای حوکمدانی لە ساڵانی دواییدا ئازادکرا.

٣-هەسەن (مامۆستا حەسەن عوسمان )، لەسەر رێکخستنی (حسك) دەستگیرکرابوو.بە مۆنەبەد حوکمدرا.

بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی ئێمەوە بوو، کەچی رۆژگار کاریکی کارێکی کرد کە بۆچوونەکانی ئێمە بوونە تیشکی رۆژو ناوجەرگی تاریکستانی سووتان، وا ئەمسال ساڵێکی ترەو رۆژگارێکی ترەو نەورۆزێکی ترە... ئەوەی کە زۆر بیری لێدەکەمەوە ونبوونی ((پێنج هاوریێ)) (چواریان) زۆر خۆشەویستم بوون، کە بوونە قوچی قوربانیی و نەیانهێشت هەناسەی ئەم رۆژە وەربگرن.

بۆچوونەکانی ((کاکە جەبارم))[1]هەردەم لەیادە، کە زیرەکانە شتەکانی هەڵدەسەنگاندو برادەرانی دڵخۆش دەکردو ئەرکی ئەوەی گرتبووە ئەستۆ، کە رۆژانە لەگەڵ برادەراندا دوو دوو، یەکەیەکە قسەو لێکۆڵینەوەو گۆرینەوەی باری سەرنج و بۆچوونەکان شی بکەنەوە، ئەم کارەی زۆر برادەری زیندووکردەوە.

گەشبینیی ((کاکە عەتا))م هەرگیز لەبیرناچێت، کە هەموو جار دەیوت: (مامۆستا) چیمان لێدەکەن بابیکەن، هەرچیمان لێ بکەن، تۆڵەی خۆیان ناکەنەوە، پیاو یەك جار دەبێت و یەك جار دەمرێت. چەندە دڵخۆش بووم، کە زۆر بەسووکایەتیی سەیری دامودەزگا داپلۆسێنەرەکانی دەکرد، هەموو سزاو ئەشکەنجەکانی وەکو وەرزشێك دەهاتنە بەرچاو.

زۆر هەوڵدەدەم ((کاکە ئەحە))م[2]بیربچێتەوە، بەڵام مرۆڤەو ئەندێشەی تایبەتی خۆی هەیە، هەر مرۆڤەش لە دەروونیا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ هەندێك هاوریێ. منیش (کاکە ئەحە)م لەکۆنەوە دەناسی و خۆشەویستییەکی تایبەتی لەنێوانماندا هەبوو، ماوەیەکی زۆربوو ئەو دەستگیرکرابوو، تا دەستگیرنەکرابووم، رۆژانە دەمویست هەواڵی بزانم، کاتێك خۆشم دەستگیرکرام، پاش چەند رۆژێك زانیم کە ماوە، زۆر خۆشحاڵ بووم بەو هەواڵە، ئەوەی زۆر دڵخۆشتری کردم، باسی پاڵەوانیتی (ئەو) بوو، لەناو هەموو زیندانییەکاندا، کاتێك یەکترمان بینی یەکەم جار لە شوێنێکی زۆر ناخۆشدابوو، کە منیان بانگکرد بردیانمە ژوورێکەوە، ئەو دانیشتبوو، بەڵام نەمانتوانی لەگەڵ یەکتری بدوێین، بەچاوی خۆشەویستی لە یەکترمان روانی.

بەبینینەکەی زۆرخۆشحاڵبووم، بەڵام بەشێوەی دانیشتنەکەی و ئەوشتانەی بەدەستییەوە بوو، زۆر دڵگران بووم، کە ئەویش بریتی بوو لە (لیستی ناوی چەندین برادەرو چەند دەرەختێکی رێکخستن). پاش کۆمەڵێك جنێو و قسەو لێدان لە یەکتریان جیاکردینەوە، جاری دووەم لە ژوورێکی تاکی نزیکی ژوورەکەمان بەقسە یەکترمان بینی، هەواڵی یەکترمان زانی، جاری سێیەم هەمان ژووریان کونکردو دەرگایەکیان خستە سەر ژوورەکەی ئێمەو (کاك جەبار)یشیان هێنایە لاو لەگەڵ ((کەمالی مەلا))[3]داو رۆژانە دووجار بەسەر ئێمەدا دەچوون بۆ سەرئاو. لەم جارەدا تاسەمان لەیەکتری شکاو زۆرشت هەبوو بۆ یەکترمان روونکردەوە.

---

١-کاکە جەبار (جەباری حاجی رەشیدی مەلائیبراهیم) لە سێدارەدرا.

٢-کاکە ئەحە (مامۆستا ئەحمەد محەمەد)، مامۆستا ئەحمەدی سەناعەیە کە لە سێدارەدرا.

٣-کەمالی مەلا ( کەمالی مەلا محەمەد) بە موئەبەد حوکمدرا لەسەر ( پاسۆك ) دەستگیرکرابوو.

هەرگیز لەیادم ناچێتەوە کە دەیوت (من حەزدەکەم هەر لێرە بمێنین، چونکە لێم روونە کە دادگا سزای پەتم بەسەردا دەدات)، ماوەی چەند مانگ لەگەڵ یەکتردا بووین. زۆرجار لەهەندێك هاوڕێ تووڕە دەبوو، من ساردم دەکردەوەو بۆچوونەکەی خۆی تەواو بوو.

زۆر هەوڵدەدەم ((کاکەحەمە))م[1]لەبیر بچێتەوە، بەڵام چۆنم لەیادبچێت کە زۆرخانەی سێ شاری تەواوکردبوو، نەیانتوانیبوو کاری تێکەن، دوای چەند رۆژ دەستگیرکردنم. کاتێکمزانی یەکێکیان کرد بەژووردا، تێم روانی ئەوە، لەسەرەتادا خۆم لێ وێڵ کرد، ئەویش هەمان شت، بەڵام زۆری نەخایاند بردیانەوە بۆ زۆرخانەکەو گەڕایەوە. دوای هەڵواسین بەپێکەنینەوە خۆی کرد بەژووردا و پەلاماریان دا، بیشێلن وتی: (لێمگەڕێن فێرم، خۆی چاك دەبێتەوە. نیگەرانی ئەم ئازارە نیم، پەژارەی ئەم کارەساتەمە کە بەرەو روومان بووەتەوە) دەستی دایە شەترەنجەکەو دەستیکرد بە (شەترەنج) چەندجار شۆردمی و دەیوت: (من فێرم هەموو جار خۆم باوکم دەشۆم). زۆر بەیەکەوە بووین رازی دڵمان بۆیەکتری هەڵدەڕشت و لە ئەنجامدا خەمەکانمان دڵی دەخواردینەوە.

بۆ ((بەکر))[2]بەداخم، لەبەرئەوەی بەعسییە فاشییەکان لەناویان برد، پەتی سێدارەی رژێم کۆتایی بە ژیانی هێنا، بووە شەهیدێکی رێگای سەرفرازیی کوردستان و یەکێك بوو لە پێنج ئەستێرە گەشەکە.

پار ئەمانە مابوون و دڵمان بەمانی هەموومان خۆش بوو. ئەمساڵ ئەوانەمان لەکیس چوون، بەڵام دیارە زۆر دەوەن کە دەبردرێت خەڵفی زۆر جوان هەڵدەداتەوە، ئەو خەڵفانە دەبنە دارو بەهەزاران کەس لەژێر سێبەریدا دەحەوێنەوە، ئەمانەش لەو دەوەنە دەچوون، کە لەنێوانی دووبەهاردا سێبەریان بۆ هەمووخەڵکەکە کردو وا ئەمرۆ نەورۆزەو ئێمە لەم شوێنەوە دڵخۆش و گەشبینین کە شایلۆغانی سەرکەوتن، سەرپاکی هەموو خاکی گرتووەتەوە، رۆژگارو نەورۆزو بەهارێکی ئێجگار مێژوویی ئەوتۆیە، کە هەرگیزاو هەرگیز لەیاد ناکرێت. ئێستا لەپێش چاومە کە منداڵانی ئێمەو هەموو خەڵکی چەندێ دڵخۆشن، بۆیەکەم جارە کە وڵاتمان بەم شێوەیە باوەشی لەیەکدابێت و بەیەك دڵ و یەك لەش و یەك مەبەست تەکان بدات، لوتکە بەلوتکەو دەشت بە دەشت و شار بەشار هەنگاوی پێشەنگایەتی تێدا بنێن و لەماوەیەکی کەمدا ئەوەی بۆیان نەخشەکێشراوە ئەنجامی بدەن.

١٩٩١/٣/٢٠

زیندانی ئەبوغرێب

---

١- کاکەحەمە (محەمەد رەحیم حەسەن) ناسرابوو بە (هاوڕێ شەماڵ) لە سێدارەدرا.

٢-بەکر (وەستا بەکری دارتاش) لەسێدارە درا.

# کۆڕەوی خەڵکی کوردستان و من و منداڵەکانم

بەپێ هەواڵەکان کە شەوانە لە رادیۆکەمەوە وەریدەگرم. ئەوانەم پێدەڵێن کە حکومەت بە هێزێکی زۆرەوە دوای کشانەوەی پێشمەرگە لە کەرکوك، پەلاماری چەمچەماڵ، بازیان، سلێمانی، پیرەمەگروون، دووکان، کفری، کەلار، دەربەندیخان و هەڵەبجەی تازەی داوە، هەر هەمووی گرتوونەتەوەو گەیشتوونەتە عەربەتی ناوچەی شارەزوور، لەلای هەولێریشەوە پەلاماری هەولێریان داوەو گرتوویانەتەوە. لەبەر ترسی هێرشی دەزگاکانی رژێم، خەڵکی ناوچەکان و شارەکان بەسەڵتەخێزانی بەرەو سنوورەکانی ئێران ملیان ناوەو رەوێکی بەکۆمەڵیان دروستکردووە، ئەوانەی لەو کاروانەدا لە خەڵکی کوردستان بەشدارییان کردووە. لە ملیۆن زیاترن و بەدەیان پیاوی پیرو پیرەژن و منداڵ لە بەر برسێتیی و سەرماو تەرو تووشی و نەتوانینی بڕینی ڕێگا بەپێ، گیانیان لەدەستداوەو کارەساتێکی مرۆیی ئێجگار گەورەو مەرگەساتێکی قورس رووبەرووی خەڵکی کوردستان بووەتەوە. هەرچەندە لە هەواڵەکاندا ئەوە بڵاوکرایەوە کە لە (٤/٢) مام جەلال لە سوریاوە گەڕاوەتەوە کوردستان و کاتێك گەیشتووەتە شاری سلێمانی، لەگەڵ گەیشتنیدا هێزەکانی پێشمەرگە شکاون و چەند هەوڵیداوە، کە بەرگری لە هێرشی دوژمن بکرێت، کەڵکی نەبووە.

رەوەکەیان ناوناوە (کۆڕەو)و لە دنیادا دەنگیداوەتەوە. من لەم کاتەدا پەژارەی منداڵەکانم و خزم و کەسوکارو هاورێکانمە. دەنگوباسی کۆڕەوەکە لە هەموو ئێزگەکانی دنیاوە رۆژانەو شەوانە باس دەکرێت، کە لە مەرگەساتی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان زیاترو زیاتر دەنگیداوەتەوە، ویژدانی مرۆڤایەتی جووڵاندووە، چەند بەلامەوە قورس و ناخۆشە گوێم لێدەبێت، کە وڵاتانی (ئێران و تورکیا) سنووریان داخستووە، لەو سنوورانە بەهۆی باران و سەرماو نەبوونی خواردن و نەبوونی کەلوپەلی پێویست لە پۆشاك و راخەر، ئەو خەڵکە بەسەریەکدا دەکەون و دەبووریێنەوەو بە کۆمەڵ لێیان دەمرێت، لە کات و ساتێکی وادا منێکی زیندانیی دوور لە وڵات دەبێت باری دەروونیم چۆن بێت بۆئەوەی بزانم منداڵەکانم و کەسوکارەکەم چییان بەسەر هاتووە؟ رۆیشتوون یان لەناو شاردا ماون؟ کە ماون، گیراون یان کوژراون؟، یان رۆیشتوون چوونەتە کوێ و گەیشتوونەتە کوێ؟ دەبێت چییان بەسەر هاتبێت؟ دەبێت چۆن رۆیشتبن؟ (شەنگە، شێنێ)یان چۆن هەڵگرتبێت؟ (زەینەب) دەبێت ئێستا لەچ حاڵێکدا بێت؟ لەگەڵ کێ رۆیشتبن؟ کێ یارمەتی دابن...؟ شەو و رۆژ لە لێکدانەوەدام بەدەیان خەیاڵ دەکەم و پرسیار دەکەم و وەڵامم دەست ناکەوێت.

ئەوەی ئومێدێکم دەداتێ، گەڕانەوەی (مام جەلال)ە، بۆ کوردستان، بەوەی بەگەڕانەوەی هەوڵێك بدات دۆخەکە ئاسایی بکاتەوەو فریای ئەو بارە ناهەموارەی گەلەکەمان بکەوێت. لەسەری مانگەوە تا نیوەی مانگ بەتایبەتی لە بڵاوبوونەوەی هەواڵی کۆڕەوەوە، لە بارێکی دەروونیی زۆر خراپدا دەژیم، هەرچی زیندانییەکی کورد دێن بۆلام و رۆژانە پرسیارم لێدەکەن.

ئەمدەویست لە روانگەی بارە دەروونییەکەمەوە وەڵامیان بدەمەوە. هەوڵدەدم کە ورەیان بەرزبکەمەوەو کۆڕەوەکەیان وا بۆ باسبکەم، کە ئەمەش جۆرێکە لە خەباتی گەلان و شێوەو شێوازێکی نوێیە لە بزووتنەوەی گەلەکەماندا. بەم شێوە خەباتە، دڵنیایان دەکەمەوە: کە گەلەکەمان بە مافەکانی دەگات و بەدوای کۆڕەودا مەرگەساتی میللەتەکەمان کۆتایی دێت، مرۆڤایەتی و وڵاتانی دنیا لەسەر ئەم کۆڕەوە بێدەنگ نابن، زۆر بە باشی دێنە دەنگ و دۆزی گەلەکەمان دەبێتە مەسەلەیەکی جیهانیی، راستە خەڵکی کوردستان دووچاری مەینەتیی و ناخۆشیی زۆر بوون، خەڵکی زۆرمان بوونەتە قوربانیی، بەڵام ئەمە دوا مەرگەساتمان دەبێت، دڵنیابن چەند رۆژێکی دیکە هەواڵی زۆر خۆشمان پێدەگات، دان بەخۆتاندا بگرن و لە پانزەی مانگدا خەڵکمان دێن.

ئەبوغرێب
مانگی ٥/١٩٩١

# مانگی (٩)و خولی میکانیکی ئۆتۆمبێل

لە بەندیخانە، لەلایەن بەڕێوەبەرێتیی بەندیخانەوە، ساڵانە چەندین خول بۆ زیندانییەکان دەکرێتەوە، زیندانییەکانیش بۆ بەسەربردنی کات لەو دەورانەدا بەشداریی دەکەن، وەکو زانیبێتم ئەم خولانە هەیە: خولی فێربوونی درووما‌ن (خەیاتی). خولی فێربوونی دارتاشی (نەجاری)، خولی فێربوونی میکانیکی ئۆتۆمبێل و زۆر خولی دیکەش، لەکۆتایی مانگی هەشتدا، کە لە ئازادبوونمان نائومێد بووین، ئاگاداریان کردین کە خولێکی میکانیکی ئۆتۆمبێل لە (٩/١)دا دەکرێتەوە، هەرکەسێك ئارەزوو دەکات ناوی لای چاودێری بەش بنووسێت و خولەکەش لە (٩/١)ەوەیە بۆ (١٩٩٢/١/١)، ناوی خۆم نووسی. دیارە دەوامی خولەکە رۆژانەیە، بەڵام لەبەر بارودۆخی بەندیخانە، زۆر بەکەمیی رێکدەکەوێت کە لە مانگەکەدا رۆژانە دەوام بکرێت. رۆژانی هەینی و رۆژانی پشوو و مواجەهەکان، دەوام ناکرێت. رۆژانەش دەوام لە سەعات هەشتی بەیانییەوە دەست پێدەکات تا ١٢ی نیوەڕۆ، زۆر رۆژ تا یەکیش دەخایەنێت.

بۆیە دەبێت هەموو بەیانییەك دوای مەستەر خۆم بۆ دەوام ئامادە بکەم. کە چوومە خولەکە سەیرمکرد (حەمە تایەرو کاکە زیاد، رزگاری حاجی کەریم و چەند زیندانییەکی کوردی تر)یش لە خولەکەن. ئەم خولە بۆ ئێمە زۆر گرنگە. لەبەرئەوەی ئەو رۆژانەی دەچینە خولەکە، ژمارەیەك زیندانیی لە کوردو عەرەب و تورکمانمان لەگەڵدایە، هەریەکیان لەبەش و رەدهەیەکەوە دێن. بەو تێکەڵاوبوون و یەکترناسینەو خەریکبوونە بە وانە خوێندنەوە، ئەوەمان بیردەباتەوە کە زیندانین و لە بەندیخانەی ئەبوغرێبداین. دەوامەکەش سێ و چوار کاتژمێر دەخایەنێت. بەهۆی خولەکەوە جۆرەها دەنگوباس وەردەگرین، لەرێگای ئەم خولەوە توانیم کە (رزگاری وەستا عەزیز «پۆلا»)[1]، کە یەکێکە لە زیندانییە سیاسییەکانی حزبی شیوعی و لە ئەحکام خاسەیە، پەیوەندیی لەگەڵ (فەخرەدین)[2]بکەم، کە ئەویش لە (ئەحکامی خاسە)یە، بە بەردەوامی نامە بۆ یەکتری بنێرین و دەنگوباس ئاڵوگۆڕ بکەین، ئەوەش بەهۆی زیندانییەکەوەیە، کە لەگەڵ رزگاردایە، کە لەم خولەدا دەوام دەکات و زیندانییەکی سیاسیی

---

١-رزگاری وەستا عەزیز کە بە (پۆلا) ناسرابوو لە بەندیخانەدا، یەکێك بوو لە ئەندامە کاراو ئازاکانی حزبی شیوعی و لە سلێمانی دەستگیرکرابوو، ئەبەزانە رووبەرووی جەللادەکان راوەستاو خۆڕاگر بوو، لە مەحکەمە بە حوکمی لەسێدارەدان حوکمدرا. دواجار بە بڕیارێك دایانبەزاند بۆ (موئەبەد)، لە (٢٠٠٢/١٠/٢٠) پێش رووخانی سەدام لەکاتی ئازادکردنی گشت زیندانییەکاندا، ئازادکراوە.

٢-فەخرەدین عەبدوڵڵا، کە لەدەستەی پێشمەرگەکانی هەورامان بوو، لەکاتی هاتنیان بۆ ناو شاری سلێمانی، لە (١٩٨٩/١١/١٣) لای وێڵەدەر کەوتنە کەمینی جاشەکانی عەلە لوتماسییەوەو دەستگیرکران. لە (٦/٤/ ١٩٩٠) لە مەحکەمەی سەورە لەگەڵ (٣) هاوڕێی پێشمەرگەیدا بە موئەبەد حوکمدرا. لە (١٩٩٥/٨/٥) ئازادکرا.

و کەسێکی متمانە پێکراوە... لە ٩/١ تا ١٢/١٢ دەوامم کرد. لەماوەی مانگەکانی (٩، ١٠، ١١، ١٢)دا زیاتر لە (٣٤) ڕۆژ دەوامم کرد. دەفتەرێکم بۆ نووسینەوەی ئەو بابەتانەی لەسەر فێربوونی نەزەریی داناوە. هەموو بابەتەکانم تێدا نووسیوەتەوەو وێنەکان (حەمەتایەر) بۆم دەکات. ڕۆژانی دەوام کە لە (مەستەر) دەگەڕێمەوە، وەکو خوێندکارێك خۆم بۆ دەوام ئامادە دەکەم، ڕیش دەتاشم، خۆم دەگۆڕم، دەفتەرەکەم ئامادە دەکەم و چاوەڕوانی کردنەوەی دەرگاکە دەکەم، لەگەڵ دەرگاکردنەوەدا بەپەلە دەڕۆم بۆئەوەی لە دەوام دوا نەکەوم، چونکە ئەگەر دوابکەوم لێم دەپرسنەوە، ئەگەر بەبێ داواکردنی مۆڵەت دەوام نەکەیت، بە ئامادەنەبوو ناوت دەنووسرێت. کە دەچوومە سەر کورسی خوێندن، گەرامەوە بۆ سەردەمی خوێندنی ناوەندیی و دواناوەندیی و زانکۆم. مامۆستا هەرچی دەڵێت حەز دەکەم بیاننووسم و زۆر زۆریش خۆی شتمان پێ دەنووسێتەوە، دەرسی عەمەلیمان هەیە، لەسەر هەیکەلی ئۆتۆمبێلەکەی هۆڵی خوێندن، دوو دوو و سێ سێ مامۆستاکە دەمانباتە سەر لاشەی ئۆتۆمبێلەکەو بۆمان شەرح دەکات و پرسیارمان لێدەکات. ئەوکاتەی وانە دەخوێنین، وەکو خوێندکار نابێت قسە بکەین، یان جموجوڵ و سەرکێشیی بکەین. ئەگەر دەنگەدەنگ بکەین مامۆستاکە لێمان توورە دەبێت، لێمان دەپرسێتەوە. زۆر ڕۆژ دەگەڕێمەوە بۆ سەردەمی خوێندنی ناوەندیی و ئامادەیی و سەرکێشی دەکەم و دەگاتە ئەوەی مامۆستا ئاگادارم دەکاتەوە. ڕۆژانی خولەکە، ڕۆژەکە دەکرێتە چەند وانەیەك و لەنێوانی وانەکاندا پشوویەکی (١٠) دەقیقەیی هەیە، (حەمە تایەر) دەستوخەتی زۆر خۆشە، لەم ماوەیەدا چەند بابەتێکم نووسی لە پەخشانەشیعرو بۆم برد، ئەویش بە خەتە جوانەکەی بۆی نووسیمەوە، پاش چەند ڕۆژێك بۆی هێنامەوە. بەڕاستیی لەو ماوەیەی کە لەم خولە دەوامم کرد، لەزۆر ڕۆژو مانگەکانی دیکەی بەندیخانە بەلامەوە خۆشترە. لە ((دەفتەرەکەمدا لە هەندێك لاپەڕەیدا بەیتە هۆنراوەی (مەحوی، پیرەمێرد، بێکەس، شێخ ڕەزا، حەمدی و خۆم)م تێدا نووسیون و ڕۆژو کاتەکەم لەگەڵیاندا نەنووسوە، پێدەچێت دەفتەرەکەم ببێتە یادگارێکی بەندیخانە)).

# مانگی (٤)و هەواڵی گفتوگۆ

لە شەوانی نۆزدەو بیستی مانگی چواردا، زۆربەی ئیزگەکان هەواڵی گفتگۆی سەرکردایەتی کوردی لەگەڵ دەسەلاّتدارانی عیراقدا راگەیاند، وتوویژو دانووستاندن بوو بە هەواڵی رۆژانەو شەوانە، هاتنی (هەڤاڵ مام جەلال) بۆ بەغدا، بلاّوکرایەوە، کە وەکو سەرۆکی وەفدێکی بەرەی کوردستانیی هاتووەتە بەغداو لەگەڵ (سەدام حسێن)دا یەکتریان بینیوە، باروودۆخی کوردستان لە راگەیاندنی ئەو هەوالاّنەوە بەرەو هێوربوونەوە دەچوون و ئێمەشی بەوە دڵخۆش دەکرد. کە بوونی گفتوگۆو دانیشتن دەبێتە هۆی ئازادکردنمان، چونکە لەهەموو گفتوگۆکانی کوردو رژێمدا لە یەکەم هەنگاو لێبووردنی گشتیی بۆ زیندانیی سیاسیی دەردەکرا، ئێمەش ئەوەی چاوەروانی دەکەین، دەرچوونی لێبووردنی گشتییە، بۆ زیندانییانی سیاسیی. ئیتر من جگە لەوەی شەوانە گوێم لە رادیۆ قاچاغەکەم دەگرم، شەوانەش دەچینە بەردەم تەلەفزیۆن و گوێ لە هەواڵەکان دەگرین. من جگەلەوەی چاوەروانی لێبووردنی گشتیم، چاوەروانی ئەوەم بەهۆی وتوویژەوە مندالەکانم لە ئێرانەوە بگەرێنەوەو لەگەڵ گەرانەوەیاندا بێنەوە بۆ سەردانم. رۆژمان بەهاتوچۆو پیاسەکردن و تاووتوێی دۆخەکە بەسەر دەبەین، شەوانەش لەناو ژوورەکەمداو لەگەڵ هاوڕێ زیندانییەکانمدا، بەدەمەتەقێی جۆراوجۆر کە هەرهەموو دەهاتەوە سەر ئەوەی کە چاوەروانی ئەوەدەکرێت، کە لەدوای ئەم رووداوانەوەو هاتنە پێشەوەی گفتوگۆ، حکومەت لێبووردنی گشتیی بۆ هەموو زیندانییان دەربکات، دوای کاتژمێر (١٢)ش لەگەڵ هاوسەرە لەشولار رەقەکەمدا، دەست دەخەینە ژێر سەری یەك و دەست دەکەینە ملی یەکترو باوەشی خۆشەویستیمان لەیەکدەدەین و لەژێر بەتانییەکەمانەوە دەکەوینە ورتەورت و بەزۆریی هاوسەرەکەم ورتەورت دەکات و قسەی هەمەجۆرم بۆ دەگێرێتەوە، ئەوەندە هەواڵ و قسەو زانیاریی وردم لەملاولەولاوە بۆ دەهێنێت، دەڵێی پیرێژنێکی حەفتا ساڵەیەو ئاگای لە هەست و نەستی هەموو دنیایە، دەبێتە میوانی (مۆنتیکارلۆ) لەپڕ ئەو بەجێدەهێڵێ و خۆی دەگەیەنێتە (بی بی سی)و زۆر ناخایەنێت سەردانێکی (لەندەن)و (دەنگی ئەمریکا)و (ئیسرائیل)یشی بەسەردا دەکات و دەگەرێتەوە بۆ (ئیزگەی بەغدا)و (عیراقی ئازاد)و (ئیزگەی تاران)و (سەوتلعەرەب)و یەکە یەکە ولاّتانی خلیج و تا ئەمانە دەکات، زۆری پێدەچێت، لەگەڵ خۆیدا منیش ماندوو دەکات و بەدەم چپەچپەوە دەستلەملان خەومان لێدەکەوێت و بەیانی لە بۆلەبۆڵی بەئاگا دێم و دەکەوینەوە هەڵشێلانی یەکترو تا کاتی (مەستەر) دێت. باوەش لەیەك بەرنادەین... دوای (مەستەر) کاکە حەمە نان و چای بەیانی ئامادە دەکات، بانگم دەکات و بەجووتەو بەدەم گەیاندنی دەنگوباسەکانی شەوەوە، دەست بە بەرچایی خواردن دەکەین... ئەم حاڵە بەردەوامە، تا سەری مانگی چوارو چاوەروانی مواجەهەدین...

# مانگی (٥)و باسی گفتوگۆ

دوای مواجەهە دۆخی بەندیخانە باشبووە. زۆر رۆژی هەفتەکان دەرگای هۆڵەکان دەکرێنەوەو زیندانییەکان دەچنە ساحە (واتە حەوشەی گەورەی بەندیخانەکە زۆر گەورەیەو بە دیوارێکی بەرزی سەربەتەلی درکاویی دەورەدراوە). زیندانیی هەموو بەش و رەدەکان لەم رۆژی ساحەیەدا دەرژێنە ناو حەوشەکەو ئەوانەی کە شت دەفرۆشن، لەناو ساحەکەدا هەفتەبازارێکیان دروستکردووە شت دەفرۆشن. لە زیندانییەکان ئەوانەی نەخۆشن، یان تەمەنی وایان هەیەو نەیان دەتوانی برۆن و بێنە ساحە. یان ئەوانەی ئالوودەی حەبخواردنن و لەبەر بێئاگاییان بەئاگا نایەن، کە رۆژی چوونە دەرەوەیە بۆ ساحە. نایەنە دەرەوە. ئەگینا سەراپای زیندانییەکان بۆ ئەو بای باڵە دێنە دەرەوە، نیمچە حەوانەوەیەکی دەروونیی و جەستەییە بۆ زیندانییەکان. دیارە لەم چوونە دەرەوەیەدا هەر زیندانییەو چاو بۆ ناسیاو و هاورێکانی خۆی دەگێرێت. ئێمە لەگەڵ چوونە دەرەوەماندا بەدوای هاورێکانی خۆماندا دەگەرێین، لەم ماوەیەدا کەم رۆژ رێکدەکەوێت کە لەم رۆژانەدا هەرهەموو یەکتر نەبینین. لەیەکتر بینینەکانماندا، دەکەوتینە گۆرینەوەی هەواڵ و تاووتوێکردنی دۆخەکە. لەو رۆژانەی ساحەدا کە لە مانگی (٥)دا دەچینە دەرەوە، باس هەرباسی گفتوگۆی سەرکردایەتی کوردو رژێمە. زۆربەمان لەسەر ئەوە کۆکین، کە وتوویژو دانووستاندن لەگەڵ رژێمدا دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی تەمەنی حزبی بەعس و رژێمەکەیان و ئەو درێژبوونەوەی تەمەنی بەعسەش هۆی نزیکبوونەوەی کورد بێت بۆ رێککەوتن لەگەڵ بەعسدا، چونکە ئێمە دەزانین کە بەعس و رژێمەکەی لە گرتنی کوەیتەوە، گەلەکۆمەکێی ولاتانی دنیا لەسەر رژێمە لەرووی ئابلوقەی ئابووریی و کۆکردنەوەی هێزی سەربازیی هەمەجۆر بۆ دەرکردنی لە کوەیت و لێدانی هەموو بنکە سەربازیی و ئابوورییەکانی، بەعسی لە لێواری مەرگ و لەناوچوون نزیککردووەتەوە، راپەرینەکانی خەڵکی عیراق لە بەسرەوە بۆ دهۆك، کورسی دەسەڵاتی بەعسی بەتەواویی هێناوەتە لەرزین، هیچیان بەسەر هیچەوە نەماوە. لەم کاتەدا کە بەعس بەتەواویی باری خوارەو بەزەبری کوشتن و لەناوبردن لە جەماوەر، دەیەوێت خۆی بگرێتەوە، کورد وتوویژی لەگەڵدا بکات، دەبێتە هۆیەك بۆ پشوودان و هێوربوونەوەی، کە لەو پشوودانەیدا دەتوانێت جارێکی دیکە خۆی و هێزەکانی و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی رێکبخاتەوەو خۆی بۆ سەرکوتکردنی کۆمەڵانی خەڵکی عیراق سازو ئامادە بکاتەوە. ئەمانە هەرهەموو قسەمان لەسەر کردو ئەوەشمان باسەکرد. کە گەلەکەمان لە مانگی (٤)دا کۆرەوی پێکراوە، لە ئەنجامیدا شارو شارۆچکەکانمان چۆڵبوون و خەڵکە رەوکردووەکەمان لە ولاتانی ئێران و تورکیا لە بارودۆخێکی ئێجگار ناهەمواردا ژیان بەسەردەبەن، ئەگەر یارمەتی و گوشاری ولاتانی دنیا نەبوایە، لەو کۆرەوەدا کورد قردەکراو گەورەترین کارەسات رووبەرووی گەلەکەمان دەبووەوە. دەبووە ئەنفالێکی دیکە، بۆ چارەسەرکردنی ئەو دۆخەو

گەڕانەوەی خەڵکەکەمان بۆ شارەکان. لەڕێگای وتوویژو ڕێککەوتنێکی کاتیشەوە بێت، دەتوانرێت خەڵکە ئاوارەو ڕەوپێکراوەکانمان بگەڕێنەوە، لە گەڕانەوەیاندا دووچاری کوشتن و لەناوبردن نەبنەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا ئێمە ئومێدمان بەوەیە، کە بەهۆی گفتوگۆوە لێبووردنی گشتیی بۆ زیندانییانی سیاسیی دەربکرێت، بەو هۆیەوە لە زیندان دەرچین و بگەڕێینەوە ناو کەسوکارو وڵاتەکەمان. لە دوو هەفتەی یەکەمی مانگەکەدا بەهۆی چوونە ساحەمان و گوێگرتنمان لە ئێزگەکان. بۆمان دەردەکەوێت دوای هاتنی (مام جەلال) بۆ بەغداو گەڕانەوەی، وەفدێك لە کوردستانەوە چوونەتە بەغدا بە سەرۆکایەتی (کاك مەسعود بەرزانی)و ئەندامیتی (کاك نەوشیروان مستەفا). لە هاتنی ئەو وەفدەدا هیوامان بەوەیە، کە لە یەکەم دانیشتنیاندا لەگەڵ وەفدی حکومەت داوای لێبووردنی گشتیی بۆ زیندانییانی سیاسیی بکەن، بەتایبەتی زیندانیی سیاسیی کورد، ئێمە لە چاوەڕوانیدا شەو و ڕۆژمان بەسەرەبرد، شەوانە ئێزگە نامێنێت پەنای بۆ نەبەین و سەیری تەلەفزیۆن نەکەین، بۆئەوەی گوێمان لە هەواڵی دەرکردنی بڕیاری لێبووردن بێت بۆ زیندانییان... دەزانین گفتگۆو دانیشتن بەردەوامە، بەڵام باسی لێبووردن باس ناکرێت. لەڕاستیدا ئێمە بە ئومێدەوە دەژین، مەزەندەمان وایە، کە تا کۆتایی مانگی (٥)، لێبووردن دەردەکرێت و لە بەندیخانە دەرباز دەبین. چاوەڕوانییەکەمان ئەوەندەی تر بەندیخانەی لا ناخۆشترکردووین، شەو و ڕۆژمان لێ ناڕوات، وا دەزانین بەسەر درکەزیبەوەین، سەبارەت بە وتوویژو لێبووردنی گشتیی، تەنها هەر ئێمەی کورد نین کە قسەی لەسەر دەکەین، بەڵکو زیندانییە عەرەب و تورکمانەکانیش زۆربەی زۆریان ئەو وتوویژەیان پێ ناخۆشە، بەوەی بەهۆیەکی دەزانن بۆ هەڵسانەوەی بەعس و ڕژێمەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕوانی ئەوە دەکەن، کە بەهۆی گفتۆگۆکەوە وەفدی کورد داوای لێبووردنی گشتیی، نەك بۆ تەنها زیندانیی سیاسیی بکات، بەڵکو داوای لێبووردنی گشتیی بۆ هەموو زیندانییان بکرێت و هەموو بەندیخانەکان چۆڵ بکرێن.

# نووسینەکانی ناو زیندان

## -٣-

## ((زیندان و بیرەوەرییەکانی ژیانم...))
## ٨/٩ی پوشپەڕ ٢٦٩١
## ٢٩-٣٠/ ١٩٩١/٦

((١))

رۆژگار دێت و دەڕوات، گیانی پاکی مرۆڤ خۆراکی سەرجەمی رووداو و کارەساتەکانە. یاسای ژیان وای سەپاندووە کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا لەدێرزەمانەوە، دووبەرە لە کێشەیەکی توندوتیژدان، بەرەی خێرو خۆشگوزەرانیی و دابینکردن و وەدەستهێنانی، بەرەی شەڕو ئەشکەنجەو لەناوبردن، هەردوو بەرەکە مرۆڤ سەرکردایەتییان دەکات و بە مرۆڤیش ئامێرەکان دەجوولێن...

بەرەی یەکەم لە ململانێیەکی ئێجگار گەورەدایە، بۆئەوەی چی فەروخۆشییە بۆ مروڤایەتی دابین بکات و بیسازێنێت. لەم ململانێیەدا بەهەزاران گیان دەبێتە قوربانیی و ژیانی خۆیان دەکەنە مۆم و لەپێناویدا دەسوتێن...

بەرەی دووەم بە پێچەوانەوە، هەموو تواناو دەسەڵات و ئامێرێکی کوشندەو داپڵۆسێنەری خۆی لە دژی بەرەی یەکەم دەخاتە کارو گەشە بەوە دەکات، کە مرۆڤ لە سایەیدا زەبوون و چەوساوەو کەمدەسەڵات بێت. ئەم یاسایە گشتییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی.

ئێمەی کوردیش لەناو کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا دەژین و رەنگدانەوەی ئەم ململانێیەمان لە زۆر کۆنەوە بەسەردا سەپێنراوە، لە چەوساندنەوەیەکی بەردەوامدایین و تائێستا وەکو مرۆڤ رەفتارمان لەگەڵدا ناکرێت، بێبەریی کراوین لە بچووکترین مافی مرۆڤایەتی و نەتەوایەتی، پێمان رەوا نابینن لەسەر خاك و ئاو و شوێنی خۆمان بحەوێینەوەو هەناسە بدەین. وەکو گەلەگورگ کەوتنە لاشەمان و بەسەر چەند گورگێکی برسی و درندەئاسادا بەشیانکردووین و پارچەپارچە کەوتوونە خواردنمان.

((٢))

منیش لەنێوانی (لوتکەی بەخشی، کەلەوێ، سەگرمەو چالآوا) لە گوندێکی چەپی خنجیلانەی پەنا شاخی (داریکەلی)، لەبەر هەوای فێنکی (دەربەندی باسەرەدا) (سەرم کێشایە ئەم جیهانە جەنجالەوە. لەناو خێزانێکی ئایینی خاوەن (تەکیە)و دەرویش و موریدو میوان و حایوحوی زۆری دەرویشاندا گەشەم کردو چاوم کردەوە). سەردەمی لەدایکبوونم سەردەمی شێخ و دەرویش بووە، بۆیە لەوکاتەدا کە لەدایکبووم (باوك)م لە گەڕاندا بووە، لە سنووری شارباژێڕو ئێران بۆ ئیرشادی، نەنکم بەناوی باپیرە گەورەمەوە ناوی ناوم (کاك حەمە)، واتە (محەمەد) بەمەبەستی ئەوەی لە پاشەڕۆژدا، جێگای ئەو و باوکم بگرمەوە لە (شێخێتی)دا... منداڵبووم، هەرکەوتمە سەرپێ و سەرنجی زۆر شتم دەدا، لە دووروبەر لە کۆڕی زیکری دەرویشان خۆشیم دەهات، شمشێربازیی، زەرگبازیی، یاریی بەئاگرکردن، خەڵك سەربڕینم لابووبووە فلیمێکی زۆر خۆش و وەکو منداڵی ئێستا بە (فلیمی کارتۆن)م دەهاتە پێش چاو... حەزم دەکرد دەرویشەکان زووزوو بێن، بەتایبەتی دەرویشەکانی شارباژێڕ بۆئەوەی سەر بکەمە گوێزو بادام و باسوق و مێوژ خواردن، چونکە ئەوان دەهاتن زەخیرەی زستانیان بە کۆڵی گوێدرێژ بۆ دەهێنایین، کێ دۆشاوی ترێی دەخوارد؟ ترشی سماق و مێوژ بەرەش و سووریەوە، باسوق و گوێزو بادام و قەزوانی بنەو شیلە، ئەوەندەیان دەهێنا بەشی زۆربەی ماڵی ئاوایی دەدرا، جگە لەوەی بەدرێژایی زستان شەوانە لەماڵی ئێمە کۆدەبوونەوەو مێوژ، باسوق، قەزوان، گوێزو دۆشاو دادەنرا، شەوانی بەفربارین کەس نەبوو، لەناو دێدا (دۆشاوبەفر) نەخوات.

لەگەڵ ئەمانەدا هەردەم سەرنجی کۆمەڵێك چەکدارم دەدا، کە ئەوانیش زۆرجار دەهاتن، دەستی باوکمیان ماچ دەکرد، داوای دۆعای خێریان دەکرد، چەکدارەکان خۆیان لە فیشەکدا زەرد دەکرد، زوربەیان تفەنگ و دەمانچەو خەنجەریان پێبوو، ئەمانیش زۆر شەو دەمانەوە، ئەوانە دوای نوێژی عیشا تەهلیلە دەکراو دوای تەهلیلە، دەکرا بەزکر کردن و تەپڵ و دەف لێدەدراو باوکم لە سوچێکەوە لە تەنیشت (کورەکەوە) دادەنیشت و منیش دەچوومە باوەشییەوە، جارناجارێك هاوارێکی دەکردو منیش دادەچڵەکیم، کوتوپڕ دەستی دەهێنا بەسەرماو دەیوت مەترسەو منیش لەخۆشیی دەف و تەپڵەکە ئاگام لەخۆم نەدەما.

((٣))

ساڵ هات و رۆیی، منیش تەمەنم گەورە بوو، تا وام لیهات باوکم خۆی دەستیکرد بە وانە پیوتنم، وردە وردە کەوتە فیرکردنی ئەلف و بیّ و تا گەیشتە ئەوەی دەست بکەم بە خویندنی قورئان... تەمەنم وابوو، کە زۆر شتم لیك جیادەکردەوەو حەزم دەکرد لە هەموو شتیك بپرسم.

ئەو رۆژانەی تەمەنم لە ساڵ و سەردەمیکدا بوو، کە (شیخی نەمر)[1]لە (داریکەلی)[2]بوو... رۆژانە پیاوەکانی شیخ لە هاتوچۆدا بوون بۆ (سۆلە)و (دیلیژە)و گوندەکانی بەر دەربەند، واتە گەرمیان. لەم هاتوچۆیەیاندا زۆریان لایان دەدایە ماڵی ئیمەو منیش هەر لەخۆمەوە کە باسی شیخ و چەکدارەکانی دەکرا، دەموت دیارە مەسەلەیەك هەیە بۆیە شیخ لە داریکەلی گیرساوەتەوەو ئەم چەکدارانەشی بەدەوری خۆیدا داناوە.

رۆژیّ لە باوکم پرسی (باوکە ئەم پیاوانە بۆ هەرکاتیك دین چەکیان پییەو قەت بیّ چەك نایەن)؟ وتی: (کورم ئەی نازانیت ئەوانە پیاو و پاسەوانی شیخی گەورەن لە داریکەلی). وتم: شیخ کییە؟ بۆ لە داریکەلییە؟ چەکدارو پاسەوانی بۆ چییە؟ ئەی بۆ ئیمە چەکدارو پاسەوانمان نییە؟ وتی: (شیخ مەحمودی حەفیدە) خزمی خۆمانە گەورەو سەرۆکمانە... لەترسی میری لە داریکەلی دائەنیشیّ، ئەوپیاوانە پاریزگاری ئەکەن لەدوژمنو هەموو کاتیّ ئامادەن ئەگەر هیرشی بۆبکەن پەلاماری هیزی میری بدەن. ئیمە وەکو ئەونین ئەو جیگای مەترسییەو لە رژیم قاچاغە، ئیمە قاچاغ نین... وتم باشە ئەم شیخە کامەیە؟ وتی چۆن نازانی کامەیە ئائەو کەسەیەکە ها لەماوەی پیشوودا هات بۆ دیی خۆمانو لەسەرسەکۆی مزگەوتەکە لەبن دارتووەکە دانیشتبوو، پیاویکی سمیڵ گەورەو دەمانچەیەکی برنەوی بەقەدەوە بوو. خەنجەریکی دەبانی مستووسپی کردبوو بەبەر پشتوینەکەیدا مشکیو جامانەی بەتیکەڵاوی بەستبوو بەسەرەوە، منو خاڵەت لەلایەوە دانیشتبووین، ئا ئەوە شیخەو، ئەو چەکدارانەشی لەدەوروبەری مزگەوتو دیّ بڵاوبوبوونەوە پیاوەکانی بوون.

تەمەنم وای لیهات بەئاسانی بەبیّ ترس هەموو جاریّ ئەچووم بۆماڵی (خاڵە شیخ محەمەد)[3]لە دیلیژەو ئەهاتمەوە، ساڵیك رەمەزان بوو، لەدەوروبەری (٢٧)ی مانگدابوو، باوکم نامەیەکی نووسیو وتی (حەمە) کورم ئەم نامەیە ئەتوانی بەریت بۆ داریکەلیو بۆ خزمەتی شیخ)؟ منیش کەناوی شیخو داریکەلی هینا لەخۆشیا وام زانی دەستیّ جلی تازەی بۆ جەژن بۆ کردووم، وتم (ئەی بۆچی ناتوانم) وەرزەکە وەرزی بەهاربوو، خەلکی دیّ

---

١- شیخ مەحمودی حەفید (مەلیك) مەحمودە.

٢-داریکەلی: گوندیکە لە گوندەکانی ناوچەی بازیان و کەوتووەتە خورهەلاتییەوەو بەقەد شاخی داریکەلی و کەلەوییەوەیەو ساڵانیك (شیخ) لەو گوندە دادەنیشت.

٣-خاڵە شیخ محەمەد: خاڵۆی باوکم و خاوەنی تەکیەبوو لەگوندی (دیلیژە) دادەنیشت.

هەرهەموو بەکاروباری کشتوکاڵەوە خەریك بوونو کەسی لەدەورنەبوو، خۆیشی لەخەڵوەتدا بوو، لەگەڵ (حاجی حەمە رەزا)و (مام نەریمانو حاجی محەمەد)[١]دا..

کاغەزەکەی دامیۆ وتی ڕێگاکە ئەزانیت؟ وتم بەڵێ، وتی لەسەر خۆ بەشاخەکەدا سەرکەوە، ڕێگا ترسی نییە، تەنها ئاگات لەبەر پێی خۆت بێت لەبەر مارو مێروو. ژیرانە بچۆرە خزمەتی شێخ و نامەکەی بدەرێ و وەڵامەکەشی بێنەرەوە.

نامەکەم لە تەنکەی گیرفانم قایمکرد، پێڵاوم لێ هەڵکێشاو کەوتمە ڕێ. نەمزانی چۆن بەو شاخەدا هەڵگەڕام و کاتێکمزانی وام لە (سەر کەل) لەناو دارەکانی سەرکەلدا.

ڕێگا چۆڵ نەبوو، کاروانچی دەهات و دەڕۆی زوو زوو ماندوو نەبوونی ڕێبوارەکانم دەکرد، زۆرم حەزدەکرد یەکێك لە کاروانچییەکان لێم بپرسێت، ئەوە بۆکوێ دەچیت؟

بەڕێکەوت ئاواتەکەم نەهاتە دی و کەس لێی نەپرسیم، تا بەشانازییەوە بڵێم بۆ خزمەتی شێخ دەچم. گەیشتمە ناو دێی داریکەلی لە پیاوێکم پرسی ماڵی شێخ کامەیە؟ خانوویەکی بەرزی پیشاندام، وتی: ئا ئەو خانووە بەرزە دوو قاتدیە، دەبینیت چەند پیاوێکی لەبەردەمدا وەستاوە، ئەوە ماڵی شێخە... ڕووم کردە ماڵی شێخ و چوومە بەردەم خانووەکە، چەند پیاوێك بەچەکەوە وەستابوون، پرسیم شێخ لە کوێیە؟ وتیان کوڕە شێخت بۆ چییە؟ وتم: دەمەوێت بچمە خزمەتی، پیاوەکان کە سەیریانکرد قسەم زلە لێم کۆبوونەوە، دەستیانکرد بەپرسیارکردن، کوڕی کێیت؟ لە کوێوە هاتوویت؟ شێخت بۆ چییە؟ لەم پرسیارانەوە منیش تووڕە بووم، وتم: ئێوە حەقتان چییە بەسەرەوە شێخ لەکوێ دادەنیشێت؟.. یەکێك لە پیاوەکان لێم وردبووەوەو وتی: کوڕینە ئەم منداڵە وابزانم کوڕەکەی (مامە شێخ کەریمە).

ئەوانیش وتیان کوڕە ئەو چۆن بەم منداڵییە دەینێرێت؟ باوەڕناکەین کوڕی ئەو نییە. ئەو پیاوە هاتە پێشەوەو وتی: تۆ کوڕەکەی (مامە شێخ کەریم) نیت؟ منیش وەکو تووڕە بووبووم، وتم: نەخێر، کوڕی ئەو نیم. لەم مشت و مڕەدابووین گوێم لێبوو (شێخ ) بانگی کرد ئەوە کێیە وا نایەڵن بێتە پێشەوە؟ وتیان قوربان منداڵێکە دەیەوێت بێتە خزمەت جەنابت دەڵێت ئیشم پێیەتی... وتی: لێی گەڕێن با بێتە سەرەوە، ئەو پیاوەی وتی لە کوڕی فلان کەس دەچێت لەگەڵمدا هات و سەریخستم بۆ خزمەتی شێخ. کە چوومە سەرەوە، سەیرمکرد شێخ لەسەر کورسییەك لەبەر هەیوانەکە دانیشتووەو چەند پیاوێکی بەدەوردایەو چوومە پێشەوەو سەلامم کرد، وتی: (ئەحە سوور ئەمە ناناسی)؟ وتی: قوربان بۆی چووم، بەڵام پێم نالێیت، وتی: کوڕی (شێخە ریش پانە) چووم و دەستیم ماچکردو ئەویش ناوچەوان و ئەملاو ئەولای ماچکردم، فەرمانی دا کورسییان بۆ هێنانم. وتی: (شێخە ریش پان) ریشەکەی هەرماوە،

---

١- حاجی حەمە رەزا: پیاوێکی بەتەمەن و خەڵکی سۆڵە بوو. (مام نەریمان)یش پیاوێکی بەتەمەن بوو خەڵکی گوندی بارزیی گەورە بوو. (حاجی محەمەدی مام عەلی) خەڵکی سۆڵەیە. ئەمانە ساڵانە لەرەمەزاندا لەگەڵ باوکمدا دەچوونە خەڵوەتەوەو (٤٠) شەو و رۆژ خەڵوەتیان دەکێشا.

نەیتاشیوە؟ وتم: قوربان چۆنی دەتاشێت، وتی: پێی بڵێ با بیتاشێ... ئاویان بۆهێنام و خواردمەوە. وتی: ئەوە بەرۆژوو نیت؟ وتم: نەخێر، رۆژووم لەسەر نییە، منداڵم. فەرمانی دا نانیان بۆ هێنام و نانەکە نان و ماست بوو، وتم: نانی بەیانیم خواردووە. وتی: ماندوو بوویت کەمێك بخۆ شەرم مەکە.

نان و چام خواردو نامەکەم دایەو (ئەحە سوور) بردییە خزمەتی... نامەکەی خوێندەوە، وتی: باشە چی بۆناردووم تا ئەو دۆعایەی بۆ بنووسم؟

وتم: قوربان هیچ... فەرمووی لەبەر تۆ بۆی دەنووسم، بەڵام پێی بڵێ با ریشەکەی بتاشێت. وتم: بەڵێ، پێی دەڵێم. ئەو دوعایەی باوکم داوای کردبوو (گوللەبەند بوو) چووە ژوورەوە بۆی نووسیم و نەیهێشت بگەڕێمەوە نانی نیوەڕۆم خوارد، دوای نانخواردن، وتی: (ئەحە سوور) ماینەکەت زینکەو کوری (خالە شێخ کەریم) بخەرە پاشکۆت بیبەرەوە، وتی: فەرمانتە قوربان، بەڵام حەزدەکەم رێگام بدەیت شەو لە خزمەتیا بم، فەرمووی قەیناکا...

لەگەڵ (کاك ئەحمەد)دا گەرامەوەو کە گەیشتینەماڵەوە بە دوورو درێژیی سەرپاکی شتەکانم بۆ باوکم گێڕایەوە، تائێستا ئەو رۆژەو دیمەنەم لەبیر ناچێتەوە، دانیشتنەکەی شێخ و قسەکردنی لەگەڵمدا، هەیوان و چایخانەکە... رۆژانە وەکو شریتی سینەمایەك دێتەوە یادم...

((٤))

خوێندنەکەم بەردەوام نەبوو، چونکە باوکم لەبەر ئیش و کاروماڵ و میوان زۆر رۆژ نەیدەپەرژایە سەر من وانەکەم پێ بڵێت. (مەلا شێخ قادر) کە لەلای خۆمان بە (مەلا شێخ قادری قسور) ناسرابوو، هات، ئەم مەلایە یەکێك بوو لەو مەلایانەی قورئانێکی چاکی دەخوێندو هەموو نهێنییەکانی خوێندنەوەی قورئانی دەزانی، لەناوچەکەدا بەناوبانگ بوو. هەموو ساڵێك دەهات چەند مانگێك لەماڵمان دەمایەوەو وەکو مەلای ئاوایی پێش نوێژی بۆ خەڵکی دێیەکە دەکرد، مەلایەکی زۆر خواناس بوو، بەردەوام قورئانی دەخوێند.

بۆماوەی سێ مانگ بەردەوام قورئانی پێ وتم، زۆر بەشی لە قورئان پێ رەوان کردم. ئەو رۆیشت زۆری پێنەچوو (مەلا شێخ سالح)ی ئامادینی هات، ئەم مەلایەش یەکێك بوو لەدۆستە هەرە خۆشەویستەکانی باوکم، ساڵانە لە گوندی (ئامادینەوە) لە شارباژێڕەوە. دەهات و هەموو جارێك مانگ و دوو مانگ زیاتر دەمایەوە، پیاوێکی ئیجگار موسڵمان و هێمن و لەسەرخۆ بوو، من دەڵێم ئەگەر پیاوچاك هەبوبێت، ئەو (مەلا شێخ ساڵحە) یەکێك بووە لەو پیاوچاکانە. ئەمیش قورئانێکی چاکی دەزانی و باوکم ئەمجارە ماوەی دوو مانگ نەیهێشت بڕواتەوەو وانەی زۆری لە قورئان پێ وتم و زۆرم نەمابوو کە قورئان تەوار (خەتم) بکەم.

دێیەکەمان مەلای نەبوو... زۆری پێنەچوو باوکم (مەلا مەجیدی کانی سپیکە)ی هێناو

کردی بە مەلای مزگەوتی ئاوایی... من و کۆمەڵێك منداڵی ئاوایی لە حوجرە دەرسمان لای دەخوێند، من لە هەموویان زیاترم خوێندبوو، بۆیە منی کرد بە جێگری خۆی لە دەرس وتنەوەو سەرپەرشتیکردنی فوتابییەکاندا. ئەو دەرسی بەمن دەوت و منیش دەرسم بەمنداڵەکان دەوت... زۆر بە زوویی قورئانم تەواو (خەتم) کرد، دەستم کرد بە خوێندنی کتێبە وردەکان، دوای ئەمەش چوومە بەکرەجۆ لە ماڵی (پورە ئامین)م بووم و چوومە قوتابخانەو لە پۆلی یەك دەوامکرد، زۆرچاك دێتەوە یادم پاریزگاری ئەوکاتە (عومەر عەلی) بوو. رۆژێك هات بۆ قوتابخانەکەمان منی هەڵسان و تەباشیری دامێ شتی پێ بنووسم، ئەوکاتە لە پۆلی یەك بووم و هەردوو پۆلی (یەك و دوو) لەیەك ژووردا دەیانخوێند. ئەوەی پێیوتم لەسەر تەختەکە بەڕاستیی نووسیم و هەڵەم نەکرد، بە بەڕێوەبەری وت لە چەندە؟ وتی: لەپۆلی یەکە. وتی: (بیخەرە پۆلی دوو). لەم خوێندنە دەوامم نەکرد، دەستم کردەوە بە خوێندنی فەقێیەتی چوومە (هەزارمێرد)و لە ماڵی (حاجی مەهدی)و لای (مەلا شێخ تەیب) دەرسم دەخوێند، ڕێکەوت وابوو لەوێش (مامۆستا شێخ تەیب) چەند قوتابییەکی هەبوو، لەبەرئەوەی من لە هەموویان زیاترم خوێندبوو، دەرسم بەوان دەوت دوای (هەزارمێرد) چوومە (جێشانە) لە ماڵی (دەروێش شەریف) بووم و لەلای (مامۆستا مەلا سەید محەمەد) دەمخوێند، دوای جێشانە چوومە (کانی بەردینە)و لە ماڵی (پوورە پیرۆزم)، واتە ماڵی کاك شێخ ئیسماعیل شێخ ئەمین کە مێردی پوورم بوو، بووم و لەلای (مەلا مەجید) دەرسم دەخوێند. ئەم مەلا مەجیدە ئەو مەلا مەجیدە بوو، کە ساڵێك لای خۆمان بوو. بوو بەمەلای دێی کانی بەردینە، لەوێش چەند قوتابییەکی هەبوو، من وەکو مامۆستا وابووم و دەرسم بەسەرجەمی قوتابییەکانی دەوت، ئەویش دەرسی بەمن دەوت... دوای (کانی بەردینە) باوکم بردمی بۆ (دارتووی سەروو) بۆلای (مەلا حەمە ئەمین)و بردمیە ماڵی (حمەسەعید حاجی مەلا سەلیم). چەند مانگێك لە دارتوو مامەوەو زۆرم لاناخۆش بوو، بەبیانووی سەردانەوە رۆیشتمەوە بۆ سۆڵە، کە چوومەوە هێشتا باوکم نەگەڕابووەوە، وتیان چۆن هاتیتەوە؟ وتم: مامۆستا خۆی وتی برۆرەوە تا ماوەیەکی دیکە، چونکە ئێستا ماوەم نییە دەرست پێ بلێم... باوکم هاتەوە، کە هاتەوە زۆر تووڕە بوو، وەکو دەرکردن دەریکردم، کە بینی بێ پرس هاتوومەتەوە، سەری خۆم هەڵگرت و چووم بۆ (سلێمانی)، زۆر گەڕام بۆ ئەوەی لە مزگەوتێك جێم بێتەوە، تا بخوێنم، بەڵام جێگا نەبوو، (مەلا قادری کونەکۆتریم) بینی خۆی ئامادە کردبوو. بڕوات بۆ (جێشانە)، چونکە لەوێ شوێنی گرتبوو، وتی: بۆ نایەیەت بچین بۆ ئەوێ؟ وتم: زۆرچاکەو بڕیاری چوونم دا.

تێبینی:

ئەم بیرەوەرییە سەرەتا لە زیندان بۆم تەواونەکرا، بۆیە لێرەدا بڵاوی دەکەمەوە وەکو (یادگارییەکی زیندان)ە، بەدەستمەوەیە لە داهاتوودا تەواوی بکەم و بڵاوی بکەمەوە...

# یادگاریی زیندان

ئەم نامەیەی لەخوارەوە کە دەیخوێننەوە، دووەم نامەیە ئاراستەی هەڤاڵانی بەرێزی سەرکردایەتیم کردووە، لە بەرواری (١/٩/ ١٩٩١)دا، نامەکە پەیوەندیی هەبوو، بە مەسەلەی گفتوگۆی بەرەی کوردستانیی لەگەڵ رژێمی بەعسی فاشیدا، لەبەرئەوەی یادگارییەکی زیندانەو پەیوەندیی بەراوبۆچوونی مەسەلەی رەوای گەلەکەمانەوە هەیە، لەکاتی خۆیدا چۆنم بەرزکردووەتەوە هەرواش بڵاوی دەکەمەوە، دەقی نامەکە بەم شێوەیەی خوارەوەیە، نامەی یەکەمم لە رۆژی ١٩٩١/٨/١٢ ناردبوو، منداڵەکان نامەکەیان نەنووسیبووەوە. یەکسەر رەوانەیان کردبوو، لای خۆشم لە زیندان نەمدەتوانی بیپارێزم، بۆیە ئەو نامەیە لەناوچووە، حەزدەکەم بزانرێت لە بابەتی ئەم نامەیە هاورێیانی زیندانم (مامۆستا ئەحمەد سالح، مامۆستا شێخ عەزیزو کاک حەمەتاهیری شێخ مەحمود) سەرونامەیان لە زیندانی ئەبوغرێبەوە بۆ هەڤاڵانی سەرکردایەتی ناردو لەو باوەڕەدا نیم لەلای هەڤاڵانی سەرکردایەتیش مابێتەوە.

گفتوگۆو نامەیەك بۆ بەرێزان[*]...

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم...

هەڤاڵانی بەرێز، بەدوای نامەی یەکەممدا لە رۆژی (١٩٩١/٨/١٢)دا، وا نامەی دووەمم ئاراستەی بەرێزتان دەکەم. بەوهیوایەی بەوردیی لێیبکۆڵنەوە، دیارە نووسین و ناردنی ئەم جۆرە نامانەمان گەیاندنی دەنگمانە بە بەرێزتان، لەلایەك و هاوبەشیکردنمانە لە دەربڕینی راوبۆچوونمان لەسەر مەسەلەی رەوای گەلەکەمان لەلایەکی ترەوە. ئەمەش بەمافێکی رەوای خۆمانی دەزانین، دڵنیاین ئێوەش ئەو مافەمان پێڕەوا دەبینن، چونکە خۆمان بەموڵکی شۆڕش و گەلەکەمان و بزووتنەوە پیرۆزەکەی دەزانین فەرموون ئێوەو نامەکەم:

((١))

پێشەکی:

مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان لەنیوەی سەدەی بیستەوە، چەند شێوەیەکی خەباتی نهێنی و ئاشکرای بەخۆیەوە بینیوە. تا لەسەرەتای شەستەکانەوە لەشێوەی خەباتی ژێرزەمینی و سیاسییەوە دەستی دایە شێوە خەباتی چەکداریی (پێشمەرگایەتی)و هەردوو خەباتی شارو شاخی بەیەکەوە گرێداو لە بڕیاری خەباتی چەکداریی (پێشمەرگایەتی)یەوە، دەستکرا بە ئاشکراکردنی دروشم و داواکارییە رەوا سیاسییەکانی گەلەکەمان، وا بۆ (٣٠) ساڵی رەبەق دەچێت، گەلەکەمان رۆژانەو ساڵانە رۆڵە جەربەزەکانی لە هەردوو شێوەی خەباتەکەدا لە (ژێرزەمینی و پێشمەرگایەتی) گیانیان دەکەنە قوچی قوربانیی و ساڵ لەگەڵ ساڵیش خەباتەکە تووندوتیژترو دژوارتر دەبێت، سیاسەتی دوژمنکارانەی رژێم رۆژ لەدوای رۆژو ساڵ بەدوای ساڵدا سەرکوتکەرانەو خاپوورکەرانەو قەڵاچۆکەرانە دەگرێتە بەر، بەرنامەو پیلانی لەناوبردن و سوتماککردنی کوردستان پەیڕەو دەکات، ئەم سیاسەتە زیاترو ئاشکراتر خۆی لە ساڵەکانی دوای پیلانی لەناوبردنی شۆڕشی گەلەکەمان لەساڵی (١٩٧٥) دا دەبینێتەوە، بەدوایىدا ساڵ بەساڵ خەستترو دوژمنانەتر جێ پێی خۆی قایمتر دەکرد، بۆ لەناوبردنی گەلەکەمان، تا ساڵی (١٩٨٨) بەناوی پەلاماردانی ئەنفالەوە توانی دەست بەسەر هەموو کوردستاندا بگرێت، گەلەکەمانیان لە پانتایی دەوروبەری شاری (سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، دهۆك) کۆکردەوە، دەستیان خستە بینەقاقای و هەرچی سەرچاوەی ژیان و دەرامەت هەبوو، لێیان بڕین. (٥) هەزار گوندی کوردستانیان خاپوورو وێران کرد، چەندین شارو شارۆچکەی کوردستانیان تەقاندەوە، هێزی پێشمەرگەش بەناچاریی و لەبەر ئەو بارودۆخەی بۆ رژێمی بەعس سازا لە ئەنجامی وەستانی شەری (عیراق-ئێران)دا، مافی بەخۆی و سوپاو هێزەکانی دا بۆ بەکارهێنانی هەموو جۆرە شێوەو چەکێکی کوشندەو لەناوبردن، بۆ زاڵبوون بەسەر شۆڕشی گەلەکەمان و بزووتنەوە رزگاریخوازییەکەیدا، بۆیە بەرەو بنکەکانی سەر سنوورو ناو ئێران پاشەکشەیان کردو کارەساتێکی گەورەو پڕ مەینەتیی رووبەرووی هێزی پێشمەرگەو گەلەکەمان بوودوە، ئێمە لەو بارودۆخە سەخت و دژوارەدا، کە رەنگە خۆتان زۆرچاك لێی بەئاگابن، بێ گوێدانە هەرەشەو چاوتێبڕینێکی دوژمن و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی، بەپێی نەخشەی (سەرکردایەتی و رێکخراوی سلێمانی) بڕیاری خەباتی بەردەوامی ژێرزەمینیمان دا، بۆ بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی ئەنفال، کە وابزانم پێویست ناکات کەم و زۆر لەو مەسەلەیە بدوێم، چونکە دڵنیام بەرێزتان باش لێی بەئاگان، ئەوە بوو لە سەردەمێکدا بەهۆی پەرۆشیی هاورێیانمان بۆ مەسەلەکە لەلایەك و کەمئەزموونیی هەندێکی ترو لەخۆباییبوون و پەلەکردن لە کارەکاندا لەلایەکی تر، لە شارەکانی (سلێمانی، کەرکوك، رانیە، هەولێر، کەلار، چەمچەماڵ و بازیان) چەند شوێنێکی تر بەدوای یەکدا

چەند خەتێکی ڕێکخستن ئاشکرابوون، چەندین کەسمان کەوتنە بەر شاڵاوی گرتن و ڕاکردن، لەنێوانی ئەو هەڤاڵانەدا ئێمە لەسەرو دەمی دوو شەو و ڕۆژدا، چەند کەسمان بەبێ ئاگایی لێگیراو ئەو ژمارەیەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو زیادیی ڕۆیشت، زۆربەی ئەو کەسانەی ئێمە لەو کەسە خەباتکەرو تێکۆشەرانەی سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلوول بووین، لە نزیکەوە شارەزایی و ئاگاداری هەر هەموو ڕووداو و کارەسات و تەتەڵەو گێژەکان بوون، من خۆم کە یەکێکم لەوانەو شارەزایی و ئاگادارییم لە شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلەکەماندا هەیە. لەماوەی (٣٠) ساڵی خەباتدا، ئاگادارم چەندین جار گفتوگۆو ڕێککەوتننامە لەگەڵ ڕژێمە جیاجیاکانی عیراقدا کراوە، بۆ چەند مانگ و بگرە ڕێکەوتنی ساڵ و زیاتریشی کردووە، تا ڕێککەوتنامەی ساڵی (٧٠)، کە نزیکەی چوار ساڵی خایاندو دوا ڕێککەوتنیش ساڵی (١٩٨٤) بوو، کە نزیکەی ساڵێك دەوامی کرد، بەدرێژایی مێژووی هەموو ئەو ڕێککەوتننامەو وتوویژانە، یەکەم هەنگاو بۆ سەلماندنی نیازپاکیی ڕژێم، ئازادکردنی زیندانییە سیاسییەکان کراونەتە چەپکە گوڵی ئەو مەسەلەیە، کە جاری وا هەبووە شێوەی ڕێککەوتنەکە هەر لەشێوەی ڕاگرتنی تەقەدابووە، ئەم هەنگاو و مەرجەش لەهەموو گفتوگۆکاندا خاڵێکی ڕەواو شۆڕشگێڕانە بووە، بۆ دۆزینەوەو مەرەخەستکردنی ئەو تێکۆشەرانەی لە بارودۆخی دژوارو تیرۆردا بەهۆی چالاکی و جموجووڵی شۆڕشگێڕانەوە، لە خەباتی ژێرزەمینی و پێشمەرگایەتیدا کەوتوونەتە بەر شاڵاوی گرتن و ونکردن و زیندانیکردن، ئەم هەنگاوە یان بابڵێین ئەم یاسایە لەهەموو ئەو شۆڕشانەی دژی داگیرکەر بەرپاکراوە، وەکو شۆڕشی ئێمە کە داواکاریی مافی ڕەوای گەلێکیان پەیڕەو کردووە، بۆنموونە، لەم سەردەمەی ئێستادا کە ئێمە لەگەڵ ڕژێمدا گفتوگۆمان هەیە (شۆڕشگێڕە جەزائیرییەکان کە دەیانەوێت گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی جەزائیریدا بکەن (داوایان کرد، کە یەکەم: دەبێت هەموو زیندانییە سیاسییەکانیان بۆ ئازاد بکەن. دووەم: گفتوگۆشیان بدرێتە تەلەفزیۆن. سێیەم: هەموو جۆرە هەڵبژاردنێك ڕابگرن تا کۆتایی گفتوگۆ).

ئێمەی گەلی کورد لە دێرزەمانەوە خەبات دەکەین، بەدرێژایی تەمەنی ئێمە کەوا (سی ساڵە) شۆڕشی ڕەوای ڕزگاری گەلەکەمان دەستی پێکردووە، قوربانیی لەسەر قوربانیی دەدەین و کارەسات لەسەر کارەسات ڕووبەڕووی گەل و نیشتمانەکمان دەبێتەوە، کەچی بەداخەوە دروشمی داواکارییەکانمان لە سندووقی. (حوکمی زاتی)دا خۆی لە قاڵبداوەو چەکەرەو چرۆیەکی تر دەرناکات و تێپەڕناکات، بەپێی ئەو کارەسات و قوربانییانە مامەلەی شۆڕشگێڕانە بۆ مافی ڕەوای گەلەکەمان لەبەرچاو ناگیرێت، ئەوەی لە بەیاننامەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠) بەرەسمیی و نیوەناچڵی ڕژێمی بەغدا بۆ گەلەکەمانی دانپیاناوە، کە هەر لەسەرتاوە کەوتە پیلانگێڕان و سەوداکردنی پەشیمانیی و پاشگەزبوونەوەو دواخستنی جێبەجێکردنی بەندەکانی و پێداگرتن لەسەر مەرام و خواستی خۆی، بۆ بەرژەوەندیی ڕژێمەکەی. هەر خۆی بوو، بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێککەوتننامەیەو کشانەوەی هێزو بارەگاکانی پێشمەرگە

لەناو شارو شارۆچکەکانی ژێر دەسەلاتی رژێم، لێرەدا وەکو مەسەلەیەکی مێژوویی بیرەوەرییەکم دێتەوە یاد کە بە پێویستی دەزانم بیخەمە پێش چاوی بەرێزتان:

(لە سەرەتای سالی ١٩٧٤-دا بوو، دوا وەفدی کورد هاتە بەغدا، ئەوەی لەیادم بێت یەکێك لەو وەفدانە (کاك حەبیب محەمەد کەریم)بوو، کە ئەوکاتە سکرتێری (پ.د.ك) بوو، کۆبوونەوەیەکی بەهەموو کادیرە پێشکەوتووەکانی لقی (٥) کرد، لەو کۆبوونەوەیەدا هەڤالی شەهید (مامۆستا سالح یوسفی) ئامادە بوو. (کاك حەبیب) پرۆژەیەکی شۆرشی دەرهێناو وتی: ئەمە پرۆژەی خۆمانەو هاتووین بۆ دوایەمین جار پێشکەشی حکومەتی دەکەین، ئەگەر لەسەری رازی بوون، ئەوا لەم رۆژانەدا بلاوی دەکەینەوە، ئەگەر رازیش نەبوون، ئەوا دەست بەشەرکردن دەکەینەوە. لەو کۆبوونەوەیدا، وتوویژو لێکۆلینەوەو پرسیاری زۆر کرا، لەو پرسیارانەی رووبەرووی (کاك حەبیب) بووەوە، ئەوەبوو لێمان پرسی (ئەگەر حکومەت بەم پرۆژەیەی ئێمە رازی نەبوو، شۆرشیش بریاری شەری دایەوە دروشم و داواکاری ئێمە، واتە (شۆرش) دوای دەستپێکردنەوەی شۆرش چی دەبێت؟). وتی: مەبەستتان لە چییە؟ وتمان: دروشمەکمان هەر (حوکمی زاتی بۆ کوردستان و دیموکراتییەت بۆ عیراق دەبێت)؟ یان حوکمی زاتییەکە دەگۆرێت بۆ (فیدرالی یان کۆنفدرالی) لەوەلامدا وتی: بەتەئکید دروشمی حوکمی زاتی دەگۆرێت و دەبێتە (فیدرالی یان ئومفیدرالی). ئێمە ئەوکاتە هەرهەموو سوور بووین لەسەر شەرو خوێن گەرمیمان وای لێکردبووین حەزمان لەشەر دەکردەوە، لەناو ئەو پرسیارو لێکۆلینەوەیەدا (شەهید یوسفی) هەلیدایەو وتی: (بەرای من نە سەرجەمی پرۆژەکەی ئێمەو نە پرۆژەکەی حکومەت بێت، بەلکو پرۆژەیەك بێت هەرچی بکەین، کارێك بێت شەر نەبێتەوە، ئەوانەی بەلێنیان پێداوین کە یارمەتیمان بدەن لەکاتی شەرکردنەوەدا، درۆمان لەگەلدا دەکەن)، ئێمە هەموو بەگالتەجارییەوە رووی قسەیەکمان کردە (شەهید یوسفی)، ئەو وا وەلامی ئێمەی دایەوەو وتی: (هیچم نییەو زۆر ئاگام لە خۆمەو بابە ئێوە خوێنگەرمن و هەندێ شت من دەیزانم، ئێوە لێی بێ ئاگان، ئەمە رای منە بۆ مێژوو لەدواجاریشدا کالەك بەئەژنو دەشکێنن، چونکە بۆ ئیستای ئێمە گەشەکردن و پاراستنی ئەو شێوەی حوکمی زاتییەی من دەیلێم، باشترە لە شەربوونەوە)، ئەمە مەسەلەیەکی مێژووییە خۆم یەکێك بووم لەو کادیرانە، کەچی بەداخەوە دوای (٣٠) سال بەسەر ئەو وتوویژو بەیاننامەیەدا، دوای راگواستنی دەیان گوندی سنووری لە کوردستاندا، بەناوی (پشتیوانی ئەمنی)یەوە، دوای بۆردومانکردنی شاری هەلەبجەی شەهید بە چەکی کیمیایی و شەهیدکردنی (٥) هەزار کوردی بێتاوان و دەربەدەرکردنی هەزارانی دیکە، دوای ئەنفالی بەدناو و ونکردنی (١٨٢) هەزار خەلکی کورد، دوای هەشت هەزار بارزانی بێسەرو شوێنکراو، دوای سووتماککردنی کوردستان بەخاپووورکردن و وێرانکردنی (٥) هەزار گوندو تەقاندنەوەی چەندین شارۆچکەی دێرینی کوردستان، دوای دۆزینەوەی دەیان گۆری بەکۆمەل و دوای شەهیدبوونی هەزاران پێشمەرگەی قارەمان لە سەنگەری بەرگریدا دژی رژێمی فاشی بەغدا، تازە بەتازە نوێنەرانی

شۆڕش و گەلەکەمان وتوویژ لەسەر فراوانکردن و چاککردنی ئەو حوکمە زاتییە دەکەن.
بەپێی ڕووداو و هەموو گۆڕانکارییەکانی ناوەوەو جیهان و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و سەردەمی ئێستا، بارودۆخەکە جیاوازیی زۆری هەیە لە ساڵانی حەفتاو کاتی ڕێککەوتنی بەیاننامەی (یانزەی ئازار)، من وای دەبینم کە سەنگی مەسەلەکان بەلای گەلەکەماندا قورسترە وەك بەلای ڕژێمی بەغدادا، ئەو بارودۆخەی ئێستا بۆ گەلەکەمان و شۆرشەکەی ڕەخساوە، لە هیچ کات و سەردەم و ساڵانێکی دیکەدا نەهاتووەتەکایەوە، هەلکەوتی وای بۆ ڕێنەکەوتووە، وەکو هەموو گۆڕانکارییەکانی دنیا خۆ بەگۆڕانکارییەکی ناوازەو سەرتاسەریی هەر بەوشێوەیەش ئەم حاڵە بۆگەلەکەمان لەبارە، بۆیە ئەم هەلکەوتە ڕەخساوە هۆشیارانە مامەلەی لەگەلدا بکەین، با لەدەستی نەدەین و زیرەکانە بتوانین کەلکی بۆ گەلەکەمان لێ وەربگرین، هەلێکی لەبارە بۆ ئەوەی سەر بە بەعسی فاشی دابنەوێنین و لاوازیی ڕژێمی بەغدا بقۆزینەوە، بۆ دەستەبەرکردنی زۆربەی زۆری خواستی گەلەکەمان، فەرموون من وای دەبینم کە ئێمە دەستمان بالاترە لە ڕژێم لەم بوارانەدا:-

**أ- لەڕووی باری ناوخۆمانەوە:**

١-جەماوەری گەلەکەمان لەهەموو ساڵانی پێشوو کۆك و تەباو ئامادەو لەخۆبووردووترە، یەك دەنگن بۆ پشتگیریکردن و بەدەنگەوەهاتنی داواکارییەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان، کە ئەوە خۆی لەخۆیدا لە داواکردنی مافی ڕەوای گەلەکەماندا، کە مافی چارەی خۆنووسینە دەبینێتەوە، کە ((دروشمی مافی چارەی خۆنووسین لەدوای شۆڕش ئەیلوولی ساڵی -١٩٧٥-ەوە بەدەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێخوازی گەلەکەمان بە ڕابەرایەتی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) کراوەتە دروشمی خەبات و تێکۆشان)).

٢-لایەن و ڕێکخراوە کوردستانییەکان، لەهەمووکات و لەم کاتەدا کۆك و یەکگرتووترو هۆشیارانەترو بەئەزموونترن، کە ئەویش ئەمڕۆ هەموولایەنەکانی ناومەیدانی کوردستان خۆیان لە (بەرەی کوردستانیی)دا کۆو تەبا کردووە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا درككردنە بە مەسەلەی مەسئولییەتی مێژوویی لەم قۆناغەدا، دیارە هەر ئەم کۆك و تەباییە دەستەبەری سەرکەوتنی مەسەلەی خەباتی چەندین ساڵەی گەلەکەمانە.

٣-جەماوەری ڕقنەستوورو داخلەدلی گەلەکەمان بێ ترس و سلەمینەوە لەگەل هێزی شۆڕشگێری گەلەکەماندا ئامادەی پەلاماری سەربازگەو دامودەزگا سەرکوتکەرو داپلۆسێنەرو بنکەو پیاوەکانی ڕژێم بوون، لەناو شارو شارۆچکەو سەرجەم ئۆردووگا زۆرەملێکاندا، ئەوەبوو لە ڕاپەڕینەکەی سەرەتای مانگی (٣)دا، جەماوەری گەلەکەمان هاوشان لەگەل هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا، هێرشی یەك لەدوای یەکیان کردە سەر هەموو ئەو دامودەزگایانەی ڕژێم لە شارەکانی (سلێمانی، هەولێر، دهۆك و خانەقین) دوا هێرشیان بۆ سەر شاری دێرین

و شادەماری ئابووریی گەلەکەمان (کەرکوك) بوو، کە توانرا بەهۆی ئەو هێزە یەکگرتوو و قینلەدڵەوە بۆ یەکەمجار لە مێژووی رزگاریخوازی گەلەکەماندا دەست بەسەر شاری کەرکوکدا بگیرێت و بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی جەماوەرو گەل و شۆرشەوە.

٤- لە ئەنجامی هێرش و پەلاماری قارەمانانەی جەماوەری گەلەکەمان، تۆڵەسێنانە توانرا بە هەزاران لە پیاوان و سەرانی بەدەسەڵاتی رژێم لەناوببرێت و دەستگیربکرێت، بەهەزاران سەربازو ئەفسەری دەرەجەداری جۆراوجۆرو چەکداری دیکەی رژێم بەدیل بگیرێن و چۆکی سەرشۆریی تاوانبارییان پێ دابنەوێنن، کە ئەمەش لەخۆیدا شکاندنی سام و هەیبەتی سوپاو چەکدارەکانی رژێم بوو، کە بەرەفتاری درندانەیان سەرجەم جەماوەری کوردستان و عیراقیان تۆقاندبوو.

٥- لەو هێرش و پەلامارانەی پێشمەرگەو جەماوەر، بۆسەر سەربازگەو بنکەو دەزگا جۆراوجۆرەکانی رژێم، خۆشبەختانە توانرا بە هەزاران چەکی قورس، تانك، زریێ پۆش، بە هەزاران پارچە چەکی سووك و جۆراوجۆر چەندین مەخزەنی چەك و تەقەمەنی دەستیان بەسەردا بگیرێت و ببێتە موڵکی شۆرش و جەماوەری گەلەکەمان، کە ئەم دیاردەیە لەهیچ سەردەمێکدا بەم شێوەیە بۆ گەلەکەمان نەرەخساوەو نەهاتووەتە دی.

٦- لە گرتنی شارو شارۆچکەکاندا، چەندین بانکی پر لەپارەو چەندین مەخزەنی ئازووقەی بێ ژمارە، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی جەماوەرو شۆرشەوە، کە ئەم پارەو ئازووقەیە خۆی لەخۆیدا وزەو توانایەکی تایبەتی هەبوو، بۆ بووژاندنەوەی جەماوەری گەلەکەمان و پەرەسەندن و دەوڵەمەندبوونی شۆرش. کە ئەم جۆرە دەستکەوتە لە بارودۆخێکی وا رەخساودا نەبێت، هەرگیز نایەتە دی، بۆیە دەبێت کەڵك لەم هەلە وەربگیرێت و بەهیچ ئەم خێرو بێرە لەناو نەبرێت.

٧-پەیوەندیکردنی سەرجەم چەکدارەکانی رژێم لە فەوجە خەفیفەکان، مەفرەزە تایبەتییەکانی ئەمن، ئیستخبارات، موخابەرات، پیاوانی ئەمن و بەعسییەکان، بەهێزی پێشمەرگەو جەماوەری راپەریوی گەلەکەمانەوە، لە یەکەم قۆناغی راپەرینەوە، ئەمەخۆی لەخۆیدا پێی دەوترێت تەقینەوەی سەرتاسەریی گەلی گورد، دیارە ئەم جۆرە تەقینەوانەش هیچ هێزێك نییە خۆی لەبەردا بگرێت و بەرەنگاری بێتەوە، بۆیە لەماوەی چەند رۆژێکی کەمدا دوژمنی داگیرکەری بەعسیان، رەگ و ریشەی چەندین ساڵەی لەبن هەڵکەنراو هەر هەمووی خۆی بەهێزی پێشمەرگەو جەماوەر ناساندو ملی تەسلیمبوونیان دانەواند، کە ئەم دیاردەیە ئەگەر لە بارودۆخێکی وا رەخساودا سەری هەڵنەدایە، زۆر بەگران ئەو بنکەو دامودەزگاو گەرایانەی چەندین ساڵەی رژێم لە کوردستاندا، هەڵدەکەنراو پاکدەکرایەوە، کە ئەم رووداوە خۆی لەخۆیدا شۆرشێکی نوێ بوو لە شێوازێکی نوێی خەباتی گەلەکەمان، بۆیە دەبێت هەردەم ئەو دەستکەوتانە بپارێزین و لەکیسی نەدەین.

٨-لەگەڵ راپەرینەکاندا سەرجەمی سەرچاوەی ژیانی ئابووریی رژێم لە کارگەی

پیشەسازی، ئابووریی، بەرهەمهێنەر و مۆڵگاو بنکە سەربازییەکان، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش و جەماوەری گەلەکەمانەوە، کە ئەمە بوو بەهۆی برینی شادەماری ئابووریی رژێم، دیارە رۆڵی کاریگەری هەیە لەسەر رژێمی سەدام.

٩- کاتێك رژێم هۆشی هاتەوە بەرخۆی و بە سوپا شکاو و دارزاوەکەیدا چووەوەو کۆیکردنەوە، دەستی کردەوە بە پەلاماردانەوەی جەماوەری راپەڕیوی کوردستان، هەر بۆیە بەهێزێکی زۆرو داخلەدلەوە پەلاماری شاری (کەرکوك)ی داو بەهۆی ئەو چەند هۆیەی کە هەموو دەیزانین، توانی دەست بەسەر کەرکوکدا بگرێتەوە، هەر دوای کەرکوکیش پەلاماری سەرتاسەری شارەکانی (چەمچەماڵ، دوز، ئاڵتوون کۆپری، سلێمانی، هەولێرو دهۆك)ی دا، بەلاّم کاتێك جەماوەری گەلەکەمان لە نیازی گلاّوی رژێم گەیشت، کە ئەم هێرشەی تۆلە ئاسایەو کۆ لەهیچ شتێك ناکات، دەیەوێت بەدەردی شاری کەربەلاو نەجەف تەرو وشکی شارەکانی کوردستانیش بەسەریەکدا بسووتێنێت، قەتل و عامی خەڵکی کوردستان بکات، هێزی پێشمەرگەش وەکو پێویست تەیارو کۆك نەکرابوو، کە بتوانێت وەکو پێویست بەرگریی لەو هێرشە گەورەیە بکات و رووبەرووی بوەستێت، ئەمەش دیارە هەر دەگەرێتەوە بۆ چەند هۆیەکی ناوەکی، بۆیە جەماوەری گەلەکەمان هاودەنگ و بێ سلمینەوە وازی لە ماڵ و سامانی خۆی هێناو بریاریدا بۆ مانەوەی شەرەف و وزەی مرۆیی کورد، رەو بکات بۆ ناو شاخ و دۆڵ و کەژە سەرسنوورییەکان. بەپێی پەتی، سەروسنگی رووت، بێ نان و پۆشاك، بێ راخەرو کەلوپەل لەژێر رێژنەی گوللەو باران و تەرزەو سەرماو سۆڵەدا، ملی رێگای هات و نەهاتیان گرتە بەرو هەزاران کیلۆمەتریان بە چەندین رۆژ بری و لە ترسی مەرگی سەدام، مەرگی شیو و دۆڵ و چیا سەرکەشەکانی کوردستانیان هەڵبژارد، خۆیان گەیاندە سنوورەکانی (عیراق- ئێران و عیراق-تورکیا) ئەم رەوە کارێکی هێندە گەورەو لە عەقل بەدەربوو، راستەوخۆ کاری کردە سەر سیاسەتی رژێم، کە نەك سیاسەتی رژێمی لەجێی خۆیدا پووچەڵ کردەوە، بەڵکو گەلانی دراوسێ و گەلانی دنیای سەرسام کردو سۆزی بەلای گەلی کوردا راکێشا، کە ئەم دیاردەیە لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەماندا نەبووەو روونەداوە. بۆیە دەبێت ئەم شێوە نوێیەی خەبات دەرس و پەندی شۆرشگێرانەی لێوەربگیرێت و بخرێتە پاڵ کارەساتی بارزانییەکان و ئەنفال و هەڵەبجەی شەهید، چونکە بەهەزاران کەس لە پیرو منداڵ لەو کۆرەوەدا گیانی پاکیان بەخشی.

١٠- کاتێك رژێم زانی لە سیاسەتی کوشتن و تالاّنکردندا زەرەرمەند بوو، پەنای هێنایە بەرچەکی رزیوی گفتوگۆو هەر لەسەرودەمی مانگانەی وتووێژدا، جەماوەری گەلەکەمان شێوە خەباتێکی دیکەی گرتەبەر، ئەویش خەباتی مانگرتن بوو، دیارە خەباتی مانگرتنیش شێوەیەکی نوێی خەبات و پێویستی ئەم سەردەمەیە، بۆیە لە کوردستاندا سەریهەڵداو کارێکی زۆری کردە سەر پێشخستنی خەباتی گەلەکەمان، لەرووی ناوەوەو جیهاندا، ئەوەبوو تا (UN ) وەلاّمی داخوازیی مانگرەکانی نەدایەوە، مانگرە قارەمانەکان مانگرتنیان

نەشکاند، جەماوەری گەلەکەشمان بەپەرۆشەوەو رۆژانەو شەوانە لەژێر رێژنەی باراندا لە مانگرەکان کۆدەبوونەوەو پشتگیرییان دەکردن.

١١-کاتێك رژێم دامودەزگا ئیدارییەکانی تێکوپێك شکا، مووچەخۆران و کرێکاران و فەرمانبەران بوونە دەستەبەری بەڕێوەبردنی کاروبار لە کوردستاندا، بۆ چەند رۆژێك نەبێت دەزگا ئیدارییەکان و بەرهەمهێنەرەکان رانەوەستان، دیارە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە جەماوەر چەندێ بەپەرۆشەو چەند نەترسە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی خۆی.

١٢-هەر بەدەستپێکردنی راپەڕین، دەیان حزب و رێکخراوی سیاسیی شاراوەو نوێ سەریانهەلداو خەباتی رێکخراوەیی خۆیان ئاشکراکرد، بەبێ ئەوەی بەرەی کوردستانیی رێگا لەهیچ لایەنێکیان بگرێت و سامالێکی دیموکراتی و ئازادیی لە سەرتاسەری کوردستاندا سازاو بالی بەسەر جەماوەری گەلەکەماندا کێشا. کە ئەم ئازادیی و دیموکراتییە بوو بەهۆی زیاتر دەرکەوتنی سیاسەتی دیکتاتۆری فاشییەتی سەدام.

**ب-لەڕووی باری ناوخۆی عیراقەوە:**

١- دوای پەلاماری دەولەتە هاوپەیمانەکان، جەماوەری گەلی عیراق لە شارەکانی ناوەراست و خوارووی عیراقدا راپەڕین و پەلاماری دامودەزگاکانی رژێمیان داو تۆلە سێنەرانە دەستی رق و قینیان لێوەشاندن، زۆربەی شارەکانی ناوەراست و خوارووی عیراق کەوتە ژێر کۆنترۆلی جەماوەرەوە، رژێم هیچ دەسەلاتێکی تیایدا نەما، تەنانەت ئەو راپەڕین و پەلامارە هەندێك شوێنی لەناو بەغدای پایتەختیشدا گرتەوە، وەکو (مدینة الثورة).

٢-هەرچۆن لە کوردستاندا چی سامانی ئابووریی، سەربازیی، ئەمنیی هەبوو، کەوتە ژێر دەسەلاتی جەماوەرەوە، هەروەاش لە شارەکانی خوارووی عیراقیش دووپات بووەوەو رژێم بەهیچ شێوەیەك دەسەلاتی ئیداریی، ئەمنیی و سەربازیی خۆی بەسەریاندا نەما، هەرهەموو ئەو دامودەزگایانە تەسلیم بە جەماوەر بوون.

٣-پاشماوەی سوپا دڕندەکەی لە شەڕی کەنداودا کەوتە بەرشالاوی راپەڕین، زۆربەیان هەر لەیەکەم پەلاماردا خۆیان تەسلیمی جەماوەر کرد. زۆریشیان هەبوو چوونە پالیان و رووی چەکەکانیان کردە سنگی رژێم و دەزگاکانی.

٤- رارای و دوودلیی لە ئەنجامی ئەو راپەڕینانە، کەوتە ناو پیاوان و سەرانی رژێمەوە، کە ئەم دیاردەیە بەشێوەیەك بوو پیاوی وایان هەبوو، لە دروستبوونی حزبی بەعسەوە کاری حزبیی لەئەستۆدابوو، کەچی بێ هیوابوو، لەڕێی حزبەکەی لایداو پشتی تێکردو خۆی تەسلیمی جەماوەر کرد، ئەم دیاردەیە بوو بەهۆی دارزان و تێکشکانی دامودەزگا حزبیی، ئەمنیی و سەربازییەکانی رژێم.

٥-بەهۆی راپەڕینەوە جەماوەر ئەو سام و ترسەی لە رژێم و پیاوان و دەزگا سەرکوتکەرەکانی

هەبیبوو، ڕەوییەوەو گیانی پەلاماردان و بەگژاچوونەوەی تیا دروستبوو.

٦-بەهۆی ئالۆزیی باری ناوەڕاست و خوارووی عیراقەوە. سوپایەکی زۆری ڕژێم لەو ناوچانەدا جێگیرکراون و لەبەر باروودۆخە نائاسایییەکە، ناتوانێت جوولەیان پێبکات، کە ئەمەش هەلێکی ڕەخساوە کە زۆربەی سوپای ڕژێم نەتوانن بەشداریی هێرش و پەلامارداني ڕژێم بکەن بۆ سەر کوردستان.

٧- بەهۆی ئەو ئالۆزیی و پاشاگەردانییەی کەوتە ناو دامودەزگاکانی ڕژێمەوە لە کوردستان و خوارو و ناوەڕاستی عیراق. ڕژێم ناچاربوو بەدەیان پیاو و سەرانی خۆی بەسزای لەناوبردن و کوشتن بگەیەنێت، بە تاوانبارکردنیان بە خیانەت، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا خۆشبەختییەکی چاکە بۆ گەلی عیراق و گەلی کوردمان، زیاتر ڕاڕایی و دوودڵیی لەناو پاشماوەی هێزەکانی تریدا پەیدا دەکات و وەکو جاران بەپیر فرمانەکانییەوە ناچن.

٨-لەسەر مەسەلەی ڕاپەڕینەکانی خوارو و ناوەڕاستی عیراق و شێوەی سەرکوتکەرانەی، ئەو ڕاپەڕینانە دووبەرەکیی و ناکۆکیی لەناو دامودەزگاو سەرکردایەتی ڕژێمدا سەریهەڵداو بوو بەهۆی دەرکردن و دوورخستنەوەی زۆریان، دیارە (سعدون حمادي) هەموو کەس دەیزانێت لەسەر چی لابرا.

### ج- لەڕووی عەرەبییەوە:

١- ڕژێمی بەعسی بەغدا بەیەکجاریی لەناو دەوڵەتە عەرەبییەکاندا بەتاکیی ماوەتەوە، دۆستە هاوماڵ و خێزانییەکانیشی ئێستا پشتیان تێکردووەو نایانەوێت بەچاك و خراپ لای لێبکەنەوە.

٢- دانشگای عەرەبی بەتەواوەتی ڕژێمی بەغدایان لەبەرنامەی خۆیان دەرکردووەو هیچ ڕاپۆرت و داواکارییەکی بەچاك و خراپ ناخوێننەوەو بایەخی پێ نادەن.

٣- زوربەی وڵاتە عەرەبییە دۆستەکانی ڕژێم، ئێستا بوونەتە دوژمنی سەرسەختی ڕژێم، بەئاشکرا هەڕەشەی لەناوبردنی لێدەکەن، هەموو جۆرە وزەو توانایەکی خۆیان خستووەتە گەڕ بۆ خستنی سەدام و ڕژێمەکەی.

٤- ئەو وڵاتە عەرەبییانەی لەزۆر دەمێکەوە لەگەڵ ڕژێمی سەدام ناکۆکن، ئێستا زیاترو توندتر ئەو ناکۆکییەیان خەستکردووەتەوەو دەیانەوێت لەم هەلە ڕەخساوەدا تۆڵەی خۆیانی لێبکەنەوە.

٥-ڕژێمی بەغدا بەگرتنی کوەیت، وڵاتانی عەرەبی بۆیان دەرکەوت کە ئەم ڕژێمە گیانی داگیرکردن و سەرۆکایەتی لە کاری ڕۆژانەیدا مرق دەداو هیچ سەرکردەیەکی عەرەب بەهاوشانی خۆی نازانێت، بگرە خۆی بە سەرکردەو سەرۆکی هەموو گەلی عەرەب دەزانێت، بۆیە کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان پەلاماری عیراقیان دا، جگە لەو وڵاتانەی بەرەسمیی هاوبەشی ئەو

دەوڵەتە هاوپەیمانانە بوون و ئەو دەوڵەتانەی بەشدارییان نەکردبوو، بەکەم و زۆر بەرگرییان لە رژێمی بەغدا نەکردو بە بچووکترین نارەزایی دژی ئەو پەلاماردانە هاوبەشییان نەکرد.

**د- لەرووی جیهانییەوە:**

١-دیارە بەپێی زنجیرە تاوانەکانی رژێمی سەدام و رووداو و کارەساتەکانی گەلەکەمان، لە کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، شالاوی ئەنفال، خاپوورکردنی (٥) هەزار گوندی کوردستان، سەرنگومکردنی (٨) هەزار بارزانی، گەلانی دنیاو وڵاتە خێرخوازو رێکخراوە مرۆڤدۆستەکان بە گەلەکەمان ئاشنابووبوون و شارەزای مەینەتی و بێدەرامەتیمان بوون، کەم تا زۆر پشتگیریی مرۆڤانەی خۆیان لە کارەساتەکانمان دەکرد، تا کۆرەوی ئەمساڵی خەڵکی کوردستان، کە ئەم کۆرەوە بەشێوەیەك بوو، کاری راستەوخۆی کردە سەر ویژدانی وڵاتانی دراوسێی کوردستان، وەکو (ئێران، تورکیا، گەلانی جیهان، وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات و خۆرئاوا)، کە کارەساتەکە بەو شێوەیە بوو نە ئێران نە تورکیا نەیانتوانی خۆیان لە ئاستیدا رابگرن، ناچاربوون دەرگاکانی سنووری وڵاتەکانیان خستەسەرپشت و باوەشی بەزەیی و بەپیرەوەهاتنیان بۆ لێقەوماوانی گەلەکەمان گرتەوە، بەفریایانەوە چوون و وڵاتانی دنیاش پشتگیریی خۆیان نیشاندا.

٢-هاودەنگ لەگەڵ کردنەوەی سنوورەکانی (ئێران و تورکیا) وڵاتانی هاوپەیمان و وڵاتانی ئەورووپا کەوتنە پاڵپشتی گەلەکەمان و بە هانای لێقەوماوانی گەلەکەمانەوە هاتن، بڕیاری پاڵپشتی و بەپیرەوەهاتنیان دا، بەپەلە کەوتنە خۆ بەناردنی هەموو جۆرە کەلوپەل، خواردەمەنی، چادر، راخەر، پۆشاك و داوودەرمان بۆ دەربەدەرو ئاوارەکانی گەلەکەمان، لە ناوچە سەر سنوورییەکان و ئۆردووگاکانی ناو ئێران و تورکیا.

٣-هاوئاهەنگ لەگەڵ بەپیرەوەهاتنی مرۆڤانەی گەلەکەمان، دەنگی نارەزایی و هەرەشەکردن بەرزبووەوە لە رژێمی سەدام، سوپای دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەپەلە لە تورکیا دابەزی و لە ماوەیەکی کەمدا خۆیان گەیاندە کوردستان بۆ پارێزگاریی لە گەلی کوردو بەرپەرچدانەوەی شالاوی رژێم بۆ سەر کوردستان.

٤-هەرلەکاتی ئەو کارەساتە گەورەو گرانەدا بوو، کە هەموو جیهانی هەژاند، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبووەوەو بڕیاری ژمارە (٦٨٨)ی بۆ پاڵپشتی گەلی کورد دەرکرد، دژی رژێمی سەدام و بۆ بەرگریکردن لە شالاو و هێرشی نامرۆڤانەی بۆ سەر خەڵکی لێقەوماوی کوردستان. ئەم بڕیارە خۆی لەخۆیدا دانانە بەمافی رەوای گەلەکەمان، لەلایەن ئەنجوومەنی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، پێویستە ئێمە کەڵك لەم بڕیارە وەربگرین و هەوڵبدەین کە ببێتە بڕیارێك (مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلەکەمان) مسۆگەر بکرێت، دیارە کە ئەم بڕیارە رێگرتنە لە رژێمی سەدام لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکی قورس و

کوشندەو فرۆکەو هێرشی بەربلاو بۆ سەر خەڵکی کوردستان، هەربۆیە ئەم بڕیارە دیوارێکی پارێزگارییە لە گەڵەکەمان.

٥-مانەوەی ئابلۆقەی ئابووریی لەسەر عیراق و دەرکردنی بڕیار لەسەر بڕیار لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، کارێکی ئەوتۆی کردووە، کە هەردوو دەستیان خستووەتە بینەقاقای رژێم و دەیانەوێت بیخنکێنن. ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکە توانای سەربازیی، ئابووریی، سیاسیی، ئیداریی و کۆمەڵایەتی رژێمی بەغدای لەگۆ خستووە.

٦-شەرفرۆشتن و بیانووگرتن لەلایەن دەوڵەتی (ئێران-تورکیا- سوریا- سعودیە) بە عیراق، بەناوی داکۆکیی و یارمەتیدانی گەلی عیراق و پشتگیری لێکردنی ئەم حاڵەش مەترسی خستووەتە سەر سوپاکەی بۆ رووبەڕووبوونەوەی شەڕێکی دیکە بۆیان.

٧-ترۆبوونی دراو، واتە پارەی عیراقی لە مامەڵەی جیهانیدا، بەشێوەیەك هەرچی نرخ هەبێت بۆ دراوەکە نەماوە، کە ئەم حاڵە کاری راستەوخۆی کردووەتە سەر ئابووریی رژێم لەلایەك و ئابووریی بازرگانیی گەلی عیراق لەلایەکی دیکە.

ئەمانەو زۆری تریش کاری راستەوخۆیان کردووەتە سەر رژێمی سەدام و هەڕەشەی دوا رۆژی رەش و لەناوبردنی لێدەکەن. جا لە بارودۆخێکی وا رەخساو و لەباردا، کە هەموو هۆو دیاردەکان بوونەتە هۆی بارخواریی رژێم و کەس نییە سووکە شانێکیش بداتە بەر راستکردنەوەی، خۆشی تواناو تاقەتی راستکردنەوەی نەماوەو بارەکەش زۆر قورسەو زۆر بەزەحمەت دەتوانێت هەنگاوی لەژێردا بنێت، کەچی ئالەم کاتەدا (شۆڕش و بەرەی کوردستانیی) خۆیان کۆك و ئامادەکردووە، بۆ ئاهەنگی گفتوگۆو کەوتوونەتە بڕواو قەناعەتێکی وا، کە (سەدام حسێن) گۆڕاوەو بووەتە ئەندازیاری حوکمی زاتی...!! دەیەوێت زۆر بەجدیی بۆ رێککەوتن و چارەسەری عادلانەی مەسەلەی کورد هانگاوبنێت.

بەپێی رۆژنامەو قسەکەرەکانی وەفدی بەرەی کوردستانیی، وتووێژەکە بۆ تەواوکردنی پرۆژەی حوکمی زاتی (١٩٧٠) لەژێر ناوی (فراوانکردن و چاککردن و گۆڕانکاریی)، وا بۆ چوار مانگ دەچێت بۆ بژارکردن و جۆماڵکردنی ئەو حوکمەزاتییە هاتوچۆی بەردەوام دەکرێت، ئەمڕۆ بۆ سبەی و سبەی بۆ هەفتەی داهاتوو، دەستی دەستی بە بەرەی کوردستانیی دەکرێت.

((٢))

له بارودۆخێکی وادا، که رژێم له گیانه‌للای مه‌رگدایه، ده‌رووی لێبراوه‌و له هه‌موو لایه‌که‌وه‌و هه‌لکه‌وتی ناوخۆیی و ناوچه‌یی و جیهانیی واره‌خساوه، که هه‌موو دیارده‌و رووداوه‌کان هه‌ره‌شه‌ی تووندوتیژ له له‌ناوچوونی رژێمی سه‌دام ده‌که‌ن، له‌م کاته‌دا هه‌موو گه‌لانی عیراق به‌هه‌موو جیاوازیی بیروباوه‌ر، ئایین، مه‌زهه‌بی و نه‌ته‌وه‌یییه‌وه، چاوه‌روانی نه‌مان و لێکهه‌لوه‌شاندنی رژێمی به‌غدای دکتاتۆریی ده‌که‌ن و سه‌رجه‌می جه‌ماوه‌ری گه‌لی عیراق داخله‌دلانه‌و رقنه‌ستوورانه، په‌لاماری دامووده‌زگاکانی رژێم ده‌ده‌ن. به‌داخه‌وه به‌ره‌ی کوردستانیی دای ده‌مرکێننه‌وه‌و ته‌یمان به‌ستیی بۆ دامووده‌زگاکانی رژێم دروست ده‌کرێت.

من له‌باوه‌رێکدام که رژێمی سه‌دام و خودی سه‌دام خۆی و سروشتی خۆی، نه‌گۆراوه‌و ناشگۆرێت، هه‌ر درێژه‌پێدانه به دکتاتۆره‌که‌ی جاران، به‌لام ئه‌مرۆ بۆ پارێزگاریی له کورسی ده‌سه‌لاتداریی ده‌یه‌وێت به‌رگی دکتاتۆرییه‌ت به که‌وله مه‌رێك داپۆشێت، بۆیه به‌پێویستی ده‌زانم له‌گه‌ل راو هه‌لسه‌نگاندنه‌کانمدا ره‌خنه‌و بۆ چوونه‌کانم ده‌رباره‌ی ئه‌م حاله‌ی ئێستاو گفتوگۆ بخه‌مه پێش چاوی به‌رێزتان، به‌مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی که له قوولایی زیندانێکی دوورو له پشتی چه‌ند ده‌رگای کلۆمدراوی یه‌ك له‌دوای یه‌کدا، ده‌نگم بگه‌یه‌نمه ناو کۆرو کۆبوونه‌وه‌کانتان و بیرتان بهێنمه‌وه که ئێمه‌ش له سه‌رده‌مێکدا هاورێ و کورانی رۆژانێکی سه‌خت و دژواری رۆژانه‌ی خه‌باتتان بووین، بۆ هه‌موو مه‌سه‌له‌کان له هه‌موو بارودۆخێکدا هه‌لوێستی شۆرشگێرانه‌و بۆچوونی تایبه‌تی و دروست و نه‌خشه‌ی گونجاوی خۆمانمان هه‌بووه.

ده فه‌رموون با له بۆچوونی منه‌وه جارێکی دیکه به مه‌سه‌له‌کاندا بچینه‌وه‌و تیشك بخه‌ینه‌وه سه‌ر مه‌سه‌له‌ی گفتوگۆتان له‌گه‌ل رژێمدا:

١-درێژه‌دان به وتووێژێك له‌سه‌ر ته‌واوکردن و جێبه‌جێکردن و چاککردن و فراوانکردنی حوکمی زاتی، له‌سه‌ر رۆشنایی به‌یاننامه‌ی (١١ی ئازاری ١٩٧٠)، ده‌بێت چی بگه‌یه‌نێت؟، بۆ ئه‌وه‌نده درێژه بکێشێت؟ له‌کاتێکدا هه‌مووومان ده‌زانین ئه‌گه‌ر پیاچوونه‌وه‌ی ئه‌و به‌یاننامه‌یه بێت، ئه‌وا خۆ دامووده‌زگاکانی به‌ناو حوکمی زاتی هه‌رمارن و ته‌نها گۆرینی که‌سه‌کان و چه‌ند یاسایه‌ك نه‌بێت، لێکۆلینه‌وه‌ی ئه‌وتۆی ناوێت، خۆجاران به‌ناو شاری (سلێمانی و هه‌ولێرو ده‌هۆك) شاره‌کانی ناوچه‌ی ئه‌و حوکمی زاتییه بوون، ئه‌گه‌ر هه‌روا مابێته‌وه، ئه‌م سێ شاره گیروگرفتی نییه، جا نازانم رژێم زیره‌کانه له‌کاتی خۆیدا یاسای ده‌رکردبێت و به‌شه بێلی خستبێته ئالان و حاسلی شاره‌زوورو باخ و باخاتی هیران و نازه‌نین و سه‌یرانگای ئه‌نیشکێوه‌و له‌سه‌ر ئه‌و مه‌سه‌له‌یه کێشه سه‌ریهه‌لدابێت، ئه‌وه‌ی ئێمه لێی ئاگادارین و مه‌سه‌له‌ی لێکۆلینه‌وه‌و گیروگرفتی له‌سه‌ر بێت، ده‌بێت به‌خه‌ستیی گفتوگۆی له‌سه‌ربکه‌ین

لەگەڵ رژێمدا (کەرکوك، خانەقین، مەندەلی، شەنگار، ئاکرێ و سنووری حوکمی زاتی و مەسەلەی ئێزدییەکانە لەلایەك و مەسەلەی سوپاو دامودەزگا سەرکوتکەرەکانە، لە ناوچەی حوکمی زاتی لەلایەکی دیکەوە...)، کە بەرای من، دەبێت پێش هەموو شتێك ئەمانە بخرێتە پێش و وتووێژی لەسەر بکرێت، ئەمانەش من وای بۆ دەچم لە دوو کۆبوونەوەدا بەتەواویی نیازی رژێم لەم رووەوە دەردەکەوێت و ساغدەبێتەوە، ئیتر ئەوەندە دیزە بەدەرخۆنەی ناوێت.

٢-هەشت هەزار بارزانی بێسەرو شوێن، (١٨٢) هەزار نادیاری ئەنفال، (٥) هەزار شەهیدی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، (٥) هەزار گوندی خاپوورو وێرانکراو، تەقاندنەوەی چەندین شارۆچکەی دێرینی کوردستان. بەهەزاران شەهیدی پێشمەرگەو ریزەکانی رێکخستن، لەدوای کارەساتی (١٩٧٥)و دەستپێکردنەوەی شۆرشی نوێخوازی گەلەکەمان، کیمیابارانکردنی شێخ وەسانان، بالیسان، سەوسێنیان و بادینان... ئەمانە هەر هەمووی قوربانیی و کارەساتی دوای بەیاننامەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠)ن، ئەمانە نەك دەبێت لێی بێدەنگ بین، بەڵکو دەبێت بیکەینە وەرەقەیەکی بەهێز بۆ چەسپاندنی زۆرترین مافی رەوای گەلەکەمان، دەبێت بەپێی قورسایی ئەو کارەسات و قوربانییانە ئێمە داوای مافی رەوای گەلەکەمان بکەین.

لەکاتێکدا لەساڵی (١٩٧٠)دا حوکمی زاتی قبووڵکراوە، کوردستان تووشی کارەساتی کیمیایی و ئەنفال و خاپوورکردن نەبووبوو، بۆیە دەبێت داواکاریی ئەمرۆ لە دوێنێ زۆرتربێت، دەبێت داواکارییەکانمان بە بارتەقای ئەو قوربانییانە بێت، کە گەلەکەمان پێشکەشی کردووە، نەك رازیبوون و بێدەنگبوون بەوەی (لاپەرەی سپی هەڵبدرێتەوەو ئەوەی رۆیی، رۆی بۆ داهاتوو هەنگاو بنێین) گفتوگۆ بکەین.

٣- ناپاکیی و گلاویی نیازی رژێم لە شاری کەرکوك و ناوچەکەیدا بەئاشکرا لەژێر دەواری وتووێژدا دەردەکەوێت، دەیەوێت مەرام و مەبەستەکانی خۆی بچەسپێنێت و ئەنجامی بدات. نەدەبوو لەژێر ناوی گفتوگۆدا گوشاری دەرکردن و ئاوارەکردن و راوەدوونان بخرێتە سەر دانیشتووانی کەرکوك و دەوروبەری، بەڵکو دەبوو بەپێچەوانەوە وەزعی نائاسایی و پشێویی ئەو شارە هێمن بکرایەتەوەو خەڵکە ئاوارەو دەربەدەرەکەی و تاڵانکراوەکەی بگەرایەتەوەو زەرەرو زیانەکانیان بۆ بژاردنایە.

٤-لەکاتی راپەرینە پرشکۆکەی بەهاردا، بەهەزاران ئەفسەرو دەرەجەدارو سەربازو پیاوان و سەرانی رژێم بەدیل گیران و ئەو دیلانە زۆربەیان لە ریزەکانی سوپای گاردی کۆماریی و هێزی تایبەتی و پیاوانی جێبەجێکەری ئەنفالە بەدناوەکەی رژێم بوون، ئەوانە دەستکەوتێکی زۆرباش بوون بۆ گەلەکەمان و دەتوانرا بکرێتە وەرەقەیەکی بەکەڵك، بەڵام بەداخەوە وەکو زانیمان ئەو دیلانە بێ لێکۆڵینەوەو جیاکردنەوە، یان بەبێ ئارەق لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە ئازادکران، کە بەرای من نەدەبوو ئەو دیلانە وا بەئاسانی قووتاربکرێن، بەڵکو دەبوو بەووردیی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکرایەو لە ناوچەیەکی سەرسنوور شوێنیان بۆ دابین بکردنایە، بکرایەتە هۆیەك بۆ دۆزینەوەی قولاخی بەرزانییەکان و ئەنفالەکان، نەك ئازادبکرێن و

بەگەڕانەوەیان رژێم لەناو سوپاکەیدا ڕێکیان بخاتەوەو بیانکاتەوە بەگژ گەلەکەماندا... من وای بۆ دەچم کە بەرەی کوردستانیی و جەماوەر لەگەڵ سەرکەوتنەکانیاندا کارەساتەکانیان بیرچووەتەوە، کە نەدەبوو کورد هەرگیز لەناوبردنی بارزانییەکان و ئەنفال و هەڵەبجەی بیربچێتەوە.

٥-زیندانیی سیاسیی دیاردەیەکی بەردەوامی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمانە، ئەوەی من ئاگاداربم زیاتر لە (٤٠٠) زیندانیی سیاسیمان هەیە، لە زیندانە جۆراوجۆرەکانی رژێمدا، کە حوکمیان بەسەردا دراوە، جگە لەو زیندانییانەی کە هێشتا لەژێر ئازارو ئەشکەنجەی دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمدان، وەفدی بەرەی کوردستانیی تائێستا لەوە ناچێت داوای ئازادکردنی ئەو زیندانییانەیان کردبێت، تائێستا لیستی ناوی زیندانییەکانیشیان لا نییەو باش نازانن کە چەند زیندانیی سیاسیی هەیە. کە دەبوو هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی وتووێژەوە، وەکو وەفایەك بۆ ئەو خەڵکە سیاسییانە بەگشتیی، داوای ئازادبوونیان بکرایەو سووریش بوونایە لەسەر ئازادکردنیان بەزووترین کات، نەك وەکو زانیومانە ئەو مەسەلەیەیان هێشتووەتەوە بۆ دوائەنجامی گفتوگۆ، بەناوی ئەوەی وەفدەکە دەیانەوێت خاڵی جەوهەری بنچینەیی داوابکەن و خۆیان بە شتی لاوەکییەوە خەریك نەکەن! تەنانەت هەندێك لایەنی بەرە رایان وایە وابووە، کە کورد زیندانیی سیاسیی نییە، هەر بۆیە کاتێك رژێم لێبووردنی گشتیی بەناوی زیندانییە سیاسییەکان دەرکرد، هیچ حسابێکی بۆ رای وەفدی بەرەی کوردستانیی نەکردو کاتێك کەوتە جێبەجێکردنی ئەو لێبووردنە، بەئارەزووی خۆی کەوتە پۆل پۆلکردنی زیندانییەکان و ئەوانەی پەیوەندییان بە مەسەلەی سیاسییەوە نەبوو، ئازادیکردن و سیاسییەکانیش لەجێگای خۆیاندا مانەوەو وەفدی بەرەش گوێی خۆی لێ خەواندو بەکەم و زۆر ورتەیان لەسەر نەکرد، لە ئەنجامی گوشاری کەسوکاری هەندێك لەو زیندانییانە، وەفدی بەرە داوای ئازادکردنی چەند زیندانییەکیان کرد لە (١٩٩١/٨/١٤)، زیندانییەکان و کەسوکاری زیندانییەکان بەو هەواڵە دڵخۆش کران، جگە لەچەند زیندانییەکی ئافرەت کەسی دیکەیان ئازاد نەکردو لە بەڵێنەکەیان پاشگەزبوونەوە.

٦-من بەلامەوە سەیربوو، هەڤاڵانی سەرکردایەتی ئێمە بگەنە ئەو قەناعەتەی کە سەدام گۆڕاوەو رژێمەکەی گەیشتووەتە ئەو راستییەی کە دان بەمافی گەلی کوردا بنێت، دەیانەوێت رابردووی رەشی فاشێتیی خۆیان سپی بکەنەوە. ئەم قەناعەتە بگاتە پلەیەك کە لەگەڵ سەرانی رژێمدا بە مەبەستی هەواڵزانین سەردانی زیندانییە سیاسییەکان بکەن و بەپێش چاویانەوە دیارییان بۆ بنێرن، بێ ئەوەی بیر لە پاشەڕۆژ بکرێتەوە، کە ئەگەر گفتوگۆ تێکچوو، چارەنووسی ئەو زیندانییانە چۆن دەبێت؟

٧-لەژێر باڵی وتووێژدا رژێم بەردەوام خەریکی نەخشەو پیلانی گڵاوی سیاسیی، ئەمنیی و سەربازییە لە کوردستاندا، ئەمەش ناپاکیی رژێم دەسەلمێنێت.

٨-رژێم لەبەرئەوەی راستگۆ نییە لە مەسەلەی گفتوگۆکەیدا، تائێستا بەرەسمیی لە

ڕۆژنامەکانیدا بەناوی سەرانی ڕژێمەوە هیچ دەربارەی گفتوگۆ ڕاناگەیەنێت، بەڵکو زۆلانە ڕاگەیاندنەکانی وەفدی بەرە دەربارەی گفتوگۆ لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا دەقۆزنەوەو بلاوی دەکەنەوە، وەکو خۆیان نوێنەریان دەستنیشان نەکردبێت بۆ وتوویژ، کە بەڕای من نەدەبوو وەفدی بەرەی کوردستانیی بەکەم و زۆر دەربارەی وتوویژ هیچ شتێك ڕاگەیەنن و بلاوی بکەنەوە، بەداخەوە سەرۆکی وەفدی بەرەی کوردستانیی لە گۆڤاری (ڕەنگین)دا بە دووروردرێژیی دەربارەی گفتوگۆو بەرەوپێشچوونی و نزیکبوونەوەی بلاوکردنەوەی لە ڕۆژانی سبەی، یان چەند ڕۆژێکی دیکەدا بلاودەکەنەوە. من دەپرسم گۆڤاری ڕەنگین چییە؟ چ ڕۆلێکی سیاسیی هەیە لە مەیدانی سیاسیی عیراقدا؟ تا لەسەر لاپەڕەکانی مەسەلەی کورد بلاوبکرێتەوە. ڕۆژنامەی (بابل)و (ثورة) بەڕای عیراقی و جیهانی بفرۆشن، یان خەڵکانی دوور لەباری وتوویژ بەناوی وەفدەوە سەرکەوتن و کاتی بلاوکردنەوە بە نیزگەو ڕۆژنامە جیهانییەکان ڕابگەیەنن، بەڕای من ئەمە لایەنێکی خراپەو نەدەبوو هەرگیز بەوشێوەیە بوایە.

٩- دیموکراتییەت و مەسەلەی دیموکراتییەت، بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆندا دەیخوێنینەوەو بەرگوێمان دەکەوێت، ڕژێم ڕازی نییە کە بەهیچ جۆرێك باسی ئەو مەسەلەیە بکرێت، چونکە عیراق و ڕژێمی عیراق خۆی ڕژێمێکی پەرلەمانیی و دیموکراتییەو باسکردنی ئەو مەسەلەیە لەنگییە بۆ ڕژێمی سەدام.

١٠-ئەوە بوو پێش شەڕی کوەیت، ڕژێمی سەدام بەناو دەستووری هەمیشەیی بۆ عیراق داناو، بلاویکردەوە، دیارە ئەو دەستوورە کەلێنی زۆرو شتی نابەجێی ئێجگار زۆری تێدایە، لەکاتێکدا وەفدی بەرەی کوردستانیی وتوویژ لەگەڵ ڕژێمدا دەکات، پێویستە داوای گۆڕانکاریی لەو دەستوورەدا بکەن، چونکە زیندانیی وای تێدایە، بۆ گەلی کورد زیانبەخشە، بەلام بەداخەوە وا ڕژێم زیرەکانە ئەو دەستوورەی سەپاندو وەفدی بەرەش هیچی پێ نەکرا.

١١- ڕژێم لەسەرگەرمی یاسای پارتەکان (قانون الاحزاب) یاسایەکی لەو بابەتەی بلاوکردەوە، کە دیارە هەرهەموو باش دەیزانین کە ئەو یاسایە، یاسایەکی زۆر نادروست و زیانبەخشە، جگەلەوەی کە بۆ عیراق ناشێت بۆ کوردستان زۆر بێکەڵك و نابەجێیە، تەنانەت لایەنەکانی نێو بەرەی کوردستانیش ناتوانن لەژێر ئەو یاسایەدا کاری حزبیی خۆیان ئەنجام بدەن، کە دەبوو وەفدی بەرەی کوردستانیی زۆر بەتووندیی ڕێگای لە بلاوکردنەوەی ئەو یاسایە بگرتایەو بەپێی بەرژەوەندیی ئێمە نەبوایە، بلاونەکرایەتەوە.

١٢- لەبەرئەوەی جەماوەر هەست بەهیچ گۆڕانکارییەك ناکات، لە سیاسەتی ڕژێمدا بەدەستپێکردنی گفتوگۆو نارەزایی و پەلاماردانی دامودەزگاکانی ڕژێم، لە ئەنجامی ڕەفتارەکانی ڕژێم لەژێر باڵی وتوویژدا دەستی پێکردووەتەوە، بەداخەوە وەزعەکە گەیشتووەتە ڕادەیەك هێزەکانی (پ.م)و جەماوەر. بەیەکدا هەڵدەپژێن و بۆ بەرژەوەندیی ڕژێم، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خەریکە هێزی پێشمەرگە دەکرێتە هێزێکی تایبەتی بۆ پاراستنی ڕژێمی سەدام.

که ئەم دیاردەیە بەرای من دابرینی جەماوەرە لە شۆرش و هیزی پیشمەرگە.

لە کۆتاییدا حەزدەکەم رووبکەمە بەریزتان و پیتان بلیم دوای (١٥) سال تیپەربوون بەسەر حوکمی زاتیدا. چۆن دروشمی لایەنەکانی ناوبەرەی کوردستانیی لە دروشمی حوکمی زاتی نەگۆراون؟ لەکاتیکدا هەروەکو من ئاگادارم (ی.ن.ك) هەر لەسەرتای دەستپیکردنەوەی شۆرشە نویخوازەکەیەوە، دروشمی (مافی چارەی خۆنووسین)ی بەرزکردووەتەوەو چەندین قوربانیی لەپیناودا داوەو چەند لایەنیکی دیکەی ناو بەرە، وەکو (پاسۆك) لە زۆر دەمیکەوە نەك مافی چارەنووس بەهەندیٔ چارەسەری کاتیی رازی نین، بەلکو داوای سەربەخۆیی دەکەن و لایەنی (حسك)یش مافی چارەنووس بەداوای گەلەکەیان دەزانن و حزبی (شیوعی)ش لەبەرنامەی خۆیانداو بەپیی (م.ل) مافی چارەنووس بۆگەلان بە مافی رەوا زانراوە... لایەنی (پ.د.ك) وەکو کاك (حەبیب) لە (١٩٧٤)دا وتی: دروشمیان دەبیت لە حوکمی زاتیبیەوە بۆ (فیدرالی) بەلای کەمەوە گۆرابیت ئیتر نازانم چۆن هەموو لایەنەکانی ناو بەرەی کوردستانیی تازە، تازە چنگ لەسەرشان کەوتوونەتە دوای حوکمە زاتیبیە شەق و شرەکەی رژیمی بەغدار سەدامی دیکتاتۆر.

١٩٩١/٩/١

زیندانی ئەبوغریب

تیبینی:

- لەگەل نووسین و رەوانەکردنی ئەم نامەیەی مندا، هاورییان (مامۆستا ئەحمەد سالح، کاك حەمە تاهیری شیخ مەحمود، مامۆستا شیخ عەزیز محەمەد)یش سەرو نامەی لەمجۆرەیان بۆ سەرکردایەتی نووسی و رەوانەیان کرد.

- ئەم نامەیە لە سالی (١٩٩٢)دا دامە (مامۆستا کەریم شیخانی)، بۆئەوەی لە کوردستانی نوی-دا بلاوبکریتەوە. بلاونەکرایەوە. ئەو نووسخانەی لای خۆم بوون لە ٣١/ئابی/١٩٩٦-دا لەگەل کۆمەلیك نامەو نووسینی دیکەمدا لەناوچوون. خۆشبەختانە ئەم نووسینەم لای (مامۆستا کەریم) بوو. زۆر سوپاسی دەکەم کە بۆی گەراندمەوە.

* ئەم نامەیە لە گۆڤاری (رۆشنایی) ژمارە (٣)ی سالی یەکەم، ١/ئازاری/٢٠٠٥، لقی سلیمانی کۆمەلەی زیندانییە سیاسییەکانی کوردستاندا بلاوکراوەتەوە.

## (نامە)

زیندانی ئەبوغرێب

برازای شیرینم کاکە عەزەگیان رۆژباش

چاوەکەم... نامە خۆش و بەتامەکەتم پێگەیشت، کاتێکی خۆشم لەگەڵدا بردە سەر، زۆر پێی گەشامەوە. عەزەگیان. تێر تێر چاوەکانت و ئەملاولات ماچ دەکەم، هیوادارم گەنجێکی پێگەیشتووی سەردەمی خۆت بیت، هیوام بەهەمووتان هەیە، کە کوڕی ئێستاو پاشەڕۆژ بن.

ئازیزەکەم... پۆزشت هێناوەتەوە، کە نەتتوانیوە جارێکی تر سەرم لێ بدەیتەوە، ئێوە جێگای گلەیی نین، چونکە خۆم دەزانم (تۆو بەخشی و کاکە رەئووف و ئەوانی تر) وەزعتان چۆنە، گرنگ ئەوەیە ئێوە تووشی گیروگرفت نەبن و منیش لێرەوە تووشی خەم و پەژارەی تر نەکەن.

منیش لێرەوە خەمی ئێوەمەو هەمیشە لە پەژارەتاندام، دڵ لەدڵ مەدەن، من بە زەبری زەمانەو شەقی یەك لەدوای یەکی، بەمزووانە بەدیدارتان شاد دەبمەوەو دەستی مامێتیتان دەکەمەوە مل و هەموو رۆژگاری داهاتوو بەیەکەوە دەبەینە سەر...

ئاواتی من ئەوەیە، کە ئێستا ئێوە لەگەڵ (بەخشی و رەئووف)دا رۆژەکانتان بەشادیی بەرنەسەرو دوور لە گیروگرفت... دەستەکانی باوکت و دایکت ماچ دەکەم، لەکۆتاییدا هەر شادو سەرکەوتوو بن.

مامت

٢٤/پوشپەڕ/٢٦٩١

١٦/تەمووز/١٩٩١

تێبینی:

- عەزە: (عیززەدینی شێخ لەتیفی) برازامە، کە لەئێستادا زاوامەو لە ئەڵمانیا دەژی.

- ئەم نامەیە لە وەڵامی نامەیەکیدایە، کە بۆی نووسیبووم. بەداخەوە نامەکەیم لانەماوە.

- نامەکە لای (عەزیز) خۆی پارێزرابوو.

-٤-

## رەو و... ئەندێشەی باوك

١٩٩١/٤/١٢

زیندانی ئەبوغرێب

ڕۆڵەکانم
ئێستا لەکوێن...؟
ماون، مردوون لە هەرکوێ هەن...
بیرتان ئەکەم لە گەڵتانام
خولیاتانم لە رەوتانام
کۆرپەکانم...
هەرچەند هەڵئەسم و دائەنیشم
هەرچەند ئەخەوم و رائەکشێم
لە تەکتانام
هەنگاو هەنگاو لە دووتانم
بەچاو بەدڵ
بن بەرد، بن بەرد
کوردستانتان بۆ ئەگەڕێم
بەدواتانا دەشت و دۆڵ و
چیاکانتان بۆ پەی ئەکەم
گردو ملەو یالەکانتان
بۆ تەی ئەکەم...

❊❊❊

ڕۆڵەکانم...
بیرتان ئەکەم... بیرتان ئەکەم

به دووربینی چاوی دنیا
سەیرتان ئەکەم
بەدرێژایی ڕێگای بەغا
بانگتان ئەکەم
بەدواتانا ورد ئەگەڕێم
هەنگاو هەنگاو لەگەڵتانا
هەنگاو ئەنێم...

هەر دۆڵ و شیوێ ڕۆژێ لێی بووم
هەر لوتکەی چیایە بەتیژایی چاو
کێڵاومە
هەر دارستانێ ساتێ تێی چووم
چڵی دارم لێبڕیوە
یا لەبن سێبەریا حەواومەوە
هەر ئەشکەوتێ چوومە ناوی
خەمی ڕۆژانەم تیا حەشارداوە
یان کارو بەرغەلم تیا مۆڵداوە
یاسوێسکەو کەوم تیا گرتووە
ئێوەی تیا ئەبینم
هەڵئەگەڕێن و دائەگەڕێن
ورد ورد ئەڕۆن
دائەنیشن و گردئەبنەوە
چەند ئەگەڕێم وردئەبمەوە
ناتان بینم
ئێوە لەکوێن چیتان لێهات؟
دەنگتان نییە هیچ نابیستم
ڕەنگتان نییەو هیچ نابینم
ئێوە لەکوێن؟
ئێوە لەکوێن؟

* * *

ڕۆڵەکانم
باش ئەزانم شار بەدەرن

کۆڵ بەکۆڵ ترس لەسەرن
لەترسی مەرگ رێگای شاختان
گرتووە
لەترسی مەرگ خۆشی شارتان
وێڵ کردووە
باش ئەزانم چاک ئەترسن
لە گەڵتانام کە بترسن
چونکە زەبری داگیرکەرتان
چاک ناسیوە
رەفتاری رەشەکوژیی
باش لە دڵتانا چەقیوە
بۆتان هەیە کە بپرسن
لە دڵتانام کە ئەپرسن
بۆکوێ راکەین...؟
بۆچی راکەین؟
شاروماڵمان بۆچی جێبێڵین؟
بۆکوێ برۆین بۆ کوێ بچین؟
ئەی باوکمان چۆن جێبێڵین؟
هاوار ئەکەن
بەقورگی پر لەگریانەوە
ئەی باوکمان چۆن جێبێڵین؟
***
رۆڵەکانم...
لەدڵتانام کە قولپ ئەدەن
هەنسک ئەدەن
فرمێسکی چاوتان ئەخۆنەوە
لە تاوانا لێوتان ئەخۆن و ئەکرۆژن
خەمی من و شار هەڵئەمژن
وا هەست ئەکەن کە جارێتر
منی باوکتان بە هیچ جۆرێ
نابیننەوە...
تەکان ئەدەن بەرەو چیا

قاچتان ئەروا دڵتانناروا
ڕێگا ئەبڕن، بەڵام چاوتان
هەر لەشارە
خەمی قووڵتان لای باوکی پڕ ئازارە
هەنگاوەکانتان یەک یەک
ئەینێن...
گشتی وێنەی منی تیا ئەبینن...
بەکوڵ ئەگرین و ئەڵێن
جارێکی تر هەرگیز هەرگیز
من نابینن...
❊❊❊
ڕۆڵەکانم...
کورپەکانم ئەمە کاروانی خەباتە
ڕێگا دوورە، بەڵام لوتکەی ئاسۆ
زەردەخەنەی ڕێی نەجاتە
خەفەت مەخۆن ڕەوکردنتان
تەواو کەری ڕێی خەباتە
خواستی ئێوەو باوکتانە
ئەم کاروانە کاروانێکی مەرگەساتە
❊❊❊
ڕۆڵەکانم...
چاوم لێیە دایکتان ئەگری
لاشەی ئەرواو دڵی ناروا
تەکان ئەدا هاوار ئەکا
ڕۆڵەکانم، ئەی خەڵکینە بۆ کوێ بڕۆم؟
من چۆن بڕۆم؟
دە من ناڕۆم
هەرچەند ئەکەم پێم ڕێ داناگرێ
ئەم ڕێگایە بێ باوکی منداڵەکانم
بۆ نابردرێ.
هاوار ئەکا ئەی خەڵکینە
باوکی منداڵەکانم چەندێ ونبوو

چەندێ دووربوو.
ئەوەندەیتر دوورکەوتەوە
چەندی تر لێم ونبۆوە
من چۆن برۆم، بۆکوێ برۆم؟
ئەگەر برۆم جارێکی تر
نایبینمەوە
من چۆن برۆم، ئەی جاری تر
نایبینمەوە؟
هاوار ئەکا ئەی خەڵکینە وا بەندی
دڵم پچرا...
هاوار ئەکاو بە هەردوو دەست
بەخۆیا ئەدا
toوخوا خوایە
ئەم یاسایە لای گەورەییت هەر یاسایە؟
گەر یاسایە
تووخوا خوایە
ئەم یاسایە کەی ڕەوایە...؟ چۆن ڕەوایە؟
وا سێ ساڵە کۆڵ بەکۆڵین
ماڵوێران و بێ ڕێ و شوێنین
بەخوا خوایە
ئەم یاسایە ناڕەوایە.
ناڕەوایە...
***
ڕۆڵەکانم...
چاوم لێیە دایکتان بەکوڵ ئەگری
بە چاوی پڕ لە گریانەوە سەیری
یەک یەکتان ئەکا...
سەر هەڵئەبڕێ و بانگتان ئەکا
ڕۆڵەکانم پێ هەڵگرن
پەلە بکەن پێ هەڵگرن
با تۆپەکانمان پێ نەگا
دەخیلتان بم ئاگادار بن

لاریٚ مەکەن
نەکو مینتان پیا بتەقیٚ
چونکە ئەم شاخانە گشتی مینە
سەر هەڵئەبریٚ و بانگیٚ ئەدا
خوایە چی بکەم؟
ئەوا بەندی دڵم تەقی
تازە من و (باوکی بەخشی)
چاومان بەچاوی یەک ناکەوێتەوە
دیارەو ئاخری یەک بووین
ئەم ڕێگایەش دوورو سەختەو
نابڕێتەوە...
❊❊❊
ڕۆڵەکانم
چاوم لێیە (بەهار) بەدوای دایکتا ئەگری
فرمێسکی گەورەی چاوی ئەکەونە
سەر کولمەکانی
زوو زوو بەدەست ئەیانسڕیٚ
جار ناجاریٚ بەهەنسکی گریانەوە
هاوار لە دایکی ئەکا
ئەڵی دایە تووخوا بەسە
ئیتر مەگری.
خوا گەورەیەو بەشکم گویٚ بۆ نزاکانمان بگریٚ
ئیتر مەگری ئیتر مەگری
❊❊❊
ڕۆڵەکانم چاوم لێیە
(شێنیٚ) بەسەر شانی (ئازاد)ەوە
گوێی لە (دایکی)و (بەهار)ە
بۆیە خۆی خوار ئەکاتەوە
بانگیان ئەکا
دایە... دایە... بەهار بۆچی ئەگری
وەرنە ڕێوە پیٚ هەڵگرن
ئەگەر بگرین منیش ئەگریم

دەپێم بڵێن بۆچی ئەگرین؟
دەست ئەدا بەسەر شانی
کاک ئازادیا
دەبوەستە با ئەوان بێن
تابزانین بۆچی ئەگرین؟
ئازاد ئەڵی: دادە شێنێ
ڕێمان دوورەو وا هەورەکە
ئەگرمێنێ
دایکم قورسەو لەگیانی خۆی بێزارە
لەتاو ئازاری لەشی
ماندوو و شەکەتی هەورازە
هیچیان نییە
هەر لەم شاخە سەرکەوتین
لەودیوی شاخ ترسمان نییە
دائەنیشین هەتاکو دێن
شێنی بەدەنگی بەرز بانگی
دایکی ئەکا
دایە... دایە... پەلەمەکە
گەرماندووبووی، دەدانیشە
بۆچی ئەگری؟
من و ئازاد وا لەسەرتان رائەوەستین
ئیتر مەگری. ئەگەر بگری منیش ئەگریم
❊❊❊
رۆڵەکانم چاوم لێیە
(شەنگە) بە باوەشی بەهارەوە
ئەم شانەو شانی پێ ئەکا
ئەقیژێنی هاوار بۆلای دایکی ئەکا
بەهار چەندێ ماندوو و پەستە
ئەوەندەیتر ماندووی ئەکا
بۆیە بەهار لەداخانا
چرنووک لە شەنگە ئەگرێ و
ئازاری ئەدا

دایکی بە هەنسکەوە بانگی
بەهار ئەکا.
کچم کچم مەیگریەنە
گریانی ئەو من ئەگریەنێ
هێشتا شەنگە باوکتی نەناسیوە
لەو کاتەوە ئەم بووە ئێمە
خێرمان لە خۆمان نەدیوە
تووخوا رۆڵە مەیگریەنە
زۆر شەوی خەفەتاویم پێ
بەسەربردووە
هاودەنگم بووە خەمی باوکتی
کەمکردوومەوە
مەیگریەنە مەیگریەنە

❊❊❊

رۆڵەکانم چاوم لێیە
(بلێسە) تەکان ئەداو ماندوو بووەو
سوور هەڵگەڕاوە
ئارەق لەبەرێ پێی ئەچۆڕێ
بە هەورازا هەڵئەگەڕێ
بەحاڵ ئەڕوا...
کە ئەگاتە سەر یاڵەکان
دائەنیشێ و سەیری خوارەوە ئەکا
بانگتان ئەکا پێ هەڵگرن پێ هەڵگرن...
بێنە رێوە
من والێرەم چاوتان لێمە...؟
بۆچی نارۆن دەی ئازاکەن
وەک من راکەن.

❊❊❊

رۆڵەکانم چاوم لێیە
کاکە (ژیرە) هەردوو دەستی گیراوە
کەلوپەلی هەڵگرتووە
زۆر شەکەتەو رەش هەڵگەڕاوە

کەمێ ئەڕواو چیچکەیەکی
بۆ ئەکا
زۆر بەوردیی بەدرێژایی
ڕێگادا ئەڕوانێ.
لەناخەوە هەناسەیەکی سارد
هەڵئەکێشێ.
دیارە بەچاو و دڵ بۆ من ئەگەڕێ
کە سەیر ئەکا بەدرێژایی کارواڵن
من نابینێ
هەڵئەسێت و ڕوو لە کاروان
وەرئەگێڕێ.
ئەکەوێتەوە ڕێ و بەدەم ڕێوە
قوڵپ ئەدا
ئەڵێ تازە من و باوکم یەک نابینینەوە
لە داخانا پشت هەڵئەکا
بەقینەوە تف لە ڕۆژگاری
ناهەمواری خۆی ئەکا...
ملی ڕێگا ئەگرێتەوە
لەگەڵ کاروانی سەرەو خێردا
بەهەنگاوی وردی
ڕێگای دەشت و دۆڵ و چیا
ئەبڕێتەوە...
لەدڵی خۆیا سێ و دوو ئەکا و ئەڵێ
سەرهەڵگرتنی ئەم گشت خەڵکە
بەرەو چیا
لە کاروانێکی وا دوورو درێژو بەریندا
هەرگیز بە هیچ هێزێ دانامرکێ
دانامرکێ
***
ڕۆڵەکانم چاوم لێیە
کاکتان (بەخشی) زیاد لە گشتان
کەلوپەلی بەشاندا داوە

لە پێشتانەوە تەکان ئەداو
خەمی گەورەی لەکۆڵناوە
لەهەر وەستانێکیا بانگتان ئەکا
پێ هەڵگرن وەرنە رێوە
ئاگاداربن یەک جێمەهێڵن
سەیرە بەدرێژایی رێگادا ئەروانێ
ورد ورد چاو ورد ئەکاتەوە
بۆمن سەرو بنی کاروان ئەکا
من نابینێ... لەناخییەوە
هەناسەیەکی قووڵی سارد هەڵئەکێشێ
خەفەتی من دەروونی زامداری ئەخواتەوە...
بەڵام! دیارە پیاوە
دان بەخۆیا ئەگری
خەمی دەروونی ناخاتە سەر رووی...
بە فرمێسک داخەکانی هەڵنارێژێ.
بروای وایە ئەم کاروانە
پاڵ و بەرینەی
سەری بەرەو چیا هەڵگرتووە
درێژەی کاروانی زیندان و ئەشکەنجەیە
تەواوکەری هەزاران هەزاری
بێ قوڵاغی ئەنفالی
ساڵانی رابردووی ئەم خەڵکەیە...
سەرەنجامی گیانبەخشینی
هەزاران کوری داخ لە دڵی جەربەزەیە.
بروای وایە ئەم رەوەیان
هەمووی تەواوکەری رێگای سەرکەوتنی
ئەم خەلکەیە.
بۆیە هەمووجارێ بەدەنگی بەرز
هاوار ئەکا بانگتان ئەکا
پێ هەڵگرن، پێ هەڵگرن وەرنە رێوە
رێگای دوورمان بریوە
بۆ جێی مەبەست رێگای زۆرمان بریوە

تەنها ئەم چیایەمان بڕی
ئەودیو چیا جێی ترس نییە
دائەنیشین ئەحەوێینەوە
ماندوو بوونتان لەبیر ئەچێتەوە.
٭٭٭
ڕوڵەکانم چاوم لێیە...
لەم ڕەوەتانا هەر ئێوە نین
بەهەزاران هەزار خەڵکی دێو شار
ملی ڕێگای هات و نەهاتی گرتووە
چارەنووسی کەس دیار نییە
بۆ مردنە یان ڕزگاربوونی یەکجارییە.
٭٭٭
ڕۆڵەکانم چاوم لێیە
لەم ڕەوەتانا پوورتان (لەعلی)
بەخۆی و پێنج منداڵەوە
لەگەڵتانا فرمێسکی خەست هەڵئەڕێژی
بۆ باوکی منداڵی و کاکی بەندکراوی
ڕەشاوی ئاخوداخ هەڵئەمژێ
جار ناجارێ ئەڵا (دلێر) کاکە زووکە
با لەیەک نەبڕێین
ڕێمان دوورەو گەر مردنیش بێت
باپێکەوە بمرین.
ڕۆڵەکانم چاوم لێیە
مامتان (موحی) دواکەسی کاروانتانە
وەکو شوان بەریداون
خەمی لای یەکەیەکەی هەمووتانە
خەمی ئێوەو خەمی من ڕەنگ و رووی
تاریک کردووە
ئاگای لە ڕۆیشتنی چیا نییە داخی
ئێمە دەستی گرتووە.
(تۆڵە)ی بەسەرشانەوەیە
پوورتانی وا لەپێشەوە

کۆرپەکانی (حەمە)و (ئاوارە)و
(شەپۆل)
هەریەکەیان بەشی خۆیان کەلو
پەلیان هەڵگرتووە
(ئەرخەوان)یش خشپە خشپ
ملی ڕێی شاخی گرتووە
❊ ❊ ❊
ڕۆڵەکانم چاوم لێیە...
جارناجارێ تاوێ باران ئەتانشۆرێ
جلوبەرگتان گشت تەڕ بووە
کەلوپەل و خواردنتان لەکیس چووە
هەر ئەڕۆن ڕێ تەواو نابێ
شوێنێ نییە دەستنیشان بێ
تا بۆی بچن
چونکە تەنها شاخەکانە هەر هیچ
کەسی تێدا نییە.
بۆیە هەر ئەڕۆن و ئەڕۆن
ڕێ تەواو نابێ
خەمتان زۆرەو یەک لەدوای یەک
خەستتر ئەبێ.
❊ ❊ ❊
ڕۆڵەکانم خەفەت مەخۆن
گەر بشمرن سەربەرزییە.
سەر بەرزییە...
چونکە مردن لەپێناوی ئازادیا
سەرکەوتنە سەرکەوتنە
❊ ❊ ❊
ڕۆڵەکانم چاوم لێیە
خەڵکی بە هەزاران هەزار ئەڵێی
کوللە پەیکورەیە
هەموو چنگیان لە شاخ و دەشت و
یاڵ گیرکردووە

**لەترسی مەرگی رووبەڕوو**
**مەرگی نادیاریان هەڵبژاردووە.**

❊❊❊

**ڕۆڵەکانم...**
**کارەساتە... کارەساتە**
**گشت ژیانمان مەرگەساتە**
**سەرهەلگرن سەرهەڵگرن**
**بڕۆن ئێوەش خواتان لەگەڵ**
**بەشکم ویژدانی مرۆڤایەتی**
**ئەم دنیایە دەرچی لە کەل**
**وا ئەمجارە هەموو دەستتان**
**لە ژیانتان بەرداوە**
**ژن و منداڵ پیرو گەنج**
**مەرگی سەربەرزیتان لە مشت ناوە**
**چەندێ خۆشە وا بەکۆمەڵ**
**گەر بشمرن.**
**ئەم بریارەتان گشت بڕیارێکی**
**دوژمن هەڵئەبڕێ...**

❊❊❊

**ڕۆڵەکانم... ڕۆڵەکانم**
**خواتان لەگەل**
**لەگەڵتانام... لە رەوتانام...**
**بیرتان ئەکەم... خولیاتانم...**
**ڕۆڵەکانم... ڕۆڵەکانم...**

ئەم شیعرە لە (زیندانی ئەبوغرێب) بە بۆنەی (کۆڕەوی) بەهاری ساڵی ١٩٩١و لە ١٩٩١/٤/١٢ نووسراوە. لەبەرئەوەی خێزان و منداڵەکانم ماوەیەکی زۆر بوو سەرو سۆراخیان نەبوو، لێیان بێئاگابووم و لەو کۆڕەوەدا ئەوانیش لە سلێمانییەوە گەیشتبوونە (شاری بیجاڕ) ئێران.

## (کشانی پێنج ئەستێرەو پیاچوونەوەی ژانەکانم)

(ئەم پانۆرامایە لە ٢٠/ ١٩٩١/٩ لە بەندیخانەی «ئەبوغریب» دانراوە) بەبۆنەی لەسێدارەدانی پێنج هاورێمانەوە.

نیوەرۆیە
لەژێر زەمینی دادگادا...
چاوەڕوانی دادگا دەکەین.
هەر هەموو (سیی) کەسین...
بەناو یەکدا وەکو هەنگ...
پوورە ئەدەین تۆپەڵ ئەبین...
جێ جێ ئەکەین... دێن و دەچین...
بۆ یەک ئەدوێین نەخشە بۆ ناو ژووری
دادگا دائەنێین...

❊❊❊

کاتژمێر کەوتە پەلە...
پەلە... پەلەی ئەکرد.
چرکەی کاتژمێر سێی نیشاندا...
جەندرمەکەی ژووری دادگا
دەرگای رووی ئێمەی کردەوە
لەسەر بەرزایی قادرمەکان
رەپ راوەستا...
بەدەنگی بەرز تێخووڕین...
وتی وسبن... بێدەنگ بن...
ریزبن... گشت گوێ بگرن...
یەکەم پۆستی ناوی خوێندەوە
پێنج کەس بوو
(باوەرو گمۆو زانا...
شەماڵ و پۆلا)بوو...
بانگیکردن... جیایکردنەوە
سەریخستن ریزیکردن

لەچاو تروکانێکا
بۆ ژووری دادگا
ونی کردن...
❊❊❊
کاتێ ئەو پێنج ئەستێرە گەشە
ئەو پێنج هاورێ دڵگەشە
وەک برووسکە
بەپێش چاومانا کشان...
لە دەرگای دادگا ئاوابوون و نەگەڕانەوە..
دڵم سست بوو...
هاورێکانم گشت لێ ونبوو...
ئەو ژێر زەمینەم لێ گۆڕا...
ئەبڵەق بووم
بەچوار دەوری خۆم و ژێر زەمینا
چاومەگێرا...
خۆم... خۆم... نەئەبینی
کەسی تریشم نەئەبینی
پۆستەی یەکەم وای لێکردین...
جەرگی برین
پێنج گەلاوێژی گەش و پڕشنگداری
لێدابرین...
پێنج هاورێ... پێنج برای
بەبڕیاری لێسەربڕین...
❊❊❊
دادگا... دادگای چی؟!
هەرناو... ناوی دادگا بوو!
ئەگینا... نەداد هەبوو!
نەدادگەر دادی لابوو!
دادو دادگا هەر هەموویان
بەرامبەرمان ناڕەوا بوو
لەو رۆژەوە...
شانزەی دەبوو

ئەوان لەئێمەو ئێمە لەوان
بێئاگابووین...
شەو و رۆژ گوێمان هەڵئەخست
ها ئێستا نا تۆزێکی تر
ئەو پێنج هاوڕێیە دەرئەکەون
پەیدا ئەبن...
بەڵام یازوخ چاوەڕوانی
کەڵکی نەبوو...
شەونخوونی... بیرکردنەوە
سوودی نەبوو...
رۆیین و لێمان ونبوون
زوو ئاوابوون...
(پێنج کۆی) سەر پیرەمەگروون بوون
پێنج رۆڵە... پێنج جەربەزەی سەنگەری
سەرەرێ بوون...
پێنج رۆشنایی پێنج برووسکەی رێگای
دووربوون...
پێنج هاوڕێی رێگای سووربوون...
❊❊❊
هاوڕێکانم...
ئێوە رۆیین لە دەستمان چوون
دڵنیابن... لێتان روون بێ
ئێمە هەموو دەمێ خولیاتانین
شەو و رۆژمان خولیایی ئێوەیە
نانخواردن و جوولەمان
قسەو هەڵوێست و بۆچوونمان
گشتی شێوەو هەڵوێستی ئێوەیە
وتەکانتان ئەخوێنەوە...
×××
کاتێ (باوەر) لە هۆڵی چوار
تێکەڵاومان بوو
چەندێ خۆشبوو

زۆر بێخەم بوو
کە گەشبین بوو
(باوەڕ) باوەڕی وابوو
ئەم جیهانە زووە ئەگۆڕێ
ئەم ڕژێمە بەناچاریی
خۆی ئەگۆڕێ
گەر نەگۆڕێ ڕێک ئەدۆڕێ
کاتێ (گمۆ)
دوای سالی لەیەکبران
لە هۆلی پێنج یەکمان بینی
باوەشمان بەیەکدا کرد.
ئەو من و من ئەوم ماچە ئەکرد...
هەرچەندمان کرد
تاسەمان لە یەک بشکێ
تاسەمان نەئەشکا
لە ترسی جەندرمە بێشەرمەکان
یەکمان بەردا...
چاک لەیادمە (گمۆ)
هەموو جارێ لە هۆلی یەک
ئەی وت براکانم...
ئەگەر بەربووین و چووینەدەر
دەخیلتان بم نەکەن
نەکەن باسی ئەشکەنجەی دەزگاکانی ڕژێم
بۆ منداڵانی شار باس بکەن
چوون ئەپرسن... با نەترسن
چونکە هەرچی جۆری سزاو
ئازاریان هەیە
ناتوانی هەرگیز ناتوانی
دەماری خوێنی باوەڕێ ببرێ.
هەرچی دەزگای گوشاریان هەیە
لەسەر دلمان کۆیکەنەوە.
ناتوانی نا... ناتوانی...

یەخەی کچێکی کوردی خاوەن باوەڕ
بکاتەوە...

❊❊❊

براکانم... زۆر جۆری سزام بینی
ئەشکەنجەی زۆر زۆریان دام
زۆر هەوڵیان دا زۆر ڕەنجیان دا
نەیانتوانی وشەی خۆری هیوا
لەمن بدزن...
دەخیلتان بم منداڵەکان مەترسێنن
وایان لێکەن وایان فێرکەن...
با گشت کاتێ ئەوان دەزگاکانی
ڕژێم بترسێنن... تا بیڕووخێنن

❊❊❊

شەو بوو دوای هەڵواسین
دوای ئەشکەنجەو داپڵۆسین
بەپاڵ بەلێدان لوولیان دام
وەک چۆلەکەیەکی لەئاونراو
کردیانم بەژوورێکا
ژوور ژوور نەبوو...
ناوی ژوور بوو...
کونەگورگێ تەنگەبەر بوو...
هەڵاوی ژوور پیاوی ئەکوشت
سەرمای زستان ژانی ئەرشت
بیست کەسی ڕەنگ زەرد
ڕەنگ هەڵوەریو
یەک ڕاکشاو یەک دانیشتوو
وەکو شێری بەتۆڕ گیراو
بەندکراو ڕەنگپەڕیو
سەیرە ئا ئەو کونە ژوورە تەنگەبەرە
ئاخنراوە...
چەند بچووکە هێندە جیهانێکی
گەورەیە...
شانۆی زەبرو زەنگە

قوتابخانەی جەربەزەیە
ئای چەندێ خۆشبوو...
ئا... ئەو خەلکە بەندکراوە
چەند ئامادە چەند لەسەرپێ
بۆ هەرکەسێ
لە ژووری ئەشکەنجەوە
بۆ ئەو ژوورە ئەخرایەرێ
ئەو کونە رەشە داخراوە
خەڵکی وریای خاوەن هەڵوێستی
تێخنراوە...
هەر هەموو قاڵ. قاڵی
ئەشکەنجەی ئەو جێ و ناوە
شادمان بووم هێشتا پێڵاوم
دانەکەنیبوو...
هەر هەموویان راستبوونەوە
باوەشی هاورێیەتیان بۆ گرتمەوە.
وەکو برا پەلاماریاندام
شانیان گرتم کەوتنە شێلانم...
یەک... دوو... سێ
بەشێنەیی لەگەڵ شێلانا
وردە وردە ئەیان پرسی
ناوت چییە؟ کەی گیراوی...؟
بۆ گیراوی؟
ئینجا وەکو مامۆستای قوتابخانە
وانەی وردیان بەگوێدا ئەدام
زۆر لەسەرخۆ قومی ئاویان پێدام
وتیان مامۆستا دلگیر مەبە
ئێرە وایە
ئەم ئەشکەنجەو سزایە
چەند رۆژێکە بەری کورتە
تەواو ئەبێ ئەبرێتەوە
وەرس ئەبن جاڕس ئەبن
لەتوانامان پەی دەس ئەبن

چی ئەکەن با بیکەن
کام سزا قورسە سزامان دەن
ناتوانن هەرگیز ناتوانن
بروای ئێمە بلەرزێنن
هێوای ئێمە بتارێنن

❊❊❊

کەسی یەکەم کە ئەیشێلام
بەچرپەوە بەگوێیدا دام
وتی من ناناسی
من تۆ ئەناسم
من (زانا)م کە خەمتان بووم
داچڵەکیم و دڵخۆش بووم
ئازارەکانم سارێژبوو...
وتم (زانا)یت... زانا ماوی؟
خەمم نەما... ژانم رەوییەوە
مادام ماوی...
کەسی دووەم... زۆر بەسووکی
بەگوێیا دام...
وتی ئێمە مەفەرزەکەی (هەورامانین)
(شەش) کەسەکەین گشتمان ماوین
کاتی بیستم چەند هاورێیەک
خەممان بوون کە نەمابن
ئێستا ماون و دیمنەوە...
لە خۆشیانا ئەشکەنجەکانم
بیرچوونەوە...
هەتا ماوم ئەو رۆژو ژوورو
هاورێیانەم بیر ناچنەوە

❊❊❊

چەند رۆژو شەو رۆیی
جۆری سزاو ئەشکەنجەیان
نەگۆری...
ئێوارە بوو... چاوەرێی شێوی شەو بووین
زرەی زنجیر ژوور بەژووری ئەکردەوە...

نزیک بۆوه
هەرهەموومان دڵمان راخست
گوێمان هەڵخست
کێیان هێنا- کێیان بوێت؟
کێ بانگ بکەن... کەلەپچەکەن؟
بۆ ژووری ئەشکەنجەی بەرن؟
دەرگای ژووریان کردینەوه
بەپاڵ بەشەق یەکێتریان
کرد بەژوورا...
چاوم پێکەوت سەرم سوورما
من سەیرمکرد... ئەو سەیری کرد
نە من قسە... نە ئەو قسە
چاوی خەممان دڵی پەستمان
بۆ یەک رووانی
تالاوی ژانمان لێ ئەچۆری
منیەناسی مِن ئەم ناسی
ئەو (شەماڵ) بوو..
چەند مانگێ بوو لێمان ونبوو
بێ سەرو شوێن و هەواڵ بوو...
روویان تێکرد لێیان پرسی
زۆری ژوورەکە ئەیان ناسی
وەڵامی نەدایەوه...
سەیریکردین...
هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا
وەک ماری پێکراو پەپکەی خواردو خۆی راکێشا
هاورێ (شەماڵ) پیاو بوو
مەردبوو...
خۆراگرو... چاونەترس
وەک پۆلا بوو...
فەرهەنگ بوو فەرهەنگێکی
زۆر گەورەبوو
شارەزابوو... باش خەملابوو...
وەک هەڵۆ بوو...

راوبۆچوونی وابوو...
ئەیوت... ئەگەر ئێمە بچینە دادگا
من و چەند کەسمان تیائەچین و
ئەبرێنەوە...
❊❊❊
کاتی دائەنیشم و بیرئەکەمەوە
ئەو هاورێیانەو بیرەوەرییانەم
بیردێنەوە
شەری شەترەنجی (شەماڵ)
گۆرانیی ژووری دووی (زانا)
پێکەنینی (سەرکەوت)و (فێ)
خەمی منی ئەکردە جێ.
ئای... چەندخۆشبوو...
بەیانییان زوو...
پێش سەرکەوتنی (جومعە و حەمە)
پێش ژەمە نیسکی یەکشەممە
(زانا) بەسروودی ئیزگەو بە
مۆسیقای رێی خەبات
بانگیەکردین هەڵیەسانین
بەیانی باشی لێ ئەکردین
بە دەس لە پەنجەرە بچووکەکەی
دەرگاکەوە سڵاوی لێ ئەکردین
ساڵ... ساڵی... نەوەد بوو
❊❊❊
مانگ...
شانزەی دە بوو...
کات... کاتژمێری پێنج زیاتر بوو
شوێن... ژێرزەمینی دادگا بوو
بریار... بریارێکی نارەوابوو.
دوای دوابریار بەدوو ماشێن
بەرەو ئەبوغریب رەتیانکردین
ئەو پێنج هاورێیە بەجیا
لە ماشێنی دووەما سەرخران

ئێمە لەوان ئەوان لەئێمە دابران
لە ئەبوغرێب زوو دابەزین
بەریز یەک بەدوای یەکدا ئەچین
لەڕارەوی زیندانا گلدرانەوە
خزێنرانە ژوورێکی کەنارەوە
یەکەیەکە بەچاو خواحافیزیمان
لێ ئەکردن...
ئەوانیش بەپێکەنینەوە
دوا سڵاویان لێ ئەکردین
ڕێکەوت وابوو...
هاورێ (ئاوات) لەناو هەمووماناا
بەختەوەری بەرو دوابوو...
ئەو چووە ژوورەوە بۆلایان
بۆ دواینجار خواحافیزی لێکردن
یەکەیەکە دەسی لەمل کردن
ماچی کردن...
ڕاسپاردەی یەکەیەکەی
وەرگرتن...

❊❊❊

(باوەڕ) پێی وت:
هاورێ خۆ دیت
چۆن سزایانداین
بێ شەرم بوون داخ لەدڵ بوون
لە سزامان بەپەلە بوون
دادگا دادگا نەبوو
دادگەر جەللادی بوو
زۆر نامەرد بوو...
(گمۆ) پێی وت:
هاورێ وا ئێمە ڕۆیین
ئێوە ئەگەر مانەوە
دوا قسەو دوا وەسیەتم
بۆتان ئەڵێمەوە
مافی هاورێ بۆ هاورێیە

مافێکی ڕەواو بەجێیە
منداڵەکانم پشتگوێ مەخەن
وەسێتێکە بۆتان ئەکەم
ئەوان کەوتنە ئەستۆی ئێوە
(هیوا)م بێ هیوا مەکەن
سەریان لێدەن خەمیان بخۆن
ئیتر ئێوە لەجێی براو کەسی منن
هاوڕێن و برای منن
مام و خاڵ و کەسی منداڵمن
جگەرگۆشەی براتانن

(شەماڵ) ڕووی تێکردو پێی وت:
هاوڕێ ئیتر وایە
ئەمە خەباتە... خەباتیش
هەڵبەت وایە...
چارەنووسی ئێمە وابوو
بەڵام خەباتمان ڕەوا بوو
گرنگ نییە... ئێمە ئەڕۆین
هەر ئێمە نەبووین و ئێمە نابین
مەرج ئەوەیە ئێوە لەم ڕێبازە
بەردەوامبن...
خەبات بکەن و کۆڵ نەدەن
خەباتی ئێمە تەواو بکەن
نەسرەوتن تا سەرکەوتن
ئێوە ئێمە باش ئەناسن
باکمان نییە لە خنکانمان...
(زانا) بەپێکەنینەوە پێی وت:
مامۆستا من سەربەرزم
زۆر بەختەوەرم
مادام لەڕێی گەل و کوردستانا
وا بەشانازییەوە ئەمرم
شادمانم کە ئێوە لەم بڕیارە
نارەوایە دەربازبوون:

قوربانتانبم لەسەر خەبات
بەردەوامبن...
هەردەم سووربن
قەت کۆڵ نەدەن
❊❊❊
(پۆلا) وتی:
کاکە زۆر چاو روونم
دوارۆژ گەش ئەبینم
هیچم نییە پێتان بڵێم
ئەوەی هەمە منداڵەکانمە
با لەئامۆژگاریتان بێبەش نەبن...
تکام وایە بێکەس نەبن
کەمدەس نەبن
❊❊❊
لەدوا وشەی لێکبرانا
هەر هەموو وتیان
ئێمە ئەرۆین
ماڵ ئاوایی لە سەرجەمی
هاورێیانمان ئەکەین.
ئەمەی ئێمە ئەنجامی خەباتمانە
تیکۆشانیش بۆ سەربەستی ژیانە
قوربانیش لەپێناوی گەل و نیشتمانا
سەربەزییەو یاسای ژیانە
❊❊❊

رۆژ هات و رۆیی...
ئەو پێنج ئەستێرەیە دەنگیان نەبوو
رەنگیان نەبوو.
بەکەم بە زۆر شوێنەوارو
شوێنیان نەبوو
هەوالی هات و هەواڵ راست بوو
درۆ نەبووز..
ئەو پێنج ئەستێرەیە خنکێنراون

لە ئەبوغرێب بەسێدارەدا کراون
لەبەردەمی سێدارەدا
دلێرانەز.. سەربەرزانە
سروودی شەهیدان و ڕێی خەباتیان
چریوە...
بەدەنگی بەرز بەیەکەوە
کەڵ ژیان و کەم ژیانیان وتووە
پەتی قەنارەیان پچریوە
خۆیان ملی خۆیان هەڵواسیوە
کوردستانیان بەتەرمی هەر پێنجیان
نووسیوە.
سەرکەوتنیان بە مردنیان
بەخشیوە...
***
براکانمز.. ئەمە سەرگوزشتەی
پێنج ئەستێرە، پێنج بڵێسەی
کوردستانە...
داستانە. داستانی سەروەریی
هاوڕێیانە...
ئەو پێنج هاوڕێیە لەیادمانن
برامانن هاوڕێمانن
پێنج خۆشەویستی ڕێگامانن
پێنج بوو بە شەش
شەش قارەمانی زیندانمانن
باوەر، پۆلا، گمۆ
زانا، شەماڵ، جوانرۆ)
هاوڕێمانن...
برامانن...

**تێبینی:**

**-باوەڕ: هاوڕێ جەبار (جباری حاجی ڕەشید)، بەرپرسی (ڕێکخراوی پیرەمەگروون) بوو لە (سلێمانی) لە ۱۹۹۰/۱/۲۳ لە بازگەی تاسلوجە لەگەڵ هاوڕێ عەبدولعەزیز عومەردا دەستگیرکراو لە ۱۹۹۰/۱۱/۷ لە بەندیخانەی ئەبوغریب لەسێدارەدرا.**

**-گمۆ: (مامۆستا ئەحمەد محەمەد وەتمان) (ناسراو بە مامۆستا ئەحمەدی سەناعە) ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی بوو لە ۱۹۸۹/٤/۱۲دا، بەهۆی خۆفرۆشییەکەوە کە پوازو سەر بەئەمنی سلێمانی بوو، دەستگیرکراو لە ۱۹۹۰/۱۱/۷ لە ئەبوغریب لەسێدارەدرا.**

**-شەماڵ: هاوڕێ ((حەمەڕەحیم))محەمەد ڕەحیم حەسەن). لە مانگی ۱۹۸۹/۷/۹ لەکاتی ئەنجامدانی کاری پارتیزانیدا، لەلایەن خۆفرۆشێکەوە دەستنیشانکراو لە شاری کەلار دەستگیرکرا، ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی بوو بەرپرسی بەشێکی سوپای رزگاری کوردستان (سرك) بوو، لە ۱۹۹۰/۱۱/۷ لە ئەبوغریب لەسێدارەدرا.**

**-زانا: (هاوڕێ عەتا حاجی ئەحمەد)، لە ۱۹۸۹/۱۰/۲۳ بەهۆی دەستنیشانکردنی کەسێکی خۆفرۆشەوە لە دووکانەکەیدا لە سلێمانی لەگەڵ (حەمە زاهیر تۆفیق)دا دەستگیرکران لەلایەن دەزگای ئیستیخباراتەوە... یەکێك بوو لە پێشمەرگەکانی ناوشارو لە ۱۹۹۰/۱۱/۷ لە ئەبوغریب لەسێدارەدرا.**

**-جوانرۆ: هاوڕێ (سالار محەمەد سەعید)، لە ۱۹۹۰/۲/۱۱ دەستگیرکراو لە ئەنجامی ئەشکەنجەو بێ خواردنی لە ئەمنی سلێمانی... لە بەندیخانەی ئەبوغریب تووشی نەخۆشیی جگەر بوو، بەو نەخۆشییە لە بەندیخانەی ئەبوغریب لە بەیانی ڕۆژی ۱۹۹۱/٤/۱۷ لە نەخۆشخانەی ئەبوغریب شەهیدبوو.**

**-پۆلا: هاوڕێ (وەستا بەکری دارتاشە)، کە لە ۱۹۸۹/۱۱/٥ لەگەڵ (کامیل سابیر)دا دەستگیرکران... سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکوکی دەکرد، ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی بوو، لە ۱۹۹۰/۱۱/۷ لە ئەبوغریب لەسێدارەدرا.**

**-ئاوات: هاوڕێ (مامۆستا ئەحمەد ساڵحە)، کە لە ڕۆژی ۱۹۹۰/۱/۲٥ لەناو قوتابخانەکەیدا لە سلێمانی لەلایەن دائیرەی ئەمنەوە دەستگیرکرا. کاتێك دەسگیرکرا ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی بوو، بەڕێکەوت ڕۆژی ۱۹۹۰/۱۰/۱٦. ئەوچووە ناو ژووری ئەو پێنج هاوڕێیەو هەموویانی بینیبوو، دوای خواحافیزی لێکردن ڕاسپاردەی هەر یەکێکیانی بەدەمیی وەرگرتبوو، کە پێمان گەیشتەوە ڕاسپاردەکانی پێگەیاندین.**

-(فێ): (هاوڕێ فەخرەدین عەبدوڵڵا)یە، کە یەکێکبوو لە مەفرەزەکەی هەورامان لەکاتی هاتنی مەفرەزەکە بۆ دەوری شاری سلێمانی، لەلایەن خۆفرۆش (عەلی لووت ماسی)ەوە لە هاوینی ساڵی ۱۹۸۹ لە شاخی وێڵەدەر دەستگیرکران.

# گەرمیان و داستانی شەهیدان

**٩/٢٣ بۆ ١٩٩١/١٠/١، بەبۆنەی شەهیدبوونی (حەمەڕەشە)[*]وە نووسراوە**

براکانم...
ئێوە بوون...
چاوی ئەنفالتان شکان...
ئێوە بوون نەخشەی رژێمتان
دران
ئێوە بوون... بوونە هەڵۆو
کونەپەپووی شوومی شەڕتان
فران...
ئێوەبوون... بوونە سیمرخ و
هەردوو پێتان
لە هەردەی گەرمیاندا
چەقان...
ئێوە بوون... بڕیارتاندا
بیر بڕوێنن.
بەڕاست باوەڕتان رووان
ئێوەبوون... بوونە تاق تاقکەرەو
بانگی بڕیارتاندا...
لەگەڵ تێشکی خۆرا گیانتان رووا...

براکانم...
ئێوە بوون... چاوی گەشی (قەندیلتان)
بە ئاوی روونی (رۆخانە) رشت
ئێوە بوون گەرمای گەرمیانتان
بە کرێوەی (سورێنە) کوشت
ئێوە بوون... (هۆمەر ملتان) کردە
جێگاو جێتان نەهێشت

داستانی (ژاڵەو حەمەکتان)
سەر لەنوێ دارشتەوە...
بانگی نوێتان بەگوێی هەموو
هەردو شاخێکا پەخش کردەوە.
***
براکانم...
برام ئێوە بوون...
بوونە گەردەلوول و گەڕتان
بەگیانی خۆتانەفرۆشت
وەکو هەڵۆ گەرکەڕی
شاخ و باڵەکانتان کڕۆشت
ئێوە بوون... بوونە (کڵاوکوڕەو)
تاوێر تاوێر... گەروو گەروو
دانتان ئەرشت.
ئێوە بوون... باوەشتان بە خۆرا
کردبوو.
وەکو سەربازی نادیار کڵاوی
(سەخری جنتان) لەسەرکردو
هەر رۆژە هەرساتە
لەبن بەردێ لەناو هەردێ
سەرتان هەڵدا...
ڕەنجتان کێشا هەوڵتان دا...
بوون بەسام بە رۆژو شەو
دوژمنتان قاو ئەدا...
دەرسی پیاوانی رژێمتان ئەدا.

براکانم...
ئێوە بوون...
بووبوونە شاسواری گەرمیان و
ئەسپی سەرکەشتان
لەدژی شاڵاوی داگیرکەر تاو ئەدا...

براكانم...
چەندی ئەنووم چەندێ دائەنیشم و
بیر ئەکەمەوە...
ئێوە دێن و دەچن و ئەتانبینم.
ئێوە ئەبینم پاڵەوانی رۆمانێکی ئەو
گەرمیانەن
ئەو چیرۆکە کراوەتە شانۆگەریی و
گەرمیان شانۆیەو ئێوەش
ئەکتەری سەرکەوتووی ئەو شانۆیەن
ئێوە ئەکتەری شانۆی شانۆگەریی
گەرمیانن.
پالەوانن... پاڵەوانن
بۆیە لە هەڵسان و دانیشتنما
لە خواردن و لە نووستنما
لە خوێندنەوەو لە نووسینما
لە دەفتەری بیرەوەریی و
سەروەریما
لە یادمن و یادتان ئەکەم
ئەتان بینم...
بەپێش چاوما دێن و تێئەپەرن
هێند جەربەزەن جەرگی پیاوانی
ئەنفال ئەبرن... سەریان ئەبرن.
بۆ هەرشوێنێ ئەروانم ئەتانبینم
ئەتانبینم... برام ئەتانبینم
لە هەردەکانی ناو (جەباری) و (تاڵەبانا)
لەسەر کانی و باخی (هۆمەرە گەدە)و
(خاڵە بازیانا)...
لە هەردەکانی ناو (زەنگەنە).
لە (کونە گەچۆرەکانی) (خوێلینەکە)و
لە ئەشکەوتەکانی (خۆر نەوەزانا)
لە هەردەی ناو (هەمەوەند)و
لە پانتایی (بان مەقانا)

لە کەژی (مەملەحە)و (ئاژداخا)
لە شاخی (پەیکوڵی)و (چاڵەوادا)
لە چیاکانی (هەنجیرە)و (ئاڵی گۆرانا)
لە پێدەشتی دەوری (تەکێ)و (بازیانا)
لەسەر ئاوی (ئاوە سپی)
لە هەردەکانی (پشتی کفری)
لە (قادرکەرەم) (دەشتی کورە)
برام لە هەموو ئەم شوێنانە
ئەتانبینم.
ئەتانبینم ئەسپی سەرکەشتان
تاو ئەدەن
سڵ لە سوپای بڵاوی داگیرکەر
ناکەنەوە
❊ ❊ ❊
براکانم
ئەتانبینم لەناو (سەنگاو)و
گوندە خاپوورکراوەکانی
لەسەر (ڕۆخانە) دەوری (کەرکوک)
لە دەشتی (لەیلانی)
ئەتانبینم لە شاخی (سەگرمە)و
(پشتی مێولی)...
لە(پیرەسەن) پشتی (خاوێ)
ئەتان بینم لە دێی (کرِبچنەی)
هاتنە دنیات
لە (هەنارە)و (باسەرە)و (بان تەختە سی) .
وشک و بێ ئاوت.
لە گردەکانی دەوری هەردوو (دۆڵانا)...
لە چەم و بناری (سەرکۆو) (دەرەوێنا)...
لە (دێلێژە) لەو سەرکانی و ئاوە ڕێژە
لە (چنارە) لە شاخی (پەیکوڵی)
(پشتی داریکەلی).
لە (تەقتەقان)و (قەڵای بەخشی)

لە ناوەڕاستی (چواردە قۆپی)
لە هەردوو دیوی (بانی مۆرد)و
(بانی خێلانا)...
چاو بەهەر بەردو گردو یالێکا
ئەگێرم...
ئێوە دێنە پێش چاوم ئەتان بینم
براکانم ئێوە بوون... بەوەفا بوون
خەمی خۆتان و ئێمەو
ئەو خەڵکەتان بەکۆڵ دا.
گیڤارا بوون... گیڤارای چی؟
لەگیڤاراش بالاترو سەرکەشتر بوون...
هەردە هەردە
بن بەرد بن بەرد
ئەو کێوانەتان ئەپشکنی
هەنگاو هەنگاو
زۆر لەسەر خۆ ورد ئەگەران
بەدوای گەڕای داگیرکەرا
ناخی شەوتان ئەبڕی.
❊ ❊ ❊
براکانم...
(کاکەحەمە) ئێوە کوڕ بوون
پاڵەوان بوون مەرد بوون
گوڕی ئێمەو خەڵکی دەربەدەرو ئاوارە بوون
قارەمان و چاونەترس و جەربەزە بوون...
ئێوە بوون بەڵێنتان دا بەنیشتمان گەلی پەرتکراوی
دەبێ نەخشەی ئەنفالیان بۆ
ڕەشکەنەوە...
شوێنەواری سووتماککردن
ئازایانە بسرنەوە
بەڵێنتان دا ئەبێ بەسەر ئەو خاکەدا
خوێن بڕێژن و خوێنتان بڕژێ
بەڵی وابوو ئەو بەڵێنەتان

برده سەرو تەکانتان دا...
بەڵێ (مەلا ئەحمەد)و هاوڕێکانی
بەڵگەی راستی بەڵێنتان بوون
(مەلا ئەحمەد)و پێنچ هاوڕێکەی
گۆرستانیان ئەشکەوتێکی
رووخێنراو بوو...
پەساپۆرتیان شەهیدێکی
کوردستان بوو.
(سەی محەمەد)و (شێرکۆ جدی)
سەرقافڵە چی کاروانتان بوون

* * *

براکانم
(کاکەحەمە) ئێوە بوون
ئەو گەرمیانەتان جێنەهێشت.
ئێوەو هاوڕێکانت
چیتان نەکرد؟
کام بەرزایی کام لوتکەی شاخ
کام زەردەو کاوەتان
بەگیانی تەرو شەکەتەوە
ماچ نەکرد؟
کام ئۆردووگا کام شارۆچکەتان
سەردان نەکرد...؟
خۆشحاڵ نەکرد؟
کام باخی وێران، کام بێشەی
چرتان
نەکردە شوێن و خۆتان
تیا حەشار نەدا؟
کام رەبایە کام سەنگەری
داگیرکەرتان
بەچەکی شانتان بیراز نەکرد؟
کاکە کاتێ (مەلا ئەحمەد)و دەستەکەی
جەرگ و دڵی کوردستانیان

ئەکێلا...
ئەو مەردانە لە هەردەو شێوەکانی
گەرمیانا
بەدوای پۆستاڵی رەشی داگیرکەرا
چاوی قین و رقیان ئەگێرا...
بەڵی (کاکەحەمە). ئێوە بوون...
(کاکە شێرکۆ) لە گەرمیانەوە نامەی
نووسی بۆ هاوسەری.
بەداخەوە هێشتا نامەکەی
نەگەیبووە جێ.
هێشتا نامەکەی هاوسەری
پێی نەزانیبوو
(شێرکۆ) لە گەرمیانە
لەپڕ هەواڵی شەهیدبوونی
دەنگی داخست
رێگای داخست.
نامەی نووسراو بەلۆکراوی لە گیرفانی هاوڕێیانا
مایەوە
دوای شەهیدبوون بەچەند مانگێ
لەنێوانی دەستی هاوسەریا کرایەوە
ئائەمە داستان نییە؟!

براکانم
(کاکەحەمە) ئێوە بوون
زۆر شتتان کرد...
ئێوە بوون بووبوونە دێوانەو بەساڵ
چۆڵ و پەرستپتان ئەکرد...
خێزان... مندال کەسوکاری
خۆشەویستتان واز لێ هێنا.
خۆشی ژیان و شارستانی
حەوانەوەتان بەجێهێلا...
بڕیارتان داو سوور بوون

دەبێ لە پێناوی بەڵێنتان دا
سەردانێن و بمرن...
بەڵێ بەڵێنتان زوو بردە سەر
بەناو پێدەشت و دۆڵا کەوتنە گەڕ.

٭٭٭

براکانم...
(کاکەحەمە) تۆ...
چەندی دووربووی
من تامەزرۆی بینینت بووم
تامەزرۆیی دیداری شیرینت بووم
سەیر بوو رووداوەکان وایان
سەپان
کە نەمان توانی ماوەیە دوور
یەکتر ببینین
جارناجارێ دوورو نزیک
پەیامبەرێ بەرێی
نامە هەواڵی تۆی بۆم ئەهێنا

٭٭٭

برام (کاکەحەمە)
لە یادمە نامەیەکت بۆ ناردم
کە کردمەوە نامەیەکی چەند
شیرین بوو
لە خۆشیانا چەند جارێکم بەدوای
یەکدا خوێندەوە
زۆر پێی شادبووم
هەتا ئێستا وشەکانم
لەبیر ماوە.
نامەیەکی چەند بەتام بوو.
یادگارێکی چەند پیرۆز بوو.
برام... رۆژ هات و رۆیی
من و تۆ
هەر دووراو دوور

بەرێی نامە
یەکمان ئەبینی.

***

برام... کاکەحەمە
هێندەم زانی لەپر
بەبێ ئاگا دەستگیرکرام
ماوەی هەشت مانگ
لە ئەشکەنجەو سزادا ونکرام.
تا گەیشتمە زیندانێ
هەر چوار دەورم
بەچەند دیواری بەرز
گیراوە
بەچەند جۆرێ پاسەوان
هەر چوار دەورم تەنراوە
لە ژوورێکدام
چەند دەرگای ئاسنینم
لەسەر داخراوە
تەنها دەنگم بەرێی نامە
ئەگا پێتان
خۆت ئەتزانی خۆت ئەتزانی
شەو و رۆژ دێت و ناڕواو
ئێمە ئەرۆین
ئەوان نارۆن
بەڵام ئێوە ئەو ئاواتەی
بەڵێنتان لەسەر دابوو.
وا هاتە دی زوو هاتە دی.
ئێستا تۆ خەریکی وردە وردە
لە دەشتی گەرمیانا
ملە ملە دەشت بەدەشت
جەوەڵ جەوەڵ
پاکۆی سوپای دوژمن
ئەدەی.

لە بەرزاییی و لوتکەی هەر چیایەک
مەشخەڵی دوانەورۆزی
سەرفرازی هەڵ ئەکەی
ئای (کاکەحەمە) چەند بەختەوەری
کە بەپانتایی دەشتی گەرمیانا
ملت ئەناو رەتی راوی
دوژمنت دائەمەزراند
خۆزگا ئێمەش لەم ئاهەنگا
لەگەڵ ئاهەنگی چەکتانا
ئەبووین
بۆ رزگاری
هەڵمەتبەری نوێتان ئەبووین
بەڵام برام... ئاخ!!
برام چەند ستەم بوو
چەند ناخۆشبوو
لەپر... یەکجار لەپر
بە هەواڵێک سریان کردم
وریان کردم گێژیان کردم
هەواڵی شەهیدبوون و
سەروەریی
هەواڵی بەڵێنی تۆ
چەند جگەر بربوو
چەند ستەم بوو

* * *

برام
(کاکەحەمە) بەراست تۆ بووی
کە جارێکی تر بۆ چەند
چرکەیەک نەمدیتەوە
نەمدیتەوە...
دڵنیابە تۆ سەروەری
بەختەوەری
هەتا مێژوو هەبێ لە گەرمیانا

تۆ باوەڕی

❊❊❊

برام ئاواتم بوو
رۆژی لەژێر سێبەری
ئازادیا
وەکو برا وەکو هاوڕێ
باوەشی سەرفرازیی
بەیەکدا کەین
تێر یەک ماچکەین
تێر یەک ماچکەین
بەڵام ئاخ من زیندانیی
تۆش شەهیدو
لەیەک براین لەیەک بڕاین...
(کاکەحەمە)
(کاکەحەمە)...

٩/٢٢ تا ١٠/١ی ساڵی ١٩٩١ تەواو بوو.
٨ی رەزبەر
زیندانی ئەبوغرێب

❊ بەبۆنەی شەهیدبوونی هاوڕێ و خزمم (محەممەدی شێخ عەبدولکەریم)، کە ناسرابوو بە (حەمەڕەش) دانراوە.٢

# مواجەهەی یەکەم: کەرنەڤاڵ بوو

زیندانی ئەبوغرێب
١٩٩٠/١١/٥
بەشی (٨)، ژووری (١٠)

بەپێی ئەوسیستەمەی بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب دانرابوو. مانگانە زیندانییەکان دووجار مواجەهە دەکران، سەری مانگ و نیوەی مانگ. (کاکەحەمەو مارف) ماوەی ساڵ زیاتربوو لەو زیندانەدا بوون. شارەزایی تەواویان هەبوو. دوو رۆژ پێش کاتی مواجەهەپێیان وتم: رۆژی دووی مانگ مواجەهەیە. دەبێت خۆت ئامادەبکەیت. وتم: جا چۆن خۆم ئامادە بکەم؟ وتیان: ئێوارەی یەکی مانگ دەبێت (خێمەو حەبل) پەیدا بکەین و شوێنێك لە حەوشەکە پاکبکەینەوە، خەیمەکەی بەچواردەوردا بگێڕین. شوێنەکەش دەبێت گەورە بێت، لەبەرئەوەی تۆ یەکەم مواجەهەتە خەڵکی زۆر دێن بۆلات. وتم: جامن خەیمەو حەبلم لە کوێ بوو؟ وتیان: خەمت نەبێت ئێمە پەیدای دەکەین... خەیمەو حەبلیان پەیداکرد. ئێوارەی رۆژی یەکی مانگ چووینە حەوشەکەو شوێنێکیان هەڵبژاردو دەستمان بە پاککردنەوەی کرد، خەیمەکانمان هەڵواسی خەیمەکان بریتیبوون: لەچەند گونییەك کە درابوونە دەم یەك و چەرچەف و بەتانی تەنکیان کۆکردبووەوە. لەناو خەیمەکەشدا چەند بەتانی و حەسیرێکمان راخست و شوێنەکە شوێنێکی گەورە دەرچوو. دیارە ئەگەر ئەوان نەبوونایە هەرگیز من نەمدەتوانی ئەم شوێنە وا رێکخەم و چاك و پاکی بکەمەوە... (بەختیار)یش هەر لە حەوشەکە شوێنێکی پاککردەوەو خەیمەی بە دەوردا داو ئامادەی کرد. تا ئێوارە دەرگا داخرا لە دەوری خەیمەکان ماینەوە.

شەوانی مواجەهە. وەکو شەوی جەژن وایە. هەر زیندانییەك لای خۆیەوە خەریکی تەراش و خۆشۆردن و تیفتیفەی دەموچاویانن، زۆرکەس کەسێك دەموچاوی بۆ هەڵدەگرێت، هەشە بە مووکێش خەریکی هەڵکەندنی مووی ڕوومەتییەتی. منیش شەو ریشم تاشی، خۆم شۆرد. ئەمشەو زۆر بەکەمیی نووستم، هەر بیرم لە منداڵەکان و ئەو کەسانە دەکردەوە کە دێن بۆلام، لە خۆشیی مواجەهەو بینینی زەینەب و منداڵەکانم و براو خوشك و کەسەکانم چەندم کرد خەوم لێنەکەوت. چەند نووستم، نووستم. بەیانی سەعات (٥) خەبەرم بووەوەو سەعات (٦) (مەستەر) کراو دوای (مەستەر) خۆم گۆڕی، کاتێکمزانی (کاکەحەمە) هات جلی کوردی لەبەرکردبوو، مشکییەکی سەوزی بەسەرییەوە بەستبوو. لەوپەڕی کەیف و خۆشیدابوو. وتی: خۆت ئامادەکردووە؟ وتم: ئامادەم. بەیانی ١٩٩٠/١١/٢-یە. کاکەحەمە وتی: بابچینە بەردەرگا بوەستین، ئێستا کاتی دەرگا کردنەوەو هاتنە ژوورەوەی مواجەهەکارانە. من و کاکەحەمەو مارف و بەختیار لەبەر ژوورەکەماندا راوەستاین و هەر ئەوەندەمان زانی دەرگای هۆڵەکە کرایەوەو خرایە سەر پشت... کاکەحەمە بە مارفی وت: دەبێت ئاگامان لەو شتانە

بێت کە بۆ مامۆستای دەهێنن، لێمان نەدزن.

(من، بەختیار، کاکەحەمەو مارف) راوەستابووین، کاتێکمانزانی بەرایی مواجەهەکاران پەیدابوون... رارەوی بەردەم بەش و رەدهەکان پڕ بوون لە خەڵك. لە رارەوەکەدا زیندانییە دەسترەنگینەکان هەر یەکەیان لەلایەکەوە دووکانی چەرچێتی خۆی دانابوو. یەکەم کەسی من کە پەیدابوون (زەینەب و ئازاد)بوون، خۆیان کرد بەهۆڵەکەداو رێك لەبەر دەممداندا راوەستان، هەریەکەیان کۆڵێکیان بەسەر شانەوە بوو، دیار بوو زۆر ماندوو بوون. کاکەحەمەو مارف کۆڵەکانیان لێگرتن و باوەشمان بەیەکدا کرد، هێشتا لەیەك جیانەبووبووینەوە، یەك بەدوای یەك و بە کۆمەڵ ژمارەیەکی زۆر لە برا، خوشك، خزم و کەس، دۆست، ناسیاو و هاورێیان پەیدابوون، من و کاکەحەمەو زەینەب و ئازاد بەرەو ساحەکە رۆیشتین، (مارف)مان جێهێلا بۆ شارەزایی و رێنوێنیی مواجەهەکاران... ئێمە لای خەیمەکە بووین. کاکەحەمە لەخوار خەیمەکەوە راوەستابوو، بۆ بەخێرهاتن و هێنانی ئەو کەسانەی پرسیاری منیان دەکردو بۆلای من هاتبوون، دەیهێنان بۆلای خەیمەکەو منیش پێشوازیم لیدەکردن. هاتنەژووردوەی مواجەهەکاران تا سەعات (٩)ی خایاند... ئەو رۆژە ئەوەندە خەڵك بۆلامان هاتبوون. هەموو بەشەکەی شلەژان و قەرەباڵغییەکی ئەوتۆ دروستبوو، کەس سەر کەسی نەدەپەرژا. زیندانییەکانی بەشەکە سەرسامبوون و بەلایانەوە زۆر سەیربوو، کە ئەم هەموو خەڵکە بۆلای من و بەختیار هاتوون و هەرکەسیش دێت پەلامارمان دەدات و ماچمان دەکات، لە باوەشمان دەگرێت، دیارە لە هەموو رەدهەو بەشەکان بەهەمان شێوەیە. بۆیە ئەو رۆژە لە مواجەهەی ئاسایی دەرچوو، وەکو کەرنەڤاڵێکی زۆر گەورە لەم بەندیخانەیەدا بەدی دەکرا، سەرجەم بەرێوەبەرانی بەندیخانەو زیندانییەکانی سەرسامکردبوو، هەر ئەم مواجەهەیە سەلماندی کە زیندانیکردنی ئێمە ئاسایی نییەو وەکو زیندانییەکانی دیکەی ناو ئەم زیندانە نین... جگە لە زەینەب، ئازاد، بەهار، ژیر، بلێسەو شێنێ، براکان و خوشکان و خزمان لە سلێمانی و سۆڵەو دێلێژەو خەڵکێکی زۆری دۆست و ناسیاو و هاورێیان هاتبوون، لەناویاندا (کاك حەمەرەشیدو کاك حەمەنووری و کاکەولا بوون)... لەم مواجەهەیەدا خواردنێکی ئێجگار زۆر و میوەو گوێزو شتی هەمەجۆرو دیاریی جۆراوجۆریان هێنابوو... ئەمرۆ لەگەڵ ئەوانەی هاتبوون، نانمان خوارد، جگە لە خواردن پارەشم بۆ هاتبوو، ئەو پارانەی بۆم هاتبوو، بەشی خۆمم لێ گلدایەوەو ئەوی دیکەم دایە زەینەب بیباتەوە... شتەکانیش ئەوەندە زۆربوون، زۆر شتم پێدا ناردەوە بۆ خۆیان، بەتایبەتی گوێزو هەنگوین و شیرینی... چەند نامەیەکیشم بۆ هاتبوو، نامەکان زەینەب لەپشتی بەستبوون بۆئەوەی نەبینرێن.

کراس و بیجامەو جلی دیکەیان بۆ هێنابووم. جگە لەوانەی بۆلای من و بەختیار هاتبوون، ئەوانەشی بۆلای برادەرەکانی دیکەمان هاتبوون، دوو دوو، بەکۆمەڵ سەردانی ئێمەشیان دەکرد، ماوەیەك لامان دەمانەوەو لەوانەش کە بۆلای من و بەختیار هاتبوون سەردانی ئەو برادەرانەیان دەکرد کە دەیانناسین، رۆژێکی سەیرو سەرنجراکێش بوو. جموجووڵ و

هاتوچۆیەکی زۆر نائاسایی لەناو بەندیخانەدا بەهۆی ئێمەوە دروستبوو. زیندانییەکان و فەرمانبەران و کارمەندانی بەندیخانەکەیان سەرسام کردبوو. (کاکەولا) کە خالی کاك حەمەڕەشیدە، لە زۆر بۆنەدا لەگەڵماندا دەبوو، کە منی بەو لاوازییە بینی، رووی کرد: کاك حەمەنووری و پێی وت: خۆزگا (نوورە) تۆم دەدی چۆن شێخ محەمەد ئاوا لاواز بووە. تۆش وات لێدەهات، وتی: ئاخ (نوورە) شێخ محەمەد دەگیرێ و تۆش وەکو بەرزەکی بانان دەردەچێت، بوو بەپێکەنین.

بەراستیی رۆژێکی ئێجگار خۆشی ئەوتۆ بوو، باوەرناکەم لەبیرم بچێتەوە، کاك حەمەڕەشید جیای کردمەوە، پێی وتم: لە برادەرەکانتان ناوی (٥) کەسمان بدەرێ کە باری ئابووریان باش نەیێت، بۆئەوەی مانگانە بتوانین یارمەتییان بدەین، منیش ناوی (٥) لە هاورێ کەمدەرامەتەکانم پێدا... پێش ئەوەی مواجەهە تەواو بێت، ئەو شتانەی پێویستم بوون بۆ ئازادو زەینەبم نووسی، تا لەمواجەی داهاتوودا بۆم بهێنن، مواجەهە لە دەوری کاتژمێری (١٢-١)ی نیوەرۆ تەواو بوو. مواجەهەکاران خواحافیزییان کردو بەجێیان هێشتین. منیش لەگەڵ مارف و کاکەحەمەدا ئەو خواردن و میوەو شتانەی بۆیان هێنابووم کۆمانکردەوە، بردمانە ژوورەوە لەژێر قەرەوێڵەی مارف و ئەو زیندانییەی دیکەدا دامنان... کاکەحەمە دوو فلین و مارف یەك فلینیان هەبوو. خواردن و میوەکانمان خستە فلینەکانەوەو لەناو سەهۆڵدا هەڵگیران... کاکەحەمە ئەنقەر چییەکانی راسپارد بۆ فلین، فلینێکی گەورەیان بۆ هێنایین، سەهۆڵ دەهات، سەهۆڵمان کری و خواردن و میوەکانمان تیا تاقەتکردن، ئەو شتە زیادانەی کە کاکەحەمەو مارف پێیان وتم، ناردمنەوە، چونکە ئەوان ئەزموونی ناو بەندیخانەیان هەبوو، کاکەحەمە وتی: ئەم شتانە بۆتۆ هاتوون، کە بۆتۆ هاتوون مەرج نییە هەر هەموویان لێرە گلبدەیتەوە. ئەوەندەی تا (١٥) رۆژی دیکە پێویستتە، گلیان بدەرەوەو ئەوی دیکەی بنێرەوە بۆ منداڵەکان، تۆ دەمێکە گیراویت، ئێستا من دەزانم ئەوان وەزعیان لەم چەند مانگەدا چۆن بووە... کە مواجەهەکاران رۆیشتن. لەلایەك دڵم زۆر خۆشبوو، کە ئەو هەموو خەڵکەم بینی و چاوم بە زەینەب و منداڵەکان کەوتەوە، لەلایەکی دیکە زۆر نیگەران بووم بەهۆی رۆیشتنەوەیان و مانەوەم بەتەنیا. پاش نیوەرۆی رۆژی (٢) مانگ لەگەڵ (کاکەحەمەو مارف و بەختیار) لە حەوشە پیاسەمان دەکرد، ئەوان هەر باسی خەڵکەکەو زۆرییان دەکرد، زۆریان پێخۆشبوو کە خەڵکە بەو شێوەیە هاتوون بۆ لامان و سەردانمان دەکەن و حیسابمان بۆ دەکەن. نیوەرۆ لەو خواردنانەی بۆیان هێنابووین، گەرممانکردەوە، نیوەرۆژەیەکی باشمان کرد، بەشی هەندێك زیندانیشمان دا. لەو گوێژو شیرین و شتانەی گلمدابوونەوە بەشی زیندانییەکانی ژوورەکەم داو بەشی موراقیبەکەیان داناو دوای کاکەحەمە بۆی برد. بۆ ئێوارەش خواردنمان گەرمکردەوەو شیوێکی باشمان کرد، شەو کە چوومەوە ژوورەوە نامەکانی بۆم هاتبوون کردمنەوە، کە کردمنەوە سەیرمکرد یەکێك لە نامەکان (نامەیەکی بەخشییە) لەگەڵ سەعاتێکدا، بەدیاریی بۆی ناردبووم. ئیتر

کەوتمە خوێندنەوەی یەکە یەکەی نامەکان و شەوم لەگەڵدا بردنە سەر، نامەکانیش بوونە مواجەهەیەکی دیکە لەو شەوەدا، ئەو نامانەم نەك جاریٚ زیاتر لە (٣-٤) جار خوێندنەوە، دوو شەو و دوو رۆژم لەگەڵدا بەسەربردن. خەفەتم بۆ بەخشی خوارد، کە بەهۆی ئەوەی نەچووبوو، بۆ خزمەتی سەربازیی لەبەر پرسینەوەی بازگەکان نەیویرابوو بێت. لەو مواجەهەیەدا کاك حەمەڕەشیدو کاك نووری و زەینەب کۆمەڵێك شتیان بۆ باسکردم، کە گێڕانەوەی ئەو زانیارییانە بۆ من زۆر بەسوود بوون.

# نیوەی مانگی (١١)و دووەم مواجەهە

بەندیخانەی ئەبوغریب
١٩٩٠/١١/٢٠

مواجەهەی نیوەی مانگ لە (١٧)ی مانگدا بوو. رۆژی پێش مواجەهە عەسرەکەی لەگەڵ شێخ مارف و کاکەحەمە چووینە حەوشەکەو شوێنمان پاککردەوەو خەیمەمان بەچواردەوریدا گێرا... خەیمە بەچەند چەرچەف و بەتانی کە شێخ مارف و کاکەحەمە پەیدایان کردبوون... ئێوارەش ریشم تاشی و شەو حەمامم کرد. شەو لە خۆشیی ئەوەی بەیانی کەسوکار دێن بۆ مواجەهەمان، تا درەنگ خەوم لێنەکەوت، بەیانی سەعات (٥) خەبەرم بووەوە. هەستام و دەموچاوم شۆردو کەوتمە پیاسەکردن بە رارەوەکەدا. لە سەعات (٦) لەدەرگا درا بۆ (مەستەر) موراقیب کەوتە هەڵسانی زیندانییەکان بۆ ئامادەبوونیان لە مەستەردا. مەستەر کراو هاتینە ژوورەوە.

سەعات (٧) دەرگای بەشەکە خرایە سەرپشت، لەبەردەم دەرگاکەو بەناو رارەوەکەدا لەگەڵ شێخ مارف و کاکەحەمەو بەختیاردا پیاسەمان دەکرد... کاتێکمانزانی مواجەهەکاران پەیدابوون... رارەوی بەردەم بەش و رەدهەکان ئەو زیندانییانەی شتیان دەفرۆشت، لەمبەرو ئەوبەری دووکانی دەستگێری خۆیان دانا... کاکەحەمە جلی کوردی لەبەر کردبوو، مشکییەکی بەسەرییەوە بەستبوو، ئەوەندە لێی جوانبوو لە بەگزادەی جاف دەچوو...

کاتێکمزانی (ئازاد) پەیدابوو. بە دوایدا (زەینەب، بەهار، ژیر، بلێسەو شێنێ) هاتنە ژوورەوە. بەرەو ساحەکە رۆیشتین. ئازادم ناردەوە بۆ بەردەرگا، بۆئەوەی هەرکەس هات بیهێنێت بۆ حەوشەکە. لە سەعات حەوتەوە تا سەعات (٥ر٨) بۆ (٩) خەڵك هاتە ژوورەوە، ئەوەندە خەڵك و خزم و کەس و ناسیاو و برادەران هاتبوون، ئەو شوێنەی کە پاکمان کردبووەوە، بەتەواویی پڕبووەوە. بەردەوامیش دەستە دەستەو دوو دوو، خەڵك دەهات بۆلام. قەرەباڵغییەکە ئەوەندە زۆربوو، سەرنجی هەموو زیندانییەکانی راکێشابوو. لەراستیدا کەرنەڤاڵێکی چاوپێکەوتن و سەردان و پرسینەوەو بەسەرکردنەوەی خزمانەو دۆستانەو نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرانە بوو. ئەوەندە جۆری خواردن و میوەو دیاریم بۆ هاتبوو، نەمدەزانی چی لێبکەم، نانێکی بەکۆمەڵمان خواردو ئەوخواردنەی کە بۆخۆمیان هێنابوو. بەجیا زەینەب داینان و وتی: ئەمە هی خۆتە وریای بە لە شوێنێ سارد دایان بنێ، با نەترشێن و خراپ نەبن.

ئەو کەلوپەل و پێداویستییانەی داوام کردبوون، زۆربەیان بۆ هێنابووم. بۆکسێك و فلینەیەکی تەبەدۆری دوو دەست جلی لەبەرکردن، بیجامەو کەلوپەلی پێویستی ژێرەوە، چەرچەف و پشتی و دۆشەك و بەتانی، قاپ و قاپاخی تەواو لەگەڵ تاقمی چا و لەگەڵ

نۆردووی نان. بەکورتی ماڵۆچکەیەکیان بۆ هێنابووم، باشترین شتیش کە هێنابوویان، باوەڵێکی ئاسنی گەورە بوو.

نامەیەکی زۆرم بۆ هاتبوو. کە زۆربەیان بە زەینەب بوو، بە زیرەکی هەڵیگرتبوون. خواردن شتەکان ئەوەی پێویستم بوو گلمدانەوەو ئەوانە شی زیادبوون بە منداڵەکاندا ناردمنەوە. بەڕاستیی خەلکەکە ئەوەندە زۆر هاتبوون، ناتوانم ناوەکانیان بنووسم. ئەم مواجەهەیەش تەواو بوو. مواجەهەکاران چوونە دەرەوەو دوای تەواوبوونی مواجەهە، مەستەر کراو سەرژمێریان کردین، دڵنیابوون لە ژمارەی زیندانییەکان. دوای مەستەر کاکەحەمە وتی: با نانێك بخۆین. خواردنیان گەرمکردەوەو نان و چامان خوارد، ئینجا کەوتینە رێکخستنی خواردنەکان لە بۆکس و فلینەکاندا. خواردنی وشکەشم خستە ناو باوەڵەکەو لەو شتانەی بۆم هاتبوون بەشی زیندانییەکانی ژوورەکەم و موراقیب و هەندێك زیندانیی هەژار، ئەوانەی مواجەهەیان نەدەهات. دوایی سەهۆڵ هات و سەهۆڵمان کری، بەسەر فلینەکاندا دابەشمان کرد. بۆ شێوی ئێوارەش نانێکی باشمان لەو خواردنانەی بۆمان هاتبوو، سازکردو شێومان کرد. شەوەکەشم لەگەڵ کۆمەڵێك نامەدا بەسەربردو بوو بە مواجەهەیەکی دیکەو لە نامەکاندا زۆر شتیان تێدابوو، کە زۆر رووداو و شتی رۆژانی رابووردووی بیر دەخستمەوە.

لەو جلانەی بۆم هاتبوو تاقیمکردنەوە. ئەو باوەڵەی بۆیان هێنابووم، شتی زۆری کۆکردمەوەو سوودی زۆرم لێبینی.

# سێیەم مواجەهە

(١٩٩٠/١٢/٥)

بەهەمان شێوەی مواجەهەکانی دیکە رۆژی پێش مواجەهە، شوێنمان پاککردەوەو ئامادەمان کرد. شەو ریشم تاشی و حەمامم کرد. ئەو جلە تازانەی بۆیان هێنابووم ئامادەم کرد کە بەیانی لەبەریان بکەم... شەو تا درەنگ لە خۆشیی مواجەهە تا درەنگ خەوم لێنەکەوت. بەیانی زوو هەستام و پێش مەستەر (مارف)یش هەستاو کاکەحەمە پەیدابوو. وتی: هەستاویت، وتم: لە سەعات پێنجەوە بەخەبەرم. بانگەوازی مەستەر کراو سەعات (٦) مەستەر کراو لە سەعات (٧) دەرگای بەش کرایەوە بۆ مواجەهە.

لە (٧,٥)ەوە مواجەهەکاران پەیدابوون. یەکەم کەس لە مواجەهەکارانی من (زەینەب و ئازاد) بوون. کە هەریەکەیان کۆڵێکیان بەسەر شانەوە بوو. کۆڵەکەم لە زەینەب گرت، زۆر قورس بوو. وتم: ئەمەت چۆن بۆ هەڵگیراوە؟ وتی: چی بکەم، ئەگەر بۆت هەڵناگیرێت با خۆم هەڵیگرمەوە؟ لەم قسانەدا بووین مارف پەیدا بوو. کۆڵەکەی لێگرتم و بەرەو ساحەکە رۆیشتین. لە ساحەکە باوەشمان بەیەکدا کردو تێر یەکمان ماچکردو ئازاد کۆڵەکەی داناو ئەویشم لەباوەش گرت و تێر تێر ماچم کرد. وتی: زۆر ماندووبووم، دەرگاکە زۆر دوورە، یەکسەر دانیشت و وتی: زۆر لە خزمان هاتوون (بەهار، ژیر، بلێسەو شێتێ)ش لە دواوەن لەگەڵ مامە محێدینمدان. با من بچمەوە بۆلای دەرگاکە من و زەینەب بەیەکەوە دانیشتین. جارجارە دەستی دەکردە ملم و ماچی دەکردم و دەیوت تۆ بڵێی خوا کارێك بکات بێیتەوە ناومان؟ وتی: کۆمەڵێك نامەم پێیە با تا قەرەباڵغ نەبووە، بتدەمێ. نامەکانی دەرهێناو دایە دەستم، منیش لە گیرفانمدا هەڵمگرتن، وتم: ئەمە بۆ شەو کە دەیخوێنمەوە، وەکو مواجەهەیەکی دیکە وایە... وتی: نامەیەکی (جەمیلە)ی تێدایە زۆر لە خەمتایە وتم: وەزعی چۆنە؟ وتی: زۆر باشە، بەڵام دەترسا. کە لە مواجەهەی پێشوو گەرامەوە هات بۆ ماڵمان، وتی: رەنگە نەتوانم بچم بۆ مواجەهە، بەڵام نامەیەك بۆ مامۆستا دەنووسم و بەشکم بۆی بەریت، وا نامەکەیم بۆ هێناویت. تا قەرەباڵغی پەیدابوو، ماوەیەك بەجووتە پێکەوە دانیشتین و کۆمەڵێك شتی بۆ باسکردم، کە بە پێویستی دەزانی پێم بڵێت، یەکێك لەوانە، باسی مامۆستا (ش)ی کرد. کە دوای دەستگیرکردنم چۆن چووە بۆ ماڵمان و پرسیاری ئەوەی کردووە کە کێ سەردانیان دەکات و کەس پارەو خەرجی بۆ بردوون؟ کە ئەو جارە چووە پێی وتووە، مامۆستا تکایە ئیتر مەیە بۆ ماڵمان و با زیاتر ماڵمان ویران نەبێت، بەڵام دوای ئەوە کە نەشچووە بۆ ماڵمان، چاودێریی ماڵمانی کردووەو لێی کەوتووەتە گومانەوە، ئیتر بەتەواویی خۆیان لێشاردووەتە، هەروەها باسی ئازادبوونی (کاك مەجید سەلیمی) بۆکردم، کە چۆن راسپاردەکانی منی پێگەیاندوون، هەروەها باسی محێدینی پوورزامانی کرد

(محیدینی شخ حەمەئەمین) کە ئازادبووە سەری لیداون و ئەو کراسەی کە لەئەمنی سلیمانی دابووم پیّ، بۆی بردبوون و پیّی وتبوون، ئەمە کراسەکەیەتی و راسپاردەکانمی پیوتبوون...
کاتیکمانزانی کاك حەمەنووری پەیدابوو، هەر لیمان نزیکبووەوە وتی: دادە زەینەب بە (کاك شیّخ محەمەد) شادبوویتەوە؟ چەندم پیخۆشە وا بەجووتە شانتان داوە بەشانی یەکەوەو دانیشتوون، ئیتر بەدوای (کاك حەمەنووری و کاك حەمەرەشید)دا یەك بەدوای یەکدا لە خزم و کەس و دۆست و برادەران و هاوڕیّیان پەیدابوون. نزیکەی سەعاتیك بۆ سیّ چارەك بەپیوە بووم، پەیتاپەیتا بە خیرهاتنم دەکردن، (زەینەب) بەتەنیشتمەوە راوەستاو لە خۆشیدا هەر پیدەکەنی، بەهاتنی خەلکەکە دەگەشایەوە ئازاد، بەهار، ژیر، شینێ، بلیسە، محیدین و کاکم راوەستابوون، بەخیرهاتنی خەلکیان دەکرد. زەینەب وتی: ئەمجارە شوکر رەنگ و رووت باشترەو دەبینم هیزیکت تیهاتووەتەوە، رەنگت سوورایی تیکەوتووەتەوە، جلەکانیشت جوانن و پیرۆزت بن، ئەوە بەخشی بۆی کردوویت، دوای ئەوەی میوانەکان گەیشتن و هەرهەموو دانیشتن، نانمان دانا بە کۆمەل نانیکمان بەیەکەوە خواردو مواجەهەو رۆژیکی خۆشمان بەسەربرد.
(کاك حەمەرەشید) دووبارە وتی: لەو برادەرانەی وەزعی ئابوورییان باش نییە بەخۆتەوە، ناوی (٥) کەسمان بدەریّ با کە چووینەوە کاریك بکەین یارمەتییان بۆ دابین بکەین، من ناوی (٥) کەسم لە هاوڕیّیان دا پیّیان، ئەوەی لەیادم مابیّت یەکیکیان (کاك شیخ عەبدول)و ئەوی دیکەیان (کاك عەلی سالح) بوو.
مواجەهە تەواوبوو. میوانی مواجەهەکاران دەستیانکرد بە رۆیشتن. زەینەب ئەو شتانەی زیادبوون، کۆیکردنەوە لەگەل خۆی بردینییەوەو مەبلەغیك پارەی زیادم پیّبوو، کە بۆم هاتبوو، ئەوەشم دایە، وتم: بۆ خەرجی مالەوەو مندالەکان.
دوای تەواوبوونی رۆیشتنی مواجەهەکاران، مستەریان کردو سەرژمیرکراینەوەو کراینەوە بەشەکە. کاکەحەمەو مارف وتیان نانیك نەخۆین؟ وتم: بۆ نا... ئەو هەمووشتانەمان هەیە کامەی دەزانن زوو خراپ دەبیّت با لەوە گەرم بکەینەوە، بەئارەزووی خۆمان تیری لیبخۆین.
لەو شتانەی بۆم هاتبوو، بەشی زیندانییەکانی ژوورەکەو موراقیب و چەندکەسی هەژار، کە مواجەهەیان نەهاتبوو دا. کاکەحەمە کە شتەکانی برد بۆ موراقیب و گەرایەوە، وتی: موراقیب بریاریداوە کە بەمزووانە شوینیّت بۆ پەیدا بکات و لەو ژوورە بتگوێزیتەوە.
نانیکی باشمان خواردو ئەو خواردنانەی کە بۆمان هاتبوو هەرهەموویمان لە بۆکسەکەو فلینەکاندا ریکخست و پرمانکردن لە سەهۆل و شتی وشکەشم هەندیکی لای کاکەحەمەو ئەوی دیکەم لە ژوورەکەی خۆمان و لەژیر قەرەویلەکەی مارف و ناو باوەلەکەدا دانا...
ئیوارە دوای مەستەر، خواردنمان گەرمکردەوەو شیومان کرد. چایەکی خۆشمان بەسەردا

کردو میوەمان خوارد.

ئەو ڕۆژە هەرچەندێ زوو هەستابووم و زۆریش ماندوو بووبووم، بەڵام لەبەرئەوەی دڵم خۆشبوو، هەستم بە ماندوویتی نەدەکرد. خەوم نەدەهات. لەسەر قەرەوێڵەکەی مارف کەوتمە دەرهێنانی نامەکان و یەکەیەکە دەستم بە خوێندنەوەیان کرد. نامەکەی (جەمیلە)م زۆر لا خۆشبوو. دووجارم خوێندەوە، لەگەڵ نامەکانی دیکەشدا شەو مواجەهەیەکم کردو کاتێکی خۆشم لەگەڵدا بەسەربردن و خەوتم.

بەیانی دوای مەستەر، دەرگا بۆ چوونە ساحە کرایەوە، خۆم گۆڕی و بەرەو ساحە ڕۆیشتم. زۆرێك لە برادەرانم بینی و هەریەکە هەواڵێکی پێبوو. هەریەکە قسەیەك و بیروبۆچوونێکی لەسەر وەزعەکە هەبوو. دوای پیاسەیەکی زۆر لە ساحەکە، گەڕاینەوە بۆ شوێنەکانی خۆمان لە بەش و ڕەدهەکان.

## چوارەم مواجەهە[1]

(١٩٩٠/١٢/١٥)

زیندانی ئەبوغرێب، قاعەی (٨)، ژووری (١٢)

ڕۆژی (١٢/١٤) هەرچەند بڕوامان نەدەکرد کە کەس بتوانێت بێتە سەردانمان، چونکە بارودۆخی عێراق و کوردستان بەهۆی شەڕی خەلیجەوە زۆر ئاڵۆزبوو... لە حەوشە شوێنێکم پاککردەوەو ئامادەم کرد... بەیانی (مەستەر) کرا، دەرگای ساحە کرایەوە. لە سەعات (٧)وە هەر چاوەچاوم بوو کەسوکار بێن، کەس دیارنەبوو، لە سەعات (٨,٥) کاتێکمزانی (کاك حەمەڕەشیدو کاك حەمەنووری) بەجووتە پەیدابوون... لەبەرئەوەی کەسی دیکە نەهات نەچووینە ساحە. لە ژوورەکەی (کاکەحەمە) لە خوارەوە دانیشتین، بەگشتیی خەڵك کەم هاتبوو. وتم: چۆنە وا بەجووتەو لەم ناوەختەدا هاتوون...؟ وتیان: بارودۆخەکە زۆرئاڵۆزە، بەپێویستمانزانی تا ئاڵۆزتر نەبووە سەردانێکت بکەین، لە هاتنەکەماندا چەند شتێك هەیە پێتی ڕابگەیەنین و تۆش بە هاوڕێیانی بگەیەنیت.

وتیان: ئێمە لە سلێمانی و هەموو ناوچەکان خۆمان سازداوە بۆ (ڕاپەڕین)، زۆربەی چەکداری حکومەت بە تایبەتی ئەوانەی لێیان ڕابینراوە، پەیوەندییان پێوەکراوەو سازو ئامادە کراون بۆ ڕۆژی خۆی. حەزدەکەین پێت بڵێین لەگەڵ لێدانی عێراقدا، لە سەرتاسەری عێراقدا

١-لەم مواجەهەیەوە لە (گۆڤاری سلێمانی)، ژمارە (٩٨-٩٩)ی ساڵی ٢٠٠٨ تا ڕۆژی هەینی (١٩٩١/١/٤)، بە دووبەش بڵاوکراوەتەوە بە پێشەکییەکەوە، کە بەپەسەندم نەزانی لەم کتێبەدا ئەو پێشەکییە بڵاوبکەمەوە.

راپەڕین دەبێت... زۆر نزیکە پەلاماری ئەم بەندیخانانە بدەن و بیان شکێنن، بەدڵنیاییەوە ئەم بەندیخانەیە دەشکێت و ئێوە دەرباز دەبن.

بەڵام ئەوە بزانن کە لەو ڕۆژەدا سەیارە نابێت، کەس ناتوانێت بەهاناتەوە بێت... دەبێت خۆتان لەناو خۆتاندا خۆتان ڕێکخەن، چوار چوار، پێنج پێنج، بکەونە یەك و ئاگاداری یەکتربن... هەر دەرچوون، بەپێ هەولبدەن لەناو بەغدا زوو دەرچن، وا دابنێن پێشمەرگەن و لە گەرمیانەوە دەچن بۆ قەندیل... دەبێت زۆر وریای خۆتان بن و هەولبدەن لەیەك دانەبڕێن. وتیان: لە ئێستاشەوە تا ئەو کاتەی لە عیراق دەدرێت، هەر مواجەهەیەك بۆمان کرا، سەردانتان دەکەین. نەشهاتین، بزانە ئێمە سەرقاڵین و بەباشی نازانین بێین. هەرچی بوو بەنامە ئاگادارت دەکەین. هەرچەندە هەردوو کەس هاتبوون بۆلام، بەڵام هاتنەکەیان وەکو ئەوە وابوو سەدکەس هاتبێت بۆ لام، چونکە مژدەی زۆر خۆشیان پێبوو.

## پێنجەم مواجەهە

**سێشەممە (١٩٩١/١/١)**

قاعەی (٨)، ژووری (١٢)

ئێوارەی دووشەممە شپرزەی پاککردنەوەی شوێن بووین بۆ ڕۆژی سێشەممە، شوێنمان پاککردەوە. خەیمەمان چاککرد. شەو هەر لەخەیاڵی هاتنی منداڵەکان و خەڵکدابووم. دەبێت چۆن بێن و کێ بێت؟ بەیانی سەعات (٦) مەستەر کرا... سەعات (٧) دەرگای ساحە کرایەوە. من خەریکی جێگاکەم بووم. زیندانییەکان زۆریان بەتەمای ئەوە بوون کە لە یەکی مانگدا لێبووردن دەرچێت و لەو چاوەڕوانییەدا دەژیان...

سەعات (٧,٥) ئەوانەی بۆ مواجەهە هاتبوون، هاتنە ژوورەوە...

(تایەرو عەلی خەلیفە) یەکەم کەس بوون هاتنە ژوورەوە، بە دوایاندا ئەمانەش هاتن (زەینەب، ئازاد، بابەعەلی، خاڵ شێخ ئەمین، شێنێ و شەنگە، کاکەم و براژنم، حاجی محەمەد، مەلا قادری گاوانی و کورەکەی، دەروێش حسێن، ئاریان عومەر، کاك سەرحەد، مستەفای حەمە سدیق خان، عەبدولکەریمی عەبدولقادری عەربەت، عوسمان عەربەتی، مەلاکەریمی سێتەڵان، حەمەڕەشید، حەمەنووری، کاك مەحمود جەلال و یەکێکی تر، حەسەن گەرمیانی، خەلیل وەندی، محێدین، سالاری کاك مەجید، نەجمەدین و یەکێکی

تر...) رۆژێکی هەورو باراناویی بوو...

لەم رۆژەدا ئێمە لە بەندیخانەی ئەبوغرێب ساڵی (٩٠)مان بەرێکرد، ساڵی (٩٠) بۆ ئێمە ساڵێکی پڕ مەینەتی و زۆر ناخۆشبوو، ساڵێك بوو لە ساڵە ناهەموارەکانی ژیانمان. ساڵێك بوو تەنانەت بەتەمای سەرمان نەماین، پێنج هاورێی خۆشەویستمان لێدابڕا، کە لەڕاستیدا چواریانم زۆر لەدڵدا شیرین بوو، هەرگیز لەیادم دەرناچن (جەبار، عەتا، ئەحمەد، محەمەد)، چونکە لە دەرەوەی بەندیخانەو لەناو بەندیخانە زۆر لەیەکەوە نزیکبووین و پەیوەندیمان لەگەڵ یەکدابوو، ئەمرۆ لەگەڵ ساڵی نوێدا ناخۆشترین هەواڵیان دامێ، کە ئەویش هەواڵی ئەو پێنج ئەستێرەیە بوو[1].

**چوارشەممە (١٩٩١/١/٢)**

ئەمشەو بارانێکی زۆر باری و ئەمڕۆش باران هەر بەردەوام بوو، ئەمرۆ مەلایەك لەدەرەوە هاتبوو، بەندەکانیان بۆ کۆکردنەوەو قسەی ئاینی بۆکردن.

شەو تا درەنگ گوێم بە رادیۆوە بوو، بۆ دەنگوباسی شەڕی خلیج، چەند هەواڵی جیاجیا هەبوو، مناوەرەی ئێران لەسەر سنوور... ناردنی فرۆکەی جەنگی بۆ تورکیا تا (٤٠) فرۆکە، خۆئامادەکردنی سوپای سووری بەهەموو چەکێکەوە بۆ شەڕی ناو عیراق. ناردنی (٣٠) باخیرەی جەنگیی بەهەموو تەقەمەنییەکەوە، چوونی (مەلیك حسێن) بۆ وڵاتانی ئەورووپا، بۆ مەبەستی ئاشتی، کردنەوەی ئیزگەیەکی نوێ بەناوی (دەنگی عیراقەوە)، لە سووریاو میسرو سعودیەو خلیجەوە. سەردانی سەرۆك بۆ بەسرەو کوەیت بۆ بەرەکانی جەنگی خەلیج.

**پێنجشەممە (١٩٩١/١/٣)**

ئەم شەوەش هەمان دەنگوباسی شەوانی پێشوو هەبوو، وەجبەیەك لەو زیندانییانەی ئیجازەیان هەبوو دابەزین. بارانی شەو هەر بەردەوام بوو.

باس هەرباسی شەڕەو گوێهەڵخستن بۆ دەنگوباسی شەڕ. گوێ بۆ رادیۆ راگیراو هەواڵەکان جیاجیا ئەمانەیان راگەیاند، کردنەوەی ئیزگەیەکی نوێ دژی عیراق، هاتنی (بیکر) بۆ ناوچەی خەلیج و بەنیازی هاتن بۆ عیراق، بڕیاری کۆبوونەوەی پەرلەمان دەدرێت، کە لە رۆژی هەینی

---

١-(ئەو پێنج ئەستێرەیە (٥) هاورێیمان بوون کە حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەردا درابوو. هەواڵمانزانی کە نامەردانە لە سێدارەیان داون)و هەواڵەکە لەناو برادەراندا بلاوبووەوە.

بۆ مەسەلەی خەلیج کۆببێتەوە، ناردنی (٤٠) فرۆکەی جەنگیی بۆ تورکیاو نیازی سوپای ئێران لە سنوورو چوونی وەفدێکی عیراق بۆ ئێران بۆ مەسەلەی دیل و سنووردیاریکردن و هاتنی ئێرانیان بۆ (نەجەف و کەربەلا) ناردنی هێزی بەردەوام بۆ خەلیج لەلایەن وڵاتانەوە.
لەم رۆژەدا ئەوەندە دەرگا نەکرایەوە، باران دەباری، بەڵام تەمومژو هەور بوو، خەریکی خوێندنەوەی رۆمانی (ئەندێشەی مرۆڤێك) بووم...

**هەینی (١٩٩١/١/٤)**
بەندیخانەی ئەبوغرێب
ئەمرۆش دەنگوباس هەر دەنگوباسی شەڕی خەلیج بوو، (بۆش) بڕیاری دا کە (٧-٩)ی مانگ (بیکر)و وەزیری خارجی لە سویسرا یەکتر ببینن بۆ مەسەلەی شەڕی خەلیج، ئەمرۆ رۆژێکی خۆشبوو، لەبەرئەوەی بەیانی مواجەهەیە تاقی ئێوارە خەریکی شوێن پاککردنەوە بووین و کەلوپەلم هەڵخست، چونکە رۆژەکەی زۆر خۆشبوو.

## شەشەم مواجەهە

**شەممە (١٩٩١/١/٥)**
لەم مواجەهەیەدا ئەم کەسانە هاتن، (محیدین، ئازاد، فازیل، بنار، بەهادین، عوسمان، مامۆستا سالح، عومەر، بەکر، کەمال، جەلال شازەمان)و یەکێکی تر، برادەری (مامۆستا عەبدوڵلا)و نامەیەکی (فەخرەدین)، فەوزی، عەمەر سەرکار، ئیبراهیم، برادەرێکی تر، خوشکەزاکەی حەمە تایەر، حەمەئەمین)، رۆژێکی هەورو سارد بوو. ئەمشەو بڕیاردرا کە وەزیری دەرەوە بچێت بۆ سویسرا بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ (بیکر) لە (٩)ی مانگ.

**یەکشەممە (١٩٩١/١/٦)**
ئەمرۆش هەواڵەکانی شەڕ هەروەکو خۆی وابوو، لەنێوانی بڕیاردانی گەڕانەوەو نەگەڕانەوەو شەڕو ئاشتیدا، بەڵام بەپێی وتاری سەرۆك کۆمار لە رۆژی شەشی مانگدا لەکاتژمێر (١١)ی بەیانی وا دەرکەوت کە سوورین لەسەر ئەوەی کە نەگەڕێینەوە لە کوەیت و بەپێی وتارەکە ئامادەبن بۆ شەڕو بەپێی هەواڵەکانی دەرەوەش سوورن لەسەر گەڕانەوە.
شەو و رۆژێکی تەماویی و هەورو شەونم بارییبوو، دەرگای ساحە لە کاتژمێری (١٢)ی نیوەڕۆ کرایەوە. گیروگرفتی نەبوونی غاز گەورەترین گرفتی رۆژانەی زیندانییەکانە.

**دووشەممە (١٩٩١/١/٧)**

ئەمشەو شەونمێکی زۆر بارییبوو، دەرگایان نەکردەوە تا سەعات (٩)ی بەیانی، کۆبوونەوەیەکیان کرد بە بەشەکەمان، ئەوەیان راگەیاند کە بەرێوەبەر گۆراوە هەواڵ و دەنگوباس هەر لەسەر شەڕی خەلیجەو یەك هەرەشە لەوی تر دەکات.

**سێشەممە (١٩٩١/١/٨)**

ئەمشەو شەوێکی ساردو تەماویی و هەور بوو، هەواڵەکانی شەڕی خەلیج هەروەکو جاران چاوەروانی کۆبوونەوەی هەردوو وەزیری دەرەوە دەکەن. شەش فرۆکەی سەمتی چوونە سعودیەو داوای پەنابەرییان کرد. ئەمرۆ لە نەخۆشخانەی رەشیدی سەربازییەوە، هاتن بۆ خوێن وەرگرتن و خوێنێکی زۆریان لەهۆزیندانییەکان وەرگرت. رۆژەکە رۆژێکی ساردبوو.

**چوارشەممە (١٩٩١/١/٩)**

ئەمشەو وەکو شەوەکانی دیکە شەوێکی ساردبوو. بارانێکی زۆر باری، هەواڵی شەڕی خەلیج هەرچاوەروانی کۆبوونەوەی هەردوو وەزیر دەکەن. جوولەکە لەمشەوەوە بەتەواویی خۆی ئامادە کردووە بۆ شەڕو زیاد لە چوار ملیۆن قیناعی دابەشکردووە بەسەر خەڵکەکەیدا. ئەمشەو وەزیری دەرەوە گەیشتە (جنیف) بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ بیکرو لەبەر ئەو ئوتێلەی لێی دادەبەزێت (کۆترێکی ئاشتی گەورەیان) کە درێژییەکەی مەترێکە، دروستکردووەو ئەمرۆ (محەمەد حەنحون)و ئەوانەی ئیجازە بوون گەرانەوەو (کاکەحەمە)یان بۆ ئیجازە بانگکرد لە بەشی ئیجازاتەوە.

ئەمرۆش دەرگایان نەکردەوە، غاز کەمەو ئێمە غازمان نەماوە، دوای نیوەرۆ کردی بەسایەقەو هەوایەکی ساردی هەڵکرد.

**پێنجشەممە (١٩٩١/١/١٠)**

ئەمشەو کاتژمێری (١٠) هەواڵەکانی دەرەوە رایگەیاند، کە دوای سێ جار کۆبوونەوەی هەردوو شالیار بەبێ ئەنجام لە یەك جیابوونەوەو نەگەیشتنە ئەنجام و (بۆش) دوای ئەو کۆبوونەوەیە گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانیی کردو هەروەها شالیاری عیراقیش. وەزیرەکانی ئەوروپا کە بریتیبوون لە دوانزە وڵات، داوایان لە شالیاری عیراقی کرد کە لەگەڵیان کۆببێتەوە، بەڵام رەتی کردەوەو لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵێکی زۆری وڵاتان و ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە بۆ بەرگریی لەشەڕ، بەڵام هەموو دیاردەکان وا دەگەیەنن، کە شەڕ دەبێت و هەموو لایەنەکانی بەشداریی ئەم ناوکۆکییە خۆیان ئامادە دەکەن. ئەمرۆ دەنگ بڵاوبوو کە رۆژی چوارشەممە (ت. ن)یان لێرە دیوە لە بەشی تاك و وای بۆ دەچین کە ئەو هاورێیانەمان لە سێدارەدرابن.

**هەینی (١٩٩١/١/١١)**

ئەمشەویش هەواڵەکان زیاتر هەر لەسەر شەڕی خەلیج بوون، سووربوونی عیراق لەسەر مانەوەی لە کوەیت و سووربوونی دەرچوونی لە کوەیت. ناردنی (١٠) باخیرەی پڕ لە سەربازی ئامادەکراو، کە هەر کەشتییەك هەزار سەربازی هەڵگرتبوو بۆ خەلیج. ئەمڕۆش ڕۆژێکی خۆش بوو. هەموو وڵاتانی ئەورووپا داوایان لە سەفارەتەکانیان کردووە، کە تا ڕۆژی شەممە لە عیراق بگەڕێنەوە بۆ وڵاتانی خۆیان، لەبەر مەترسی شەڕی خەلیج.

**شەممە (١٩٩١/١/١٢)**

ڕۆژ بەڕۆژ لە پانزەی مانگ نزیك دەبینەوەو ڕۆژانەش دەنگوباسی شەڕ گەرمتر دەبێت. ئەمشەو هەموو هەواڵەکان ڕایانگەیاند، کە (دیکویلار) بەرەو بەغدا دەکەوێتە ڕێ و بەنیازی وتوویژ بۆ مەسەلەی ئاشتی لە (جنیف) هەر نوێنەری دوانزە وڵاتەکەی ئەورووپای بینی و چوونەتە فەرەنساو میترانی بینی و بەرەو عەممان کەوتووەتە ڕێ و لەوێشەوە بۆ بەغدا. ئەمڕۆش ڕۆژەکەی زۆر خۆشبوو. خۆرەتاو و بێ هەوابوو. وەفدەکەی چووبوون بۆ ئێران و گەڕانەوەو وەزیری دەرەوەش گەڕایەوە، هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆ لەبەر چاو نییە لەڕووی ئاشتییەوەو کۆنگریس کەوتوونەتە کۆبوونەوەو بۆش لەگەڵ زۆربەی مامۆستایانی دانشگاکان و ئەندامانی کۆنگریس کۆبوونەوەی کردوبارو دۆخی شەڕی خەلیجی بۆ باسکردن، بەنیازی ڕازیبوونیان لەسەر شەڕو بڕیاردانی.

**یەکشەممە (١٩٩١/١/١٣)**

ڕۆژ بەڕۆژ سات بەسات لەکاتی دیاریکراو نزیك دەبینەوەو هەموو دنیا میلی ڕادیۆ باددداو چاوەڕوانی ئەنجامی ئاشتی و شەڕی خەلیجە. ئەمشەو (دیکویلار) گەیشتە بەغداو وەزیری دەرەوە بەخێرهاتنی کردو کۆبوونەوەی لەگەڵ کردو بڕیارە کە ڕۆژی (١٤) کاتی (١٠)ی بەیانی سەرۆك لەگەڵیدا کۆببێتەوە. ئەمشەو هەواڵەکان ئەوەیان گەیاند سەرۆکی سووری نامەیەکی ناردووە بۆ سەرۆك دەربارەی کشانەوەی لە کوەیت، هەروەها مەلیکی سعوودیەش بانگەوازێکی لە کۆنگرەی ئایینیدا کردووە بۆ سەرۆك کە بگەڕێتەوەو سەرۆکیش لە کۆنگرەی ئایینیدا لە بەغدا وتارێکی خوێندەوە سووربوونی نیشاندا لەسەر مانەوە لە کوەیت و بەرەنگاری بوونەوە بەرەو ڕووی دوژمن. ئەمشەو شەوێکی گەرم بوو. ئەمشەو خەفەر بووم لە چوارەوە بۆ شەش لەگەڵ سەعید. بێغازیی سەری لێ شێواندووین، چەند ڕۆژە لەبەر بێغازیی نانی کانە دەخۆین.

**دووشەممە (١٩٩١/١/١٤)**

ئەمشەو (دیکویلار) گەڕایەوە دوای کۆبوونەوە لەگەڵ وەزیری دەرەوەو سەرۆك و دوای کاتژمێری (١٢)، سەرۆك گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانیی بۆ سازدرا، لەگەڵ رۆژنامەنووسە عیراقییەکان بەهەڕەشەوە باسی شەڕی کردو جارێکی دیکە هەموو دوژمنەکانی دڵنیا کرد کە کوەیت دەکرێتە مەیدانی پێکدادان و شەر لەوێوە دەستپێدەکرێت. ئەمشەو نامەکەی سەرۆکی سووری و وەڵامەکەی سەرۆك لە ئیزگەو تەلەفزیۆنەوە خوێندرایەوە.

خەریکە رۆژەکان کورت دەبنەوەو دەگەینە ئەوەی کە بکەوینە ژماردنی سەعات و هیچ رۆشنایيەکی ئەوتۆ دیارنییە کە بەرەو ئاشتی بڕوات، ئەمرۆ ئەنجوومەنی نیشتمانیی کۆبوونەوەی کرد، دەربارەی بڕیاردانی شەڕ.

رۆژەکەی رۆژێکی ساردو باراناویی بوو. بارودۆخەکە بە تەواوەتی ئاوسە. ئەمشەو دکتۆر لە ئیزگەی مەککەوە گفتوگۆیەکی ئیزگەیی کردو بۆ ماوەی چارەکێك باسی بارودۆخی کوردو عیراق و گەلی کوردو عەرەبی کرد. وە باسی زۆر لایەنی دیکە. ئەمرۆ غازمان بۆهات و غاز زۆربوو. لەم رۆوە وڵاتی مەککەو ئەهرامەکان چەکی پاراستن دابەش دەکەن بەسەر خۆیاندا بۆ ئامادەبوونی شەڕ.

**سێشەممە (١٩٩١/١/١٥)**

ئەمشەو لەو شەوانەیە کە کاتژمێر دەژمێردرێت بۆ کۆتاییهاتنی کاتی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ مەسەلەی شەڕ، کات بەکات خەڵك و ئیزگەکان و هەموو دنیا دەژمێرن، ئەمشەو شەست فڕۆکەی جەنگیی کە سەری نەویان هەڵگرتووە بەرەو شەڕی خەلیج کەوتنە ڕێ و بە هەزاران سەربازو شەش کەشتی پڕ لە هەموو تفاقێکی شەڕ.

ئەمڕۆش رۆژێکی خۆش و هەتاوەو شەوەکەی زۆر ساردبوو.

ئەمڕۆ خەیمەکەی (ئەبو عەباس) دابووی پێم بۆ مواجەهە، بۆم گێڕایەوە. ئەمڕۆ کۆتایی مەوعیدی ئەنجوومەنی ئاسایشە دەربارەی گەڕانەوەی عیراق لە کوەیت و بەپێی هەموو هەواڵ و هەوڵدانەکان وا دەگەیەنێت کە هیچ چارەسەرێکی ئاشتییانە کەڵکی نەگرت و تەنها ڕێگا کە مابێتەوە، ڕێگای شەڕەو هەموو وڵاتان خۆیان ئامادەی شەڕ کردووەو تورکیا ڕایگەیاند، کە لەم شەڕەدا تازەترین چەك بەکاردەهێنرێت. ئەمڕۆ هەموو زیندانییەکان دوو دوو و سێ سێ قسەیان دەکردو لەو رۆژە دەدوان کە دەتەقێتەوە. (حوسەنیش) هەردەڵێت نابێت هەردەبێت چارەسەر بکرێت.

**چوارشەممە (١٩٩١/١/١٦)**

ئەمشەو سەعات بەسەعات هەموو دنیا لەگەڵ هەواڵەکان ڕووبەڕوو دەبوونەوە، هەواڵێك گەیشت کە هەوڵێکی فەرەنسی و چەند وڵاتێکی عەرەبی هەیە. بۆ چارەسەری ئاشتییانە،

بەڵام دواجار لەپێش وەقت بەچل دەقیقە لەندەن و مۆنتیکارلۆ رایان گەیاند، کە فەرەنسا لەو هەوڵەی کشایەوە. وا سەعات (١٢:٢٥) دەقیقەیەو گوێمان لە رادیۆ گرتووەو ئیزگەی بەغدا هەواڵەکانی دواقسەی لە دوانزەوە بۆ دوانزەو چارەك راگەیاند، کە سەرۆك چووە بۆ بەرەکانی جەنگ لە کوەیت و بەسرە. بۆ یەکەمجار ئیزگەی لەندەن رایگەیاند، کە بۆماوەی سەعاتێك بەرنامەکەی زیاد بکات. لە یانزەوە بۆ دوانزە. ماوەی هەشت سەعات درا تا سەعات (٨)ی بەیانی. ئەمڕۆ هەموو خەڵك چاوەڕوانی شەڕبوو.

**پێنجشەممە (١٩٩١/١/١٧)**

ئەمشەو لە سەعات دوو و نیو هێزەکانی ئەمریکا بەپەلە لە هەموو هێزەکانی عیراقیان دا لە هەموو لایەکەوە. بەهێرشی ئاسمانیی و بازۆك، لە هەموو بنکە سەربازیی و فڕۆکەخانەو پرۆژەکان درا، وە بەپێی هەواڵەکان هەموو ئەو شوێنانەی لێیاندرابوو، گرنگ بوون و هیچ وەڵامێکی عیراق نەبوو، تەنانەت ئیزگەو تەلەفزیۆن لێدرابوو، تەنها سەرۆك دوای سەعات دەی بەیانی وتارێکی خوێندەوەو بۆشیش لەلای خۆیەوە رایگەیاند، کە دەستیان بە عەمەلیاتی رزگارکردنی کوەیت کرد، بە ناوی (رەشەبای گەردەلوولی بیابان) کوتان بەدرێژایی رۆژو شەو بەردەوام بوو...

**هەینی (١٩٩١/١/١٨)**

ئەمشەو کوتانی بنکە سەربازیی و پرۆژە ئابووریی و سەربازییەکان بەردەوامبوو. ئەمڕۆ مواجەهە هەبوو، هیچ کەسێك بۆلای ئێمە نەهاتبوو. تەنها لە سلێمانییەوە برای کاك (جەبار) هاتبوو، لە کەرکوکەوە یەك کەس و خەڵکی بەغداو شوێنەکانی دیکەش زۆر بەکەمیی هاتبوون. کە لە سەعات (١:٥)وە ئەمڕۆش کوتان بەردەوام بوو. کارەبا نەبوو، ئاو نییە، خواردن نییە، ئەمڕۆ تەنها هەر زیندانییەو نان و نیوێکیان دەدایە.

**شەممە (١٩٩١/١/١٩)**

ئەمشەو کوتان بەردەوام بوو. ئاو و کارەبا نەبوو. زیندانیی یەك سەموونیان بۆ هێناو نیوەڕۆ لە سەعات (٣) برنجیان هێنا. ئەمڕۆ داوایان لە هەموو زیندانییەکان کرد، کە یەکی عەریزەیەك بۆ (تەتەوع) بنووسێت بۆ (تەتەوع)کردن و هەموو نووسیمان.

**یەکشەممە (١٩٩١/١/٢٠)**

ئەمڕۆش کوتان بەردەوام بوو. لە هەموو لایەکەوە. ئاو و کارەبا نییە، تەنها سەمونێك و یەك جار خواردن، ئەویش شۆربا... بە مووشەکەی زەوی بەزەوی درا لە سعودیەو جوولەکە.

**دووشەممە (١٩٩١/١/٢١)**

ئەمڕۆ هێزەکانی هاوبەش و هاوپەیمانان بەردەوام بوون لە لێدانی هێزەکانی عیراقی لە هەموو بەرەکانی جەنگەوە. فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لە بنکەکانی تورکیا. کەوتنە بۆردوومانکردنی کەرکوك و موسڵ و سنجارو سەرسەنگ و هەموو بنکە سەربازییەکانی ناوچەی عیراق.

کارەبا نەبوو، ئاو نەبوو، بەغدا وەکو چۆڵەوانی وابوو، ئێزگەی عیراق و تەلەفزیۆن لێبڕاوە، خەڵکەکە لە بارودۆخێکی زۆر نەفسیی ناخۆشدا دەژین. ئەمڕۆ بڕیاردرا ئەو دیلانەی دەستگیرکراون دەخرێنە ناو بنکە سەربازیی و مووشەکییەکانەوە.

**سێشەممە (١٩٩١/١/٢٢)**

ئەمشەو بەیانی (١٤)ی عیراقی دەرچوو. بە مووشەك لە سعودیە درا، لێدانی هێزەکانی لە هەموو بەرەکان و شارەکانەوە بەردەوامە. لەلایەن هێزی هاوپەیمانەکانەوە، بەغدا هەروەکو جاران لێدەدرێت، ئەمڕۆ بەزۆریی هێرش کراوەتە سەر ناوچەی کوەیت و دەریاو بەسرە. بەپێی هەواڵەکانی ئێزگەی هاوپەیمانەکان، تا ئەمڕۆ (١٠) هەزار دەرچوون کراوە، بۆ سەر بنکەی سەربازیی و مووشەکی و فڕۆکەییەکان و بەرەکانی جەنگ... ئەمڕۆ ئاو باشتربوو لە ڕۆژان، کارەبا هەرنییە. ئەمشەو هەموو ئێزگەو دەوڵەتە هاوپەیمانەکان نارەزاییان بەرامبەر عیراق دەرکرد، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکاندا. ئەمڕۆ (٢٣) سەربازیان لە دەریادا دەستگیرکرد. لەلایەن هێزی هاوپەیمانەکانەوە.

**چوارشەممە (١٩٩١/١/٢٣)**

ئەمشەو بە مووشەکی سکۆت درا لە جوولەکە، ئەم لێدانە بۆ جاری سێیەمە. ئەمشەو هەواڵەکان ڕایانگەیاند، کە ئەمریکا بڕیاریدا کە سەرۆك بگرێت، لەسەر ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ دیلەکاندا کردوویەتی، ئەمشەو ئێزگەکان ڕایانگەیاند، کە بەرەسمیی پەیوەندیی بە بەرگریکارانەوە کراوە، بۆ دانانی حکومەتی نوێ لە نوێنەری شیعەو کورد. ئەمڕۆ ئەو زیندانییە موجازانەی بەئیجازە ڕۆیشتبوونەوە بۆ ناو شارەکانی خواروی عیراق، گەڕانەوەو ڕایانگەیاند کارەبا نییە. قوتابخانەکان هیچیان نییە، لە هەموو شوێنە سەربازیی و مووشەکی و فڕۆکەخانەکان دراوە، بارودۆخی عیراق زۆر خراپە. لە مەدینە سەوەرەوە بە (پەنجا) دینار نەفەرێکیان گەیاندووەتە ئەبوغرێب.

**پێنجشەممە (١٩٩١/١/٢٤)**

ئەمشەو کاتژمێری (١٠:١٠) دەقیقە، بە مووشەك لە جوولەکەیان داو ئەوانیش بە مووشەك و فڕۆکە لە (١٠:١٥) دەقیقە بۆردوومانی بەغدایان کرد. لە (١٠:٢٥) دەقیقە لە ڕیازو عەرعەریان

دا بەمووشەك، ئەمشەو باران باری، ئەمشەو ئیزگەكان رایانگەیاند، كە شەڕێك لەنێوانی هەردوو هێزەكەدا بووە، شەش سەربازی عیراقی بەدیل گیراوە.

ئەمڕۆ یەك سالی رێكە من گیراوم، ئەمڕۆ لە قوتابخانە لە كاتژمێری سێ و نیودا لەكاتی تاقیكردنەوەی نیوەی سالدا، دوو جەندرمە هاتن و بەناوی بانگكردن بۆ كۆبوونەوەی بەڕێوەبەرەكان، هاوڕێشتمیانە ناو ئۆتۆمبێلێكی بەرازیلی و كردیانم بە بەڕێوەبەرێتیی ئەمنی سلێمانیدا، ئەمشەو ئیزگەكان رایانگەیاند، كە هێزە هاوپەیمانەكان ئەوە بەدرۆ دەخەنەوە، كە لە هیچ شوێنێكی هاولاتییان و شوێنە پیرۆزەكان نەدراوە. ئەمڕۆ رۆژێكی هەتاوی خۆش بوو، نە بەفرۆكە نە بەمووشەك تۆپبارانی بەغدا نەكرا. ئەمڕۆ بۆ یەكەمجار تەماتەو خورما هات بۆ فرۆشتن. كیلۆیەك تەماتە بە (٣) دینارو خورما بە (٢,٥) دوو دینارو نیو بوو.

ئەمڕۆ (٢) سەموونیان لەگەڵ شۆربای پیازدا دابەشكرد، ئەمڕۆ هەندێك پەتاتەمان هەبوو كوڵانمان و چێشتی قەرەخەرمانمان مابوو، هی (٢٣) مانگ و نیوەرۆ خواردمان.

## هەینی (١٩٩١/١/٢٥)

ئەمشەو تۆپباران هەبوو لەسەر بەغدا، بەڵام نەماندەزانی لە كوێوەیە، ئیزگەكان ئەمشەو رایانگەیاند، كە (٢٢) سەربازمان لە دەریادا بەدیل گیراوە، (٣٠)مان كوژراوەو سێ فرۆكەمان كەوتووەتە خوارەوە، لە دەوروبەری كوەیت. لە بنكەكانی سەربازیی كۆماریی دراوە. ئەمشەو ئیزگەكان رایانگەیاند، كە هێزەكانی عیراق خۆیان ئامادە كردووەتەوە. ئەم راگەیاندنە لەلایەن (ن.ب.ش.س)و مامەوە راگەیەندرا كە نزیكەی سەد هەزار خەڵكی كوردی ناوچەكانی خواروو، بەتایبەتی بەغدا روویان كردووەتە كوردستان و زووربەی ناوچەكانی كوردستان لێیان دراوەو خواردەمەنی كەمەو خەڵك شپرزەیەو خۆبەدەستەوەدانو پەیوەندیكردن لەناو سوپادا بۆناو ریزەكان و توركیا زۆرە، ئیزگەكان رایانگەیاند، كە ئێران و سوریا رازی نین بەوەی زەوی عیراق دابەش بكرێت. ئەم هەواڵە مەترسی خستە دڵمانەوە، لەسەر مەسەلەی خۆمان. بەپێی هەواڵەكان تۆپباران لەسەر كوەیت و دەوروبەری خەستكراوەتەوە، ئەمڕۆ رۆژێكی زۆر ساردبوو، ئەمڕۆ (٢) سەموون و برنج هەبوو، بۆ زیندانییەكان، رۆژێكی هەورو باران بوو.

## شەممە (١٩٩١/١/٢٦)

ئەمشەو هەواڵەكان هەروەكو شەوانی دیكە پڕبوو لە دەنگوباسی شەڕی دەریا... لێدانی سەربازی كۆماریی لەلایەن هێزە هاوپەیمانەكانەوە بەردەوامبوو. بەتایبەتی فرۆكەكانی فەرەنسا (٣) فرۆكەی لەسەر دەریا كەوتنە خوارەوە. (٢) بیری نەوت لەلایەن كوەیت و لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە تەقێنرانەوە. ئەمڕۆ رۆژێكی خۆش بوو.

**یەکشەممە (١٩٩١/١/٢٧)**

ئەمشەو هەواڵەکان ریانگەیاند، کە (٣) فرۆکە لەسەر بەرەکانی جەنگ کەوتنە خوارەوە و (٧) فرۆکەی جەنگیی عیراق لە ئێران نیشتنەوە، یەکێکیان کەوتە خوارەوە. لێدانی سەربازی کۆماریی بەردەوام بوو. ئەمشەو رایانگەیاند، کە ناوەکان بنووسن بۆ (تەتەوع، فیدائی، جەیشی شەعبی و قواتی مسلم). ناوەکان نووسران و بەیانی سەعات هەشت دەدرێن بە ئیدارە. ئەمرۆ رۆژێکی زۆر خۆشبوو. ئەمشەو بە پازۆکە لە سعودیە درا. ئەمرۆ ناوەکانیان کرد بەلیست بەسێ جۆر، (فیدائی، قوات مسلم، جەیشی شەعبی) بەسێ نووسخەو ئیمزامان لەسەر کردو پێش مەستەری ئێوارە تەسلیمی ئیدارە کرا. ئەمرۆ رۆژێکی خۆش بوو، هەتاو بوو، دەنگوباسی بیرە نەوتەکانی کوەیت لەسەر خەلیج و ئاگرتێبەردانی لە ئیزگەکانەوە بەردەوام بوو.

**دووشەممە (١٩٩١/١/٢٨)**

ئەمشەو ئیزگەکان رایانگەیاند، کە (٣٩) فرۆکەی عیراق چوونەتە ئێرانەوە. بە مووشەك لە سعودیە دراوە. دەنگوباسی نەوتی خەلیج بەردەوام بوو. بەهۆی باران لە بەهبەهانی، بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێ و ئەم بەیانییە دووجار فرۆکە هاتە سەر بەغدا. بەم برووسکەیە بڕیارە زیندانییەکان ئازاد بکەن:

**(امر السيد الرئيس القائد حفظه الله...**

**باخلاء السجون ويكون موقف السجين مرتبطا بولائه في الظرف الراهن، من خلال التطوع في الجيش الشعبي والجيش او العمل الفدائي. اعملوا فورا...).**

ئەمرۆ رۆژێکی خۆرەتاوی خۆش بوو.

**سێشەممە (١٩٩١/١/٢٩)**

ئەمشەو تۆپباران هەبوو. دەنگوباس رایگەیاند، کە سلێمانی و بەدرەو رانیە بۆردومان کراون و ژمارەی فرۆکەکانی ئێران گەیشتە (٦٩) فرۆکە، (٣٠)ی گواستنەوە، (٣٩)ی جەنگیی.

ئەمرۆ رۆژێکی خۆرەتاوی خۆش بوو.

**چوارشەممە (١٩٩١/١/٣٠)**

ئەمشەو دەنگی چەند مووشەکێك هات، لەوە دەچوو کە لێرەوە بیهاوێژن بۆ دوژمن.

ئەمشەو دەنگوباسەکان رایانگەیاند، کە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان کەرکوك و بەغداو بەسرەو چەند شوێنێکی دیکەیان بۆردوومان کردووە، لەوانە وەزارەتی پیشەسازیی و تەلەفزیۆنی کەرکوك و فڕۆکەخانەی کەرکوك، یەکێك لە دیلەکان لەو شوێنانەدا کوژراوە.

ئەمشەو راگەیاندرا، کە ژمارەی فڕۆکەکانی چوونەتە ئێرانەوە، گەیشتوونەتە (١٠٠) فڕۆکەو بیستوپێنجیان سیخۆن. ئەمرۆ هاتن بۆ خوێن وەرگرتن لە زیندانییەکان. ئەمرۆ دوای نیوەڕۆ دووکەڵێکی رەش چواردەوری بەغدای گرت. لە ئەنجامی لێدانی هاوپەیمانەکان، ئەمشەو لەلایەن هێزەکانمانەوە هێرشکراوەتە سەر هێزەکانی هاوپەیمانەکان لەناو ئەرازی سعودیە. بەدرێژایی بیست کیلۆمەتر، چوونە ناو شاری ساحلی سعودیە. ئەمرۆ لەزۆربەی بەش و رەدهەکان خوێنیان وەرگرت، پروپاگەندەی وا دەکرا کە رۆژی پێنجشەممە مەدەنییەکان دەردەکەن.

## مانگی (١٩٩١/٢)و ئێمەو ئەبوغرێب و دۆخی عیراق و مواجەهەی سەری مانگ

شەوی (١/١٧) کە هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بەناوی (گەردەلوولی بیابانە)ەوە. لە هەموو لایەك بە هەموو چەکێکی جەنگیی و لە چەندین قۆلەوە بەچەندین شێوە، کەوتنە لێدانی هێزەکان و دامودەزگاو پرۆژە پیشەسازیی و گرنگەکانی عیراق لە کوەیتەوە بۆ ناو عیراق، لێدان و پەلاماردانەکەیان زیاتر لە (١٠) رۆژی خایاند بەو هێرش و پەلاماردانە. هەموو هێزی سەربازیی عیراقیان کەنەفتکردو ناچاری کشانەوەیان کرد لە کوەیت و سوپاکەی بەشێوەیەك سەری لێشێواوەو شیرازەی سوپای لەیەکترازاوە، نەك بەوەی ناتوانێت بەرگریی بکات. بەڵکو نەیاندەتوانی خۆشیان دەرباز بکەن، لە بەدیلگرتن و کوشتن سوپا بەهێزو پرچەك و زەبەلاحەکەی عیراق، لێکهەڵوەشایەوەو پەرش و بڵاو بووەوەو هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە.

خەڵکی لەلایەك بەو لێدانە دڵخۆشبوون و لەلایەکی دیکەشەوە ترسی زۆریان هەیە، بەهۆی هێرشی بەردەوامەوە زیانی ماڵیی و گیانییان لێبکەوێت، ببنەقوربانیی ملهوریی و سەرکێشی سەدام و رژێمەکەی. کۆمەڵانی خەڵکی عیراق بەگشتیی لەو رۆژەوەی کە سەدام بەهێزی سەربازیی پەلاماری کوەیتی داو داگیری کرد. تێگەیشتن کە عیراق نانی شوانی خواردووە، بەم کارە نامرۆڤانەیەی، بریاری مەرگی بەدەستی خۆی دا، هەموو خەڵکی عیراق دەیانزانی ئەم رەفتارانەی بۆ ناچێتە سەرو کوەیت بەداگیرکراویی نامێنێتەوە، بۆیە لە رۆژی پەلاماردان و داگیرکرنەکەوە، لە چاوەروانی ئەوەدان، کە وڵاتانی دنیا بەتایبەتی ئەمریکا کە دەسەڵاتدارانی کوەیت سەر بەئەمریکا بوون و دەیانزانی ئەمریکا دڵسۆزی دۆستەکانییەتی رازی نابێت دۆستێکی وەکو کوەیتی بەو دەردە ببرێت. دەیانزانی هەموو وڵاتانی عەرەبی ئەو کردەوەیەی سەدامیان قبووڵ نییەو بەکارێکی ترسناکیان ئەژمار دەکرد، زۆر وڵاتیان دەترسان پەلاماری ئەوانیش بدات و وڵاتەکەیان لێداگیر بکات، بەتایبەتی (سعودیە). بۆیە لەسەر ئەمانە ئاوات و هیوایان هەڵچدەچنی و لە چاوەروانی وەڵامدانەوەدا بوون. بۆیە لە مانگی (٢)ەوە، لایەنە بەرهەڵستکارەکانی رژێم کەوتنە خۆکۆکردنەوەو خۆرێکخستن و بەرنامەدارشتن بۆ راپەرین و پەلاماردانی دامودەزگا حکومیی و حزبیی و رێکخراوەییەکانی بەعس. مانگی (٢) مانگێکی گرنگ و تایبەتە بوو لە مێژووی عیراقدا. مانگێکە بوو لەو مانگانەی دەسەڵاتی سی ساڵەی رژێمی بەعس تێدا بێدەسەڵات بووە، بەرامبەر بە سەرکوتکردن و ستەمکردن، بەرامبەر بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان. ئەو رژێمە کە ساتێك لە چەوساندنەوەی جەماوەر غافڵ نەبووە. لەم مانگەدا بێئاگا، لە هەڵسوکەوتی جەماوەرو خواخوایەتی بوو جەماوەر لێیان هەڵنەسن و پەلاماریان نەدەن... لە کوردستان

کۆمەڵانی خەڵك لەوپەڕی رقنەستووریی و داخ لەدڵیدان، بەرامبەر بەو رژێمەی کیمیاباران و ئەنفالی کوردستانی کردووە.

بەهەزاران هەزار گوندو شارو شارۆچکەی خاپوورکردووە، خەڵکەکەی راپێچی ئۆردووگای زۆرەملێ کردووە. بۆیە لە هەلێك دەگەڕان و چاوەڕوانی رۆژێك بوون تۆڵەی ستەم و ستەمکاریی لە بەعس و رژێمەکەی بکەنەوە..

بەپێی ئەو زانیارییانەی پێم گەیشتوون، لەگەڵ داگیرکردنی کوەیتدا سەرکردایەتی شۆڕش بە بەرنامەیەکی داڕێژراوی پێشمەرگانە، هەموو هێزی پێشمەرگەیان کۆکردووتەوەو رێکیان خستوون و لە ئێرانەوە گەڕاونەتەوە بۆ ناو کوردستان، قۆناغ قۆناغ لەگەڵ دۆخە ئاڵۆزەکەی عیراق و کوەیت و وڵاتانی دەوروبەرو دنیادا بەرەوپێشتر دەچن. وەکو پێیان راگەیاندووم (بەرەی کوردستانیی) دروستکراوەو بەنیازن بە هێزی بەرەیی بەرنامەکەیان جێبەجێبکەن.
ئێمە لەم بەندیخانەیەدا کە ئەو هەواڵانەمان پێدەگات، یان لە رێگای ئیزگەکانەوە دەبیستین خوێنێکی نوێ لە گیانماندا دەگەڕێ و ژیانێکی نوێ دەبینین... سەری مانگ، واتە لە (١-٢/٢)دا مواجەمان هات. ئەوانەی هاتبوون بۆلام ئەمانە بوون: (زەینەب، ئازاد، بەهار). لەبراو خوشك و خزمانم زۆر هاتبوون.

خواردنی زۆرو کەلوپەلی باشیان بۆ هێنابووم. باسی دۆخی سلێمانی و خۆ ئامادەکردنی شۆڕش و جەماوەرییان بە دووروودرێژیی بۆ کردم. نامەیەکی (کاك حەمەرەشید)و چەند برادەرو خزمانیان بۆ هێنابووم. هەڵمگرتن بۆ دوای مواجەهە. ئەوەی زۆر گرنگ بوو بۆم ئەوە بوو، کە لەو هاتنەیاندا نەوتیان بۆ (چۆلەکە) هێنابوو، چونکە نەوتەکە دەست نەدەکەوت. نازانم چۆن رێگایان دابوون بیهێننە ژوورەوە. ئەو چۆلەیە بۆکاتی بێغازیی بۆ ئێمە زۆر دەوری بینی. کاکەحەمە ژوورەکەی و شوێنەکەی باشتربوو. چۆلەو نەوتەکەی لە ژوورەکەی خۆی قایم کرد. ئەوکاتە هێشتا غازمان مابوو. کە مواجەهە تەواوبوو. مەستەریان کردینەوەو گەڕامەوە بۆ ناو ژوورەکە، زیندانییەکانی ناو ژوورەکە هەستیانکرد رەنگورووم باشەو روونە، پرسیان دەنگوباسی سلێمانی چۆنە؟ منیش بە کورتەیەك ئەوەی زانیم لەسەرم ناکەوێت، بۆم باسکردن. ئەوانیش مواجەهەیان هاتبوو. منیش لەوانم پرسی وەزعی بەغداو شارەکانی دیکە چۆنە؟ باسی بێئاویی و بێکارەبایی و لێدانە بەردەوامەکانی هاوپەیمانانیان کرد، شپرزەیی خەڵك بۆ دەستکەوتنی خواردن و پێداویستی رۆژانەی ژیان شپرزەیی دامودەزگاکانی حکومەتیان بۆ کردم، وتیان بە دووری نازانین کە خەڵك راپەڕێت و پەلاماری دامودەزگاکانی حکومەت بدەن. شەوم لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکاندا بەسەربردو شەوە مواجەهەیەکی دیکەم بەڕێکرد. نامەکەی (کاك حەمەرەشید) لاپەڕەیەکی ئەی فۆر بوو. ئەم دیوو ئەو دیوی نووسیبوو. کۆمەڵێك هەواڵی سەبارەت بە رێکخستن، خۆکۆکردنەوە، ئامادەباشی و پەیوەندیی بە چەکدارە کوردەکانی وەك (جاش)و مەفرەزەتایبەتەکان، موستەشارەکان، بەرپرسانی حکومەت، دابەزینی چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگە بۆ ناو شارۆچکەو ئۆردووگاکان، نزیکبوونەوەیان

له شاری سلێمانی و دابەزینی دەستەکانی پێشمەرگە بۆ ناوچەکانی شارباژێر، پێنجوێن، قەرەداغ، بازیان و گەرمیانی کردبوو، زۆر شتی تری نووسیبوو. کە هەرهەمووی هەواڵی دڵخۆشکەرو گرنگ بوون. نامەکە زانیاریی هەواڵی باشترو وردتری تێدابوو. لەو هەواڵانەی کە مواجەهەکەران بۆیان باسکردبووم. مانگی (۲)ش لێدان و کوتانی یەکە سەربازیی، دەزگاو پرۆژە پیشەسازیی، ئیستخباراتی، ئەمنی، موخابەراتی و گرنگەکان بەردەوامە. ئێمەش کێشەی بێتاویی و کارەبایی رووی تێکردووین. حکومەت بەهۆی قەدەغەکردنی سووتەمەنییەوە... هەموو جوولەیەکی لەناو بەغداو شارەکانی عیراقدا راوەستانووە. لە ناوەراستی مانگی (۲)دا. عیراق رازی بوو بەوەی لەسەر هەوڵەکانی سۆڤییەت کە چاویان بە (یەڤگینی بریماکۆفی) نێردراوی (گۆرباتشۆف) بکەوێت و (بریماکۆف) ۲/۱۲ گەیشتە بەغداو لە کۆشکی میوانداریی لە ناوەراستی بەغدا سەدام پێشوازیی لێکرد، نەك لەو حەشارگە پتەوەی کە لەکاتی جەنگەدا تێیدا دەژیا...

(بۆش لە راگەیاندنێکدا داوای لە سوپای عیراق و گەلی عیراق کرد، کە جڵەوی کارەکان بەدەستەوەبگرن و سەدام حوسێنی دکتاتۆر ناچار بکەن واز لە دەسەڵات بهێنێت). ئەم راگەیاندنەو داواکارییەی بۆش، ئێمەی لە بەندیخانەوە دڵخۆشکرد، کە بەئاشکرا ئەمریکا داوا لە کۆمەڵانی خەڵکی عیراق و سوپاکەی دەکات، دەسەڵات لە سەدام وەربگرنەوەو رژێمی دکتاتۆریی لەناوبەرن. بۆچوونمان وابوو بەم داوایە خەڵکی داخ لەدڵ و رقئەستووری بەغدا زیاترو باشترو زووتر خۆیان بۆ لەناوبردنی بەعس و رژێمەکەی کۆدەکەنەوەو بەوەش ئێمە لەم زیندانە دەرباز دەبین.

بەدوای هاتنی (بریماکۆف)دا لە ۱۹۹۱/۲/۱۸ (تاریق عەزیز) چوو بۆ مۆسکۆ. رایگەیاند، کە بەتەواویی پێشنیازەکانی سۆڤییەت رازین بەکشانەوەی بێ مەرج لە کوەیت.

زیاتر لە چوار هەفتە فرۆکەکانی هاوپەیمانان بەشێوەیەکی رێکوپێك و بە بەردەوامی بۆمبابارانی سەرجەم ئامانجە سەربازیی، سیاسیی، ستراتیژیی و ئابوورییەکانی لە عیراق و کوەیت-دا کرد، لەو چوار هەفتەیە بەشەو رانەدەوستاو بە بەردەوامی بۆردوومانی وێرانکەرانەی سەرجەم بنکە گرنگە کانی دەکرد. کە ئەو لێدان و بۆردوومانکردنە، کارێکی بە سەرجەم هێزەکانی عیراق کرد. کە تواناو هێزی بەرگریکردنیان تێدا نەما، بەڵام (سەدام) ئەو بەڵێنەی بە سۆڤییەتییەکانی دا، جێبەجێ نەکردو ئامادە نەبوو لە کوەیت بکشێتەوە. بۆیە هاوپەیمانان لە رۆژی شەممە (۲/۲۳) رایانگەیاند، کە تا کاتژمێر هەشتی شەو بەکاتی عیراق لەسەر (سەدام) رادەوەستن بۆ کشانەوەی لە کوەیت، کە بەبێ مەرج دەبێت بکشێتەوەو رایانگەیاند، دەبێت سەدام بەئاشکراو بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك. بەو مەرجانە رازی بێت و رابگەیەنێت کە دەکشێتەوە. ئەگەر نا بەهێزی سەربازیی لە کوەیت دەریدەکەین. سەدام گوێی بەمەش نەدا، بۆیە لە رادیۆکەمەوە گوێم لێبوو، لە ۲/۲٤ (بۆش) فەرمانی بە (نۆرمان شوارتشکۆف)دا کە فەرماندەی باڵای هێزی هاوپەیمانەکان بوو، لە (سوعدیە). کە هەموو

هێزەکانی بەردەستی بەکاربێنێت، لەوانەش هێزە زەمینییەکان بۆ دەرکردنی سوپای عیراق لە کوەیت. دوای ئەو فەرمانە (شوارتشکۆف) کەوتە جێبەجێکردنی ئەرکە سەربازییەکانی و لەماوەی کەمتر لە (٤٨) کاتژمێری جەنگ. بڕبڕەی پشتی سوپای عیراق بەتەواویی شکاو و سوپای عیراق ناچاری دەرپەڕاندن لە کوەیت کرا.

بەپێی ئەو هەواڵانەی بڵاودەکرانەوە، لە ئەنجامی ئەو پەلامارو هێرشەی هێزەکانی هاوپەیمانان ڕۆژی ٢/٢٤ (٢٠٠٠٠) هەزار سەرباز بەدیل گیران و (٣٧٠) تانك تێکشکان و (٧) فیرقەی عیراقی لێکهەڵوەشان و توانای شەڕو بەرگرییان نەماوە.

(سەدام) دوای ئەو شکستە گەورەو ئابڕووبەرە، هاتە قسەو تێیدا فەرمانی بە فەرماندە سەربازییەکانی کرد، کە فەرمانەکەی بەم شێوەیە ڕاگەیاند: (بەشێوازێکی ڕێکوپێك بکشێنەوە ئەو شوێنانەی کە بەر لە ١٩٩٠/٨/١ لەبەردەستیاندا بووە،... )و لە ٢/٢٦ سەدام ڕایگەیاند، کە هێزەکانی عیراق لە ماوەی (٤٨) کاتژمێری داهاتوودا کشانەوەیان لە کوەیت تەواو دەکەن، سەدام بۆ هاوڵاتییانی عیراق وتەیەی بڵاوکردەوەو وتی: (هاوڵاتییانی خۆشەویست، چەپڵە بۆ سەرکەوتنەکانتان لێبدەن... ئێوە ڕووبەڕووی هەموو دنیا بوونەتەوە. ئەی عیراقییە مەزنەکان ئێوە سەرکەوتن. هیچ شتێك لە سەرکەوتنی شکۆدار خۆشتر نییە...).

بەپێی هەواڵەکان کە بە بەردەوامی گوێبیستیم. ڕاگەیەندرا، کە لەکۆتایی کشانەوەی سوپای عیراق لە کوەیت زیانەکانی سوپای عیراق بەم شێوەیە ڕاگەیەندرا، (٥٠) پەنجا هەزار دیلی سەربازیی، (٨) فیرقەی سەربازیی تێکشکاو توانای هیچیان نەما، تێکڕا زیانەکانی عیراق بە (١٥٠) هەزار کەس خەمڵێنرا. دوای ئەو پەلامارە گەورەیەی هێزەکانی هاوپەیمانان و دەرپەڕاندنی هێزو سوپای عیراق لە کوەیت، بۆش لە ڕاگەیاندنێکدا بڕیاری کۆتایی شەڕی داو وتی:

(کوەیت ئازادکرا... سوپای عیراق بەزێنرا... ئامانجە سەربازییەکانمان هاتنەدی. سەرکەوتنێك بوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی و بۆ دەسەڵاتی یاسا...).

سەدام لە وەڵامی بۆشدا ڕایگەیاندو وتی: (ئەی عیراقییەکان ئێوە سەرکەوتن، عیراق ئەو سەرکەوتووە بەتوانایە بوو، کە لە بەرامبەری ئیمپراتۆریەتی جیهانیی ڕاوەستاو بەرگریی کردو لەگەڵ (٣٠) دەوڵەتی دنیادا...).

بەپێی هەواڵەکانی کۆتایی شەڕ ڕاگەیەندرا، کە عیراق لە (٤٣) فیرقەی سەربازیی، تەنها (٧) فیرقەی توانای سەربازییان ماوە. لە (٨٠٠) کاتژمێردا هێزەکانی هاوپەیمانان (٧٣٧٠٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەی خاکیان داگیرکردو دەست بەسەرداگرت، کە (١٥٪) لەناو خاکی عیراقدایە.

بەرەسمیی کاتژمێر (٨)ی بەیانی ڕۆژی (٢/٢٨) شەڕ ڕاوەستا. بەپێی هەندێك هەواڵ کە گوێم لێیە. دیلی عیراقی لە (١٠٠) هەزار تێپەڕی کردووە، ژمارەی کوژراویشی بە (١٧٥) هەزار مەزەندە دەکرێت، شەش هەفتە بە بەردەوامی لە هێزەکانی عیراق لەناو کوەیت و ناو

عیراق درا. ئێمە لە بەندیخانە بەوە زۆر دڵخۆشین، کە ئەو سوپا زەبەلاحەی عیراق کە چەندین ساڵ پەلاماری خەڵکی عیراق و ئێران‌و کوەیت و کوردستانی دەدا ئا ئاوها تێکبشکێنرێت و لێکهەڵوەشێت، ئەم دڵخۆشییە بە تەنها ئێمەی کورد نین، لەم بەندیخانەیە هەست دەکەین، عەرەبەکان و تورکمانەکان و تەنانەت ئەوانەشی کە پێش دەستگیرکردنیان پلەو پایەی حزبیی و حکومیی و سەربازییان هەبووە، زۆر لە ئێمە پرترو بەپەرۆشترن، لە ناخیانەوە بەو دۆخەی تووشی سەدام و رژێمەکەی بووە، شادمانن، هەرچەندە زۆریشیان لەوە دەترسن ئەگەر لە بەندیخانەئازادبن و بچنەوە ناو کەسوکاریان لە دەست خەڵك قوتار نابن و تووشی چەرمەسەریی دەبن.

## نیوەی مانگی (٢)و مواجەهەیەکی دیکە

هەرچەندە لێدان و پەلاماردانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بۆسەر دامودەزگا سیاسیی، ئابووریی، ستراتیژیی و پیشەسازیی و سەربازییەکانی عیراق بەردەوام بوو، عیراق بەگشتیی لەژێر شاڵاوی ئاگرو ئاسندا دەژیا. کوردستان تا رادەیەك لە ئارامیدابوو. هەرچەندە ڕێگاوبان بەهۆی هێرشەکانەوە پڕ مەترسیی بوون، هاتوچۆ کارێکی ئاسان نەبوو. لەگەڵ ئەوانەشدا ئێمە هەر چاوەڕوانی هاتنی کەسوکارمان دەکرد، تامەزرۆی هاتنیان بووین... ڕۆژی پێش مواجەهە خۆم ئامادەکرد. لە ساحە شوێنێکم پاککردەوە. بەونیازەی مەزەندەم دەکرد کە مواجەهەکارانم زۆربێن. شەو هەر لەبیرکردنەوەی ئەوەدابووم بەیانی دەبێت کێ بێت بۆ مواجەهە. دەبێت ڕێگاوبان وابێت کەپەکی هاتنیان نەخات؟ شەو وەکو شەوانی تر بوومەوە بە هاوڕێی رادیۆکەم و لە کاتژمێر دوانزەوە کەوتمە گوێگرتن لە هەواڵ و راپۆرتەکانی ئێزگەکانی مۆنتیکارلۆو ئیسرائیل و لەندەن. دەنگی ئەمریکاو ئێزگە عەرەبییەکان و ئەو ئێزگانەی کە وەکو موعارەزە لەپێش جەنگ و کاتی جەنگەکەدا دامەزرابوون.

هەموو هەواڵەکان تەئکیدیان لەسەر بەردەوامی لێدان و وێرانکاریی دامودەزگاکانی عیراق لە کوەیت و ناو عیراق و پەکخستنی هێزو توانای سەربازیی عیراق دەکردەوە. بەپێی هەواڵی هەندێك ئێزگە، هێزی هاوپەیمانان لەچەند سەربازگەیەکی عیراقیان داوە لەناوچەی کوردستان و تۆپبارانیان کردوون و قوربانیی مرۆیی لەو هێرشانەدا باس نەدەکرا. بەهەرحاڵ لەگەڵ راپۆرت و هەواڵەکاندا خەو بردمییەوە. بەیانی کە بەئاگاهاتم رادیۆکەم هەر ئیشی دەکردو نەمکوژاندبووەوە. کاتژمێر پێنجی بەیانی، لەخەو هەستام. جارێکی دیکە گوێم لە هەندێك ئێزگە گرت، بۆئەوەی خۆم بۆ (مەستەر) ئامادە بکەم، رادیۆکەم حەشارداو کەوتمە خۆسازدان. کاتژمێر (٦:٥) مەستەریان کردو لە کاتژمێر (٧:٥) دەرگای هۆڵ کرایەوە. چوومە خوارەوە کاکەحەمە پیاسەی دەکرد. خۆی گۆڕیبوو. خۆگۆڕینێکی وا دەتوت بەنیازە ژنی بۆ بگوێزنەوەو کچەجافێکی بۆ دابەزێنن. مشکییەکی سەوزی بەسەرییەوە بەستبوو. دەستێك جلی جوانی پاکی لەبەرکردبوو. تەراشێکی خۆی ئاسایی کردبوو. کە چوومە بەشەکە رۆژباشی لێکردم و وتی: دەنگوباس چییە؟ دەبێت ئەم سەگبابە لەناوبەرن؟ بەکورتی هەندێك لەو هەواڵانەم پێ وت، کە شەو و بەیانییەکەی لە ئێزگەکانەوە وەرمگرتبوون. وتی: دەبێت ئەمرۆ کەس بێت بۆ مواجەهەمان؟ من چاوەڕێی کورەکەم دەکەم. سەربازەو لە دەوری بەغدایە. ئەگەر سەلامەت بێت، کەس نەیەت ئەو دێت بۆلامان.

لەم قسەنادا بووین. (کورەکەی کاکەحەمە) پەیدابوو. پرسیارمان لێکرد کەس بۆ مواجەهە هاتووە؟ وتی: خەڵك زۆر هاتوون و خەریکی هاتنە ژوورەوەن. منداڵەکانی تۆم بینی لە هاتنە ژوورەوەدا بوون. کاکەحەمەو کورەکەی بەرەو ژوورەکەی رۆیشتن. بە تەنها مامەوە. کاتێکمزانی (مارف و کامەران) پەیدابوون، ئەوانیش خۆیان گۆڕیبوو، بەنیازی

ئەوەی مواجەهەیان دێت. کەوتینە پیاسەکردن و ئەوەندەم زانی (ئازادو بەهار) هاتنە ژوورەوەو بەدوایاندا (زەینەب، شێنێ، ژیر، محێدین، لەعلی، شوکری، بەهادین، مەلیح، فەوزی، کاکەم، حەپسە، براژنە ئامینم، فاروقی پوورە کافیم، ناسحی شێخ مستەفا، چەند خزم و کەسێکی دیکە) پەیدابوون و چوونە حەوشەکە. شتی زۆرییان بۆ هێنابووم، لە خواردن و میوەو وشکەی جۆراوجۆر... محێدین وتی: بۆیە شتی زۆرمان بۆ هێناویت، نەوەکو لەسەری مانگدا نەتوانین بێینەوە بۆ لات. هەولبدە دەست بەشتەوە بگریت. با شتت لێنەبڕێت. (زەینەب) وتی: شەکروچایی تەواوم بۆ هێناویت، کاکلەگوێز، هەنگوین، مرەبا، پەنیر، سەتلی ماست، برنج و رۆنی خۆماڵی زۆرم بۆهێناویت. ئەگەر دەستیان پێوە بگریت، بەشی زیاتر لە (٣) مانگت دەکات، تەنانەت راشی و دۆشاویشم بۆ هێناویت. کاتێکمزانی دەستی برد بۆ ئەو شوێنەی کە نامەکانی تێدا هەلگرتبوو، کۆمەلێك نامەی دایە دەستم، وتی: نامەی (کاك حەمەنووری) تێدایە (کاك حەمەرەشی و کاك نووری) زۆریان حەزدەکرد بێن، بەلام زۆرسەرقاڵ بوون و بۆیان نەکرا بێن.

نانمان ئامادەکردو نانێکمان بەیەکەوە خوارد... کەوتنە باسکردنی بارودۆخی کوردستان، بەتایبەتی شاری سلێمانی و دەورو بەری. وتیان پێشمەرگە بەتەواویی لە شارەکان نزیکبوونەتەوەو هەندێك دەستەی پێشمەرگە بە نهێنی لەناو شارەکاندان. بەهەموو شێوەیەك چ خەلکەکە، چ پێشمەرگەو چ رێکخستنەکان، تەنانەت جاشەکان لە ئامادەباشیدان و چاوەروانی فەرمانی سەرکردایەتین. (محێدین) وتی: نەخشەیەکی زۆرباش دانراوە. کە بە بەرنامە شار بەشار پەلامار بدرێت و ئازاد بکرێت، بۆ هەموو سەربازگە سەربازییەکان هێزی پێشمەرگە دانراوە. دۆخەکە لەراستیدا لە ئان و ساتدایە بۆ تەقینەوەو پەلاماردان. پێم وت: ئاگاداری کورەکان بن. گەنجن بە گەنجێتیان پەلامار نەدەن و لەناوبچن. هەرچی دەکەن با لەگەل کاك حەمەنووری و کاك حەمەرەشیدادا بیکەن، ئەوان شارەزان و دەزانن.

(شوکری) هەر تاونەتاوێك باوەشی پێدادەکردم و ئەملاو ئەولای ماچدەکردم و دەیوت: ئەم ماچەیان هی (دایکمە) کاکەگیان بەقوربانت بم ئەگەر پەلاماری بەندیخانە درا ئاگاتان لەخۆتان بێت. ئازاد، بەهار، ژیر، شێنێ و بلێسە هاتنە لامەوەو یەکەیەکە باوەشیان پێداکردم و ئەوان منیان ماچ دەکردو منیش ئەوانم ماچ دەکرد. هەندێك مەدالیام بۆ دروستکردبوون. خۆم نا بۆم دابوون بەدروستکردن. مەدالیاکان لە زەنگیانە دروستکرابوون و جزدانیشیان تێدابوو. ناوەکانیان لەسەر نووسرابوو. یەکێکیان هی (زەینەب) بوو. نووسرابوو (دایکی بەخشی) دام پێیان. دیاربوو زۆریان پێخۆشبوو. (بەهار) وتی: ئەمە لەناو نابەم مادام ناوی خۆمی لەسەرەو لێرە دروستکراوە. یەکێك لە مەدالیاکان بۆ (بەخشی)بوو. زۆر تامەزرۆی بینینی بەخشی بووم. لەبەرئەوەی دەبوو بچووایە بۆ خزمەتی سەربازیی و نەچووبوو. نەیدەوێرا سەرم لێبدات لەو رۆژەوەی گیرابووم، تا ئەم مواجەهەیە یەکترمان نەبینیبوو، زۆرم بیردەکرد (بەخشی)هەر لە یەکەم مواجەهە سەعاتێکی بەدیاریی بۆ ناردم، منیش ئەو

مەدالیایەم بۆ دروستکرد کە ناوی خۆی لەسەر نووسرابوو.
مواجەهە تەواوبوو. یەك بەدوای یەکدا کەوتنە رۆیشتن و دواکەس کە رۆیشتن زەینەب و منداڵەکانم بوون و یەکەیەکە یەکمان ماچکردو خواحافیزیمان لەیەك کرد.
دوای تەواوبوونی مواجەهە (مەستەر) کراو کە گەڕاینەوە (کاکەحەمەو مارف) وتیان مواجەهەیەکی خۆشبوو. هەرهەمووماں کەسوکارمان هاتبوو. ئەوانیش هەر یەکەیان باسی بارودۆخەکەو باشیی دۆخی کوردستانیان دەکرد. کوڕەکەی (کاکەحەمە) باسی وەزعی سەربازیی و لێدانەکانی هاوپەیمانانی بۆ کاکەحەمە کردبوو. کاکەحەمە لەوپەڕی زەوقدابوو.
وتی: هەرچەندە نانێکم خواردووە، بەلام حەزم لە خواردنە، دەڵێن چی نانێك بخۆین. وتم: با شتەکان تاقەت بکەین دوایی نانێکی باش دەخۆین... شتەکانمان ڕێکخست و نانمان گەرم کردەوەو سێ قۆلیی نانێکی باشمان بە زەوقەوە خوارد، لەو میوەیەی بۆمان هاتبوو، میوەشمان خوارد. خواردنی وشکەمان لە باوەڵەکەی خۆم و باوەڵەکەی کاکەحەمەدا هەڵگرت. وتم: کاکەحەمە ئەمانەی لەم باوەڵەی مندایە دەستی لێنادەین وا حیساب دەکەین ئەو شتانەمان نییە. بۆ ئێوارەش شفتەمان گەرم کردەوەو شێومان کردو چایەکی باشمان لێناو چەند چامانخواردەوە.
شەویش لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشتم و کەوتمە کردنەوەی نامەکان و یەکەیەکە دەستم بە خوێندنەوەیان کرد. لەگەڵ نامەکانیشدا شەوانە مواجەهەیەکم کردو کۆمەڵێك هەواڵ و دەنگوباسی خۆشتریان لە نامەکاندا بۆ نووسیبووم. بەتایبەتی نامەکەی کاك حەمەنووری کۆمەلێك هەواڵی وردو سەرنجراکێشی تێدابوو. چەند نووکتەیەکی خۆشی بۆ نووسیبووم، کە هەر نووکتەیەکی رۆژگارێکی ژیانمانی دەهێنایەوە یاد. زیندانییەکانی ژوورەکەم. دەیانبینم ئەوانیش دڵیان خۆشەو دیارەو زانیاریی زۆرییان بۆ هاتووە، لەسەر وەزعی بەغداو باسی ئەوەیان کرد کە ئێستا نە کارەباو نە ئاو نە سووتەمەنی وەکو بەنزین و باسی بڵاوبوونەوەی فەسادو بێ ڕەوشتییان دەکرد، کە بەهۆی گرانیی و نەبوونییەوە دووچاری هاوڵاتییانی بەغدا بووەتەوە. لەدوای سەعات دوانزەوە، بوومەوە بە هاوڕێی رادیۆکەم و دەستم بە گوێگرتن کردەوە. ئەمشەویش لەگەڵ گوێگرتنی رادیۆکەمدا خەوم لێکەوت و بەیانی کە هەستام رادیۆکەم هەر ئیشی دەکرد. ئەمرۆ زۆر حەزمان لە ساحەیە. بۆئەوەی گوێبیستی دەنگوباسی زیاتر بین، بەلام ساحە نەکرایەوە. لە هۆڵەکەو ساحەکەمان زیندانییەکان لە مقۆمقۆدان. دیارە. بەتەمای دۆخێکی نوێ بوون...
لەدوای مواجەهەوە، رۆژو کاتژمێرمان بەرێدەکردو شەوانەش بەهۆی رادیۆکەوە جۆرەها هەواڵ و دەنگوباسمان دەبیست، کە لە بیستی مانگ تێپەڕین. هەڕەشەی بۆش و هاوپەیمانان لەزیادبووندا بوون. لێدانیان بەردەوام بوو. کێشەی بێکارەیی و بێئاویی ئێمەشی شپرزەکردووە. کاتێك بۆش دوا ئینزاری دایە عیراق بۆ کشانەوەو نەکشایەوە، بەدوایدا بە

هێرشێکی چڕوپڕو بێدەست پاراستن بەشێوەیەك لە هێزەکانی سوپای عیراقیان دا لە کوەیت، یەکسەر هێزەکە تێکشکاو ناچاری ڕاکردن و خۆدەربازکردن کراو، کوەیتیان جێهێلاو بە شکانێکی زۆر خراپەوە کوەیتیان چۆلکرد، (سەدام) دوای ئەو تێکشکانە ئینجا هەر بەناو بڕیاری چۆلکردنی کوەیتی داو و داوای لە فەرماندەکانی کرد کە کوەیت جێبهێلن و ڕایگەیاند کە سەرکەوتوون. لەکاتێکدا هێزەشکاوەکەی عیراق بەرەو عیراق دەهاتەوەو هێزەکانی هاوپەیمانان لەو هێزە شکاوەشی بەخراپیی داو کاتێك بەرایی هێزە شکاوەکە گەیشتنە ناو شاری (بەسرە). خەلکی بەسرە ڕاپەڕین، ڕاپەڕین لە بەسرەوە دەستیپێکردو ڕاپەڕینەکەیان بەناوی (ڕاپەڕینی شەعبان)ەوە ناونا. بەدوای بەسرەدا هەردوو شارە شیعەکەی (نەجەف و کەربەلا) ڕاپەڕین و بەکوردی ڕاپەڕینی خوارووی عیراق کلپەی سەندووە، کۆمەلانی خەلك زۆر داخ لەدلانەو پەلاماری بارەگا حزبیی و حکومییە سەرکوتکەرەکانی داوەو دەیانەویت لەو ڕاپەڕینەدا تۆلەی چەند سالەی خۆیان لە سەران و پیاوانی بەعس و ڕژێمەکەی بکەنەوە. بەکورتی لە (٢/٢٦)ەوە ڕاپەڕینێکی جەماوەریی لە زۆربەی شارەکانی خواروو و ناوەڕاستی عیراق بە بەغداشەوە دەستیپێکردووە، بەپێی هەوالەکانی کە لە ئیزگەکانەوە وەری دەگرم، ڕاپەڕیوەکان بەهەزاران هەزار لە پیاوانی بەعس و سەرانی ڕژێمیان دەستگیرکردووەو وەکو حەیوان سەریان دەبڕن و دەیانکوژن. لەپال ئەو کوشت و کوشتارەدا، دەیانیان دەچنە پال جەماوەرو لەگەلیاندا بەشداریی ڕاپەڕینیان کردووەو ڕژێم و حزبەکەیان بەجێهێلا... ئەم دەنگوباسە لە مانگی دوودا تا سەری مانگ درێژەی کێشا.

# مواجەهەی سەری مانگ و هەواڵەکان

لەسەری مانگدا زەینەب و منداڵەکان و محیّدین و چەند کەسی دیکە هاتن بۆلام، لەبەرئەوەی زۆر نەبوون، هەر لە ژوورەکەی خۆم دانیشتین، دوای حەوانەوەیان، کەوتنە گێڕانەوەی هەواڵ و دەنگوباسی سلێمانی و کوردستان. هەواڵەکان هەرهەموو ئەوەیان دەگەیاند، کە بەدوای راپەڕینی ناوەراست و خوارووی عیراقدا. لە کوردستانیش نەخشەو پلانی راپەڕین دانراوە. وتیان پێشمەرگە لە شارەکان نزیکبوونەتەوەو بەرەی کوردستانیی راگەیەنراوەو بە سەرپەرشتی بەرە راپەڕین دەکرێت، بڕیارە هەموو حزبەکان بەشداریی بکەن. خەڵك زۆر لەسەرپێ و ئامادەن و خواخوایانە بڵێن ئادەی. ئیزگەکە، واتە(ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان) ئیش دەکات و باسی راپەڕینەکانی خوارووی عیراق و تێکشکانی سوپای عیراق دەکات، بەو ڕێگایانە هانی جەماوەر دەدات کە سازو ئامادە بن بۆ راپەڕین. محیّدین وتی: لەناو شارەکاندا ڕێکخستنەکان بەرنامەی چڕوپڕو هەمەلایەنەیان داناوە، دابەشکراون و چەکی زۆرر هاتووەتە ناو شارو بەسەریاندا دابەشکراوە، پەیوەندیی بە موستەشارو چەکدارەکانی رژێمەوە کراوە، وتی: وەکو دەڵێن چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگەش هاتوونەتە ناو سلێمانی و ناو ئۆردووگاکان و شارۆچکەکان و خۆیان حەشارداوە.

شتی زۆریان لە خواردن و پێداویستی هەمەجۆریان هێنابوو. وتیان دەست بەشتەوە بگرە، هەموو شت گرانبووەو دەستیش ناکەوێت. گەنم و خواردنی وشکە زۆر زۆرگرانە، بەڵام ئێمە باشین و لەهیچ پەکمان نەکەوتووە... وتیان حکومەت زۆر مەترسی پەیداکردووە لەیەك پێ خۆی قایم دەکات و خۆی کۆدەکاتەوە، چەند نامەیەکیان بۆهێنابووم. نامەکانم هەڵگرت، زەینەب وتی: نامەیەکیان هی کاك (حەمەنووری)یە ئەوەی بۆ ئێمە لێرە زۆر گرنگە، نانە، (نۆردوویەکی) زۆریان لە دوو کارتۆنی پڕدا هێنابوو.

لەم مواجەهەیەدا زیندانییەکانی ژوورەکە کەسوکاریان هاتبوون، بەڵام زۆر نەبوون. ئەوانیش باسی راپەڕینی بەسرەو کەربەلاو بەغداو نەجەف و شارەکانی دیکەو بێوەزعیی خەڵکی بەغدایان لەبەر بێکارەیی و بێئاوی و بێسووتەمەنیی بۆ کردوون و سەیرمکرد زیندانییەکان و ئەوانەشی هاتبوون بۆلایان، ڕوویان گەشەو خۆشحاڵن بەوەی ڕوویداوە. باسی شپرزەیی و لێکهەڵوەشانی سوپای عیراقیان دەکرد، باسی ئەوەیان دەکرد کە بەسەدان رەفیق حزبیی و بەرپرسی حکومیی لە ئەمن و ئیستخبارات و ئەفسەر وازیان لەکاری خۆیان هێناوەو چوونەتە ناو جەماوەرەوەو کە لەوان خراپتر پەلاماری دەزگاکانی حکومەت دەدەن.

کاکەحەمەش هەر دەهات و دەچوو. لە محیّدینی پرسی، ئەی کەی لای خۆمان پەلامار دەدەن؟ بۆ راوەستاون؟ وا خوارووی عیراق بەعسیان نەهێشت. محیّدین وتی: کاکەحەمە پەلەت نەبێت هاکا راپەڕین لای خۆشمان ئاواتەکەی تۆیان هێنایەدی.

مواجەهە تەواوبوو. شتی زیادەکانم بۆ پێچانەوەو لەگەڵ خۆیان بردیانەوە، کە ئەوان

ڕۆیشتن. جموجوولێکی نائاسایی لەناو بەندیخانەدا پەیدابوو. دیاربوو باس هەر باسی ڕاپەڕینەکەو تێکشکانی دامودەزگاکانی بەعس و سەرشۆڕکردنی پیاوانی بەعس بوو. برادەرانی خۆشمان، واتە کوردەکانیش، هەریەکەیان هەواڵی دڵخۆشکەریان وەرگرتبوو. بەکورتی لە جەژنە مواجەهەیەك دەچوو.

زیندانییەکان ئاواتیان لەسەر ڕاپەڕین بۆ دەربازبوون لە بەندیخانە هەڵچنیبوو. کە مەستەر کرا، فەرمانبەران و پۆلیسەکانی بەندیخانە ئاسایی نەبوون و هەرهەموویان ڕەنگ و ڕوویان گۆڕشرابوو. لەوە دەچوو هەر هەموو بترسن.

ئەو پاش نیوەڕۆیە، باوەڕ ناکەم کەس خەوتبێت و منیش نەخەوتم، کە چوومەوە ژوورەوە. زیندانییەکان بەبێ ترس و ڕاشکاوانە ئەوەی بۆیان گێڕابوونەوە. هەرهەموویان بۆیان گێڕامەوەو دڵیان بەوە خۆشبوو. کە ڕاپەڕینەکە لە بەغدا خەریکی پەرەسەندنەو پێی دەچێت لە ڕۆژانی داهاتوودا دۆخەکە وای لێبێت و خەڵك پەلاماری بەندیخانەکان بدەن و بەندیخانە بشکێت و دەربازبین. هەریەکەیان بەجیا پێی دەوتم (باوکی بەختی) ئەگەر خوای کرد بەندیخانە شکا، دەبێت لەگەڵ مندا بیت بۆئەوەی هیچت بەسەر نەیەت و بەسەلامەتی بگەیتەوە سلێمانی. دڵنیایان دەکردم کە ئەوپەڕی یارمەتیم بدەن لەهەموو ڕوویەکەوە.

دوای عەسر کاکەحەمە پەیدابوو. وتی: نەچین شێو ئامادەکەین؟ وتم: بۆ نا و یەکسەر... چووینە خوارەوەو خواردن و چامان ئامادەکردو شێوێکی زۆر باشمان کردو سەرو دووچای خەستمان بەسەردا کرد.

شەو کەوتمە کردنەوەی نامەکان و تا خەوتن کردنمە شەوچەرەی شەو و هەر نامەی دووجارم خوێندنەوە. نامەکەی (کاك حەمەنووری)م سێ جار خوێندەوە، ئەوەندە دەنگوباسی خۆشی تێدابوو. نامەکەم لابوو بە بەیانی دەستپێکردنەوەی شۆڕش و لە خوێندنەوی تێر نەدەبووم. جگە لە باسکردنی وردەکارییەکانی بەرنامەی ڕاپەڕین و کۆمەڵێك ڕێنماییشی بۆ نووسیبووم، مژدەشی دابوومێ، کە لە داهاتوویەکی نزیکدا بە ئازادکردنی عیراق و کوردستان پێیان شاد دەبمەوە.

دوای کاتژمێر دوانزە، چوومەوە بۆلای هاوڕێی دڵسۆزو خۆشەویستەکەم و دەستی شەوم لەملی کردەوەو ئەویش وەکو بزانێت من تینووی چیم و چیم لەو دەوێت. کەوتە گەیاندنی هەواڵی یەك لەدوای یەك و ئەوەی لە هاوڕێ بەسۆزەکەم دەبیست، وەکو ئەوە وابوو خۆم لەناو ڕووداوەکاندا بم و بەئارەزووی دڵی خۆم تۆڵە لە یەکەیەکەی پیاوانی ڕژێم بکەمەوە. بەدەم گوێگرتنی هەواڵەکانی هاوڕێکەمەوە خەو بردمییەوە، کە بەیانی هەستام و بانگیکردم بۆ نەتکوژاندوومەتەوە، خەریکە نووزەم تێدا نەمێنێت، دەبێت هەر ئەمرۆ پیلم بۆ پەیدا بکەیتەوە، منیش پێم وت: جارێ پەلە مەکە هەواڵەکانی بەیانیم پێبدە، ئەوکاتە داوای خۆراکم لێبکەرەوە، خەمت نەبێت نەمن لە تۆ دادەبڕێم نە تۆش دەتەوێت لە من دابڕێیت، تازە بووینەتە دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی و مەگەر زیندانیکردنی تۆ لەیەك دوورمان

بخاتەوە، تا نزیکی (مەستەر) لەم وتوویژەدا بووین.

زۆر حەز بەوە دەکەین کە ساحە بکەنەوەو بچینە ساحە، بۆئەوەی هاوڕێکانمان ببینین و دەنگوباس ئاڵوگۆڕ بکەین، بەلاّم ئەوە بووە خەیاڵ، چونکە بارودۆخی عیراق بەشێوەیەك ئاڵۆزابوو، کە سەرانی رژێم هەرهەمووی لەوپەڕی ترس و مەترسیدا دەژیان و متمانەیان بە دەوروبەری خۆشیان نەمابوو. بەندیخانەش یەکێك بوو لەو دەزگایانەی کە دەبوو توندتروو قایمتر دەرگاکانی دابخرێت و بەندیخانەتر بێت...

ئەوەی کە بۆ رۆژانی داهاتوو کەڵکی لێوەربگرین، تەنهاو تەنها رادیۆ خۆشەویستەکەمە. بەڕاستیی هاودەنگێکی خەمخۆرمە. شەوانە سەر دەنێین بەیەکەوەو ئەو قسە بۆ من دەکات و منیش بەوردیی گوێ بۆ یەکە یەکەی وتەکانی دەگرم و لەبەریان دەکەم.

ئەبەغرێب
١٩٩٠/٣/٥

# مانگی (٣)و راپەڕینەکان

لەگەڵ تێکشکانی هێزەکانی عیراق لە کوەیت و دەوروبەری و ناچارکردنی بەکشانەوەو پەرشوبڵاوبوونەوەی لە بەسرەو دەوروبەری، لەدوای ڕاگەیاندنی وەستانی شەڕ لەلایەن هاوپەیمانانەوە، لە (٢٥-٢/٢٦)ەوە خەڵکی داخلەدڵ و ڕقئەستووری شیعەی عیراق، بڕیاری راپەڕینی جەماوەرییا لە شاری بەسرەوە دا، کەڵکی زۆریان لە پەرتەوازەیی و شکانی سوپای عیراق بینی، بە بەسرەوە رانەوەستا، راپەڕینەکە زووربەی شارە شیعەنشینەکانی وەکو (نەجەف و کەربەلا)ی گرتەوە، هەر ئەو راپەڕینە تەشەنەی کردو بەغداو هەندێك لە شارە سووننی مەزهەبییەکانی بەرەو پەلاماردانی دامودەزگاکانی ڕژێم برد... بەپێی ئەو هەواڵانەی لە ئێزگەکانەوە وەرم دەگرت، بەتایبەتی ئێزگەی تاران، زۆر بەگرنگییەوە باسی راپەڕینەکانی دەکردو هانی جەماوەری دەدا، کە پەیوەندیی بە جەماوەری راپەڕیوەوە بکەن. وایان دەگەیاند، بەعــقرانەو دەست لە سەران و بەرپرسانی حزبیی، ئەمنیی، ئیستخباراتیی و حکومیی ناپارێزت، بەشێوەو شێوازێك راپەڕیوەکان پیاوانی بەعسیان بەسزای تاوانبارییان دەگەیاندن، کە دووربوو لە (نەریتی شۆڕش و شۆڕشگێڕیی). بە تەورو قەمە سەریان دەبڕین و لەتوپەتیان دەکردن و هەڵواسینیان بە قەنارەی قەسابیدا هەڵیاندەواسین، کە ئەمجۆرە مامەلەکردنە بەرنامەی بزووتنەوەی پێشکەوتنخوازیی نەبوو، دیار بوو ئەوە هەمووی دەگەڕایەوە بۆ ئەنجامی داخلەدڵی جەماوەرەکە، لە مامەڵەو ڕەفتاری چەندین ساڵەی پیاوان و سیاسەتی ڕژێمدا.

کاتێك لە ئێزگەکانەوە گوێبیستی ئەوهەواڵانە دەبووم، منیش بست بست باڵام دەکردو دەستم بەسەر دڵمدا دەهێنا. ئەو راپەڕینە لەکۆتایی مانگی (٢)ەوە تا ناوەڕاستی مانگی سێ بەردەوام بوو، ناویشیان لێ نابوو (راپەڕینی شەعبان). سەیر لەوەدا بوو راپەڕینەکە هەر جەماوەرە ڕقئەستوورەکەی دژی بەعس نەبوو، بەڵکو بە هەزاران لە پیاوەکانی بەعس و حزبیی و حکومیی لە ڕۆژانی پەلاماردانی دامودەزگا حزبیی و حکومییەکاندا، پەیوەندییان بە جەماوەرەوە دەکردو دەچوونە پاڵیان و ئەوانیش هاوبەشی نەمانی بەعس و دەسەڵاتدارییان دەکرد.

# بەرەو ئازادکردنی کەرکوك

## نیوەی مانگی (٣)و مواجەهە

بەپێی دەنگوباسەکان کە گوێمان لێدەبێت. بەتەمای ئەوە نەماین کەس بێت بۆ مواجەهەمان. رۆژی مواجەهە کاتێکمزانی (محێدین، زەینەب، بەهارو ئازاد)و چەند کەسی دیکە پەیدابوون... بەپیریانەوە چووم، لە سیمایاندا ماندوویێتییان پێوەدیاربوو. محێدین وتی: تا گەیشتووینەتە ئێرە، سەد کفنمان زەرد کردووە، دەیان گرفتمان هاتووەتە رێگا، بەڵام گرنگ ئەوەیە گەیشتینە لات. دوای حەوانەوەیان محێدین کەوتە باسکردنی دۆخی سلێمانی و کوردستان و بەوردیی کەوتە گێڕانەوەی باسی راپەڕین. وتی: کە لە رانیەوە رۆژی (٣/٥) راپەڕین دەستیپێکرد، نەکوژایەوە تا سەراپای هەموو شارەکان ئازادکران، لە سلێمانی ئەوەی زۆر بەرگریی تێدا کرا ئەنفالەکەو ئەمنە سوورەکەو سەربازگەی سارداو بوو. وتی: کە ئەنفالەکەو شوێنەکانی دیکە دەستیان بەسەرداگیرا، پیاوانی رژێم هەرهەموو خۆیان خزاندە ئەمنە سوورەکەوە. لە ئەمنە سوورەکەدا شەڕی مان و نەمانیان دەکرد، ئەنجام ئەمنەکە گیراو بە دەیان لەوانەی کە ئێوەیان ئازارو ئەشکەنجە دەدا بەسزای تاونبارییان گەیشتن و تۆڵەیان لێکرایەوە بە بەرپرسەبەری ئەمنیشەوە. وتی: خۆزگا بەخۆزاگای خوا لەوێ دەبوویت و بەچاوی خۆت ئەو راپەڕینەت دەبینی. پرسیاری کورەکانم لێکرد، وتی: (بەخشی و عەزیز) هەر لەگەڵ کاك حەمەنووری و ئەواندان، شوکر سەلامەتن.

لەکاتی گرتنی ئەمنەکەدا (شێخ کەریمی باخی سەروو)و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە شەهید بوون. (لەتیفی شێخ تایەری دۆڵان) لەناو کوژراوەکانی ئەمنەکەدا بوو. دیارە ئەویش لەترسانا خۆی کوتابووە ئەمنەکەوەو بەرگریی کردبوو. وتی: هەواڵێکی دیکەی ناخۆشم پێیە، ئەویش شەهیدبوونی (حەمەڕەشە)، کە لە (٣/١١) لەنێوانی کفری و دووزدا لەلایەن چەکدارەکانی موجاهیدینی خەلقەوە، شەهیدکرا، کە موجاهیدین هاوبەشی هێزەکانی حکومەتیان کرد بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕین و شەڕی زۆریان لەسەر رژێم کرد. بە هەواڵەکە سست بووم. ئێجگار زۆرم بەلاوە ناخۆشبوو. کە ئەو پیاوە جەربەزەیە، ئەو قارەمانە پارتیزانە، جگە لە ساڵانی پشێویی پێشمەرگایەتی، لەدوای ئەنفال لە هەشتاوهەشتەوە، بە بەردەوامی لەگەڵ پێشمەرگە پارتیزانەکاندا لە ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداغدا بووبووە چقڵی چاوی دوژمن، بە ئازایەتی خۆی و ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵیدابوون ناوچە ئەنفالکراوەکانیان ئاوەدانکردبووەوە... ئای چەند دڵی بە پێشمەرگایەتی و بە خەباتی رەوای گەلەکەی خۆشبوو. چەند نەترس و سادەو خۆنەویست بوو!!

کۆمەڵێك یادگاریم لەم سات و کاتەدا هاتنەوە یاد، رۆژانی وتوویژی (ی.ن.ك)و رژێم لە

ساڵی (١٩٨٣)و بینینی حەمەرەش لە سووورداش، لەکاتی گفتوگۆکەدا هاتنی بۆماڵمان. ئەو نامانەی لەو رۆژگارانەدا بۆم ناردبوو، لەسەر ئەمانەوە ئەوەم هاتەوە یاد کە لە ساڵی (١٩٨٩) لە ئەنجامی هەندێك کێشە لەناو هەمەوەندەوە هاتبووە (تەکیە)و لە تەکیەوە چووبووە (چەمچەماڵ)و ئاگاداری (رێکخراوی سلێمانی) کردبوو. کە سەردانی بکەن و ئەوکاتە دەبوو (کاك حەمەنووری) بچووایە بۆلای، لەبەرئەوەی پەیوەندیی بەوەوە بوو، بەڵام کاك حەمەنووری لەئارادا نەبوو. بۆیە رێکخراو منی ئاگاردار کرد بەزووترین کات بگەمە لای، رۆژێ لەگەڵ (مامۆستا رەئووەف بێگەرد) لە سلێمانییەوە چووینە چەمچەماڵ و دەمانویست بچین بۆ ئەو ماڵەی کە لێی بوو، ماڵەکە ماڵی (کاك شێخ عەلی کانی چنار) بوو، لەکاتێکدا بەرێوەبووین بۆ ماڵیان، لە کورەکانی (کاك شێخ عەلی)، (عەزیز)یان بەرەو رووومان هات و وتی: مەچن بۆ ماڵمان. حەمەرەش دەرچووەو ماڵی ئێمە پڕە لە سەرباز. کە لە بازار کورەکەمان بینی، چیرۆکی دەربازبوونی بۆ گێراینەوەو کاتێك کە ویستمان بگەرێینەوە. لە نەقلیاتەکە تووشی (کاك حەمەرەشیدی باریکەیی) بووین بە خۆی و پاسەکەیەوە، لەگەڵیدا گەراینەوە.

زۆرم بەڵاوە قورسە. پیاوێکی وا ئازاو چاونەترس، لە هەڵمەتی راپەریندا بەشداریی بکات و ئەو هەموو ساڵە چۆلپەرستی بکات، بۆئەوەی کوردستان و شارەکانی کوردستان بەئازادکراویی و گەلەکەی بە سەرفرازیی ببینێت، لەکاتێکی وادا کە زۆربەی خاکی نیشتمان ئازادبکرێت، ئەو شەهید بکرێت، لەبەری رەنج و ماندووبوونی نەخوات، بەچاوی خۆی و بەبێ ترس بەناویا نەگەرێت، ئای (کاکەحەمەو مامەریشە) چۆن زۆڵە کورد نەیهێشت بگەنە ئاواتی خۆتان!

محیێدین، وتی: ئێستا هەموو هێزەکانی پێشمەرگە لە چەمچەماڵن و گەیشتوونەتە قەرەهەنجیر و بەنیازن کە پەلاماری کەرکوك بدەن و ئەویش رزگار بکەن... لەلای گەرمیانیشەوە پێشمەرگە چوونەتە خوارەوەو گەیشتوونەتە کفری و قادرکەرەم.

لە هاتنەکەیاندا هەمەجۆر خواردنیان بۆ هێنابووە. ئەوەی بۆ ئێمە زۆر گرنگە (نانی نۆردووە). دوو کارتۆنیان هێنابوو. پێم وتن: مادام نانی زۆرتان هێناوە، باکمان نییە. نەشکرا بێنەوە بۆ مواجەهە، گرنگ نییەو خۆتان مەخەنە مەترسییەوە، با تووشی رووداوێك نەبن. نانمان بەیەکەوە خوارد... بەراستیی نانێکی ئێجگار خۆش و بەتام بوو، لەبەرئەوەی لەگەڵ باسکردنی ئازادیی کوردستاندا دەمانخوارد.

محیێدین، وتی: ئەگەر پەلاماری کەرکوك بدرێت و ئازاد بکرێت، رەنگە هاتنمان بۆ سەری مانگ ئاسان نەبێت. بەراستیی نازانین دۆخەکە چۆن دەبێت. وتم: گرنگ نییە، ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت، وریای خۆتان و کورەکان بن، چونکە کورەکان ئەزموونیان نییەو شارەزا نین با بەنەزانیی خۆیان دانەنێن... من شتم زۆرە. سێ مانگی دیکەش نەیەن، بێ خواردن نابم. ئەوەی لێرە کێشەیە، نەبوونی غازو خواردنە. من ئەو (چۆلە)یەی بۆتان هێناوم، لەکاتی بێغازیدا دەتوانم بەکاری بهێنم، واتە بۆ شت لێنان و گەرمکردنەوە، پەکم ناکەوێت. کارێکی

زۆر باشتان کرد، کە لەکاتی خۆیدا بۆتان هێنام... لە محێدینم پرسی: ئەو هەموو سەربازە دیلەیان چی لێکرد؟ وتی: هەرهەموو کۆکراونەتەوەو لە مزگەوت و قوتابخانەکان شوێنیان بۆ دابینکراوەو خواردنیان دراوەتێ... پرسیم ئەی جەماوەر پەلاماریان نادەن بیانکوژن؟ وتی: سەربازەکان لەرادەبەدەرن و ئێجگار زۆرن، هەزارو دوو هەزار نین، زۆرێکیشیان بەرەو کەرکوك و موسڵ و بەعقوبە رێگایان پێدراوە بگەڕێنەوە بۆ ناو کەسوکاریان. تەنها ئەفسەر نەبێت، کە هێڵنراونەتەوەو لە شوێنێ تایبەت دانراون.

وتم: سەیرە... ئەم کوردە چەند دلسافەو چەند زوو شتی بیردەچێتەوە، کورد چی کردبوو؟ بەعس و ئەو سەربازو ئەفسەرانەی سوپاکەی ئەنفالی کرد؟ هەڵەبجەو چەندین شوێنی دیکەی لە کوردستان کیمیاباران کرد. نازانم ئەو خەڵکە کوردە چ تاوانێکی کردبوو بەو دەردەیان بردن؟ بەعس و پیاوانی سلێیان لە هەموو دنیاو یاساکانی مافی مرۆڤو مرۆڤایەتی نەکردەوە، بەپێش چاوی هەموو دنیاوە قڕانی کوردی کرد، کەچی دوای سێ ساڵ بەسەر ئەو هەموو مەرگەساتەدا، کورد هەلی بۆ دەرەخسێت و بەسەر دوژمنەکەیدا دەسەلاتی دەبێت، ئەوانەی قەتڵ و عامی کردبوون، دەکەوێتە بەردەستیان، لەجیاتی ئەوەی تۆڵەیان لێبکەنەوەو بەهەزار هەزار بیانکوژن، کەچی رێزیان لێدەگرن و خزمەتیان دەکەن. بەدڵنیاییەوە دەڵێم چوار رۆژی دیکە رژێم هۆشی بێتەوە بەر، بیبەوێت پەلاماری کورد بدات، هەموو ئەو سەربازانە دەچنەوە ریزی سوپاکەو جارێکی دیکە ئەنفالمان دەکەنەوە.

(عامر) یەکێکە لە زیندانییەکانی ژوورەکەم، کە برای لەناو ئەو سوپایەدایە. خۆشی ئەفسەری هەوالگری سوپابوو... پرسیاری سەربازە دیلەکانی کرد، کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا کراوەو چییان لێکردوون؟ کە بۆم باسکرد، وتی: بەراستیی کورد خاوەنی شەهامەت و کەرامەتە، کورد بەراستیی مرۆڤەو رێزی مرۆڤیان لایە. ئێمە کە پەلاماری پێشمەرگەمان داو بەهەموو جۆرە چەکێکی قەدەغەکراو لێماندان و شکانمانن و کە زانیمان کورد دەسەلاتی نەماوە، بێبەزەییانەو زۆر نامرۆڤانەو درندانە کەوتینە ویزەیان، جگە لە کیمابارانکردنیان و ئەنفالمان کردن و هەرچی گوندو شارۆچکەیان هەبوو، خاپوورمان کرد. ئەوەی ئێمە بەو گەلەمان کرد مەگەر ئەڵمانیا بەجوولەکەی کردبێت، کەچی ئەو سوپایە کەوتووەتە بەردەستیان. نەك نەیان کوشتوون، بەڵکو رێزیان لێگرتوون و خزمەتیان کردوون. محێدین، وتی: چەند رۆژێکە لەسەر داوای خۆیان، وەجبە وەجبە رەوانەیان دەکەنەوەو سەربازێکی زۆر گەڕاونەتەوە. (عامر) وتی، زۆر راستە من دوو برام لە دەوری رانیە بوون، گەیشتوونەتەوە بەغدا، کە لەراستیدا باوك و دایکم بەتەمایان نەمابوون. وتی: مەگەر ئەوان بزانن چۆن باسی شەهامەتی کورد بکەن... (عامر) وتی: چەند رۆژە دۆخی شارەکانی نەجەف، کەربەلا، بەسرە، بەغداو ئەو شارانەی راپەڕینیان تێداکراوە، زۆر زۆر خراپە، دوای پاشەکشێی سوپا لە کوەیت و رێکخستنەوەیان، بەهەموو جۆرە چەکێکەوە پەلاماریان دراوە، بەدرندەترین شێوە لێیان دەدەن و بە بێبەزییانە دەیانکوژن و زینەدەبەچاڵیان دەکەن، خانوو و ماڵیان بەسەردا

خاپووروو ویران دەکەن، هەرچی بگرن بەبێ پرسینەوە، یەکسەر گوللەبارانیان دەکەن. ئەوەی بە نەجەف و کەربەلایان کردووە، مەگەر لەکاتی ئەنفالەکاندا بە کوردیان کردبێت. هەر سەربازێکیش لە کوردستان گەڕابێتەوە، بەزووترین کات پەیوەندیی بە سوپاوە نەکاتەوە گرتن و گوللەبارانکردنی یەکە. ئەو سەربازو ئەفسەرانەی کە لەناوچەکانی ناوەڕاست و خوارووداا بەشداریی ڕاپەڕینیان کردووە، لەهەر شوێنێك بەر دەستی ڕژێم بکەون، یەکسەر گوللەبارانیان دەکەن. وتی: عیراق کراوەتە دەریای خوێن.

ئەم مواجەهەیە یەکێکە لە مواجەهە خۆش و مژدەبەخشەکان، لە خۆشیانا وام دەزانی ڕزگارم بووەو لە بەندیخانەدا نەماوم. ئێمە بەکۆمەڵ دانیشتبووین کاکەحەمە بەپێکەنینەوە خۆی کرد بەژووردا، وەکو زاوابێت و کچە جافی بۆ بگوێزرێتەوە، خۆی گۆڕیبوو، مشکییەکی سەوزی جوانی بەسەرییەوە بەستبوو، دەستێك جلی جوانی پاکی لەبەرکردبوو. بەزەوق و پێکەنینەوە. سڵاوی کردو وتی: (زەینەب خان) بەخێربێیت، دڵی (شێخ محەمەد)تان خۆشکردبێت باشە، تەوقەی لەگەڵ محێدین و منداڵەکاندا کردو دانیشت... وتی: پێم بڵێن ئەوەی ڕۆژانە (شێخ محەمەد) لەسەر لای خۆمان بەمنی دەڵێت، وایە یاننا؟ وتیان: سەبارەت بە ڕاپەڕین؟ وتی: بەڵێ. هەرچی پێ وتوویت بەزیادەوە وایەو کوردستان ئێستا زۆر خۆشەو هەر ئێوەی لێ کەمن. وتی: جا بۆ واناکەن ئێمەش بگەیەنەوە ناوتان. نانی لەگەڵماندا خوارد. وتی: (شێخ محەمەد) لە ڕاپەڕینی جنووبەوە زەوقی زۆری هەیەو هەست دەکەم وەکو جاران نییە، حەزی لە خەو نییە، خواردن لە من باشتر دەخوات، شەوانە تا کاتژمێر (١٠) لای منەو باسی خۆش خۆشم بۆ دەکات... بە محێدینی وت: بەو برادەرانە بڵێ نەیەڵن ئەو سەربازو ئەفسەرانە دەرچن، با هەموویان لە تۆڵەی ئەنفال و کیمیاباراندا بکوژن و لەناویان بەرن، هەلەو بۆمان ڕێککەوتووە. با لەدەستی نەدەین. کورد مەگەر لە ڕۆژێکی وادا حەقی خۆی بکاتەوەو تۆڵە لەو دوژمنانە بسێنێت. وتی: چی بکەم خۆ من لە دەرەوە نیم، ئەوەی ڕۆژێك بە ناپیاویی بینیومە بەرامبەر بە گەلەکەمان، داخی دڵی خۆمم پێبڕشتایە. لە هاتنەکەیاندا کۆمەڵێك نامەیان بۆ هێنابووم. زەینەب وتی: لە نامەکاندا هی (کاك حەمەڕەشید و کاك حەمەنووری) تێدایە دەیانۆت با بەوردیی بیانخوێنێتەوە.

مواجەهە تەواوبوو... بەدوایاندا مەستەرکرا. فەرمانبەران و پۆلیسەکانی بەندیخانە دەموچاویان گرژبوو، هەرهەموو غەزەبیان لێدەباری، مامەڵەیان وەکو جاران نییە. تووڕە، لە دڵی خۆماندا دەمان وت زۆریان نەماوە. کاتێکتان زانی ئێوەش فتکران و لێشاوی ڕاپەڕین ڕایماڵین.

هەرچوومەوە سەرەوەو لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشام، یەکسەر خەوم لێکەوت. عەسرێکی درەنگ کاکەحەمە خەبەری کردمەوە، بانگیکردم و وتی: ئەوە چۆنە وا نووستوویت؟ وتم: ئەمشەو نەنووستووم و تا بەیانی بەدیار ڕادیۆوە دانیشتووم. بەدڵخۆشییەوەو لە خۆشیدا خەوم لێکەوت. وتی: کەواتە بابڕۆینە خوارەوە بەئارەزووی خۆمان نانێکی باش بخۆین. وتم:

شفتەو کوبەمان هەیە، کامیان بخۆین؟ وتی: شفتەکە باشە، شفتەمان گەرمکردەوەو شێوێکی زۆرباشمان کردو دەعوەتی (مارف)یشمان کرد. چایەکمان لێناو سەرو چەند چای خەستمان بەسەردا کرد. شەو لە کاتژمێر (٩)وە چوومەوە سەرەوەو دەستم کرد بە کردنەوەو خوێندنەوەی نامەکان. یەکەم نامە، نامەکەی کاك حەمەرەشیدم هەلپچری، بەخوێندنەوەی، بەقەدەر مواجەهەکە زەوقم لێبینی... نامەکەی زۆر بەوردیی سەبارەت بە دۆخەکە نووسیبوو. باسی یەکەیەکەی رووداوەکان و سەرکەوتنەکانی کردبوو. بەرنامەی داهاتووشی لە چەند خالێکدا نووسیبوو. بەشێکی نامەکەی تەرخانکردبوو، بۆ ئامۆژگاریی و رێنماییکردن، بەراستیی چێژی تەواوم لە خوێندنەوەی نامەکە بینی، چونکە بەئاگاییەوە دەنگوباسەکانی نووسیبوون، داجار نامەکەی حەمەنووریم خوێندەوە، ئەویش هاوشێوەی نامەکەی کاك حەمەرەشید بوو. تا کاتژمێر (١٢)ی شەو خۆم لەگەڵ نامەکانی دیکەدا کردە میوان و یەکەیەکە ئەوان بەخێرهاتنی منیان دەکردو وایان پێخۆشبوو، کە شەو بەیەکەوە بخەوین.

ئەوانم کردە خەو و کەوتمە ئێشکگرتن لەگەڵ هاوڕێ خۆشەویستەکەمدا، لەگەڵ هەرقسەیەك بۆی دەکردم، ئەوەندەی تر ژیانم تازە دەبووەوە... هەرچەند لەگەڵ هاورێکەمدا لەگەرمەی گفتوگۆدابووین، بەلاّم دلّم لای زەینەب و محێدین و منداڵەکان و ئەوانە بوو، کە هاتبوون بۆلام، بیرم لەوە دەکردەوە، دەبێت لە گەڕانەوەیاندا گرفتیان تووش نەبووبێت؟ بەباشی گەڕابنەوە، یان رووبەڕووی کێشەو زەحمەتی کراون؟... بەدەم بیرکردنەوەو گوێگرتنم بۆ هاورێکەم، خەو بردمییەوە، بەیانی لە دەنگی موراقیب بەئاگاهاتم کە بانگی دەکرد مەستەرە، سەیرمکرد هاورێکەم نەنوستووە، هەر قسەم بۆ دەکات، گلەییم لێدەکات بۆ بەشەو بەتەنها جێم هێشتووە. لەم قسەنەدابووم لەگەڵ هاورێکەمدا، کاتێکمزانی کاکەحەمە هاتە سەرەوە، بۆئەوەی هەلمسێنێت، کە هاتە ژوور سەرم و سەرم بەرزکردەوە، وتی: باشە بەخەبەری، هاتم هەلتسێنم... بەدوای مواجەهەدا، رۆژ بەرۆژ زیاتر بەند دەکراین و دەرگاکانی بەندیخانە زیاترو زیاتر کلۆم دەدران.

ساحە نەما... تەنها بەشەکانی خۆمان و ساحەی بەشەکە نەبێت، چوونە دەرەوە نەما. غاز نییە، کارەبا تابلێی خراپە... ئاو نییە، عەنقەرچی خواردن ناهێنێت، ئەوانەی بەناچاریی دەبوو پشت بە نانی کانەو خواردنی کانە ببەستن، دەبوو وەریگرن حاڵیان باش نییە، ئێمە چاوەڕوانی نانی کانە نەبووین و وەرمان نەدەگرت. بێغازییەکە لەهەموو شت خراپترە. زیندانییەکانی شپرزە کردووە، ئێمە چۆلەکەمان خزمەتی باشمان دەکات، هەرچەندە قەدەغەیە، بەلاّم بەدزییەوەو زۆر بەوریایی بەکاریدەهێنین کاری خۆمانی پێ مەیسەر دەکەین. زیندانییەکان حەسوودیمان پێدەبەن. یارمەتی زیندانییەکانی ژوورەکەی کاکەحەمە دەدەین، لەبەر دوو شت، یەکەم: لەرووی ئینسانییەوە. دووەم: بۆئەوەی بەو یارمەتییە وایان لێبکەین کە پەنا نەبەن بۆئەوەی دائیرە ئاگادار بکەن تا بێن بیگرن و لەکیسمان بچێت. لە حەمامەکەو ژوورەکە دامان دەنا، لە ماوەیەکی کەمدا کاری خۆمانی پێدەکەین و دەیپێچینەوە.

لە نامەکەی (کاک حەمەنووری)دا، بەوردیی باسی راپەڕینەکانی سلێمانی، پیرەمەگروون، دووکان، بازیان، گەرمیان، شارەزوور، چەمچەماڵ و شوێنەکانی دیکەی بۆ نووسیبووم، باسی چۆنیتی گرتنی ئەمنە سوورەکەو ئەوانەی کە لەگەڵیدابوون و بەتایبەتی باسی (بەخشی و عەزیزی) کردبوو، باسی دەرهێنانی (کاک تەحسین قادری) لە ئەمنەکە بۆ نووسیبووم. سەرباری ئەو هەواڵانە، باسی نەخشەو بەرنامەی گرتنی کەرکوکی بۆ نووسیبووم. کە بەدەستەوەیە لەم رۆژانەدا هەڵمەتێکی هەمەلایەنەو لەهەر چوارلاوە بۆ شاری کەرکوك و دەوروبەری بکرێت، بۆ ئازادکردنی، نوسیبووی: ئەگەر لە گرتنی کەرکوکدا سەرکەوتن بەدەستبهێنین، ئەوا دابینیٚ کە بەتەواویی پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستان رزگاری بووە...

ئەوەی دوای ئەو نامەو هەواڵانە من لە چاوەڕوانیدا دەرباز دەکات، تەنهاو تەنها هاوڕێی شەوانەکەمە، کە لەدوای کاتژمێر (١٢)دوە، لەسەر پشتییەکەم سەر دەنێین بەیەکەوەو بە بەتانییەکە سەری خۆمانمان دادەپۆشین، ورتە ورتەکانی ئەو، لە دنیای جەنگەکەو راپەڕینەکان ئاگادارم دەکات، بەدەم ورتە ورتەکەمانەوە، دەنووین و بەیانیش بەدەم بۆڵەبۆڵی ئەودوە، کە پێی دەوتم: ئەمشەو خۆت خەوتیت و منیشت بیرچووەوەو تا بەیانی وەنەوزم نەداوە، بەئاگا هاتم.

لە شەوەکانی (١٦-١٧-١٨-٣/١٩) ئەوەی پێدەوتم کە کورد، جگە لە شاری سلێمانی، هەولێرو دهۆك، ئێستا لەئامەدەباشیدایە بۆ ئازادکردنی شاری کەرکوك، هێزیان کۆکردووەتەوەو جەماوەریان سازو ئامادەکردووە بۆ راپەڕین لە کەرکوکدا، دەیانەوێت کەرکوکیش رزگار بکەن و بەدوایدا دوور نییە کە ئیعلانی سەربەخۆیی و دەوڵەتی کوردی نەکەن.

کاتێك شەوەکانی ( ٢٠-٢١-٣/٢٢) مژدەی ئازادکردنی کەرکوکی داپێم، لەو شەوانەدا وا پێی رادەگەیاندم، کە (هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان) لە چەند قۆڵێکەوە، هەڵمەتیان بۆ سەر دامودەزگاکانی رژێم و حزبی بەعس و سەربازگەکانی دەوروبەری کەرکوك بردەوەو هەرهەموویان گیراون. لەخۆشیدا خەوم لێنەدەکەوت و لەگەڵ خۆمدا ئاهەنگی سەرکەوتنم دەگێڕا. دەبێت چی لەوە خۆشتربێت لەهەموو ئیزگەکانەوە رابگەیەنرێت کە شارە نەوتەکەی کەرکوکی کوردستان، کە چەندین ساڵە کورد شۆڕشی بۆ دەکات و لەهەموو دانیشتن و وتوویژەکانی کوردو رژێمدا، لەسەر ئەوشارە نێوانی کوردو رژێم تێکچووەتەوەو رێکنەکەوتوون. ئێستا بەبێ گفتوگۆو بە پەلامارو هەڵمەتی پێشمەرگەو جەماوەر، لەژێر دەسەڵاتی رژێمێکی فاشی و درندەو کوردکوژ دەربهێنرێت، پێشبینی ئەوەش بکرێت دوای ئازادکردنی، کورد دوورنییە کە بانگەشەی سەربەخۆیی و دەوڵەتی کوردیی نەکات.

چەند خۆشە شەوانە گوێبیستی یەکەیەکەی سەرکەوتنەکانم، باسی ئەوە دەکریٚ کە پارێزگای کەرکوك ئێستا بووەتە بارەگاو مەڵبەندی کۆبوونەوەو بڕیاردان، بەرپرسانی کورد لەبینایەی ئەو پارێزگایە کۆدەبنەوە، کە چەند ساڵە نەخشەو پیلانە دوژمنکارییەکان و سیاسەتە شۆڤێنییەکانی بەعس و رژێمەکەی دژی خەڵکی کەرکوك و گەلەکەمانی تێدا

جێبەجێ دەکرێت، پێشوازیی لە عەرەبە هاوردەکان و نەفرەت لە کوردی رەسەنی دانیشتووی ئەو شارە دەکات.

چەندم بەلاوە خۆشە، کە دەبیستم پێشمەرگەو جەماوەر باوەشیان بەگری نەوتی کەرکوکدا کردووەو دەستیان لەملی یەك کردووە، لەنێوانیاندا دوژمنی داگیرکەر دەکەنە قەرەبرووت و ریسوای دەکەن. کە گوێم لێدەبێت، ئەوا فەیلەق و فرۆکەخانەو باروتخانەو پارێزگاو بارەگاکانی بەعس و ئەمنی کەرامەو شوعبەو مەتاریسە ئەمنییەکان، یەك بەدوای یەکدا گیران، چەندین فیرقەی کوردکوژی بەعس کەوتوونەتە دەست پێشمەرگەو جەماوەرە راپەریوەکەی، بست بست بالا دەکەم بەیانی وەکو مژدە دەیدەمە ئەو کەسانەی کە لێیان دلنیام...

ئای چ کارەساتێکە، کە شەوانی (٢٧-٢٨-٣/٢٩) هەواڵی ئەوە رادەگەیەنرا کە رژێم هێزەکانی کۆکردووەتەوە، هێزی زۆری بۆ کەرکوك گواستووەتەوە، دەیەوێت کەرکوك لەدەست کورد بسەنێتەوەو مەعەسکەر خالید نەتوانراوە بگیرێت، پێشمەرگەی زۆری تێدا شەهیدکراوە، کاتێك شەوانی (٣٠-٣/٣١) راگەیەندرا کە رژێم سەیتەرەی بەسەر کەرکوکدا کردەوەو پێشمەرگە شارەکەیان چۆڵکردووە، ئەم هەموو خۆشییەی لە رۆژانی پێشوودا چێژم لێوەرگرت، بەم هەواڵە ناخۆشانە هەرهەموویم دایەوەو لە داخا قەستەکەم دەست بنێمە بینەقاقای و بەتەواویی بیخنکێنم، کە هەواڵی وا ناخۆش و جەرگبڕم پێدەڵێت... ئەم رۆژانە، کوردەکان، بەتایبەتی کاکەحەمەو مارف و کامەران. دێن بۆلام و پرسیاری دەنگوباسم لێدەکەن، ئەوانیش بەو هەواڵانەی کەرکوك زۆر دڵتەنگن و خەمێکی کوردانەمان بۆ دزی گەلەکەمان خواردەوەو ئەو ئاوات و هیوایەی لەماوەی ئەو دوو سێ مانگەدا لەسەریەك هەڵمانچنیبوون، بەرەو نائومێدیی سەرمان بەیەکداکردەوەو هەواڵەکانی شارەکانی نەجەف، کەربەلا، بەسرە، مەدینەی سەورەو شوێنەکانی دیکەی بەغداش کە دەمانبیست بە چ شێوەیەکی دڕندانەو رقئەستوورانە مامەڵە لەگەڵ هاوزمانی خۆیاندا دەکات، ئەگەر دەسەڵاتی بەسەر کوردو شارەکانی کوردستاندا بگەڕێتەوە، بەدڵنیاییەوە ئەنفالی یەکجاریمان دەکات و بانگەشەی کوردقڕان دەکات. گەلەکەمان بەتەواویی لەناودەبات.

عەرەبەکان کە باسی نەجەف و کەربەلا دەکەن، فرمێسك بە چاویاندا دێتە خوارەوە، سەبارەت بە هەواڵی کوردستانیش، ئەوەندەیان دەزانی، رژێم بەهێزێکی زۆرەوەو بەهەموو جۆرە چەکێکەکەوە پەلاماری خەڵکی کوردستانی داوە، یەکێك لە کەرکوکەوە هاتبوو، زۆر بەخراپیی باسی دۆخی کەرکوك و سەربازگەی خالیدی دەکرد، کە بەهۆی نارێکیی هێزەکانی پێشمەرگەو شڕەخۆرییەوە، نەتوانراوە بگیرێت و پێشمەرگەی زۆری تێدا کوژراوە، هەرئەوەش بووەتە هۆی پاکنەکردنەوەی کەرکوك لە بەعس و دامودەزگاکانی. ئەو پیاوە بەشێوەیەك باسی شڕەخۆریی و تالان و برۆی کەرکوکی دەکرد، من لای خۆمەوە شەرمەزار دەبووم. دەیوت هەر چەکداربوو، هەڵیدەکوتایە سەر مالان، هەرچییان لە ئۆتۆمبێل و ماڵ

دەستبکەوتایە، یەکسەر دەستیان بەسەردادەگرت و دەیانبرد. جیاوازیی لەنێوانی ماڵە کورد، عەرەب، تورکمان، کلدوئاشووریدا نەدەکرا.
ئەوانەی خەریکی تالانی بوون، بەلایانەوە گرنگ نەبوو، کەرکوك دەگیرێت یان ناگیرێت، رژێم دەردەکرێت یان ناکرێت، جیاوازییان لەنێوانی ماڵی هاولاتی و حکومەتدا نەدەکرد، ئەوەی بەلایانەوە مەبەست بوو، دەستکەوتی ماڵ و سەیارەو شتی دیکەبوو.
چەکدار بەجۆرێك بلاوبووەوە نەتدەزانی کامە پێشمەرگەیەو کامەجاشەو سەر بەحکومەتە، بێسەروبەریی بەشێوەیەك بوو، کەست بۆ جیانەدەکرایەوە، خەڵکی کەرکوك سەریان لێشێوابوو. نەیاندەزانی بەشداریی راپەرین بکەن لەگەڵ پێشمەرگەدا لەدژی حکومەت، یان لە ماڵی خۆیان بمێننەوەو ئاگاداری سامان و ماڵیان بن، تا تالان نەکرێت. وتی: هەر ئەوەش بوو کە رژێم لە (٣٠)ی مانگ توانی پێشمەرگە بەتەواویی بشکێنێت و لە شارەکەیان بکاتە دەرەوە، دەست بەسەر شارەکەدا بگیرێتەوەو بە دەیان هاولاتیی دەستگیرکران و راپێچی زیندان کران.
بەندیخانە ئەم رۆژانە وەکو خۆڵ و دۆ بەسەر زیندانییەکانیدا کرابێت وایە. کەس تروسکەی تێدا نییە. بەندیخانەیەکی کپ و بێ جووڵەیە. زیندانییە کوردەکان تەواو بێزەوق و بێتاقەتن، پێکەنین لەسەر لێوی کەسیان نابینرێت، وەکو ئەو ماسییانەیان لێهاتووە، کە لەناو گۆمێکدابن و گیا گامەی تێدا کوترابێت، هەرهەموویان لەبەر وریی و گێژیی لارەلاریانە. یەکەیەکە دێن بۆلام و پرسیارم لێدەکەن. منیش هەرچەند لەوان بێتاقەتترو بێزەوقترم، بەلام بۆئەوەی بەنائومێدیی نەگەرێنەوە، باسی ئەوەیان بۆ دەکەم کە لەهەموو شۆرشێکدا، چۆن سەرکەوتن هەیە، شکستیش دەبێت، بەلام هەموو شکستێك نابێتە کۆتایی شۆرش، بەڵکو زۆر شکست دەبێتە دەرس و سەرکەوتنی گەورەتری لێ چاوەرواندەکرێت، باسی ئەوەیان بۆ دەکەم، کە رژێم لە حەفتاکانەوە بە بەرنامە کار لە تەعریبکردنی کەرکوکدا دەکات و قایمی دەکات و هێزی جۆراوجۆری تێدا جێگردەکات، خەڵکی شارەکە سەرکوت دەکات و دەترسێنێت. پێشمەرگەش لەبەر نەشارەزایی و تێکرژانیان لەگەڵ جەماوەردا، دیارە سەریان لێشێواوەو نەیانتوانیوە وەکو پێویست بەرنامەکەیان ئەنجام بدەن، بەلام چاوەروان بن بەمزووانە کەرکوك بەتەواویی رزگاردەکرێت، پێیان دەڵێم مادام جەماوەر سامی لە بەعس شکاو ترسیان لە دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی نەماوە، بە روویاندا راپەرین. تازە جارێکی دیکە بەعس وەکو جاران ناتوانێت دەسەلات لە عیراق و کوردستاندا بەرێوەبەرێت.
بەم قسانە ورەی کوردەکان بەرز دەکەمەوە... شەو دێت و چاوەروانی نیوەی شەو دەکەم، بۆئەوەی لەگەڵ هاورێکەمدا سەربنێینەوە سەرسەرین و بەجووتە بکەوینەوە شەنوکەوکردنی گۆرانکارییەکانی ناو عیراق و کوردستان و دنیا، ئەو قسەم بۆ بکات و منیش وەکو تەسجیل هەرچی وت، تۆماری بکەم، بۆئەوەی بەیانی بۆ ئەوانەی تینووی هەواڵ و دەنگوباسن بۆیان لێدەمەوە.

له کاتژمێر (١٢)ی شەوەوە، بەجووتە خۆمان بەژێر بەتانیدا دەکەین و دەست لەملانی یەکتر، ئیزگە بە ئیزگەو وڵات بە وڵات دەرۆین. هەواڵەکان شکستی هێزی پێشمەرگەو جەماوەری راپەڕیوی کوردستانیان رادەگەیاند، باسی شاڵاوی سوپای عیراقیان دەکرد، کە چۆن بەرقەوە پەلاماری شارو شارۆچکەکان دەدەن، لەلایەکی دیکەوە بەدرێژیی باسی سەرکوتکردنی راپەڕینی شەعبانیان دەکردو بێدەنگیی ئەمریکاو هاوپەیمانانیش لەو دۆخەدا لەولاوە بوەستێ.

## (٢/٤)و مواجەهە

بەپێی هەواڵ و دەنگوباسەکان، لە ئەنجامی شاڵاوەکانی رژێم بۆ کوردستان، لەدوای گرتنەوەی کەرکوك، خەڵکی کوردستان بەکۆمەڵ رەویان کردووە، لەبەرئەوە بەتەمای ئەوە نەبووین کە کەس بێت بۆ مواجەهەمان. شەو بە نابەدڵیی خۆم بۆ مواجەهە ئامادەکرد. بەیانی کاتژمێر (٦) (مەستەر) کراو کاتژمێر (٧:٥) دەرگا کرایەوە، مواجەهەکاران هاتن. من لەگەڵ کاکەحەمەو مارف و بەختیاردا پیاسەمانەکرد. لە کاتژمێر (٩) کاتێکمزانی (کاك لەتیفم و بابە عەلی و لەعلی خوشکم) پەیدابوون، بردمن بۆ سەرەوە.

بابە عەلی، وتی: بەحاڵێکی زۆر خراپ هاتووین. کەوتنە باسی بارودۆخی سلێمانی، کە خەڵکی شار بەکۆمەڵ رەویان کردووە. وتیان: منداڵەکانی تۆش لەگەڵ محێدین و منداڵەکانیدا لە سلێمانی دەرچوون بەرەو شارباژێڕ. هەواڵیانمان لانییە. خەمیان لێ مەخۆ پشت بەخوا سەلامەت دەبن. کۆمەڵێك کەلوپەل و خواردنیان بۆ هێناوم.

بەیەکەوە نانمان خوارد... هاتنەکەیان لەو رۆژەدا بۆ من زۆر خۆشە. لە بەغداو کەرکوك و هەندێك شوێنی دیکەی عیراقەوە خەڵك هاتن، بەڵام ئەوانیش تاك و تەرا بوون و بەو لێشاوەی مواجەهەکانی پێشوو نەبوون... ئەوانەی هاتبوون، کۆمەڵێك هەواڵی سەیرو سەمەرەیان پێبوو. سەبارەت بە چۆنێتی سەرکوتکردنی راپەڕینەکانی شارەکان و دەستگیرکردنی سەدان لە بەعسییەکان و ئەو بەرپرسە حکومییانەی کە لە راپەڕینەکاندا بەشدارییان کردبوو. کە مواجەهە تەواو بوو. (مەستەر) کراو گەرامەوە بۆ شوێنەکەم. کەوتمە بیرکردنەوە لە منداڵەکان و حاڵی(زەینەب)و شپرزەیی و چۆنێتی رۆیشتنیان. بەکوردی خەم دایگرتم. دەسەڵاتیشم نەبوو. کاکەحەمە هات بۆلام، سەیری کردم رەنگ و رووم تەواو نییە، وتی: بۆ وا تێکچوویت؟ کە باسی منداڵەکانم بۆ کرد، دەمزانی ئەویش لەدڵەوە پێی ناخۆشە، بەڵام کەوتە قسەی خۆش و وتی: گوێ مەدەرێ، مادام لەژێر دەستی ئەم حکومەتە دەرچوون،

لێیان مەترسەو کاتێکتزانی هەواڵی خۆشیان بۆ هێنایت. کەوتە گێڕانەوەی سەرگوزشتەو بەسەرهاتی جۆراوجۆر، هەر بۆئەوەی من لەو خەمە خاو بکاتەوە. ئێوارە شێومان کردو شەو چوومەوە ژوورەکەی خۆم. لەسەر جێگاکەم خۆم راکێشا. زیندانییەکانی ژوورەکەم زانییان خەم و خەفەتم هەیە، کەوتنە قسەکردن و وایان کرد کە هەستم دانیشم و لەگەڵیاندا قسەبکەم. بەقسەکردنەوە تا درەنگانی شەو دانیشتین و دوایی راکشام و لەگەڵ هاورێکەمدا سەرمان بەیەکەوە نایەوەو تا درەنگانێك گوێم بۆ شلکردو ئەو قسەی دەکردو هەواڵ و دەنگوباسی دەدا بەگوێمداو منیش بەوردیی وەرم دەگرتن، تا خەوم لێکەوت و بەیانی بۆ مەستەر بەئاگاهاتم.

ئەبوغرێب
١٩٩١/٤/٥

## (١٩٩١/٤/١٧)و مواجەهە

بەهۆی بارودۆخی کوردستانەوە، بەتەمای هاتنی منداڵەکان و کەسوکار نیم. دەزانم کە منداڵەکانم لەگەڵ کۆرەوەکەی کوردستاندا رۆیشتوون. لە پەژارەیەکی ئێجگار زۆردام. مواجەهەی نیوەی مانگ کەوتە (١٧)ی مانگەوە، شەوی (١٦ لەسەر١٧) خۆم ئامادەی مواجەهە کرد. بەیانی کاتژمێر (٦) (مەستەر) کراو کاتژمێر (٧:٥) دەرگای بەش خرایە سەرپشت، لەدوای هەشتەوە موجەهەکاران پەیدابوون، کاتێکمزانی ئەم کەسانە پەیدابوون (کاکەم، ناهیدە، لەعلی) لە سلێمانییەوە، هەر کە چاوم بەمێژەرەکەی کاکەم کەوت، یەکسەر بەرەوپیری چووم و باوەشمان بەیەکدا کردو بەقوولیی گریانەوە، وتی: حەمەگیان چۆنی... لەگەڵ لەعلی و ناهیدەش یەکمان ماچکردو چووینە سەرەوە دانیشتین. کاتێکمزانی بانگیانکرد (باوکی بەخشی) میوانت هات، کە چوومە دەرەوە لەسەر موحاجەرەکانەوە سەیری خوارەوەم کرد، بینیم (فەوزی و سەعدیە)[1]ن بەدەست سڵاوم لێدەکەن و چووم بەپیریانەوە، بەپەرۆشەوە یەکترمان ماچکردو بردمنە سەرەوە بۆلای کاکەم و ئەوان، دوای حەوانەوە من

---

١-فەوزی (فەوزی عەواد قەیسی)یە، کوردی فەیلییە، لە پارێزگای کوت دادەنیشێت. بەهۆی گواستنەوەم لە سلێمانییەوە بۆ پارێزگای واست لە ساڵی (١٩٧٥)دا بوو بە هاورێم.

* سەعدیە عەلوان کازم فەیسی، خێزانی ناوبراوەو ئامۆزای یەکن و باوکی سەعدیە لە قەزای حەی دادەنیشت و من نهۆمی سەرەوەی ماڵی باوکیم بەکرێ گرتبوو. لەو مواجەهەیەدا بەجووتە لە کوتەوە هاتبوون بۆلام.

کەوتمە پرسیارکردن و هەر یەك لە کاکەم و فەوزی کەوتنە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانم.
کاکەم، وتی: رۆڵە دەزانیت، کە منداڵەکان لە سلێمانی نەماون و لەگەڵ خەڵکەکەدا بەرەو ئێران رۆیشتوون. هەواڵیان هاتووە گەیشتوونەتە ناو ئێران و هەموو سەلامەتن، بەڵام تائێستا شوێنی نیشتەجێبوونیان نازانم. وەکو هەواڵم پێگەیشتووە، لەگەڵ منداڵەکانی کاکەحەمەو خزمانی دێلێژەدان، پرسیم ئەی محێدین و منداڵەکانی، وتی: ئەوانیش بەیەکەوەن. پرسیم وەکو بزانن (شەنگە)ماوە. وتی: شەنگەو هەر هەموویان ماون و سەلامەتن و لەخەمیاندا مەبە، مادام خزم و کەسی زۆریان لەگەڵدایە، دڵت لایان نەبێت. هەر ئەوان نین شاری سلێمانی ئێستا چۆڵ و هۆڵە تاك و تەرا ماڵی تێداماوە. ئەوەی توانای بووە رۆیشتووە. کەس هیچی لەگەڵ خۆی نەبردووە. هەرچی رۆیشتووە بەسەڵتە خێزانی رۆیشتووە. دووکان و بازار چەند رۆژە کراوەتەوە، بازار زۆر کەمە. حکومەت کە هاتووەتەوە ناوشار، دەست بۆ کەس نابات.
شار هێمنەو دیارە حکومەت دەیەوێت خەڵکەکە بگەڕێنەوە، خەڵکیش زۆر دەگەڕێتەوە. کە دەشگەڕێنەوە، حکومەت هیچیان پێناڵێت. وتی: رۆڵە هەر خەڵکی سلێمانی نەرۆیشتوون، رەوەکە سەرتاسەری کوردستانە، لە کەرکوك و گەرمیانەوە تا دهۆك و زاخۆیە. لەسەرەتادا دۆخەکە زۆر نالەبارو ناخۆشبوو. لەبەرئەوەی ئێران و تورکیا سنووریان داخستبوو، نەیان دەهێشت کەس بچێتە ناویانەوە، بەڵام چەند رۆژە ئێران سنووری کردووەتەوەو خەڵکەکەیان وەرگرتووە. لەو سنوورانە خەڵك زۆر لەناوچوون. یەکێك لەوانەی کە لە رێگا عەمری خوای کردووە (بەدری خاڵەمە)[1].
کاکەم، وتی: لەگەڵ ئەوەی خەڵکەکە بەکۆمەڵ رەویان کردووەو حکومەت بەتەواویی هاتووەتە پێشەوە، بەڵام پێشمەرگە لە هەموو ناوچەکان شەڕی باشیان کردووە، لەزۆر شوێن حکومەتیان شکاندووەو گەڕاوەتەوە، حکومەت ئێستا لە شارەزوور، لە عەربەت بەولاوە ناتوانێت بڕوات. هێزێکی حکومەت چووە بێستانسوور، پێشمەرگە لێیدان و دەریکردن، ئێستا پێشمەرگە بەتەواویی بەسەر شارەزووردا زاڵەو هێزی پێشمەرگە لە بەمۆو سەرتەکی بەمۆیە، حکومەت چەندجار پەلاماری هەولێرو ناوچەکانی گەرمیانی داوە، سەرکەوتوو نەبووە. (مام جەلال) لە ماوەتەوە خەریکی رێکخستنەوەی پێشمەرگەیە. دەنگێك هەیە لەگەڵ حکومەتدا رێکبکەون و گفتوگۆ بکەن. وتی: خەمت نەبێت وەزع زۆر باش دەبێت، کورد تازە لەوە دەرچووە وەکو جاران هەڵپەی نزیکبوونەوە بۆلای حکومەت بکات.
بەڵکو وای لێهاتووە خەڵك حەز بەوە دەکات لە شۆڕش و هێزی پێشمەرگە نزیکبێتەوە. کۆرەوەکە ئەوەی سەلماند کە کورد بەمەرگی خۆی رازییە، نەك دەسەڵاتی حکومەت قبوڵ بکاتەوە. (لەعلی) هەر بەساقەو بەقوربانم دەبوو، (ناهیدە) بەزەردەخەنەیەکەوە دەیوت

---

1-بەدرییەی شێخ عەبدولڕەحمان، کچی خاڵەمە، خێزانی شێخ جەلالی شێخساڵحی ئامۆزامە. لە کۆرەوەکەدا لە رێگای تەوێڵەو بیارە کۆچی دوایی کرد.

مامەگیان چۆنی شوکر باشیت؟ تووخوا خەم مەخۆ. (فەوزی) کورتەباسێکی لەسەر راپەرینەکان باسکردو باسی پاریزگای واستی بۆ کردم. (سەعدیش) لەیەکپێ دەیوت (ئەبو بەخشی) خەفەت نەخۆی ئینشائەڵلا بەمزووانە ئازاد دەبیت، زەینەب و منداڵەکانیش بەسەلامەتیی دەگەرێنەوە، لەگەڵ ئازادبوونتا بەیەك شاد دەبنەوە، کاکەم و ئەوان شتیان زۆر هێنابوو. هەروەها فەوزی و سەعدیە بەئارەزووی خۆیان شتیان هێنابوو، تەنانەت کیلۆیەك چایان دامێ وتیان ئەمە هی (ئەبو محەمەد)[1]ە. لە قسەکردندا بووین، کاتێکمانزانی (کاکەحەمە) پەیدابوو، وتی: یاشێخ هەواڵی خۆشتان بۆ شێخ هێناوە؟ لەسەری مانگەوە ئەم پیاوە ئاگای لەخۆی نییەو لە خەمێکی زۆری منداڵەکانی و خزمان و سلێمانیدایە. کاکەم وتی: کاکەحەمە پشت بەخوا باش دەبێت.

بەکۆمەڵ نانمان بەیەکەوە خوارد، کاکەم لەکاتی نانخواردندا بە کاکەحەمەی وت: کاکەحەمە ئەم ماوەیە لای خۆمان لە رۆژی حەشر دەچوو. خوا بەخێری بگێرێت و ئێوەش لەم بەندیخانەیە رزگارتان بێت. ئەمجارە هیچ نامەیەکم بۆ نەهاتبوو.

مواجەهە تەواو. کاکەم و فەوزی و ئەوان رۆیشتن دوای تەواوبوونی مواجەهە (مەستەر) کرا.

گەرامەوە بۆ شوێنەکەم. زیندانییەکانی ژوورەکەم پرسیاری سلێمانییان کرد. ئەوانیش هەریەکەیان چەند کەسیان هاتبوو بۆ لایان و ئەوانیش کۆمەڵێك هەواڵ و دەنگوباسیان لابوو.

شەو کە دانیشتین، کەوتنە باسی پەلامارەکانی حکومەت بۆ سەر شارەکان، بەمەبەستی کوژاندنەوەی راپەرینەکان و سەرکوتکردنیان، جۆرەها باسیان کرد. شەو کاتی (نووستن، لەگەڵ رادیۆکەمدا سەرمان کردەوە سەر سەرین و بەدەم ورتەورتەوە خەوم لێکەوت و بەیانی بۆ مەستەر بەئاگاهاتم.

ئەبوغریب
١٩٩١/٤/٢٠

---

١- ئەبو محەمەد پیاوێکی کوردی فەیلی بوو، ناوی (رەشید) بوو، دووکاندار بوو لە کوت. بەهۆی فەوزییەوە ناسیم، کەسێکی زۆرباش بوو، هەرچەند بچوومایەتە کوت دەبوو سەری لێ بدەم و دەنگوباسی پێ بلێم.

## (٥/٢) مواجەهەیەکی سەیر

ئەبوغریب ژووری (١٢)، بەشی (٨)، (١٩٩١/٥/٣)

بەپێی هەواڵەکان خەڵکی کوردستان لەترسی شالاَوی هێزەکانی رژێم بەرەو سنوورەکانی (ئێران و تورکیا) کۆرەویان کردبوو. دۆخی کوردستان لەوپەری خراپیی و ناهەمواریدا بوو... بەو هۆیەوە باوەرم نەدەکرد کەسێك بتوانێت بێت بۆلام. مواجەهەی سەری مانگی چوار لە رۆژی (٥/٢)دا بوو. شەو زۆر لە لێکدانەوەی دۆخەکەی سلێمانی و کوردستاندا بووم. سەرم لە وەزعەکە دەرنەدەکرد... بەیانی دوای مەستەر گەرامەوە ژوورەکەم راکشامەوە... بەشەکەمان وەکو رۆژانی مواجەهەکانی پێشوو جموجوولی ئەوتۆی تێدا نەبوو. کاتژمێر هەشت و نیو دەرگای بەشەکەمان خرایە سەرپشت بەمەبەستی مواجەهە... لە کاتژمێر (٩) وە تاك و تەرا خەڵکی مواجەهەکار دەهاتنە ژوورەوە... ئەوانەی دەهاتن کورد نەبوون.

لەکاتێکدا لە تارمەی بەردەم ژوورەکەمدا، خۆمدابوو بەسەر موحاجەرەکەداو سەیری خوارەوەم دەکرد، کاتێکمزانی پیاوێکی بالاَبەرز بەجلوبەرگی کوردییەوە لە دەرگاکەهاتە ژوورەوە، بەدوایدا چەند کەسێکی دیکە هاتن. سەیری سەروەیان دەکرد، ئێستێکیان کرد، دیاربوو پرسیاریان کرد. کە لێم روانین دەبینم جلوبەرگە کوردییەکە (کاك سەرحەدی خەلیفە یونسە)، ئەوان بە پلیکانەکاندا بەرەو سەرەوەو منیش بەرەو پلیکانەکان بەرەوپیریان چووم، لەسەر پلیکانەکان بەیەکگەیشتین. بە باوەش پێداکردنەوە پێشوازیم لە یەکەیەکەیان کرد، بەرەو ژوورەکەم پێشیان کەوتم، هەر لە ژوورەوە دانیشتین، وتم لام سەیرە، هەرگیز لە خەیاڵی ئەوەدا نەبووم مواجەهەم بێت و کە دێش ئێوەبن. ئەوانەی هاتبوون ئەمانە بوون (کاك سەرحەد، کاك حەمەرەشید، کاك حەمەنووری، مامۆستا عومەری کوێخا قادری ئاوەکەڵە، کاك ئیبراهیم عەلی رەزا). ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەوەبوو (کاك حەمەرەشید) بەدزداشەوە هاتبوو. وتیان زۆر کەم خەڵك هاتووە، ئێمەش مەگەر هەرخۆمان بزانین چۆن هاتووین و چۆن گەیشتووینەتە لای تۆ، کاك سەرحەد وتی: ئەوەی دەبووە هۆی ئەوەی کە لە بازگەکان رێگریمان لێنەکەن و مەرەخەسمان کەن (مامۆستا عومەر)بوو. لە هەربازگەیەك ناسنامەکەی پیشاندەدا، یەکسەر راگیریان نەدەکردین و لە کەسمانیان نەدەپرسی.

کەوتنە باسکردنی دۆخی کوردستان و دەیان مەسەلەی جیاجیاو هەمەجۆریان بۆ روونکردمەوە... مەرگەساتی کۆرەویان باسکرد. هەواڵی منداڵەکانیان دەزانی کە ئەوانیش رۆیشتوون، بەلاَم هەواڵی ئەوەیان نەبوو گەیشتوونەتە کوێ و لەکوێ جێگیربوون. باسی ئەوەیان کرد، کە ئێران سنووری خستووەتە سەرپشت و رێگریی ناکات بۆ چوونە ناو ئێرانەوە... باسی تورکیایان کرد کە ئەوان تائێستا وەکو پێویست سنووریان نەکردووەتەوەو سنووریان داخستووە، خەڵك لەو قوڵەوە زۆر شپرزەیە، بەلاَم گوشاری ولاَتان هەیە بۆئەوەی

تورکیاش سنوور بکاتەوەو پێشوازییان لیّ بکات، بەکورتی زۆر هەواڵی خۆش و ناخۆشیان پێدام، لە گەرمەی قسەکردندا بووین. (مامۆستا عومەر) رووی تێکردم و وتی: (خۆزگەم بەخۆت کە لەم شوێنەیت)... وتم: بۆ وادەڵێیت؟ وتی: (راستت دەوێت من ئێستا ئێرەم پیّ خۆشترەو حەزم دەکرد لێرە بوومایە، نەك لەدەرەوە).. قسەکەیم بەلاوە سەیربوو، برادەرانیش سەیریانکردو لە قسەکەی جۆرە سەرسامییەکیان لەروودا دەبینرا. وەکو بۆم روونبووەوە (مامۆستا عومەر) لە وەزعەکەو ژیانی خۆی دەترسا، کە لەو دۆخەدا بە ئارەزووی ئەو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا نەکرێت، بەراستیی مواجەهەیەکی ئێجگار خۆش بوو. یەکێك بوو لە مواجەهە دەگمەنەکان... هەرهەموویان یەکەیەکە پێیان دەوتم کە ئاگاداری خۆم بم و ترسم نەبێت و وەزعەکە هەرچەندە ئێستا زۆر خراپە، بەڵام زۆر زۆر باش دەبێت و بەم شێوەیە نامێنێتەوە، ئەم کۆرەوە دەبێتە خەباتێکی دیکەی گەلەکەمان و کورد توانی بەشێوازی دیکە خەباتی نەتەوایەتی بکات، بەهۆی ئەم کۆرەوە، دڵنیاین کە وڵاتانی دنیا بە پیرمانەوە دێن و بێدەنگ نابن. هەرچەند زیانی مرۆیی و ئابووریی زۆر دەکەین، بەڵام ئەنجامەکەی بە قازانجی گەلەکەمان و شۆڕشەکەمان دەشکێتەوەو باسی هاتنەوەی (هەڤاڵ مام جەلال)یان کردو گەشبین بوون بە گەڕانەوەی.

## مانگی (٥)و مواجەهەی سەری مانگ

دوای مواجەهەی نیوەی مانگ و لە دوو هەفتەی کۆتایی مانگدا. چەندجار چووینەوە ساحە، لە ساحە لەگەڵ هاورێکانماندا یەکترمان دەبینی و دەنگوباسمان ئاڵوگۆر دەکرد، لەسەر دۆخەکەو بەتایبەتی وتوویژو لێبووردنی گشتیی قسەمان دەکرد، شەو نەبوو نەچینە بەردەمی تەلەفزیۆن و گوێ لە هەواڵەکان نەگرین، ئەوەش بەمەبەستی ئەوەی بزانین دەنگوباسی وتوویژ چییە؟ حکومەت لەوبارەیەوە چی رادەگەیەنێت؟ ئایا بریاری لێبووردن دەردەکرێت؟ شەوانە لە رێگای رادیۆ قاچاغەکەمەوە، گوێم لە ئیزگەکان دەگرت و بەدوای هەواڵەکان و راوبۆچوونەکاندا شۆر دەبوومەوەو هەڵسەنگادنی خۆم بۆ هەریەکەیان دەکرد.

لەکۆتایی مانگداو رۆژی (٦/١) بەمەبەستی مواجەهە خۆمان سازو ئامادەکرد، رۆژی (٦/٢) مواجەهە هەبوو، ژمارەیەك لە کەس و لە خزمەکان هاتن.

ئەوانەی هاتبوون دڵیان خۆشبوو، وتیان لەم ماوەیەدا گفتوگۆ دەکرێت و لەم گفتوگۆیەدا لێبووردن دەردەکرێت و ئێوە ئازاد دەبن و بەهۆی دەنگوباسی وتوویژەکەوە کوردستان ئارامبووەتەوە، خەڵك لە ئێرانەوە دەگەرێنەوە، لەم مانگەدا منداڵەکانی تۆش دەگەرێنەوە. نەمدەزانی ئەوە بۆ دڵخۆشکردنی من دەڵێن، یان هەواڵی منداڵەکانیان دەزانی و زانیاریان هەبوو بۆ گەرانەوەیان. بەهەرحاڵ لە مانگی (٦)یشدا چەند رۆژ چووینەوە ساحەو لەگەڵ هاورێیاندا یەکترمان دەبینی و هەریەکەمان ئەوەی لە هەگبەکەیدابووایە هەڵی دەرشت.

ئەبوغریب

١٩٩١/٦/٣

## (١٩٩١/٦/١٥) مواجههەیەکی خۆش

((رۆژی هەینی)) ٢٤/جۆزەردان/٢٦٩١ - ژووری (١٢)، ١٩٩١/٦/١٥

دوای رۆژگارێکی سەیرو چاوەروانەکراو، دوای سێ مانگ و دوانزە رۆژی رەبەق، منداڵەکانم لێ ونبووبوون، ئەوان لە من و من لە ئەوان، ئەوان بەرەو چیاو دۆڵ و کەژە سەرکەشەکان لە ترسی مەرگ و نیزەو بۆمب و گوللەبارانکردن ملی ریی شاخ و چیایان گرتەبەر، بێ ئەوەی بزانن چارەنووسیان بۆ کوێیان دەبات، لە ترسی مەرگ رایان دەکرد بۆ مەرگ...

(زەینەب، حەپسە، ئازاد، سابات، بەهار، شێنێ، تۆلە، شەنگە، مامی ئەحمەد، حەمەرەشید، عوسمان، مەحمود، عومەری مەکتەبە، رەشید خۆشناو رەحیم) هاتن بۆ مواجههەم.

بەراستیی مواجههەیەکی زۆرخۆش بوو، چونکە بەهاتنیان تامەزۆرییم شکاو ئەو گومان و دوودڵییەی هەمبوو رەوییەوە. لەم رۆژو شەوەدا مووچەخۆرانی ئاسایی بەرێوەبەرێتیی بەندیخانە مووچەیان وەرگرت. هەواڵی کۆچی کاکەم (حەسەن)یان دامێ، زۆر دڵگران بووم و زۆر کاری ناخۆشی تێکردم، چونکە ماوەی دوو ساڵ بوو نەمبینیبوو، وا بۆ یەکجارەکی رێنەکەوت یەکتری ببینینەوە... ژیان بریتییە لە کۆمەڵێك کارەسات و ناخۆشیی و لەیەك ونبوون و دابران.

(کاك حەسەن بەرزنجی) کوری شێخ محیدینی قادرکەرەمەو هاوسەری (پوورە حەلاوم) بوو. پیاوێکی سیاسیی و دنیادیدەو خاوەن ئەزموون بوو، رێزی زۆری لە دایکم دەگرت و بەرێزەوە پێی دەوت (باجی رەحمە)... دایکیشم لەبەرئەوەی رێزی لە پوورە حەلاوم، کە خوشکی بوو، دەگرت کاك حەسەنی خۆش دەویست.

لە منداڵیمەوە تێکەڵاوی منداڵەکانی بووم و لەگەڵ (ئەرشەدی) کورە گەورەیدا نێوان و هاورێیمان زۆر گەرم بوو. هەروەها لە کورەکانی دیکەی (ئاسایش، وریا- نەبەرد، هێرش و شۆرش)دا نێوانمان خۆشبوو، ئەوان هەرهەموویان بە منیان دەوت (کاکەحەمە). جگە لە کورەکانیان لەگەڵ کچەکانیشیان (چریسکە، شەهلا، فامیدە و چیا)دا پەیوەندیی پوورزایەتیمان بەهێزبوو. جگە لە (چریسکەو شەهلا) ئەوانی دیکە بە (کاکەحەمە) بانگیان دەکردم. کاك حەسەن خزمێکی دڵسۆزو بەخەم بوو. حەزی بە بوون و خۆشیی خزمان دەکردو ئەوەندە منی خۆشدەویست هەستم دەکرد وەکو کورەکانی سەیری من دەکات، هەر بە (کاکەحەمە) بانگی دەکردم... لە بۆچوونی یەکتر دەگەیشتین و زۆرجار کە بەیەکەوە دادەنیشتین، گەردەشەمان لەسەر مەسەلە سیاسییەکان دەکرد، جار جارە هۆنراوەی دەنووسی و هەندێکیانی بۆ دەخوێندمەوە. پیاوێکی سەخی و دەسەنەو دڵفراوان بە تەبیعەت بوو. لە میوانداریدا بێوێنە بوو. هەمیشە حەزی بە قەرەباڵغی و دانیشتنی بەکۆمەڵ دەکرد. دڵنیابووم بەگرتنی من زۆر نارەحەت بووبوو، خەمی تەواوی لێخواردبووم، بەڵام دەسەڵاتیشی نەبوو.

بۆیە بەبیستنی هەواڵی مەرگی زۆر زۆر پەشۆکام و خەم دایگرتم و لە بەندیخانەدا پرسەی خۆم بۆ داناو پرسەی وا نا کە لە شوێنێك دانیشم و خەڵك بێت بۆلام، بەڵکو لەدڵ و ناخی خۆمدا چەند بەخەمباریی رۆژگارم بەسەربردو چەندین یادەوەریی رۆژانی ژیانمان هاتەوە یاد. یەکێك لەو یادەوەرییانە، کاتی دەستگیرکردنەکەی کە لە بەندیخانەیەکی شاری کەرکوك زیندانیی کرابوو، هێشتا نەخرابووە ژێر لێکۆڵینەوەوە. رۆژێك لەگەڵ پوورە حەلاومدا سەردانمان کردو لە کونی پەنجەرەی دەرگای ژووری بەندیخانەکەوە قسەمان لەگەڵدا کرد، بەو سەردانەمان خۆشحاڵ بوو. لە قسەکردنیدا بەورەو بێباك بوو. ئاواتم دەخواست مەرگ پەلاماری نەدایەو بمایەتەوە، تا من لە بەندیخانە ئازاد دەکرام و یەکترمان ببینیایەتەوە[1].
هەر لەم مواجەهەیەدا هەواڵی کۆچی (کاکەڕەشە)[2]یان دامێ کە لە (١٨/٩/١٩٩٠)وە، کۆچی دوایی کردبوو، بەبیستنی کۆچی ئەویش زۆر خەفەتبار بووم، چونکە لەگەڵ کاکەڕەشەدا یەکترمان زۆر خۆشدەویست و لەڕووی خزمایەتی و بیروباوەڕی کوردایەتییەوە لە یەکەوە زۆر نزیکبوون.

زیندانی ئەبوغرێب
١٩٩١/٦/١٥

---

١-بۆیە کە ئازادبووم. رۆژێك بەتایبەتی چووم بۆ سەر گۆڕەکەی سەیری ئەو زەوییەم کرد کە یەکەیەکە هەڵمان دەلوشێت و لێمان تێرنابێت.
٢-(کاکەڕەش)ە، (شێخ ڕەشیدی شێخ عارفی) دێلێژەیە، پیاوێکی کوردپەروەرو دڵسۆزبوو، لە ژیانیدا چەرمەسەریی زۆری بینیبوو، پیاوێکی سەخی و دلفراوان و میواندار بوو، (باجی نەزیفی) خێزانی بەئارەزووی ئەو هەردەم هەڵسوکەوتی دەکردو یەکتریان زۆر خۆشدەویست.

## ((مواجەهەی ئەمجارەو بەرەو رووبوونەوە...))

ژووری (١٢) قسم (٨)
١٥ی پووشپەر/٢٦٩١
((١٩٩١/٧/٧))

رووداوەکان رۆژ لەگەڵ رۆژ هەنگاو دەنێن، تادێت بەری چاومان روونتر دەبێتەوە، لە تیشکی خۆر نزیکتر دەبێتەوە، کاروانەو بەرەو تیشکی خۆر پەل دەکوتێ، ئەمرۆ سبەی هەر پێی دەگات... چەند مواجوهەیەك بەتەماین، لەم مواجەهەیە نەگەینە مواجەهەیەکی دیکە، ئێمە روودو ماڵ و خاکی نیشتمان بگەڕێینەوە، وا مواجەهە لەگەڵ مواجەهە رۆژگارەکان بەرێدەکەین، باکمان لێ نییە، چونکە بڕوامان بەهێزە، ئەو مەبەستەی ئێمەی لەسەری زیندانیی کراوین هەرپێی دەگەین، دوور یان نزیك دەست لە ملی خواستەکانمان دەکەین... وا ئەم مواجەهەیەشمان کردو چاوەڕوانی مواجەهەیەکی دیکە دەکەین، کە بەپێی قسەی هاتووەکان کە لەم جارەدا زیندان بەجێدێڵین و لەجیاتی ئەوەی ئەوان بێن دەستمان لە مل بکەن، ئێمە دەگەڕێینەوەو دەستیان لە مل دەکەین. لەم مواجەهەیەدا ئەم کەسانە هاتبوون (ئەرشەد، قادر، چاڵاك، لەتیف و کورەکەی، زینەب، پەروین، لەعلی و چنوور، مامۆستا حسێن و فەتاح، عومەر... گەلاڵی، جەلال، کاك مەحمودو مامۆستایەکی دیکە).

لەم مواجەهەیەدا کە لەگەڵ (ئەرشەد)دا چاومان بەیەك کەوت، فلیمی ژیانی خۆمان و لەناوچوونی (باوکیمان) بیرکەوتەوە، باوەشی پوورزایەتیمان لە ملی یەکتری کردو یەکسەر دامانە پرمەی گریان، چونکە بەراستیی لەگەڵ (کاك حەسەن)دا یەکتریمان خۆش دەویست... دڵسۆزمان بوو، بەرژەوەندیی ئێمەی دەویست، حەزی بە خێروخۆشیمان دەکرد، ئێمەش وەکو گەورەیەکی دڵسۆزو دنیادیدە رێزمان بۆ دادەنا... ئیتر ئەمە کاروانی ژیانەو بەرودوا هەرهەموومانی پیادا دەرۆین...

هاتنی (پەروین) زۆر خۆشحاڵی کردم، چونکە زۆر کارو هەڵوێستی بیر هێنامەوەو زۆر شتم بۆ روونبووەوە. (چنوور) زنجیرەیەك کارەساتی دیکەی یادخستمەوەو کاری کردە سەر هەموومان کەوتی ((خاڵە تۆ بۆچی هەر نایەیتەوە بۆلامان))، ((دەتووخوا بێرەوە...)).

لەم مواجەهەیەدا چەند نامەیەکی خۆش خۆشم بۆ هاتبوو، کە هەرهەموو نامەکان گەشبینیی و پاشەڕۆژی سەرفرازییان دەستنیشان دەکرد... بەتایبەتی نامەکەی (جەمیلە)م زۆر لا خۆش بوو، چونکە زۆر دەمێکە لەیەك دوورین و نامەکەی (لاوە، کاك حەمەرەشید، تاهیر، شەوە، هیوا، دلێرو بەخشی) بوونە مواجەهەیەکی دیکەو دوو سێ رۆژ لەگەڵیاندا دانیشتم و تاسەم لێیان شکا...

ئەبوغرێب- ژووری (١٢)
١٩٩١/٧/٧

## مواجەهەی (١٩/٧/١٩٩١)و چاوەڕوانیی

ئەمڕۆش وەکو هەموو مواجەهەکانی دیکە ڕۆژی هەینی بوو، ڕۆژی هاتنی خەڵك بوو بۆ سەردانی بەندیخانە...

هەر لەڕۆژی پێنجشەممەوە، خۆمان ئامادەکردو بۆ ڕۆژی هەینی وەکو هەموو ڕۆژەکانی دیکەی مواجەهە... بەیانی کاتژمێری پێنج لەخەو هەستام و چاوەڕوانی (مەستەر)م دەکرد، لە پێنج و نیو دەرگای مەستەر لێیدا، بەڵام مەستەریان لە شەش و نیو کرد، لەدوای مەستەرەوە کەوتینە چاوەڕوانیی بۆ هاتنە ژوورەوەی میوانەکان.
ئەمڕۆ بەجیاوازیی لە ڕۆژی (٧) مانگ کە لە کاتژمێری حەوت خەڵك هاتنە ژوورەوە، لە کاتژمێر هەشت و نیو خەڵك هاتنە ژوورەوە، لە هاتنەژوورەوەی هەر یەکێکدا سەیری هاتنی یەکێکی دیکەمان دەکرد، خەڵك هات، بەڵام کەسی ئێمە دیارنەبوو...
لە کاتژمێری نۆو نیو پیاوێك و منداڵێك هاتنە ژوورەوە، پرسیاری کەسێکیان کرد، کە خەڵکی (چوارتا)بوو، لێمان پرسی خەڵکی لای خۆمان زۆر هاتووە؟ وتی: کەسی وا نەهاتووە، دوێنێ قلیشایەوەو ئەوەی بەدزییەوە نەهاتبێت، نەهاتووە، من بەدوو قۆناغ هاتووم، بەڵێ، لەگەڵ قسەی ئەو پیاوەدا ئێمە دەستمان لەهاتنی خەڵکی لای خۆمان شۆردو بەتەما نەماین لەگەڵ زیندانییەکانی خۆمان دەهاتین و دەچووین.
بەڵێ، هەر چاوەڕوان بووین، بەڵام کەس نەهات... وردە وردە دەرکەوت لە (سلێمانی و هەولێر) بارودۆخ باش نەبووەو قلیشاوەتەوە... لە سەرێکەوە زۆرمان پێخۆش بوو، کە ئەم هەموو هاتوچۆیەو درێژەکێشانی وتووێژە بەتەواویی دوودڵیی و ناخۆشیی خستووەتە دڵی خەڵکەوە، بۆیە تا زوو یەکلایی بکرێتەوە، خۆشترە، چونکە (پێوەدان لە گیزەگیز خۆشترە)، لەسەرێکی دیکەوە پێمان ناخۆش بوو، لەبەرئەوەی بارودۆخی بەندیخانە زۆرناخۆش بووبوو، بەتایبەتی بۆ ئێمە ئەگەر بقەومێتەوە، مەترسی لەسەر ژیانمان هەیە، چونکە لە سەرەتای وتووێژدا لە قۆناغی دووەمدا برادەران بەخوتوخۆرایی هاتن بۆلامان و باریان قورس کردین، کە ئەمە بەهەڵەیەکی مێژوویی لەسەریان حیساب دەکرێت، ئەگەر ئێمە شتێکمان لێ بێت، ئۆباڵی ماڵ و منداڵ و ژیانی ئێمە لە ئەستۆی ئەوانەیە کە هاتن بۆلامان... ئەو ڕۆژە سەراپا لە لێکدانەوەدا بووم، تا شەو، لە دەنگوباسی کاتژمێری (١١)دا باسی ئەو تێکچوونەی سلێمانی و هەولێری کرد، کە گوایە بە دەسیسەی ئێران بووەو کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیی کاك مەسعودو وەفدەکەی پیشاندا، کە لەگفتوگۆکەدا وایان دەرخست کە وتووێژ تەواو بووەو تەنها بلاوکردنەوەی ماوە، کە ئەویش بەمزووانە بلاو دەکرێتەوە... بەهەرحاڵ مواجەهەیەکی ناخۆش بوو، چونکە هەرهەموو بەتەمای هاتنی ماڵەوە بووین، هەرچی

خواردنیش بێت نەمان مابوو، بەتایبەتی (نان) کە لێرە زۆر زۆر گرنگە... (نانی کانە) لە (خەپلەی تانجی) جاران دەچێت و ناچاری نەبێت هەرگیز بە مرۆڤ ناخورێت... ئەوەندەی ئەمجارە بێتاقەت و بێتفاق بووین، لەکاتی هێرش و پەلامارەکانی ولاتە هاوپەیمانەکان و راپەڕینەکەدا ئەوەندە بێتفاق و خواردن نەبووین... بەهەرحاڵ ئەمەش بەشێکی سەرەکییە لە ناخۆشیی بەندیخانە...

شەممە زیندانیی ئەبوغرێب
١٩٩١/٧/٢٠

## ((دەرچوونی لێبووردنی گشتیی بۆ هەموو سیاسییەکان))

ئێوارەی یەکشەممە کاتژمێر (٧)ی ئێوارە لە کورتەی هەواڵەکاندا تەلەفزیۆن ڕایگەیاند، کە لێبووردنی گشتیی بۆ هەموو سیاسییەکان دەرچووە، بووبەهەراو هەرخەڵك بوو، مژدەی لێبووردنەکەی بۆ دەهێنایین و زۆری پێنەچوو، کە زۆربەی ئەو براکوردانەی لە بەشەکەماندابوون سەرکەوتن و پیرۆزباییان لێکردین، لەوانە (بەختیار، مارف، کامل، عەلی، سالار، محەمەد، عەزیز، رزگار، کاك فەتاح، کاکەحەمەو زۆر لە براعەرەبەکانیش)، لەوانە (سەعید، عامر، جاسم، هانی، میسم، ئەبوجەعفەرو زۆری تر...) کەوتینە چاوەڕوانیی بۆ هەواڵی کاتژمێری (٩)و کاتی دەنگوباس دەستی پێکرد، سەرۆك چاوپێکەوتنی خەڵکی دیالەی کردو یەك سەعاتی خایاندو لە کاتژمێری (١٠)ەوە کەوتە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان و لەپێشەوە دوو بڕیاری (مەجلیسی قیادەی سەورە)ی خوێندەوە، کە ژمارە ٢٤١-٢٤٢ لە ١٠/محرم و ١٩٩١/٧/٢١ بۆ لێبووردنی گشتیی بۆ سیاسییەکان، بۆ سەربازە ڕاکردووەکان، لەڕاستیدا ئەوەی دڵی خۆشکردین، ئەوە بوو، کە بەهۆی ئێمەوە توانرا هەموو زیندانییە سیاسییەکانی دیکەی عیراق ئازادبن، ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ ئێمە، چونکە بە دەستکەوتی وتوویژمان زانی... ئەمشەو تا سەعات (٣)ی شەو نەنووستین و بەیانی دوای (مەستەر) خەوتمەوەو کاتێکمزانی (بەختیار) خەبەری کردمەوە، وتی: ساحەیە، نایەیت؟ چووم نانم خواردو چوومە دەرەوە بۆ ساحەو لەوێ زۆربەی برادەرانمان بینی و یەك پیرۆزبایی لەیەکتر دەکردو ڕۆژێك بوو لە ڕۆژە خۆشەکانی بەندیخانەو ساحە... هەواڵی ئەو دەنگوباسانەی کە لە سلێمانی ڕوویدابوو، هەندێکمان زانی و هەرهەموو دڵخۆش و شادبووین یەك یەکتری ماچ دەکردو دەیوت بە سەرکەوتنی گەلەکەمان و هاتنەدی خواستەکانمان. هەر سەرکەوتوو بێت هێزی لەبن نەهاتووی گەل و مەچەکی پاڵەوانانەی جەماوەرو شۆڕشی درێژخایەنی گەلەکەمان...

ئەبوغریب
١٩٩١/٧/٢٢

# چەند یادگارێك

## رۆژی ١٩٩١/٧/٢٥

ئەمڕۆ رۆژی چوارەممان تەواوکرد لە دەرچوونی لێبووردنەکەو تا ئەم کاتەی ئەم نووسینەی تێدا دەنووسم، هیچ دیاردەیەکی لێبووردنەکە دیار نییە...

بەدەرچوونی بڕیارەکە سەرپاکی زیندانییەکان گرژبوون و پێیان ناخۆش بوو، جگە لە کەمێکیان نەبێت، هەموو ئەم وتەیەیان دەوتەوە (سیاسیی دەربچێت و ئێمە دەرنەچین، چۆن ئەمە دەبێت؟).

رۆژی سێشەممە من ئەو کەلوپەلانەی هەم بوون، بەسەر (کاکەحەمەو مارف)و ئەوانی دیکەدا دابەشم کرد، کەلوپەلی پێویستی خۆم لە جانتایەکدا ئامادەکرد. بەیانی رۆژی سێشەممە کە شتەکانم بردە خوارەوە (کاکەحەمە) پڕقورگی پڕبوو لە گریان و دەستی کردە گریان، دڵم زۆر دایەوە... لەڕاستیدا زۆرکاری تێکردم، رۆژی چوارشەممە رۆژنامەی جمهوری قسەیەکی (وەزیری عەدلی) لەبارەی لێبووردنەکەوە بڵاوکردبووەوە، کە وتبووی ئەو کەسە سیاسییانەی کە بەماددەی (٢١) سزای حوکم دراون، بەر ئەم لێبووردنە دەکەون، بەپێی ئەو قسەیە بێت کەس دەرناچێت، چونکە کەس بەو ماددەیە حوکم نەدراوە، ئەم قسەیە دڵی هەموو زیندانییەکانی خۆشکردو کەوتنە گاڵتەکردن و لاقرتێ و پێکەنین زیندانییە رامیارییانەی لە بەشەکەماندا هەبوو، تاگەیشتە ئەوەی کە هەندێك کەس کەوتە وەڵامدانەوەیان و منیش لەلای خۆمەوە، وتم: ئێمە هەر دەردەچین، بەم لێبووردنەش نەبێت، لێبووردنی دیکەمان بۆ دێت و دڵنیاشم کە بەم لێبووردنە هەرهەموومان دەردەچین.

رۆژی پێنجشەممە مەسەلەکە خاوبووەوە، هەواڵ هات کە هەرهەموو بەردەکەوین. رۆژی شەممە لیژنە دێت و ئێمەش ئەمڕۆمان خستە سەر رۆژەکانی دیکەو سەعات دەژمێرین و رۆژ تەواو دەکەین، سەعاتی شەو دەژمێرین و دەمانەوێت رۆژ ببێتەوە زۆرمان لەبەردەمدا نەماوەو چاوەڕوانین... چاوەڕوانیش ناخۆشترین شتە لە ژیاندا...

## رۆژی (١٩٩١/٧/٢٨) یەکشەممە

ئەمڕۆ هەشتەم رۆژە بڕیاری لێبووردن دەرچووەو تائێستا هیچ هەواڵێکی راستی ئازادبوون نییە. ئەمڕۆ تەنها ئەوەنەمان بۆ روونبووەوە، کە رۆژی شەممە (٧/٢٧) مواجەهەی (شێخ عوسمان) هاتبوو، لەو هاتنەدا ئەوەیان لە دەمی (دکتۆر ئومێدە)وە راگەیاندبوو، کە هەرهەموو بەر ئەم لێبووردنە دەکەوین و چەند رۆژێکی دیکە دەست دەکرێت بە ئازادبوونمان.

ئەوانەی کە بەتەمای ئازادبوونین شەو و رۆژ هەردێن و دەچین بیر لەوە دەکەینەوە، کەی

دەست دەکەن بە ئازادکردنمان. من بڕوام وایە، کە ئازاد دەکرێین و ئەمڕۆ ڕاگەیەندرا کە بەیاننامەی ڕێککەوتن دەخوێندرێتەوەو نەش خوێندرایەوە، ئەمڕۆ ڕۆژنامەکان قسەی مامەیان لە تورکیاوە نووسیبوو، کە دوێنێ لەوێوە قسەی کردووەو چووە بۆ لەندەن و پاریس و ئەلمانیا، هیچ هەواڵێکی وتووێژ نییە لە مامەیان پرسیبوو، دەربارەی گفتوگۆ هیچ وەڵامێکی نەدابووەوە.

شەوی ١٩٩١/٧/٢٨

**ڕۆژی (١٩٩١/٧/٢٩) دووشەممە**

ئەمڕۆ ساحە کرایەوەو هەموو چووینە ساحەو زۆربەی برادەرانمان بینی و زۆر قسەو باس ئاڵوگۆڕ کرا. ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ هەواڵ گەیشت، کە مەعلومات و ئیستمارەی ئازادبوون هاتووەو دەستکراوە بەراکێشانی ئیستمارەکان و لە ماددەکانیش تەنها (١٥٦) بەرناکەوێت و سەرپاکی ماددەکانی دیکە بەردەکەون.

ئەمڕۆ ئەوانەی گومانیان دەکرد هەر هەموویان دڵیان خۆش بوو، یەك پیرۆزبایی لەیەکتر دەکردو چەند کەسێکیان هاتن و پیرۆزباییان لە من کرد.

**ڕۆژی (١٩٩١/٧/٣٠) سێشەممە**

ئەمڕۆ هەواڵمان پێگەیشت کە ئیستمارەکان تەواوکراون و لە نیوەڕۆدا نێردراوە بۆ لیژنەکەو ئەمڕۆ لە (خاسە) خەڵك بەردراوە، دەنگ هەبوو کە نزیکەی (٧٥٠) کەس ئازادکراوە، ناوی لیژنەکە لەسەر ئیستیمارە بەم شێوەیە دانراوە:

| منظم الاستمارة | المدقق | المدير |
|---|---|---|
| عضو | عضو | عضو |
| المدير العام | العقيد | ممثل وزارة العدل |
| رئيسا للجنة/ ديوان الرئاسة | | |

بەپێی ئەم هەواڵە هیچ کەس لە ماددەکدا (ئیستیسنا) نییەو هەرهەموو ماددەکان بەردەکەون، ئێستا ئێمە چاوەڕوانین کە هەر سەعاتێك بانگیان کردین و بڕۆین و ڕزگاربین، هەرهەموو ئاواتمان لەگەڵ دەرچوونەکەدا ئەوەیە نەگەینە مواجهە لەبەر کەسوکار...

## ((ڕۆژی مواجەهە))

### ١٢ی خەرمانانی ٢٦٩١
### ٣ی ئابی/١٩٩١، شەممە

چەند ڕۆژێکە قاچی چەپم ئازارێکی تێدا پەیدابووە، دەمارەکانی قاچم دەفرێ، تائێستا دووجار (بەرۆمالجین) شەو هەنوومە، بەڵام هەروەکو خۆی وایە... ئەمشەو کە بۆ بەیانی مواجەهەیە، هەر لەخۆمەوە بەبێ هۆیەکی دیاریکراو پەستیی دایگرتووم، خۆشم نازانم هۆی چییە؟ وەکو حاسەی شەشەم شتێکی کۆکردبێتەوەو بیەوێت پێم بڵێت، بەڵام زات نەکات و وەکو پێی خۆش نەبێت پێم بڵێت وابوو... بەهەرحاڵ ئەم حاڵەم بەردەوامبوو، کاتێك (مەستەر) کراو شتومەکم ئامادەکرد بۆ مواجەهە... دەرگای بەشەکەمان کرایەوەو میوانەکان هاتنە ژوورەوە... بەرارەوەکەدا ملم نا بەرەو بەشی (حەوت و شەش) زۆر نەرزیشتم، لەولای بەشی حەوتەوە سەیرمکرد (زەینەب) گونییەکی بەسەرەوەیەو بەرەو لای بەشەکەمان دێت، چووم و کۆلەکەم لێگرت، بەڵام (عەزیز گرگاشەیی) لێی وەرگرتم و تا بەردەرگای بەشەکەمان. ئەو پەستییە دیاربوو، هەر لە دەم و چاو و هەڵسوکەوتم نەرەوییبوودوە... بۆیە (زەینەب) پرسی بۆ پەستی...؟ هەواڵتان چییە؟ کەی دەردەچن؟ منیش هەر بەو پەستییەوە وتم: دەرچوونی چی؟ ئێمە هیچ نازانین ئێوە دەزانن.

ئەوم گەیانە سەرەوەو نەختێك ئاوی خواردەوەو زۆری پێ نەچوو (ئازاد)یش پەیدابوو... ئازاد هێشتا نەحەوابووەوە، (محیەدین) گەیشتە بەردەرگای ژوورەکەم...

محیەدین دانیشت و دانەنیشت (بەهادین) هات و دوای بەخێرهاتنکردنی هەرهەموویان، ڕوویان تێکردم بۆ پەستی...؟ کەی بەردەبن...؟ لە وەڵامی پرسیارەکەیاندا، وتم: پەستنیم و بەربوونیش تا ئێستا لەبارەیەوە ئێمە هیچ ئاگادار نەکراوین و وتیان پرسیومانە بەمزووانە بەردەبن... قاچم جارناجارێك دەمارەکانی دەفرێ و دەستم بۆ دەبرد (محیەدین) پرسی، ئەوە چییە قاچت دێشێت؟ وتم: نا هیچ نییە.

کەوتنە گێڕانەوەی هۆی نەهاتنی (٦/١٩) کە چۆن خۆیان ئامادەکردووەو گەڕاونەتەوەو سواری سەیارە بوون و لەبەر تێکچوونی بارودۆخی شاری سلێمانی گەڕاونەتەوەو نەهاتوون.

ئەو شتانەی بۆیان گێڕامەوە، نەختێك ئاوی ساردی کرد بەدڵمداو وەکو هەستم بەتۆڵەیەك کردبێت وابوو... باسی ئێستای شاریان بۆ کردم، کە زۆر خۆشەو دەسەڵات بەدەست خۆمانەوەیەو دەسەڵاتی میریی زۆر کزە، ناتوانێت هیچ بکات. بەکۆمەڵ بەیەکەوە نانمان خواردو بەدوایدا چا... دوایی هەواڵپرسینی یەکەیەکەی براو کەس و خزمان و هاوڕێیان، دڵنیابووم لێیان وردەوردە ئەو تارماییەی، کە کەپڕۆکەی لەسەر دڵ و دەروونم کردبوو، کەوتە ڕەوینەوە. زۆری پێ نەچوو کاك (مەجیدو سالار) دەرکەوتن، زۆر دەمێك بوو لەگەڵ

مامۆستا (ئەحمەدو عەزیز)دا باسمان دەکردن و لۆمەمان دەکردن کە وەکو هاورێی رۆژانە لەم ماوەیەدا دیارنەبوون... پەیدابوون دوای ئەملاو ئەولای یەکتری ماچکردن یەکسەر خۆیان وتیان، روو زەردین کە درەنگ هاتین بۆ لاتان، داوای لێبووردن دەکەین، منیش وتم: برا وەڵلا بە ئارەزووی خۆمان باسمان کردوون... ئەمانیش زۆر شتی دلخۆشکەریان بۆ باسکردین، کە لە بەرژەوەندیی گەلەکەمان دەبینرا...

بەهەرحاڵ دەوری سەعات (١٢) مواجەهە تەواوبوو، لەگەڵیاندا رۆیشتمە خوارەوەو خواحافیزیم لێکردن، لەم مواجەهەیەدا نامەی (تایەرو کامەران و ئیبراهیم)م بۆ هاتبوو، لەگەڵ نمرەکانی (بەهار و ئازاد)دا بەخوێندنەوەی نامەکانیان بەرۆژی دووەمی مواجەهەم داناو ئەمرۆش وەکو مواجەهە وابوو لەگەڵ (تایەر، کامەران، ئیبراهیم، بەهار و ئازاد)دا.

ئەمرۆ ئەو پەستییە تۆزێك خاوی کردبووەوەو بەرەو رەوینە دەرۆیشت، ئەمرۆ پانزەیەمین رۆژی لێبووردنە، هیچ دەنگی دەرچوون نییە (ئەبو بیلال) هاتە بەشەکەمان و وتی: (هەرهەموو بەردەبن و بەردەکەون)و چەند رۆژە لە (١٩٤-٢٢٦) کاری تێدادەکەن و دەربارەی (١٥٦-١٥٧) پرسیاریان لە دیوان کردووەو چاوەروانی وەڵامی دیوانین، چونکە (١٧٥) هەمرو ماددەکانی سزا دادەپۆشێت، ماوەی چەند رۆژێك بوو بەهیوای جێبەجێکردنی لێبووردنەکە نەمابووین، چونکە (وەزیری عەدل) لە گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانیدا لە (٧/١٥) رایگەیاند، کە لیژنەکانی لێبووردن کاروبارەکانیان ئەنجامداوەو بەپێی یاسای (٢)و ئەوانەی کە سەر بە تاوانباری عادین، بەرناکەون... ماوەیەکیش بوو، دەنگی وتووێژ لە هەمور لایەکەوە کپ بوو، بەپێی ئەم دووشتە دەستمان لەوە شۆردبوو، کە ئازادمان دەکەن و برادەران هەرهەمرو لەبەر خۆیانەوەو بەیەکەوە سەرزەنشتی سەرکردایەتی و شۆرشیان دەکرد، لەبارەی خۆمانەوە: بریارمان دا، کە هەریەکە نامەیەکی توندوتیژ لەو بارەیەوە بنووسین و (من و کاکە عەزەو کاکە ئەحمەو کاکەحەمە) هەریەکەی نامەیەکمان نووسی و ناوەرۆك و شێوەی هەرچوار نامەکە وەك یەك وابوو، بریارمان دا کە هەریەکەمان بەرێگایەك بیگەیەنێتە شوێنی خۆی... ئێمە لەم باری دەروونییەدا دەتلاینەوە، کاتێکمانزانی رۆژی سێشەممە (٨/١٣) کاتژمێر (١٢)ی نیوەرۆ لە رێگای (چاودێریکەرەوە) داوای ناوی هەمور کوردەکانیان بەهەمور دەعوایەکی تاوانبارییەوە (واتە بە رامیاریی و جنایەتەوە) کرد.

بۆ شەوێ هەواڵمان پێگەیشت، کە گوایە فایلی هەرهەمور زیندانییە کوردەکان جیاکراونەتەوەو کاریان تێدا کردووە بۆ ئازادکردن. رۆژی چوارشەممە (٨/١٤) بەیانی لەگەڵ (مەستەرا) لە بەردەمی هەمور بەش و رەدهەکاندا بە (چاودێریکەریان) راگەیاند، چەند کوردی تێدایە، دوای مەستەر جیابێتەوەو نەرواتە ژوورەوە.

دوای (مەستەر) بەشی ئێمە (٢٤) کوردی تێدابوو، پێیان راگەیاندین کە بەریز بەرەو سەیتەرەکە برۆین و رۆیشتین. لای سەیتەرەکە لە رارەوی کارگەکان ریزیان کردین و دایانناین. کە ئێمە چووین چەند رەدهەو بەش هاتبوون... دانیشتین تا مەستەر تەواو بوو، هەرهەمرو

هاتن... دواجار رایانگەیاند کێ دەنگی باشە، بێتە دەرەوە، چی ناوێکمان خوێندەوە بانگی بکات. (خالد) چووە دەرەوەو کەوتنە ناوخوێندنەوە، پێنجەم ناو منیان خوێندەوە، هەر ناوێکیان دەخوێندەوە پێیان دەوت بڕواتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

ناوخوێندنەوە تەواو بوو، دەوری پەنجاو حەوت کەس ناویان نەبوو. چەند کەسیش کە نەتەوەکەی کوردە روون نەبوو، پێیان راگەیاندن، کە رۆژی مواجەهە بنێرن بۆ دڵنیابوونی نەتەوەیی و رۆژی شەممە بۆتان بهێننەوە، ئەم ناونووسین و جووڵەیە مقۆمقۆی خستە ناو زیندانییەکان، دەیانوت هەر کورد ئازاددەکەن و عەرەب ئازادناکەن.

# نووسینە تایبەتەکان

## (٤/١٧)و مەرگی هاوڕێ جوانرۆ

هاوڕێ (سالار محەمەد سەعید)، کە ناوی نهێنی لە ریزەکانی ریکخستندا (جوانرۆ) بوو. لەو شاڵاوەی بۆ ئەنفالی ریکخستنەکانی ناوشارەکان لەلایەن دامودەزگاکانی ئەمنەوە لە مانگی (١)ەوە بەچڕیی دەستپێکرد. هاوڕێ (جوانرۆ)ش لە رۆژی ١١/٢/١٩٩٠ (لەبەرێوەبەرێتیی گەشتوگوزاری سلێمانی) کەوتە بەر ئەو شاڵاوەو لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە راپێچی ئەمن کراو کەوتە ژێر ئازارو ئەشکەنجەیەکی بەردەوامەوە... (کاکە سالار) قارەمانانە خۆی گرت و پیاوانی ئەمنی سلێمانی چەواشەکرد. ئەشکەنجەو ئازاردان کاریان لەبیرو باوەڕی نەکردو بە ئازاری جەستەی، جەللادەکانی شەرمەزارکرد. مانەوەمان لە ئەمنی سلێمانی تا نیوەی یەکەمی مانگی ١٠/ ١٩٩٠، لەزۆر رووەوە کاریگەریی لەسەرمان هەبوو. یەکەم: بەهۆی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجانەی لەو ماوەیەدا بێبەزەییانەو نامرۆڤانە ئەشکەنجەی یەکە یەکەیان داین. دووەم: لەڕووی دەروونییەوە، کە کەسمان لێمان روون نەبوو چارەنووسمان بەچی دەگات. سێیەم: لەڕووی کەمیی و جۆری خواردنمانەوە کە راستەوخۆ کاری کردبووە سەر جەستەمان و هەموومانی لاوازو بێهێز کردبوو. چوارەم: لە رووی بێبەریکردنمان لە تیشکی خۆر کە رۆڵی گرنگی هەیە بۆ جەستەی مرۆڤ. پێنجەم: پیسیی و پۆخڵی ژوورو جێگاو پێخەفمان کارێکی وایکردبوو کە ئەسپێیەکی زۆرمان هەبوو، زووربەی زۆرمان بەوهۆیەوە دووچاری نەخۆشییەکانی پێست بووبووین، جگە لەنەخۆشیی پێست، زۆربەشمان تووشی نەخۆشیی جۆراوجۆری دیکە بووبووین.

یەکێك لەو هاوڕێیانەمان کە بەوهۆیانەوە دووچاری نەخۆشییەکی سەخت بوو، لە ئەمنی سلێمانی هاوڕێ (سالار) بوو. کە بەدەست ئازاری ئەو نەخۆشییەوە دەیناڵاند، لە ئەمنی سلێمانیش هیچ رێگایەکی چارەسەرکردنی نەخۆشیی نەبوو. پیاوە جەللادەکانی ئەمنی سلێمانی، گاڵتەیان بە نەخۆشیی زیندانیی دەهات و حەزیان دەکرد لەجیاتی چارەسەرکردنمان، یان بردنمان بۆلای پزیشك و نەخۆشخانە، حەزیان دەکرد هەرهەموومان بە زەلیلی و زەبوونی لەبەردەستیاندا سەربنێینەوەو لەناوبچین. (کاك سالار) هەرچەند لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا بەتواناو ریخۆڵەکێش بوو، بەڵام نەخۆشییەکەی ئەمنناساو بەعسییانە ئەشکەنجەیان دەداو دەویست بەتەواویی کەنەفتی بکات و شەو و رۆژ بەچرکەیەك خافڵی نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەمنی سلێمانی بە وردەیەکی بەرزەوە ململانێی لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا دەکردو توانی بەسەریدا زاڵبێت... کە بردیانین بۆ دادگا، لە دادگای سەورە حوکمیان بەسەر هاوڕێ (جوانرۆ) لە داسێدارەدان نەبوو، بەڵام نەخۆشییەکەی لە (دادگای عەواد بەندەر) زاڵمانەتر

حوكمی بەسەر کاکە سالاردا دابوو. بۆیە کە چووینە بەندیخانەی ئەبوغرێب و بەسەر بەش و ڕەدهەکاندا دابەشیانکردین، (هاوڕێ جوانرۆ) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکەدا بەر بەشی (٦) کەوتن، یەکێکیان هاوڕێ (سامان مەولود) کە ناوە نهێنییەکەی (بەرزان) بوو. زیندانی ئەبوغرێبیش دەردو خەمەکانی لە ئەمنی سلێمانی کەمتر نەبوون. بۆیە کاکە (سالار) ڕۆژ بەڕۆژ نەخۆشییەکەی زیاترو زیاتر پەرەیدەسەندو فاشییانە پەلاماری جگەرو هەناوی دەدا. چارەسەریش لە بەندیخانەی ئەبوغرێب بۆ نەخۆشەکانی بەندیخانە، نەخۆشخانەیەکی ناو بەندیخانەکەبوو، کە هەفتانە پزیشکی پسپۆڕی نەخۆشییەکان دەهاتنە نەخۆشخانەکە. هەندێك نەخۆشی زیندانییەکان، نە نەخۆشخانەکەو نە ئەو پزیشکانەی هەفتانە دەهاتن، نەدەبوونە هۆی چارەسەرکردنی و دەرەقەتی نەدەهاتن، چونکە یەکێك بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشیی و چارەسەرکردنی، باری دەروونیی و ئاو و هەوای پاك و نەخۆشخانەی تایبەت و پزیشکی تایبەتە، لە بەندیخانەدا ئەمانە نەبوون، ئیتر نەخۆش چۆن چاك دەبێتەوەو چارەسەری بۆ دەکرێت؟ هاوڕێ (جوانرۆ) هەرچەندە لە بەندیخانەی ئەبوغرێبەوە دووجار بۆ پشکنین و چارەسەر نێردرا بۆ (نەخۆشخانەی شوعلە) لە دەرەوەی بەندیخانە، کە ئەو نەخۆشخانەیە تایبەت بوو بە بەندیخانەکان، بەڵام لەو نەخۆشخانەیەش نەتوانرا هیچ چارەسەرێکی ئەوتۆی بۆبکرێت، تەنانەت لە جاری دووەمدا لەو نەخۆشخانەیە پێیان ڕاگەیاندبوو، کە نەخۆشییەکەی چارەسەری نییەو ژیانی لە مەترسی نەماندایە. ئەم ڕاگەیاندنەی پزیشکەکانی (خەستخانەی شوعلە) هەموو بەرپرسانی ئیدارەی بەندیخانە دەیانزانی، لێی ئاگاداربوون، باش باش دەیانزانی کە (کاك سالار) ناژی و نەخۆشییەکەی بەشێوەیەك کەنەفتی کردووە، کە هیچ دەرمان و پزیشك و نەخۆشخانەیەك، فریای ناکەوێت و چارەسەری ناکات و نایەڵێت درێژە بە ژیانی بدات، کەچی ئەو کاربەدەستانەی بەندیخانە کارێکیان نەکرد، کە بڕیارێکی بۆ وەربگرن و ئەو حوکمەی بەسەر ئەودا درابوو، وا بکەن بەفەرمان و بڕیارێکی تایبەت لە بەندیخانە دەری بکەن و بینێرنەوە ناوماڵ و منداڵ و کەسوکاری، بۆئەوەی ئەو چەند ڕۆژەی ژیانی لەناویاندا بەسەر بەرێت و بیکەنە هەڵوێستێکی مرۆڤایەتیی و نەیکەنە خاڵێکی ڕەشی نامرۆڤانەیان، سەبارەت بە ژیانی مرۆڤێك، ئەو بەعسییە دڵڕەش و دەروون نەخۆشانە، بڕیاری ئەوەیان دابوو، تا دوا تەمەنی ژیانیان دژی مرۆڤ و مرۆڤایەتیی ڕەفتار بکەن و بڕیاری فاشییانەیان جێبەجێ بکەن. بۆیە کاك (سالار)یان بەو نەخۆشییەوە لە بەندیخانەدا هێشتەوە، ئازاری نەخۆشیی کردی و کاکە سالاریش کردی... بۆیە دوای ئەو دووجار بردنە بۆ (نەخۆشخانەی شوعلە)و گەڕانەوەی، بەناچاریی بردیانە (نەخۆشخانەی بەندیخانە)و ماوەی زیاتر لە (حەڤدە شەو و ڕۆژ) خەواندیان. لەکاتێکدا کە لەو نەخۆشخانەیە خەواندبوویان و پزیشکەکانی (نەخۆشخانەی شوعلە) ڕایانگەیاندبوو، لە ماوەیەکی کەمدا گیان لەدەست دەدات و نەخۆشییەکەی سارییەو هەرکەس نزیکی بێت تووشی دەبێت، (هاوڕێ سامان مەولود)ی هاوڕێمان بەبێ گوێدانە ڕاسپاردەی پزیشك، لەبارەی توشبوونییەوە، دەسەبەری

ئەوەبوو، کەوا ئەو ماوەیەی لە نەخۆشخانەی ئەبوغرێب کەوتبوو، بەدیاریەوە بێت و بەوپەڕی دڵسۆزیی و هاوڕێیانەو برایانەو کەسانە، شەو و ڕۆژ خزمەتی بەردەوامی بکات. لەکاتێکدا ئێمەی هاوڕێیانی (کاکە سالار) لەو ماوەیەی کە لەسەر جێگاو ژوورەکەی بەدەست ئازاری نەخۆشییەکەیەوە دەیناڵاند، جار جار نەبێت دەچووین سەرێکمان لێدەدا، ئیتر هیچی دیکەمان پێنەدەکراو دەسەڵاتمان نەبوو، بەڵام (کاک سامان) لەو کاتانەشدا کە هەردووکیان لە یەك بەشبوون و هەریەکەیان لەژوورێك بوون، بە بەردەوامی خزمەتی دەکردو خافڵی نەدەکرد.

(کاك سامان) گێڕایەوە، وتی: شەوی ١٦-١٧/٤/١٩٩١ کە بۆ بەیانی ڕۆژی مواجە هەبوو. ئێمە لە نەخۆشخانەکە بووین، شەو ریشم بۆ تاشی و حەمامی کردو خۆی شۆرد. بەنیازی ئەوەی بەیانی مواجەهەیەو کەسوکاری دێنە مواجەهەی، بەڵام شەو لەدوای کاتژمێر دووەوە، پێی ڕاگەیاندم کە باری تەندروستی زۆرخراپە، وتی: کە سەرنجمدایە، ڕاستوایەو وردە وردە خراپترو خراپتر دەبێت، لە (کاتژمێر چواری بەیانی) لەسەر قەرەوێلەی ئەو نەخۆشخانەیە، لەبەر دەست و چاومدا گیانی سپارد. دوای ئەوەی کە دڵنیابووم لەوەی کەوا کاك سالار چووە پاڵ (٥) هاوڕێ شەهیدەکەی دیکەمان. ئیدارەی نەخۆشخانەم ئاگادارکرد، ئەوانیش هاتن و تەرمەکەیان لێوەرگرتم و لە شوێنی تایبەت دایاننا، منیش بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە، بەبێ کاك سالار گەڕامەوە بۆ بەشەکەم، هەواڵی کۆچی سالاری جوانەمەرگم بە هاوڕێکانم ڕاگەیاند، کاتێك مواجەهەکاران هاتن و کەسوکارەکەی ئەویش هاتن، بەناچاریی ئەو هەواڵە جەرگبڕەم پێدان و ئەوانیش دوای هەوڵیان، توانییان تەرمەکەی وەربگرنەوەو بیبنەوە بۆ سلێمانی. ڕۆژی مواجەهەکە هەواڵەکە بڵاوبووەوە. هەرهەموو ڕۆژەکەمان لێشێواو هەریەکەمان لەناخی خۆماندا پرسەمان بۆ (کاك سالار) دانا، باوەڕناکەم کەسێکمان بووبێت بە کۆچی (کاکە سالار) کۆستکەوتوو نەبووبێت و بە شەهیدبوونی هەر (٥) هاوڕێکەی دیکەمانی بیرنەخستبێتەوە، بەداخەوە کاکە سالار لە مانگەکانی (١-٢) دا دەنگوباسی کەساسیی و زەلیلیی بەعس و سەرۆکەکەیانی بیست، لە مانگی (٣)شدا ئازادکردنی کوردستانی پێڕاگەیەندرا بە کەرکوکیشەوە، بەداخەوە لەدوا ڕۆژی تەمەنیدا، هەواڵی کۆڕەوی بەگوێدا درا، سەد موخابن کە مەرگ مۆڵەتی نەدا بەچاوی خۆی ئازادیی و سەرفرازیی گەلەکەی و کوردستانەکەی ببینێت، ڕۆژانێك لەو ئازادییەدا هەوای سەربەستیی هەڵمژێت و ئۆخەیەك بکات کە ئەو بیروباوەڕەی ئەو لەپێناویدا خەباتی بۆ دەکرد، بەجۆرێك لەجۆرەکان بە ئامانجەکانی گەیشتووە.

بەبۆنەی شەهیدبوونی هاوڕێ (جوانرۆ)وە لە بەندیخانە، (شیعرێکم) بۆ نووسی و لەکاتی خۆیدا ناردمەوە بۆماڵەوە، کە ئازادکراین و هاتینەوە سەرخۆمان، کەوتمە تاقیبی ئەو نووسینانەی کە لە بەندیخانە لە نووسین و شیعرو پەخشان و نامە نووسیبووم، کە سەیرمکرد ئازادی کوڕم بە خەتە خۆشەکەی هەرهەمووی لە دەفتەرێکدا نووسیوەتەوەو پاراستوونی، یەکێك لەو نووسینانە شیعرێکەی هاوڕێ جوانرۆ بوو. زۆرم بەلاوە گرنگ بوو،

خۆشم دەویست هەرجارێك دەمخوێندەوە تێر دەگریام. لە مانگی ١٩٩٢/٤-دا لە ساڵیادی کاك (سالار)دا لە هۆڵی (یەکێتیی نووسەرانی کورد) کە بارەگاکەی لە بەختیاری بوو، ئێستا وەزارەتی شارەوانییە، سازکرا، هۆڵەکە جمەی دەهات. لەو کۆڕەدا پارچە هۆنراوەکەم خوێندەوەو لەکاتی خوێندنەوەیدا، قورگم پڕبوو لە گریان و زۆربەی زۆری ئامادەبووانیش لەگەڵ خوێندنەوەی پارچە شیعرەکەدا گریان. ئێستاش بیرمە خوشکە (کوردە) کە یەکێك بوو لە زیندانییە ژنەکان لە کۆتایی کۆڕەکەدا هات بۆلام و پێی وتم: بۆ وات کردو بەو شیعرە کاریگەرەت هەرهەموومانت خستە گریان؟

ئەو بابەتە وەکو هەموو بابەتەکانی دیکە تۆمارکرا... لە رۆژگارە رەشەکانی گەلەکەماندا، لە ئەنجامی شەڕی خۆکوژیی کە ٣١/ئابی ١٩٩٦ یەخەی پێگرتین، بەناچاریی ماڵەکەم لەناو شاری سلێمانی جێهێلاو کۆمەڵێك لەو نووسینانەم لەماڵەوە مانەوەو بەجێم هێشتن. کاتێك گەڕاینەوە، بەداخەوە هاتمەوە سەر هەواری خاڵیی و جگەلەوەی کەلوپەلی ماڵەکەم تاڵانکرابوو، دەستکاریی کتێبخانەو ئەو شتانەشم کرابوون، ئەو نووسینەم لەگەڵ کۆمەڵێك نووسین و نامەو شیعردا، بەر شاڵاوی تاڵانکردن کەوتبوون. خەمم لە کەلوپەلەکان نەخوارد، چونکە لە ژیانمدا ئەوە سێیەم جار بوو، کە من ماڵم دروست دەکردو تاڵان دەکرا، دەمزانی هەموو کەلوپەلێك دەتوانرێت بکردرێنەوەو پەیدای بکەمەوە، بەڵام لەناوچوونی بەرهەمی ئەدەبیی زۆر زەحمەتە کە لەناوچوو، پەیدابکرێتەوە، یان بنووسرێتەوەو دابڕێژرێتەوە. لەم مەرگەساتەدا (ساڵی ١٩٧٤)ی هێنامەوە یاد، کە لەو ساڵەشدا کۆمەڵێك بابەتی ئەدەبیی و وێنەی چەند ساڵەم لەناوچوون، تائێستا خەمیان نارەوێتەوە. بەتایبەتی نووسینێك لەناو بەندیخانەدا نووسرابێت، دەبێت چ بایەخێکی بۆ کەسێکی وەکو من هەبێت؟! من دڵنیام ئەونووسینانە دەست کەسانی ئەوتۆ کەوتوون، کە هەموو نووسینەکانی وەکو کەلوپەلی ناوماڵ سەیرکردوون و هەر لەماڵ بردوونیەتە دەرەوە، خۆی پێوە ماندوو نەکردووەو لەسەر شەقامەکان فڕێیداون، دیارە ئەهلی قەڵەم و نووسین نەبوون، کە زانیویانە شتێك نییە کەڵکی مادیيان پێبگەیەنێت، لایان بووەتە بارو لەکۆڵ خۆیان کردووەتەوە، بە نەزانییان گەورەترین زیانیان بەمن گەیاندو گەنجینەیەکی بەنرخیان لە گەنجینەی بیرو رۆژانی ژیانی زیندانیان لەناوبردم، حەزدەکەم بزانرێت لەو مەرگەساتەدا ئەم نووسین و نامانەم لەناوچوون:

١. مەرگی (هاوڕێ جوانڕۆ).
٢. نامەیەك بۆ کاك (نەوشیروان مستەفا).
٣. نامەیەك بۆ شاعیر (شێرکۆ بێکەس).
٤. گەرمیان و داستانی شەهیدان.
٥. کشانی پێنج ئەستێرە.
٦. رەو و ئەندێشەی باوك.
٧. ژێرزەمینی دادگا.

٨. تاوانتان کرد ئەنفالتان کرد.
٩. لە پەنجەرەی زیندانەوە.
١٠. نەورۆزو زیندان.
١١. چەند نامەیەك بۆ هاورێیان (حەمەرەشید، حەمەنووری، جەمیلە، پەروین، هاورێ خەبات و (بلە)و چەند نامەی دیکەی لەو جۆرە.
١٢. گفتوگۆو نامەیەك بۆ بەرێزان.
١٣. دەفتەری یاداشت کە وەکو رۆژژمێرێکی زیندان وابوو.
١٤. چەند بابەتی دیکەی وەکو زیندان و بیرەوەریی رۆژانی ژیانم.

ئەمانە هەموو لەناوچوون... دوای مشوورخواردن، لە ئەنجامی گەڕان و پرسیارکردنمدا، ئەم بابەتانەم لای چەند هاورێ و کەسێك دەستکەوتەوە.
(گفتوگۆو نامەیەك) لای مامۆستا (کەریم شێخانی) کە ناردبووم بۆ کوردستانی نوێ کە بەدەستخەتی (مامۆستا سامان) نووسرابووەوە، لای خۆی پاراستبووی.
(پێنج ئەستێرە) نووسخەی لای (کاك حەمەتایەری شێخ مەحمود) پارێزراوبوو. (مانگی یەکەمی دەفتەری یاداشتەکەم) لەگەڵ چەند رۆژێکی دیکەدا لە ماڵی (محێدینی برام) پارێزرابوون. ئەو پارچە هۆنراوەیەی بۆ (شەهید سالار) نووسرابوو. چەند هەوڵمدا چنگم نەکەوتەوە، تەنانەت سەرم لە ماڵیان دا. بۆئەوەی ئەو شریتەی کە لە رۆژی کۆرەکەدا تۆمارکرابوو، بمدەنێ تاو ئەو شیعرەی لێ وەربگرمەوە. بەداخەوە پێیان راگەیاندم، کە ئەوانیش ئەو شریتەیان لەناوچووەو لایان نەماوە. چەندم هەوڵدا دەستم نەکەوتەوە، بۆیە بەجێی خۆیم زانی کە ئەم نووسینەی بە نووسین لەسەر بنووسم.
هەروەها لەو بابەتانەی دیکە زۆربەیانم دەست نەکەوتەوە، بەراستیی زۆر زۆر بۆیان بەداخم و ئەگەر بمانایە هەریەکەیان بەجۆرێك لە جۆرەکان کتێبەکەیان دەولەمەندتر دەکردم. من وامزانی هەر بەعس و رژێمەکەی، دوژمنی سەرسەختی ئەدەبیاتی گەلەکەمانن، نەمزانی کە خۆشمان ئەگەر کەوتینە دژایەتی یەکتر، رقی تۆلەسەندنمان لە دوژمنایەتییەکەی بەعس خەستترو نارەواتر دەبێت. من نازانم ئێستا کوێ بۆ ئەمانە بگەرێم؟!
(نامەی کاك نەوشیروان، ژێر زەمینی دادگا، بۆ شەهید سالار، تاوانتان کرد ئەنفالتان کرد، لە پەنجەرەی زیندانەوە، نامەی کاك شێرکۆ، نامەکانی کاك حەمەرەشید، کاك حەمەنووری، جەمیلە، پەروین، هاورێ خەبات، برایمی مامۆستا شێخ ئیسماعیل، لاپەرەکانی دەفتەری رۆژانەی زیندان و چەندین نامەو نووسینی دیکە).

## (٥/١٥)و سەردانێکی چاوەڕواننەکراوی (کاک نەوشیروان مستەفا)

بەپێی هەواڵەکان دەمانزانی کە (کاک نەوشیروان مستەفا) وەکو نوێنەری (ی.ن.ك) لەگەڵ وەفدەکەدایە لە بەغدا، شتێکم بەرگوێ کەوت کە گوایە یەکێك لە ئەندامانی وەفدەکە هاتووەتە ئیدارەی بەندیخانەو پرسیاری یەکێك لە زیندانییەکانی کردووە. باوەڕم نەدەکرد ئەو هەواڵە ڕاستبێت. لە مواجهەی نیوەی مانگ لە (٥/١٧)دا. لە مواجهەدا باسکرایەوەو وترا کە ئەندام وەفدەکە (کاک نەوشیروان) بووەو هاتووە بۆلای (کاک مستەفای سەید قادر)...
لەڕاستیدا لە مواجهەی نیوەی مانگدا بیرم نەماوە کێ هاتبوو بۆلام، بەڵام بەدڵنیایی خەڵکانێك بۆلام هاتبوون.

دوای مواجهە بەدوو ڕۆژ دەرگای هۆڵەکان بۆ چوونە ساحە کرایەوەو چوومە ساحە. لە ساحە بەپێی قسەی هاوڕێکانمان بۆم دەرکەوت، کە ڕاست بووە کاك نەوشیروان لە ڕۆژی (١٥و٥/١٦)دا هاتبووە بەندیخانەو لەیەکەم ڕۆژدا، واتە لە ڕۆژی (٥/١٥)دا داوای (مستەفای سەید قادر)ی کردبوو. چەند بانگیان کردبوو بە بڵندگۆ، وەڵامی دەست نەکەوتبوو. دیارە کاك مستەفا کە دەستگیرکرابوو بەناوی (عومەر مەحمود ئیسماعیل)ەوە گیرابوو. کە لە دادگاش حوکمدرابوو، هەر بەو ناوەوە حوکمدرابوو، نێردرابوو بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب، ڕۆژی (٥/١٦) کە جارێکی دیکە هاتبووەوە (مامۆستا فەرەیدوون دارتاش)ی بانگکردبوو. دیاربوو لە بانگکردنەکەی ئەودا تێگەیشتبوو، کە بۆ کەس وەڵامی ئەو بانگکردنەی نەداوەتەوە.

ئەوکاتە من (کاك مستەفا)م نەدەناسی. دەمزانی لەدوای حوکمدانی ئێمە، هاوڕێیەکی دیکەمان دەستگیرکراوەو حوکمدراوەو هێنراوەتە ئەبوغرێب و دەوترا ناوی (عومەر)ە.

من لام سەیربوو، کە سەرکردەیەکی خاوەن ئەزموون و شارەزا لە بەعس و سیاسەتی بەعس و ڕژێمەکەی، چۆن پرکێشی ئەوەی کردووە بەبێ دەرچوونی بڕیاری لێبووردن. هاتووەتە بەندیخانەو پرسیاری هاوڕێیەکی وەکو کاك مستەفای کردووە؟ ویستوویەتی بیبینێت و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکات؟! ئەوەی دەیڵێم هەر ڕای من نەبوو، بەڵکو ڕای سەرجەمی هاوڕێیانم لەو بارەیەوە وابوو. ئێمە دەمانپرسی باشە کاك نەوشیروان لەو ژمارە زۆرە گیراوەی ئێمە، بۆ بەتەنها هاتووەو پرسیاری کاك مستەفای کردووە؟ ئەمە بووە جێگای سەرسامیمان و مەتەڵەکەمان بۆ هەڵ نەدەهات... لەناو خۆماندا دەمان وت: (کاك نەوشیروان) لەجیاتی ئەوەی لەناو وەفدی کوردییەوە بێتە بەندیخانەو تەنها پرسیاری یەکێکمان بکات، بۆئەوەی بیبینێت، داوای لە وەفدی حکومەت بکردایەو پێی لەسەر دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی گشتیی بۆ زیندانییان داگرتایە باشتر نەبوو؟

ئێمە بەوە نیگەران بووین، چونکە هەریەکێك لە ئێمە لە لێکۆڵینەوەکانمانداو لە دادگا ئینکاریی ئەوەمان کردبوو، کە سەر بە (ی.ن.ك) نین و لە ئەمنی سلێمانی و دوای جەلسەی یەکەمی دادگا. چەند کەسێکیان لێ بانگکردین بۆئەوەی نامە بۆ کاك نەوشیروان بنووسین و

قسەی پێ بڵێین، چەند کەسێکمان نەچووینە ژێرباری ئەوەی کە ئەونامەیە بنووسین و یەکێك لە کەسەکان من بووم. لەکاتێکدا وەفدی کوردی هاتووەتە بەغدا بۆ وتوویژو رێککەوتن، جاریّ نەیانتوانیوە بریاری لێبووردن دەربکەن و روونیش نییە ئایا ئەم وتوویژە سەردەگرێت، یان نا؟ لەکاتێکدا وتوویژ سەرنەگرێت و رێککەوتن نەکرێت و لێبووردنی گشتیی دەرنەچێت، سەردانی کاك نەوشیروان لەدوای کشانەوەی وەفدی کوردی، نابێتە کێشە بۆ ئێمەی زیندانیی و رژێم هەروا بەئاسانی دەستبەردارمان دەبێت؟ کە باش دەزانرا ئەو رژێمە دەربەست نەبوو، کە لەسەر بریاری دادگای سەورەکەیەوە جارێکی دیکە ئێمە بگێرێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەو بمانداتەوە بە دادگاو حوکمی قورسترمان بەسەردا بدەن، کە ئەم جۆرە رەفتارانە بۆ بەعس و رژێمەکەی شتێکی زۆر ئاسایی و چاوەروانکراوبوو.

لەبارەی سەردانەکەی کاك (نەوشیروان)ەوە نامەیەکم بۆ نووسی و لە نامەکەدا رەخنەم لێگرتبوو. نازانم نامەکەی بەدەست گەیشتبوو، یان نا؟ نووسخەیەك لە نامەکەم لە ماڵەوە نووسیبوویانەوەو لە(٣١/ئابی ١٩٩٦)دا لەگەڵ کۆمەڵێك نامەو نووسینی دیکەمدا لەناوچوون، ئەگەر بەدەستی گەیشتبێت لەو باوەرەدام کە لە ئەرشیفەکەیدا ماوە، چونکە وەکو بزانم کاك نەوشیروان، گرنگی بەپاراستنی ئەرشیف دەدات. لەراستیدا من تائێستاش لەبارەی ئەو سەردانەی کاك نەوشیروانەوە هیچ زانیارییەکم لانییە، تا لە مەبەستی هاتنەکەی بگەم و رێکەوتی واش نەبووە نە لەخۆی پرسیار بکەم و نە لە کاك مستەفا و رای کاك مستەفاشم لەوبارەیەوە هەر نەزانیوە، کە لەسەر سەردانەکە رای چی و چۆن بووە؟

## (١٩٩١/٧/١٥)و سەردانێكی بێهودەی (دكتۆر فوئاد مەعسوم)

ماوەی سێ مانگ و نیوە، وەفدی كوردستان لە بەغدان. هیچ دەنگوباسێكی لێبووردن نییە. ئێمە شەو و رۆژ لە چاوەڕوانیداین. بەیانی رۆژی (٧/١٥) لە دەورووبەری كاتژمێر (٩) لەلایەن ئیدارەی بەندیخانەوە ئاگادار كرام، كە ریش بتاشم و جل لەبەربكەم و خۆم ئامادە بكەم. لە ئاگاداركردنەكەدا پێیان نەوتم ئەم خۆئامادەكردنە بۆ چییە. زۆرجار ئەو زیندانییانەی كە بڕیاری لەسێدارەدانیان بەسەردا دەدراو بۆ لەناوبردن بانگ دەكران، بەهەمان شێوە پێیان رادەگەیاندن كە بەو شێوەیەی بەمنیان وت، خۆیان ئامادە بكەن. ئەو رۆژانە دەكەوتنە رۆژی (چوارشەممە)ی هەفتەكانەوەو ئەمرۆش كە من ئاگاداركرام (چوارشەممە)یە.

كەوتمە خۆئامادەكردن، بەڵام چۆن؟ لەوپەڕی ڕاڕایی و بیركردنەوەدا بە (كاكە حەمە) و (بەختیار)و (مارف)م وت: بانگكردنەكەم ئاسایی نییە، رۆژەكەش رۆژێكی نەگریسە لە بەندیخانە. بۆیە وەسیەتنامەیەكم نووسی و دامە دەست (كاك حەمە)و ئەوەی مەبەستم بوو تیایدا نووسیم. پێم وت: ئەگەر رۆیشتم نەگەڕامەوە، ئەم نامەیە لات پارێزراوبێت تا منداڵەكانم دێن، كە هاتن بیدەرە دەستی (زەینەب). كاكە حەمە وتی: باشە بۆ وا شڵەژاویت؟ وتم: (كاكەحەمە) بانگكردنەكە ئاسای نییە، ئەم (بەعسە) متمانەی نییە، هەرچەند سەر دێنم و دەبەم هیچ هۆیەك نییە بۆ بانگكردنم. لەوكاتەوەی ئاگاداریان كردم ریشم تاشی و خۆم گۆڕی، چوار قۆڵی لەگەڵ (بەختیارو كاكەحەمەو مارف)دا لە ڕاڕەوی بەشەكەمان كەوتینە پیاسەكردن. دوای دوو كاتژمێر زیاتر. لە ئیدارەوە هاتنەوەو بانگیانكردم و دەرگای بەشەكەیان كردەوەو چوومە دەرەوە (كاكەحەمە) لەگەڵمدا هاتەدەرەوەو لە پۆلیسەكەی پرسی نازانیت بۆچی بانگی دەكەن؟ وتی: نازانم و كاكەحەمەی كردەوە ژوورەوەو منی پێش خۆی دا. لە بەشەكانی (٧-٦)و رەدهەكانەوە سەیریان دەكردم... كاتێك بەرەو ئیدارەیان بردم و لە ژوورێك دایاننام، كاتێكمزانی (هاوڕێ عەبدولعەزیز عومەرو مامۆستا فەرەیدوون دارتاشیشیان) هێنا. ئەوانیش بەهەمان شێوە نەیاندەزانی بۆ بانگكراون و ئیشی چییان پێمانە. ئێمە لەگەڵ خۆماندا لە قسەكردندا بووین و گەردەشمان لەسەر بانگكردنەكە دەكرد، هاتن و دەرگایان كردەوەو بەدوای یەكدا بردیانین بۆ ژوورێكی دیكە، كە چووینە ژوورەوە سەیرمانكرد (دكتۆر فوئاد مەعسوم) دانیشتووە. لەبەرمان هەستاو خۆی پێناساندین و لەگەڵماندا ماچ و مووچی كردو دوایی وتی: دانیشن، من یەكێكم لە نوێنەرانی (ی.ن.ك) لە وەفدەكەدا، هاتووم بۆلای ئێوە، واتە ئەو كۆمەڵەی كە بەیەكەوە لە دادگای سەورە حوكمدراون. وتی: حەزم دەكرد كە هەرهەمووتان ببینم، بەڵام ئەوە نەدەكرا، بۆیە ئێوەم بانگكردووە، بۆئەوەی وەكو نوێنەری هاوڕێكانتان بتان بینم و پێتان رابگەیەنم، كە ئێوە بەمنزیكانە بەردەبن و هەر لەم مانگەدا ئازاد دەكرێن، كە بەربوون ئێمە یەكسەر دێینە پێشوازیتان و كە گەیشتنە سلێمانی دەتان بەین بۆ (خێوەتە) لە شارباژێرو لەوێ ئاهەنگێكی

خۆشتان بۆ سازدەکەین. بڕێك پارەم بۆ هێناون، پارەکە بۆ ئەوەیە کاتی ئازادبوونتان، مەسرەفی ئۆتۆمبێل و ئوتێلی پێ بکەن تا دەگەنەوە سلێمانی، پارەکە دەدەمە ئێوە. ئێوە ئارەزووی خۆتانە پارەکە لای خۆتان دەهێڵنەوە وەکو لیژنەیەك لەکاتی ڕۆژی ئازادبوونتاندا خەرجی هاتنەوەتانی لێ بکەن، یان بەپێی ژمارەتان پارەکە بەسەریاندا دابەش دەکەن. وتمان: تائێستا لێبووردنی گشتیی دەرنەچووە، ئیتر ئێمە چۆن ئازاد دەبین؟ وتی: لێبووردنەکە لەم ڕۆژانەدا دەردەچێت. پرسیمان ئەم پارەیە بۆ هەموو ئەوکەسانەیە کە لەسەر (ی.ن.ك) دەستگیرکراون، یان تەنها بۆ ئێمەیە؟ وتی: ئەم پارەیە تەنها بۆ ئەو زیندانییانەیە کە بەیەکەوە دەستگیرکراون و حوکمدراون، واتە هاوڕێکانی (شەهید جەبارو ڕێکخراوی پیرەمەگروون).

ماوەیەکی باش لەگەڵماندا دانیشت، بەکورتی باسی گفتوگۆکەو چۆنیتی وتووێژەکانی بۆ باسکردین و باسێکی کورتی بارودۆخی کوردستانی کردو بەئومێدەوە لە بارودۆخەکەی دەڕوانی، وتی: ئەمە ڕێگایەکە بۆ گەڕانەوەی خەڵکە ئاوارەو ڕاکردووەکەمان، چونکە دۆخی خەڵکەکەمان لە (ئێران و تورکیا) خراپەو باش نییە. ئەگەر ڕێگا چارەسەرێك نەدۆزینەوە، خەڵکەکەمان تووشی کارەساتی ناخۆشتر دەبێت. ئێمە ڕەخنەمان لەوە گرت کە (کاك نەوشیروان مستەفا) لە مانگی (٥)دا بەمەبەستی بینینی (کاك مستەفای سەید قادر) سەردانی بەندیخانەی کرد، کە دەبوو تا نەگەنە بڕیاری دەرکردنی لێبووردنی گشتیی بۆمان، سەردانمان نەکەن، ئەگەر بەرێزیشت بەتەواویی لە بڕیاری لێبووردن دڵنیا نەبیت، نەدەبوو بەم ئاشکراییە بێیت بۆلامان و ئاوا لەپێش چاوی ئەم بەعسییانە پارەمان بدەیتێ، وتی: ترستان نەبێت و دڵنیابن کە بەدوای هاتنی مندا ئازاد دەکرێن، ئێمە لە (خێوەتە) هەموو شتمان بۆ ئامادەکردوون، ئەوەشی پێڕاگەیاندین کە لە هاتنی ئەوەوە لیستی ناوی ئەو زیندانییە کوردانە بکەین کە لەسەر سیاسەت و شۆڕش دەستگیرکراون، ئەوانەی سەر بە (یەکێتی، پارتی، حسك و حزبی شوعی)ین و لە مواجهەدا لیستی ناوەکانیانمان بۆ بنێرینەوە.

ماوەیەك بەیەکەوە دانیشتین داوای ڕۆیشتنی کردو خواحافیزیمان لەیەك کردو پارەکەمان لێوەرگرت. لە ژوورەکە پێش گەڕانەوەمان بۆ شوێنی خۆمان، بڕیارماندا کە پارەکە بەپێی ژمارەی هاوڕێکانمان بەسەریاندا دابەش بکەین و وامان بەباشزانی پارەی بەشەکانی لای بەشی هەشتەوە، من بەسەریاندا دابەشبکەم و بەشەکانی دیکەش (عەبدولعەزیزو مامۆستا فەرەیدوون) دابەشی بکەن. گەڕاینەوە برادەرەکانمان لە دەرگاکانەوە لە چاوەڕوانیماندا بوون.

بەدەم ڕێوە مژدەمان پێدان، کە گەیشتمەوە بەشەکەمان، سەیرمکرد (کاکەحەمەو بەختیارو مارف)، لە ڕاڕەوەکەدا هەر پیاسە دەکەن. لەگەڵ چوومە ژوورەوە، یەکە یەکە باوەشیان پیاداکردم و کاکەحەمە وتی: ڕەنگت سوورو گەشاوەیە، دیارە مژدەیەکی خۆشیان پێداویت، منیش کە باسی هاتنەکەی (دکتۆر)م بۆکردن زۆر دڵخۆشبوون، بۆ ڕۆژانی دوایی کە لەکاتی ساحەدا لەسەر ڕاسپاردەکەی (دکتۆر)، داوامان لە بەشەکان کرد، کە لیستی ناوەکانمان بدەنێ، تا لەکاتی مواجهەدا بۆیان بنێرنەوە. ئێمە لەگەڵ دابەشکردنی پارەکەدا، داوای

لیستی ناوەکانمان کرد، بەو شێوەیەی (دکتۆر) داوای لێکردین، پارەکە یەکی (٢٧٠) دینارمان بەرکەوت.

ئێمە لە مژدەی ئازادبوون، شەو و رۆژمانەو بووەتە یەك و نازانین خەو و خواردن چییە، بەڵام کە لە (٧/٢١)دا لێبووردنی گشتیی دەرچوو. ئێمە ئازادنەکراین و ماینەوەو نازانین چارەنووسمان بەچی دەگات.

## له شیراتۆنه‌که‌ی ئه‌منی سلێمانی، زانیمان چۆن ئه‌نفالی رێکخستن کراوه‌

پێش بردنمان بۆ (مه‌حکه‌مه‌ی سه‌وره‌). هاوڕێیانمان به‌سه‌ر چه‌ند ژوورو هۆڵدا دابه‌شکرابووین... به‌و هۆیه‌وه‌ نه‌مده‌زانی ژماره‌ی ده‌ستگیراوه‌کانمان چه‌ندن و ئه‌وانه‌ی ده‌ستگیرکراون کێن و خه‌ڵکی کوێن. جارناجارێك یه‌کێکیان له‌ژوورێکه‌وه‌ بۆ ژوورێکی دیکه‌ ده‌گوێزرایه‌وه‌و له‌و هه‌ندێ زانیاریی تازه‌مان وه‌رده‌گرت. زۆرجاریش له‌ په‌نجه‌ره‌ بچووکه‌کانی ناو ده‌رگای ژووره‌کان، له‌و کاتانه‌ی سه‌جانه‌کان له‌ئارادا نه‌بوونایه‌، چاکوچۆنی و قسه‌مان له‌گه‌ڵ یه‌کدا ده‌کرد، به‌ڵام ئه‌وه‌ نه‌ده‌بووه‌ ده‌رفه‌تێك تا هه‌موو یه‌کتر ببینین و یه‌کتر بناسینه‌وه‌. من ده‌مزانی چه‌ند هاوڕێیه‌کی خۆشه‌ویست و نزیکم ده‌ستگیرکراون. ئه‌وه‌ش وه‌کو پێویست نه‌بوو. تا له‌ به‌یانییه‌کی رۆژی ١٩٩٠/٩/٩ جموجوولێکی نائاسایی له‌ راڕه‌وی قاتی سه‌ره‌وه‌ی ئه‌منه‌که‌و له‌به‌ر ده‌می هۆڵه‌کانی (٣،٤،٥)دا ده‌ستیپێکردو ده‌رگایان کرده‌وه‌ ناوی یه‌که‌ یه‌که‌یان ده‌خوێندینه‌وه‌و پێیان ده‌وتین بچینه‌ ده‌ره‌وه‌. ئێمه‌ که‌ له‌ هۆڵی پێنج بووین، یه‌که‌یه‌که‌یان له‌ راڕه‌وه‌که‌دا ریزکردین و به‌دوای یه‌کدا بردیانینه‌ خواره‌وه‌... له‌ پانتاییه‌که‌ی نێوانی ژووره‌کانی خواره‌وه‌دا به‌ریز له‌مبه‌رو ئه‌وبه‌ری پانتاییه‌که‌وه‌ له‌به‌ین دیواره‌کاندا هه‌رهه‌موویان راگرتین. له‌وێدا تێگه‌یشتین که‌ چه‌ند هاوڕێمان ده‌ستگیرکراوه‌... ئه‌و به‌یانیی رۆژه‌، به‌یانییه‌کی خۆشبوو، چونکه‌ که‌ کۆیانکردینه‌وه‌و هه‌رهه‌موومانیان به‌ریز به‌ ته‌نیشتی یه‌که‌وه‌و به‌رامبه‌ری یه‌ك راوه‌ستانین... ئه‌و هاوڕێیانه‌ی که‌ یه‌کمان ده‌ناسی و که‌ له‌و ماوه‌ی ئه‌و چه‌ند مانگه‌دا له‌ ئه‌منه‌که‌ یه‌کترمان نه‌بینیبوو، له‌و به‌یانییه‌دا یه‌کترمان بینییه‌وه‌، به‌سه‌یرکردن و تێڕوانینی یه‌کتر چاکوچۆنیمان له‌گه‌ڵ یه‌کدا کرد، ئه‌مه‌ له‌لایه‌ك له‌لایه‌کی تدیکه‌وه‌ که‌ بینیمان هه‌رهه‌موومانیان کۆکردووه‌ته‌وه‌، تێگه‌یشتین که‌ ره‌وانه‌ی شوێنێکی دیکه‌مان ده‌که‌ن و هه‌ریه‌که‌مان لای خۆیه‌وه‌ مه‌زه‌نده‌ی بۆ ئه‌وه‌ ده‌چوو، که‌ بۆ (مه‌حکه‌مه‌ی سه‌وره‌) بێت، به‌وه‌ش دڵمان خۆشبوو، که‌ له‌م ئه‌منه‌ رزگارمان بێت... دوای ئه‌وه‌ی (نه‌قیب ماجید) هاته‌ ناوه‌راسته‌وه‌، چه‌ند قسه‌یه‌کی کردو تێیگه‌یاندین که‌ ده‌مانبه‌ن بۆ (مه‌حکه‌مه‌ی سه‌وره‌) له‌ به‌غدا به‌دوایدا، دوو دوو که‌له‌بچه‌یان کردینه‌ ده‌ست، رێکه‌وت وابوو (من و کاك شێخ عه‌بدول) به‌یه‌که‌وه‌ که‌له‌بچه‌کراین... ئۆتۆمبێلێکیان هێنایه‌ حه‌وشه‌که‌ی ئه‌من (که‌ ئه‌سعافێکی گه‌وره‌ی قه‌پات بوو) دووددوو به‌دوای یه‌کدا کردیانینه‌ ناو ئه‌و ئه‌سعافه‌وه‌، ده‌رگایان لێداخستین و به‌ره‌و به‌غدا که‌وتینه‌رێ. نامه‌وێت لێره‌دا باسی چۆنێتی رۆیشتنمان بۆ به‌غداو مه‌حکه‌مه‌ی سه‌وره‌ بکه‌مه‌وه‌، چونکه‌ له‌پێشه‌وه‌ باسمکردووه‌، ئه‌وه‌ی به‌لامه‌وه‌ گرنگه‌ له‌م بابه‌ته‌دا باسی بکه‌م، ئه‌وه‌یه‌ دوای گه‌رانه‌وه‌مان له‌ مه‌حکه‌مه‌ بۆ ئه‌منی سلێمانی، که‌ گه‌یشتینه‌وه‌ ئه‌من، نه‌یان خستینه‌وه‌ هۆڵ و ژووره‌کانی که‌ لێی بووین، به‌ڵکو هه‌رهه‌موومانیان خسته‌ (هۆڵی یه‌ك)، که‌پێیان ده‌وت (شیراتۆنه‌که‌ی ئه‌من). به‌و کۆکردنه‌وه‌مان له‌و هۆڵه‌و دابه‌شبوونمان به‌سه‌ر هه‌ردوو به‌شی هۆڵه‌که‌دا، تێگه‌یشتین

که چۆن ئەنفالی ڕێکخستن کراوەو ژمارەمان گەیەنراوەتە (٣٠) سی کەس، ئەوانەشی که دەستگیرکرابووین بریتیبووین له خەڵکی ناو شاری (سلێمانی، هەولێر، کەلار، قەڵادزێ و شارەزوور، هەڵەبجەی شەهید، پێنجوێن، شەقڵاوە)... زۆرمان یەکمان دەناسی و زۆرێکیشمان یەکتریمان نەدەناسی.

* ئەوانەی من لەپێش دەستگیرکردنماندا لەدەرەوە یەکمان نەدەناسی، ئەم هاوڕێیانە بوون:

١-(ئەبوبەکر محەمەد ساڵح) وەستا بەکری دارتاش.
٢-محەمەد ڕەسوڵ سەعدی (کاکەزیاد).
٣- کامیل سابیر مەحمود.
٤-سامان مەولود غەریب.
٥-ڕزگار محەمەد عەبدوڵڵا.
٦- عەلی محەمەد شاسوار. (عەلی شەهید محەمەد).
٧- موحسن حەمەئەمین حەمەعەلی (موحسینی مەلا حەمەئەمین).
٨- عەتا ئەحمەد محەمەد.
٩- محەمەد زاهیر محەمەد تۆفیق.
١٠- سالار محەمەد سەعید عەبدولڕەحمان.
١١- کامەران عەزیز عەلی (کامەرانی مەلا عەزیز).
١٢- ئەردەڵان عومەر عەلی.

* ئەوانەشی یەکمان دەناسی و له ساڵانی خەباتی نهێنیدا کارمان بەیەکەوە کردبوو، ئەمانە بوون:

١- محەمەدی مەلاحسێن (مامۆستا محەمەد).
٢- ئەحمەد محەمەد ساڵح (مامۆستا ئەحمەد).
٣- عەزیز محەمەد ئەحمەد (مامۆستا شێخ عەزیز).
٤- جەمال عەزیز ئەمین (مامۆستا جەمالی میرزا عەزیز).
٥- عەلی ساڵح سلێمان (مام عەلی).
٦- عەبدولعەزیز عومەر عارف.
٧- بەختیار عومەر ئەولی.
٨- عەبدولڕەحمان قادر غەفوور (شێخ عەبدول).

* ئەوهاوڕێیانەی لەپێش دەستگیرکردنماندا یەکمان دەناسی و وەکو کەسێکی ئاسایی، نەك وەکو کاری ڕێکخستن، ئەم هاوڕێیانە بوون:

هاوڕێ (جەباری حاجی ڕەشید) لە ساڵی حەفتاکاندا بەهۆی یەکێتیی قوتابییانی کوردستانەوەو هاوڕێ (ئەحمەدی سەناعە) لەدوای (١٩٧٦)ەوە، بەهۆی (کاک حەمەڕەشید) ەوە، (مامۆستا عوسمانی شێخ عەبدول) بەهۆی مامۆستایی و تێکەڵاویی خزمایەتییەوە، هاوڕێ (حەمەتایەری شێخ مەحمود) بەهۆی شەهید مولازم عەبدوڵڵاو بلە ڕەشی برایەوە. هاوڕێ (کارزان ئیسماعل) بەهۆی دراوسێیەتییەوە، (مامۆستا فەرەیدوون دارتاش) وەکو مامۆستای هونەر، (حاجی ئەحمەد) وەکو وەکیلی حەج، هاوڕێ (محەمەد ڕەحیم) بەهۆی (کاک حەمەڕەشیدو کاك حەمەنووری)یەوە، (عەریف تالیب) وەکو پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوولی سەر بە باڵی (مەکتەبی سیاسیی).

کاتێك کە لە شیراتۆنەکە کۆیانکردینەوە، لەماوەی چەند ڕۆژو شەوێکدا هەرهەموو لە نزیکەوە یەکترمان ناسی و زۆربەشمان لەگەڵ یەکدا بووینە هاوڕێی زیندانی، شەو و ڕۆژ گەردەشمان لەگەڵ یەکدا دەکردو بارودۆخەکەمان تاوتوێدەکرد. نابێت ئەوەش باس نەکەم ئەم (٣٠) کەسەی چارەنووسمانیان بەیەکەوە بەستینەوە، هەرهەموومان بەتۆمەتی ئەندامی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)و (ی.ن.ك) دەستگیرکرابووین و لەو زیندانە مرۆڤکوژەدا تووندکرابووین، دەعواکەمان کرابووە یەك دەعواو ناویان نابووین (جەماعەتی جەبار). کاتێك بۆ یەکەمجار براینە مەحکەمەی سەورەو بەحوکمێکی قەرەقوشانە لەماوەی (٣٠) دەقیقەدا حوکمیان بەسەرماندا دا، کە گەڕاینەوە بۆ ئەمنی سلێمانی و لە هۆڵی (١) کۆیانکردینەوە، کە پێیان دەوت (شیراتۆنەکەی ئەمنە سوورەکە) لەوێ تێگەیشتین کە ئەنفالی ڕێکخستن کراوە. کاتێك گەڕاینەوەو لەو هۆڵە بەیەکەوە کۆیانکردینەوەو ئەو حوکمەمان بەسەردا درابوو، بەدەگمەن هاوڕێیەکمان هەبوو، لەو خەبات و بەرخودانەی کە کردبووی لەپێناوی ئەو بیرو باوەڕەیدا، ئەو حوکمەیان کە بەسەردا دابووین، پەشیمان بێت و نارەزایی دەربڕێت، بەڵکو حوکمەکەیان بەشانازیی خەبات و تێکۆشانی ڕەوایان دەزانی لەپێناوی ڕێبازی کۆمەڵەو گەل و نیشتمانەکەیاندا...

## مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن لە کۆمەڵەو (ی.م.ک)دا رێکیخستم

بەجێی خۆی دەزانم هەر لەم باسەمدا، ئەو راستییە بدرکێنم کە من لەدوای گواستنەوەم لە (قەزای حەی پارێزگای واسگ)ەوە بۆ سلێمانی، لە سالی (١٩٨٠)داو دەستبەکاربوونم لە (ناوەندی خەباتی کوران) وەکو مامۆستاو جێگیربوونەوەم لە سلێمانی و دوای چەند سەردان و یەکتربینیمان لەگەڵ شەهید مامۆستا (جەمال تاهیر)دا، وای بەپەسەند زانی کە واز لە پەیوەندیی تاکی بهێنم و دەست بەکاری رێکخستن لە ریزەکانی (کۆمەڵەو یەکێتیی مامۆستایاندا) بکەم، وتی: من زۆرسەرقاڵم و رەنگە لەمەودوا نەتوانم وەکو پێویست یەکتر ببینین و بۆ ئەوەشی تۆ رۆڵی خۆت بەتەواویی ببینیت، پێم باشە رووبەرووی مامۆستایەکی خاوەن ئەزموون و تێکۆشەرێکی بەتاقەت و هەڵسوراوت بکەمەوە، کە ئەو دەتوانێت لەهەردوو بوارەکەدا کارت بۆ دیاریی بکات، ئێمەش لە ئێستادا پێویستیمان بەکەسانی وەکو تۆیە. پرسیم مامۆستاکە کێیە؟ یەکتر دەناسین؟ وتی: نازانم یەك دەناسن یان نا، بەڵام ئەو مامۆستایەکی بەتەمەنەو مامۆستای سەرەتاییە. یەکتریش نەناسن کە لەم بوارەدا یەکتان ناسی، بۆ خۆتان خۆشترە، پەرلەو رۆژو کات و شوێنی یەکتربینینمان دانا عەسرانێك لە دووکانی (تەهای مامەم) لەسەر (شەقامی چوارباغ) دانیشتبووم، کاتێکمزانی مامۆستایەکی سەرسپیی جوان هاتە بەر دووکان و پرسی، ئەمە دووکانی شێخ تەهایە؟ وتم: بەڵێ فەرموو، وتی: جەنابت کاك شێخ تەهای؟ وتم: نەخێر، من شێخ تەها نیم و ئامۆزای ئەوم. فەرموو ئەمرکە. وتی: جەنابت (شێخ محەمەدی)؟ وتم: بەڵێ، هاتە سەرەوەو خۆی پێناساندم و دووکانەکەی تەهاو شەقامی چوارباغ بوو بە بنکەو ژووانگەی درکاندنی پەرلەو قۆڵهەڵماڵین بۆ خەبات و تێکۆشان، بە ناسینی زۆر دڵخۆشبووم، چونکە بینیم مامۆستایەکی سەرسپیی بەتەمەن، بەگوڕو تینێکی هەرزەکارانەوە، خۆی تەرخانکردووە بۆ خەبات و تێکۆشان لەپێناوی گەلەکەیداو دەویەت منیش وەکو خۆی بخاتە کۆڕی خەباتەوەو دوو ئەرکم پێ بسپێرێت. یەکەم: ئەرکی وەرگرتنی شانەی رێکخستنی کۆمەڵە. دووەم: ئەرکی لەئەستۆگرتنی رێکخستنی مامۆستایان بۆ ناو (یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان) لە یەکەم دەقەی هاتنییەوە بەوردیی گوێم بۆ یەکەیەکەی قسەکانی گرت، حەزم دەکرد زیاترو زیاتر قسە بکات و شتم بۆ روونبکاتەوە، مامۆستاکەش (مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن) بوو، کە تائێستا سوپاس بۆ یەزدان تەندروستی زۆر باشەو لە ژیاندایە، عەسرەکە گەیشتە ئێوارەو کاتی دووکان داخستن، کات و شوێنی دیکەمان بۆ دانیشتنی دیکە دانا، لە دانیشتنی دووەمدا ئەرك و کارم بەرەو روو کرایەوە، ماوەی دووساڵێك بەو لێبووردەییە کارمان بەیەکەوە کرد، دواجار بەهۆی کۆمەڵێك ئاڵوگۆڕ لە ریزەکانی رێکخستندا لە یەك جیابووینەوە، بەڵام جارێکی دیکە دیسانەوە بووەوە بە بەرپرسم و بەیەکەوە کارمان کردەوە.

لەساڵی (١٩٧٥)ەوە تا ڕۆژی دەستگیرکردنم لە (١٩٩٠/١/٢٤) لە ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵەو یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان)دا، لەگەڵ ئەم هاوڕێیانەدا کارم کردووە:

١- مامۆستا عەزیز مەحمود، لە شەوی ٢٤-١٩٧٩/٣/٢٥، لە موسڵ بەسێدارەدان شەهیدکرا.

٢- فەهمی شێخ ئەنوەر قەرەداغی، لە ١٩٨٠/١١/٢٨-دا لە هەولێر بەسەرنگومکراویی شەهیدکرا.

٣- مامۆستا جەمال تایەر، بەکارەساتێك لە ١٩٨٣/٧/١٤، لە بالیسان شەهید بوو.

٤- مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن، لەژیاندا ماوە.

٥- مامۆستا ئەحمەد سالح، لەژیاندا ماوە.

٦- مامۆستا جەمال عەزیز، لەژیاندا ماوە.

٧- مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد، لەژیاندا ماوە.

٨- هاوڕێ شێخ عەبدول (عەبدولرەحمان قادر غەفوور)، لەژیاندا ماوە.

٩- هاوڕێ برایمی حەمەعەلی، ئێستا لە سوید دەژی.

١٠- هاوڕێ عەبدولعەزیز عومەر، ئێستا لە سوید دەژی.

١١- مامۆستا محەمەدی مەلا ئەحمەد، لەژیاندا ماوە.

١٢- مامۆستا جەلال غەریب، لەژیاندا ماوە.

١٣- مامۆستا فەوزی مەلا مەحمود، لە ئەورووپا دەژی.

١٤- مامۆستاعومەر مستەفا، لەژیاندا ماوە.

١٥- مامۆستا محەمەد ڕەئووف محەمەد.

١٦- مامۆستا سوعاد ئەحمەد.

١٧- مامۆستا وەسفیە بن وەیس، لەژیاندا ماوە.

١٨- هاوڕێ شێخ سالحی شێخ نەجمەدین، لەم ساڵانەدا کۆچی دوایی کرد.

١٩- مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ غەریب باساکی، کە لە ٢٠٠٢/١٠/٢ کۆچی دوایی کرد.

٢٠- مامۆستا سەربەست بابەشێخ ئێستا لە هەولێرە.

٢١- مامۆستا جەمیل مەحمود شازەمان، لەژیاندا ماوە.

٢٢- مامۆستا شەفیق حەمەبچکۆل (کە بەداخەوە بەخائین دەرچوو، یەکێك بوو لە (پوازدە) خراپەکانی ناو ڕێکخستنی کۆمەڵە)و بەسزای خیانەتی گەیەنراوە.

٢٣- هاوڕێ عەلی سالح، لەژیاندا ماوە.

٢٤- هاوڕێ وەستا لەتیفی هەورامی، لەژیاندا ماوە.

٢٥- هاوڕێ ئیبراهیم مەحمود، لەژیاندا ماوە.

٢٦- هاوڕێ عوسمان قادر (وەستا عوسمانی هەلاج)، لەژیاندا ماوە.

٢٧- هاوڕێ عەبدوڵلا ڕەسوڵ (ناسراو بە عەبدوڵلا کۆمەڵە)، لەژیاندا ماوە.
٢٨- هاوڕێ کامەران عەبدوڵلا (هاوڕێ خەبات)، لەژیاندا ماوە.
٢٩- هاوڕێ هەمزەی عەلی دەدە، لەژیاندا ماوە.
٣٠- هاوڕێ سەروەر محەمەد ئەمین مارف، لەژیاندا ماوە.
٣١- مامۆستا محەمەد دەرویش، لەژیاندا ماوە.
٣٢- مامۆستا محەمەد ڕەشید فەتاح، لەژیاندا ماوە.
٣٣- هاوڕێ حەسەن شێخ ئیسماعیل، لەژیاندا ماوە.
٣٤- هاوڕێ جەمیلە شێخ مەحمود، لەژیاندا ماوە.
٣٥- هاوڕێ حەمەڕەشیدی حاجی شەریفی باریکەیی. شەوی ١٩-٢٠/١٠/٢٠٠١، بە دەستانی گورچیلە شەهید بوو.
٣٦- هاوڕێ شەوقیە کاکەحەمە، لەژیاندا ماوە.
٣٧- هاوڕێ پەروین کاکەحەمە، لەژیاندا ماوە.
٣٨- هاوڕێ قادری محافەزە، کۆچی دوایی کردووەوماڵیان لە ئیسکان بوو.
٣٩- هاوڕێ پەخشانی شێخ ساڵح، لەژیاندا ماوە.
٤٠- مامۆستا سەردار حەمەسالح، لەژیاندا ماوە.
٤١- مامۆستا جەمال ئەمین، لەژیاندا ماوە.
٤٢- هاوڕێ سوارە محەمەد ڕەسوڵ، لەژیاندا ماوە.
٤٣- هاوڕێ ئەحمەد کەریم، لەژیاندا ماوە.
٤٤- هاوڕێ عەلی حاجی محەمەد، لەژیاندا ماوە.
٤٥- هاوڕێ ئەحمەد حەمە سەعید، چاپچی بوو لە پارێزگای سلێمانی زانیاریی زۆری بۆ دەناردین، کۆچی دوایی کردووە.
٤٦- هاوڕێ ئەحمەد شێخ مەحمود، لەژیاندا ماوە.
٤٧- هاوڕێ محیەدینی شێخ کەریم، لەژیاندا ماوە.
٤٨- مامۆستا سدیق محەمەد ئەمین، لەژیاندا ماوە.
٤٩- مامۆستا ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، کۆچی دوایی کردووە.
٥٠- مامۆستا غازی عەبدولکەریم، لەژیاندا ماوە.
٥١- مامۆستا ڕەئووف سابیر (بێگەرد)، لەژیاندا ماوە.
٥٢- هاوڕێ حەمەنووری حاجی ئەحمەدی گەرمیان، لە ٨/٤/٢٠٠٥ بەکارەساتێکی دڵتەزێن شەهید بوو.
٥٣- مامۆستا محەمەد نووری تۆفیق، لەژیاندا ماوە.
٥٤- هاوڕێ لەمیعە کاکەحەمە، لەژیاندا ماوە.
٥٥- هاوڕێ کەژاڵ کاکەحەمە، لەژیاندا ماوە.

٥٦- هاوڕێ بەختیار عومەر ئەویلە، لەژیاندا ماوە.
٥٧- مامۆستا عەبدولڕەحمان ئیسماعیل، سەرۆکی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان، لەژیاندا ماوە.
٥٨- هاوڕێ عومەر مەجید میرخان، لەژیاندا ماوە.
٥٩- هاوڕێ مامۆستا هوشیار حسێن بەرزنجی، لەژیاندا ماوە.

ئەو سەردەمانەی لەگەڵ ئەم هاوڕێیانەدا کاری ڕێکخستنی کۆمەڵەو (یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان)مان کردووە، زۆربەمان هاتوچۆی ماڵی یەکترمان کردووە. کۆبوونەوەمان لە ماڵەکانمان کردووە، خێزان و منداڵی یەکمان ناسیوە، لەکات و ناکاتدا خۆمان بەماڵی یەکتردا کردووە، چالاکیمان بەیەکەوە کردووە. فەرمان و بڕیارەکانی ڕێکخستنمان بەبێ دواکەوتن جێبەجێکردووە، لە کۆنفراسەکانی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستاندا بەشداریمان کردووە. بەشانازییەوە دەڵێم کە لەو ساڵانەدا لەگەڵ ئەو تێکۆشەرانەدا بەیەکەوە لە کۆڕی خەباتدا کارمان کردووە.

کە بەلای منەوە بۆ ئەو ڕۆژگارو سەردەمانە ئەو هاوڕێیانە کاریگەریی زۆریان لەناو جەماوەردا هەبووە، ئەندامی چالاکو لەخۆبردووبوون و نەترسانە کاریان دەکرد. من چۆن سوپاسی ئەو مامۆستایەم دەکەم کە یەکەم پیت و وشەی کوردی فێرکردم و خۆم بە قەرزاری دەزانم، هەرواش زۆر سوپاسی ئەو هاوڕێیانە دەکەم کە لە ڕۆژانی خەباتمان زۆر شت لەیەك فێربووین، بەبێ ڕامان و ڕاشکاوانە لەسەر مەسەلەکان گفتوگۆو گەردەشەمان لەگەڵ یەکدا دەکرد، قسەی یەکمان بەهەند وەردەگرت، بووبووینە هاوڕێ و برای دڵسۆزی یەکتری، بەدڵ یەکمان خۆش دەویست و ڕێزمان لەیەکتر دەگرت.

حەزدەکەم هەر بۆ مێژوو باسی ئەوە بکەم لەو ساڵانەی خەباتی نهێنیماندا بەزۆریی کۆبوونەوەمان لە ماڵی ئەم هاوڕێیانە دەکرد.

١- مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن، ماڵیان لە گەڕەکی ڕزگاری-یە.
٢- مامۆستا جەمال تایەر، ماڵیان لە مەلکەندی و بەرانان بوو.
٣- مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد، ماڵیان لە تووی مەلیك بەرامبەر مقەری تۆپیو عوسمان بوو، کە ئێستا ئاسایشی گشتیی تێدایە.
٤- مامۆستا جەلال غەریب، لە گەڕەکی خەبات و شەهیدانی سەرچنار.
٥- هاوڕێ ئیبراهیمی حەمەعەلی، ماڵیان لە گەڕەکی سابونکەران نزیکی بەردەرکی سەراو پشتی کتێبخانەی سلێمانی بوو.
٦- مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ غەریب باساکیی، ماڵیان لە ئیبراهیم پاشایە.
٧- مامۆستا سەربەست بابەشێخ، ماڵیان لە شەهیدانی سەرچنار بوو.
٨- هاوڕێ حەمەنووری حاجی ئەحمەد، ماڵیان لە دوورلنەمن و شەهیدانی سەرچنار بوو.

٩- هاوڕێ حەمەڕەشیدی حاجی شەریف،ماڵیان لە گوندی باریکەی عەربەت بوو.
١٠- مامۆستا جەمیل مەحمود شازەمان، ماڵیان لە سلێمانی تازەو مامۆستایان بوو.
١١- هاوڕێ عەبدوڵڵا ڕەسوڵ (کۆمەڵە)، ماڵیان لە گەڕەکی شەکرەکەی قلیاسان بوو.
١٢- هاوڕێ عەلی سالح سلێمان، ماڵیان لە خانووەکانی ئەلبانەکەی بەکرەجۆدایە.
١٣- هاوڕێ عەبدولڕەحمان قادر غەفوور (شێخ عەبدول)، ماڵیان لە خانووەکانی ڕەی-دا بوو لە ڕزگاری.
١٤- هاوڕێیان (شەوقیەو پەروینی کاکەحەمە)، ماڵیان لە گەڕەکی چوارباخ بەرامبەر مەلعەبەکە بوو.
١٥- مامۆستا ئەحمەد سالح، ماڵیان لە دارۆغاو برایم پاشاو مامۆستایان بوو.
١٦- هاوڕێ سوارە محەمەد ڕەسوڵ، ماڵیان لە گوندی کۆستەی چەمی بەکرەجۆ بوو.
١٧- هاوڕێ هەمزەی عەلی دەدە، ماڵیان لە عەقاری بوو.
١٨- هاوڕێ شێخ سالحی شێخ نەجمەدین، ماڵیان لە گەڕەکی برایم پاشاو دارۆغا بوو.
١٩- هاوڕێ ئەحمەد کەریم، ماڵیان لە تووی مەلیك بوو.
٢٠- هاوڕێ بەختیار عومەر ئەولیە، ماڵیان لە گەڕەکی ڕزگاری بوو.
٢١- هاوڕێ کامەران عەبدوڵڵا (خەبات)، ماڵیان لە گەڕەکی خانووەکانی کارگەی جگەرە بوو لە ڕزگاری.
٢٢- هاوڕێ وەستا لەتیفی هەورامی، ماڵیان لە گەڕەکی دوورلئەمن بوو.
٢٣- ماڵی نووسەری ئەم کتێبە، ماڵیان لە (شێخ محێدین، مەجید بەگ، مامۆستایان) بوو.
٢٤- هاوڕێ عەبدولعەزیز عومەر، ماڵیان لە گەڕەکی بەرانان بوو.
٢٥- مامۆستا شەفیق حەمە بچکۆل، ماڵیان لە سەرچنار بوو.
٢٦- ناوەندی برایەتی کوران، کە ئەوکاتەی مامۆستا جەمال عەزیز بەڕێوەبەری بوو، لەگەڵ ماڵیاندا لە گەڕەکی مامۆستایان.
٢٧- مامۆستا محەمەدی حاجی دەروێش، ماڵیان لە ئیسکانی سەروو بوو.
٢٨- هاوڕێ محێدینی شێخ کەریم، ماڵیان لە مامۆستایان بوو.
٢٩- مامۆستا جەمال ئەمین، ماڵیان لە ئیبراهیم پاشا بوو.
٣٠- هاوڕێ حەسەنی شێخ ئیسماعیل، ماڵیان لە شێخ محێدین بوو.
٣١- هاوڕێ عوسمان قادر (وەستا عوسمانی هەلاج)، ماڵیان لە خەبات بوو.

داوای لێبووردن لەو هاوڕێیانە دەکەم کە لەو ڕۆژگارانەدا بەیەکەوە کارمان کردووەو لێرەدا ناوم بیرنەکەوتوونەتەوە، نەمنووسیون و دڵنیام تێکۆشەرانی دیکەمان هەبووە کە ناویانم لەبیر نەماوە لەگەڵ ڕێزی زۆرمدا بۆیان.

دەمەوێت هەر بۆ ڕاستیی ئەو پەروەردەیەی کە لەناو ڕیزەکانی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی

کوردستان)دا پێی پەروەردە کراین، دان بەو راستییەدا بنێم کە لە رۆژانی خەباتی نهێنی لە ساڵی (١٩٧٦) تا رۆژی دەستگیرکردنم لە ١٩٩٠/١/٢٤، ئەم هاورێیانە لێپرسراوم بوون و بەیەکەوە لەناو ریزەکانی (کۆمەڵە)و (ی.م.ك)دا خەباتمان کردووە:

١- مامۆستا محەمەدی مەلا حسێن، دووجار لە (کۆمەڵە)دا تا دەستگیرکردنم. لە (ی.م.ك)دا

٢- مامۆستا ئەحمەد محەمەد ساڵح، لە کۆمەڵەدا (دووجار).

٣- مامۆستا عەزیز محەمەد، لە کۆمەڵەدا.

٤- هاورێ ئیبراهیمی حەمە عەلی، لە کۆمەڵەدا.

٥- مامۆستا جەمال عەزیز، لە کۆمەڵەدا.

٦- هاورێ شێخ عەبدول، لە کۆمەڵەدا.

٧- شەهید مامۆستا جەمال تایەر، لە سەرەتای (١٩٧٦-١٩٨٠) لە کۆمەڵەدا.

٨- شەهید مامۆستا عەزیز مەحمود، لە ساڵی ١٩٧٦ لە کۆمەڵەدا.

٩- هاورێ عەبدولعەزیز عومەر، لە ١٩٨٧-ەوە تا ١٩٩٠-و رۆژی دەستگیرکردنم لە کۆمەڵەدا.

١٠- مامۆستا ئەحمەدی مەلا محەمەد، لە کۆمەڵەدا.

## هاوڕێ خەبات بەنامەیەك هەواڵی خۆی بۆناردم

(کامەران عەبدوڵڵا)، کە ناوە نهێنییەکەی (خەبات) بوو. هاورێیەکی چالاك و کاراو بەتواناو رووناکبیرێکی ناو ریزەکانی رێکخستنی (کۆمەڵە) بوو. دەرچووی پەیمانگا بوو. لە بنەچەدا خەڵکی کەرکوك بوو. لە ساڵەکانی (٨٧، ٨٨، ٨٩) بۆ کاری رێکخستن بەرەو رووی من کرایەوە. سەرپەرشتی ژمارەیەك هاورێی لە شانەو هێڵی تایبەتدا دەکرد. خەمخۆرێکی بەپەرۆشی رێکخستن بوو، لە زۆر کۆبوونەوەدا پێشنیازو داوای ئەوەی دەکرد، کە گۆڤارێکی رووناکبیریی دەربکەین، گۆڤارەکە بکەینە ئۆرگانێکی تایبەت بە بیروبۆچوونەکان لەسەر کوردو دۆزەکەی، دەیوت من ئامادەم هەموو ئەرکەکانی دەرچوونی لە ئەستۆ بگرم. پێشنیازەکەی لەرووی دڵسۆزییەوە بوو، بەڵام دەرکردنی گۆڤارێکی لەوجۆرەی کە ئەو داوای دەکرد (دەریبکەین) بۆ ئەو بارودۆخەی ئێمە گونجاو نەبوو. لەبەرئەوەی ئێمە لەناو ریزەکانی رێکخستنی کۆمەڵەدا (کاری رێکخراوەیی)مان دەکرد... دەمانویست خۆمان لە چاودێریکردنی دامودەزگا ئەمنیی و سەرکوتکەرەکانی رژێم دوور بخەینەوە، کارێك نەکەین سەرنجیان رابکێشین و بکەوینە ژێر بەدواداچوونیان. بەمەبەستی پاراستنی هاورێیانمان. بۆیە دوای چەندجار باسکردن و لێکۆڵینەوەو گۆرینەوەی بیورا، رازیمان کرد کە واز لەو پێشنیازو داخوازییەی بهێنێت. ئەو پۆلەی ئەوی تێدا رێکخرابوو، پۆلی (شەهید عەزیز)ی سەر بەکەرتی (شەهید جەمال)بوو.

تا ئەو رۆژەی من دەستگیرکرام، هاورێ خەبات لەگەڵ مندا کاری حزبیی دەکرد. بە بەردەوامی کۆبوونەوەمان دەکردو کۆبوونەوەکانمان دابەشکردبوو. هەرجارەی لە ماڵێك بوو، ماڵەکەیان لە گەرەکی خانووەکانی کارگەی جگەرەکە بوو، دیارە کە من دەستگیرکرام بەو دەستگیرکردنەم هەڵبەت شپرزەو نیگەران بووبوو. کاتێك کە حوکمیانداین و چووینە بەندیخانەی ئەبوغرێب، ئەوانەی نەیاندەتوانی بێن بۆ مواجهەمان، نامەیان بۆ دەناردین، یەکێك لەو هاورێیانەی کە بۆی نەکرابوو بێتە سەردانمان لە بەندیخانە، (هاورێ خەبات) بوو. بۆئەوەی من دڵنیا بکاتەوە لەوەی کە کاتی راپەرین و دوای راپەرین ئەو بەردەوامە لەسەر کارکردن، لە ١٩٩١/٨/٣ نامەیەکی کورت و پووختی بۆناردم و لە نامەکەدا، دوای دەربرینی هەستی هاورێیانەی بۆ من، ئەوەی روونکردبووەوە، کە توانیویتی هاورێیانی رێکخستن بدۆزێتەوەو ئەو ئەرك و کارانەی کە لە سەردەمی رێکخستنی نهێنیدا لەگەڵ مندا ئەنجامیدەدا، لە سەردەمی راپەرین و کاری ئاشکرای رێکخراوەییدا لەگەڵ هاورێیاندا بەردەوام بێت و پەرۆشانەتر لەسەر کارەکانی بەردەوام بێت.

ئاواتی ئەوەی خواستبوو، کە لە داهاتوویەکی نزیکدا ئێمەش ئازاد بکرێین و بگەینەوە ناویان و بەشداریی کاروانی خەبات بکەینەوە، بەو نامەیە زۆر زۆر گەشامەوە، یەکەم: لەبەرئەوەی بەهۆیەوە هەواڵیم زانی. دووەم: کە زانیم لەسەر کارکردن بەردەوامەو توانیویتی

هاوڕێیان بدۆزێتەوە... نامەکەم چەندجار خوێندەوەو وەڵامم دایەوەو لەگەڵ وەڵامەکەدا نامەکەیم ناردەوە بۆ ماڵەوە، بەداخەوە ئەو نامەیەش وەکو کۆمەڵێك نامەی دیکە لەناوچوون و لەبەردەستمدا نەمان، تا لەم کتێبەدا دەقەکەی بڵاو بکەمەوە.

# نامەکەی (پەروین) ئازاریدام

(پەروین کاکەحەمە) بەحوکمی ئەوەی ئامۆزامە. باوکی یەکێك بوو لەو خزمانەی کە زۆر لەیەکەوە نزیکبووین و یەکتریمان خۆش دەویست، متمانەی تەواو لەنێوانماندا هەبوو. بۆ هەموو کارێکی پرسی پێدەکردم و رای وەردەگرتم. بەو بۆنەیەوە بە بەردەوامی خێزانی هاتوچۆی یەکمان دەکردو زۆر سەردانمان بەیەکەوە دەکرد. بەپێی ئەو پەیوەندیی و خۆشەویستییەی لەنێوانی من و کاکەحەمەدا بوو. خێزانەکانمان (زەینەب و باجی فەیمە)ش زۆر یەکتریان خۆش دەویست و رێزێکی زۆریان لەنێواندا هەبوو. بەو پێودانگە منداڵەکانیشمان یەکتریان خۆشدەویست. (ساڵی هەشتا) کە من نەقڵی سلێمانی بوومەوەو بەگەیشتنەوەم دەستم بە کاری حزبیی و رێکخراوەیی کرد، لەگەڵ دەستبەکاربوونمدا کەوتمە جموجووڵ بۆ راکێشانی دڵسۆزان بۆ ناو ریزەکانی رێکخستن. سەیرمکرد (کاکەحەمە) زۆر پەرۆشی گەلەکەیەتی و حەز بەسەرکەوتنی شۆرش دەکات و لەگەڵ مندا هاورایەو حەز دەکات ئاگاداری دەنگوباسی شۆرش و پێشمەرگە بێت. (کاکەحەمە) جگە لە دوو کور، چەند کچێکی سەلارو زیرەکی هەیە. لەناویاندا دوو خوشکە گەورەکەیان (شەوقیەو پەروین)، کە قسەم لەگەڵدا کردن، دەرکم بەوە کرد حەزیان بەوەیە کە جگە لە خزمایەتی و ئامۆزایەتی، لەرووی سیاسیشەوە لە منەوە نزیکن. بۆیە بەجێی خۆیم زانی کە قسەیان لەگەڵدا بکەم و ئەگەر رازیبوون، رێکیان خەم. هەر قسەم لەگەڵداکردن شاگەشکانە بەدەنگمەوە هاتن و یەکسەر بە داواکەم رازیبوون، منیش لە ئەڵقەیەکی روناکبیریدا رێکمخستن و هەفتانە لەگەڵیاندا کۆدەبوومەوەو ئەدەبیاتی کۆمەڵەم بۆ دەخوێندنەوە، ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە مانەوەو دواجار کەوتنە جموجووڵێکی باش بۆ راکێشانی کچانی هاورێیان بۆ ناو ریزەکانی رێکخستن. خوشکەکانیان (لامیعەو کەژاڵ)یان رێکخست و بەدوایدا چەند کچێکی دیکەو وردە وردە سەیرمکرد هێڵەکەیان زۆر دەبن، بۆیە یەکسەر بریارمان دا کە سێ سێ لە شانەدا رێکیان بخەین و لەماوەی ساڵێکدا چەند شانەیان دروستکرد، من سەرپەرشتی ئەوان و ئەوانیش سەرپەرشتی شانەکانیان دەکرد... شەوقیە پەیمانگای تەواو کردبوو، لە دائیرەی کارەبا دامەزرابوو. پەروین فەرمانبەری دائیرەی ئەوقاف بوو. کچەکانی تدیکەش دەیانخوێند. پەروین بەدەم فەرمانبەرییەوە ئامادەیی تەواوکرد، لە کۆلیژی ئەندازیاری کارەبا لە زانکۆی بەغدا وەرگیرا. دوای ئەوەی کە هێڵەکەیان فراوان بوو. رێکخراویش بە پەسەندیزانی کە رێکخستنی ژنان لە یەك کەرتی تایبەت بە ژناندا کۆبکاتەوەو ئەو هێڵەی من سەرپەرشتیم دەکرد لەو بریارەوە لەگەڵ رێکخستنەکانی دیکەی ژناندا تێکەڵاوبوون و کەرتەکەیان ناونرا (کەرتی شەهید لەیلا) بەناوی (یەکەم کچی لەسێدارەدراو لە ساڵی ١٩٧٤)دا کە ناوی (لەیلا قاسم) بوو، دوای ئەو تێکەڵاوبوون و یەکخستنەوەیان من لەرووی کاری رێکخراوەییەوە ئاگام لێیان نەما،

بەڵام وەکو ئامۆزاو ئامۆزازا پەیوەندییەکەمان رۆژ بەرۆژ، ساڵ بەساڵ لە زیادیدابوو. (کاکە حەمە) زۆر دڵی پێیانخۆشبوو. دوای دوو سێ ساڵ کارکردنیان لەو کەرتەداو بەهۆی سەرهەڵدانی چەندکێشەیەکەوە. لە رێکخراوەوە کەرتەکەیان بەرەو رووی من کردەوە، من بووم بە بەرپرسی کەرتی (شەهید لەیلا)، نەك تەنها بەرپرسی (شەوقیەو پەروین). ئەوکاتە کەرتەکە چەند هاورێیەك ئەندامی کەرت بوون، ئەوانەی من بیرم ماون و ناویانم لەبیر ماوە، ئەمانە بوون (شەوقیە کاکەحەمە، پەروین کاکەحەمە، جەمیلە مەحمود، گێلاس حەمەعەلی)، ناوی نهێنی هەریەکەیان بەپێی ناوەکان (ئارشین، کەژو، کۆژین، بەفرین)، گێلاس لەبەرئەوەی هاوسەرەکەی لە شەری عیراق-ئێراندا بە دیل دەستگیرکرابوو، پەیوەندیی تاکی بە شەوقیەوە بوو. بەشداریی کۆبوونەوەو کارو چالاکی نەدەکرد، (پەروین) لە کولییە لە بەغدا دەیخوێند، ئەوەی لە سلێمانی مابوونەوە (جەمیلەو شەوقیە) بوون. پەروین لەبەرئەوەی لە بەغدا بوو. نەدەتوانرا شانەی رێکخستنی بدرێتێ، وەکو بیرم بێت لە بەغدا خوێندکارێکی رێکخستبوو. بۆیە نەشیدەتوانی لە کۆبوونەوەکانی مانگانەی کەرتدا بەشداریی بکات، بەڵکو هەرکات بهاتایەوە بەشداریی کۆبوونەوەی کەرتی دەکرد. ئەوەی ئەرك و کارو چالاکی کەرتەکەی کەوتبوە ئەستۆ (شەوقیەو جەمیلە) بوون. کە ژمارەیەکی باش هاورێیانیان لابوو، بە بەردەوامی کۆبوونەوەیان لەگەڵدا دەکردن و راپۆرتی مانگانەیان دەنووسی. کە من دەستگیرکرام، نەمدەزانی چارەنووسی ئەو هاورێیانە چی بەسەرهاتووە. کاتێك حوکمدرام و چوومە ئەبوغرێب، هەندێکیان هاتن بۆلام، کۆمەڵێك هەواڵ و زانیارییان پێدام، دوای راپەرین ئەوانیش بەگوژم و تینی کۆنەوە کەوتنەوە کارکردن، دیاربوو هەریەکەیان شوێن و جێگای خۆیان دۆزیبووەوە. لەدوای چەند مانگێکی راپەرین و دوای کۆرەوەکەو گەرانەوەیان، کەوتبوونەوە کاری جدیتری هەمەلایەنە، من نەمدەزانی ئەوان رووبەرووی کێشەبوونەتەوە. لە مواجههەیەکدا کە (زەینەب)و منداڵەکان هاتن بۆلام، نامەیەکی (پەروین)ی هێنابوو، دای پێم و وتی: پەروین دەڵێت کە نامەکەی خوێندەوە، وەڵامم بداتەوە، بابزانم ئەو رای چییەو چی دەڵێت...؟ کە مواجهەە تەواوبوو، شەو نامەکەی پەروینم خوێندەوە. نامەکە دووردرێژ بوو. بەشێکی باسی کارو چالاکی و ئیشەکانی خۆی و چۆنێتی کارکردنی کردبوو. بەو باسکردنەی زۆر دڵخۆشبووم. بەشەکەی دیکەی باسی ئەو کێشانەی کردبوو، کە بۆیان دروستکردبوو. زۆریان لێکردبوو کە نابێت بەو شێوەیە کاربکات و تێکلاوی کاری حزبیی ببێت، لەمەیاندا زۆری نووسیبوو، زووخاوی هەڵرشتبوو. لەدواجاریشدا داوای رای منی کرد بوو، بۆ چۆنێتی چارەسەرکردنی، نامەکەم چەندجار خوێندەوەو هێڵم بەژێر کۆمەڵێك رستەو پەرەگرافیدا کێشاو بەوردیی وەڵامی نامەکەیم دایەوە، لە مواجهەدا هەردوو نامەکەم ناردەوە بۆ سلێمانی، نامەیەکیشم بۆ (تایەری برازام) نووسی، کە هاوسەری شوقیە بوو، ئەوەی بەپەسەندو بەرژەوەندیم زانی لەنامەکەدا سەبارەت بە (پەروین) بۆم

نووسی. نامەیەکیشم بۆ (کاک حەمەڕەشیدو کاک حەمەنووری) نووسی لەو بارەیەوە، تا ئەوکێشانەی (پەروین) چارەسەر بکەن.

بەداخەوە نامەکەی (پەروین)م لانەماوەو باوەڕیش ناکەم ئەویش نامەکەی منی هەڵگرتبێت ئەگینا هەردوو نامەکەم لەم کتێبەدا بڵاودەکردەوە.

# نامەکانی (جەمیلە) دڵخۆشیانکردم

(جەمیلە شێخ مەحمود) کە ناوی نهێنییەکەی (کۆژین) بوو. لەدوای وتوویژی (١٩٨٣-١٩٨٤)،وە گوێزرایەوە بۆ (کەرتی شەهید لەیلا)و بوو بە ئەندامێکی کاراو چالاکی کەرتەکە، پێشتر لە چەند شانەو هێڵی ڕێکخستندا کاری کردبوو. خوێندکار بوو. ماڵیان لەبەر خانەقای مەولانا خالید بوو. باوکی دووکانی لەبەر خانەقادا بوو. کچێکی زیرەك و بەتوانا بوو، دەینووسی و حەزی لە شیعر بوو، جارجارەش شیعری دادەنا.

وەکو لەو نووسینەی لەسەر (پەروین) نووسیومەو باسمکردووە، لەبەر چەند هۆیەك ئەوەی بەفیعلی و ڕاستەوخۆ کاری ڕۆژانەو هەفتانەو مانگانەیان لەو کەرتەدا دەکرد، تەنها (شەوقیەو جەمیلە) بوون. (شەوقیە) چەند شانەو هێڵی ڕێکخستن و پەیوەندیی تاکی لابوو، سەرپەرشتی دەکردو کۆبوونەوەی لەگەڵدا دەکردن، یەکێك لە پەیوەندییە تاکەکان (گێلاس عەلی)ی ئەندام کەرت بوو، کە تەنها مانگانە ئابوونەی خۆی و خوشکێکی کە لە ڕێکخستندا بوو، دەدایە (شەوقیە) و ئیتر هیچ چالاکییەکی ڕێکخراوەیی نەبوو. تەنانەت راپۆرتێکی ڕۆژێك لەڕۆژان بەرزنەدەکردەوە، بەبیانووی ئەوەی دۆخێکی تایبەتی هەیەو ناکرێت کاروچالاکی هەبێت، دۆخە تایبەتەکەشی هۆی بەدیلگرتنی هاوسەرەکەی بوو لە شەڕی عیراق- ئێراندا.

(جەمیلە)ش چەند شانەو هێڵی ڕێکخستنی لابوو، بەڕاستیی هاوڕێیەکی تا حەزکەیت چالاك، بەتوانا، زیرەك و وریا، ئیشکەرو بەخەم و لێهاتوو. سەلارو سەنگین و بێدەنگ و هێمن. ئەرك و کاری سەرشانی بەبێ دواکەوتن هەفتانەو مانگانە جێبەجێ دەکرد، راپۆرتی مانگانەی بەتێرو تەسەلی دەنووسی. دەستڕەنگین بوو، خەیاتێکی ژنانەی زۆر باشبوو. کە خوێندنی ئامادەیی تەواوکرد، لەبەر بێ ئیشی لە کارگەیەکی خەیاتیی ئەهلی دامەزرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوکارەی دەکرد، کاری ڕێکخستنی دوا نەدەخست، لە ساڵانی (٨٧، ٨٨، ٨٩)دا لەبەرئەوەی بارو دۆخی کوردستان و بەتایبەتی سلێمانی باش نەبوو. پیاوانی دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم بەوردیی و لەهەموو ڕێگایەك و بەهەموو شێوەیەك چاودێریی ڕێکخستنەکانی ناوشاریان دەکرد، دەگەڕان بەدوای سەرەداوێکدا، جا بۆئەوەی خۆی لەو چاودێریکردنە دوورخاتەوە، پێشنیازی کرد کە بەیانییان پێش دەستپێکردنی دەوام. راپۆرت و دەنگوباسەکان بگەیەنێتە ماڵمان، ئەگەر خۆم لەماڵ بووم بیداتە خۆم و ئەگەرنا بیداتە دەست (زەینەبی هاوسەرم)، هەر نووسراو و ئەدەبیاتێکیش کە دەبوو بگاتە ئەو و ڕێکخستنەکان لە خۆم یان لە زەینەب وەریانگرێت و بۆی دەرچێت، زۆربەی بەیانییەکان کاتژمێر (٧)ی بەیانی دەگەیشتە ماڵمان و نەدەگەیشتە کاتژمێر (٨) تێی دەتەقاندو دەڕزی.

کۆبوونەوەکانیشمان بەزۆریی لە ڕۆژانی پشووەکاندا لە ماڵی ئێمە، یان ماڵی (شەوقیە)، یان ماڵی (کاکەحەمە) دەکرد، لەبەرئەوەی ماڵی ئەوان گونجاو نەبوو بۆ کۆبوونەوە، کۆبوونەوەمان لە ماڵیان نەدەکرد، لەڕاستیدا ماڵیانم هەر نەدەزانی، چونکە ئەو لەبەر باوکی وای بەلاوە پەسەندبوو.

تا ئەو رۆژەی دەستگیرکرام، من بەرپرسی ئەو کەرتەبووم. تەنانەت رۆژێك دوای دەستگیرکردنەکەم بە کۆمەڵێك راپۆرت و نووسینەوە بەبێ ئاگایی لەوەی کە من دەستگیرکراوم، چوو بوو بۆ ماڵمان و (زەینەب) نەیهێشتبوو دانیشێت و یەکسەر پێی وتبوو: دامەنیشەو هەر زوو خۆت ونکە، چونکە (شێخ محەمەد) دەستگیرکراوە، با تۆش دەستگیرنەکرێیت، ئەمە کاتێك زانیم کە حوکمدرام و چوومە ئەبوغرێب و (زەینەب) هات و پرسیاریم کرد.

جەمیلە لە ژیانی بەندیخانەمدا دوو نامەی بۆ نووسیم، کە یەکەم: نامەی لە مواجەهەی ١٩٩٠/١٢/٢-دا بە (زەینەب)دا بۆی ناردبووم، لەم نامەیەدا بەوپەڕی دڵسۆزیی پەژارەیەوە هەواڵی پرسیبووم، باسی هەندێك شتی بۆ کردبووم و ئاواتی ئەوەی خواستبوو، کە بەزوویی ئازادبم و وەکو باوکەکەی جارانی (کەرتی شەهید لەیلا) کاریان لەگەڵدا بکەمەوە، مژدەی ئەوەشی دابوو، کە ئاسۆ ڕووناکەو سەرکەوتن بەرێوەیە، نامەی دووەمی دوای ڕاپەڕین و کۆڕەو لە (١٩٩١/٧/٧)دا لە کاغەزێکی شینی خورشیدا بە خەتێکی وردو دوورو درێژیی بۆی نووسیبووم، لە نامەکەدا هەمەلایەنە باسی خۆی و ڕێکخستن و کارەکانی کردبوو.

نامەکەی نامەیەکی ناوازەی زۆر بەتام و چێژ بوو. بۆیە زۆر زۆر دڵخۆشی کردم. لە نامەکەدا باسی ئەوەی کردبوو، کە دوای گرتنی من چۆن سەری لە ماڵمان داوەو (زەینەب) بەپەلە ڕەوانەی کردووەو نەیهێشتووە لە ماڵمان بمێنێتەوەو... باسی ئەوەی کردبوو، کە دوای دەستگیرکردنی من تا ڕاپەڕین، کەسێك نەبووە بەفەرمیی سەرپەرشتییان بکات و بیانگرێتەوە.

نامەکەم چەندجارێك خوێندەوە، لەدواییدا بەتاقەت و بەپێی ناوەرۆکی نامەکەی، وەڵامێکی وردی هاورێیانەم دایەوە، ئەو چۆن لە کۆتایی نامەکەدا نووسیبووی (کچی خۆت) منیش هەربەو شێوەیە بۆم نووسیبوو (کچی خۆم)و لە مواجەهەدا نامەکەم دایە دەست (زەینەب) وتم، ئەمەیان لای خۆتان هەڵگرن و وەڵامەکەشی بدەرە (جەمیلە)... بەنیگەرانییەوە لێرەشدا دەیلێمەوە، ئەو نامانەی کە بۆی نووسیبووم لە ٣١/ئابدا بوو بەخۆراکی نەزانیی کەسانی نەزان، وەکو لە هاورێ جەمیلەم پرسی سەبارەت بە وەڵامی نامەکان، ئەویش وتی: مابووم، هەڵم گرتبوون لە ٣١/ئابی نەگریسدا لەناوچوو. خۆزگە نامەکان بمانایەو لەم کتێبەدا بڵاوم بکردنایەتەوە.

# (بلە)و نامەیەکی چیرۆکئاسا

(ئیبراهیمی شێخ ئیسماعیلی شێخ کاکەحەمەی دێلێژە) خاڵۆزای باوکمە، باوکی مەلا بوو. بەهۆی مەلایەتییەوە چەند گوندێکی کردبوو. ئەوەی من بیزانم و لەیادم بێت مەلای (قەزلەر، چۆلمەك، جێشانە، دێلێژە، بەکرەجۆو هەنجیرە) بووە، بەهۆی مەلایەتییەوە لە دێکەی خۆیان کە (دێلێژە)بووە، دوور کەوتووەتەوە. ئەو ساڵانەی کە مەلای بەکرەجۆ بوو، باوکم منی بۆخوێندن ناردە بەکرەجۆو لای دەمخوێند (برایم) ئەوکاتە لە من منداڵتربوو، لەگەڵ ئەوەشدا بووبووینە هاوڕێ و یەکمان زۆر خۆشدەویست، کاتێك هەردووکمان گەورەبووین، بەرێکەوت هەردووکمان لەیەك ساڵی خوێندندا لە دانشگای بەغدا، ئەو لە (پەیمانگای ئیدارەو منیش لە کولیژی زمان بەشی زمان و ئەدەبی کوردی) وەرگیراین، لە چوونی بەغدامانددا زیاترو زیاتر لەیەکتر نزیکبووینەوە، هەردووکیشمان لە بزووتنەوەی سیاسیدا کارمان دەکرد، وەکو (پارتی) برایم زیاتر بەلای بیروباوەڕی چەپدا دایدەشکاندو یەکێك بوو لە کادیرەکانی باڵی (مەکتەبی سیاسیی). ئەوساڵانە هاوڕێکانی لەبەر خۆشەویستی لەجیاتی (برایم و ئیبراهیم) پێیان دەوت (بلە)و ئیتر هەر بە (بلە) بانگمان دەکرد. دوای تەواوکردنی پەیمانگا لە بانکی (عەقاری سلێمانی) دامەزراو هەر لەو بانکە کچێکی هەڵبژارد بەناوی (شەمسەی حاجی تۆفیق)و بوونە هاوسەری یەك و ناوی لێنا (شەمام)و تائێستاش هەر (بەشەمام و بلە) بانگی یەك دەکەن. بەهۆی باری سیاسییەوە ناچاری ئەوەبوو، سەری خۆی هەڵگرێت و بەرەو ئێران و لە ئێرانەوە بەرەو هەندەران بڕوات...

کاتێك من دەستگیرکرام و هەواڵی گرتنەکەی پێگەیشتبوو، شپرزەو نیگەرانی کردبوو. کە چوومە (ئەبوغرێب) نامەیەکی دوورو درێژی لە کاغەزێکی خورشیدیدا نووسیبوو، هەردوو دیوی لاپەڕەکەی پڕکردبووەوە. لە نامەکەدا جگەلەوەی کە نووسیبووی خەم و پەژارەیەکی ئێجگار زۆرم تووشبوو، کە بیستم گیراویت، بەڵام کە هەواڵم پێگەیشت بە (حوکمدان)ت شکاوەتەوە، دڵخۆشبووم، چونکە پیاو کە لەناوچوو لەناودەچێت و هیچ ئومێدێك نامێنێت، بەڵام حوکمدان ئومێدی ئەوە دەکرێت کە ئازادبێت و لەناونەچێت. لە بەشێکی نامەکەیدا گەڕابووەوە بۆ ژیانی رابردوومان، کۆمەڵێك یادەوەریی وردی وای باسکردبوو، کە من بیرم نەمابوون و لە گێڕانەوەکەشیدا چەندین قسەی خۆش و نووکتەئامێزی تێدا نووسیبوو. باسی ژیانی رۆژانی بەکرەجۆو سۆڵەو دێلێژەی کردبوو، کاتێك نامەکەم دەخوێندەوە، وامدەزانی لەو سێ شوێنەم و بەڕاستیی نامەیەك بوو لە چیرۆکێکی کورتی سەردەمی (لاویتیم) دەچوو.

لە بەشێکی نامەکەدا باسی ساڵانی (قەزای حەی)و سەردانەکەی بۆلامان و باسی ساڵانی بەغداو ژیان و گوزەرانی بەغدای کردبووین... بە نامەکە زۆر زۆر گەشامەوە، چەند رۆژ مواجەهەم لەگەڵدا کردو کە دەمخوێندەوە، وامدەزانی لەگەڵ خۆی دانیشتووم و دووبەدوو قسەدەکەین. ئەو نامەیە لەو رۆژو ساڵ و کاتەو لەو شوێنەدا بۆ من زۆر خۆشبوو، لەبەر،

یەکەم: دەمێك بوو هەواڵیم نەدەزانی بەهۆی ئەو نامەیەوە هەواڵیم زانی، کە لە (سویدە) و باری ژیانیان باشەو لە کێشەو چەرمەسەریی و نارەحەتیی دەربازبوون. دووەم: شێوەی نووسینی نامەکەی شێوازێکی جیاوازی ئەوتۆ بوو، کە لە نامەیەکی چیرۆکناسای ئەدەبیی بەپێز دەچوو.

لەناو نامەکەدا (سەد دۆلاریشی) ناردبوو. ئەو پارەیەش لەوکاتەدا بۆ من جێگای خۆی گرت. سەد دۆلارەکەم لە مواجەهەیەکدا دایە (زەینەب)و وتم: بیبەرەوە، من لێرە پێویستم نییە، بیکەرە خەرجی بۆ مندالەکان (زەینەب) لەوێدا وتی: من نەمزانی ئەو پارەیەی تێدایە. وتم: منیش تا نامەکەم نەکردەوە، نەمزانی. (زەینەب) وتی: ئەوەیە خزمی باش و دڵسۆز. سەیرکە لەو دوورەوڵاتەوە بیری لەچی کردووەتەوە؟

نامەکەم هەڵگرتبوو. دوای ئازادبوونیشم جارێك تا دووجارم خوێندەوە، خوا شەری خۆکوژیی کورد بگرێت، کە پەلاماری ماڵ و ئەرشیفەکەمی داو لەخۆرا هەلاهەلای کردو نەیهێشت ئەو نامە بەنرخە بۆ ئەمرۆ بمێنێتەوە، تاوەکو بەڵگەیەك لەم کتێبەدا بڵاوی بکەمەوە.

# مانگی (١٢)و چۆنیتی ئازادکردنمان

لە هەفتەی دوای مانگی چوارەوە گفتۆگۆو دانووستاندن لە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانییەوە لەگەڵ رژێمی بەعسدا دەستیپێکرد، درێژەی کێشاو لەماوەی وتووێژەکاندا بڕیارێکی لێبووردنی گشتیی بۆ زیندانییانی سیاسیی دەرکرا، بەڵام کار بەبڕیارەکە نەکراو ئەنجامی وتوویژیش هیچی لێ سەوز نەبوو، بەهۆی رەفتارو هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی عیراقەوە لەکاتی دانیشتن و وتوویژدا بەرامبەر جەماوەری کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە شارەکاندا، کۆمەڵانی خەڵك کەوتنەوە راپەڕین و خۆپیشاندان لە دژی رژێم... لە (١٩٩١/٧/١٧)دا راپەڕینی دووەم لە شارەکانی (سلێمانی. هەولێرو زۆر شوێنی دیکەی وەکو کۆیە خۆپیشاندان و راپەڕین بەگەرمیی دەستیپێکرد، لەو راپەڕینانەدا ژمارەیەك لە خۆپیشاندەران شەهیدکران و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازو پیاوانی رژێم کوژران، ژمارەیەکیش کە خۆی دەدا لە سێ هەزار کەسێك بەدیل گیران. لەو دەستگیرکراو و کوژراوانەدا کۆمەڵێك ئەفسەری پلەداری لە هێزەکانی سوپایان تێدابوو... راپەڕینەکان گوشارێکی جەماوەریی گەورە بوو بۆ سەر رژێم و دامودەزگاکانی و سەرانی رژێمەکەی، کە تێیان گەیاند کە کوردو جەماوەری ستەمدیدەی کوردستان جارێکی دیکە لە زەبرو زەنگیان ناترسێن و ملکەچی فەرمان و بڕیارەکانیان نابن و هیچ دامودەزگایەکی سەرکوتکەری بەعس توانای ئەوەی نابێت کە جەماوەر داسەکێتن و رامی بکات. بەدوای راپەڕینی مانگەکانی (٧-٨-٩)دا راپەڕینی سێیەم لە سەرەتای مانگی (١٠)دا بەمانگرتن و پەلاماردان و خۆپیشاندان لە سەرتاسەری کوردستاندا دەستیپێکرد. رژێم کە زانی تازە ناتوانێت جارێکی دیکە دەسەڵات بەسەر کوردستاندا بگرێتەوەو بەتەواویی سام و هەیبەتی بەعس لە سەرتاسەری کوردستاندا نەماوە، کەس حیسابیان بۆ ناکات و هەرچی بکات بێسوودە، بۆیە بەناچاریی لە کۆتایی مانگی (١٠)دا کە وابزانم رێك لە (١٩٩١/١٠/٢٣) بەرەسمیی بڕیاریدا، کە ئیدارە لە هەرسێ پارێزگا ئازادکراوەکەی کوردستان بکشێتەوەو لەگەڵ بڕیاری کشانەوەیدا مووچەی سەرجەم فەرمانبەرانی کوردستانی بڕی. بەنیازی ئەوەی بەم بڕیارەی سەرکردایەتی کورد لە کوردستاندا رووبەرووی تەنگەشەی دارایی و ئابووریی دەکات و گوشارێك دەبێت بۆسەریان و لە ئەنجامی بێمووچەیی، خەڵکی کوردستان لە سەرکردایەتی سیاسیی کورد رادەپەڕن و پەنا بۆ رژێم دەبەنەوە. نەیزانی جەماوەر هێندە داخلەدڵ و رقنەستوورە، ئامادەیە بەساڵ بە نانەسکی و بەوپەڕی ناخۆشییەوە ژیان بەسەر بەرێت، بەڵام جارێکی دیکە پەنا بۆ رژێمی بەعس نەبەنەوە. کۆمەڵانی خەڵك رازی بوون، بەوەی دەست بخەنە بینەقاقای خۆیان لەپێناوی سەرفرازیی و نەگەڕانەوەی دەسەڵاتی رژێم... بەدوای کشانەوەی حکومەت لە کوردستان، ئیدارە کەوتە دەست (بەرەی کوردستانیی) سەرکردایەتی بەرە توانییان لەگەڵ

کشانەوەی رژێم لە کوردستاندا، ئیدارەی هەرسێ پارێزگای (سلێمانی، دهۆك، هەولێر) بگرنە دەست و ئیدارەیەکی خۆماڵیی کوردی دابمەزرێنن... ئێمە کە ئەم هەواڵانەمان لە بەندیخانە پێدەگەیشت و لەو ئیزگانەوە گوێمان لێدەبوو. شاگەشکە دەبووین و دەمان وت، ڤیروسیا ئێمە بەرنابین مادام وڵاتەکەمان ئازادبووەو لە چاوزەقکردنەوەی بەعس رزگاری بووە باکمان نییەو لەوە گەیشتبووین کە رژێمی بەعس جارێکی دیکە ناتوانێت دەسەڵات بەسەر کوردستاندا بگرێتەوەو کورد قڕ بکاتەوە ئەوەشمان لاروون بوو، رژێم هەر ناچاردەبێت کە نزیك یان دوور ناچاردەکرێت کە ئێمە لە زیندانەکانی ئازاد بکات. بۆیە لە کۆڵ خەمی مانەوەمان لە زیندان بووبووینەوە. ئێمە وامان ئەژمارد کە کوردو کوردستان بەرەو سەربەخۆیی هەنگاو دەنێت... لەکاتێکیشدا دەمانبیست (کەناڵی تەلەفزیۆنی کوردی لە کوردستانی ئازادکراودا لە سلێمانی کراوەتەوە) بە وتارێکی (هەڤاڵ مام جەلال) بەرنامەکانی پەخشکردووە، یان دەمانبیست (کۆلێژی سەربازیی) لە قەڵاچوالان کراوەتەوە، بەو هەواڵانە دەستمان دەخستە سەر دڵمان و دەمان وت، ئیتر تەواو ئاواتەکانمان هاتوونەتە دی و لەمەو دوا منداڵەکانمان چاوزەقکردنەوەی بەعس نایان تۆقێنێت.

لەو سەرودەمەدا ئێمە بەتەواویی دەستمان لەوە شۆرد، کە رژێم لە بەندیخانە دەرمان بکات، بڕیاری لێبووردنەکە جێبەجێ بکات، بەڵکو وای بۆ دەچووین کە لەداخی کورد لەو بڕیارەی پاشگەزبووەتەوە. دەرچوونمان بووەتە شتێکی چاوەڕواننەکراو و موستەحیل... مانگی (١١)مان بەو حاڵەوە بەسەربرد، لە مانگی (١٢)دا، هەواڵمان زانی کە خودی سەدام و کۆمەڵێك لە سەرانی رژێمەکەی، لە هەوڵی ئەوەدان کە لەو ئەفسەرە پلەدارانەی کە بەدیل گیرابوون، یان کوژرابوون لەکاتی شەڕو راپەڕینەکاندا، خەڵکانی نزیك و کەسوکاریان بوون، دەیانویست بە هەرنرخێك بێت دەستیان بکەونەوە، لە رێگای نوێنەریانەوە ئەو داوایەیان لە سەرکردایەتی کورد کرد، سەرکردایەتی کورد بەتایبەتی بەرپرسانی (ی.ن.ك) بەمەرجێك ئەو دیل و کوژراوانە دەدەنەوە بە رژێم، کە (زیندانییە سیاسییەکان) ئازاد بکرێن، وەکو دەمانبیست ئەو مەرجە خوالێخۆشبوو (کاك جەبار فەرمان) داوای دەکرد، مەرجەکە سەریگرت و بڕیاری ئازادکردنمان دراو لە (١٩٩١/١٢/٢٠) هەموومانیان کۆکردەوەو کۆمەڵێك فۆرمیان پێ پڕکردینەوەو ئاگاداریان کردین کە خۆمان ئامادە بکەین بۆ ئازادبوون... بەیانی رۆژی (١٢/٢٢) پێش نیوەڕۆ، بە موکەبەرە کەوتنە ناو خوێندنەوەمان... لەگەڵ بانگکردنەکەدا دەرگای بەشەکان و رەدهەکانیان دەکردەوەو ئێمەش بەو کەلوپەلەی دەمانبردنەوە، لەگەڵ خواحافیزیدا لە برادەرەکانمان، دەچووینە دەرەوەو لە ڕاڕەوەکەوە بەرەو ڕاڕەوی ئیدارەو لەو شوێنەی کە لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لێوەی چووینە ژوورەوە بۆ بەندیخانە، لە هەمان شوێنەوە کردیانینە دەرەوەو لە بەردەمی دەرگای بەندیخانە لە ناوەوە، شوێنێك هەبوو، چەند کورسی بە

چیمەنتۆ دروستکراوی لێبوو. ئەو شوێنە جگە لەوەی کە لەدوای بڕیاری دادگا لێوەی چووینە ژوورەوە. من ئەو کاتە هێشتا لە (ڕەدهەی یەکی پێشوازیی بووم). مواجهەیەکم تێدا کردبوو. ئەویش بە هاتنی (کاک حەمەڕەشید، کاک حەمەنووری، کاک ئیبراهیم عەلی ڕەزا، کاک مەلا داودو کاک ئیبراهیمی عەلی بەگ) بۆلام، واتە بە مواجهەیەکی تایبەت. کە لە ڕێگای کاک (ئیبراهیم عەلی ڕەزا)وە ڕێکخرابوو. لەو شوێنە دایاننایین. لە ئیدارەوە هاتنەوە بۆلامان و ناوەکانیان خوێندینەوە. ئەوانەی خزمەتی سەربازییان لەسەر بوو، یان دەبوو بەپێی موالیدەکانیان بچنە خزمەتی سەربازیی، جیایان کردنەوەو ئەوانەشیان دەناردنەوە بۆ سەربازگەکانی لەکاتی پێش دەستگیرکردنیاندا لێی بوون، واتە ئەوانەیان لە ئێمە جیاکردەوە. ئەوەشی خزمەتی سەربازیی نەیدەگرتنەوە جیایان کردینەوەو یەکێك هات هەندێك قسەی بۆکردین سەبارەت بەبڕیاری لێبووردن و ئازادکردنمان. لە قسەکانیدا بەمەکرەمەی سەرۆك سەدامی دادەنا. کەوتە ئەوەی کە پێمان ڕابگەیەنێت بەرەو دەرەوەی بەندیخانە بڕۆین، چەند کەسێکمان داوایان کرد، کە وەرەقەی ئازادبوونمان بۆ بکەن بۆئەوەی کە چووینەوە شارو شوێنی خۆمان بەو وەرەقەیە سەردانی فەرمانگەکانمان بکەین، بۆ گەڕانەوەو دەوامکردن. ئەم قسەکەری ئیدارەیە وتی: پێویست ناکات و ناتانەوێت، بەڵام چەند برادەرێکمان سووربوون لەسەر داواکەیان و بەکورتی نەیان دەویست بەبێ ئەو وەرەقەیە لە بەندیخانە بچنە دەرەوە. بۆیە ناچاربوون ماوەی زیاتر لە کاتژمێرێك ڕامانگرن و تا ئەو وەرەقەیەیان بۆکردین، کە تێیدا نووسرابوو (دوای دە ڕۆژ سەردانی دائیرەی ئەمنی پارێزگاکانمان بکەین) لەوکاتەدا کە برادەران سووربوون لەسەر داواکردنی وەرەقە (یەکێك لە ئەفسەرەکان ئیتر نازانم پلەی چی بوو پێی وتن بابە بڕۆن و لەسەر وەرەقە ڕامەوەستن و تازووە لە بەندیخانە بچنە دەرەوە. کێ دەڵێت تا ئەو وەرەقەیەتان بۆ دەکرێت بڕیارێکی دیکە نایەت کە بەرنەدرێن و بتانگێڕنەوە بۆ ناو بەندیخانە...). بەگوێمان نەکرد. دیاربوو ئەوان بۆیە ئەو وەرەقەیەیان نەکردبوو، ئاگاداری دۆخی کوردستان بوون و دەیانزانی هیچ دائیرەیەکی ئەمن لە شارەکانی کوردستاندا نەماوەو حکومەت لە کوردستان پاشەکشەی کردووەو دەسەڵات بەدەست سەرکردایەتی کوردەوەیە، وەرەقەیان بۆ هێناین بەبێ ئەوەی ناومانی لەسەر بنووسن، هەر یەکەو وەرەقەیەکیان پێداین و وتیان، کە چوونەوە خۆتان پڕی بکەنەوە، وەرەقەمان وەرگرت و بەرەو دەرگای حەوشەی بەندیخانە بەڕیز کەوتینە ڕێ. یەك بەدوای یەکدا خواحافیزیمان لەو کاربەدەستانە کردو لە دەرگای حەوشەی بەندیخانەی سەقیلەی ئەبوغرێب چووینە دەرەوە، بە دواماندا دەرگاکەیان داخستەوە... زۆربەمان بارمان قورسبوو. بەدەست ئەوشتانەی پێمان بوو گیرمان خواردبوو. لە نزیکی بەندیخانە هیچ جۆرە هۆیەکی گواستنەوە نەبوو، بەپێ کەوتینە ڕێ و ماوەیەکی باش کە ئەگەر بڵێم زیاتر لە سەعات و نیوێك بە چۆڵەوانیدا ڕۆیشتین... تا لەوێوە تێگەیشتین کە ئەو ماوەیەی

ئێمە لە بەندیخانەدا بووین، کەسوکارمان و ئەوانەی هاتبوون بۆلامان، بەچ زەحمەت و ماندووبوونێك گەیشتوونەتە لامان، گەیشتینە سەر شەقام و بازاڕێکی قەرەباڵغ... پێش ئەوەی سواری سەیارە بین، هەرهەموو بڕیارماندا کە بچینە (ئوتێل پێشرەو) لە (باب الشرجی) دوو دوو و سێ سێ سواری ئۆتۆمبێل بووین. من و دووکەسی دیکە کە بیرم نەماون کام لە هاوڕێکانم بوو سواری تەکسییەك بووین. کە زانی زیندانین و کوردین و ئازادکراوین، کەوتە قسەی خۆشو پیرۆزبایی لێکردنمان و وتی، مادام دەمێکە ناو بەغداتان نەبینیوە، حەزدەکەم لەسەر حسابی خۆم ئەگەر ڕازیبن ناوشارتان بگێڕم. وتمان بۆ نا... بەڕاستیی گەڕانێکی زۆر باشی بەناو بەغدادا پێکردین و زۆر شوێنی بردین و ئێوارە گەیاندینییە ئوتێلەکە. کە چووینە ژوورەوە، سەیرمانکرد ژمارەیەك لە هاوڕێیانمان لە ئیدارەی ئوتێلەکە دانیشتوون، خاوەنی ئوتێلەکە کوردەو خەڵکی سلێمانی بوو. زۆر بەگەرمیی و خۆشییەوە پێشوازیی و پیرۆزبایی لێکردین، بۆ هەرهەموومان شوێنی حەوانەوەی دابینکرد... شەو چەند کەسێك سەردانی خزمانیان کردو منیش تەلەفۆنم بۆ کاك (برایم) کرد. مژدەی ئازادبوونم پێدان، وتی: لەکوێن هەرئێستا دێم بەشوێنتا. وتم: ئێمە کۆمەڵێك هاوڕێین ئەمشەو لێرەین، نامانەوێت لەیەك جیاببینەوە، دەمانەوێت بەیانی زوو بەرەو سلێمانی دەربچین، وتی: دێم هەرهەمووتان دێنم بۆماڵی خۆمان و بەیانیش ئۆتۆمبێلتان بۆ ئامادە دەکەم، هاوڕێکانم ڕازی نەبوون و منیش پێم وت: تازە بەم درەنگ وەختە مەیەو هەر ئەوەندە بزانە کە ئێمە لە بەندیخانە دەربازبووین.

شەو چووینە باری ئوتێلەکە... داوای خواردنەوەمان کرد، چەند برادەرێکمان نەیان دەخواردەوە، یەکێك لەوانە (مامۆستا ئەحمەد سالح) بوو. وتی: من ناخۆمەوە، وتمان بەبۆنەی بەربوونەوە هەر دەبێت بخۆیتەوە، ڕازیبوو لەگەڵمانداو بەو بۆنەیەوە بیرەیەك یان دوانی خواردەوە، وا مەزەندە دەکەم ئەو دانیشتن و خواردنەوەیەمان یەکێك لە ئوتێلەکە پارەکەی دا، ئێوارەش کە نانمان خوارد لە کەبابخانەیەك هەرچیمان خوارد خاوەنی کەبابخانەکە هەرچەندمان کرد پارەی وەرنەگرت، خاوەنی ئوتێلەکە شەو پاسێکی مونشەئەی گەورەی بۆ گرتین، بۆئەوەی بەیانی زوو بێتە بەرئوتێل و هەرهەموومان بەرەو سلێمانی بەرێت. بەیانی زوو پاسەکە هات و بەرەو سلێمانی کەوتینە ڕێ... لە(خالس) لاماندا میوەیەکی زۆرمان کڕی... کە گەیشتینە بازگەی کەرکوك - سلێمانی. بازگەکە ڕێگای بەپاسەکە نەدا بمانگەیەنێتە سلێمانی و ناچار پاسێکی دیکەمان گرت... لە بازگەکە ڕازی نەدەبوون ئەو میوەیەی کڕیبوومان لەگەڵ خۆمان بیبەین، لەبەرئەوەی هەموو جۆرە خواردەمەنییەکیان قەدەغەکردبوو بچێت بۆ سلێمانی، بەڵام پێمان وتن، ئێمە (زیندانیی سیاسین)و لەسەر بڕیاری (سەرۆك سەدام) ئازادکراوین و ئەمەش وەکو دیارییەکی سەرۆك دەیبەینەوە بۆ منداڵەکانمان. کە وامان وت ڕێگایان داین و هەرچی میوەیەکمان کڕیبوو بیبەین و گلی نەدەنەوە. کە لە بازگەی کەرکوك دەرچووین و

بەرەو سلێمانی کەوتینە ڕێ، لەخۆشیدا نەماندەزانی چی بکەین و باوەڕمان نەدەکرد کە ئێمەین و لە ئۆتۆمبێلداین و لە بەغداو بەندیخانەکەیەوە بەرەو سلێمانی دەڕۆینەوە... کە گەیشتینە (بازگەی بانیمەقان) ڕایان وەستانین و دەستیان بە پشکنینمان کرد، سەیری ئەو هەموو میوەیەیان کردو کەوتنە پرسیارکردن، کە پێمان وتن ئێمە زیندانیی بووین، لەسەر بڕیاری سەرۆك سەدام ئازادکراوین... سەربازەکانی بازگەکە دەیان وت: (ئێوە دەچن بۆ وڵاتێکی تر (انتم ترحون لغیر دولة)، بەو وشەیە زۆر دڵم خۆشبوو، وتم: ئەوە سەربازی عەرەبە بەئێمە دەڵێن دەچن بۆ وڵاتێکی تر، واتە وڵاتی کوردستان، وتم: کوڕینە ئەمە مژدەیەکی ئێجگار خۆشە کە ئەم سەربازانە وەها دەڵێن، لەو بازگەیەش میوەکانیان گلنەدایەوەو میوەکەمان گەیاندەوە سلێمانی.

## پێشوازییەکەی مانگی (٧)ی خێوەتە، گەیشتە مانگی (١٢) لە چەمچەماڵ

لە (١٩٩١/٧/١٥) لە سەردانێکی چاوەڕواننەکراودا، (دکتۆر فوئاد مەعسووم) بەمەبەستی سەردانمان هاتە بەندیخانەی ئەبوغرێب و پێی ڕاگەیاندین، کە چەند ڕۆژێکی دیکە ئێوە ئازاد دەبن و لەکاتی ئازادبوونەکەتاندا ئێمە مەراسیمی پێشوازیکردنمان لە (گوندی خێوەتەی نێوانی قەڵاچوالان و ماوەت)دا بۆ ئامادەکردوون... بەدوای ئەو سەردان و پێڕاگەیاندنەدا (٥) مانگ و حەوت ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی، ئینجا ئەو مژدەیەی (دکتۆر فوئاد) بووە ئەمری واقیع و لە زیندان ئازادکراین... مەراسیمی پێشوازییەکەمان کە دەبوو لە مانگی (٧) و لە (خێوەتە)بێت، گەیشتە مانگی (١٢)ەو لە چەمچەماڵ سازکرا، ئەو چەند ڕۆژەی کە ئەو وتی، بووە چەند مانگ و ئێمەی بەتەواویی نائومێد کردو دەستمان لەوە شۆرد کە ئێمە بتوانین زیندانی ئەبوغرێب بەجێبهێڵین و دەربازبین.

کاتێك ڕۆژی (١٩٩١/١٢/٢٢) لە دەروازەی بەندیخانەی ئەبوغرێب هاتینە دەرەوە بەرەو ناو بەغدا کەوتینە ڕێ، شەو لە (ئوتێل پێشرەو)ماینەوەو بەیانی ڕۆژی (١٩٩١/١٢/٢٣) بە پاسێکی گەورە لە بەغداوە بەرەو سلێمانی بەڕێکەوتین، دەوری نیوەڕۆ گەیشتینە بازگەی (بانیمەقان) و کە لە بازگەکە بەو ڕستەیەی سەربازەکانی بازگەکە کە وتیان ئێوە دەچن بۆ (غەیر دەولە) مەرەخەسیانکردین، بە لێژگاییەکەی ڕووی شاری چەمچەماڵدا شۆڕبووینەوەو زۆری نەخایاند گەیشتینە چەمچەماڵ. لە بازگەکەوە هەموو قوتەو ملەو بەرزاییەکی کە دەیڕوانی بەسەر شاری چەمچەماڵ و ناوچەکەدا، سەربازگەو ڕەبایەی سەربازیی بوون، ئەگەر سەرنجت بدایە لەهەموو ڕەبایەکانەوە لوولەی دۆشکە بەرەو چەمچەماڵ دامەزرابوون. هەر لە سێبەری ڕەبایەکان دەرچووین و لەپێشی ناوماڵەکانی چەمچەماڵ کەوتینە ناو ئاپووڕەی جەماوەری پێشوازیکردنمان و پاسەکەمان کەوتە ناو ئەو جەماوەرەوە، کە لەمبەرو ئەوبەری شەقامەکەدا ڕاوەستابوون، (من و مام تالیب) لەلای یەکەوە لە پاسەکەدا دانیشتبووین، لەوکاتەی کەوتینە ناو جەماوەرەکەوە، لاشعوریی من قورگم پڕبوو لە گریان و فرمێسك بەچاوانمدا کەوتنە سەر ڕوومەتەکانم، کە بەلای (مام تالیبدا) لامکردەوە، سەرنجم دا ئەویش بەهەمان شێوەی منەو چاوەکانی دەسڕێت. لێم پرسی (مام تالیب) دەبینم تۆش قورگت پڕبووەو ئاو بەچاوانتا دێتە خوارەوە، باشە هۆی چییە هەردووکمان وا دڵمان پڕبووەو چاوەکانمان پڕ فرمێسکن؟ وتی: منیش نازانم... (شێخ محەمەد) دەبێت خۆشیش گریان و فرمێسکی خۆی هەبێت، وتی: دیارە دڵپڕبوون و گریان و فرمێسك هەڵڕتنیش تەنها هەر بۆ کاتی ناخۆشیی و لەدەستدانی ئازیزان نییە، دڵخۆشیی و شادیش لەم جۆرە گریان و فرمێسکڕشتنەی هەیەو بەگریانی خۆشیی دادەنرێت، ئێمە کە لە جامی سەیارەکەوە سەیری دەرەوەمان دەکردو دەمانبینی جەماوەر وەکو (تەتەڵە میران) لە پانتایی پێش ئەوەی بگاتە ناو ماڵەکان، بڵاوبوونەتەوەو بەیەکدا دێن و دەچن و پێشمەرگەش بەچەکەوە بەناویاندا دەسووڕێنەوە، بەبێ ترس لە

بەرامبەری ئەو هەموو رەبایەی سەربازەکان دەسووڕێنەوە. دیاربوو ئەو قورگ پڕبوونەمان هۆی ئەوەبوو، کە ئەمڕۆ گەلەکەمان گەیشتووەتە رۆژێك جەماوەرو پێشمەرگەکانی سڵ لە دوژمن و سوپاکەی ناکەنەوە، سنوورێکی دیاریکراو دانراوە بۆ سەربازەکانی رژێم، بۆیان نییە لەو شوێنانەی خۆیان بێنە خوارەوەو ناشتوانن کە ئەو هەموو خەڵك و پێشمەرگەیە دەبینن تەقەیان لێبکەن و رقی شۆڤینییانەیان بەسەردا بڕێژن... ئێمە لەو گریان و سەیرکردنە خۆشەدا بووین، کاتێکمانزانی لە ناوەڕاستی جادەو لەناو جەماوەرەکەدا پاسەکەیان راگرتین، بوو بە چەپڵەڕێزان و هوتافکێشان. هەر دەرگای پاسەکە کرایەوە... یەکسەر (کاك مولازم عومەر، کاك عومەر فەتاح، کاك جەبار فرمان و مام رۆستەم) یەك بەدوای یەکدا بۆناو پاسەکە سەرکەوتن و هاتنە ناو پاسەکەوە... بە هەردوو دەستیان سڵاویان لێدەکردین و بەخێرهاتنەوەو پیرۆزباییان لێدەکردین. (کاك مولازم عومەر) وتی: ماوەیەکی زۆرە ئێمە لە خەمتانایین و ئێوەی تێکۆشەرانی ناوشار بەهۆی زیندانیکردنتانەوە نەتانتوانی لە راپەڕین و ئازادکردنی کوردستاندا بەشداریمان لەگەڵدا بکەن... بەڕاستیی جێگەتان دیاربوو. بەدەم پێکەنین و قسەکردنەوە گەیشتە لای من و مام تالیب. وتی: (شێخەگیان) چەندم پێخۆشە کە ئاوا لەم رۆژەدا بەسەربەرزیی دەتبینم و بە دیدارت شادبوومەوە، باوەشێکی برایانەو تێکۆشەرانەی پیاکردم و تێر یەکمان ماچکردو دوایی خۆی گەیاندە (مام تالیب)و وتی: (مامە تالیب) خوا بەعس و سیاسەتەکەی بگرێت، کە پیاوێکی وەکو تۆی بەم تەمەنەوە راپێچی زیندان کرد. دوای ئەو (کاك عومەر فەتاح) دوای سڵاوکردن و بەخێرهاتنەوەو پیرۆزبایی گەیشتە لام و وتی: (شێخە) چەندە خۆشحاڵم کە هاورێیەکی خۆشەویستم لەکاتی ئازادیی کوردستاندا بەهۆی خەباتی نهێنییەوە گیراوەو ئازاد دەکرێت، باوەشمان لەیەکداو رووبکردە هاورێیان و وتی: ئێوە بەحەق تێکۆشەرو هاورێی نەترسی (ی.ن.ك)و کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوون، ئێوەبوون لەناوجەرگەی دوژمندا بوێرانە خەباتتان دەکردو پاڵپشتی هێزی پێشمەرگە بوون. (کاك جەبار) لەبەرئەوەی دیاربوو کەسمانی لەنزیکەوە نەدەناسی، بەهەردوو دەستی بەپێکەنینەوە وتی: بەخێربێنەوە... حەزدەکەم بزانن بەعس ئێوەی بەرنەدەدا، ئەگەر ئێمە ئەو ئەفسەرە پلە دارانەمان بەدیلی لای خۆمان نەهێڵایەتەوەو ئەو ئەفسەرە کوژراوانەی کەوتبوونە بەردەستمان گلمان نەدانایەتەوە، بە لێبووردنەکە ئێوەی بەرنەدەداو ئێمە سووربووین لەسەر ئەوەی کە ئێوە ئازاد بکەن، ئینجا ئێمەش ئەو ئەفەسرو لاشانەیان بدەینەوە. دڵنیاتان دەکەم ئێمە یەك ئەفسەرو لاشەمان نەدەدانەوە تا ئێوەیان ئازاد نەکردایە، حەزدەکەین بزانن ئێوە بەگۆڕینەوە بەردراون و ئومێد دەکەین بە گەرانەوەتان بۆناومان، ببنە کۆڵەکەیەکی ئەستوور بۆ رێکخستن و جۆشدانەوەی جەماوەرو کۆکردنەوەیان لە (ی.ن.ك). (مام رۆستەم) بەدوایاندا هەردوو دەستی هەڵبری و وتی: چەند سەربەرزییە بۆ ئێمەی پێشمەرگە لەمرۆدا بەهۆی خەباتی بەردەوامی گەلەکەمانەوە کۆمەڵێك لەئێوەی تێکۆشەر لە ئازادیی کوردستاندا دەگەڕێنەوە ناومان و شەقی زەمانە سەدام و بەعسی

ناچارکرد کە ئێوەی خەباتکار بگەنەوە ناومان...

دوای ئەو پێشوازیی و بەخێرهاتنەوەیەمان یەك بەدوای یەکدا، لە پاسەکە چوونە خوارەوەو ئێمەش بەدوایاندا هەریەکەمان لەجێگای خۆمانەوە کەوتینە جوولە بۆلای دەرگاکە، کەوتینە دابەزین لەگەڵ دابەزیندا دەمانبینی جەماوەرێکی زۆری لە رادەبەدەر لە چاوەروانی دابەزینماندان، هەر لە دەرگای پاسەکە دەهاتینە خوارەوەو هەریەکەمان کۆمەڵێك لە براو خزم و کەس و هاورێمان پەلاماریان دەداین و جیایان دەکردینەوەو هەریەکەمان دەبووە پشکی کەسوکاری خۆی و بەرەو لای ئۆتۆمبێلەکان دەیانبردین. من هەر لە پاسەکە هاتمە خوارەوە، هەرئەوەندەم زانی (کاك حەمەنووری و کاك حەمەرەشید) هەریەکەیان لەلایەکەوە قۆڵیان بە قۆڵمدا کردو براو خوشك و برازاو خوشکەزاو کەسوکارو ناسیاو لەپێش و پاش و ئەملاو ئەولامەوە، کەوتنە رۆیشتن و بەدەم رۆیشتنەوە، لە خزم و کەس و هاورێیانم پەلاماریان دەدام و ئەملاو ئەولایان ماچ دەکردم و بە زەردەخەنەی خۆشییەوە دەگەرایەوە، بەدەم رۆیشتن و لەناو ئەو ئاپوورەی خەڵکەدا کە وردە وردە دەرۆیشتین، کاتێکمان زانی گەیشتینە ئەو شوێنەی کە ئۆتۆمبێلەکانی لێ راوەستابوو. لەوکاتەدا کەسمان ئاگامان لە کەسمان نەماو هەریەکەمان سەرقاڵی خزم و کەسوکاری خۆی بوو... هەر گەیشتینە لای ئۆتۆمبێلەکان (کاك حەمەنووری) بە کاکەمی وت: (کاك شێخ عوسمان) من کاك شێخ محەمەد دەخەمە ناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆمەوە، کێتان جێگاتان بووەوە لەگەڵمان سورابن و ئەوانی دیکەش با بەدواماندا بێن بەرەو سلێمانی.

بەناو ئەو خەڵکەدا کەوتینە رێ و وردە وردە، زۆر لەسەرخۆ دەرۆیشتین... نازانم ئا لەوکات و ساتەدا ئاو هەر بەچاوەکانمدا دەهاتنە خوارەوە؟ جا ئاو بەچاواندا چۆن نایەتە خوارەوە لە رۆژێکی وا مێژووییدا. ببینم وڵاتەکەم ئازاد کراوەو گەلەکەم سەرفرازەو بەئازادیی و بێ ترسی دوژمنان لەناو خاك و نیشتمانی خۆیدا هەڵسوکەوت دەکات، ئەو رێبازو بیروباوەرەی ئێمەی لەسەر دەستگیرکرابووین و زیندانیکرابووین، تا رادەیەکی زۆر بەرهەمەکەی بە ئەنجام گەیشتووە، ئەو ئامانجەی لەپێناویدا خەباتمان بۆ دەکردو قوربانیمان لەپێناویدا دەدا، ئەو سەرکردەو پێشمەرگانەی تا پێش راپەرین نەیاندەتوانی لە چیاکان بێنە خوارەوەو بگەنە ناو شارەکان، لەئێستادا ئەوە دەبینین هەر سەرکردەیەو پێشمەرگەیە بەسەربەرزیی و سەربەستی لەناو جەماوەردا بەئازادیی دەسوورێتەوەو ئەوان باوەش بە جەماوەر جەماوەر باوەش بەواندا دەکات، ئەم کوردستانە ساڵانێکی دوورو درێژ بووبووە قورەشێلی پۆستاڵی داگیرکەران و لە کورد قەدەغە کرابوو. لەمرۆدا ئازادەو یەك سەربازی دوژمن نابینی و لە بانیمەقانەوە دووراو دوور سەیری خاکەکەمان دەکەن، ناتوانن هەنگاوێك بێنە پێشەوە. چۆن فرمێسك بەچاواندا نایەتە خوارەوە، لە سات و رۆژێکی وادا کە دەبینین ئەو ئاوات و ئامانجەی ساڵانێکی تەمەنمان لەپێناودا دانا، وا ئەمرۆ دەبینین هاتوونەتە دی و گەل و وڵاتەکەمان دوورن لە رقی شۆڤێنییانەی بەعس و داگیرکەرانی. لەکاتی رۆشتنماندا بە شەقامی ناو چەمچەماڵدا

چەند دڵخۆش دەبووین کە بەریز خەڵك لەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە راوەستاون و بەدەست و چەپڵەریزان و هوتافکێشانەوە بەوپەری دڵخۆشییەوە پێشوازیمان لێدەکەن.
کاتێك گەیشتینە (تەکیە)، دەمانبینی خەڵکی ئەو ئۆردووگایە بەکۆمەڵ بەژن و پیاوەوە لەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە لە پێشوازیماندا راوەستاون و بەوپەری خۆشییەوە بەخێرهاتنەوەمان دەکەن... بەڵێ، تەکیەش پێشوازییان لێکردین و کاتێکمان زانی گەیشتینە ناو (دەربەندی بازیان)و بە بەردەمی بەردەقارەماندا بەرەو بازیان دەرۆین. کە گەیشتینە ئاستی (بەردەقارەمان) بیرکردنەوەم بۆ رابردوومان گەرایەوەو (شێخی نەمرو بەردەقارەمان) وەکو چەخماخە بەمێشکمدا گوزەری کرد، ئەوەم تاووتوێ دەکرد، کە سالانێك پێش لەدایکبوونی ئێمە، سەرکردەو قارەمانێکی وەکو (شێخ مەحمودی حەفید) بەخۆی و لەشکرەکەیەوە لەم دەربەندی بازیانە لەپێناوی رزگارکردنی گەلەکەیدا سەنگەری بەرگریی و مقاوەمەتی لێداو خۆشی لە پێشەوەی پێشەوەی لەشکرەکەی لەژێر ئەو گابەردەدا، چاوی لە قولاغەی تفەنگ و پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەکەی بوو. ئەوێ رۆژێ سنگی داکوتاو بەوپەری نەترسیی و چاوقایمییەوە دەیوست بەر لەهێزی داگیرکەر بگرێت، بەلام یازوخ خیانەتی خۆفرۆشانی کورد بەناجوامێرانە لەژێر ئەو گا بەردەدا بەدیلیان گرت و بە دیلێتی رەوانەی ولاتێکی دوور لە کوردستان زیندانیی کرا، دوای چەندساڵ بەسەر ئەو مێژووەدا کە شێخی نەمر لەپێناویدا خەباتی دەکردو زیندانیی دەکرا، ئێستا ئێمەش لە زیندانی داگیرکەر ئازادکراوین و ئاواتەکانی (مەلیك مەحمود) وا هاتوونەتە دی، ئەوانەی دەستی خیانەتیان گەیاندە بەردەقارەمان بۆ بەدیلگرتنی شێخی نەمر، جەماوەر نەفرەتیان لێدەکات و رووڕەشی مێژووی گەلەکەمانی دەکات. من لەو لێکدانانەوانەدا بووم. کاتێکمانزانی کەوتینە ناو ئاپوورەی خەڵکی ئۆردووگای گۆپاڵەوەو بەدوایدا گەیشتنە تەینال و سەرپردەکەی و خەڵکی ئەو شارۆچکەیەش لە رێماندا راوەستابوون.
کە زانیم تەیناڵە، چەخماخەیەکی برووسکەئاسا بەمێشکمدا رابوورد، ئەوەم هاتەوە یاد کە پێش دەستگیرکردنم شەوەکەی لە تەیناڵ بووم و لەگەڵ چەند هاورێیەکی خۆشەویستدا لەماڵی (حەمدی گلی) شەومان بەسەربردو (براکەی عەزەی نەهێم) هاتەوە یادو لە دلی خۆمدا پرسیم دەبێت ئەو خۆفرۆشانە چییان بەسەر هاتبێت؟ و لە (کاك نووری)م پرسی، نازانیت جەماعەتی عەزەی نەهێ چییان لێهاتووە؟ وتی: رایانکردووەو وان لە بەغدا. بەداخەوە بەردەست نەکەوتن. بەدەم قسەکردنەوە لەگەڵ کاك نووریدا گەیشتینە ئۆردووگای تەیناڵ و خەڵکەکەی ئەویش ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکەیان گرتبوو، لە پێشوازیماندابوون، لەبەردەمی ئەو ئۆردووگایەدا یەکسەر (شێخ سەعیدی شێخ حەمەساڵحی مەیدان)م هاتەوە یاد، کە ماڵەکەی لەو ئۆردووگایە بوو، ئەو ئێوارەیەی لە سلێمانییەوە هاتین بۆ تەیناڵ، ئەویشمان بانگکردو لەگەڵ خۆماندا هەڵگرت، بەداخەوە بووم بۆ شەهیدکردنەکەی و لە کاك نووریم پرسی چۆن شەهیدکرا؟ کاك نووری زۆر بەداخەوە باسی شەهید بوونەکەی کردو وتی:

پیاوێکی زۆر دڵسۆزو کوردپەروەرو قارەمان بوو. جێگای داخە کە شەهیدکرا... ئەویشمان بەو یادگارییەوە جێهێلاو گەیشتینە لای نۆردووگای بازیان. سەیرمانکرد خەڵکێکی زۆر بەجلی زەردو سوورەوە بەلافیتەوە لەبەری خوارووی شەقامەکە راوەستاون بۆ پێشوازیمان و گرووپ گرووپ بە چەپڵەرێزان و دەست بەرزکردنەوە، بەخێرهاتنەوەمان دەکەن و وێنەی (مام جەلال) بەرزدەکەنەوە، ئای چەنێ خۆشبوو کە گەیشتینە دووریانی (ئەڵایی - دێلێژەو دەواجنەکە)... بە گەیشتنم گەرامەوە بۆ ساڵانێك کە (شێخی نەمر - مەلیك مەحمود) لە داریکەلی بوو، چەکدارەکانی بەشەو و رۆژ لە چواردەوری بوون. لەو دیبەوە بە رژێمی پاشایەتی ئەو سەردەمەی دەسەلاند، کە شێخ وەکو سەرکردیەکی کورد دەستبەرداری شۆرش و کوردایەتی نابێت و تا دوانەفەسی ژیانی خەبات دەکات و گەلەکەی جێناهێڵێت، ئەوەم بیرهاتەوە، ئەوکاتەی ئەو لە (داریکەلی) بوو من منداڵبووم تەمەنم دە بۆ دوانزە ساڵان بوو. شێخی باوکم لە رەمەزانێکی ئەو ساڵانەدا بۆ کارێك ناردمی بۆ خزمەتی شێخ و بەو چوونەم چەند دڵخۆشبووم، شریتی بیرەوەریی گەرایەوەو ئەو ئێوارەیەم هاتەوە یاد کە (مەلیك مەحمود) بە خۆی و لەشکرەکەیەوە هاتنە سۆڵەو چووە سەر سەکۆی مزگەوتەکەو باوکم و خاڵەم و کاك سدیق و خزمان لە چواردەوری بوون و ئەو هاتنەی ئاسایی نەبوو، دیاربوو هەواڵی زانیبوو، کە حکومەت هێزی کۆکردووەتەوەو دەیەوێت بینێرێت بۆ سەر شێخو بیگرێت، شێخ بۆئەوەی رووبەرووی شەڕ نەبێتەوە داریکەلی چۆڵکردبوو، هاتبووە خوارەوەو هەر شەو بە لەشکرەکەیەوە لە سۆڵەوە بەرەو پیرەسەن و لە شاخی گردەرەشی سەگرمەوە رۆیشتن، بەیانییەکەی کە ئاوایی بەخەبەرهات سەیرمانکرد پۆلیس چواردەوری ئاوایی گرتووە، سەرپەرشتیاری هێزەکەش (شێخ رەزای گولانی)بوو، هاتەوە بیرم لەو هاتنەی شێخ رەزادا باوکمی بانگکردو پرسیاری شێخ و لەشکرەکەی لێکردو باوکیشم پێی وت: یاشێخ کەس نەماوە راوەدووی مەلیك مەحمود بکات، تۆ نەبێت؟ زۆرم پێناخۆشە تۆ بەم پۆلیسانەوە کەوتوویتەتە دوای شێخ و لەشکرەکەی. شێخ رەزا وتی: خاڵە شێخ من مەئمووری حکومەتم و پارێزگار فەرمانی پێداوم کە دەبێت ئەمە بکەم و دڵنیابە منیش زۆرم پێناخۆشەو پۆلیسەکانیش هەروەکو منن و ئێمە ئەوەی حکومەت و پارێزگار لێمانی دەوێت، خۆمان دەزانین چۆنی جێبەجێدەکەین و شێخ مەحمود بەئێمە دەستگیر ناکرێت.

هەر لەوکاتەدا، کە وردە وردە بە شەقامەکەدا بەرەو ئەڵڵایی و تاسلوجە بەرەو ژوور دەبووینەوە، ئەو رۆژەم هاتەوە یاد، کە لە ساڵی (١٩٨٤)دا، دوای شەهیدکردنی (سەید کەریم) لە تاسلوجە، هێزی پێشمەرگە بۆ تۆڵەسەندنەوەی، دابەزینە سەر شەقامەکان و ئەوکاتەش شەوەکەی من لەگەڵ چەند میوانێکی (کوت و حەیدا) لە دێلێژە بووین، کاتێك هەواڵەکەمان بیست بەیانییەکەی لە دێلێژەوە بەرەو سلێمانی گەراینەوە. کاتێك گەیشتینە سەر شەقامی سەرەکی کەرکوك-سلێمانی، سەیرمانکرد چەند دەبابەیەك و سەربازێکی زۆر راوەستاون، کەبەرەو ئەڵڵایی بەرەو ژوور بووینەوە، (شێخ مەحمود)ی پێشمەرگە رایگرتین و پرسیاری

لێکردین کە لە کوێوە هاتوون، کە یەکمان ناسیەوەو زانی لە دێلێژەوە هاتووینەتەوە، وتی: پەلەبکەن و لەم شوێنە دەرچن، با میوانانەکانتان تووشی کێشەو سەرئێشە نەبن. کە کەوتینە رێ سەیرمانکرد لاشەی کوژراوی سەرباز لەبەری خوارەوەی شەقامەکە کەوتوون، پێشمەرگەش لەمبەرو ئەوبەری سەنگەریان گرتووە، پەنجەیان لەسەر پەلەپیتکەی چەکەکانیانە. ئیتر رێگایەو دووسالە لێی دوورم، کە پێدادەرۆم کۆمەڵێك یادو یادەوەریم بیردێتەوەو دوایان دەکەوم، ئای لەوکاتە کە گەیشتینە ئاستی شارۆچکەی ئەڵلایی و بینیمان خەڵکەکەی بەگەرمییەوە لە پێشوازیماندان و بەو پێشوازییەیان خۆشحالیان کردین، کاتێك بەسەرەو ژوورەکەی تاسلوجەدا بەرەو ژوور بووینەوە، ئەو ئێوارەیەم هاتەوە یاد، کە بە تەکسییەك لەگەڵ (بێگەردو شێخ رەزا) بەرەو تەینال ملمان دەناو بەفر لەیەکپێ دەباری و ترسی ئەوەمان بوو، کە بەفرەکە رێگامان لێبگرێت و نەگەینە تەینال، گەیشتینە بازگەکەی سەر تاسلوجەو یەکسەر ئەوەم بیرهاتەوە کە ئەو بەیانییەی رۆژی (١٩٩٠/١/٢٣) هاورێیان (جەباری حاجی رەشیدو عەبدولعەزیز عومەری) تێداگیرابوون، لەو بەیانییەوە کارەسات بەرەو رووی رێکخستنەکانی ناو شار بووەوەو بەیانییەکەی رۆژی (١/٢٤) منیش لەو بازگەیەوە بەو بەفرە بەرەو سلێمانی لە تەینالەوە دەگەراینەوە، ئێوارەکەی کەوتمە بەر شالآوی گرتن و دوای دوو ساڵ زیندانیکردن، وا ئەمرۆ بە ئاهەنگی ئازادکردنمانەوە، لە ئازادیی کوردستاندا بە هەمان بازگەدا بۆ سلێمانی دەرۆین، بەلآم بازگەکە جیاوازەو لەجیاتی سەربازو ئەمنی رژێم، پێشمەرگەی کوردستانی لێ راوەستاوەو لەجیاتی ئەوەی وەکو سەربازو ئەمنە تاوانبارەکان هاورێکانمان بگرن و خەڵك ئازارو ئەشکەنجە بدەن. بەخۆشیی و شادییەوە لە پێشوازیماندا راوەستاون و بەخێرهاتنەوەمان دەکەن...

کەژاوەی ئازادبوونەو وردە وردە بەرەو سلێمانی شۆردەبێتەوەو لەو رێگایەدا چەندین بیرەوەریم هەیەو برووسکەئاسا بەمێشکمدا گوزەر دەکەن و تێدەپەرن، فریای گێرانەوەیان ناکەوم، گەیشتینە شارۆچکەی تاسلوجەو لەپێش پردەکەوە خەڵکێکی زۆر لە دانیشتووانی شارۆچکەکەو لە هەردوو بەری شەقامەکە لە پێشوازیماندا راوەستابوون. پردەکەی پێش گرتنی ئێمە خەریکی دروستکردنی بوون، هەروەکو خۆی مابوو هێشتا تەواو نەکرابوو... کاتێك گەیشتینە لای کەنەکەوەو کێلەسپی... ساڵی حەفتاو چوارو پێشمەرگایەتی و کشانەوەی هێزی کەرکوکم هاتەوە یاد، کە سەرپەرشتی هێزێکم دەکرد بۆ پەرینەوە لەسەر شەقامەکە (شێخ محەمەدی فەقیرە)م دامەزراند بە بیکەیسی و رەشاشەوە، بۆ ئەوەی تا هێزەکە دەپەرێتەوە پارێزگاری رێگاکە بکات، ئەو بەیانییەم بیرهاتەوە کە لەو کشانەوەیەدا لەگەڵ (دکتۆر نەجم)دا لە بناری شاخی پیرەمەگروون لە هیلاکیدا خەومان لێکەوتبوو، کاتێك خەبەرمان بووەوە، خۆر کەوتبوو، کە (دکتۆر نەجم) هەستاو لەسەر شوێنەکەی جوولآ مارێك لەژێریدا پەپکەی خواردبوو. کاتێك گەیشتینە ئاستی بەکرەجۆو دووریانەکەی لای کۆنە (چایخانەکەی عارف) رۆژانی منداڵی و خوێندنم لە بەکرەجۆو چوونە قوتابخانەو

(عومەر عەلی)و مامۆستا شێخ ئیسماعیل وماڵی پوورە ئامینەم و شێخ ساڵح و چەندین کەسی دیکەم بیرهاتەوە، ئەو رۆژەشم هاتەوە یاد کە لە ساڵی (١٩٥٦)دا هەواڵی وەرگەرانی ئۆتۆمبێلەکەی باوکمیان دامێ، بەشپرزەیی بەرەو لای (باخی بەختیاری)و پردەکەی قلیاسان و سلێمانی رۆیشتم. کە گەیشتمە سلێمانی باوکم کۆچی دوایی کردبوو.

بەدەم ڕێوە کاك نووری بەدەم لێخورینی ئۆتۆمبێلەکەیەوە قسەم بۆ دەکات، ئەویش شتم بۆ دەگێڕێتەوەو باسی راپەرین و چۆنێتی سازدانیم بۆ دەکات، قسەو گێرانەوەکانی ئەو لەگەڵ بیرکردنەوەکانمدا ئاوێتەی یەك دەبوون و هەستم بە بەختەوەرییەکی ئێجگار زۆر دەکرد...

چی لەو سات و کات و رۆژە خۆشتربوو؟ کە بەئازادیی کوردستان و بەسەرفرازیی شاری سلێمانی لەو دەروازەیەی کە بەعس بەنیازبوو شارەکەمان (سلێمانی) بکاتە شارێکی گەشتوگوزاریی و ناوی بنێت (مدینة السیاحیة الاولي) لەسەر گردو بەرزاییەکانی دەوروبەری شار کۆشك و تەلاریان دروستبکەن، خەڵکە رەسەن و شۆڕشگێڕەکەی دەربەدەر بکەن، بیکەنە شاری حەوانەوەو رابواردنیان... بەڵام وا ئەمرۆ بەهۆی خەباتی نەپساوەو بەردەوامی گەلەکەمان و هێزی پێشمەرگەو خەڵکە تێکۆشەرەکەیەوە، نەخشەو پیلانەکانی سەدام و بەعس و رژێمەکەیان پووچەڵکرانەوەو ئێستا سلێمانی بازنەی بەدەوردا نەماوە، بووەتەوە بە شارەکەی (مەلیك مەحمود، پیرەمێرد، زێوەر، بێکەس، شێخ نووری شێخ ساڵح، سالم، کوردی، کەمالی، گۆران و مەلاحەمدوون) کورد بەرێوەی دەبات و چاو و دەست و بیرکردنەوەی داگیرکەرانی لێدوورکەوتووەتەوە.

چەندرۆژێکی مێژوویی بوو، کاتێك گەیشتینە بەردەم مەڵبەندی سلێمانی، کە لە شوێنەکەی مونەزەمەی (حەتین)دا بوون، ئەو مونەزەمەیەی کە نەخشەو پیلانی بۆ لەناوبردنی کوردو تێکدانی شاری سلێمانی تێدا دادەنرا، ئێستا بووەتە جێگاو بارەگای مەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی و لەهەردوو بەری شەقامەکەی بەردەمی حەشاماتێکی ئێجگار زۆر راوەستاون و لە پێشوازیماندان و پێمان دەڵێن (کوران و پیاوانی شار) بەخێربێنەوە بۆ ناومان. ئا ئەوە بەری رەنج و ماندووبوونتانە، بفەرموون خۆتان بکەن بە مەڵبەندەکەتاندا. ئەمە مەڵبەندی ئێوەیەو دەبێت ئێوە لەمەودوا بەرێوەی بەرن و جەماوەری تێدا کۆبکەنەوە، ئەو سات و کات و رۆژەی بەرمەڵبەندو سەرشەقامی (سالم)ی ئێستا، ساڵی (١٩٥٨)و ئازادبوونی (شێخ لەتیفی شێخ مەحمودو گۆرانی شاعیر)م دەهاتەوە یاد، کە جەماوەری شاری سلێمانی لەو رۆژەداو بەوپەری ئازادیی و سەربەستییەوە لە ئامادەیی سەناعەوە بەریز لە هەردوو بەری شەقامەکە راوەستابوون، تا بەردەرکی سەرا بۆ پێشوازیکردن لەو زیندانییانە، دیارە خەڵکی ئەم شارە بوو ئەو رۆژە بۆ ئەو تێکۆشەرانەی گەلەکەیان مەراسیمی پێشوازییان سازکرد، وا ئەمرۆ بۆ ئێمەی رۆڵەیان مەراسیم سازدەکەن، بەو ئاهەنگ و پێشوازییە دڵمان دەدەنەوە، پێمان دەڵێن، خەمتان نەبێت ئەوەی لە ئەمنە سوورەکە بەئێوە کرا، رۆڵەکانی ئەم شارە لە تۆڵەی ئێوەدا بە پیاوانی ئەمنە سوورەکەیان کردەوە، بەو سزایەیان گەیاندن کە ئێوە دەتانویست. دەست

بخەنە سەردڵتان و بەئارامییەوە روو لە ناو ماڵ و منداڵتان بکەنەوە، باش باش بزانن بەدڵی ئێوە تۆڵە لەو تاوانبارو پیاوانەی فاشییەکان کراوەتەوە، ئێمە زۆر سەربەرزین پێتان کە نە ئەشکەنجەو سزادانی ئەمنە سوورەکەو نە دادگای (سەورەکەی عەواد بەندەر)و نە بەندیخانە چەند دیوار بەرزکراوەکەی ئەبوغرێب کۆڵی بەئێوە نەداو بەخۆراگریی و جوامێریتان کۆڵتان بە دوژمنەکەتان داو وا ئەمرۆ سەربەرزو شکۆمەندانە هاتوونەتەوە ناومان.

ئەوکاتەی بەناو جەماوەرەکەدا چووینە ناو مەڵبەندەوە، داوایان لێکردم کە بەبۆنەی ئازادبوونمانەوە چەند قسەیەك بۆ جەماوەرە بەئەمەکەکەی شارکەم بکەم... بردیانمە قاتی سەرەوە، لەسەر ئەو تارمەیییەی رووکاری شەقامە سەرەکییەکە. بەبۆنەی ئازادبوونمان و ئەو پێشوازییە گەرمەی خەڵکەکەوە، چەند قسەیەکم کرد، لەوکاتەدا خۆم زۆر بە بەختەوەر دەزانی، چونکە لە شوێن و جێگایەکەوە قسەم دەکرد بۆ خەڵکی شارەکەم، کە پێش راپەرین شوێنی پیاوانی بەعس بوو. لەم شوێنەوە، پیاوەکانی بەعس نەخشەو پیلانیان بۆ قەلاچۆکردنی کورد دادەنا، رۆڵەی گەلەکەمانیان لەخشتەدەبردو دەیانکردنە بەعسی و ئەمن و پیاوی خۆیان...

ئێستا ئەم شوێنە پڕیەتی لە رۆڵە تێکۆشەرەکانی گەلەکەمان، جەماوەرە داخلەدڵ و خاوەن هەڵوێستکەی، پلانی سرینەوەی شوێنەواری بەعسیتی و تەعریب دادەرێژن بەبیرو باوەری کوردایەتییەکی بێگەرد. نەوەکان پەروەردە دەکەن، خەبات و سەروەرییەکانی (ی.ن.ك) بۆ جەماوەر روونەدەکەنەوە.

دوای تەواوبوونی مەراسیمی پێشوازیکردنمان، هەریەکەمان بەرەو ماڵ و ناو منداڵەکانمان رۆیشتینەوە... کاتێك لەگەڵ کاك حەمەنووریدا سواری ئۆتۆمبێلەکە بووینەوەو بەرەو ماڵەوە کەوتینە رێ، بە شەقامی ناو گەڕەکی (دوورلنەمندا) بەرەو گەڕەکی مامۆستایان دەرۆیشتین. ئەو ساتەی بەناو گەڕەکەدا دەرۆیشتین لە کاك حەمەنووریم پرسی، ئەم خانووانە ئێستا کێیان تێدایە؟ ئەمنەکان چییان بەسەرهات؟ وتی: خانووەکان لەگەڵ راپەریندا، پێشمەرگەو کادیرو خەڵکی شار چوونەتە ناویان و ئێستا هەرکەسێك لەهەر خانوویەکدا بێت، بەخانووی خۆی دەزانێت. ئەمنەکانیش ئەوەی نەکوژراو نەکەوتە بەردەست جەماوەر، دەرچوون خۆیان گەیاندەوە شارو جێگای خۆیان... بەدەم قسەکردنمانەوە گەیشتینە گەڕەکی مامۆستایان و بە شەقامی ناویدا بەرەو کۆڵانی خۆمان چووینەوە، کە گەیشتینە سەری کۆڵانەکە، خەڵکێکی زۆری گەڕەکەکەمان بەمەبەستی پێشوازیی و بەخێرهاتنەوەم راوەستابوون، لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزین و بەپێ بەناو جەماوەرەکەدا بەرەو ماڵ کەوتینە رێ، کە نزیکبووینەوە، سەیرمکرد (زەینەب) خۆی گۆریبوەو بەدڵخۆشیی و پێکەنین و رووی گەشەوە بەرەو پیرمان هات و باوەشمان بەیەکدا کردو وتی: یاخوا بەخێربێیتەوە. ئۆخەی بەدیدارت شادبووینەوە، وتی: من بۆیە نەهاتم بۆ چەمچەماڵ لەبەرئەوەی دوو حەیوانم قەرار دابوو لە رۆژی بەربوونتدا بیکەمە مەولودو ئەوە مەرەکانە بەگەیشتنت وا لەبەر پێتا سەری دەبرین و بەشکم خوا

بەهۆی ئەو مەولودەمانەوە لە بەلاو ناخۆشیی دوورمانخاتەوەو ئیتر بەئاسوودەیی بژین. بەناو خوێنی هەردوو مەرەکەدا بەرەو دەرگای ماڵ و قادرمەکان بوومەوەو گەیشتمە سەربانەکە، ئای چەند سات و کات و رۆژێکی خۆش بوو. دوای دوو ساڵ دوورکەوتنەوەو بەجێهێشتنی ماڵ و منداڵ و ئەو دەرگاو قادرمەو سەربانە، وا ئێستا لە باهۆزێکی ئازادیی و سەرفرازیداو بەوپەڕی دڵخۆشییەوە دەگەڕێمەوەو خۆم بەناو ماڵەکەمدا دەکەمەوەو چەند خۆشبوو، کە منداڵەکان هەریەکەیان بەجیا پەلەی دەکرد زووتر بمگاتێ و خۆی بخاتە باوەشمەوە (بەهار، شێنێ، بلێسە، ژیر، بەخشی و ئازاد)و کاتێکمزانی (شەنگە)یان خستە باوەشمەوەو من ئەوم ماچ دەکردو ئەویش منی ماچ دەکرد وتم: (شەنگە گیان) ئەی بۆ کە هاتی بۆ ئەبوغرێب نەهاتیتە لام، کە سەیرت دەکردم دەگریایت؟

ئای چ رۆژێ بوو، کە دایکم دەیوت رێگام بکەن بابگەمە (حەمە)و هەر بەیەکگەیشتین، نەماندەزانی چۆن باوەش لەیەکبکەینەوە، کە دایکم لەخۆشیاندا گریاو منیشی خستەوەگریان و وتی: رۆڵە بەو دۆعایانە بووایە کە من بۆم دەکردی، دەبوو خۆت و خێزانت و منداڵت تووشی هیچ نارەحەتییەك نەبوونایە. ئێستاش داوام لە خواو باو و باپیرانم ئەوەیە کە ئیتر ئەمە کۆتایی خەم و ناخۆشیی و دەردی سەریتان بێت (حەمە گیان) ئەوە تۆیت؟ ئای! رۆڵە چەندت داخ بەدڵما کرد!! بەخوا گەردنت ئازادنەکەم ئازاد نابیت. کاتێك سەیرمکرد باجی روقیەو سوعادو مەلیح و لەعلی و شوکری هەر پێنج خوشکەکەم بەچواردەوری من و دایکمەوەن و لەخۆشیدا دەشگرین و پێدەکەنن، ئیتر خوشکبێت و برایان لە زیندان ئازاد کرابێت و بێتەوە ناویان، دەبێت چی بکەن و چەند دڵخۆش بن؟ لەو سات و کاتەدا؟ ئیتر بەدوایاندا هەر پوورو براژن و ئامۆزاو خوشکەزاو برازاو پوورزاو خاڵوزاو خزم و کەس بوو هەریەکە بەجیاو بەپەرۆشەوە باوەشیان پێدا دەکردم و بەخێرهاتنەوەیان دەکردم...

ئای! چەند رۆژانی پڕشکۆو ناوازەبوو، لە رۆژی (١٢/٢٣)ەوە تا سەری مانگ، ماڵمان دەتوت شاییەو ژوورو سەربان و بەردەرگاو ماڵی براکانم پڕبوون لە خەڵکی دڵسۆزو خزمی بەسۆزی ئەم شارە، شایلۆغانی بەربوونیان لەگەڵ منداڵەکانمدا دەگێڕا، من نازانم چۆن و کەی بەچی؟ بتوانم چاکەی ئەو خەڵکە بدەمەوە؟ باوەڕ ناکەم و ناکەم بەهیچ رێگاو شێوەیەك بتوانم ئەو چاکەیەیان قەرەبووبکەمەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێم تامردن رێزو خۆشەویستیم بۆ هەریەکەیان دەبێت و بەراستیی سەلماندیان خەڵکی ئەم شارە خەڵکێکی بەئەمەك و بەوەفاو دڵسۆزی میللەت و تێکۆشەرانی گەلەکەیان خۆش دەوێت.

## دیاریی مەکتەبی سیاسیی

ئەوەی لەو رۆژە پرشکۆو خۆشییەدا دلخۆشتری کردم، ئەوەبوو کە لە مەلبەندەوە بانگیانکردم، کە چوومە مەلبەند سەیرمکرد هاوڕێکانیشم لە مەلبەندن. لەو بانگکردن و چوونەماندا. هەر یەکەمان دیارییەکیان داپێمان و وتیان ئەوە دیاریی (مەکتەبی سیاسییە) بۆی ناردوون... هەرهەمووممان بەدیارییەکە خۆشحالبووین کە گەڕامەوە بۆ مالەوە. (زەینەب)و مندالەکان پرسییان بۆچییان بانگکردن؟ وتم: مەکتەبی سیاسیی ئەم دیارییەی بۆ ناردبووین... کە (بەخشی) کردییەوە سەیری کرد سەعاتێکی دەستە... کەوتنە سەیرکردنی و بەخشی پێکەنی وتم: بۆ پێدەکەنیت؟ وتی: بابەگیان بەراست ئەمە دیاریی مەکتەبی سیاسییە؟ وتم: بەلێ، بۆ؟ وتی: ئەم سەعاتە لە بازار بەدەست دەستگێڕەکانەوەیەو لە سەعاتە عادییەکانەو بەنرخێکی هەرزان دەیفرۆشن... من رازی نیم بیکەیتە دەستت. ئەو سەعاتەی کە من بۆم ناردیت بۆ ئەبوغرێب و ئێستا لەدەستتدایە ئەوە سەعاتی (سویسری ئەسلە)و دە سەعاتی وادەهێنێت، خۆزگە وەرت نەگرتایە. وتم: گرنگ نییە مادام دیاریی مەکتەبی سیاسییە، بەلامەوە پیرۆزە من نایکەمە دەستم، ئەو سەعاتەم هەیە ئێوە یەکێکتان بیکەنە دەستتان. وتیان باوکە ئێمە سەعاتی وا ناکەینە دەستمان و من و ئازاد سەعاتی زۆر زۆر لەوە باشترمان لەدەستدایە. بەراستیی ئەو گەردەشەیە لەسەر ئەو دیارییە تووشی شۆکی کردم و تا رادەیەك نیگەران بووم، پێم خۆش نەبوو (مەکتەبی سیاسیی) دیارییەکمان بداتێ ببێتە جێگای رەخنەی مندالەکانمان. بەلکو دەبوو دیارییەك بووایە مندالەکانمانی دلخۆش بکردایە...

## قەڵاچوالان و دیداری هەڤاڵ مام جەلال

دوای (١٠) رۆژێك زیاتر لە ئازادبوونمان، ئاگاداریان کردم کە بچم بۆ قەڵاچوالان بۆ دیداری (هەڤاڵ مام جەلال). کە چووم سەیرمکرد برادەرەکانیشم لەوێن زۆرمان بەلاوە خۆشبوو، کە بۆ ئەو مەبەستە بانگیان کردووین، نیوەرۆخوانیان بۆ دروستکردبووین. (هەڤاڵ مام جەلال) لەوێ نەبوو. نانمان خواردو دوای نانخواردن (هەڤاڵ مام جەلال) هاتەوە. لەگەڵمان دانیشت و کۆبوونەوەیەکی لەگەڵدا کردین، وەکو بیرم بێت چەند هەڤاڵێکی دیکەی مەکتەبی سیاسیی و هەڤاڵێکی دیکەی لێبوو. (هەڤاڵ مام جەلال) وتی: ئێمە زۆر خۆشحاڵبووین بەئازادبوونتان لە زیندان، ئێوە شەهیدی زیندوون و مایەی سەربەرزین بۆ یەکێتییەکەتان و گەلەکەتان. ئێوە بەحەق تێکۆشەری لێهاتوون، توانیتان تاگرتنتان بەوپەڕی جوامێرییەوە ئەرك و کاری رێکخستنی نارشارەکان بە هوشیارییەوە جێبەجێ بکەن و هەڵبسووڕێنن، خەباتێکی ئێجگار سەختتان کرد، ئێوە بوونە هۆی گەڕانەوەو مانەوەی مەفرەزە پارتیزانەکانی پێشمەرگە لە ناوچە چۆڵ و ئەنفالکراوەکان، لە زیندانیش خۆڕاگرو جوامێرو بەهیمەت بوون و ئومێددەکەم بەئازادبوونتان ببنەوە بەو تێکۆشەرانەی جاران و گوڕژم و تین بەگەشەکردنی رێکخستن و کۆکردنەوەی جەماوەر بدەن لە دەوری یەکێتییەکەتان. روویکردە برادەران و وتی: ئەوە تەکەتوولی تازەی زیندانیی پەیدابوون، ئەمەی بەپێکەنین و گاڵتەوە دا بەرووی برادەراندا، قسەکەی وایگەیاند واتە ئێوەی تەکەتوولی سجن باوتان نەماو ئاگاداری خۆتان بن... پێی وتین لە نانخواردنەکەتاندا نەمتوانی لەگەڵتانابم. بەمنزیکانە میوانداریەکی باشتان بۆ دەکەم و دواجار کۆمەڵێك وێنەمان لەگەڵ بەرێزیدا گرت و دیدارەکەمان کۆتاییهات و تائێستاش لە چاوەڕوانی ئەو میوانداریەدابن. من ئەو دیدارەم زۆر لاخۆش و گرنگ و مێژوویی بوو، لەبەرئەوەی وا لە نزیکەوە لە ژیانمدا لەگەڵ (هەڤاڵ مام جەلال) دانەنیشتبووم و گوێم لە قسەکردنی نەبووبوو. یەکەمجار بوو لە ژیانمدا وا لە نزیکەوە بەدیداری شادبم، بۆیە لەبیرم ناچێتەوە.

## شەقلاوەو دەعوەتێکی (کاک نەوشیروان مستەفا)
## لە ئوتێل هەورامانی هەولێر

پاش ئەو دیدارەی (هەڤاڵ مام جەلال) بانگیانکردین بۆ شەقلاوە، ئەوکاتە (مەکتەبی سیاسیی) وەکو بزانم لە شەقلاوە بوو. لەراستیدا بیرم نەماوە ئەو بانگکردنەمان بۆچی مەبەستێك بوو؟ شەوێك لەوێ ماینەوە. زۆریش لە هاورێکانمان نەهاتبوون... رۆژی دوایی (کاك نەوشیروان مستەفا) پێی راگەیاندین، بۆ ئێوارە دەعوەتی بەرێزیانین لە (ئوتێل هەورامان) لە هەولێر... عەسر بەرەو هەولێر رۆیشتین و بۆ ئێوارە چووینە ئوتێلەکە. لە قاتی سەرەوە شوێنمان بۆ رێکخرابوو. لە شوێنەکە کۆبووینەوەو دانیشتین. کە (کاك نەوشیروان) هاتە سەرەوە، تەنها (کاك مستەفا چاورەشی) لەگەڵدا بوو... لەسەر قەنەفەیەك لەبەرامبەرمان دانیشتن. پێش شێوکردن سەبارەت بە بەندیخانەو خۆی هەندێك باسی بۆکردین، ئەویش بە شەهیدی زیندووی داناین و وتی: ئێوە ئەو تێکۆشەرانە بوون، کە دوای ئەنفال توانیتان جلەوی رێکخستنەکانی ناو شار بگرن و سەرپەرشتی مەفرەزە پارتیزانەکانی پێشمەرگەش بکەن. ئێوە ئەگەر خەباتکار نەبوونایەو تێکۆشانتان نەکردایە لەپێناوی میللەتەکەتاندا، رژێم نەیدەگرتن و تووشی ئەو هەموو زەحمەتی و نارەحەتییە نەدەبوون و (٥) هاورێشتان لێ ئیعدام نەدەکرا... ئێمە ئازادبوونی ئێوەمان زۆر زۆر مەبەست بوو، لە سەرەتای وتووێژەکەمانەوە لەگەڵ حکومەتدا زۆر لە هەوڵی ئەوەدابووین، کە بە هەرنرخێك بووە ئازادبکرێن و بێنەوە ناومان، لە راپەریندا جێگاتان دیاربوو لەناوماندا. دڵنیام بەگەرانەوەتان بۆ ناومان، سەنگ و پێگەی خۆتان بۆ یەکێتی و گەلەکەتان دەبێت. من بەو دیدارەی (هەڤاڵ نەوشیروان) زۆر دڵخۆشبووم، چونکە سێیەم جارم بوو لە نزیکەوە (کاك نەوشیروان) ببینم، جاری یەکەم لە بالیسان و جاری دووەم لە (ئاوەژێ) لەکاتی وتووێژەکەی (١٩٨٤)دا لەگەڵ چەند برادەرێکدا سەرمان لێداو بۆ ماوەی زیاتر لە دوو سەعاتێك لای ماینەوە، بارودۆخی ئەوکاتە جیاوازبوو لە بارودۆخی ئێستا، کە ئێمە لە زیندان ئازادکراوین و کوردستانیش جگە لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی و دهۆك) زۆر شارو شارۆچکەی دیکەشی ئازادکراون، خەریکی پێکەوەنانی (دەسەڵاتی خۆماڵیی کوردین)، بۆیە حەزم بە قسەکانی دەکردو تامەزرۆ بووم، کە ئاوا لە نزیکەوە بەوردیی گوێم لە قسەی بێت و پێشم خۆشبوو، کە ئەوەی لەگەڵیدایە (کاك مستەفا چاورەش)ی هاورێی دێرینمە...

(کاك نەوشیروان) دوای ئەو قسەکردنەی بانگی منی کرد، بچمە لایانەوە، لەنێوانی هەردووکیاندا لەسەر قەنەفەکە دانیشتم. هەردانیشتم، کەوتە باسکردنی بارودۆخی یەکێتی لە سەردەمی شاخ و پێشمەرگایەتی بەوردیی کێشەکانی ئەو سەردەمەو ئەو رۆژگارانەی باسکردو شیکردەوە، هاتە سەر ئێستاو ئایندەی (یەکێتی) پێی لەسەر ئەوە داگرت، کە دەبێت چی بکەین بۆئەوەی بتوانین لەم بارودۆخە نوێیەدا یەکێتی بەرەو پێش بەرین و خزمەتی

میللەتەکەمانی پێ بکەین؟ وتی: بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئێوە وەکو تێکۆشەری ناو ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شارەکان و زیندانیی ڕۆڵی بەرچاو و دیارتان دەبێت. باسەکەشی زیاتر لەسەر دەسەڵات و بەکارهێنانی دەسەڵات لەناو (سەرکردایەتی)و (مەکتەبی سیاسیی یەکێتی) دا چڕکردەوە. وتی: ئێمە لەمەودوا دەبێت لە مەسەلەی دەسەڵاتدا هەوڵبدەین دەسەڵاتی (هەڤاڵ مام جەلال) دیاریی بکرێت و دەسەڵاتی سنووورداری هەبێت. ئەگەر وا نەکەین وەکو سەردەمی شاخمان لێدێت و هیچمان پێناکرێت. پێی لەسەر ئەوە داگرت و وتی: ئەگەر (مام جەلال) خاوەنی هەموو دەسەڵاتێك بێت لەناو یەکێتیدا، ناتوانین هیچ بکەین. ئێوەش وەکو ڕێکخستنی نهێنی ناو شارەکان و تێکۆشەری زیندان دەبێت ڕۆڵی باشتان لەم بوارەدا هەبێت، ئێوەو کادیرە تێکۆشەرەکانی دیکەمان دەتوانن فشار بۆسەر (مام جەلال) دروستبکەن، کە ڕێگا نەدرێت ئەو خاوەنی هەموو دەسەڵاتەکان بێت. (مام جەلال) دەبێت بەپێی ئەو دەسەڵاتانە کاربکات کە بۆی دادەنرێت. وتی: بارودۆخی پێشمەرگایەتی و شاخ تەواو بوو، ئێستا دۆخی ئازادیی و دروستکردنی دەسەڵاتی خۆماڵیی کوردییە، حزب و لایەنی زۆر پەیدابوون و هاتوونەتە ناوەوە، پارتیش لەوێ بوەستێت، کە هاتووەتە سەر حازریی. ئەگەر هەرهەمووومان بە سەرکردایەتیشەوە بەوریایی و بەرنامەیەکی چڕوپڕ کارەکانمان ڕێك نەخەین، دۆخەکە بەزیانی یەکێتی و گەلەکەمان دەشکێتەوە. چەندجار دووبارەو سێ بارەی کردەوە، کە دەبێت دەسەڵاتی (مام جەلال) سنووردار بکرێت و کەمبکرێتەوە، نەهێڵین هەرچی ویستی بیکات و ئاگاداری مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی و کادیرانی پێشکەوتوو نەکات، چونکە بارودۆخی لەمەودوا لەرووی ناوەوەو دەرەوەو بوارەکانی سیاسیی، ئابووریی. بازرگانیی، دبلوماسی، ئیداریی، سەربازیی، پەرلەمانی و حکومەتییەوە پێویستی بەڕای کۆمەڵ هەیە. بەوردیی گوێم بۆ قسەکانی شلکرد یەکەمجار بوو، ئاوا لە نزیکەوەو بەو شێوەیە من کاك نەوشیروان ببینم و قسەم بۆ بکات. قسەکانی وا دەکرد باوەڕناکەم لە هاوڕێیانمان کەسێکیان گوێیان لە قسەکانی بووبێت، وتی: بۆیە ئەم قسانەم بۆتۆ کرد، تۆ تێکۆشەرێکی کامڵ و مامۆستایەکی خاوەن ئەزموونیت، دەتوانیت لەگەڵ برادەرەکانتدا قسە بکەیت، ئەم شتانەیان بۆ ڕوونبکەیتەوە... کە لە قسەکانی بوودەوە، وتم: بەتەواویی لە قسەکانت و مەبەستەکەت گەیشتم...، من لەکاتی ئیشکردنی نهێنی ناوشاردا، وام دانابوو بەڕێزتان دوای (مام جەلال) کەسی دووەم بیت و سکرتێری کۆمەڵە بیت و مام جەلال بەبێ تۆ هیچ کارو بڕیارێك نادات، کە دەستگیرکراین و چووینە ئەبوغرێب شەو و ڕۆژ گۆرانیمان بۆ ئێوە دەچڕی و ئاواتەخوازبووین، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە دیداری (هەڤاڵ مام جەلال و بەڕێزتان) شادبین، ڕۆژێك زووتر بگەینەوە ناوتان، بەشداریی خەبات و کاری نوێی ڕێکخستن بکەین، بۆ پێشکەوتنی گەل و نیشتمانەکەمان، بە ئەندازەی هەموو دنیا دڵمان پێتان خۆشبوو، بەڵام لەم باسەی بەڕێزتدا ئەوە تێگەیشتم، کە ئێوە لەناو سەرکردایەتی و بەتایبەتی لەگەڵ (هەڤاڵ مام جەلال)، کۆك نەبن لەگەڵ یەکدا ڕێك و تەبا نەبن و ساردیی

لەنێوانتاندا هەبێت، من ئاگاداری ئەو کێشەو ناکۆکیی و ململانێیەی شاختان نیم و من لە زیندانەوە بەرنامەم بۆ لە ئێستا بەدواوە لە مێشکمدا دارشتووە، بەڵام بەپێی قسەکانی بەرێزتان بێت، ئێمە ناتوانین ئەو بەرنامەیەی دامانرشتووە لە ئایندەدا جێبەجێی بکەین.
وتی: نا... نا وا نییە بەپێچەوانەوە، ئەگەر بەو شێوەیەی باسمکرد کاربکەن، دەتوانن ئێوە لەدوارۆژدا هەموو شت بەدڵی ئێوە بێت، ئێوە کاربکەن و هاوکارو پشتیوانیمان بن، سنووری دەسەڵات بۆ (مام جەلال)و هەریەکەمان دابنرێت و نەهێڵن هەریەکەمان بۆ خۆمان دەسەڵات بەئارەزووی خۆمان بەکاربهێنین، ئەوە رەوتی یەکێتی بەرەو پێش دەروات، خۆشمان و گەلەکەشمان لێی سوودمەند دەبین. من لەو دانیشتنەدا ئەوەم بۆ روونبووەوە، کە ململانێیەکی توند لەنێوان (کاک نەوشیروان و هەڤاڵ مام جەلال)دا هەیە، کار بۆ ئەوە دەکات دەسەڵاتەکانی (هەڤاڵ مام جەلال) سنووردار بکرێت...

# کۆبوونەوەیەکی فراوان و زیندەبەچاڵکردنی کۆمەڵە

لە مانگی (١/١٩٩٢)دا، ئاگادارکراین بچین بۆ هەولێر بۆئەوەی بەشداریی کۆبوونەوەیەکی فراوان بکەین. دیاربوو کۆبوونەوەکە تایبەت بە هاوڕێیانی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) بوو، من لەگەڵ هەڤاڵان (کاک حەمەرەشیدو کاک حەمەنووریدا) بەیەکەوە چووین بۆ هەولێرو لە یەك ئوتێل دابەزین و ئوتێلەکە وەکو بیرم بێت (ئوتێل زەیتوون) بوو. رۆژی دوایی بەیانییەکەی کاتژمێر (١٠)ی بەیانی هەر هەموو لە (هۆلی میدیا) کۆبووینەوە... دوای هێوربوونەوەی هۆلەکەو هاتنی برادەرانی سەرکردایەتی و هەڤاڵان (نەوشیروان مستەفا، عومەری سەید عەلی، فەرەیدوون عەبدولقادر، عومەر فەتاح، مولازم عومەر، حەمە تۆفیق و ئەوانی تر...)، کۆبوونەوەکە بە دەقیقەیەك وەستان بۆ گیانی شەهیدان دەستپێکرد.

کاك نەوشیروان وەکو سکرتێری کۆمەڵە قسەی لەسەر کۆمەڵەو بارودۆخی سەردەمی دروستبوونی کۆمەڵەو رۆڵی کۆمەڵە لە دامەزراندنی (ی.ن.ك)و هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ و خەباتی شاخ و پێشمەرگایەتی و نەبەردییەکانی هاوڕێیانی کۆمەڵەو ئاماژەی بە شەهیدە سەرکردەکانی، کە لەپێناوی ئەو رێبازەدا گیانیان بەخشیوە، کرد. دواجار هاتە سەر بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان و (ی.ن.ك)و سەردەمی شاخ و سەردەمی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی دامودەزگاکان و جەماوەری راپەڕیوی کوردستان کردو زۆر لەو بارەیەوە قسەی کرد، ئەوەی روونکردەوە، کە لە بارودۆخێکی وادا کۆمەڵەو مانەوەی کۆمەڵە رۆڵی نامێنێت، وتی: ئێمە لەپێش راپەڕین لە ئێرانەوە بیرمان لەوە کردووەتەوە، کارمان بۆکردووە، بە چاکمان زانیوە، کە کۆمەڵەو هیچ باڵێکی دیکە لەناو (ی.ن.ك) نەمێنێت و (یەکێتی) وەکو (رێکخراوێکی سیاسیی) بمێنێتەوە. بۆیە ئێوەشمان کۆکردووەتەوە، بۆئەوەی لەم کۆبوونەوە فراوانەدا دوای وەرگرتنی راو بۆچوونەکانتان بڕیاری ئەوە بدەین کە کۆمەڵە هەڵوەشێتەوە، هەرهەموومان لەژێر چەتری (یەکێتی)دا کاربکەین. وەکو بێتەوە یادم زۆر لەوبارەیەوە وتوویژو قسە کرا، بەڵام بڕیارەکە درابوو. هەر موناقەشەیەك بکرایە، وەڵامی دەسەویەخەی بۆ ئامادەکرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا، ژمارەیەکی زۆر لە هەڤاڵانی رێکخستنەکانی ناو شار بەو هەواڵ و راگەیاندنە نیگەران بووین و بەلامانەوە کارێکی گونجاو نەبوو، کە دوای راپەڕین وا بەپەلە کۆمەڵە هەڵوەشێنرێتەوە، لەراستیدا ئەو راگەیاندنەمان بەلاوە نامۆ بوو...

بەڵا، لەگەڵ هەموو موناقەشەو قسەکردنێکدا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەو زیندەبەچاڵکردنی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) دراو بەبێ سێبەری کۆمەڵەو بەدڵشکاویی هۆڵەکەمان بەجێهێڵاو گەراینەوە بۆ شارو شوێنەکانمان.

# یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك)و ڕێگرتنمان لە بەشداریی کۆنگرە

دوای کۆبوونەوەی فراوانی کادیرانی کۆمەڵە بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، دەست بە خۆئامادەکردن کرا بۆ یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك)... لە مانگی (٢) کۆنگرە لە شاری سلێمانی دەستیپێکرد... کاتێك ئەندامانی بەشداری کۆنگرە دیاریکران، سەیرمان کرد من و چەند هاوڕێیەکی زیندانیمان لە ئەندامێتی کۆنگرە بێبەشکراوین و ناومان نییە. ئەوەی بیرم بێت ئەم کەسانە بووین (مامۆستا ئەحمەد ساڵح، مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد. حەمە تایەری شێخ مەحمود، مامۆستا مەلا محەمەدی مەلاحسێن و بەندە).

ڕۆژی دەستپێکردنی کۆنگرە، کە لە (هۆڵی ڕۆشنبیریی سلێمانی) بوو، چووینە هۆڵەکە، ئەوانەی لیژنەی سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی کۆنگرە بوون، لە هۆڵەکە بوون، لێمان پرسین بۆ ئێمە نەکراوینەتە ئەندامی کۆنگرە؟ لەوە تێگەیشتین کە چەند کەسێك لەو کارە بەرپرسیارن. وەکو تێگەیشتین یەکێك لەوانە (کاك خالد ڕەزا) بوو. چووینە هۆڵی کۆنگرەو لێمان پرسی، قسەی ڕاستی نەدا بەدەستمانەوە، کەوتە پاساوهێنانەوە کە گوایە ئەو ئاگادارنییە، وتی: ئەندامانی کۆنگرە بە هەڵبژاردن هاتوونەتە کۆنگرە، پێی وتین، دەبوو ئێوەش لە چەند شوێنێك خۆتان هەڵبژاردایە تا ببوونایەتە ئەندامی کۆنگرە. ئێمە دەمانزانی ئەو قسەیە وا نییە، هەشە وەکو ئێمەیەو نەچووەتە پرۆسەی هەڵبژاردنیشەوەو کراوەتە ئەندامی کۆنگرە... زۆر تووڕەبووم لە تووڕەبییەکەمدا ئاگام لەخۆم نەماو یەخەم گرت پێم وت: دیارە ئێوە بڕیاردەری کۆنگرەن، پێم وت: ئێستا باجی ئەندامێتی کۆنگرەمان بۆ نەکرێت، ئەم کۆنگرەیە دەشێوێنم و چیم لێدەکەن بیکەن. (مامۆستا ئەحمەد) باڵی گرتم و لە کاك خالید دووری خستمەوەو وتی: لەسەرخۆبە بەوشێوەیە نا... وتم: بۆ بەم شێوەیە نا؟ من لەم هۆڵە ناچمەدەرەوە تا باجی ئەندامێتیمان نەدەنە دەست. چی دەبێت با ببێت. بەڵێ، دوای ئەو تووڕەبوون و قرەیە پێش ئەوەی کارەکانی کۆنگرە دەستپێبکات، باجی بەشداربوونیان بۆ هێناین، چووینە کۆنگرەوە. لەسەر کورسییەکانی ناو هۆڵەکە جێگامان نەبووەوە، ناچار چووینە سەر شانۆکە. کۆنگرە دەستیپێکردو لەکاتی قسەکردنی هەڵسووڕێنەری کۆنگرەدا، کاتێکمانزانی لەبەردەمماندا (کاك عومەر دەبابە) بێهۆش کەوت و گیانی لەدەست دا، بەو هۆیەوە کارەکانی کۆنگرە ڕاگیرا. بۆ دەسپێکردنەوەی کۆنگرە، کۆنگرە لە سلێمانییەوە گوێزرایەوە بۆ هەولێر بۆ هۆڵی میدیا. من لەگەڵ کاك حەمەڕەشیدو کاك حەمەنووریدا بووم، چووینە (ئوتێل زەیتوونە) کە بەرامبەری هۆڵەکەبوو. کارەکانی کۆنگرە دەستیپێکردەوەو چەند لیژنەیەك بۆ کارەکانی کۆنگرە پێکهێنران، من چوومە لیژنەی پێڕەوی ناوخۆ لەگەڵ (کاك ئەحمەد مەولوود)دا، کە سەرۆکی لیژنەکە بوو.

لە کۆنگرەدا کێشە لەنێوان (هەڤاڵ مام جەلال)و (هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا)دا چڕبووەوە، بووەهۆی درێژبوونەوەی ڕۆژانی کۆنگرە، درێژبوونەوەکە بەشێوەیەك بوو، هەموو ئەندامانی

کۆنگرە بێتاقەت و وەڕس بووبوون. ڕۆژێ لەگەڵ (کاک حەمەڕەشیدو کاک عوسمانی حاجی مەحمودو کاک حەمەنووری)دا کۆبووینەوە، بڕیارمان دا کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و کۆتاییهێنان بە کۆنگرە، سەردانی هەردوو بەڕێزان (هەڤاڵ مام جەلال و هەڤاڵ نەوشیروان) بکەین... چوارقۆڵیی سەردانی (هەڤاڵ مام جەلال)مان کرد، ئەوەی مەبەستمان بوو پێمان وت... لە وەڵامدا بەڕێزی وتی: ئێوە چیتان پێباشەو لە بەرژەوەندیی کۆنگرەو یەکێتییە، منیش لەگەڵتانم و کاغەزی سپیتان بۆ ئیمزا دەکەم و بچن بۆلای (کاکە نەوەش)و زۆرم پێخۆشە قسەی لەگەڵدا بکرێت... دوای سەردانەکەی (هەڤاڵ مام جەلال) چووین بۆلای (کاک نەوشیروان)و لەگەڵ ئەویشدا ئەوەی بەرنامەمان بۆدانابوو پێمان وت و قسەمان لەگەڵدا کرد، سەرەتا کاک حەمەڕەشیدو دواجار کاک حەمەنووری و دوایی من و قسەمان کرد. بەباشی و بەوردیی گوێی لە هەرسێکمان گرت و قسەکانمانی پێ قبووڵ بوو وەسفی هەریەکەمانی بەجیا کرد.

(کاک عوسمانیش) ویستی بەدوای ئێمەدا قسە بکات و ڕای خۆی سەبارەت بە دۆخەکە دەربڕێت. هەر کەوتە قسەکردن کاک نەوشیروان بەتووندیی چوو بەگژیداو لێی تووڕەبوو. قسەکانی پێ بڕی و بەڕەقیی وەڵامیدایەوەو ڕازی نەبوو قسە بکات. کاک عوسمان ڕەنگێکی هێناو برد، تەنها ئەوەندەی وت: کاک نەوشیروان بۆ بۆم نییە قسە بکەم؟ ڕای خۆم بڵێم؟ ئەندامی کۆنگرەو یەکێتی نیم؟ وتی: هەرچی بیت، بەڵێ، بۆت نییەو چەند شتی تریشی بەڕوودا دا، ئیتر کاک عوسمان بێدەنگ بوو. ئێمە بەو بەگژاچوونەوەیەی (کاک نەوشیروان) واقمان وڕماو بەلامانەوە سەیربوو. کە بۆ وا بەگژیا چوو...؟ کاک حەمەڕەشید ڕانەوەستاو یەکسەر هەڵیدایەو وتی: (کاک نەوشیروان) بۆ وا ڕەقی لەگەڵ کاک عوسماندا؟ کاک عوسمان پێشمەرگەیەکی پارتیزان و کادیرێکی پێشمەرگەی لێهاتووەو پیاوێکی بەهیمەت و بەتواناو ئازایە، لەگەڵ ئێمەدایەو هاوڕێمانەو حەقی خۆیەتی ئەویش وەکو ئێمە لەڕاو بۆچوونەکاندا بەشداریی بکات، بەدوایدا، کاک حەمەنووری و تا بەهەرسێکمان وامانکرد ئەو گرژییە خاو بکەینەوە، دۆخە ئاڵۆزەکە هێور بکەینەوە. لە ئەنجامدا ڕاو بۆچوون و قسەکانمان و بۆچوونەکانمان پێدەچوو کاریگەریی خۆی هەبووبێت، چونکە بەدوایدا کۆنگرە کە کارەکانی ڕاوەستابوو. کەوتەوە کارکردن و بە دوو ڕۆژ هەموو کارەکانی کۆنگرە کۆتاییان هات... یەکێتی هیچ باڵێکی تێدا نەما، بوو بە (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)و سەرکردایەتی نوێ هەڵبژێردراو ئەوەی من بەلامەوە زۆر ناخۆشبوو، ئەوەبوو لەسەرەتای کۆنگرەدا (کاک مولازم عومەری حاجی عەبدوڵڵا) ڕازی هێناو کۆنگرەی بەجێهێشت، چونکە بەڕاستیی هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستم بوو، پیاوێکی بەهیمەت، ئازاو، بەتوانا، بەوەفا، خاوەن جەماوەر، کەسایەتییەکی سیاسیی، پێشمەرگایەتی و کۆمەڵایەتی و عەسکەریی بوو، لەناو کادیران و جەماوەری خەڵکی کوردستان و هێزی پێشمەرگەدا زۆر خۆشەویست بوو. بۆیە ئەو سەردەمەی (ی.ن.ک) زۆر پێویست و گرنگ بوو.

# زیندان و بیرەوەریی نەورۆزو نەورۆزی ئەمساڵ

سەرەتای ساڵی نەوەدو گەرمەی تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ بوو... سەرقاڵی تاقیکردنەوە لەلایەك و خەم و نیگەرانیی ئەو بارودۆخەی لەکۆتایی ساڵی پێشوودا بەرەو روومان بووبووەوە، لەلایەکی ترەوە، جموجووڵ و چالاکی رێکخراوەییمان وەستابوو، چەند هاورێیەکمان لە دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم تووندکرابوون، هەواڵ و زانیاریی تەواومان لەسەریان نەبوو...

دەمێ بوو چاوەروانی ئەنفالی ناوشارمان دەکرد، بەڵام نەمان دەزانی کەی و چۆن دەستپێدەکات؟ زۆرجار بەهۆی چەند بیانوویەکەوە زۆر گەرەك و ئۆردووگاو ماڵانیان دەپشکنی... هیچ سەری گلۆڵەیەکیان چنگ نەدەکەوت... ئێمە کارو ئەرکەکانی سەرشانمان زۆر بەهێمنی و ریخۆڵەکێشی ئەنجام دەدا. هۆی گرتنی چەند هاورێیەکمان تا رادەیەك دەزانی، بەڵام هاورێشمان بوون درکمان پێ نەدەکردن. خۆمان خۆمان سووك بارکردبوو، ئێوارە بوو، کاتژمێر سێ و نیوی رۆژێکی شووم و ناخۆش بوو، تاقیکردنەوەی بەشی یەکەم تەواو بوو، بەشی دووەم لە ژوورەوە بوون و پرسیارەکانیان بەسەردا دابەشکرابوو، قوتابخانە ورتەی لێوە نەدەهات، تەنها یەك مامۆستا نەبێت بەدەنگی بەرز پرسیارەکانی دەخوێندەوە... لەژووری ئیدارە خەریکی رێکخستنی پرسیاری رۆژی دوایی بووم، کاتێکمزانی... دووجەندرمە، لەشێوەی دوو هەوشاری برسیدا خۆیان بەژووردا کرد، لەگەڵ پرسیاردا ئەملاو ئەولایان گرتم، هێشتا لە ژوورەکە پێم نەچوو بووە رارەوەکە، هەریەکەیان دەستێکیان گرتم و بەرەو دەرگای دەرەوە راپێچیانکردم، هەر ئەوەندەی بلێی یەك و دوو فرێیان دامە ناو ئوتۆمبیلێکی بەرازیلی سوورەوە... دەمانچەیان لەسەر سەرم دانا، کاتێکمزانی فرێیان دامە ژوورێکی بچووکی ساردەوە. ژوور چی، ژووری ریشەکێشکردنی مرۆڤ. چاوم بەناو ژوورەکەدا وردکردەوە. دوو سەتڵ و دو قووتووی بچووکی ماست و یەك بەتانی و سەموونێکی رەق و دوو سێ دەنك خورمای کرمێ. چەند پوولی دۆمینەی لەناوی سەموون دروستکراو. جگە لە کۆکەی یاساولێك تاماوەیەکی زۆر شوێنێکی کپ و ساردبوو، پاش چەند کاتژمێرێك زرەی زنجیرو هەڵگرتنی دەرگا جموجوولێکی نائاسایی دروستکرد. کاتێکمزانی دەرگا ئاسنینەکەیان لێ کردمەوە، تێیان خوریم وەرە دەرێ. هەر لە ژوورەوە چرومە دەرەوە بە پەرۆیەکی رەش تووند هەردوو چاویان بەستمەوەو کەلەپچەیان کردە دەستم. ئەو شەوە چییان کرد، کردیان (دیارە خەڵکی کوردستان خۆیان بەچاوی خۆیان فیلم و شێوەی ئەشکەنجەکانی ئەو دامودەزگا توانبارانەیان بەهۆی راپەرینەوە بینیوە).

دوای چەند رۆژێك مانەوەم لە ژووری ئینفرادیی کە تەواو بێلەزەتیان کردبووم، شەوێك دوای هەڵواسین و کارەبا لێدان. فرێیان دامە ناو ژوورێکەوە، تەندروستیم باش

نەبوو یاساوڵەکە گوێم لێبوو وتی: ئاوی مەدەنیّ و وەرزشی پیّ بکەن و خڕ دەرگاکەی داخستەوە. پەلاماریاندام و کەوتنە شێلانم. خەڵکینە مرۆڤ گەورەیە (بەو واتایە نا ئەوانەی بەناو مرۆڤن و ڕەفتارەکانیان دڕندەئاسایە)... لەو شوێنەدا چەند خۆشە لەناو چاو و ناخی دەستگایەکی تاواندا مرۆڤ ئەوەندە نەترس و ئەوەندە دڵسۆزبێت بۆ یەکتری و بەپیرەوەهاتن و دلدانەوەو قسەکردن، ئازارو ئەشکەنجەت بیرباتەوە... سەیربوو، ئەو هاوڕێیانەی ئێمە لە دەرەوە پەژارەیانمان بوو، وای بۆ دەچووین کە لەناوبراین و نەمابن، لەو ژوورەدا لەکاتی شێلانمدا خۆیان پێناساندم، بەبینینی ئەوان خەمێکی چەند مانگەم سارێژبوو، چونکە ئێمە باوەڕمان بەوە بوو، کە پیاو لەژێر دەستی ئەو پیاکوژانەدا نەکوژرێت هەر ڕۆژێك دێت ڕزگاری بێت. شەو و ڕۆژ لەو ژوورەدا وەکو یەك بوو، ترووسکەیەکی گلۆپێکی سەدی و دەنگی هەواکێشێکی بچووك نەبێت، هیچ ڕووناکی و ڕۆشنایی دیکە نەبوو. ژوورێکی بچووك بیستوپێنج هاوڕێی تێئاخنرابوو، لەسەر شان و بەحاڵە حاڵ جێمان دەبووەوە، بەردەوام زرەی زنجیری کلیل نیشانەی بانگکردن و ئەشکەنجەدان بوو... نەورۆزی ئەو ساڵەمان لەو ژوورەدا لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەدا یادکردەوە، ئەوانەی لەگەڵمان بوون هەیانە لەناوبراوە، هەیانە هێشتا لە زینداندایە، هەیانە وەکو خۆم ڕزگاری بووەو ئێستا لە ئاو و هەوای ئازادیدا دەژی...

لەو ژوورەدا لەناو ناخی دوژمندا سەرمان بەیەکدا دەکرد، بیرو بۆچوونەکانمان لێکۆڵینەوەمان لەسەر دەکردو پاشەڕۆژمان گەشبینانە هەڵدەسەنگاند. پیرۆزبایی نەورۆزمان لەیەك دەکرد، ئازارو ئەشکەنجەکانی ئەو دڕندانە ڕقی ئەستوورتر دەکردین، گیانی دەکردینە پۆڵا. بڕوامان دەکردە گوللەو ناخی ئەو جەللادانەی دەپێکا. چەند ئەوان توندوتیژتر دەبوون، ئێمە چەندان ڕقگیرترو باوەڕ ئەستوورتر دەبووین، نەورۆزی ئەو ساڵەمان لەنێوانی ژووری ئەشکەنجەو ئینفرادیی و ژووری ژمارە (٢)دا، لەگەڵ زرەی زنجیر، لێدانی کارەبا، هەڵواسین، کێبڵ، جنێو، شەق و شەقازلەدا، بەسەربردو ئەو یادو بیرەوەرییانە لەبیر ناچنەوە.

بەهاری پار، لەناو چواردیواری ژوورێك و چەندین دیواری دیکەی بەدەورداکراوی ئەو ژوورەدا لە پشتی چەند دەرگایەکی داخراوی زیندانی ئەبوغرێبی ڕژێمدا، چاوە چاوی پرشنگی ئازادیی و سەرفرازیمان دەکرد. خۆش ئەوەبوو، چۆن لە یەکەم مانگی ساڵی ڕابردوودا دەستگیرکرام لە کۆتایی ساڵی پاردا دوو هاوڕیّ هاتن بۆلام، سەرجەمی نەخشەی ڕاپەڕین و خۆسازدانیان بۆ هێرش و پەلاماردانی ڕژێمیان بەدوورو درێژیی بۆ باسکردم و دلخۆشیان کردم، کە هاکا دەنگی ئازادیی ئێمەی دەربازکرد. مانگی (١)ی پار مانگێکە لە مێژووی گەلی عێراق و گەلی کوردو گەلانی جیهاندا تۆمارکراوە، هەرگیز لەیاد ناکرێت، چونکە بوو بەهۆی دۆزینەوەی سەری گلۆلەی گۆڕانکاریی و لەگۆخستنی ڕژێمێکی خوێنڕێژی مرۆڤکوژی دژبەگەل. سەرەتای خۆسازدان بوو، بەلیّ،

لەو مانگەوە خەمەکان خربوونەوە، رقەئەستوورەکان کەوتنە هەناسەدان و ئاواتەکانمان کەوتنە سەرەتاتکێ، لە بەهاری شکۆ، بەهاری شالاو و هێرش و راپەرین، بەهاری تەقینەوەی رق و قینی هەڵەبجەی شەهیدو ئەنفالی شورمی گەرمیان، دەیان گۆری بەکۆمەڵ و مەرگی گوللەبارانکردنی دەیان رۆڵەی جوانەمەرگ، راگواستن و تەقاندنەوەو تەختکردنی سەرجەمی گوندەکانی کوردستان و شارو شارۆچکەی جوان و رەنگین، گەورە بوون بە بەهاری پاکۆدان و هەڵکەندنی هەموو بنکەو داموەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمی داگیرکەرو بوو بە بەهاری ریشەکێشکردنی رەگ و ریشەی هەموو گەراو تۆوێکی چێنراوی چەند ساڵەی بەعسی دژبەگەل و خاکی کوردستان،

بەهاری پار سەرفرازیی و رزگارکردنی شاری کەرکوکی داگیرکراوبوو. کەرکوکی تەعریب و تەبعیسکراو، کەرکوکی لەسێدارەدراو لەگۆخراو... کەرکوکی قین و رق، بۆیە هەر لەگەڵ دەنگی هاواری کورگەلی بیست بەرزەپێ راپەری و خۆی کۆکردەوە، وەکو چۆن ئەوان بۆمبای کیمیاییان بەسەر هەڵەبجە دارشت و شەهیدیانکرد. ئەوانیش هەروەکو بۆمبێکی تەوقیتکراو بەرووی رژێمدا تەقییەوەو باوەشی بۆ هەزاران رۆڵەی گەلەکەی گرتەوە لە هەردوو بەری خاسە پێیان چەقاندو بریاریان دا، دەبێت خاسە ئاوی بەهاری، خوێنی پیاوانی رژێم و تاوانباران بێت، دەبێت خاسە بە کەللەسەری فاشستەکان پڕ بکرێتەوە... دەمێ ساڵ بوو، کەرکوك چاوی بریبووە رۆڵە چاوگەش و قارەمانەکانی کە بێن و باوەشی پێدا بکەن و ببنە شەواری پۆلایین و لە چنگی داگیرکەر رزگاری بکەن. بەڵێ، دەمێ ساڵ بوو، هەزاران هەزار رۆڵەی دلێری چاوگەش و بیرروناك چاویان بریبووە کەرکوکی دێرین و شادەماری گەلی کورد، دەیانویست بەخوێنی خۆیان باوەش بە کەرکوکدا بکەن، لەژێر چەکمەی داگیرکەران رزگاری بکەن. دەمێ ساڵ بوو، بەوهیوایە دەورو گڕی کەرکوکیان دەدا... (مامەریشە) بریاری وابوو کە لەسەر چیای حەمرین لافیتەیەك داکوتێ و بلێت: (قەدەغەیە کەرکوك بەعسی تیابمێنێت و بەعسی تێبێت... کەرکوك کوردستانە... کوردستان ئەمە سنوورمانە)، چەند ساڵ بوو کەرکوکیش دەویست لە گەورەترین گۆرەپانیدا پەیکەری مامەریشە دروست بکات، لەژێر پەیکەرەکەیدا بنووسرێت (تف و نەفرەت لەو بنکەو شوێن و کەسەی نەخشەی پیلانی نامەردانەی بۆ شەهیدکردنی مامەریشە دانا...). نەورۆزی پار نەورۆزی سەرفرازیی و جەژنی راستیی سەرکەوتن بوو. نەورۆزی وا لە مێژووی گەلەکەماندا هاوتای نییەو نەبووە، ئای چەند دڵخۆش بووین، کاتێك هەواڵی راپەرینەکان و سەرکەوتنەکانمان بیست، ئای چەندێ شادبووین کە بیستمان کەرکوك و خانەقین رزگارکراوە. ئەوەندە شادو دڵخۆش بووین، سەرجەمی زیندانییە عەرەبەکان هەستیان دەکرد کە ئێمە لە چ خۆشیی و کامەرانییەکداین، ئەوەندە دڵتەنگ بوون بەشادیی ئێمە، هەر ئەوەندەیان مابوو لەو بەندیخانەیەدا هەریەکەیان لە شوێنی خۆیان خەریك بوون دەتەقین و بەدەستیان بوایە

یەکەیەکەو بە کۆمەڵ لەناویان دەبردین... بەڵێ، نەورۆزی پێرارو بەهارو نەورۆزی پار، لام دوو بیرەوەرین هەرگیز لەیادم دەرناچێت و هەموو ساڵێك بەشانازییەوە یادیان دەکەمەوەو شتیان لەسەر دەنووسم. ئەمساڵیش لەماڵی خۆم لەناو منداڵی خۆمدا، لە کوردستانێکی ئازادو سەرفرازدا، کە لەناو جەماوەری گەلە ستەمدیدەو زامدارەکەمدا بەئازادیی یادی نەورۆزو یادی سەرکەوتنەکان و راپەرینەکان دەکەینەوە، کارو گفتمان بۆ دوارۆژێکی رووناك و رزگارکردنەوەی کەرکوك و خانەقینە. لە بەهاری بیرەوەریی نەورۆزی یەکگرتن و تەبایی ریزەکانی گەل و بەرەو هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و بەگەرخستنەوەی یاساو ئیدارەو بەڕێوەبردنی کارەکانمان هەنگاو دەنێین. دەبێت نەورۆزی ئەمساڵ بکەینە نەورۆزی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و سڕینەوەی شوێنەواری بەعس و دامەزراندنی دامودەزگا ئیدارییەکانی کوردستان... نەورۆز... نەورۆز... نەورۆزتان پیرۆز.

سلێمانی
نەورۆزی ١٩٩٢

# دایکم و زەینەب و منداڵەکانیشم، مافیان بەسەرمەوەیە

## دایکم[1]



دایك ئەو مرۆڤە مەزنەیە کە نۆ مانگ و نۆ رۆژ هەر کۆرپەیەکی بە چەرمی سکی خۆی هەڵدەگرێت، بە ژانێکی منداڵبوونەوە مرۆڤێك پێشکەشی کۆمەڵگاکەی و مرۆڤایەتی دەکات... زۆر نووسەرو زاناو رووناکبیرو تەنانەت پەیامبەرەکانیش، سەبارەت بە شوێن و پێگەی دایك لەناو کۆمەڵدا، وتەی گونجاو و شایستەیان وتووە.

دایك مرۆڤێکە پێگەی لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا وەکو شەوقی مانگ لە دەریایەکی رۆشندا شەوق دەداتەوە.

دایك ئاوێنەیەکی باڵانمای بێگەردە لەناو کۆمەڵگاداو مرۆڤ نییە خۆی بە جوانیی و قەشەنگی تیدا نەبینێت.

دایك کاریزیکی چاوقرژاڵی ساردو فێنکە هەموو مرۆڤێك ئاواتی ئەوەیە مژی پێوە بنێت و تینی لێبخواتەوە.

دایك بەفراوێکی کوێستانییەو سەیرکردن و خواردنەوەی دڵ و دەروون فێنك و هێور دەکاتەوە.

دایك فریشتەیەکی خواییەو هیچ فریشتەیەك ناگاتە هاوشانی.

دایك لێزمەبارانێکی بەهارییە هەر مرۆڤێك شەلاڵ بکات ئەگەر نەخۆشیش بێت چاکی دەکاتەوە.

دایك گەوهەرێکی ئێجگار بەنرخە کەس ناتوانێت بە پارە بیکڕێت... بەڵای منەوە دایك لەمانەو ئەمانە، زۆر زۆرتریشە.

(ناپلیۆن) ناهەقی نەبووە بۆ مەزنیی دایك وتوویەتی: (دایك بەدەستی چەپی بێشکە رادەژەنێ و بەدەستی راستی جیهان...).

بەڵێ، دایك ئەو مرۆڤەیە کە شەو و رۆژ لە خەمی کۆرپەکەیدایەو بەسۆزانە شەونخوونیی

---

١-دایکم لە شەوی (١٤-٢/١٥/٢٠٠٠) دوای ملـملانێیەکی دوورو درێژ لەگەڵ نەخۆشیدا، لەماڵی خۆمان کۆچی دوایی کرد.

بەدیارییەوە دەکات و لیی وەڕس نابێت. لە شیری مەمکەکانی ڕەزیلی ناکات و لە ئامێزگرتنی بە ئەرکێکی مرۆڤایەتی دەزانێت.

بۆیە (شکسپیری) مەزن وتوویەتی: (لەجیهاندا سەرینێك نییە لە ئامێزی دایك نەرمتر...).

بەراستیی دایك ئەوەندە مرۆڤێکی لە لوتکەدایە، چەند سەیری بکەیت، ناتوانیت سەری لوتکەکەی ببینیت، بۆیە (ماری هۆپکینز) دەڵێت: (دایکایەتی، مەزنترین دیاریی خودایە بۆ ژیان...).

دایك لەناو گەلانی جیهان و کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا خاوەن ڕێزو گەورەیی و پایەیە، بۆیە (رووسەکان) لە پەندەکانیاندا وتوویانە: (دایك نەتەوە دروست دەکات).

دایك خەڵفی خێرەردار بە رووبەکی ئەوەندە جوان و سەوزە چاو لە تەماشای تێرنابێت و لە سێبەری فێنکی ناتەوێت دەرچێت، بۆیە (نووسەرێکی کورد) دەربارەی دایك دەڵێت:

(دایك ئەو لاپەڕە سپییەیە کە دێری منداڵەکانی لەسەر دەنووسرێت...).

دایك فریشتەیەکی خوایيە هەموو مرۆڤێك لە ئاستیدا دەبێت کڕنووش بەرێت، بۆیە هەمان (نووسەری کورد) دەڵێت:

(خۆشەویستی دایك لەرۆحی ئەو فریشتانە دەچێت کە هەمیشە ئاسمانیان پڕ لە نوور کردووە...).

لە ئاینی ئیسلامدا لە چەندین شوێن لە (قورئان و وتەکانی پەیامبەر)دا باسی مەزنیی دایك کراوە. بۆیە پەیامبەر لە وتەیەکیدا دەڵێت: (بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە). بەڵێ، پەیامبەری ئیسلام لەم وتەیەیدا ڕوودەکاتە نەوەکانی مرۆڤایەتی و پێیان دەڵێت، ئەگەر دەتانەوێت لە دنیای جاویدانیتانا بگەنە بەهەشت، دەبێت لەم دنیایەدا ڕێز لە دایکان بگرن و دڵیان ڕاگرن و خۆشتان بوێن و داوای لێبووردن و ڕازیبوونیان لێبکەن، ئەگەر دایکتان لەم دنیایەدا لێتان ڕازی بوو، ئەوا لەو دنیا بە بەهەشتی بەرین شاد دەبن.

پەیامبەری ئیسلام ئەوەندە دایکی بەلاوە گەورەو مەبەست بووە، لە بۆنەیەکدا یەکێك لە ئامادەکان لێی دەپرسێت ئەی پەیامبەری خوا کێ لە هەمووکەس زیاتر دەبێت شایستەی ڕێزی من بێت؟

پەیامبەر لە وەڵامدا پێیدەڵێت: (دایکت).

(سێ جاری دیکە پێی دەڵێتەوە کێی تر؟ دوو جاری تریان هەر پێی دەڵێت دایکت و جاری سێیەم پێی دەڵێت باوکت)، واتە (٣) جار فەزڵی دایکی داوە بەسەر باوکدا، بۆ مرۆڤ دایك ئەوەندە خۆشەویست و جوانە بەلای مرۆڤەوە، هەرچەندە پیر بێت، کە سەیری دەکەیت هەر بەلاتەوە گەنج و جوانە. بۆیە (ئەڵمانەکان) لە پەندێکیاندا وتوویانە:

(دڵی دایك هەرگیز پیرنابێت).

دایك ئەوەندە گەنجینەیەكی پڕو بەپیتە، هەرگیز چۆڵ نابێت و كەم ناكات و كۆتایی نایەت، بۆیە (حافز ئیبراهیم) دەڵێت: (دایك قوتابخانەیەكە گەر ئامادەی بكەیت، گەلێكی باش و رەسەنت ئامادەكردووە).

دایك ئەو كێوە بەرزو پڕكاوەو زەردە سەختانەیە مرۆڤ بەئاسانیی ناتوانێت پیایدا سەربكەوێت.

دایكی منیش، ئەو دایكە مەزنە بوو كە لەكاتێكدا باوكم لە تەمەنێكی كورتدا بەهۆی رووداوی ئۆتۆمبێلەوەو لە رۆژو ساڵێكی سالانی پەنجاكاندا ماڵئاوایی لە ماڵ، دایك، ئێمە، خەلیفە، مورید، دەروێشان، خزمان كردو تەكیەو ماڵ و ئێمەی بەسەر دایكمدا جێهێشت. كۆچی باوكم كۆچێكی ناوادەو چاوەڕواننەكراو بوو. هەواڵ و خورپەیەكی لەپڕو جگەربڕ بوو بۆ دایكم و ئێمە، باوكم گەورەبوو، لە تەمەندا نا، بەڵكو لە هەڵسوكەوت و رەفتارو خواناسیی و ئاینپەروەریی و بواری كۆمەڵایەتیدا...

شێخێكی ئیرشادی بێ تەكلیف و خۆشەویست بوو... لەناو خزمان و كۆمەلانی خەڵكی ناوچەكەمان و ناوچەكانی: بازیان، گەرمیان، شارباژێڕ، پیرەمەگروون، سەرچنار، سلێمانی، سەردەشت و بانە دیارو ناسراو و خاوەن كەسایەتی خۆی بوو.

منداڵ بووم، تازە فامم كردبووەوە، كە ئەو باوكە گەورەیەمان لێ ونبوو. ئەو ساڵ و كاتە دایكم دایكانە هەرزوو بنی ماڵی گرت و جێگای باوكمی گرتەوەو بووە دایك و باوكمان، بووە (رەحمەخانی) موریدان و دەروێشان، سەروكاری ماڵ و تەكیەو دیوەخانی دەكرد. نەیهێشت تەكیەو دیوەخان ساردبێتەوەو ئاگری كورەیان بكوژێتەوە. دایكانە چوار كورو چوار كچی گەورەكردو پێگەیاند. بەشێوەیەك سەروكارو چاودێریی و سەرپەرشتی ئێمەی دەكرد. بێباوكیمان پێوە دیارنەبوو. نەیهێشت زۆر بەسەر كۆچی باوكمدا تێپەڕ بكات، هەوڵیدا جێگای باوكم پڕكاتەوەو كاكەمی لەجێگای باوكم داناو مێزەری بەسەرەوە بەستراو عەبای شێخیتی كرایە شان و بووە جێنشینی باوكم و لەسەر تەكیەكە دانرا، بوو بە هاوكارێكی باشی دایكم بۆ زیاتر گەرمكردنەوەی تەكیەو بەدەنگەوەچوونی خەلیفەو دەروێش و موریدان و میوانان...

بەجووتە دایكم و كاكەم سەرپەرشتی ئێمەشیان دەكردو بۆ هەموو داولو داخوازییەكمان، دایكانەو كاكانە بەدەنگمانەوە دەهاتن و دڵیان خۆشدەكردین و خەمتیان بەسەرماندا دەهێنا...

دایكم ئاواتی ئەوەبوو كورانی ژن بهێنن و كچانی شوو بكەن و بچنە ماڵ و حاڵی خۆیان و منداڵیان ببینێت و لە ئامێزیان بگرێت. كوران و كچان بە ئاواتی ئەو گەیشتن و هەرهەموویان بوونە خاوەنی ماڵ و منداڵ، ئەویش باوەشی گەرمی بۆ دەگرتنەوە.

دایكم لەبەرئەوەی كاكەم كورە گەورەی بوو، لەجێگای باوكم دانیشتبوو، زۆری خۆش دەویست. بۆیە لە ژیانی رۆژانەیدا زۆری حەز بەوە دەكرد، كە بە بەردەوامی لەگەڵ كاكەمدا

وەکو کورە گەورەو پۆزنشینی باوکم بژی و دەیوت: حەزدەکەم شەو و رۆژ چاوم لەسەرو میزەر شان و عەبای (عوسمان)بێت و رۆژێك عوسمان نەبینم، وا دەزانم دنیام لیّ ئاخربووە.

لەگەڵ ئەوەشدا چۆن بۆ کاکەم وابوو، بۆ ئێمەش دایکێکی دلسۆزو خەمخۆر بوو. هەموومانی خۆش دەویست و هەریەکەمانی لەبەرامبەری ئەو خۆشەویستییە دایکانەیە دەستی بەسەرماندا دەهێناو چاودێریی و ڕێنمایی دەکردین.

من لە تەمەندا کوری سێیەمی بووم... هەمووجار پێی دەوتم: (حەمە) رۆلە تۆ (نەنکت) ناوی ناوی (محەمەد) بەناوی (شێخ کاکەحەمەی باپیرتەوە) ئەوناوەی لێناویت. بۆ ئەوەی لە پاشەرۆژدا جێگای ئەو بگریتەوە... لێت تێکنەچێت تۆ کوری (شێخ کەریمی)و باوکت کەسێکی کەم نەبوو.

بەمەبەستی خوێندن، بە منداڵیی لە ماڵی خۆمان دوورکەوتمەوە، ئەوەندە منداڵبووم هەردێیەك کە دەچووم بۆ خوێندن ژنێکی خۆشەویستی بنەماڵەی خۆمانی لێبوایەو لە دایکم بچوایە بۆنی دایکم پێوە دەناو حەزم دەکرد لە باخەڵیا بنووم و سەر بکەمە سەر سنگی. کە بە سەردانیش دەهاتمەوە بۆماڵەوە سەیرمدەکرد دایکم لە من شپرزەترە بۆ لە باوەشگرتنم.

بەمنداڵیی ئەوەندە سوورو جوان بووم، لە خۆشەویستیدا پێیان دەوتم (حەمە سوور)، سوور لەگەڵما گەورە بوو تا وای لێهات بووە نازناوم. تائێستاش کە تەمەنم خۆی لە (٦٥)ساڵ دەدات، هەر بە (شێخ محەمەد سوورو شێخە سوورە) دەناسرێم و بانگ دەکرێم.

دایکم ئەوەندە دایکێکی گەورەبوو، بەلای منەوە لە دەریایەك دەچوو، کە چەندین ماسی گەورەی لەناوخۆدا حەشارداوەو گەورە کردووە، شەپۆلەکانیشی ناتوانێت دووریان بخاتەوە.

بۆیە دایکم لەهەموو رۆژگارە خۆش و ناخۆشەکاندا، دایکانە باوەشی گەرمی بۆ دەکردمەوەو بەدەنگمەوە دەهات و خەمەکانی بۆ خاوەدەکردمەوەو کێشەو گرفتەکانی بۆ چارەسەر دەکردم و فریام دەکەوت.

من لە ژیانمدا خۆشیم کەم بووە بەهاوریّ و زوربەی رۆژانی ژیانم بە ناخۆشیی بەسەربردووە، بەلام دایکم لەو رۆژانەدا بۆ من دایك بووە، رۆژانی خوێندن لە سلێمانی، بەغدا، ژیانی سەربازیی، پێشمەرگایەتی، دەربەدەریی و ئاوارەیی، گرتن و زیندانیکردن، برینداربوونم، چۆن بیربچێتەوە، کە دایکم بۆ هەر رۆژگارێك کۆلەکەیەکی ئەستووری پشتیوانیم بووە لە خەمخۆریی و بەسۆزی دایکایەتیدا. ئەگەر لەم نووسینەمدا بەدوورو درێژیی باسی دایکم بکەم، بەچەند لاپەرەیەك کۆتایی نایەت، بەڵکو دەتوانم بیکەمە کتێبێك. بۆیە تەنها ئەوەندە دەڵێم دایکم لەو دایکانە بوو، کە وتەی ئەو زاناو روناکبیرو نووسەرانە پڕ بەپڕی دایکێتی بوو.

دایکم ژنێکی ئاسایی نەبوو، تەنها خەریك و لە خەمی ماڵ و منداڵ و ئاژەڵدارییدا رۆژان بەسەر بەرێت، یان کەیبانوویەکی ژووری دیوی ئاگردان و دیوی کورەو سەرتەنوورو بان نەبوو، کە هەمیشە کراس و بەرگی ئیشکردنی لەخۆی هەڵکێشابێت نان و چێشت دروست

بکات و نان بکات، بەڵکو ژنێك بوو لەو ژنە خانمانەی بەردەوام بە پۆشاکی کوردیی
جوان و ڕێکوپێکەوە سەری دەبەستەوەو سەرپۆشی سپی دەدا بەسەرداو کەواو [illegible]
لەبەر دەکردو دەسماڵی جوانی دەدا بەسەر شانیدا، لەنێوانی دیوی کورەو دیوی [illegible]
بەرهەیوان و ژووری تەکیەدا هاتوچۆی دەکرد.

لەگەڵ هاتنی هەر دەستەیەکی دەروێشاندا، لەگەڵ کاکەمدا پێشوازییان [illegible]
دەروێشان دەکردو ژنیان بۆ دیوی کورەو بۆلای نەنکە عاسمەم دەبردو پیاوانیشیان [illegible]
دەکرد بۆ تەکیە. دوای حەوانەوەیان دەچوو بۆ تەکیە جارێکی دیکە یەکەیەکەیان [illegible]
خۆیان بەخێرهاتن دەکردن و لە تەندروستی و کەسوکاریانی دەپرسییەوەو دەیپرسی [illegible]
دەروێش نەهاتووە؟ خۆ ناساغ نییە؟ ئەی فلاّنی ترتان لەگەڵدا نییە. ئەوانیش [illegible]
بەرێزی (دایکە ڕەحمە)وە دەستیان بەسنگیانەوە دەگرت و وەڵامی پرسیارەکانیان [illegible]
بەداوای لێبووردنەوە دەگەڕایەوە بۆناو دەروێشە ژنەکان. بەهەمان شێوە لە یەکە [illegible]
دەپرسی و هەواڵی دەروێشە نەهاتووەکان و منداڵەکانیانی دەپرسی.

ئێوارە دوای شێو خۆی دەگەیاندەوە تەکیەو بەهاوشانی کاکەم دادەنیشت و [illegible]
دەروێشەکان دەکوتنە باسی مەسەلە ئایینەکان و شێخی و دەروێشی و کەشف و [illegible]
شێخانی تەریقەت و موناقیبەکانی (کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ عەبدولقادری کەیلانی
پیرانی تەریقەت)، بە وتەکانی پەیامبەرو ئایەتەکانی قورئان دانیشتنەکەیان گەرم دەکرد
شەوانە دوای نوێژی عیشا، کۆڕی زیکر دەبەستراو خەڵکی ئاوایی حاجی حەمە ڕەزا، حاجی
محەمەد دەروێش عەلی، حاجی ئەحمەد، مام تۆفیق، ئەحمەدی فەرەج، مامە ڕەزا، دەروێش
جەبار، سەعیدی مام عەلی، مامە عەزە. دەیانی تر لەگەڵ خێزانەکانیان دەهاتن و دەفژەن
و تەپڵژەنەکان دەستیان دەکرد بە تەپڵ و دەف لێدان و خەلیفەش بە سڵاوات لێدان و
خوێندنەوەی شیعری مەحوی و وەفایی و حەمدی کۆڕی زیکر گەرمەدەکرا.

(کاکەم و دایکم) بەهاوشانی یەکەوە لە تەکیە ڕادەوەستان، دەم بەدۆعا سەیری کۆڕی
زیکرەکەیان دەکرد، لەکاتی حاڵلێهاتنی دەروێشان و شمشێرو زڕەگبازیی و [illegible]
بەمقاشی سوورەوەکراو پشکۆو بزووتگی ئاگرو داکرماندنی پیالە زیاترو زیاتر [illegible]
دۆعاو نزا، بۆئەوەی دەروێشەکان و لەو حاڵەیاندا سەلامەت بن و دووچاری گرفت و [illegible]
ناخۆش نەبن. تائێستاش ئەو شەوانە لە زەینمدا ماون، منداڵان و کیژە عازەب و [illegible]
لەناو هەیوانی تەکیەو بەردەمی تەکیەدا گرد دەبوونەوەو چێژیان لەو ئاهەنگی [illegible]
شمشێربازییە دەبینی و زۆریان لە بریسکەی شمشێرەکان دەترسان و هەندێکیان [illegible]
دەستیان بە چاویانەوە دەگرت. دەروێشانی ژنیش بەهەمان شێوە بەجیا کۆڕی [illegible]
لەگەڵ ژنانی ئاواییدا دەبەست و حایوو حایوو ئەو ناوەی پڕدەکرد. ئەم حاڵە لە [illegible]
تا گەورەبووم و وام لێهات بۆ خوێندن بچمە بەغداو لە زانکۆ بخوێنم، لەو ساڵانەدا
لە سۆڵەوە باریکرد بۆ سلێمانی و لەسەر (سەدەکەی مەجیدبەگ) خانووەمان [illegible]

تەپڵ و دەف لە تەكیەی سۆڵەوە گوێزرابووەوە بۆ ژوورێكی خانوویەكی كرێ كە ناونرابوو تەكیەو دواجار لەو خانووە بۆ خانوویەكی دیكەو تا خانووی خۆمان دروستكرد، ژوورێكی بۆ تەكیە دانرا. لەو ساڵانەشدا دەروێشان لە شارباژێر، بازیان، سووورداش، ئێران و ناوشارەوە بە بەردەوامی دەهاتن و دەمانەوەو كۆڕی زیكرو تەپڵ و دەفلێدان و حاڵلێهاتنیان خەڵكی گەڕەكەكانی كۆدەكردەوەو منداڵان بە چواردەوری ماڵماندا فرك و هوریان دەكرد.

(دایكم و كاكەم) بەهەمان شێوەی سۆڵە بەدەوری كۆڕی زیكرەكەدا دەهاتن. دایكم چۆن لە سۆڵە دایە رەحمەو دایە گەورەبوو، لە سلێمانیش هەر بەهەمان ناو بانگ دەكرا، خاتوو رەحمەیەك بوو بۆ خۆی.

ئەو رۆژانەم لە قەرەداغ و بیارە بیرناچنەوە، كە خۆی دەگەیاندە لامان و لامان دەمایەوەو لەگەڵ ژیانی پێشمەرگایەتیمدا لەگەڵماندا دەژیا، یان ئەو ساڵانەم چۆن بیربچنەوە لەكاتی ئاوەرەبوونماندا لە سلێمانییەوە خۆی دەگەیاندە لامان و ماوەیەك لە (قەزای حەی) لامان دەمایەوەو دەستی بەسەر یەكەیەكەی منداڵەكاندا دەهێناو رۆژانە چەندجار ماچی دەكردن.

ئەو رۆژەم هەر لەپێش چاوە لەكاتی زیندانیمدا لە بەندیخانەی ئەبوغرێب لە یەكێك لە مواجەهەكاندا هێنایان بۆلام. كە بەیەكگەیشتین و باوەشمان لەیەكداو بەقوڵپی گریانەوە لەیەكپێ دەیوت: (حەمەگیان... حەمەگیان) (كاكەم و زەینەب) هەرچەند هەوڵیان دەدا لەیەكمان بكەنەوەو باوەش لەیەك بەربدەین دایكم لە ماچكردنم و بەقوربانبوونم وازی نەدەهێنا، دەویت لێمانگەڕێن، ئای چ رۆژێك بوو!! كاتێك ئازادكراین، لەگەڵ دایكمدا بەیەك شادبووینەوە، ئەمجارە ئەو باوەشەی لێیدام را بەخۆیەوە نووساندم وەكو ئەو دەمەی حەمەیەكی كۆرپەبووبم وابوو، لەگەڵ ماچكردن و باوەش لێدانیدا بەكوڵ دەگریا، وتم: بۆ دەگریت؟ ئەی ئەوە نییە رزگارم بووە، هاتوومەتەوە ناوتان؟ وتی: حەمەگیان گریانی خۆشییەو لەخۆشیدا پێكەنینم نەماوە، ئەم گریانەم لە پێكەنین لا خۆشترە كورە شیرینەكەم.

هەرگیز لەبیرناكرێت ئەو شەوەی پێكرام و شەو گەیاندمیانە تیمارخانەو بەیانی دوای نەشتەرگەریی، گەیشتە لام و خۆیدا بەسەرما. هەرچەند پێیان وت: دایكە نابێت خۆت بدەی بەسەریداو ئازاری بدەیت، بێسوود بوو، تا بەزۆر لەسەریان هەڵبڕیم، وتی: حەمەگیان من دۆعام بۆكردی لەدەست بەعس و سجنەكەی رزگار بیت و بێیتەوە ناومان، شەو و رۆژ لەگەڵماندا بژیت، نەمزانی لە ئازادیی كوردستانیشدا گوللە بۆ تۆ نازڵ دەبێت و ئاوات لێدێت.

كاتێك ئازاری زامەكانم خاوبوونەوە، لە نەخۆشخانە چوومە دەرەوە. دایكم مەگەر لەكاتی دەستنوێژ شۆردن و نوێژكردندا بەجێی بهێشتمایە ئەگینا بەسات بەجێی نەدەهێڵام. رۆژانەو شەوانە ماڵمان پڕبوو.

(كاك مولازم عومەر) بۆ سوعبەت و گاڵتە لای برادەران و بەناوی (كاك عومەری سەید عەلی)یەوە لەكاتی بریندابوونمدا قسەیەكی بلاوكردبووەوە. شەوێك چەند هاورێیەك هاتن بۆلام و كردیانە گاڵتەو نووكتە گێڕانەوە، دایكیشم دانیشتبوو، ئەو قسەیەی كاك مولازم

عومەریان گێڕایەوە. دایکم هەرگوێی لێبوو، بەدەنگی بەرز وتی: دەك ئەوە کوێربێت کە ئەو قسەیەی کردووە.

بەداخەوە ئەو دایکە خانمە مەزنەو دایك و باوکناسایەمان، لەدوا ساڵانی تەمەنیدا دووچاری نەخۆشییەکی درێژ خایەن بوو. دەبوو بۆ هەموو کارێکی کەسێك یارمەتی بدات و ڕەحمەخانەکەی جاران بوو بە ڕەحمەخانی سەرجێگا. ئەوەندەی لە ماڵی ئێمە دەبوو. هەستم دەکرد زۆر ئارام و دڵخۆشە، کە دەیبینی زەینەب و منداڵەکان بە بەردەوامی بانگی دەکەن نەنەگیان و زەینەب بە ئامۆژن گیانی گفتگۆی لەگەڵدا دەکرد، زۆر بەوە خۆشحاڵ دەبوو کە منداڵەکان دەچوون بۆ قوتابخانە پێش ڕۆیشتنیان دەچوون ماچیان دەکردو کە دەگەڕانەوە بەهەمان شێوە دەچوونەوە لای و پێیان دەوت نەنەگیان. بە بەردەوامی لە دۆعادا بوو بۆ زەینەب و من و منداڵەکان و هەمووجار دەویت خوایە ئەوەندەی من لێیان ڕازیم تۆش ئەوەندەیان لێڕازیی بە. ئەو ساتەوەختەم هەرگیز بیرناچێتەوە، کە لەکاتی سەرەمەرگدا لەسەر جێگاو ژوورەکەیەوە بانگی کردم (حەمە، حەمەگیان) بگرە لام و کە گیشتمە لای و وتی: ئەملاو لاتم بەرێ ماچی بکەم و توووند دەستی گرتم و وتی: ڕۆڵە ئەوەندەی من لە خۆت و زەینەب و منداڵت ڕازیم ڕەبی خواش ئەوەندەتان لێڕازیبێت، دۆعاتان بۆ دەکەم هەرگیز ناخۆشیی بەرۆکتان نەگرێتەوەو تا مردنتان لەشساغ بن، حەمەگیان من تەواو بەو قسانەوە گیانی سپارد. دەستی ئەوەندە توووند گرتبووم، دوای مەرگیشی بەماوەیەك ئینجا توانیم دەستم لە دەستی بکەمەوە. ناتوانم تامردن سۆزو گەورەیی ئەو دایکە میهرەبانە لەیاد بکەم. بەڕاستیی هەم دایك و هەم باوکمان بوو. خۆمان و خێزانمانی هەریەکە بەجۆرێك خۆش دەویست و کە هەرگیز هەستمان بە جیاوازیی نەدەکرد، بەرگریی لە خێزانی هەریەکەمان دەکرد. بیانوویەکی پەسەند نەدەکرد کە ئێمە لەگەڵیاندا خراپ بین. خێزانی سیانمان ئامۆزامان بوون و ئامۆزای دایکیشم بوون، بۆیە بەدووسەرە هەریەکەیانی خۆشدەویست، خێزانی ئەویترمان هەرچەندە لە نەوەی خانەوادەکەمان نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی بووبووە ئەندامێکی خانەوادەکەمان، زیاترو زیاتر ڕێزی لێدەگرت و خۆشی دەویست.

منداڵمان نەبوو، دایکم دەستی میهرەبانیی و خۆشەویستیی بەسەردا نەهێنێت، منداڵی هەریەکێکمانی بدیایە دوای ماچکردنی یەکسەر دەستی بەگیرفانی سوخمە یان کەواکەیدا دەکردو بە خەرجییەك دڵی خۆش دەکرد. بۆیە دەڵێم خۆزگە دایك نەمردایە. یان کە دەمرێت بەدڵشکاویی منداڵەکانی بەجێنەهێڵێت، بۆیە خۆشە مرۆڤ ئەوەندە ڕێز لە دایك و باوکی بگرێت، کاتێك لێی وندەبێت هەست بەشەرمەزاریی و پەشیمانیی نەکات. خۆزگە هەموو مرۆڤ درکی بەوە بکردایە کە خۆشی دەبێتە دایك و باوك پێویستی بەسۆزی منداڵەکانی دەبێت. بەلای منەوە بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە کە دڵی دایکی و باوکی ڕابگرێت و لە ئاستیاندا کەمتەرخەمی نەکات و لووتیان لێبەرز نەکاتەوەو پیایاندا هەڵنەشاخێت و بەدڵ و بەگیان خزمەتیان بکات. بەوە بەختەوەرم کە دایکم دەستی ڕازیبوونی گوشیم...

# زەینەب و منداڵەکانم

لەکاتێکدا ئەم یاداشت و بیرەوەرییانەم لە دووتوێی کتێبێکدا کۆکردەوەو ئامادەم کرد بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، لە ناوەرۆکیدا دەبینرێت لە ڕۆژی دەستگیرکردنمەوە تا ئازادکردنم، بەدەیان جێگەدا ناوی (زەینەب) وەکو هاوسەرو هاوبەشی ژیانم و دایکی منداڵەکانم و منداڵەکانیشم وەکو جگەرگۆشەم بەم ناوانە: (بەخشی، ئازاد، بەهار، ژیر، بلێسە، سەروو، شەنگە) هاتووە، بۆیە هەڵوێستەکردن لەسەریان و باسکردنیان بۆ کتێبەکە، بەکارێکی پێویستی دەزانم. چونکە کتێبەکە جگە لە یاداشتی زیندانییەك کە پەیوەندیی بەخۆم و بەندیخانەوەیە، پەیوەندیشی بە ژیانی هاوسەریی و منداڵەکانیشمەوەیە.

دەستگیرکردنم هاوسەرەکەم (زەینەب) کە هاوبەشی ژیانی خێزانی ئاسایی، خەباتی من لە بواری کاری نهێنی و پێشمەرگایەتی، بواری ڕووناکبیریی، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، سیاسیی و زیندانیمەوەیە. بۆیە کە دەستگیرکرام گەورەترین پەژارەو خەمی بۆ دروست بوو، منداڵەکانیشم هەریەکەیان بەجۆرێك دووچاری گرفت و خەم و پەژارە بوون.

(زەینەب) جگە لەوەی هاوبەشی ژیانم و دایکی حەوت جگەرگۆشەم بوو. ئامۆژاشم بوو، لە گرتنەکەمدا دەبینێت لە ئێوارە وەختێکدا لەلایەن مامۆستایەکی قوتابخانەکەوەو لەگەڵ مامۆستا سامانی شێخ سالحی خزم و خۆشەویستم خۆیان دەکەن بەماڵدا، هەواڵی دەستگیرکردنی منی دەدەنێ و لەو هەواڵەوە بیردەکاتەوە منی لێدابڕام و دابڕانەکەشم کاتیی نییەو چارەنووسێکی نادیار دەبینێت و ڕووبەڕووی گەورەترین و قورسترین پەژارەو چەشتن دەبێتەوە. تێدەفکرێ حەوت منداڵی بێ (باوك)ی بەسەردا جێماوە. کوڕە گەورەمان (بەخشی) لە قۆناغی دووی پەیمانگای دانشگای موسڵەو لە ماڵو شارەکەمان دوورە، (ئازادو بەهار) خوێندکاری دواقۆناغی ئامادەیین، (ژیرو بلێسە)ش خوێندکاری قۆناغی ناوەندین، (سەروو) تەمەنی سێ ساڵەو (شەنگە)ش تەمەنی دوو مانگانە. بەخێوکردن، پەروەردەکردن، پەرشتیکردن، دابینکردنی خەرجی ڕۆژانەو مانگانەیان کارێکی ئاسان نییە، زۆرستەم و قورسە بۆ ژنێکی نەخوێندەوار لە ئێوارەوەختێکدا شێوی ئێوارەی ئامادەکردبێت و لە چاوەڕوانیی باوکی منداڵەکانیدا بێت بۆئەوەی لە دەوامی قوتابخانە بگەڕێتەوەو وەکو ئێوارەکانی دیکە لەگەڵ منداڵەکانیدا شێو بکات، لەپڕێکدا چەخماخەئاسا وەکو برووسکەیەکی لەناو هەورێکی تاریك و باراناویی خۆی بکات بەناو ماڵدا، بەچرپە هەواڵی ونکردن و گیرانی پێبڕەێنێ کە باوکی منداڵەکانی لە ژووری ئیدارەی قوتابخانە، لەلایەن جەندرمەکانی ئەمنەوە ڕاپێچی ئەمن کراوەو لەگەڵ برووسکەکەدا وەکو ئەو برووسکەو چەخماخانەی لەئان و ساتێکدا بەگڕو کڵپەیان ماڵوێران دەکەن و ماڵ سارد دەبێتەوەو نامێنێت، ئاواش ئەو مامۆستایانە یەکسەر دەگەڕێنەوە بەردەرگاو سەربانی ماڵ جێدەهێڵن و لەپێش چاو نامێنن

و وندەبن. باشە هەواڵێکی وا کوتوپڕ ناخۆش و ناوەخت، لەم ئێوارە وەختەدا. (زەینەب) دەخاتە چ هەڵوێست و بیرکردنەوەیەکەوە؟ چۆن ئەو هەواڵە ناخۆشە بە منداڵەکانی بلێت؟ لەکاتێکدا ئەوان لە چاوەڕوانی باوکیاندان تا بگەڕێتەوەو شێوی ئێوارە بەیەکەوە بخۆن. دڵنیایە ئەگەر پێیان بلێت کەسیان نانی ئێوارە ناخۆن... بیردەکاتەوە، دادەمێنێ، قوڵپ دەدات، ئەم ژوورو ئەو ژوور دەکات، تا دەگاتە ئەوەی هەنسك و قوڵپی گریان و دڵپڕی سەرریژ دەکەن و دەبێتە گریان و فرمێسك هەڵڕشتن و هەواڵەکە دەگاتە منداڵەکان و تێدەگەن هاتنی مامۆستایان لەو ئێوارە وەختەدا ئاسایی نەبووە، تێکچوونی رووخسارو سیمای دەموچاوی دایکیان ئەوەیان دەگەیاند کە باوکیان دووچاری مەرگەساتێك بووە، بۆیە یەکەیەکەیان روودەکەنە دایکیان و هەرپێنجیان پوورەی لێدەدەن و لێی دەپرسن دایە: دایکە بۆ وادەکەیت؟ بۆ دەگریت؟ ئەو مامۆستایانە بۆچی هاتن و بەپەلە رۆیشتن؟ باوکم بۆ ئەمشەو دیار نییەو نەهاتەوە؟ پێمان بڵێ... دایە تووخوا، تووگۆڕی شەهیدان پێمان بڵی چی بووە؟ باوکمان چی بەسەرهاتووە؟ لێت نابێنەوە تا پێمان نەڵێیت. لەپڕ قوڵپی گریان سەردەکات و بەدەم رشتنی فرمێسکەوە پێیان دەڵێت باوکتان تەواو. باوکتان تەواو. باوکتان دائیرەی ئەمن گرتوویەتی، بێ باوك مانەوە. ئاخ باوکتان رۆڵەکانم. جا سەیرکەو دیمەنی (٥) منداڵ لە شەوێکی وا نەگریسدا، هەریەکەیان لەلایەکەوە بەدایکیاندا هەڵزناون و لەگەڵ هەڵڕشتنی فرمێسکی دایکیاندا ئەوانیش شەپۆر دەکەن و دایکیشیان دەست بەسەر یەك یەکەیاندا دەهێنێت و بەقوربان و بەساقەیان دەبێت. ئا لەم دەنگی شەپۆرو گریانەیاندا، مامەکانیان و پووریان ئامۆژنیان بەئاگادێن و دەگەنە لایان و هەریەکەیان بەجیا لەگەڵیاندا دەکەونە خەمخواردن و دڵدانەوەیان، هوشیاریی و زیرەکیی و بەئاگایی نییە ئەو دایکە نەخوێندەوارە لەو شپرزەیی و شڵەژانەدا بیر لەوە بکاتەوە، ئەو شتانەی لەماڵەکەدان و جێگای مەترسین بۆ بارگرانکردنی هاوسەرەکەی، دەبێت هەرزوو بیاندۆزێتەوە ساتاریان بکات و لەناو ماڵەکەدا نەیان هێڵنەوە، نەوەکو دوای دەستگیرکردنەکەم جەندرمەکان خۆیان بگەیەننە ماڵەوەو ماڵەکە بپشکنن، لەم شپرزەییەدا واز لە منداڵ و مام و پوور دەهێنێت و دەکەوێتە گەران و کون بەکون و شوێن بەشوێنی ماڵەکە دەگەرێت، هەرچی بەردەست دەکەوێت لە گیرفان و باخەڵیدا قایمیان دەکات و واز لەگریان و شپرزەیی منداڵ و مامەکانیان دەهێنێت...
ئالەو ساتەوەختەدا (مامۆستا ئەحمەد ساڵح)ی هاورێم نازانم لە کوێوە سووسەی کردبوو، کە من دەستگیرکراوم، یەکسەر بەبێ رامان و سڵەمینەوە چاونەترسانە خۆی گەیاندبووە ماڵمان و یەکسەر خۆی بەژووردا کردبوو، کە سەیری کردبوو. براکانم و براژنەکانم و زەینەب و منداڵەکان هەرهەموو شڵەژاون و دەستی خەم و خەفەت بەیەکدا دەدەن، گریانی منداڵ ئەوەندەیتر کاریگەریی لەسەریان کردووە. هاورێیانەو خاوەن ئەزموونانە، برایانە، دڵسۆزانەو مامۆستایانە، روو دەکاتە کاکەم پێ دەڵێت کاکە شێخ عوسمان ئێوە نابێت بەم شێوەیە بکەن، چونکە ئەم حاڵەی ئێوە خزمەتی شێخ محەمەد ناکات و ئەو دەستگیرکراوە. دەبێت

مشووری ئەوە بخۆین ئەوەی لەناومالدایەو مەترسی هەیە لەبەردەستیدا نەهێلین و خۆشتان بلاوە بکەن و منداڵەکان و دادە زەینەب بابچنە شوێن و ماڵێکی دیکەو ئەم خانووەیان چۆڵ بکەن، چونکە چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت بێن بۆ پشکنینی ماڵەکەو دووریش نییە ئەگەر دادە (زەینەب)یان بەردەست بکەوێت، ئەویش دەستگیربکەن. فەرموون ئێوە بچنەوە خوارەوە، بامن لەگەڵ دادە زەینەب هەندێك قسەو تەکبیر بکەین. زەینەب دەباتە لایەکەوەو پێی دەڵێت: هەرچیت لەبەر دەستدایەو دەزانیت لەکوێ شتی داناوە، هەرئێستا دەریان بهێنەو کۆیان بکەرەوە بیدە بە من، با من لەگەڵ خۆمی بەرم، ئامۆژگاریشی دەکات دواتریش بەوردیی ناو کتێبخانەو ناو جێگاو هەرشوێنێکی دیکە کە دەزانیت شتم تێدا دادەنا بگەرێ و لەناویانبەرێت و دووریان بخاتەوە. پێی دەڵێت: دادە زەینەب، خۆراگرو بەتوانابە... ئاگات لە منداڵەکان بێت، شێخ محەمەد یەکەم کەس نییە دەستگیربکرێت و دواکەسیش نابێت. لەوەتەی بزووتنەوەی کورد دروستبووە رژێم کوردو تێکۆشەرانی دەستگیر دەکات، هەموو دەستگیرکردنێکیش مەرج نییە ئەنجامی خراپ و ناخۆشی لێ بکەوێتەوە. خۆت دەزانیت ئێمە رێبازێکمان هەڵبژاردووە تا سەرئێسقان دژی رژێم و سیاسەتی رژێمەو لە یەکەم رۆژمانەوە ئەوەمان بۆخۆمان داناوە کە دەستگیردەکرێین و لەناودەبرێین. خۆت دەزانیت ئەوەی ئێمە دەیکەین و دەمانکردو چەند ساڵە بەبێ ترس و سڵەمینەوە لەم وڵاتەداو لەم شارەدا رۆژانە ملمان لە چەقۆ سویەوو نەترساوین. زەینەب لەکاتی ئەم قسەکردنەدا لە مامۆستا دەپرسێت، نازانیت بۆ دەستگیرکراوەو کێ گرتوویەتی؟ ئەویش هەرئەوەندە وەڵامدەداتەوە، هەر دەزگایەك گرتبێتی، حکومەت گرتوویەتی، شێخ محەمەد خوانەخواستە لەسەر دزیی و پیاوخراپیی دەستگیرنەکراوە، دیارە لەسەر مەسەلەی گەلەکەیەتی، بەلام هیوادارم گرتنەکەی زۆر نەخایەنێت و دادە زەینەب باوەرناکەم ئەم شالاوە لە کاکە شێخ-دا بوەستێت لەگەڵ ئەم گفتوگۆیەدا ئەوانەی لە گیرفان و باخەڵیدا کۆیکردبوونەوە لە یەك عەلاگەدا لە نووسراو، نامیلکە، کتێب و بلاوکراوەی دەداتە دەستی و ئەویش پێش ئەوەی خواحافیزیی لێبکات پێی رادەگەیەنێت، شپرزە نەبێت و نەشڵەژێت و لەسەر خۆو هێمن بە ماڵەکەدا جارێکی دیکە ورد بگەرێت و هەرچی دۆزییەوە یەکسەر لەناویان بەرێت، هەوڵبدات هیچی قەدەغەکراو لە ماڵدا نەمێنێت و خۆشی لە ماڵەوە نەمێنێت و دووربکەوێتەوە. ئینجا ئەو مامۆستا بەئەمەك و خاوەن ئەزموونە بەخواحافیزییەکی خەماوییەوە بەجێیان دەهێڵێت، زەینەب و منداڵەکانیش لەگەڵیدا تا سەر قادرمەکان دەرۆن و بەقوڵپی گریانەوە خواحافیزیی لێدەکەن. ئەویش بەهەمان شێوە بەقوڵپی گریانەوە ماڵئاوایی دەکات.

بۆیە دەمەوێت لەم بابەتەدا یەکەیەکە کەم تا زۆرێکیان لەسەر بنووسم.

## زەینەب



هاوسەرو هاوبەشی ژیانم، ئامۆزام. دایکی حەوت مندالم. ئەوکاتەی دەستگیرکرام تەمەنی هاوسەریم لە بەهاری (٢٤) سالماندابوو. لەو سالانەی ژیانماندا بەهەموو خۆشیی و ناخۆشیەکییەوە، بە بوون و نەبوونیمانەوە، بەبێ کێشە رۆژو سالمان لەگەل یەکدا بەرێدەکرد، هەرچەند نەخوێندەواربوو، بەلام لە ئاستێکی بەرزی بیرکردنەوەدا بوو.

بۆ بەرژەوەندیی ژیانی خێزانیی و هاوسەریی و مالداریی و راگرتنی دلی یەکتر... جگە لەوەی هاوبەشی ژیانی خێزانیم بوو، هاوبەش و یارمەتیدەری ژیانی سیاسیم بوو، لە خەباتی نهێنی، پێشمەرگایەتی و ئاوارەیی و دەربەدەریی. هابەشی ژیانی خزمایەتی و کۆمەلایەتیم بوو. هاوبەشی ژیانی قۆناغەکانی خوێندن، رووناکبیریی، ئەدەبیی و پەروەردەییم بوو. هاوبەشی پەروەردەکردن و پێگەیاندن و گەورەکردنی مندالەکانم بوو، دەتوانم بلێم لە مەیاندا بەشی شێری بەرکەوتبوو، چونکە ئەوەندەی ئەو لەگەلیاندا دەبوو من نەمدەپەرژایە سەر ئەوەی بەزۆریی لەگەلیاندا بم. هاوبەشی مالداریم بوو لەم بوارەدا بەشێوەیەك هەلسوکەوتی دەکرد، وەکو ئابووریناسێکی تەواو حیسابی بۆ هەموو جۆرە دراو و زەخیرەو خواردنێك دەکرد. شتی بەفیڕۆ نەدەدا بەراست مالداری دەکردو دکتۆرو کەیبانوویەکی ئێجگار بەسەلیقەو وردبوو. بەخواستی من هەلسوکەتی لە مالداو لەگەل دەرو دراوسێ و خزم و کەسە ناسیاوەکاندا دەکرد، خانمانە بەپیری میوانەوە دەچوو، خاتوونانە بەرێی دەکردن. بەخواستی یەکتر بووبووینە هاوسەری یەکتر، رێزو خۆشەویستی یەکمان لابوو. بەداخ و ئەفسووسەوە بەهۆی نەخۆشییەکی درێژخایەنەوە لە (٢٠٠٩/٢/٢٣)داو دوای (٤٢)سال هاوسەری مال ئاوایی لە من و مال و مندال و خزم و کەسەکانی کرد...

لەماوەی ئەو چلودوو سالەدا لەگەل هەموو شیرینی و تالییەکی ژیانماندا، رۆژێ لەرۆژان لەگەل یەکدا هەلنەبەزینەوە، بۆ تەنها کاتژمێرێکیش قسەمان لەیەك دانەبڕی. من چەندە ئەوم خۆش دەویست و رێزم لێدەگرت، ئەو سەد قات رێزو خۆشەویستی منی لابوو. ژیانی دنیای بۆیە پێخۆشبوو کە منی تێدا دەژیام و بەیەکەوە دەژیاین. رۆژێ لەرۆژان قسەیەکی نەهێناو نەبرد. هەرگیز کارێکی نەدەکرد کە من پێم ناخۆشبێت و پێچەوانەی رای من بێت، شەو و رۆژ لە خەمی من و مندالەکاندا بوو، یان هەر کێشەو قسەو قسەلۆکێکی ببیستایەو بەرەو رووی ببووایەتەوە، بەمنی نەدەوت و نەیدەهێشت بیزانم. هەمیشە دەم بەپێکەنین و رووخۆش بوو، بە بەردەوامی بەرووخۆش و پێکەنینەوە هەلسوکەوتی لەگەلدا دەکردم. هەر

ڕۆژو کات و ساتێك بەهەر هۆیەکەوە بیزانیایە من لەسەر خۆم نیم و تووڕەم ئەو لەو کاتانەدا خۆی دوور دەگرت تا خاو دەبوومەوەو تووڕەبوونەکەم نەدەما.

کێشەی هیچ خزم و ماڵێکی نەدەهێنایە ماڵەوەو کێشەو گرفتی خۆمانیشی نەدەبردە دەرەوە. ڕۆژێ لەڕۆژان وەکو هەندێك ژن کە خۆیان بە مێردو منداڵیانەوە هەڵدەکێشن، ئەو خۆی بەمن و منداڵییەوە هەڵنەدەکێشاو ڕقی لەوانە دەبووەوە کە لافوگەزافیان لێدەداو خۆیان هەڵدەکێشاو حەزی بە تێکەڵاوبوونیان نەبوو. چارەی ئەوانەشی نەدەویست کە باسی خەڵکیان لا دەکرد. قازانج و خۆشیی حزم و کەس و دۆست و ناسیاوی دەویست، بەخیلی بەکەس نەدەبردو چاوی بەوانەدا هەڵنەدەهات بەخیلیان بەخەڵك دەبرد. ڕێزی هەموو خزمان و هاوڕێیانی منی لابوو. کەسی نەدەبیزران. قسەو قسەلۆکی بۆ کەس ڕێکنەدەخست، هەمیشە لەسەرخۆو دکتۆرو کەیبانووانە لەماڵدا هەڵسوکەوتی دەکرد. دەست و دڵپاکبوو. سەخی و بەخزمەت بوو. هەرسات و کاتێك میوانمان بهاتایە بەلایەوە زۆر ئاسایی بوو شپرزە نەدەبوو، خۆی گرژ نەدەکردو بێزاریی دەرنەدەبری. من چۆنم بویستایەو پێم خۆشبووایە را نان و خواردنی ئامادە دەکرد. بەڕووی گەش و پێکەنینەوە پێشوازیی لە میوانەکان دەکردو بەڕووی خۆشەوە بەپیریانەوە دەچوو. لەکاتی ماڵئاواییدا بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێی دەکردن.

بمانبووایەو نەمانبووایە نیگەرانیی پێوە دیارنەدەبوو. کارێکی نەدەکرد کە هەرگیز من دڵم ناخۆشبێت.

ساڵێك بوو بووبووینە هاوسەری یەك، بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندن چووم بۆ بەغداو چوار ساڵ بەجێم هێشت. لە یەکەم ساڵی خوێندنمدا (بەخشی) کوڕم وەکو نۆبەرە لە گەڕەکی مەجید بەگی شاری سلێمانی لە (١٩٦٩/١/٦)دا لەدایکبوو. بەبێ ئامادەبوونم. دوای چوار ساڵ خوێندن لە زانکۆی بەغداو تەواوکردنی خوێندن گیرام بەسەربازو ماوەی ساڵێکیش لە کەرکوك و بەغدا خزمەتی سەربازیم کرد، لەگەڵ خزمەتی سەربازییەکەدا کاری حزبیشم دەکرد. دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازیی بۆ کاری حزبیی هەر لە بەغدا مامەوەو لە بەغداوە چوومە دەرەوەو پەیوەندیم بە شۆڕش و هێزی پێشمەرگەوە کرد، لە ناوچەی چۆمان و گەڵاڵەو حاجی ئۆمەران... دوای ئەو هەموو دابڕانەمان لەیەك لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەتەواویی لەیەك دووركەوتینەوە ماوەی زیاتر لە شەش مانگ نەمتوانی لە شاری سلێمانی نزیکبمەوە، نە (زەینەب و نە منداڵەکانم) ببینم. ئەوانیش زۆر بەکەمیی هەواڵی منیان دەزانی. دوای ئەوەی لە چۆمان و ناوپردان ڕزگارم بوو، بەرەو ناوچەی سلێمانی گەڕامەوەو لە مانگی (١٩٧٤/٤)دا گەیشتمە ناوچەی قەرەداغ و چوومەوە شوێنی لەدایکبوونم (هۆڵە). زەینەب و منداڵەکان لە سلێمانییەوە هاتن بۆلام و (دایکم)یان لەگەڵدا هاتبوو. دوای ئەو ماوە درێژە لەگەڵ دایکم و زەینەب و منداڵەکان و کاکەم و کاك لەتیف-مدا بەیەك شادبووینەوە. ماوەی (١٠) ڕۆژێك بەیەکەوە ماینەوەو لەبەر ئەو ئەرك و کارانەی پێم سپێردرابوو لە شۆڕشدا ناچار بەجێم هێشتن و چووم بۆ قەرەداغ. دوای چەند مانگێك مانەوەم لە قەرەداغ و ناوچەکە

بەهۆی بارودۆخی ناوچەکەو شۆڕش و هێرشی ڕژێمەوە بەمەبەستی کشانەوە لە قۆپییەوە بەرەو (سۆلە) ڕۆیشتم و لە ئێوارەخوانێکی ئێجگار ناخۆش و لە ڕۆژگارێکی نەگریسدا لە سۆلە لە خانووەکەی خۆماندا زەینەب و کاکەم و منداڵەکانم بینییەوە، هەر لەو شەوەدا بەناچاریی بەجێم هێشتن. دوای دوو هەفتەو کاتێک گەیشتمە ناوچەی دۆڵە ڕووت و لە گوندی کانی گۆران و لە ماڵی (خاڵە ئەحمەدی خانیێ) لە بەیانییەکدا کاتێکمزانی کاکە لەتیفم و زەینەب و منداڵەکان پەیدابوون و بەیەك شادبووینەوە، دوای چەند ڕۆژ زەینەب وەکو ژنە پێشمەرگەیەك لە کانی گۆرانەوە بەرەو پێنجوێن کەوتینە ڕێ و لە پێنجوێن جێگیربووین.
محێدینی برام گەیشتە لامان و بەناچاریی ئەوانم لەگەڵ محێدیندا جێهێڵاو چووم بەپای کارمەوە... دوای ئەوەی کە زانیم شوێنی کاری پێشمەرگایەتیم دوورە لێیانەوە وام بەچاك زانی کە ئەوانیش بگوێزمەوە بۆ ناوچەی بیارەو خورماڵ. بەگوێزانەوەیان هەردوو لامان حەواینەوە، لەبەرئەوەی هەفتانە دەمتوانی دوو بۆ سێ شەو لایان بمێنمەوە، شارۆچکەی بیارەمان پێوە نەهات، لەبەرئەوەی کارەساتی هەرەس و بەپیلانێکی نێودەوڵەتیی ڕووبەڕووی شۆڕش و گەلەکەمان بووەوە، ناچاری ئەوە بووین لە بیارەوە بەرەو ئێران و ئۆردووگا بڕۆین و لە ئۆردووگای دوو ئاوان بۆ ماوەیەك نیشتەجێبووین و لەو ڕۆژگارە مەرگەساتەدا من گیانم بە کاك حەمەرەشیدی حاجی شەریفی باریکەیی و ئەویش گیانی بە سەبری خێزانی بوو. لەو ڕۆژگارەدا بوو بووینە هاودەنگ و هاودەمی یەکتر.
ڕۆژانی ئۆردووگای دوو ئاوان و سەریاس بیرناچێتەوە کە لەچ بارێکی دەروونیی ناخۆشدا دەژیاین.
ئای لەو ڕۆژەی بڕیاری گەڕانەوەمان داو ژیانی ئۆردووگامان واز لێهێناو بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە. خەمی زەینەب دوو خەم بوو. یەکەم: خەمی چارەنووسی من. دووەم: خەمی کەمدەرامەتیی و بێشوێنیی و بێ ناوماڵیمانی بوو. لەو ڕۆژگارە خەماوییانەدا (ژێر)مان لەدایك بوو. بەدوایدا ڕەوانەی خوارەوەی عیراق کراین و لە قەزای حەیّ پارێزگای واست گیرساینەوە. زەینەبێکی نەخوێندەواریی، بەبێ ئەوەی یەك وشەی عەرەبی بزانێت، لەئێرانەوە یەکسەر بۆ شارێکی عەرەبنشینیی و لە گەڕەکێك بەناوی (حەیلتەگراد)ی قەزای (حەی) پارێزگای واست بگیرسێتەوە. ماوەی زیاتر لە (٥) ساڵ لە خانوویەکی دوو نهۆمیی ماڵێکی کوردی فەیلی و لەگەڵ خێزانێکی کوردی فەیلیدا ژیان بەسەربەرێت و هەر لەو خانوو و ماڵەدا بەبێکەسیی منداڵێکی لە کۆش بکەوێتە خوارەوە بە ناوی (بلێسە). سەیر لەوەدا بوو لەگەڵ ئەوەی کە عەرەبیشی نەدەزانی و ئەو خێزانەی لەگەڵیاندا دەژیاین و ماڵەکانی دراوسێشمان هەرهەمووی کوردی فەیلی بوون و لە ماڵەوەیان بەشێوە زمانی کوردی خۆیان دەدوان. لەو ساڵانەدا ئەوەندە تێکەڵاوی خێزانمان بوو. فێری شێوە زمانەکەیان بوو، بەڵام عەرەبی زۆر بەکەمیی دەیتوانی قسەی پێ بکات و فێری عەرەبی نەبوو.
کاتێك دوای پێنج ساڵ لە ئاوارەیی و دەربەدەریی گەڕاینەوە سلێمانی. لەگەڵ گەیشتنەوە،

کەوتمەوە خەباتی سیاسیی و بەنهێنی لە ریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا کارم دەکردو بە بەردەوامی هاورێیان دەهاتنە ماڵمان و کۆبوونەوەمان دەکردو نووسراو و بڵاوکراوەمان لەماڵدا بوو.

زەینەب وەکو هاوکارو یارمەتیدەرێکی زۆردڵسۆز بەوپەڕی توانای یارمەتی دەکردم. بەرێزو زیرەکانەوە بەرووی خۆشەوە پێشوازیی لە هاورێیان دەکردو شتی لێوەردەگرتن و شتی پێدەدان و بەرێی دەکردن.

ئەو ساڵانەی کە بۆ خزمەتی ئیحتیاتی سەربازیی بانگکرامەوەو ئەو هاوینەی کە بۆ سەربازگەی دبس بۆ جەیشی شەعبی رەوانەکرام. زەینەب هەمیشە لە خەمی منداڵبوو. خەمی منداڵەکانیشی بەسەردا کەوتبوو.

لە رۆژانی مەرگەساتی ئەنفالدا لەگەڵ مندا خەم و ئازاری دەکێشا، کاتێ ساڵی (۱۹۹۰) کەوتمە بەر شاڵاوی (ئەنفالی رێکخستن)ی ناوشارو لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکرام، دوای نۆ مانگ بەپێی مەحکەمەیەکی سەرپێیی مەحکەمەی بەناو سەورەی رژێم بە حوکمی موئەبەد حوکمدرام و رەوانەی بەندیخانەی ئەبوغرێب کرام.

زەینەب لەهەموو مواجەهەکاندا بەکۆڵ و بارەوە خۆی دەگەیاندە لام و کە دەهات جگە لە پێداویستی رۆژانەم چەندین نامەی جۆراو جۆریشی بۆ دەهێنام، بەو نامانە هاوکارییەکی زۆرباشی دەروونیی دەکردم. کاتێکیش لە زیندان ئازادکرام و گەرامەوە ناو ماڵ و منداڵ زەینەب تۆزێك حەوایەوەو ئاهێکی خۆشیی هەڵکێشا.

ئەو ساڵانە کەوتە خۆشییەوە، هەرچەند من لەسەر ئیش و کاری حزبیی کەمتر دەکەوتمە ماڵەوە، بەڵام ئەوم دڵخۆش و بەختەوەر دەبینی. کاتێك لە شەری نەگریسی ناوخۆدا پێکرام و بەسەختیی بریندارکرام، زەینەب رۆژانە کە دەهات بۆلام شەپۆری خۆی بەقوڵپی گریان و فرمێسك هەڵرشتن دەکرد. ساڵانی دوای شەری خۆکوژیی باری ژیانمان گۆراو بووینە خاوەنی خانووی سەربەخۆی خۆمان و منداڵ پێگەیشتن و باری ژیانمان باش بووبوو. زەینەب لەوپەری خۆشیی و دڵخۆشیدا دەژیاو لەو سەردەمی خۆشیی ژیانەماندا، دایکم بەهۆی نەخۆشییەوە کەوتە ئەرزو بەزۆریی کە لەماڵمان دەبوو، لەبەرئەوەی زەینەب ئامۆزایانەو بەسۆزانە بەدەمییەوە دەچوو، زۆر لە زەینەب و ماڵمان رازی بوو. بە بەردەوامی دەست بەنزابوو بۆی.

دوای کۆچی دایکم، بەچەند ساڵێك زەینەب دووچاری نەخۆشییەکی درێژخایەن بوو. لەوکاتی نەخۆشیی و ئازاری نەخۆشییەشدا بەتواناو رێخۆڵەکێش و خۆراگر بوو، بەڵام یازووخ لە (۲۰۰۹/۲/۲۳)دا ماڵ و حاڵ و من و منداڵەکانی بەجیهێلا. بۆیە جێی خۆیەتی لەم کتێبەدا بەم نووسینە وەفای ئامۆزایی و هاوسەرێتیمان پێشکەش خوێنەرانی کتێبەکەم بکەم. بۆ کۆچەکەی ئەم کۆپلانەم نووسیوە:

داخ و خەمی دووریی ڕۆڵەکانت
هەناوتی ڕەشهەڵگەڕاند
ئازاری گیان و دەردی بێدەرمانت
گوڵی ژینتی هەڵوەراند
حەوت خۆزگە لە ناختا بوون
شەو و ڕۆژ دەتوتنەوە
مەرگی ناوادەت وەها بوو
هەرهەمووی بیرچوونەوە
گیانە نازانم
لەکام کلافەی ژانەکانمەوە
دەستپێبکەم
لەکوێوە باسی چی و چی بۆ کۆچی
ناوادەت بکەم
تۆ تەمەنی کۆچت نەبوو
تۆ زەمەنی ئاوابوونت نەبوو
تۆ هێشتا لە شێخەڵی تەمەنتا بوویت
تۆ... تۆ لە شێخەڵی تەمەنتا بوویت.

## بەخشی

نۆبەرەی ژیانی هاوسەریمان و کوڕی گەورەمان لە (١٩٦٩/١/٦) لەدایکبووە. دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی کە بەشێکی لە قەزای (حەی) لە پارێزگای واسط بوو، بەشەکەی دیکەی لە سلێمانی و ناوەندیی و ئامادەیی لە سلێمانی تەواوکردو لە ساڵی (١٩٨٨) لە پەیمانگای تەکنیکی زانکۆی موصل وەرگیرا. ئەوکاتەی من کەوتمە بەر شاڵاوی گرتن، ئەو دوا ساڵی خوێندنی پەیمانگاکەی بوو. لەدەوامکردنییەوە تا دەستگیرکردنم من بە بەردەوامی وەکو باوکیان هەمیشە لە خەمیدابووم و هەوڵمدەدا کە لەو شارو زانکۆو پەیمانگایە بێخەرجی نەبێت و خواردەستی هاورێکانی نەبێت و لەو رۆژانەی خوێندنیدا رووبەڕووی ناخۆشیی و گرفت نەبێتەوە. هەرجارێك رێم بکەوتایەتە موصل، دەبوو سەری لێبدەم و دڵخۆشی بکەم. بەهۆی دووریيەکەیەوە دایکی هەمیشە لە پەژارەیدا بوو. دڵی بەوە خۆشبوو دیوت شوکر بەهەڵپەیەو دەستەوەستان نییەو دەتوانێت بەباشی خزمەتی خۆی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا پێی دەوتم باوکی (بەخشی) بەخشی پشتگوێ مەخە... بەخشی سەری لە بازارو دووکانداریی بەباشی دەردەچوو. دووکاندارێکی خاوەن موشتەری زۆر بوو. ئەو ساڵانەی لەبەرئەوەی (مامە محیدین)ی کرا بە سەرباز بەناچاریی خوێندنی وازلێهێناو بووە دووکاندار لە قەیسەری نەقیب بۆ یارمەتیدانم لە کڕین و فرۆشتندا چاونەترس بوو.

کاتێك من دەستگیرکرام و ئەو دوور لە ماڵ و شارو بێئاگا لە هەواڵ و دەنگوباسی دەستگیرکردنم شپرزەی دایکی و براو خوشکەکانی مام و پوورەکانی بووە. چەند ستەم و ناخۆشە لەرێگای هاورێیەکییەوە هەواڵی دەستگیرکردنی باوکی پێ بگات. دەبێت لەو سات و کاتەی بەچرپە هەواڵەکەی دراوە بەگوێدا چی کردبێت و کەوتبێتە چ حاڵێکی دەروونیی ناخۆشەوە؟ بێگومان ناخۆشترین و دڵتەنگترین هەواڵی دراوە بەگوێدا.

چی بکات؟ چۆن بێتەوە بۆ ماڵەوەو راستیی ئەو هەواڵە بزانێت و سەر لە دایکی و خوشك و براکانی بداتەوە؟

ئای لەو رۆژەی کە دەگاتەوە سلێمانی و دەگاتە بەرماڵ و لە دەرگا دەداو کەس نایکاتەوەو ماڵی مامی دێن بەدەنگییەوەو دەیبەنە ژوورەوەو راستیی هەواڵەکەیان لێوەردەگرێت و دەیەوێت بە هەرنرخێك بووە خۆی بگەیەنێتە دایکی و براو خوشکەکانی ببینێت. ئەوساتەی خۆی دەگەیەنێتە ماڵی خاڵە عەلی و باوەش بەدایکیدا دەکات و بەجووتە شەپۆر بۆ من دەکەن.

ئیتر بەخشی تۆو موسڵ و بیرکردنەوەو خەم و هەناسە هەڵکێشان... تا کۆتایی ساڵ و تەواوکردنی خوێندن و گەڕانەوە بۆ سلێمانی.

دوای تەواوکردنی خوێندن، خزمەتی سەربازیی یەخەی پێدەگرێت و پێی ڕێی دانا بچێتە سەربازیی و بەخێرایی و بەناسنامەی ساختە ئەو ساڵە خۆی حەشاردەدات و جارجارە هاوکاریی

(مامە محیدین) لە دووکانداریدا دەکات.

کاتێ حوکمدرام و چوومە ئەبوغرێب، بەخشی لەبەر بازگەکان نەیدەتوانی سەرم لێبدات، تەنها بەنامە چاوی پێم دەکەوت و چاوم پێی دەکەوت و ئەملاو ئەولام ماچ دەکرد. لەیەکەم یان لە دووەم مواجەهەدا سەعاتێکی بەدیاریی بۆ ناردم و تائێستاش ئەو سەعاتە وەکو یادگارییەکی (بەخشی) هەرماوەو بەنیاز نیم لەناوی بەرم، هەرچەندە ئیش ناکات.

لە ساڵی (١٩٩٧)ەوە سەری خۆی هەڵگرت و ئێستا لە وڵاتی سویسرا گیرساوەتەوەو ژنێکی پورتوغالی هێناوەو کوڕێکیان بەناوی (بروز)هەیە، بەڵام لەو ساڵەوەی ڕۆیشتووە نەهاتووەتەوەو تەنها بەنامەو تەلەفۆن پەیوەندیی لەگەڵماندا هەیەو لە ساڵی (٢٠٠٥) بۆ ماوەی هەفتەیەك لە ئەڵمانیاوە سەردانێکم کردو تاسەی باوك و کوڕیمان لەیەك شکاو هەر بەنیازی ئەوەین سەرمان لێبداتەوە، بەڵام بۆی نەڕەخساوەو تەنانەت لە کۆچی دایکیشیا هەر نەیتوانی سەرمان لێبداتەوە، تائێستاش من لەخەمی ئەودام و وەکو باوك، هەرچەندە دوورە، بەڵام شێوەو دەنگ و ڕەنگیم هەر لەبەرچاوە.

## ئازاد

لە (١٩٧١/٦/٢٨) لە گەڕەکی مامۆستایانی سلێمانی و لە ڕۆژگاری ئاهەنگ و خۆشیی بەیانی ئازاری ١٩٧٠-دا لە باوەشی (زەینەب)ی دایکیدا چاوی کردەوە. کوڕی دووەمم بوو. لەسەر خواستی مەلا حسێنی دراوسێمان و بەبۆنەی ئازادیی ئەوددەمی بەیانی ئازارەوە بۆ کوردستان ناوم نا (ئازاد).

قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لە قەزای حەی پارێزگای واست دەستپێکردو لە سلێمانی تەواوی کرد. قۆناغەکانی ناوەندیی و دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکرد. کاتێك من دەستگیرکرام لە پۆلی شەشی ئامادەیی بوو. ساڵی ئەوەی بوو کە نمرەی باش بهێنێت و بچێتە کولییەیەکی باش، بەڵام دەستگیرکردنی من بەرنامەی خوێندنی لێ تێکداوە. کوڕێکی وردو زیرەك و حەزی لە خوێندنەوەیە. من نازانم باری دەروونیی ئازاد چۆن بووە، بەڵام دیارە بمانەوێت و نەمانەوێت لەوپەڕی خراپیدا بووە، چۆن کوڕێك باوکی لەلایەن دائیرەی ئەمنی ڕژێمێکی فاشییەوە بگیرێت لەسەر خەباتی سیاسیی و کوردایەتی و پەیوەندی بوونی بە(ی.ن.ك)ەوە، چۆن شەو و ڕۆژ لەبیرکردنەوەی باوکیدا نابێت و لەکردنەوەی هەر دەفتەرو کتێبێکداو لە خوێندنەوەی هەر دێڕێکدا وێنەی باوکی نایەتە بەرچاو و خەم و پەژارەو خەفەت دایناگرێت.

چەندم بەلاوە قورس و گران بوو کە ئەو ڕۆژەی لە مانگی (٢)دا بردیانمەوە بۆ ماڵەوە بە مەبەستی پشکنینی ماڵمان لەبەر دەرگا چاوم بە ئازاد کەوت دەچووەوە بۆ ماڵەوەو زۆر ترس و خەم کەوتە دڵمەوە، کە ئەویش دەگرن و خوێندنەکەی لەکیس دەچێت و لە دڵی خۆمدا دەموت بۆ لەم کات و ساتەدا چووەوە بۆ ماڵەوە؟ خۆزگە نەدەچوو و نەشم دەبینی.

خۆشبەختانە بەزیرەکیی خۆی لە پشکنینی ماڵەوەدا لەگەڵیاندا بووبوو، بەشێوەیەك هەڵسوکەوتی کردبوو کە بیریان لەوە نەکردبووەوە راپێچی ئەمنی بکەن و بیگەیەننە لای من.

دوای تەواوبوونی (تەحقیق) لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدان و وەرگرتنی ئیفادە لەلایەن حاکمەوەو گواستنەوەم لە ژووری (٢)ەوە بۆ هۆڵی (٥)و لە رۆژێکدا بانگکرامە خوارەوە. دوای ریشتاشینێکی ناخۆش بردیانم بۆ شوێنێك، کاتێ چووم شوێنەکە سەیرمکرد (زەینەب و ئازاد) لەسەر قەنەفەیەك دانیشتوون و لەگەڵ منیان بینی بەرزەپێ هەڵسانە پێ و بەجووتە باوەشیان پیاکردم و هەردووکیان بەشێوەیەك پیاما دەنووسان نەمدەزانی کامیان ماچم دەکات و کامیان ماچ دەکەم.

کاتێکیش بردیانە ژوورەوە بە ئازاد وترا باوکت بەرە بۆسەر ئەو مەغسەلە با دەموچاوی بشوات، ئازاد وەکو کور راپەڕی و لەگەڵما هەستاو لەگەڵ (رەحیم) بردیانمە سەر مەغسەلەکەو دەموچاومی شۆردو لەکاتی دەموچاو شۆردندا رێنماییم کرد، ئەویش بەپەلەو لەسەرخۆ هەندێ هەواڵی دامێ.

چەندم بەلاوە خۆش بوو نەترسانە وەڵامی ئەمنەکانی دەدایەوەو بە عەرەبی قسەی دەکردو هەولیدەدا دایکی قسە نەکات، نەوەکو لە قسەکردندا هەڵەیەك بکات. ئای ئەو یەکتربینین و چاوپێکەوتنەمان لەو رۆژو کات و ساڵەداو لەو شوێنە چەند خۆشبوو، چەند گرنگ بوو بۆ ئەوانێك کە لێیان روونبووبووەوە کەماوم و نەکوژراوم. بۆ منیش زۆر خۆشبوو کە چاوم بە زەینەب و یەکێك لە کورەکانم کەوت.

کاتێك لە مانگی (٨)ی ساڵەکەدا لەسەر فەرمانی سەدامی دکتاتۆر بریاری ئەوە درا، ئەو کەسانەی لەلایەن دەزگاکانی ئەمنەوە زیندانیی دەکرێن، دوای ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوە و تەواوبوونی تەحقیق و وەرگرتنی ئیفادە لەلایەن حاکمەوە، ئەگەر حوکمیش نەدرابن، دەتوانن کەسوکاریان سەردانیان بکەن و بیانبینن.

ئای لەو رۆژەی کە نەقیب ماجد بانگیکردم و دایمە پێش و بەناو حەوشەی ئەمنە سوورەکەدا بردمی گەیاندمیە ژوورێك و داینام، کاتێکمزانی کاکە عوسمانم، هێرشی پوورە حەلاو، (ئازاد، ژیر، بلێسە، شێتێ) هاتنە ژوورەوە.. هەرچەندە مواجەهەکە زۆر کەم بوو، بەڵام چێژی خۆی هەبوو. کە وتیان مواجەهە تەواو، پێی رێی دانەدەگرت بروات راوەستابوو، دەیویست قسە بکات و تێیان بگەیەنێت کە رێگا بدەن با بۆ چەند دەقیقەیەك بێ لەگەڵمان بێت، بەڵام هێمنیی ئەو، بەتورەبوونی ئەمنەکان شلەژاو لەپڕ لەبەرچاوم ونکران. ئەو مواجەهەیە لە خەوبینینێکی زۆر کورت دەچوو. کاتێ حوکمدرام و چوومە بەندیخانەی ئەبوغرێب لە یەکەم مواجەهەدا، یەکەم کەس هاتە ژوورەوەو گەیشە لام (ئازاد) بوو. بەدوایدا زەینەبی دایکی وەکو کوری گەورەم لە ساحەکە رادەوەستاو پێشوازیی لە میوانەکانم دەکردو لەگەڵ رۆیشتنیاندا بەرووخۆشییەوە بەرێی دەکردن. (ئازاد) لە یەکەم

مواجەهەوە هەموو مواجەهەیەکی (١٥)ی مانگ و سەری مانگ لەگەڵ دایکیدا دەهات و لە هاتنەکەیدا کۆڵی قورس بەشی ئەو بوو. ئازاد پۆلی شەشی تەواوکردبوو. لە پەیمانگایەك لە کەرکوك وەرگیرابوو.

دەوامی پەیمانگاکەشی دەکردو لە مواجەهەکانیشدا دەهات بۆلام. کاتێك ئازادبووم خوێندنەکەی گواستەوە بۆ پەیمانگای تەندروستی سلێمانی و بووە خاوەنی بڕوانامەی دبلۆم، لە پەیمانگاوە ماوەیەك وەکو کارمەند لە ڕێکخراوێك کاری دەکرد. دواجار بەیاریدەدەری پزیشك دامەزراو زۆری حەز لە خوێندنەوە بوو، بە بەردەوامی کتێبی دەخوێندەوە لە زمانی عەرەبی و کوردیدا زۆر باش بوو، ئەوەندەش خەریکی زمانی ئینگلیزی دەبوو لەوێشدا بەتەواویی فێری زمانی ئینگلیزی بووبوو. لەکاتی ئازادکردنی عێراقدا لە ساڵی (٢٠٠٣) بەوەرگێڕ لەگەڵ ئەمریکییەکاندا کاری دەکردو لە کارەکەیدا زۆر سەرکەوتوو بوو، ژنی هێناو لە ژیانی هاوسەریدا توانی کۆلیژی زمانی ئینگلیزی لە زانکۆی سلێمانی تەواو بکات و ببێتە خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس و ماوەیەك لە ئەنجومەنی وەزیران لە پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەن کاری دەکرد، لە بواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتدا ئێجگار شارەزاو کاراو وردبوو.

ساڵی (٢٠٠٧) کە لەگەڵ دایکی و خێزانیدا چووین بۆ عەممان، لەوێ وەکو ئوردنییەکان قسەی دەکردو لەگەڵیان دەدوا. ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بووین، ئەو وەکو موتەرجیمێك لەگەڵماندابوو.

بەهۆی ئەوەی زۆری حەز بەکۆرپەیەك دەکرد کە لە باوەشی بگرێت، کەڵکەڵەی دەرەوەی کەوتە سەرو لەرێگای یوئێنەوە چووە تورکیاو دوای دوو ساڵ زیاتر لە وڵاتی ئەمریکا جێگیربوو، بەهۆی ئەو ڕۆیشتنەیەوە لەکاتی کۆچی دایکیدا لامان ئامادە نەبوو. دیارو ئاخری دایکی بوو.

## بەهار

سێیەم منداڵ و کچی گەورەم بوو، زەینەب زۆر بەئاواتەوە بوو دوای دوو کوڕ، کچێکی ببێت.

هەموو جار دەیوت: (کچ بۆ دایکە، دایك کەڵك لە کچ وەردەگرێت). لەسەر خواستەکەی زەینەب بەهار لە بەهاری ساڵی(١٩٧٣) لە ڕۆژی (٢١/٤)دا ئاواتەکەی دایکی هێنایە دی. بەهار هەر دایکی دڵی پێی خۆش نەبوو، بەڵکو من لەو زیاتر دڵم پێی خۆشبوو. وام دانابوو لە پاشەڕۆژدا دەبێتە کۆلەکەیەکی پتەوی ماڵەکەمان و یارمەتیدەرێکی زۆر باشی دایکی دەبێت.

ساڵی (١٩٧٤) کە چوومە دەورەوەو بووم بە پێشمەرگە، بەهار (٨) مانگ نەبوو، کاتێك لە

هاوینی ساڵی (١٩٧٤) لەگەڵ دایکی و بەخشی و ئازاد لە سلێمانییەوە هاتنە دەرەوە بۆلام، تەمەنی گەیشتبووە ساڵێك و چوارمانگ... ئەو ماوەیەی لە پێنجوێن مانەوەو لانکی نەبوو. دایکی وتی: بەهار بێلانك هەڵناکات. بەهەر نرخێك بوو لانکێکم بۆ دابینکرد.

کە لە پێنجوێنەوە گوێزرامانەوە بۆ بیارە. بەهار گەورە بوو، قسەی بۆ دەکردین و بەناوی خۆمان دایەو بابە بانگی دەکردین، بەو گەورەییە هەر لە لانکەکەیدا دەحەوایەوەو سەیر لەوەدابوو، بە بەردەوامی (پەنجەکەڵەی) دەمژی و ئەگەر تاڵێك قژی دایکی بەردەست نەکەوتیایەو لەناو لانکەکەیدا تاڵی گوڵنکەی دەسترازەی لانکەکەی تووند لەمشتیدا دەگرت و بەوشێوەیە دەنووست، کە بەئاگاش دەبوو هەربەری نەدەدا... ئەو ماوەیەی دایکم لە سلێمانییەوە هات بۆلامان، ماوەیەکی باش لامان مایەوە، کە بەهۆی نەخۆشییەوە نەبرایە نەمان دەهێشت بڕواتەوە، بەهار ئالودەو هۆگری بوو، هەر لە لانکەکە دەریان دەهێنا یەکسەر خۆی بۆ باوەشی دایکم دەکوتاو دایکیشم نەنکانە لە باوەشی دەگرت و دەستی بەسەرو قژیدا دەهێناو یەك لەسەر یەك ماچی دەکردو بەقوربانی دەبوو. باش دێتەوە یادم (شەهید شێرکۆی شێخ عەلی)، کە ئەوکاتە بەرپرسی (لیژنەی ناوچەی قەرەداغ) بوو، بارەگای ناوچەمان لە خورماڵ و دێی ئەحمەدئاواو قەسرەکەی ناو سەیرانگاکەی ئەحمەدئاوادا بوو، جارجارە سەری لە ماڵمان دەداو بەسەری دەکردینەوەو بەزینەبی دەوت برنج و شلەیەکی شارییانەمان بۆ لێنێ، ئەوەندەمان نانی بێتام و چێژی ناوچە خوارد، خەریکە نانمان لەپێش چاو دەکەوێت، ئەویش بەپێکەنینەوە پێی دەوت: جا ئازابن هەموو ڕۆژ وەرنەوە، با نانی باش و خۆشتان بۆ بکەم. ئەویش دەی وت: بەخوا من و شێخ محەمەد ئەوەندە ئازا نین.

ئەوکاتە زەینەب خەریکی خواردن دروستکردن دەبوو بەهاری لە لانکەدا دەپێچایەوە. بەهار بەژن و باڵای هەبوو، هەردوو قاچی لە لانکەکەوە دەردەچوو، کە بەئاگاش دەبوو دەدە قسەی دەکردو پەنجەی دەمژی.

کاك شێرکۆ وتی: ئەم کچەی ئێوە وەکو کوڕێکی لای ئێمە وایە بەقسە پیاوێکی گەورەیە، بەڵام بەلەش و لاروکردار بێتوانایە. دەیوت زۆر کەس کە دەچێت بۆماڵیان و لە دەرگا دەدەن، لە ژوورەوە بانگیان دەکات و پێیان دەڵێت دەرگاکە کراوەتەوە، فەرموون وەرنە ژوورەوە، خۆ بەناشوکریی نەبێت من ناتوانم بێم بەدەنگتانەوە، ئەم کچەی ئێوە بە بەژن و باڵاو قسەکردن گەورەیە، کەچی هەر لە لانکەدایە...

بەهار هەرچەندە لە ساڵ و ڕۆژێکی خۆشدا لەدایکبوو، ساڵەکە ساڵی بەیاننامەی (١١)ی ئازارو جۆرە ئازادییەکی گەل و نیشتمانەکەمان بوو، بەڵام تەمەنی گاگۆڵکەکردن و گمەگمەی قسەکردن و پێگرتنی لەناو گەرمەی شۆڕش و زەمەنی پێشمەرگایەتی ئازادیدابوو، کاتێکیش بەتەواویی کەوتە سەرپێ و دەیتوانی بەپێ و لەسەر قاچی خۆی بەناوماڵدا بگەڕێت، سەردەمی نسکۆو دەربەدەریی و ئاوارەیمان بوو. کاتێ لە سلێمانییەوە چووین بۆ قەزای حەی، تەمەنی بەهار دوو ساڵ و شەش مانگ بوو. گوڵی دەمی بە وشەی

عەرەبی و شێوە کوردی فەیلی کرایەوە، لەو ئاوارەیی و دەربەدەریی و بێکەسییە، بەراستیی هاوەدەمێکی ئێجگار باشبوو بۆ دایکی... بەهار لە حەی تەمەنی گەیشتە ئەوەی بچێتە قوتابخانە لەگەڵ بەخشی و ئازاددا ناردمنە قوتابخانەی (ئیبن جبێر)و لە پۆلی یەك دەستی بەدەوامکردن کرد، تا پۆلی دووی لەو قوتابخانەو شارە تەواوکردو گەراینەوە بۆ سلێمانی و کوردستان و بردمنە قوتابخانەیەك کە خوێندن بە عەرەبی بوو تیایداو پۆلی شەشیان لەو قوتابخانەیە تەواوکرد.

ئیتر بەهار بوو بە بەهاری ماڵ و لە زۆر ئەرك و کاری ناوماڵدا کچانە یارمەتی و هاوکاریی دایکی دەکرد، بەهار ساڵ بەساڵ گەورەبوو بوو بە کچ و بەهاری ماڵمان و بوو بە خوشکی چوار براو تاقانە کچمان بوو. چۆن دایکی ئاواتی دەخواست کچێکی ببێت، ئەمیش ئاواتی دەخواست خوشکێکی تری ببێت و ببنە دوو کچ...

لە (۱۹۸٦/۱۲/۲۹) دووەم کچمان لەدایکبوو ناومانا (شێنێ) بوو بە هاودەم و دەستەخوشکی بەهارو بەهار بە شێنێ زۆر دڵی خۆشبوو. لە پەروەردەکردن و خزمەتکردنیدا بەوپەڕی تواناوە یارمەتی دایکی دەداو بەسۆزییەکی زۆری بۆی هەبوو.

کاتێك لە ئێوارەی (۱۹۹۰/۱/۲٤) من کەوتمە بەرشاڵاوی دەزگای ئەمنی سلێمانی، بەهار چووبووە پۆلی شەشی زانستیی و لە ئامادەیی شیرینی کچان دەیخوێند. کە دەستگیرکرام، من لە خەمی ئەو و ئازادو منداڵەکانی دیکەدا بووم. لەبەرئەوەی ئازادو بەهار هەردووکیان لە پۆلی شەشی ئامادەیی بوون. دەمزانی کاریگەریی راستەوخۆی لەسەریان دەبێت، دیارە بەهەمان شێوەی من ئەوانیش لە کۆست و خەمی باوکیاندابوون. خوێندکار بەو لەپۆلی شەشەی ئامادەیی بەو تاقیکردنەوەی بەکالۆریت هەبێت و باوکیشت لەلایەن دەزگایەکی رەفتار درندەئاسا راپێچی زیندان کرابێت. ئیتر خوێندکار چۆن دەتوانێت وانەکانی بخوێنێت و هەمیشە بەردەوام لە خەم و خەیاڵی باوکیاندا بن، دیارە ئەوان لە پۆلەکانیانداو لەکاتی کۆششکردنیاندا هەر لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی باوکیاندا بوون، باوکت بگیرێت، لە ماڵ و حاڵی خۆت نەمێنێت لەم ماڵەو ماڵ و بەبێ نازو خواردنی دایك و ماڵی خۆیان، چۆن دەتوانیت بخوێنی و نمرەش بەدەستبهێنیت؟

پێش ئەوەی بمانبەن بۆ دادگاو حوکممان بەسەردا بدەن، لە ئەمنی سلێمانییەوە بەدوو براو هاورێی تێکۆشەرو کوردپەروەردا کە یەکێکیان کاك مەجید سەلیم و ئەوی دیکەیان کاکە مەجیدی شێخ حەمە مینی پورزام بوو، لە مانگی ٥/۱۹۹۰-دا ئازادکران، رامسپاردبوون کە ئازادو بەهار ئەوساڵە بەشداریی تاقیکردنەوەی بەکالۆری نەکەن، بۆ ئەوەی دەستگیرکردنەکەم نەبێتە هۆیەك بۆ کەمکردنەوەی نمرەکانیان.

کاتێك حوکمدراین و لە مواجەهەکاندا هاتن بۆلام، هەردووکیان پێیان وتم لەسەر راسپاردەکەی تۆ خۆمان هێشتووەتەوە.

کەم مواجەهە رێکدەکەوت، بەهارو ئازاد نەیەن بۆلام و هەر یەکەشیان کۆڵی قورس بۆ

باوکیان هەڵنەگرن. سەردەمی راپەڕین و ئازادکردنی سلێمانی و چەند شارو شارۆچکەیەکی دیکەی کوردستان. لە مواجەهەکاندا بەهار لاپەڕەی رۆژنامەو هەواڵەکانی کۆدەکردەوەو بۆی دەهێنام و بەو دیارییانەی ئاهێکم پێدا دەهات و پێی دڵخۆش دەبووم. ئای! لەو رۆژانەی مواجەهەیە، کاتێك لە بەندیخانە ئازادکرام و لە ئازادیی کوردستاندا گەیشتمەوە ناویان، بەهار بەوپەڕی توانای یارمەتی دایکی دەداو ئەرك و کاری ماڵەوەی بەڕێ دەکرد. تەنانەت نانیشی لەگەڵدا دەکردو باری سووك دەکرد.

ئەو ساڵەی ئازادبووم، ئەوانیش خوێندنی ئامادەییان تەواوکردو بەهار لە پەیمانگای ئیدارە-بەشی تەندروستی وەرگیرابوو خۆ ئەگەر ساڵی یەکەم من رێگرییم لینەکردنایە بۆ بەشداریکردنیان لە تاقیکردنەوە، دڵنیام لەوساڵەدا لەگەڵ ئەو هەموو بارە ناهەموارو ناخۆشەی ژیانیاندا، نمرەی زیاترو باشتریان بەدەستدەهێناو لە کولییەش وەردەگیران.

کاتێك لە شەڕەکانی ناوخۆدا من برینداربووم و ئەو شەوەی کە نەشتەرگەرییان بۆکردم و بۆ بەیانییەکەی زەینەب لەگەڵ بەهارو منداڵەکانی دیکە گەیشتنە لام لە نەخۆشخانە، باسی زەینەب ناکەم کە چی کرد، باسی بەهار دەکەم کە لە چارەکە سەعاتێکدا دەجار پەلاماری دەدام و ماچی دەکردم و ئاو بەچاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوەو لەیەك پێ دەیوت: (بابەگیان) تووخوا چۆنی؟ بۆ وات لێهات خوا ئەو کەسە کوێربکات کە ئەو گوللەیەی ئاراستەی تۆ کرد. کە ئازادبوویت دڵمان خۆشبوو، ئیتر لە ناخۆشیی رزگارمان بوو نەمانزانی لە ئازادیی کوردستانیشدا بەشی ئێمە برینداربوونی تۆمان بەردەکەوێت.

زۆرم دڵ بە بەهار خۆشبوو. لەبەرئەوەی یەکێك بوو لەو منداڵانەم بەردەوام هاوڕێی کتێب و خوێندنەوە بوو. لە هەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزیدا بەتوانا بوو. کاتێ پەیمانگای تەواوکرد، دامەزراو لە ژیانی وەزیفیدا چەند فەرمانگەیەکی کردو دوا دەزگای حکومیی کە کاری تێدا دەکرد سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی بوو. لە زانکۆوە چووە کۆلێژی کۆمپیوتەرو ساڵێك خوێندی.

زۆرم حەز بەوە دەکرد بەهار تووشی هاوسەرێکی باشبێت و لە هاوشانی بیرکردنەوەکانیدا بێت.

ئەوەی نە من و نە دایکی لە خەیاڵما نەبووبێت ئەوە بوو، کە (عەزیزی برازا)م زات بکات و بێتە خوازبێنی و ئەنجام بۆ یەك بن و ببنە هاوبەشی ژیانی هاوسەریی و خێزانی و بەو هۆیەوە وازی لە خوێندنی زانکۆی هێنا.

کاتێك لە (٢٠٠٩/٢/٢٣) زەینەب لە ماڵەکەم ماڵئاواییکرد، بەهار لە ئەڵمانیاوە تەلەفۆنی لەگەڵ مندا دەکرد لەسەر خەمی خۆیەوە دڵی منی دەدایەوەو پێی دەوتم: باوکە گیان دایکم رۆی، بەڵام تۆ ئاگاداری خۆت بەو بە تەلەفۆن بە یەکەیەکەی منداڵەکانی دەوت ئاگاتان لە باوکم بێت.

ساڵی (٢٠٠٩) کاتێك لەگەڵ عەزیزو هەردوو کوڕە جوانەکەیان (پەرۆش و پەیوەست)

گەرانەوەو ماوەی دوو مانگ مانەوە، چەند دڵخۆشبووم کە دوو کچەزای خۆمم بینی و لە ماچکردن و لەباوەشکردنیان تێر نەدەبووم و بەهاریش هەر هاتەوە، کەوتە مشورخواردن بۆم، کە نابێت بێزاربم و کچ و کورەکانی رازیکرد بۆئەوەی من ژن بهێنمەوە.
کاتێك ژنم دیاریکردو پێم راگەیاند لە تەلەفۆنەکەدا، لەخۆشییاندا پێدەکەنی و پیرۆزبایی گەرمی لێدەکردم.
بەهار ئێستا هەرچەند لێمەوە دوورەو لە وڵاتێکی ئەورووپی وەکو ئەڵمانیایە، بەڵام لێم دانابڕێت و بە بەردەوامی لەگەڵماندایەو بەهار بەڕاستیی بەهاری باوکیتی.

## ژیر

ئای لەو رۆژگارو ساڵەی ژیر خۆی بۆ ژیانی پرمەرگەساتی کوردستان و کۆمەڵگای کوردەواریی سازو ئامادەکردو ئای! لە رۆژو رۆژگاری پرمەینەتی پەرتەوازەیی و تراژیدیادا باوەشی بە ژیاندا کردو بوو بە مرۆڤێکی ناو کۆمەڵگاکەی. ساڵەکە ساڵی (١٩٧٤) بوو. شۆڕشی کوردستان دەستپێکردبووەوە، جگە لە شارە گەورەکان، هەندێك شارۆچکە نەبێت لە کوردستاندا، سەرجەمی خاکی کوردستان کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش و پێشمەرگەو هێزەکانی پێشمەرگە، لەهەموو شاخ، دەشت، گوند، شارو شارۆچکەیەك جمەی دەهات و نەبەردانە پەلاماری سوپاو دامو دەزگاکانی رژێمی بەعسی دەداو بەهەزاران لە خەڵکی کوردستان، بەبێ گوێدانە بەرژەوەندیی تایبەتی و خۆبەخشانەو خۆنەویستانە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو. هەرچەندە باری ژیانی خەڵکەکە لەرووی مادیی و بژێویی ژیانەوە باش نەبوو.
شۆڕش هەر هێزی پێشمەرگەی نەبوو، بەڵکو چەندین دامودەزگای جۆراوجۆر لە جۆری حکومەتی و بازرگانیی دامەزراندبوو، لە هەردەزگایەکدا بەهەزاران کاریان تێدادەکردو بەو مووچەیەی بۆیان دیاریکرابوو پێی دەژیان. بەکورتی رۆژگاری ساڵی حەفتاو چوار، رۆژگارێکی پرشنگدارو پڕ ئومێدبوون، هەرهەموو دڵمان پێی خۆشبوو، وام دانابوو کە لە دەستپێکردنەوەی ئەم جارەی شۆڕشەوە گەلەکەمان سەرفراز دەبێت و بە ئاوات و ئامانجەکانمان دەگەین. ئا لەو رۆژو رۆژگارەدا من لەناوچەی قەرەداغ بووم و لە مانگی (٧)دا لەکاتێکدا هێزی پێشمەرگە لە بەرگریکردن شکستی هێناو ناوچەکەی چۆڵکردو منیش وەکو کادیرێکی پێشمەرگەی شۆڕش بەناچاریی ناوچەکەم بەجێهێڵاو بەرێگایەکی دوورو درێژداو لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە چوومە ناوچەی دۆڵە رووت و لەوێوە جوابم نارد بۆ براکانم، کە زەینەب و منداڵەکانم بۆ بهێنن، بۆئەوەی لەگەڵ مندا لە ژیانی پێشمەرگایەتیدابن.
لە رۆژگارێکدا لە گوندی کانی گۆران لە چاوەڕوانی زەینەب و منداڵەکانمدا بووم

و کاتێکمزانی (کاکە لەتیف)م لەپێش نیوەڕۆیەکی ئەو ڕۆژانەدا بە زەینەب و هەرسێ منداڵەکەمەوە (بەخشی و ئازادو بەهار) خۆیان بەماڵی خاڵە ئەحمەد دا کرد. لەو ڕۆژەوە ژیانی خێزانیمان دەستی پێکردەوەو هەردووکمان بەو ژیانە زۆر زۆر ڕازیبووین و دڵمان پێی خۆشبوو. ژێر لەو سەردەمە خۆشەی ژیانماندا، زەینەبی دایکی بارگران کردو بوو بەبوونەوەرێکی ڕۆژگاری شۆڕش و شۆڕشگێڕیی.

ئای لەو ڕۆژگارەی کە بەهۆی پیلانی دوژمنانەوە نامەردانە خەنجەری ژەهراوییان سرەواندە شۆڕش و بڕبڕەی پشتی شۆڕشیان شکاندو هەرەسیان بە شۆڕش هێناو ئێمەی پێشمەرگەش لەنێوان دووڕیانێکی سەختدا ڕەوستابوو و نەماندەزانی ڕوو لەکوێ بکەین و چی بکەین؟

لەو ڕۆژگارە ڕەش و پڕ مەرگەساتەدا. لەم شوێن بۆ ئەو شوێن دەمانگواستەوەو دەڕۆیشتین و دەگەڕاینەوە. زەینەب-یش جگە لەو کۆڵە قورسانەی، بەناچاریی دەیدا بە کۆڵیدا ژێرەشی بە بەردەوامی بە چەرمی سکی هەڵگرتبوو.

شۆڕش بەئاقارێکدا برا بەناچاریی ملی ڕێگای خۆبەدەستەوەدانمان هەڵبژاردو گەڕاینەوە بۆ شارە حەیاتەکەمان، سلێمانی، لە ڕۆژێکی ئەو ڕۆژانەدا بەبێ ئاگاداری براو کەسوکار لەگەڵ زەینەب و منداڵەکاندا خۆمان بە ماڵی کاکەمدا کردو ماڵێکی نیوە جێبێکی کورتمان فڕێدایە حەوشەکەوەو دایکم و کاکەم و محێدین و براژنم و منداڵەکانی هاتن بەپیرمانەوەو دەرو دراوسێمان لێکۆبوونەوەو یەکەیەکەو دوو دوو بەکۆمەڵ بەخێرهاتنەوەیان دەکردین.

دایکم و کاکەم و محێدین فرمێسکی حەسرەتیان ڕشت و ئەو ساڵ و ڕۆژەش ساڵی (١٩٧٥) و مەرگەساتەکەی شۆڕشی گەلەکەمان بوو. کە بەپیلانی دوژمنان ڕێککەوتنی جەزائیریان بۆ سەربڕینی گەلەکەمان هێنایەکایەوە.

منیش تازە لەناو شۆڕشەوە گەڕابمەوە: شەو و ڕۆژ لەبیرکردنەوەی چارەنووسێکی نادیاردا بژیم. شوێن و جێگامان نەبێت، لەسەر ماڵی کاکەم و کەلوپەلی پێویستمان نەبێت. ئازووقەی خواردنمان نەبێت. گیرفان چۆڵ و فلس لە گیرفانمدا سەوزەلەخانم بچرێت... دەچوومە بازارو دەهاتمەوە نەمدەتوانی عەلاگەیەك بهێنمەوە. پسکیتێك، نووقلێك بۆ منداڵەکانم بەدەستەوە بگرم. زەینەب لە ڕۆژو مانگی خۆیدابێت هەموو ڕۆژ پێم بڵێت فریاکەوە. لانکەو تفاقی لانکە بۆ کۆرپەکەمان پەیدا بکەم. با لەوکاتەدا شپرزە نەبین.

منیش سەری دنیام لێهاتووەتەوە یەك نەمدەزانی چی بکەم و ئەوەی ئەو داوای دەکات. چۆن جێبەجێی بکەم، دایکم لە مشت و مڕەکەمان تێگەیشت و زانی کە من باخەڵم هیچی تێدا نییەو ڕووشم نایەت پارە لەکەس قەرزبکەم. وتی: حەمە ڕۆڵە خەمی منداڵبوونی زەینەبت نەبێت. شوکری دەنێرم بۆ بازار لانکەو دۆشەك و هەموو تفاقێکی بۆ بکڕێت. بەو هەواڵەی زۆر دڵخۆشبووم، ئەوانەی پێویست بوون لەلایەن دایکمەوە ئامادەکرا، لە ڕۆژی (١٦/٥/١٩٧٥) لە ڕۆژگارێکی شکستی شۆڕشی کوردستاندا لە بارو دۆخێکی ئێجگار ناهەموارو چارەنووسێکی نادیاردا ژێر چاوی بۆ ژێریی و هێورکردنەوەی من و دایکی

کردەوە.

ژیری چی. کۆرپەیەکی خوێنگەرمی تا حەزکەیت جوان و چاوگەش... کاکەم دەیوت لە باوکمان دەچێت.

دایکم دەیوت: ڕێك دەڵێی خاڵەتانە. بەنیازبووم ناوی بنێم (سنوور) بەو واتایەی پیلانی لەناوبردنی شۆڕشەکەمان بە ڕێککەوتننامەی جەزائیر بە دابەشکردنی سنوورەکانی عیراق و ئێران بوو، بەڵام فامیدەی پوورزام پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێت ناوبنرێت (ژیر)و لەسەر خواستی ئەو ناومانننا (ژیر).

هەر لەساڵی (۱۹۷۵)داو بەناچاریی لە مانگی (۱۰)ی ساڵەکەدا، لە سلێمانییەوە بەرەو خوارووی عیراق و پارێزگای واست و قەزای حەی بەڕێکەوتین... ژیر خەپۆڵەو جوانتربوو. بووە هاودەمێکی شەو و ڕۆژمان. لە تەمەنی دوو ساڵیدا ئەوەندە جوان بووبوو خۆشمان لە چاوی خۆمان دەترساین بەچاوییەوە بکەین. منداڵێکی گەنمڕەنگی پەلوپۆ قەوی و چاو ڕەشی زۆر زۆر جوان بوو. دەرو دراوسێمان لە سەیرکردنی تێر نەدەبوون و بەردەوام بە باوەشی کچانی گەڕەکەوە بوو.

ژیر، ژیر نەبوو، کۆرپەیەکی ناوازەو دەگمەن بوو، ئا لەو جوانییەدا، چاوپێکایی و من و دایکی ئەوەندە شپرزە کرد خەریکبوو تووشی نەخۆشیی دەروونیمان بکات. شەو و ڕۆژ بە باوەشی من و دایکییەوە بوو، پاش ئەو ماوەیە ژیر بووەوە بەژیر، بەڵام ئەو ڕەنگ و ڕووە گەش و جوانەی وەکو جاران نەماو پەری.

کاتێك لە ساڵی (۱۹۸۰) گەڕاینەوە سلێمانی و لە تەمەنی شەش ساڵیدا خستمانە قوتابخانە، کە لە ساڵی (۱۹۹۰)دا دەستگیرکرام، ژیر لە قۆناغی سێی ناوەندیی و لە ناوەندیی کانیسکانی کوران بوو. بەیانییەکەی دوای دەستگیرکردنم دەچێت بۆ قوتابخانە بۆ تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ، بەترسەوە دەچێت و کاتێك دەبینێت چواردەوری قوتابخانەکە گیراوە، جەندرمە جل بەڵەکەکان بەو ناوەدا بڵاوبوونەتەوە، ترسی لێدەنیشێت و گومانی ئەوە دەکات کە بۆ ئەو و (بلێسە)ی برای چووبن. لە دەرەوەی قوتابخانەدا چاوەڕان دەکات تا جەندرمەکان دەڕۆن و ئەو ناوە چۆڵ دەکەن. کاتێك دەچنە ناو قوتابخانە، تێدەگەن کە (مامۆستا ئەحمەد)یان گرتووە کە هاوڕێی باوکیان بووەو شەو لەگەڵ دەستگیرکردنی مندا خۆی گەیاندبووە ماڵمان. وتی: ئەو ڕۆژە ئاگام لەخۆم نەبوو، لە داخی باوکم و مامۆستا ئەحمەد. نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوەو نەمزانی چۆن تاقیکردنەوەم ئەنجام دا.

ژیر گێڕایەوەو وتی: ئێمە ماڵمان چۆڵکردبوو. ڕۆژێك لە بازارەوە دایکم و هەندێ لە منداڵەکان کە وابزانم (شێنێ و شەنگەو بلێسە)بوون، چووبوونە ماڵی خاڵە عەلیم و ئێمەش بەسەر ماڵی مامەکانماندا مامە لەتیف و مامە عوسمانماندا دابەش بووبووین، هەفتەیەك بوو من و بەهار لە ماڵی مام عوسمان بووین، ڕۆژێك لە بازارەوە بە پاسێکی هەژدەنەفەریی دەچوومەوە بۆ گەڕەکی مامۆستایان بۆ ماڵی مامە عوسمانم، سەیرمکرد (مامۆستایەك)

له دواوه له پاسه‌کەدایەو دێت بۆ مامۆستایان. وەکو بیتەوە یادم پارەی پاسەکەی بۆدام و هەواڵی تۆی لێپرسیم و منیش وەڵامم دایەوە، کە هیچ نازانم. هەر لەخۆمەوە گومانم کرد. بۆئەوەی نەزانێت لە ماڵی مامەمم، لەلای ماڵی خۆمان دابەزیم بۆ ئەوەی وا بزانێت بۆ ماڵی خۆمان دەچمەوە.

کاتێك لە مانگی (٨)دا هاتن بۆ مواجەهەم لە ئەمن، (ژیر)کە منی بینی، نەیناسیمەوەو وتی: ئەوە باوکم نییە.

کاتێك حوکمدراین و چووینە ئەبوغرێب، ژیر زۆربەی مواجەهەکان لەگەڵ دایکیدا دەهات بۆلام.

ژیر هەر ژیربوو.

ژیر لەماوەی ئەو ساڵ و دوو مانگەی کە لە ئەبوغرێب بووم، زوربەی مواجەهەکان بەژیریی و رووخۆشییەوە دەهات بۆلام.

کاتێکیش لە بەندیخانە ئازادکرام و گەڕامەوە ناویان، ژیر خوێندکاری ئامادەیی بوو. کۆششی ژیرانەی دەکردو لە چوونیا بۆ قوتابخانە هەر لە ماڵبوومایە، ماچی دەکردم کە دەشگەڕایەوە بە باوکە گیان دەهات بۆلام، ماچێکی دیکەی دەکردم و هەستم دەکرد خۆی بە منەوە بەسەربەرز دەزانێت و کە دەچێتە ناو هاوڕێیەکانی بەچاوی کوڕی تێکۆشەری زیندانیی هەڵسوکەوتی لە گەڵدا دەکەن و رێزی لێدەگرن.

ژیر ئامادەیی تەواوکردو خۆی بە زانکۆدا کرد، یەکەم جارو لە گەرمەی شەڕی خۆکوژیماندا لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر وەرگیراو تا نەقڵی سلێمانیم کردەوە، خەریکبوو بە تەواویی وەکو بەفری لێبێت.

ژیر لە زانکۆی سلێمانیش ژیکەڵەو وریا بوو، لەگەڵ مامۆستاکانیدا موناقەشەی دەکردو رای خۆی لە بەرامبەریاندا دەردەبڕی.

دوای تەواوکردنی کولییە، لەو شوێنەی دامەزراوە، تائێستا هەر لەو شوێنەیەو هەستدەکەم بە باشیی جێگای خۆی کردووەتەوەو باوەڕناکەم بەئاسانیی دەستبەرداری بن.

ژیر بە مەرگەساتی دایکی بەرنامەی ژیانی گۆڕا. خەمێکی جاویدانە دایگرت و نەشی دەویست بە فرمێسك و گریان دەریان برێت. دایکی تا ئەو رۆژەی ماڵئاوایی لێکردین بە ئاواتی ئەوەوە بوو، کە ژیر ژن بهێنێت و زۆر بەوە دڵخۆش دەبوو کە هەموو جار بەدایکی دەوت، من ژنیش بێنم لە ئێوە جیانابمەوەو هەر لەگەڵ ئێوەدا دەبم، چونکە من بەبێ ئێوە هەڵناکەم، بەداخەوە دایکی ئەو ئاواتەی بردە ژێرگڵ و ژیر هەر ژنی نەهێناو ئێستا کوڕێکی بەخەمی ماڵ و هەردوو خوشکەکەیەتی (شێنێ و شەنگە)و پەرۆشی منە بۆ باشیی تەندروستیم. منیش ئاواتم ئەوەیە کە ببینم ژن بهێنێت و ببێتە خاوەنی کۆرپەیەك و لە باوەشی بگرم، سەیرە بوو ئاواتەکەی منیش وەکو دایکی لێبێت و من بمرم و نەیبینم ژیر ژن بهێنێت.

# بلێسە

لەو رۆژگارەی کە شۆرشی کوردستان تووشی شکستکرا. رژێم بە شایی لۆغانی سەرکەوتنییەوە کەوتە پەرتکردن و ئاوارەکردن و گواستنەوەی فەرمانبەران و کادیرو پێشمەرگەو لێپرسراوانی شۆرش لە شارەکانی کوردستانەوە بۆ شارو شارۆچکەکانی ناوەراست و خوارووی عیراق، بە مەبەستی دابرینیان لە خاك و خەلکی کوردستان، وەکو سزایەك بۆ ئەو سالانەی لەگەل شۆرشی گەلەکەیاندابوون. منیش و مندالەکانم لەو شالاوە بەعسییانەدا بەر پاریزگای واست، قەزای حەی کەوتین.

لەکاتی دەستپێکردنەوەی دەوامی قوتابخانەکان، چووم بۆ ئامادەیی حەی و دەستبەکاربوونی دەوامم ئیمزاکردەوەو چەند رۆژێك مامەوە بە مەبەستی ئەوەی خانوویەك پەیدابکەم بۆئەوەی مال و مندالەکانم بەرم. ئەمەم بۆیە کرد، چونکە دووربینی ئەوەم دەکرد، کە رژێم کەوتەوە سەرخۆی دەست بەجێبەجێکردنی سیاسەتی تەعریبکردنی کوردستان بەتەواویی دەکات، واز لەو هەموو فەمانبەرە پێشمەرگانەو ئەو هەزاران هەزار کادیرو بەرپرسەی ناو شۆرش ناهێنێت، بە بەرنامەی بەعسییانە دەکەوێتە وێزەیان و لە کوردستان دووریان دەخاتەوەو نایەلێت لەناو بازارو فەرمانگەکاندا رۆژانە سەر بەیەکەوە بنێن و گەردەشە لەسەر دۆزی گەلەکەیان و شۆرشەکەیان و نەهامەتییەکانی بکەن.

ئەو بۆچوونەی (کاك شێخ حەسەنی شێخ محێدینی قادرکەرەمی بەرزنجی)م لا بەرجەستە بوو. کە پێی وتم: من پێم باشە ماوەیەك لە سلێمانی و ناو کوردستان دوور بکەوێتەوە، بۆئەوەی دووربیت لە چاوی دەزگاکانی رژێم.

بۆیە کە فەرمانی دامەزراندنەوەم لە وەزارەتەوە بۆ دەرکرایەوەو بریاری ئەوەم دا لەکاتی دەوامکردندا بەمالەوە بچمە شوێنی کارکردنم. بە بەرێوەبەری ئامادەییەکەم وت: دەمەوێت خانوویەك بگرم بۆئەوەی بچم مالەکەم بهێنم، تەلەفۆنی بۆ ناوەندیی حەی کوران کردو داوای مامۆستا (عەدنان)ێکی کردو پێی وت: سەری لێبدات ئیشی پێیەتی کە مامۆستا عەدنان هات و بە یەکتری ناساندین، پێی وت: مامۆستا عەدنان بەشکم هەولبدەیت لە گەرەکی خۆتاندا خانوویەك بۆ مامۆستا پەیدا بکەیت، وتی: مامۆستا محەمەد مامۆستا عەدنانیش کوردەو دانیشتووی گەرەکی حەیلنەکرادن و مامۆستای کۆمەلایەتییە.

مامۆستا عەدنان، وتی: بەسەرچاو هەولدەدەم کە لەم دوو رۆژەدا شوێنێکی باش و گونجاوی بۆ پەیدا بکەم و لەگەلیدا لە قوتابخانە چوومە دەرەوەو کەوتینە قسەو باسی هەمەلایەنە لە ئەنجامی قسەکردنەکانمدا بۆم دەرکەوت کە کوردێکی دلسۆزە لە خەم و پەژارەی شکستی شۆرشدایەو وتی: مامۆستا تۆ کورە گەورەکەت ناوی چییە؟ وتم: ناوی (بەخشی)یە، وتی: باوکی بەخشی مالێکی کوردی خۆمان هەیەو لە گەرەکی خۆمانەو دراوسێی مالی مامەکانمە. نهۆمی سەردەویان بەتالەو وەکو بزانم دەیانەوێت بیدەنە کرێ.

چووینە بازاڕو لە بازاڕ چووینە دووکانی ئەوپیاوەی کە خانووەکەی هەبوو. دووکانێکی عەتاری بچووکی بوو. دوای سڵاوکردن چاکوچۆنی ناساندنی من بەو و ناساندنی ئەو ئەویش بە من، وتی: ئەبو جودی نهۆمی سەرەوەتان هەر بەتاڵە؟ وتی: بەڵێ، بەتاڵە بۆچیتە؟ وتی: ئێشم پێیەتی. دەیدەین بەکرێ.

وتی: زۆرکەس هاتوون نەمداوە، بەکورد نەبێت بە عەرەبی نادەم. وتی: ئەی ئەگەر ئێمە بمانەوێت بیدەیتە باوکی بەخشی، دەڵێیت چی؟ وتی: من پێم وتی بە عەرەبی نادەم، وتی: باوکی بەخشی مامۆستایەو خەڵکی کوردستان و سلێمانییە، وتی: بۆ کەسێکی وا سەرم پێوە نییەو ناردینییەوە بۆ ماڵەوە، بۆئەوەی بچین سەیری خانووەکە بکەین. کە چووینە ماڵەوە (ئوم جودی) لە ماڵەوە بوو، بەگەرمیی پێشوازیی و بەخێرهاتنی کردین و دوای ئاو خواردنەوەو هەندێك دانیشتن بەدیار ئەو زەرفانەی خەریکی دروستکردنیان بوو، وتی: ئوم جودی دەمانەوێت سەیرێکی نهۆمی سەرەوە بکەین. لە پێشمانەوە سەرکەوت و بە باشیی سەیری خانووەکەمان کردو پەسەندمان کردو گەڕاینەوە بۆلای (ئەبو جودی)و پێمان وت: بەدڵمانە. دوای قسەکردن لەسەر کرێکەی وتی: مادام مامۆستایەو خەڵکی سلێمانی و کوردستانە مانگی بە (١٥) دینار دەیدەمێ و لەسەر ئەو نرخە رێککەوتین. دوای ئەوە ئۆتۆمبێلێکی دوو تەنیم گرت، کە ئەویش ئەبو جودی و عەدنان بۆیان پەیداکردم و لەگەڵ ئۆتۆمبێلەکە بەرەو سلێمانی گەڕامەوەو ماڵەکەم گواستەوە بۆ حەی و لەو نهۆمی دووەمەی ماڵی (مام عەلوان) گیرساینەوە. ئەوکاتە (ژیر) سێ مانگان بوو، بە ژیرەوە چوار منداڵم هەبوو.

لە (١٩٧٨/١/٥)و لە رۆژێکی ئێجگار ناخۆش و بێکەسیدا (زەینەب) کەوتە ئازارو ژانی (بڵێسە)، هەرخۆم بووم. شپرزە بووبووم نەمدەزانی بۆ کوێ بچم. دەچووم بۆ نەخۆشخانەو جێم دەهێشت، دڵم نەدەهات بەو ژانەوە بەجێی بهێڵم و دەترسام تا من دەگەمە نەخۆشخانەو پزیشك یان سستەرێك دێنم، زەینەب منداڵەکەی بەبێ کەس و بێ مامان ببێت، بۆیە چوومە خوارەوەو (ئوم جودی)یم ئاگادارکرد. یەکسەر رایکردە سەرەوەو کە بینی زەینەب زۆر بێتاقەتە یەکسەر بەراکردن چووە خوارەوەو کاتێکمزانی (ئوم کەریم)و ژنێکی دراوسێیانی هێناوە. ئوم کەریم یەکسەر ناردی بەدوای ژنێکدا کە کوردی فەیلی بوو، لە گەڕەکەکەو مامانیی دەزانی و ئەویش هات و منیان کردە خوارەوەو پاش سەعاتێك کەمتر. کاتێکمزانی (ئوم کەریم) هاتە خوارەوەو وتی: مژدەت دەدەمێ ئوم بەخشی رزگاری بووەو کوڕێکی جوانی وەکو خۆتی بووە، وەرە سەرەوە هەر گەیشتەمە سەرەوە کردیانە هەلهەلەی خۆشیی و منیش چووم ناوچەوانی زەینەب و کوڕەکەم ماچکردو سوپاسی ئەو ژنانەم کردو زەینەب وتی: باوکی بەخشی بەڕاستیی ئوم جودی و ئوم کەریم دایکانە فریامکەوتن.

بڵێسە ئا لەو شوێنەو لەو ساڵەو رۆژگارەداو بەو شێوەیە دوور لە خاکی نیشتمانەکەی چاوی بۆ دنیای پڕ ئازارو نەهامەتیی گەلەکەی کردەوە. ئەو ساڵانە ساڵی هەڵگیرسانەوەی

شۆرش و دامەزراندنی (ی.ن.ک)و هێزی پێشمەرگە پارتیزانەکان بوو.
لەپاش هەفتەیەك بۆ ناونانەکەی، نانخواردنێکی ئێوارەمان سازکرد بە ئامادەبوونی چەند کەسێك لەدەرو دراوسێ ناوم نا (بڵێسە)، پرسییان (بڵێسە) واتای چییە، وتم: واتای (شوعلە وهاجە)یە، مام عەلوان وتی: ئەمانە واز لە کوردایەتی ناهێنن و بەڕاستیی ناوێکی پڕماناو خۆشە.
بڵێسە بووە پێنجەم منداڵمان و زۆرمان خۆش دەویست، بەتایبەتی دایکی هەر زۆری خۆش دەویست دەیوت: بۆیە زۆرم خۆش دەوێت، چونکە لە ئاوارەیی و دوورە وڵاتیدا بوومە.
(بڵێسە) لە قەزای حەی فریای ئەوە نەکەوت بچێتە قوتابخانە، کە گەڕاینەوە سلێمانی، تەمەنی گەیشتە ئەوەی لە قوتابخانە وەرگیرێت، خستمانە قوتابخانە. کاتێك دەستگیرکرام بڵێسە چووبووە قۆناغی ناوەندیی و لە ناوەندیی کانیسکان دەوامی دەکرد.
لەو مواجەهەیەی ئەمن کە لەگەڵ کاکەم و زەینەب و هێرشدا هاتبوون، لە ئەمنی سلێمانی کە چاوی پێم کەوت نەیناسیمەوەو ئەو و ژێر باوەڕیان نەدەکرد کە من باوکیانم. دیارە ئەوەش لەبەر لاوازیی و پەڕینی ڕەنگ و رووی سوورم بوو. بەداخەوە لەو مواجەهەیەدا تاسوقیم لێیان نەشکا.
دوای بڕیاری مەحکەمەی سەورە لە (١٦/١٠/١٩٩٠)و ناردنمان بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب لە یەکەم مواجەهەدا، جگە لە (بەخشی و شەنگە) منداڵەکانی دیکەم بە(بڵێسە)شەوە هەرهەموویان لەگەڵ زەینەبدا هاتبوون و بەردەوامیش زووربەی مواجەهەکان (بڵێسە)یان دەهێنا...
کاتێ لە ساڵی (١٩٩١) ئازادکرام و چوومەوە ناویان، منداڵەکان شەو و ڕۆژ بەچواردەورمدا دادەنیشتن و زۆرجار بڵێسە لە خۆشیاندا هەرچەندە گەورەبوو، دەهاتە سەر ڕانم و یەکترمان ماچ دەکردو پێم دەوت: بڵێسە لە کوڕەوەکەدا خەمی (تۆو شێتیێ و شەنگە)م بوو.
چەندم پێخۆشبوو، بڵێسە توانی پەیمانگای هونەرەجوانەکان تەواو بکات و وەکو ئەکتەرێکی سەر شانۆ خۆی بناسێنێت، کاتێك پەیمانگای تەواوکردو لە ڕێکخراوێك دامەزرا، کە دەم بینی کوڕێکی شۆخ و بەتوانایە، زۆر دڵم روون دەبووەوە. هەر ڕۆژێك کە دەهاتەوە ماڵەوە، دەبوو دایکی ماچی بکات و بەقوربان و بەساقەی بێت.
بڵێسە کاتێك کەڵکەڵەی ژنهێنانی کەوتە سەرەوە، دایکی زۆر دڵی خۆشبوو. ڕۆژانە پێی دەوتم باوکی بەخشی بەدەنگییەوە بچۆو ڕێگای لێ مەگرەو با بەدڵی خۆی ژن بهێنێت، دەیوت: بەخشی. منداڵی بەخشی و بەهارو منداڵی بەهار بەمن چی، خۆ نایان بینم و ناتوانم لە باوەشیان بگرم، دایکی ئازادیش بمرێت ئەوە ئەویش لەداخانا سەری خۆی هەڵگرت، نازانم دەیان بینمەوە یاننا. لەبەرئەوە پەلە بکە با (بڵێسە) ژن بهێنێت. تووشی نیگەرانییەکی نێجگار زۆر بووم کە (زەینەب) نەگەیشتە ئەوەی ببینێت بڵێسە ژنی هێناوەو کۆچی ناوادەی کرد.

ئێستا کە دەبینم (بلێسە و ماردنی) خێزانی بەردەوام سەرم لێدەدەن و بە خەمی منەوەن، دڵم زۆر پێیان روون دەبێتەوەو کاتێکیش دەبینم (بلێسە) بووەتە بلێسەی پیاوەتی و خەمخۆریی و لەناو هاوەڵەکانیدا دیارو خۆشەویست و خاوەن کەسایەتی خۆیەتی، زۆر دڵم خۆش دەبێت.
دەبینم بلێسە خەمی من و یەکەیەکەی براو خوشکەکانی دەخوات و دەیەوێت دڵیان رازی بکات و بەدەنگیانەوە بچێت و بە بەردەوامی لەگەڵ (ژیر)دا بۆکارەکانیان، لەپرس و رادان و مەشۆرەت بەیەك دەکەن.

## شێتنێ

لە (١٩٨٦/٦/٢٩)و لەکاتێکدا من لەگەڵ سەرجەمی مامۆستایانی سەرەتایی و ناوەندیی و دواناوەندییەکاندا راپێچی (سەربازگەی مەشقی خوێندکاران لە قەزای دبس)کرابووین. بەناوی مەشقی هاوینە، حەوانەوەی ئەو چەند مانگەی هاوینیان پێ رەوا نەبینین. بۆیە لەو رۆژو ساتەی کە لەدایکبور لەئارادا نەبووم، ئەو کۆرپە خۆشەویستە لەو هاوینەدا دڵی دایکی و بەهاری خۆشکردو باوەشی گەرمی دایکی پڕکردەوەو سەریکێشایە جیهانی بوون و پڕنەهامەتیی گەل و نیشتمانەکەی.
لە پێنجشەممەو هەینییەکی مانگی (٧)دا لە دبسەوە گەڕامەوە بۆ سلێمانی و خۆم بەماڵدا کرد، کە چوومە ژوورەوە سەیرمکرد زەینەب دانیشتووەو کۆرپەیەکی بە مەلۆتکراویی لەلای خۆیەوە داناوە، دیاربوو لە ژانی منداڵبوون خەلەستبوو. کیژێکی جوانی بووبوو. هەستایە سەرپێ و بەپیرۆزبایی و بەخێرهاتنەوە یەکمان ماچکردو هەردانیشتم مەلۆتکەکەی خستە باوەشمەوەو وتی: سەیریکە کچێکی زۆرجوانە لەخۆت دەچێت و شێوەی بەهاری تێدایە. باشبوو خوابەدڵی خۆمی لەگەڵداکردم، ئەم سکەم کچ بوو. زۆرم مەراقی (بەهار)بوو کە تاقانە بێت و خوشکی دیکەی نەبێت. منیش ناوچەوان و سەر روومەتەکانیم ماچکرد. وتی: خوا ئەم حکومەتە لەناوبەرێت کە نایەڵێت ساڵێك دڵمان خۆشبێت، ئەم هاوینەی بەئێوە رەوانەبینی پشوویەکی تێدا بدەن و لەبوونی کۆرپەکەتدا ئامادەبێت. ئەو رۆژەی دەبوو بگەڕێمەوە بۆ (دبس) زەینەب وتی: بەنیازی کەی ناوی بنێیت و ناوی دەنێیت چی؟ وتم: هەفتەی داهاتوو دەکەمە مۆڵەت و لە مۆڵەتەکەدا ناوی دەنێین، بەنیازیشم ناوی بنێم (شێتنێ). وتی: (شێتنێ) چییە؟ وتم: ناوی گوندێکە لە بناری قەندیل و شاخی (بەلفەت) وەکو بۆیان باسکردووم گوندێکی خۆش و کوێستان و دڵگیرە. بووەتە شوێن و بنکەو بارەگای پێشمەرگەو سەرکردایەتی شۆڕش. تائێستا رژێم چەندینجار هەوڵیداوە سوپاکەی پێ بگەیەنێت و خاپوورو وێرانی بکات، بەڵام لە پەلامارەکانیدا سەرکەوتوو نەبووەو شێتنێ بە (شێتنێ)تی ماوەتەوەو وەکو دەڵێن لە شاری قەڵادزێوە بەپێ چەند سەعاتێکەو بەسواری ئۆتۆمبێل سەعاتە رێیەك زیاترە. جا لەبەر ئەم هۆیانە دەمەوێت ناوی بنێم (شێتنێ). یەکەم:

ناوێکی سووك و خۆشی کوردییە. دووەم: ناوی گوندێکی کوێستانەو لە بناری قەندیلە. سێیەم: یەکێکە لەو گوندانەی کە بووەتە لانکەو بنکەی حەوانەوەی پێشمەرگە. چوارەم: خەلکەکەی خۆراگرو ریخۆلەکێشن. وتی: کەوایە منیش لامپەسەندەو پێمخۆشە.
هەفتەی داهاتوو مۆلەتی هەفتەیەکم وەرگرت و کە گەرامەوە لە ئێوارەخوانێکدا کە کاکەم و محێدین و براژنەکانم و چەند دراوسێیەك ئامادە بوون. کاکەم بانگی بەناوی (شێنێ) بەگوێیدا داو وتی: بەخۆشی شێنێ و لەشساغی دایکی و رزگاربوونی باوکی لەم سەربازییەو خۆشیی‌و سەرفرازیی گەل و نیشتمانەکەمان.
کاتێك دەستگیرکرام تەمەنی (شێنێ) (٣) ساڵ و (٦) مانگ و (٢٧) رۆژ بوو. تەمەنەکەی تەمەنی خۆ خۆشەویستکردن بوو لای دایك و باوکی و خوشك و براکانی. بۆیە بووبووە گولێکی گەش و بۆنخۆش و هەمیشە جوان و کراوەی مالەکەمان. جگەلەوەی کە ئێمە وەکو دایك و باوك و خوشك و براکانی خۆشمان دەویست و بە بەردەوامی لە باوەشماندا بوو، مامەکانی و پوورو ئامۆزاکانی و کچانی گەرەك هەرهەموو خۆشیان دەویست و دەیانبردو لە باوەشیان دەگرت (شێنێ) بووە (شێنێ)ی هەمووان. لەو تەمەنەیدا زۆر هۆگرم بووبوو. لەکاتی خوێندنەوەو نووسین و میوانداریدا بەبێ پەروا خۆی بۆ باوەشم دەکوتاو دەهاتە لامەوە، هەرماوەی هەبووایە دەهاتە باوەشمەوەو ماچی دەکردم و منیش ماچم دەکرد. رۆژانە کە لە بازارو قوتابخانە دەگەرامەوەو سووسەی دەکرد. یەکسەر بەراکردن و خشپەخشپ بە سەربانەکەدا خۆی دەگەیاندە لای قادرمەکان و باوەشی بە قاچەکانمدا دەکردو منیش لەباوەشم دەکردو بەماچکردنی یەکەوە دەچووینە ژوورەوەو یەکسەر هاواری دەکرد دایە... دایە... باوکە هاتەوە.
رۆژانە لەکاتی نانخواردندا دەهاتە لامەوەو لەگەلما نانی دەخوارد. هەر ژەمی رۆژێکی نانخواردن لەکاتی نانخواردندا دوابکەوتمایەو لەگەلیاندا نانم نەخواردایە. کە نانیان بۆ دادەنام دەهاتە لامەوەو ئەگەر نانیشی بخواردایە لەگەلمدا نانی دەخواردەوە، دیارە منداڵێکی لەم جۆرە، لەپرێکدا باوکی لێ ونبکرێت و لێی داببرن. دەبێت لەچ حاڵێکی ناخۆشدا بژی؟ منیش کە دەستگیرکرام ئەو شەوانەی لە ژووری ئینفیرادیی بووم بەردەوام یەکێك لەوانەی بەزۆری بیرم لێدەکردەوە، ژیانی (شێنێ)بوو. لە خۆمم دەپرسی دەبێت ئێستا لە نیوەروان و ئێواراندا کە کاتی هاتنەوەمە چی بکات و چۆن بچێت بۆسەر قادرمەکان و دەبێت ئێستا چەندێ شپرزەی من بێت؟
کە چوومە ژووری دوو. بەزۆریی باسی (شێنێ)م بۆ هاورێیانی زیندانیی ژوورەکەم دەکرد. ئەوەندەم باسکردبوو. کاتێ (فەخرەدین عەبدوللا) ئازادکرا لە بەندیخانەو سەردانی مالمانی کرد. یەکسەر هەوالی (شێنێ)ی پرسی وتی: کوا؟ هاتە پێشەوە وتی: من (شێنێ)م وتی: شوکر باش گەورەبوویت. دەزانیت باوکت شەو و رۆژ هەرباسی تۆی دەکرد...
لە یەکەم مواجەهەماندا لە ئەبوغرێب زەینەب لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. ئەوکاتە تەمەنی

بووبوو به (٤)ساڵ و (٥)مانگ... بەدەستی بەهارو دایکییەوە بوو. کە ئێمە یەکتریمان ماچ دەکرد، ئەو هەر سەریدەکردو بەخەڵکی حەوشەکەدا دەیڕوانی. بە خەیاڵی خۆی بۆ من دەگەڕا. بەهار وتی: (شێنێ) ئەوە بۆ ناچیتە لای باوکم؟ وتی: کوا باوکم؟ وتی: ئەی ئەمە نییە لەگەڵماندا وەستاوە؟ وتی: کەی ئەمە باوکمە؟ باوکی من کەی وابوو؟ باوەشم پیداکردو وتم: (شێنێ) گیان بۆ نامناسیتەوە؟ چیم لێهاتووە؟ وتی: باوکی من قەڵەو و سوورو جوان بوو. وتم: من ئەو باوکە قەڵەو و سوورەتم ئا... ئا... شێنێ گیان باوکتم. وتی: تۆ چۆن باوکمی؟ بچووکبوویتەتەوە، ڕەنگت سووریی نەماوە... لە باوەشم دانەدەبەزی. هەرکەسی دەهات بۆلام ئەو هەر بە باوەشمەوە بوو.

دایکی هەموو مواجەهەیەك لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا. (زەینەب) بۆی گێڕامەوە وتی: (ئەوکاتەی گیرایت کراست گۆڕیبوو، چڵکن بوو، نەمشۆردبوو. هەر تۆگیرایت. پەلاماری ئەو کراسەی داو بە بەردەوامی بەدەستییەوە بوو. شەوانە دەبوو بیخاتە باوەشییەوەو بۆنی بکات و بەو بۆنەی تۆوە خەوی لێدەکەوت. زۆرجار پێم دەوت بایبشۆم. نەیدەهێشت بیشۆم و دەیوت ئەگەر بیشۆیت بۆنی باوکمی پێوە نامێنێت! تائێستا ئەو کراسە هەر بەچڵکنیی ماوەتەوەو نەمشۆردووە.

کاتێك کە (محێدینی کاك شێخ حەمەئەمین)ی پوورزامان ئازادبوو کە هات بۆلامان کراسێکی تۆی هێنابووەوە. کە وتی ئەم کراسەی بۆناردوونەتەوە. یەکسەر پەلاماری کراسەکەی داو بۆنی دەکردو ماچی دەکردو لە باوەشی دەگرت.

دوای چەندین مواجەهەو باشبوونی تەندروستیی و سووربوونەوەی ڕەنگم و قەڵەوبوونەوەم و گەشبوونەوەم. لە مواجەهەیەکدا لە باوەشمدا بوو. دەستی بە ڕوومەتەکانم و قژمدا دەهێناو سەیری دەکردم لەپڕێکدا وتی: بابە... بابە... دەزانیت ئێستا وەکو باوکەکەی جارنت لێهاتووەتەوە، وتم: چۆن؟ وتی: وەکو جاران سوورو جوان بوویتەتەوە. شوکر قەڵەویش بوویتەتەوەو ئێستا ڕێك لە باوکەکەی جارانم دەچیت...

کاتێك لە بەندیخانە ئازادکرام و گەیشتمە چەمچەماڵ، شێنێ لەگەڵ براکانیدا هاتبوو. ئەو و ژیرو کاکەم لە ئۆتۆمبێلەکەی کاك حەمەنووریدا کە منی تێدابووم سواربوون، گەیشتینەماڵەوە. وتی: دایە... دایە... ئەمە باوکمە واهاتەوە ناومان. ڕۆژانە لەهەر شوێنێك دانیشتمایە دەبوو (شێنێ) لەلامەوە دانیشت و جارناجارێك ماچێکی دەکردم و منیش ماچم دەکرد. هەستم دەکرد لە گەشەکردن و خۆشیدایە.

زەینەب وتی: باوکی بەخشی باوەربکە لەو ڕۆژەوەی ئازادبوویت (شێنێ) تەواو زیادیکردووەو گەشاوەتەوە.

کاتێك ئازادبووم (شێنێ) تەمەنی گەیشتبووە (٦) ساڵ و (٥) مانگ و (٢٤)ڕۆژو لە ساڵی (١٩٩٣) تەمەنی بوو بە تەمەنی چوونە خوێندنگاو لەو ساڵەدا خستبوویانە قوتابخانەو خوێندکاری پۆلی یەك بوو. خوێندکارێکی ژیکەلەو وریابوو... زۆر دڵی بە کتێب و دەفتەرو

قەڵەم و جانتاکەی خۆشبوو.
(شێنێ) بووە دەستەخوشکی دادە بەهاری. چۆن هۆگری من بووبوو. ئاوهاش هۆگری دادە بەهاری بووبوو.
(شێنێ) بەسەرکەوتوویی قۆناغەکانی خوێندنی تەواوکردو بروانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکان بەشی جیۆلۆجی بەدەستهێنا. ئەوساڵەی ئەو لە زانکۆ دەرچوو، دایکی دووچاری نەخۆشییەکی درێژخایەن بوو. بۆیە لەبەر دایکی نەیویست دامەزرێت و بە بەردەوامی خزمەتی دایکی دەکردو بەدەوریدا دەهات، کاتێك دایکی لە (٢٠٠٩/٢/٢٣) بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە ماڵئاوایی لێکردین. من هەر خەمی ئەو و شەنگەم بوو. کاتێك لە ساڵی (٢٠٠٩)دا دادە بەهاریان هاتەوە. هاتنەوەکەی بووە تین و تاوێك بۆیان و باری دەروونیان باشتربوو.
(شێنێ)وا بۆ ساڵێکە بە مامۆستای زیندەوەرزانیی لە پەروەردەی سلێمانی دامەزراوە. زۆرم دڵ پێی خۆشە کە دەبینم لە مامۆستاییەکەیدا سەرکەوتووەو هەوڵی پێشکەوتنی خۆشی دەداو زۆر بەتەنگی دلمەوەیەو خواردنی خۆش خۆشمان بۆ دروستدەکات و بەپێکەنینەوە پێشکەشمانی دەکات.

## شەنگە

لە (١٩٨٩/١١/٢٦) بە دوو چاوی گەشەوە سەری کێشایە دنیای ئازارو ناخۆشیی شاری سلێمانی و بووە دوا منداڵمان و سێیەم کچمان و کچە بچکۆلەی ماڵەکەمان. ئەوکاتەی لەدایکبوو، بچووکترین منداڵمان (شێنێ) بوو، کە تەمەنی (٣) ساڵ و (٤ ) مانگ و (٢٧) رۆژ بوو.
کاتێکیش دەستگیرکرام، شەنگە تەمەنی (٢) مانگ و (٢٠) رۆژ بوو. ئەوەندە منداڵ بوو، تەنها دایکی بۆ شیرو لە ئامێزگرتنی دەناسی. لەبەرئەوەی کۆرپەیەکی جوان بوو، جگە لە دایکی براو خوشکەکانیشی بە بەردەوامی لەباوەشیان دەگرت.
کە راپێچی ئەمنیان کردم، ترسی ئەوەم هەبوو، کە بەدوای گرتنمدا (زەینەب)و منداڵەکانیش بگرن و بیانهێننە ئەمن. چونکە لەو ساڵانەدا رژێم ئەو سیاسەتەی پیادە دەکرد هەرکەسێکی بگرتایە، بۆ فشارخستنە سەر گیراوەکە کەسوکاریشیان دەگرت، لەو ترسەدا لە ئەمن بیرم لە (شەنگە) دەکردەوە، بەو کۆرپەییە بێتە ناو ئەمنەوە، دایکی لەناو ئەو ئەمنەدا چۆن پەروەردەی بکات، شیرو خواردنی چۆن بۆ پەیدا بکات؟ منداڵێکی وا دەبێت لەناو ئەمندا چی بەسەر بێت؟ لەناو دەزگایەکی دوژمن بە گەلەکەمان چۆن چاو بکاتەوەو گەشە بکات و گەورە بێت؟ کۆرپەیەك لەجیاتی ئەوەی براو خوشك و مام و پوور رۆژانە ببینێت و لە باوەشی بگرن و بۆیان پێبکەنێت، چاوی گەشی بە جەندرمەی پیسا بروانێت و گوێی

بەهەرەشەو گورەشەو جنێوی پیسیان بکرێتەوە، لەجیاتی ئەوەی ورك لە شەقشەقەو بووکە شووشە بگرێت و بەدەسرازەی سەر بێشکەکەی یاریی بکات و بەلایلایەی دایکی بخەوێت. ڕۆژانەو شەوانە لە زرە زری زنجیرو کلیل راپەرێت و خەوی لێ بتارێنێت. لەراستیدا ئەو ترسە بووبووە خەمی شەو و ڕۆژم. بەسات لێی دوور نەدەکەوتمەوە.

لە مانگی(٥)ی ساڵەکەدا لە ئەمن بۆ ئیمزاکردنی وەکالەتی وەرگرتنی مووچە بانگیانکردم و لە مانگی (٦)دا جارێکی دیکە بۆ مواجەهەی (زەینەب و ئازاد) بانگکرامەوەو لەو دوو بانگکردنەوە ئەو ترسەم رەوییەوەو تێگەیشتم و لام بەرجەستە بوو، کە رژێم وازی لەو سیاسەتەی هێناوە لەگەڵ گرتنی تێکۆشەرانی کوردا کەسوکاریشیان بگرێت، لە چاوپێکەوتنی (زەینەب و ئازاد)دا بەپەرۆشەوە هەواڵی دایکم و شەنگەو منداڵەکانی دیکەم پرسی و ئەوانیش لە وەڵامیاندا پێیان راگەیاندم، کە باشن و لە خەمیاندا نەبم.

کاتێك گەیەنرامە بەندیخانەی ئەبوغرێب، (شەنگە) تەمەنی ساڵە وەختێ بوو. لەناوەراستی ساڵی (١٩٩١)دا لەیەکێك لە مواجەهەکاندا (زەینەب) شەنگەی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆلام. هەر کە بە باوەشی دایکییەوە بینیم، زۆر دڵم خۆش بوو. پێش بەخێرهاتنی هەموویان یەکسەر لە باوەشی دایکی وەرمگرت و کەوتمە ماچکردنی. لەبەرئەوەی نەیدەناسیم، تا ئەو تەمەنەی منی نەبینیبوو، فامی بەوە نەدەشکا من باوکیم، بەباوەشمەوە دەستیکرد بەگریان و گریانێکی وا هەرچەند دایکی پێی دەوت (شەنگەگیان) ئەوە باوکە گیانەو منیش پێم دەوت (شەنگەگیان) بۆ دەگریت من باوکتم. بێسوود بوو. ژیر نەدەبووەوە، ئەوەندە گریا من میوانەکانم بیرچوونەوەو لە رقدا دامەوە دەست دایکی و پێم وت: کە دەتزانی وا دەکات، بۆ هێناوتە؟ لەو جارە زیاتر تا ئازادبوونم نەیانهێنایەوە بۆلام.

لەکاتی کۆرەوەکەدا یەکێك لە خەمەکانم، خەمی شەنگە بوو.. دەترسام بەهۆی سەرما بێ خواردنی و بێ خزمەتییەوە بەو تەمەن منداڵییەوە لەناوبچێت و نەیبینمەوە، بەردەوام دیمەنی گریانەکەی دەهاتەوە پێش چاوم و خەفەتم پێ دەخوارد. کاتێك لە ئێرانەوە گەرانەوەو هاتن بۆ مواجەهەم و هەواڵیم پرسی، دایکی وتی: باوکی بەخشی شەنگە ئەگەر (حەمە رەئووفی کاکەحەمەی ئامۆزامان و ژیرەگیان) نەبوونایە فریمان دەداو لەناو دەچوو. زەینەب تاوەکو کۆچیشی کرد بەردەوام هەموو جار دەیوت بەقوربانی (حەمە رەئووف و ژیرە)بم کە شەنگەیان بۆ دەربازکردم لە مردن.

کاتێك لە بەندیخانە دەربازبووین و گەیشتمەوە ناو ماڵ و منداڵ و کە منداڵەکان یەك یەکە دەهاتنە لام و یەکترمان ماچدەکردو شێتێ لێم دوور نەدەکەوتەوەو هەر باوەشی پێدادەکردم، شەنگە ئەو کاتە تەمەنی (٢) ساڵ و (٢٧) ڕۆژێك بوو. فامی پەیداکردبوو. هەر سەیری دەکردم و لەپرێکدا هەر بانگم کرد، یەکسەر هاتە باوەشمەوەو کە ئەملاو ئەولام ماچکردو وتم باوە ماچکە ماچیکردم و سەرنجی دەموچاوی دەدام، وردە وردە بە باوەشمەوە کەوتە پێکەنین بۆم و کە پێیان دەوت، وەرە خوارەوە لە باوەشی باوەو یان کە دەستیان بۆ دەهێنا بۆئەوەی لە باوەشمی

داگرن، خۆی بە سنگمەوە دەنووساندو لە باوەشم نە دەچووە خوارەوە.
شەنگە گەورەبوو تەمەنی گەیشتە تەمەنی دەستکردن بەخوێندن. لە قۆناغی سەرەتاییدا خوێندکارێکی وردیلەو ژیکەڵەو زیرەك بوو. لە تاقیکردنەوەی بەکالۆری پۆلی سێدا نمرەی زۆر باشی بەدەستهێنا.
لە قۆناغی ناوەندیی زیاترو باشترو زیرەکتربوو. بەبێ دواکەوتن قۆناغی ناوەندیی بە نمرەی باشەوە تەواوکردو چووە قۆناغی ئامادەیی بەشی زانستیی،ساڵەکانی چوارو پێنجی بەنمرەی زۆر زۆر باشەوە بڕی و لە پۆلی شەشی ئامادەیی و لە تاقیکردنەوەی بەکالۆری پۆلی شەشدا لە دەوری یەکەم بە نمرە (٩٠٪) قۆناغەکەی بڕی و لە شانسی ئەودا ئەو ساڵە نمرە زۆر هاتبوو، ئەو کۆلێژەی ئەو حەزی لێدەکرد، کە کۆلێژی دەرمانسازیی و ددان بوو، وەرنەگیرا. بەپێی نمرەکانی لە کۆلێژی ئەندازیاریی بەشی کارەبای زانکۆی سەلاحەدین وەرگیرا. شەنگە یەکێك بوو لەو منداڵانەم کە پێویستی بەوە نەدەکرد پێی بڵێیت کۆشش بکە، یان چۆن کۆشش دەکەیت، یان بۆ کۆشش ناکەیت؟ ساڵانە بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراوی خۆی لەگەڵ ئەوەی سەیری تەلەفزیۆنیشی دەکرد، کۆششی ڕۆژانەو مانگانەو ساڵانەی خۆی دەکرد...
کاتێك لە زانکۆی سەلاحەدین وەرگیرا، بەلای خۆی و بەلای ئێمەشەوە قورس بوو. لەبەر منداڵییەکەی، زۆرم هەوڵدا بۆ زانکۆی سلێمانی بیگوێزمەوە، لە هەوڵەکانمدا سەرکەوتوو نەبووم، پێیان دەوتم دەبێت (تەنازوول) بکات، پێم دەوت تەنازوول دەکەیت؟ دەیوت نا حەزناکەم تەنازوول بکەم، چونکە کولییەکەم باشە.
شەنگە ئەو ساڵەی ئەو دەبوو بەشداریی تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەمی زانستیی بکات، دایکی نەخۆش کەوت و نەخۆشیی دایکی کاریگەریی زۆری لەسەر خوێندنەکەی کردو لەو باوەڕەدام دایکی نەخۆش نەکەوتایە، نمرەی لە (١٠٠) نزیکدەبووەو بەخواستی خۆی دەچووە کولییە.
دوو ساڵ لە هەولێر مایەوە. ئەو شەو و ڕۆژەی دایکی کەوتە هیلاکی و لە (٢٠٠٩/٢/٢٣) دا کە بەیانییەکەی کۆچی دواییکرد، شەنگە لە هەولێر بوو. تەلەفۆنمان بۆکرد بێتەوەو لە نیوەی ڕێگا سەیارەم نارد بەپیریەوە تا نەگەیشتە ماڵەوەو لە باوەشم نەگرت و نەچووە سەر تەرمی دایکی (زەینەب)مان نەناشت. کە زەینەب لەو ساڵانەدا یەکێك لە ئاواتەکانی ئەوە بوو، شەنگە لە هەولێرەوە نەقڵی سلێمانی ببێتەوەو ڕۆژانە خۆی ڕەوانەی زانکۆی بکات و کە هاتیشەوە خۆی خواردنی بداتێ. بەداخەوە بەو ئاواتە نەگەیشت و دیارەو ئاخری یەك بوون.
ئێستا لە زانکۆی سلێمانییەو لەهەمان کولییە دەوام دەکات و کچی هەڵسوڕاوی ماڵمانە.



چەمچەماڵ ١٩٩١/١٢/٢٣ لە پاسی هێنانەوەماندا لە کەرکوکەوە بۆ چەمچەماڵ



چەمچەماڵ ڕۆژی پێشوازی ١٩٩١/١٢/٢٣
بەخشی، محەمەد، حەمە نوری، ڕۆڵەکانی حەمە نوری



چەمچەماڵ رۆژی پیشوازی ۱۹۹۱/۱۲/۲۳
بڵێنە، محەمەد، بەخشی، ژێر، لەدواوە حەمە نوری



چەمچەماڵ رۆژی پیشوازی ۱۹۹۱/۱۲/۲۳
براو کەسوکارو دۆستان



چەمچەماڵ رۆژی پیشوازی ٢٣ /١٢/ ١٩٩١
کەسوکارو دۆستان



چەمچەماڵ ٢٣/١٢/١٩٩١ ئوتومبیلی حەمەنوری
(شینی) لە باوەشمدایە بەرەو سلێمانی دەڕۆین



سلیمانی ۲۳ ۱۲ ۱۹۹۱، گەڕەکی مامۆستایان
پێشوازی لەبەردەم ماڵماندا



سلێمانی ۱۹۹۱/۱۲/۲۳، گەڕەکی مامۆستایان
حەوشەی ماڵی محێدینی برام، ئاهەنگی خۆشی



سلێمانی، گەڕەکی مامۆستایان ژووری میوان
زێنەب و شێنێ، محەمەدو شەنگە



سلێمانی، گەڕەکی مامۆستایان ماڵەوە
دایکم، محەمەد، زێنەب



**ساڵی (١٩٧٩) پارێزگای واست- قەزای حەی**
**لە ڕاستەوە بۆ چەپ: (بەخشی، ئازاد، زەینەب و بڵێنـە، محەمەدو ژێر).**



**١٩٩٩- سلێمانی، گەڕەکی سەرچنار**
**مەتبەخی ماڵەوە لە ڕاستەوە بۆ چەپ: (شیتێ، شەنگە، زەینەب، بەهار)**

# -١-

## شەهیدەکان

ژیاننامەی ئەم (٧) شــەهیدە کە لەم کتێبەدا بڵاویدەکەمەوە، مێژووی خەباتی هەریەکەیان، ئەوە دەسەلمێنن کە کفنی مەرگیان هەروا ئاسایی و وەکو کفنی ئەو هەموو مرۆڤە نییە، کە رۆژانە مەرگ یەخەیان پێدەگرێت و لەگەڵ هەڵلوشــینی خاکدا ناویان دەسڕێتەوەو لە هزرو یادەوەرییدا نامێنن...

بەڵکو ئەم پۆلە شــەهیدە رۆڵەگەلێکی گەل و نیشــتمانەکەیان بــوون، کە لەگەڵ تەمەنی بیرکردنەوەیاندا نەترســانە رێبازی شــۆڕش و شۆڕشــگێڕییان بە باڵاو ژیانــی خۆیان بڕیوەو تێکۆشــەرانە خەباتی بەردەوامیــان کردووە لەپێناوی ئازادیی و ســەرفرازیی گەلەکەیاندا. بۆیــە دەبینرێــت هەریەکەیان بەجۆرێــك نێرگزی بەهــاری ژیانیــان هەڵدەوەرێت و دەبنە قوربانیی لەپێناوی رزگارکردنی خاکی نیشــتمانەکەیان و بەدەســتهێنانی سەربەرســتی بۆ گەل و نیشــتمانەکەیان، ئەگەر ســەرنج لە ژیاننامەکانیان بدرێت (٥) تێکۆشەرو (٥) رۆڵەی بەنەمەکی ئەم گەلە بەیەك بڕیاری مەحکەمەو لەیەك رۆژدا لەلایەن جەللادەکانی بەعسەوە بەیەکەوە لەســێدارە دەدرێــن و رۆژی (١٩٩١/١١/٧) دەبێتە شــۆری (٥) هاورێی کۆڵنەدەری ئەم گەلــەو رۆژی (١٩٩١/١١/١٨) دەبێتە ئەو رۆژەی قورســایی تاوانەکانــی عەواد بەندەرو ســەدام و رژێمەکەی بەتەواویی دەردەخات، کە تەرمی ئەو (٥) شــەهیدە لە گۆڕەپانی تاوانی لەســێدارەدانیانەوە هەڵدەگیرێن و دەگوێزرێنەوە بۆ (گۆڕســتانی کەرخ)، دیارە مانەوەی ئەو (١١) رۆژە لــە تابووتــی بەکۆمەڵی ســاردی تاوانیاندا، بۆ ئەوەبووە کــە دوو جار خۆیان دان بەتاوانبارییاندا بنێن و خۆیان سەرشۆڕی مێژووی مرۆڤایەتی بکەن.

ئەو تاوانبارانە وایان دەست بە دەسەڵاتی دیکتاتۆرییەتەوە قایمکردبوو، هەرگیز لەبیرکردنەوەی ئــەوەدا نەبوون، کە رۆژێك لە رۆژان تەختــی حوکمڕانییان تێکوپێك دەدرێت و لەبەردەمی گەلــدا لەســەر تاوانەکانیان دادگاییدەکرێن و بە ســزای تاوانبارییان دەگــەن، بۆیە تەرمی ســوورهەڵگەڕاوی ئەو (٥) شــەهیدە، لەجیاتی ئەوەی تەسلیمی کەســوکاریان بکەنەوە. لە گۆڕستانێکی ناو بەغدا بەنهێنی و بەبێ ئەوەی کەس پێی بزانێت، بە کەلوپەلەکانی خۆیانەوە دەنێژرێن، بێئاگا لەوەی کە دوای (١٢) ساڵ کورسی دەسەڵاتیان بەسەر یەکدا نوغرۆ دەکرێت و لــە رۆژی (٢٠٠٣/٥/٢٥)دا تەرمــی ئەو (٥) قارەمانە لە (گۆڕســتانی کەرخ) دەدۆزرێنەوەو

لەلایەن کەســوکاریانەوە دەردەهێنرێن و دەگەیەنرێنەوە خاکی نیشــتمان و بەئارامیی وەکو ئارام و خاڵە شــەهاب و هەزاران هەزاری تری شــەهیدی ئەم گەلە لە (گۆرســتانی سەیوان) ئارامدەگرن.
شەهید (ســالار محەمەد سەعید)، بڕیاری دادگا لەسێدارەدان نەبوو، بەڵام زوولم و ڕەفتاری نامرۆڤانــەی پیاوانی ئەمن و بەندیخانەی ئەبوغریــب، بە ناجوامێریی و نامرۆڤانە بەئازارو ژانی نەخۆشــییەوە لــە بەرەبەیانــی (١٩٩١/٤/١٧)دا لەناو بەناونەخۆشــخانەی بەندیخانەدا گیان دەبەخشــێت و دەچێتە پاڵ (٥) هاوڕێ لەســێدارەدراوەکەی و بە شەهیدبوونی بەعس و ڕژێمەکەی، ریسوای بەردەمی مێژوو دەکات.
تێکۆشەرانی (ی.ن.ك) تەنها ڕژێمی بەعس دوژمنیان نەبوون، بەڵکو دوای ئازادیی کوردستان و دروســتبوونی دەســەڵاتی خۆماڵیی کوردی و حکومەتی هەرێم، پەرلەمانی کوردســتان (تیرۆریســتان هاوشانی بەعسی فاشی و ســەدامی دکتاتۆر) پەلاماری ڕۆڵە بەئەمەکەکانی گەلەکەمان دەدەن، دەیانویســت کوردستان بکەنە تاریکستان و ڕێگا لە ڕۆشنایی ئازادیی و سەربەســتیی گەل و نیشتمانەکەمان بگرن و بەتاریکیی بیریان کوردستانمان لێ بشێوێنن، بۆیــە لە شــەوی (١٨-١٩٩٦/٥/١٩) نامەردانەو دوژمنانە پەلاماری شــەهید(رزگار)یان داو دەستی ڕەشی تارانیان پێیگەیشت و لەجیاتی ئەوەی (عەواد بەندەرو ڕژێمی بەعس) شەهیدی کات، ئەو مێشك ڕزیوانە شەهیدیانکرد.
(موحسین مەلا حەمەئەمین) لەکاتێکدا نەبەردانە لە ڕۆژانی تەحقیقدا ڕووبەڕووی جەللادەکانی ئەمنی ســلێمانی بــووەوەو نەیانتوانی زەفەری پێبهێنن و دادگای ســەوروەش هەر ئەوەندەی پێکرا، کە بە (١٠) ســاڵ زیندانیکردن حوکمی بەســەردا بدات... کاتێك ئازادکراو گەڕایەوە نیشتمانی دایکی و قۆڵی خەباتکردنەوەی لێ هەڵماڵی و دەیویست هەموو توانای بخاتە گەڕ بۆ خزمەتی گەل و نیشــتمانە ئازادکراوەکەی و لە گەرمەی کارو جموجووڵیدابوو، بەداخەوە مــەرگ یەخەی پێگرت و مۆڵەتی نەدا زیاتر خزمەتی گەلەکــەی بکات، لە (٢٠٠٠/٧/٩)دا بەهۆی نەخۆشیی دڵەوە گیانی سپارد.
ئەم (٧) شەهیدەی کە لێرە بەدواوە ژیاننامەکانیان دەخوێننەوە، لە لاپەڕەی ژیاننامەکانیاندا دەتوانن جامولکەیەك ئاوی ڕۆشن هەڵگۆزن و تێیان بگەن کە چ پیاوگەلێکی گەلەکەمان بوون.

# شەهیدەکان

## عەبدولجەبار رشید مەلا ئیبراهیم
## (هاورێ جەبارو جەباری رەشەی مەلابرایم)[1]



عەبدولجەبار رەشید محەمەد مەلا ئیبراهیم. ناسراو بە (هاورێ جەبارو جەباری رەشەی مەلابرایم)
- ساڵی (١٩٤٤) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- خوێندنی زانکۆیی لە زانکۆی سلێمانی و کۆلیژی کشتوکاڵی لە ساڵی (١٩٧٢) تەواوکردووە، بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلیژی کشتوکاڵیی وەرگرتووە.

- لە سەرەتای شەستەکانەوە، تێکەڵ بە کاروانی خەباتی شۆڕشگێڕیی و کوردایەتیی بووە لەرێگای (یەکێتیی قوتابییانی کوردستان)ەوەو دواجار چووەتە ریزی رێکخستنەکانی (پ.د.ك)ەوە. لەو سەردەمانەدا لە ماڵیاندا چاپەمەنیی و بڵاوکراوەکانی (پارتی) حەشار داوەو بڵاوی کردوونەتەوە.
- لە حەفتاکاندا پەیوەندیی بەریزەکانی کۆمەڵەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە.
- لە ساڵی (١٩٧٦) چالاکانە لە ریزەکانی کۆمەڵەدا کارو چالاکیی کردووە.
- ساڵی (١٩٨٢) بووەتە ئەندام کەرتی (شەهید ئەنوەر زۆراب).
- ساڵی (١٩٨٧) بووەتە لێپرسراو و سەرپەرشتیاری رێکخراوی سلێمانی و کەرکوك و بەغدا.
- لە رێکخستنی کۆمەڵەدا بە (هاورێ باوەر) ناسراوە.
- لەکاتێکدا بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی کۆمەڵە لە (١٩٩٠/١/٢٣) لە بازگەی تاسلوجە لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە (مەحکەمەی سەورە) لەگەڵ (٤) هاورێی دیکەیدا حوکمی

---

١-ئەم ژیاننامەیە لە کتێبی شەهیدان جەباری حاجی رەشیدو هاورێکانی بەدەستکارییەوە نووسراوەتەوەو وێنەکەش لەلایەن (شەمام شەوقی) هاورێیەوە نێردراوە.

لەسێدارەدانیان بەسەردا دراوە.

- لە رۆژی (١٩٩٠/١١/٧) لەلایەن جەللادەکانی بەعســەوە لە بەندیخانەی ئەبوغرێب لەگەڵ چوار هاورێکەیدا لەسێدارە دراون.

- لە (١٩٩٠/١١/١٨) تەرمەکانیان لە گۆڕستانی کەرخ لە بەغدا بەخاکسپێردراون.

- لەپاش خۆی ســێ جگەرگۆشــەی لەپاش بەجێماوە: دوو کچ و یەك کوڕ، بەم ناوانە (کانی، کەنار، رەنج).

- دوای پرۆســەی ئازادکردنی عیراق لــە (٢٠٠٣/٥/٢٥) تەرمەکانیان لە گۆڕســتانی کەرخ دەرهێنران و لە مەراســیمێکی شایســتەدا لە گۆڕستانی ســەیوان و لە شوێنێکی تایبەتی گۆڕستانەکەدا بەخاکسپێردرانەوەو خاکی نیشتمان لەباوەشی گرتنەوە.

## (ئەحمەد محەمەد وەتمان محەمەد)[1]

(ئەحمەد محەمەد وەتمان محەمەد) ناسـراو بە (مامۆستا ئەحمەدی سەناعە)و هاوڕێ (سوورە)و هاوڕێ (گمۆ).



- ساڵی (١٩٥٠) لە قەزای چوارتا هاتووەتە دنیاوە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە شارۆچکەی چوارتا تەواوکردووە.
- لە شۆڕشی ئەیلوولدا بووەتە مامۆستای شۆڕش.
- لە شەستەکانەوە تێکەڵاوی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی کوردستان بووە.
- ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووەو ڕۆڵی کاراو بەرچاوی لە خەباتدا بینیوە.
- لە ریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەدا بەناوی نهێنی هاوڕێ (سوورە)و دواجار بە هاوڕێ (گمۆ) ناسراوە.
- لێپرسراوی چاپەمەنیی و بڵاوکراوەو ئەرشیفی ڕێکخراوی سلێمانی بووە.
- لە کۆنفرانسەکانی (١، ٢، ٣) کۆمەڵە وەکو نوێنەری ڕێکخستنی ناوشار بەشداریی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٧) بووەتە لێپرسراوی (خەتی سوور)و بە هاوڕێ (سوورە) ناسراوە.
- لەماوەی کارکردن و خەباتیدا بەدەیان هەڤاڵی بۆ ناو ریزەکانی کۆمەڵەو (ی.ن.ك) ڕاکێشاوەو ڕێکخستووە.
- کراوە بە لێپرسراوی چاپەمەنی و بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەو (ی.ن.ك) و بە هاوڕێ (گمۆ) ناسراوە.
- لە (١٩٨٩/٤/١٢) بەهۆی (پواز) خۆفرۆشێکەوە لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە.
- لە ئەمنی سلێمانی سەختترین و قورسترین ئازارو ئەشکەنجە دراوە. قارەمانانە خۆڕاگربووەو بەرگەی ئازارو ئەشکەنجەکانی گرتووەو نموونەی پیاوێکی خەباتکەری قارەمان بووە لەناو ئەمنی سلێمانیدا.

---

١- ئەم ژیاننامەیە بەکەڵکوەرگرتن لە کتێبی شەهیدان جەباری حاجی ڕەشید و هاوڕێکانی و ئەو نووسینەی هیوای کوڕی بۆناردووم بەدەستکارییەوە، نووسراوەتەوە.

-ساڵێك و نۆ مانگ لە ئەمنی سلێمانی بووەو لەو ماوەیەدا نەبەردانە بەرگەی ئەشکەنجەو ئازاری گرتووە، بە قارەمانی زیندان و ئەمنە سوورەکە ناسراوە.
- لە (١٦/١٠/١٩٩٠) لە مەحکەمەی بەناوسەورە لەگەڵ چوار هاوڕێیدا بەحوکمی لەسێدارەدان (ئیعدام) حوکمدراوە.
- لە (٧/١١/١٩٩٠) لە بەندیخانەی ئەبوغرێب لەلایەن بەعسییە پیاوکوژەکانەوە لەگەڵ چوار هاوڕێکەیدا لەسێدارە دراون.
لە (١٨/١١/١٩٩٠) تەرمەکانیان لە گۆڕستانی کەرخ لە بەغدا بەخاکسپێردراون.
- پاش شەهیدبوونی، چوار کۆرپەی بەم ناوانە (هیوا، هێرۆ، هێشوو، هێڤار) بەجێماوە.
- دوای ئازادکردنی عیراق لە(٢٥/٥/٢٠٠٣) تەرمی پیرۆزیان لە گۆڕستانی کەرخ دەرهێنران و لە مەراسیمێکی شایستەدا لە شوێنێکی تایبەتی گۆڕستانی سەیوان بەخاکسپێردرانەوە.

## (محەمەد رەحیم حەسەن رەسوڵ) ناسراو بە هاوڕێ (شەماڵ)[1]



- ساڵی (١٩٥٥) لە شارۆچکەی پێنجوێن لەناو بنەماڵەیەکی هەژارو کەمدەستدا هاتووەتە دنیاوە.
- منداڵ بووە،ماڵیان لە پێنجوێنەوە هاتووەتە قەرەگۆلی شارەزوور.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لە قەرەگۆل و ناوەندیی لە عەربەت و ئامادەیی کشتوکاڵی لە بەکرەجۆ تەواوکردووە.
- لە ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧١) پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە.
- لە ساڵی (١٩٧٤) بووەتە پێشمەرگەی شۆرش.
- ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بە ریزەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٧٧) بە فەرمانبەر لە دەربەندیخان دامەزراوەو هەر لەو ساڵەدا بۆ پێنجوێن گوێزراوەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٧-١٩٧٨) رۆڵێکی دیارو بەرچاوی هەبووە لە گەشەپێدانی رێکخستن لە سنووری پێنجوێندا.
- ساڵی (١٩٧٨) کاتی داگرتنی دێکان (دێهاتەکان) لەلایەن رژێمەوە (هاوڕێ محەمەد) هاوکارییەکی باشی گوندنشینەکانی کردووەو رێنمایی کردوون، لەکاتی خەسارەت نووسینیاندا ئەم شتی زۆرو باشی بۆ نووسیون.
- لە سەرجەم راپەرینەکانی شاری پێنجوێندا رۆڵی رابەرو سەرکردەی بینیوە.
- هەر لەبەر چالاکیی و دڵسۆزیی لە کارەکانیدا کراوەتە لێپرسراوی رێکخراوی (بلکیان) لە پێنجوێن.
- لە ریزەکانی رێکخستندا سەرەتا بە (لاوك) پاشان بە (شەماڵ) ناسرابوو.
- لە ساڵی (١٩٧٩)دا لەلایەن ئیستخباراتی پێنجوێنەوە دەستگیرکراوە، لەبەرئەوەی دەزگای ئیستخبارات نەیانتوانی سوودی لێوەرگرن، بەناچاریی ئازادیان کردووە.

---

١-ئەم ژیاننامەیە وێڕای کەڵکوەرگرتن لەکتێبەکەی شەهیدان جەباری حاجی رەشید و هاورێکانی لەلایەن (هاوڕێ حەمەعەتا حەمەساڵح)ەوە نووسرابووەوەو لە (٢٠١٠/٦/٢١) بۆی ناردم، زۆر سوپاسی دەکەم و بەدەستکارییەوە نووسراوەتەوە.

- له راپەرینە مەزنەکەی (١٩٨٠/٧/٢٠)ی شاری پێنجوێن، رۆڵی سەرکردەو رێکخەرو هاندانی جەماوەری هەبوو بۆ مانگرتن و راپەرین له دژی رژێم، هەر بەدەنگی خۆی چەندجار شەوانه له بڵندگۆی مزگەوتەکانی شاری پێنجوێنەوە بانگەوازی بۆ جەماوەر کردووە، که درێژەبدەن به مانگرتن، راپەرین هێزی پێشمەرگەی کوردستان و رێکخستنەکان پشتیوانتانه، جگه له دەنگی خۆی، راستەوخۆ به تۆمارکراویش جارێکی دیکه بانگەوازی درێژەدان به راپەرینی راگەیاندووە.

- ساڵی (١٩٨٦) ئەرکی گەیاندنی پۆستەی لەنێوانی رێکخراوی سلێمانی و ناوەندی کۆمەڵەدا پێسپێردراوە، ئەوەش له ئەنجانی دڵسۆزیی و متمانەبوونی بووە.

- ساڵی (١٩٨٧) لەکاتی گەیاندنی پۆستەی رێکخراوی سلێمانی بۆ ناوەندی کۆمەڵە، دووجار له دۆڵی جافەتی به چەکی کیمیایی بریندارببوو.

- له (١٩٨٧/٩/٢٥)دا لەکاتی بردنی پۆستەی رێکخراوی سلێمانی بۆ ناوەندی کۆمەڵە، لەرێگای (سلێمانییەوە بەرەو دۆڵەرووت) له (کانی بەردینە) لەلایەن دەزگا جاسوسییەکانی بەعسەوە دەستگیرکراوەو پاش مانەوەی (٣) مانگ له (ئەمنی عامەی) بەغداو ئەشکەنجەدانی، بەهۆی خۆراگرییەوە نەیانتوانیبوو سوودی لێوەرگرن، بەناچاریی ئازادکراوە.

- پاش ئازادبوونی له ئەمن ساڵی (١٩٨٨) مەفرەزەیەکی دروستکردووە بەناوی (مەفرەزەی تۆڵەی ئەنفال)، که پێکهاتبوو له سێ کەس بۆ ئەنجامدانی کارو چالاکی پێشمەرگانە.

- له مانگی (١٩٨٨/١٠)دا دوای دروستبوونی سوپای رزگاریی کوردستان (سرك) هاوڕێ شەماڵ بووە لێپرسراوی بەشێکی زۆری (سرك) له شارەزوورو گەرمیان.

- له (١٩٨٩/٧/٧)دا لەکاتی کرینی چەك و پێداویستیی سەربازیی بۆ رێکخستنەکانی (سوپای رزگاریی کوردستان)، بەهۆی ئەڵقە لەگوێیەکی (پواز)ناسای رژێمەوە، لەلایەن دەزگای ئەمنەوە لەناو شاری کەلاردا دەستگیرکراوەو نێردراوە بۆ ئەمنی عامە.

- له (١٩٩٠/١٠/١٦) لەگەڵ (٤) هاوڕێیدا لەلایەن دادگای بەناو سەورەی بەغداوە حوکمی لەسێدارەدانیان دراوە.

- له (١٩٩٠/١١/٧) لەگەڵ چوار هاوڕێیدا له ئەبوغرێب لەسێدارە دراون.

- له (١٩٩٠/١١/١٨) تەرمەکەی له گۆرستانی کەرخ بەخاکسپێردراوە.

- له ساڵی (٢٠٠٣)دا لەدوای پرۆسەی ئازادیی عیراق له (٢٠٠٣/٥/٢٥) رووفاتی شەهیدیان له گۆرستانی کەرخی بەغداوە هێنایەوە بۆ سلێمانی له گۆرستانی (گردی سەیوان)، لەگەڵ هاوڕێکانی له شوێنێکی تایبەتی گۆرستانەکە بەخاکسپێردرانەوە.

- لەپاش خۆی سێ منداڵی بەناوەکانی (هانا-سۆما- توانا) بۆ گەل و نیشتمانەکەی بەجێهێشتووە.

## ئەبوبەکر محەمەد ساڵح کەریم، ناسراو بە (وەستا بەکری دارتاش)[1]



- ساڵی (١٩٤٧) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە.
- تا پۆلی سێیەمی ناوەندیی خوێندووە.
- لە شەستەکاندا پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە.
- لە ساڵی (١٩٦٤) کە باڵی مەکتەبی سیاسیی لە پارتی جیابووەتەوە، لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بووەو پێشمەرگەی پارتی بووە تا ساڵی (١٩٧٠).
- ساڵی (١٩٧٠) پەیوەندیی بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٧٦) راستەوخۆ پەیوەندیی بە شەهیدان (خاڵە شەهاب، جەعفەرو عەبدولواحیدە)وە هەبووە. دوای گرتن و لەسێدارەدانی هاوڕێیان، پەیوەندیی بە هاوڕێیان (فەرەیدون عەبدولقادرو عەلی بچکۆل)ەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣) سەرپەرشتی شانەچەکدارەکانی ناو شاری کردووە لە سلێمانی، لەسەر بڕیاری شۆڕش و بە بەرنامە چەندین خۆفرۆشیان بەسزای گەل گەیاندووە.
- لە کۆنفراسی دووی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا بەشداریکردووە.
- ساڵی (١٩٨٨) دوای کیمیابارانی هەڵەبجەو ئەنفال کراوەتە سەرپەرشتیاری (رێکخراوی بابەگورگوری کەرکوك و سەرپەرشتی رێکخستنەکانی (چەمچەماڵ، تەکیە، بایجان و بازیان)ی کردووە.
- لەکاتی بریندارکردنی (ئازادی سەگرمە)، لە گەرمیان لە ساڵی (١٩٨٨)دا لەلایەن هێرشی فرۆکەکانی رژێمەوە شەهید بەکر رۆڵی بەرچاو و جوامێرانەی هەبووە لە بەپیرەوەچوون و گواستنەوەو چارەسەرکردن.
- بەهۆی پوازێکەوە لەناو ریزەکانی رێکخستندا لە رۆژی (١٩٨٩/١١/٥) دەکەوێتە بەر شاڵاوی ئەنفالی رێکخستن و لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە لە دووکانەکەی، لەسەر شەقامی سابوونکەران، دەستگیردەکرێت.

---

١-بۆ ژیاننامەی شەهید وەستا بەکر کەڵك لە کتێبەکەی شەهیدان جەباری حاجی رەشید و هاوڕێکانی و ئەو نووسینەی کە لەلایەن شاخەوان بەکری کوڕیەوە پێم گەیشت، وەرگیراوە بەدەستکارییەوە.

- دوای مانەوەی زیاتر لە (١٠) مانگ لە ئەمنی سلێمانی، لە (١٦/١٠/١٩٩٠) لەلایەن دادگای سەورەی عەواد بەندەرەوە لەگەڵ (٤) هاورێی تێکۆشەریدا حوکمی لەسێدارەدانی دەدرێت.
- لە رۆژی (٧/١١/١٩٩٠) حوکمەکەیان لە بەندیخانەی ئەبوغرێب جێبەجێدەکرێت و لەگەڵ هەرچوار هاورێکەیدا لەسێدارە دەدرێن و دەبنە پێنج ئەستێرەی گەشی خەبات و کۆڵنەدان لە بزاڤی شۆڕشگێڕیی کوردستان.
- لە (١٨/١١/١٩٩٠) تەرمەکانیان لە گۆڕستانی (کەرخ)ی بەغدا بەخاك دەسپێرن.
- دوای پرۆسەی ئازادکردنی عیراق لە (٢٥/٥/٢٠٠٣) تەرمەکانیان لە گۆڕستانی کەرخ دەرهێنرانەوەو لە مەراسیمێکی شکۆدرادا لەجێگایەکی تایبەتی، لە گردی سەیوان لەناو خاکی نیشتمانمدا جارێکی دیکە بەخاکسپێردرانەوە. لەگەڵ تەرمەکەیدا نامەیەکی تێدابووە کە بۆ خێزان و منداڵەکانی نووسیبوە.
جێی خۆیەتی کە دەقی نامەکە لەگەڵ ئەم ژیاننامەیەدا لەم کتێبەدا بڵاو بکەینەوە. دیارە شەهید کە ئەو نامەیەی لەو بارودۆخە ناهەموارەدا نووسیوە، بڕوای بەوە بووە کە رۆژێك لەرۆژان گەلەکەی سەرفراز دەبێت و رژێمی بەغدا دەرووخێت، دوای لەسێدارەدانیان دەبرێنەوە بۆ کوردستان و خێزان و منداڵەکانی ئەوە دەکەنە بەڵگەنامەی شەهیدبوون و قارەمانێتیی و دووربینیی، فەرموون ئێوەو نامەکەی (شەهید پۆلا) (وەستا بەکری دارتاش)، کە لەسەر نایلۆن و بەدەرزی نووسراوە:

خێزانی زۆر ئازیزم: منداڵە خۆشەویستەکانم، هیوام خۆشیتانە[١].
١- من کەوتمە داوەوە بە هاندانی ( ) و ( )، ئەوەی دیوارەکانی دووکانی بۆ رەسمکردین، ئەو شاهید بووە بەسەرمانەوە، ئەمە بەشوێنی خۆی بگەیەنن، داواکارم لە منداڵەکان بەهیچ جۆرێك قسەی بۆ نەکەن و بڕوایان پێی نەبێت.
٢- من لەرێی نیشتماندا لەسێدارە دەدرێم، بۆیە دوا تکام وایە جلی رەشم بۆ نەکەن، چونکە پێمانەوە نایەت، بێدڵیی منداڵەکان مەکە با بۆخۆیان ئیش بکەن و خۆیان هەوڵ بدەن، رێگەی (تەلەفزیۆن)و (رادیۆ)و (تەسجیل)یان لێ مەگرن با بەئارەزووی خۆیان بن، ئەوەی من دەمەوێت تەواوکردنی قوتابخانەیە.
٣- هەوڵ بدەن ئەو شتانەی کە ئێستا ماون لە ماڵدا، دوژمن دەیەوێت دەستی بەسەردا بگرێت، بۆ ماوەیەك پەرش و بڵاوی بکەنەوە، تاوەکو بەردەستیان نەکەون، بەنیسبەت عەرزەکەی کە هەمانە، من باسم نەکردووە، ئێوەش تاوەکو وەزع بە بارێکدا دەکەوێت، باسی مەکەن، کە وەزع چاك بوو ئەوکات چیتان بەباش زانی وای لێ بکەن، ئەوەی سەرەتا بووە هۆی تووشکردنم ( ) بوو.

---

١-ئەم نامەیە لەلایەن شاخەوانی کوری و هاورێ (پەنا) عەبدوڵلای حاجی ئەحمەدەوە پێم گەیشت، سوپاسیان دەکەم.

٤- لەگەڵ (سیروان) شتم لە دووکان هەڵگرتبوو، دەری بهێنن، ئەگەر سوودی هەبوو بۆخۆتان سوودی لیّ وەربگرن، بەپێچەوانەوە بەئارەزووی خۆتان.
٥- لە مەخزەن لە پشتی دەرگای سەرەوە بەینی دەرگاو تەپەدۆرەکە شتم هەڵگرتووە، بەئاگابن.
زۆر زۆر چاوی (کاك عەبدوڵلا)ی برات ماچ دەکەم، لەگەڵ براو خوشك و کەسەکانم چاوی (سیروان)و (شاخەوان)و (تۆڵە)گیان و (شێتی)ی خۆشەویستم ماچ دەکەم، ئەوانە لەجیاتی منن چاوی (شیروان) ماچ بکەن، بەداخەوە ئەوەندە تەمەنم نەبوو، تەنها جارێکیش لەباوەشم بگرتایە، زۆر شانازیی دەکەم جێگام چۆڵ نییە، شانازیی دەکەم کە منداڵەکانم بوونە منداڵی شەهید، بەلام داواکارم بەقسەی هیچ هاورێیەك نەکەونە داوەودو سیقەیان زۆر کەم بێت، لەکۆتاییدا بەخواتان دەسپێرم، ئێستا لە ژوورێکی (٢م×٢م)داین پێنج کەسین: من و (کاك جەبار)و (کاك عەتا ئەحمەد محەمەد)و (محەمەد رەحیم)و ( مامۆستا ئەحمەد) چاوەڕوانی دوارۆژی ژیانین.
١٩٩٠/١١/٥

خوێنەری ئازیز... سەرنج لە ناوەرۆکی ئەم نامەیە بدە، کە لە پارچە نایلۆنێکدا بەدەرزی لە (١٩٩٠/١١/٥)، لە ژوورێکی (٢م×٢م)و لەناو چوارهاوریّ و لە رۆژگارێکدا نووسراوە کە هەرپێنجیان چاوەڕوانی مەرگ بوون، نێوانی نووسینی نامەکەو کۆتاییهێنان بەژیانیان، تەنها (دوو رۆژە). نامەکەی لە (٥)ی مانگدا نووسیوە، هەرخاڵەی راسپاردەیەکەو جۆرێکە لەئاگادارکردنەوەو رێنمایی و وریاکردنەوە.
خاڵی یەکەم: باسی هۆی دەستگیرکردنەکەی و ئەو (پوازە)، واتە ئەو خۆفرۆشانە دەکات کە بوونەتە هۆی دەستنیشانکردنی بۆ دەستگیرکردن و رایان دەسپێرێت کە نامەکەیان دەستکەوت، بەشوێن و جێگای مەبەستی بەگەیەنن و لێی ئاگادار بکەن.
لە خاڵی دووەمدا: ئاگاداریان دەکات کە ئەو لەپێناوی گەل و نیشتمانەکەیدا لەسێدارە دەدرێت و داوایان لێدەکات جلی رەش نەکەن و هۆکەشی گێراوەتەوە بۆ ئەوەی جلی رەشیان پێوە نایەت و راسپاردەی خێرانی دەکات، کە رێگریی لە منداڵەکانی نەکات و ئارەزوویان لەچی بوو، وەکو: تەلەفزیۆن، رادیۆ و تەسجیل با بۆیان دابین بکات و هەوڵ بدات منداڵەکانی خوێندن تەواو بکەن و هانیان بدات تا بۆخۆیان کارو کاسبی بکەن، دیارە مەبەستی لەم ئامۆژگاریيانە ئەوەبووە، کە ئەگەر منداڵەکان رێگای کارکردنیان گرتەبەرو بەئارەزووی خۆیان شتیان هەبوو، رێگای لابەلا ناگرن.
لە خاڵی سێیەمدا: ئامۆژگارییان دەکات ئەو کەلوپەلانەی لە ماڵەوە هەیانە. حکومەت بەپێی بریاری مەحکەمە هەرچی ئەموالی مەنقوولەو غەیرە مەنقوولەیانە موسادەرە دەکرێت، بۆئەوەی منداڵەکانی ئەو زیانە نەکەن، ئامۆژگارییان دەکات کە لە ماڵدا نەیهێڵن

و دووریبخەنەوە تا بەردەستیان نەکەوێت، هەروەها باسی پارچە زەوییەك دەکات* کە موڵکی خۆیەتی لە پاشـــەڕۆژدا خۆیان چۆنیان بەباش زانی وا ســـوودی لێوەربگـــرن، دیارە هاوڕێی شەهید نەیزانیوە کە دائیرەی ئەمن لەگەڵ دەستگیرکردنماندا نووسراوی بۆ سەرجەم فەرمانگە پەیوەندیـــدارەکان کردووە، کـــە بگەڕێن چی بەناویانەوەیە بۆیان ئاشـــکرابکەن. لەم خاڵەدا جارێکی دیکە هۆی دەســـتگیرکردنەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ کەســـێك لەنێوانی دوو کەوانەدا، بەبێ ئەوەی نووسیبێتی، دەستنیشان دەکات.

لـــە خاڵی چوارەمدا: ئامۆژگارییـــان دەکات و هەواڵی ئەوەیان دەداتێ کە لەگەڵ ســـیروانی کوریدا شتیان لە دووکانەکەدا شـــاردووەتەوەو هەڵگرتووەو پێیان دەڵێت: دەریبهێنن، بزانن ئەگەر سوودیان لێبینی، بەکاری بهێنن، ئەگەرنا لەناویبەرن.

لە خاڵی پێنجدا: ئاگاداریان دەکات کە لەپێش دەســـتگیرکردنیدا لە مەخزەنەکەیاندا شـــتی هەڵگرتووە، ئەوەی حەشـــاریداوە بەتەحدید شـــوێنەکەیان پێدەڵێـــت و ڕێنماییـــان دەکات کە ئاگایان لێی بێت.

لەکۆتایی نامەکەدا، سڵاو لەکەسوکارەکانی دەکات و چاوی یەکەیەکەی منداڵەکانی بەناوی (ســـیروان، شـــاخەوان، تۆڵە، شـــێنێ، شـــیروان) ماچ دەکات و ئاواتی بۆ ئەوە خواستووە، کە شـــیروانی بۆ یەك جار لەباوەش بگرتایە، خۆشـــحاڵە بەوەی کە لـــەدوای خۆی نەوەی هەیەو ڕۆڵەکانـــی درێژە بەڕێبازی باوکیان دەدەن و شـــانازیی بەوەوە دەکات کە جگەرگۆشـــەکانی بوونەتە (منداڵی شـــەهید)... بەهۆی کەمتمانەیـــی و بێباوەڕییەوە دوایان لێدەکات باوەڕو متمانە بەکەس نەکەن و قسە لای کەس نەکەن. کۆتایی نامەکەی بەوە دێنێت کە ئەوان (٥) هاوڕێـــن، هەرپێنجیان لە ژوورێکی (٢م × ٢م)دا دان، بەناو ناویان دەهێنێت و پێیان دەڵێت: ئێمە چاوەڕوانی مەرگ و لەسێدارەدان و کۆتایی ژیانین.

ئەوانەی چووبوون تەرمەکانیان لە (گۆڕســـتانی کەرخ) دەرهێنابوو، بۆیانگێڕامەوە کە بە ناو (جلە کفنەکانیاندا) گەراون، بۆئەوەی بزانن کێیان نامە یان شتی ماوەتەوە.

لەناو (جلە کفنەکانی) شەهید بەکردا، ئەم نامەیەیان دۆزیبووەوە کە لە پزووی بیجامەکەیدا بووبوو، پارچە نایلۆنێکی لوولکراو بووەو کە لەدواجاردا کردوویانەتەوەو ســـەیریانکردووە، لەسەر ئەو پارچە نایلۆنە پێچراوەیە بەدەرزی ئەم نامەیەی لەسەر نووسراوە.

## (عەتا ئەحمەد محەمەد قادر)



(عەتا ئەحمەد محەمەد قادر) ناسراو بە(عەتای حاجی ئەحمەد)[1]

- سالی (١٩٦٤) لە گەڕەکی خەبات لە سلێمانی لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- کارو پیشەی زەڕەنگەریی بووە.
- لەریزەکانی ناو کۆمەڵەدا بە (هاوڕێ زانا) ناسرابوو.
- ساڵی (١٩٨٧) لە تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بووەتە پێشمەرگە.
- چووەتە دەستەکەی شەهید مەلا ئەحمەدی گەرمیان لە چەندین شەڕدا ئازایانە بەشداریی کردووە.
- پاش ئەنفال لە ساڵی (١٩٨٨)دا بەبێ ئەوەی خۆی تەسلیم بە ڕژێم بکاتەوە، گەڕاوەتەوە ناو شاری سلێمانی و پەیوەندیی بە ڕێکخراوی سلێمانییەوە کردووە.
- لەناو شاردا ئەرکی گرتنەوەو ڕەوانەکردنی پێشمەرگە دابڕاوەکانی دوای ئەنفالی گرتووەتە ئەستۆ، ڕۆڵی بەرچاوی بینیوە لە ڕەوانەکردنی پێشمەرگە بۆ مەڵبەندی سێ.
- لەکاتی دروستکردنی شانەی چەکداردا لەناو شارو شارۆچکەکاندا ڕۆڵی جوامێرانەی لە دابینکردنی پێداویستییەکاندا بینیوەو دووکانەکەی پەناگەیەك بووە بۆ ئەو چالاکییانە.
- بەهۆی پوازێکەوە (خۆفرۆش) لە (٢٢/١٠/١٩٨٩) لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بەناوی (حەمە زاهیر تۆفیق) دەستگیرکراوە.
- لەکاتی دەستگیرکردنیداو ئەو ماوەیەی لە دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێمدا بووە، بەدڕندەترین شێوە ئازارو ئەشکەنجە دراوە، لەگەڵ ئەوەشدا قارەمان و خۆڕاگربووە.
- لە (١٦/١٠/١٩٩٠) لە مەحکەمەی سەورەی بەغدای عەواد بەندەر بە حوکمی لەسێدارەدان (ئیعدام) لەگەڵ چوار هاوڕێی قارەمانیدا حوکمدراوە.
- لە (٧/١١/١٩٩٠) لە بەندیخانەی ئەبوغرێب لەلایەن جەللادەکانی ڕژێمەوە لەگەڵ چوار هاوڕێیدا لەسێدارە دراوە.
- لە (١٨/١١/١٩٩٠) تەرمەکەی لەگەڵ تەرمی هاوڕێیانیدا لە گۆڕستانی کەرخی بەغدا بەخاکسپێردراوە.

---

١- ئەم ژیاننامەیە لە کتێبی (شەهیدان جەباری حاجی ڕەشیدو هاوڕێکانی)ەوە وەرگیراوە بەدەستکارییەوە.
* وێنەکەشی لەلایەن (هاوڕێ عەبدوڵلا)ی برایەوە پێم گەیشت.

- دوای پرۆسەی ئازادکردنی عیراق لە (٢٠٠٣/٥/٢٥) تەرمەکەی لە گۆڕستانی کەرخ لەگەڵ هاورێ شـــەهیدەکانیدا، دەرهێنراو لەڕێورەسمێکی جەماوەرییدا گەیەنرانەوە شاری سلێمانی و لە شوێنێکی تایبەت لە گۆڕستانی سەیوان بەخاکسپێردرانەوە.
- ژنی نەهێنابوو.

# سالار محەمەد سەعید عەبدولڕەحمان

(سالار محەمەد سەعید عەبدولڕەحمان)[1]



- ســاڵی (١٩٥١) لــە گەڕەکــی کانێســکانی شــاری ســلێمانی لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- بەفەرمانبەر لە شارەوانیی بازیان دامەزراوە.
- پاشــان گوێزراوەتــەوە بــۆ شــارەوانیی ســلێمانی و لە بەشــی خزمەتگوزاریی دانراوە.
- لەگەڵ ئەوەی فەرمانبەر دەبێت، بەردەوام دەبێت لەسەر خوێندن لە ئامادەیی سلێمانی کوڕان، تا لە ساڵی (١٩٧٩) قۆناغی ئامادەیی بەشی ویژەیی تەواو دەکات.
- لە وەرزی خوێندنی (١٩٧٩-١٩٨٠) لە کۆلیژی ئاداب بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێمانی وەردەگیرێت.
- پاش ئەوەی رژێم زانکۆی ســلێمانی گواســتەوە بۆ هەولێر، لە زانکۆی سەلاحەدین لەسەر خوێندن بەردەوام دەبێت.
- ســاڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بە ریزەکانی رێکخســتنی کۆمەڵەوە کردووەو رۆڵی چالاکانەی لە راکێشانی هەڤاڵاندا بینیوە بۆ ناو ریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و (ی.ن.ك) و رێکخستنیان.
- لە ســاڵی (١٩٨٢) بەهۆی فشــاری رژێمەوە بۆســەر خوێندکاران بۆ بە بەعســیکردنیان، قبوڵنەکردنــی و بەشــداریکردنی لــە راپەڕینێکــی خوێندکارانی زانکۆدا لــە هەولێر، ئەنجامەکــەی بەدەســتگیرکردنی چەند خوێندکارو گواســتنەوەی ژمارەیەکــی دیکەیان بۆ زانکۆی بەغدا، کۆتاییهات، شەهیدیش یەکێك بووە لە راگواستراوەکان.
- پاش گواستنەوەشــی بۆ زانکۆی بەغدا، شــەهید لەســەر خەبات و تێکۆشــان بەردەوام دەبێت.
- ساڵی (١٩٨٤) بڕوانامەی بەکالۆریۆس وەردەگرێت.
- بەهۆی شــەڕی نێوان (ئێران- عیراق)ەوە، شەهید لە (١٩٨٨/٣/٣١) لەفەرمانبەریی خۆی خانەنشین دەکات.

---

١-بۆ ژیاننامەی شەهید کەڵك لە کتێبی (شەهیدان جەباری حاجی رەشید و هاوڕێکانی)و ئەو نووسینەی دەشتی کوری و سەرودری برای شەهید بۆیان ناردبووم، بەدەستکارییەوە کەڵکیان لێوەرگیراوە.

- لە ئوتێل سـلێمانی گەشـتیاری ئەوسـا (ئوتێل سلێمانی پالاسی ئێسـتا) بە فەرمانبەر دادەمەزرێت.
- دوای دەسـتگیرکردنی چەند هاوڕێیەکی لە ساڵی (١٩٨٩-١٩٩٠) لەکاتی شاڵاوی ئەنفالی ڕێکخستنەکانی ناو شارەکان، شەهید سالار لە (١٩٩٠/٢/١١) دەکەوێتە بەر شاڵاوەکەو لەلایەن دەزگای ئەمنەوە دەستگیردەکرێت.
- لەکاتی ئەشکەنجەداندا خۆڕاگرو بەهێز بووەو نەیانتوانیوە زەفەری پێبەرن و بەرەو ڕوویان وەستاوەتەوە.
- لەئەنجامی ئەشکەنجەو ئازاردا، لە ئەمنی سلێمانی تووشی نەخۆشیی دەبێت.
- لـە (١٩٩٠/١٠/١٦) لەگـەڵ هاوڕێیانیدا لە مەحکەمەی بەناو سـەورە، حوکمی موئەبەد دەدرێت و دەنێردرێتە بەندیخانەی ئەبوغرێب.
- بەهۆی سەختیی نەخۆشییەکەیەوەو چارەسەرنەکردنی لە (١٩٩١/٤/١٧) ژیانی دەردەسەریی بەندیخانە بەجێدەهێڵێت و چاوی مەرگ دەنوقێنێت و دەبێتە داخێکی قورس بۆ هاوڕێکانی و کەسوکاری.
- لەدوای خۆی چوار منداڵی بەم ناوانە: (سروشت، یاداشت، دەشتی، بنار) بەجێهێشتووە.
- بەداخەوە لە مانگی شوباتی ساڵی (٢٠١٠)دا (یاداشت)ی کوڕی بەکارەساتی ئۆتۆمبێل ژیان لەدەست دەدات و لەدوای خۆی کوڕێکی یەك ساڵەی بەجێهێشتووە.

((شەهید سالار لەکاتی نەخۆشییەکەی لە بەندیخانەی ئەبوغرێب لە دەفتەرێکی یاداشـتنامەدا بە ناونیشانی (ڕووداوێکی تاڵ)[1]، چەند لاپەڕەیەکی لەسەر نەخۆشییەکەی و ئازارەکانی نەخۆشییەکەی نووسیوە. بەجێی خۆی دەزانم لەگەڵ ئەم ژیاننامەیەدا بینووسمەوەو بڵاوی بکەمەوە، وەکو یادگاریی زیندانییەك لە بەندیخانەدا.

١- ڕووداوێکی تاڵ: ئەم بابەتە لە دەفتەرێکی شەهید نووسرابووەوە، کە لە بەندیخانەی ئەبەغرێب وەکو دەفتەری یاداشت بەکاری هێنابوو. دەفتەرەکەو وێنەکەی لەلایەن دەشتی کوڕی و سەرۆوەری برایەوە پێم گەیشت، سوپاسیان دەکەم.

# ڕووداوێکی تاڵم بۆ لەگەڵ ژیاننامەی هاوڕێ جوانڕۆدا بلاوکردەوە؟

ئـــەم بابەتەی هاوڕێ (ســـالار) لە ڕۆژانی نەخۆشـــییەکەیداو دیارە بەدەم ئـــازارو ژانەوە لەو دەفتەرەی تەرخانی کردبوو بۆ ڕاگرتنی حیســـابی مانگانەی لە بەندیخانەدا، ئەم بابەتەی لە چەند لاپەڕەدا بە دەستخەتی خۆی نووسیوەتەوە، بۆ ئەوەی:

یەکەم: ئەو نووسینە وەکو یادگاریی زیندانییەك لەناو نەچێت و بۆ مێژوو بمێنێتەوە.

دووەم: بۆئـــەوەی لـــە خوێندنەوەی بابەتەکەدا خوێنەر تێ بگات کـــە ئەو هاوڕێیەمان (کاکە سالار) لەو بەندیخانە مرۆڤکوژەدا چۆن بەئازارو ژانی نەخۆشییەکەیەوە شەو و ڕۆژ تلاوەتەوەو خەو و خۆراکی نەماوەو پیاوانی بەعس چەند بێویژدان و نامرۆڤانە ڕەفتارو هەڵســـوکەوتیان لەگەڵدا کردووە، بیریان لەوە نەکردووەتەوە کە ئەو (کەڵە پیاوە) بەدڵنیاییەوە نەخۆشییەکەی کۆتایی بە ژیانی دەهێنێت، بەڵام لەخۆیان نەگرتووە لەو بەندیخانەیە دەری بکەن و بینێرنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکەی تا لەبەردەستیاندا ڕۆحی نەمری بگاتە ئاسمانی سەروەریی.

ســـێیەم: هەرکەس بەهەر شێوەو شێوازێك باسی کاك ســـالارو نەخۆشییەکەی بکات، وەکو ئەوە نییە کە خۆی لە ڕۆژان و شەوانی ژیانیدا بەدەم ئازارو ژانەوە لە نووسینێکی وادا پێمان بسەلمێنێت کە بەعس و ڕژێمەکەی چەندێ بەرامبەر بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی تاوانبار بوون.

چوارەم: لە نووسینەکەیدا بەخەتی خۆی باسی هەڵسوکەوتی هاوڕێیان و بەخەمەوەبوونیان و بێباکیی دکتۆرو پیاوانی بەندیخانە دەکات.

ئەگـــەر بەوردیـــی بابەتەکە بخوێنینـــەوە، زۆر بـــاش تێدەگەین کە ئاوات و خواســـتی ئەو هاوڕێیەمان چی بووە. لەبەرئەوەی نووسینەکە بە دەستخەتی خۆی نووسراوە، حەزم نەکرد لە ڕووی ڕێنووس و زمانەوانییەوە دەســـتکاریی بکەم، بەڵکو وەکو ئەمانەتێکی مێژوویی چۆن نووسراوە، هەرواش دەینووسمەوەو بلاوی دەکەمەوە. نامەوێت دەستکاریی تەنها وشەیەکیشی بکەم... ئەگەر چەند وشەیەك یان ڕستەیەك لە نووســـینەکەدا بە سپێتی مابێتەوە، ئەوا هۆی ئەوەیە کە نەمتوانیوە دەســـتخەتەکە بەتەواویی بخوێنمەوەو ساغی بکەمەوە، باوەڕناکەم ئەو دیاردەیەش لە نووسینەکەدا زۆر بێت و وای کردبێت نووسینەکە بێپێزو نارەوان بکات.

ئێوە (یادێکی تاڵ) بخوێننەوە، ئەو کاتە دەزانن و تێدەگەن ئەو ڕۆڵە قارەمانەی گەلەکەمان لەچ ئازارو ژانێکی نەخۆشییەکەیدا شەوان و ڕۆژانی بەسەربردووە. بەڵێ، ئا ئەمە یەکێکە لەو تێکۆشەرانەی ناو ریزەکانی ڕێکخستنی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)و (ی.ن.ك)ی سەر بەڕێکخراوی پێرەمەگروون. کە لەو ســـەردەمە سەخت و دژوارەدا، نەبەردانە خەباتی کردووە. (هاوڕێ جوانڕۆ) لەبەرئەوەی هەمیشـــە لە خەم و پەژارەی منداڵەکانیدا بووەو پەرۆشی ئەوە بووە، کە ژیان بەئاسایی بەسەر بەرن. بۆیە نامەیەکی بۆ بەڕێوەبەری بەندیخانەی ئەبوغرێب نووسیوە، بۆئەوەی نووســـراوی بۆ بەڕێوەبەریتیی خانەنشینی ســـلێمانی بۆ بکەن، بۆئەوەی

مووچەی خانەنشینییەکەی خێزانەکەی وەربیگرێت... ئەو نامە داواکارییەی لە دەفتەرەکەدا بە دەستخەتی خۆی نووسیوەتەوە، بە پێویستمزانی ئەویش بڵاوبکەمەوە.
لەکۆتاییــدا زۆر سوپاســی کاك ســەروەری برای و دەشــتی کــوڕی و کورەکانی دەکەم کە دەفتەرەکەیــان بەدەســت گەیانــدم و لە ئەنجامی ســەیرکردن و خوێندنــەوە، ئەم بابەتەی لێبەرهەم هات.

# یادێکی تاڵ

دوای مواجەهەی (١٩٩٠/١٢/١) بەچەند ڕۆژێك هەستم کرد، کە دڵم لەهەندێ خواردن تۆراوە و، خواردنی چەورو شـتی سورەکراوەم بۆ ناخورێ، لەبەر ئەوە پەنام بردە بەر خواردنی سوك وەکو خواردنی نان و ماست و نان و تەماتە... هتد.

ڕۆژانـی دوای ١٩٩٠/١٢/١٨ هەسـتم کرد، کە گـەدەم تەواو نیەو تێك چـوە، بۆیە کەوتمە هاتوچۆی (خەستەخانەی سجن)، هەرچەند ئەچومە ئەوێ یان دکتۆر نەبوو یان دکتۆری لێ بوو بەڵام دەرمان نەبوو، وە ئەو علاجانەی بۆیان ئەنوسـیم تەنها بریتی بوو لە حەبی (مغنیسۆم و لیبراکس) بەڵام ئەم حەبانە هیچ چارەیان نەکردم و دادیان نەدام، وە هەسـتم کرد کە ورگم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تووشـی ئاوسان ئەبوو، هەرچەند هەندێ لە برادەران بەڕاستی زۆر خەمیان بـوو وە بەلامەوە ئەهاتن و هەنـدێ جار ئەیان وت خواردن لەناو گەدەتا ماوەتەوە تووشـی التیهابی کردووە وە لەگەڵ ئەوەشـدا هەسـتم ئەکرد تووشـی (قبوزیەت) بووم و دانیشتنی توالیتم نیە، بۆیە زۆر لەبرادەران هەرخەریکم بوون و، هەموو جارێ پشت و سکیان ئەشێلام بـۆ ئـەوەی لەو دەردە ڕزگارم بێت، ئیـتر ماوەیەك بوو خواردنم نەبـوو، بەدەگمەن خواردنم ئەخوارد ئەویش خواردنی زۆر سـووك نەبوایە نەم ئەخوارد، ئیتر هەستم بەلاوازی خۆم کرد، سـەرباری ئەوەش شـەوان خەوم نەبوو، لەبەر ئازاری سکم چونکە بەرەو ئاوساوی ئەڕۆیشت، زۆر بێ تاقەتی کردبوم، جار بەجار بیرم ئەکردەوە ئەبێت ئەم دەردە چی بێت و خەستەخانەی ئێـرەش بەکەلـك نایەت، پیاو مراجعەی بکات تاوەکو بەباشـی (فحصی) بکەن و علاجی تەواوی بدەنێ، بەهەرحاڵ لەگەڵ هەموو ئەمانەشـدا تەنها بـیرم لەوە ئەکردەوە کەوا ڕۆژی مواجەهەی ١٩٩٠/١٢/١٤ نزیك بۆتەوەو باری تەندروستیم تەواو نیە، چۆن بتوانم بیانبینم بەم بارەوە. بەڵێ هەر چۆنێك بوو ڕۆژی مواجە هات و خێزان و مندالەکانم و براو کەس و کارم هاتن بۆلام، وە زانیان باری تەندروستیم خراپەو بۆم باس کردن کەسکم توشی ئاوساندن بوە، پێم وتن کە ئەم مواجەهەیەی تر هاتنەوە لای (دکتۆر یادگار) نەخۆشـیەکەمی تێی بگەیەنن و بزانن چی یە هەرچەندە خۆشـم نەم ئەزانی نەخۆشـیەکم چی یە، هـەر چۆنێك بوو ڕۆژی مواجەهە تەواو بوو بەجێیان هێشتم و ڕۆیشتن، بۆ شەوەکەی خەوم نەبوو، هەر ئازارم هەبوو، وە ئازارەکەم زۆر بێ شـوومار بو نەم ئەزانی چی بکەم، بەهیچ کلۆجێك نەم ئەتوانی لەسەر تەنیشـت بکەوم بخەوم تەنها هەر نەبوایە لەسـەر گازەرەی پشـت بکەوتمایە، ئیتر هەرچی پشتو سێ بەندەم هەیە، هەموو لەتاو ئازار هاواریان ئەکرد، بەڕاستی ئەو ڕۆژی مواجەهەیە (ڕزگار) کە باری تەندروستی زانیم باش نیە زۆر دڵ گران بوو زۆر غەمی بوو.

ئەوە بوو ڕۆژی ١٩٩٠/١٢/١٥ باری تەندروسـتیم بەرەو خراپی ئەڕۆیشـت و، زۆر بێ هێزو بێ تاقەت بووم، دەچوم بۆ خەسـتەخانە بەڵام بێ کەڵك بوو، بۆ ڕۆژی دوایی ١٩٩٠/١٢/١٦ ئیتر نەم ئەتوانی بڕۆم و سـکم زۆر ئاوسـا بوو، وە ئازارێکی زۆرم هەبوو، ئەوەبوو بە (سامان)م

وت تەندروستیم تەواونیە چارەم بکەن، بە عەرەبانەیەك نیوەڕۆکەی بردمی بۆ خەستەخانە، بەڵام دەوامی خەستەخانە تەواو بوبوو، تەنها (معاون طبی)ی خفری لێ بوو، وەزعەکەم تێ گەیاند ئەویش (٣) حەبی دامێ و وتی هەر ئێستا بیان خۆ، ئەگەر تا ئێوارە دانیشتنت نەبوو، ئەبێ بێتەوە، منیش حەبەکانم خواردو تا ئێوارە هەر لەناو جێگادا ئەتلامەوەو ئازارم زۆر بوو، ئیتر کات ژمێر نزیکی (٥-٦)ی ئێوارە هەمیسان بەعەربانە بردیانمەوە بۆ خەستەخانە، چونکە ئەو حەبانە کەڵکی هەر نەبوو، وە ئیتر ئەو ئێوارەیە لە خەستەخانە خەواندیانم، وەپاش سەعاتێك دکتۆری خەفەر هاتو فحصی کردم و خێرا ئاوی (مغزی)یان تێ کردم، تا بەیانی رۆژ بۆوە، ئیتر بۆ بەیانی رۆژی ١٩٩٠/١٢/١٧ دکتۆر هاتەوە لام و سەیری کردم ووتی نابێت هیچ شتێك بخۆیت، وە خواردنی لێ قەدەغە کردم، ئیتر تا (٤) رۆژ لەخەستەخانە مامەوە، وەهەموو رۆژێك برادەران ئەهاتن بۆ لام و زۆر بە پەرۆش بوون بۆم.

ئەو رۆژە اشعەی سکیان گرتم و، پاش دەرچوونی اشعەکە هیچی تێدا نەبوو، دوای ٤ رۆژ لە خەستەخانە دەرچومو، دکتۆر پێی وتم هەر ئەبێ شتی شلە بخۆیت و، هەندێك حەبی التهاباتی بۆ نوسیم وەك (امپسلین) ئیتر وتی پاش چەند رۆژێك باش ئەبیت، ئەوەبو هاتمەوە بۆ (قسم)و لەناو جێگەدا کەوتم بەڵام سەیرم ئەکرد دوای چەند رۆژێك هیچ هەستی چاك بونەوەم نە ئەدی، لەبەر ئەوە پاش چەند رۆژێك چوومەوە بۆلای هەمان دکتۆرو پێم وت کە باش نەبووم، انجا خێرا فحصی کردم و وتی تووشی (التهاباتی جگەر) بویت، رەچەتەیەکی نووسی بە زمانی (E)و حەواڵەی لای دکتۆری اخصائی باطنی کردم، کە ناوی دکتۆر (ادریس) بوو، ئەویش خێرا وتی بچۆ (فحص) پیسایت بکە، دوای ئەوەی ئەنجامی فحصی پیسای دەرچو بردمەوە بۆلای دکتۆرەکە سەیری کرد پێی وتم برۆ هیچت نییەو فحصەکە هیچی تێدانیە، پێم وت دکتۆر ئاخر سکم ئاوساوە چۆن هیچم نییە؟ وتی هیچت نییەو برۆ، بەڵێ بە بێ هیوا هاتمەوە بۆ ژوورەکەم و لەناو جێگەدا هەر ئەمدیو ئەودیوم ئەکرد لەبەر ئازارو جەنابی دکتۆریش ئەڵێت هیچت نییە. رەنگم زۆر تێکچووبوو، زۆر لاواز بوبوم رەنگم بەلای زەردیدا ئەیڕوانی سکم هەر ئاوسابوو، بەهۆی کاك (محمد طاهر)ەوە لای کابرایەك لەخەستەخانە هەر چۆنێك بوو واستەیەکمان کرد کەلای ئەو دکتۆرە بەشکم دەرزی یان دەرمانمان بۆ بنوسێت و، لەدەرەوە ئەیان کڕین، هەر چۆنێك بوو دکتۆر دەرزی (co B)ی بۆ نووسیم کاك (محمد طاهر) کە زۆر سوپاسی ئەکەم هەرچۆنێك بێت پەیدایکردن و هەمو رۆژێك ئەهات و دەرزیەکی لێ ئەدام، تارادەیەك ئەتوانم بلێم تۆزێك باش بووم، دوای ئەوە عریضەیەکم نوسی بۆ مدیری سجن کە بەشکم حواڵەی خەستەخانەی دەرەوەم بکەن، چونکە تەندروستیم باش نییەو لێرە عیلاج نییە مدیری سجن لەسەر عریضەکەی نوسی بۆ مدیری خەستەخانە، بەڵام کە چومەوە بۆ ئەنجامەکەی بێ سوود بوو، وتیان لە خەستەخانەی دەرەوەش داودەرمان نییەو هیچ دەست ناکەوێت.

پاش تەوام بوونی دەرزیەکان کە (٦)دانە بوو، تا رادەیەکی کەم تۆزێك باش بووم، ئیتر دوای

ئەوە هەر ئازاری ســـکم هەبوو، وە ئاوســـایەکەی هەر وەکو خۆی بوو، لای دکتۆری اخصائی خەســـتەخانەی سجن هەمدیســـان مراجەعەتم کردو دەرمانی بۆ نوســـیم بۆ ئەوەی کە رۆژی مـواجەهەی ١٩٩١/١/١ هاتن بیاندەمی و رۆژی ١٩٩١/١/٥ بۆم بهێنن، نزیکەی (٤) رۆژی مـاوە بـــۆ مـواجەهە هەمـوو غەمێکم ئەوە بوو، کە بەم شـــێوەیە ئەمبینن و دڵ تەنگ ئەبن، بەڵام ئەڵێی چی تەندروستیم هەروەکو خۆیەتی هیچ گۆڕانێك نەبووە تا باش بم، رۆژی مـواجەهەی ١٩٩١/١/١ هاتـــن و بەهـــەزار حاڵ بەیانیەکەی توانیم خۆم بگۆڕم، بەتانی و فەرشـــەکە کاك (سامان و عەزیز) بردیانە خوارەوە بۆ ساحەکەو رایانخست و، کاك (سامان) خێرا هاتە ژوورەوە بـــۆلام وتی وەرە خوارەوە مـاڵەوەتان هاتوە، زۆرم لەخۆم ئەکرد بۆ چونە خوارەوە نەمـنەتوانی بڕۆم، لەبەر ئاوســـاوی سکم ئەوت شتێکی قورســـم هەڵ گرتوە، دوای ئەوە هەمـدیسان کاك (سامان) هاتەوە وتی ئەوە چی ئەکەیت؟ منداڵەکانت فەقیرانە چاوەڕێی تۆیانە، ئیتر وردە وردە بە پێی پلیکانەکاندا چوومە خوارەوە بۆ ســـاحەکە، کە ســـەیرم کرد (رزگارو دەشتی) هاتوون وردە وردە بەرەو ئەوان هەنگاوم ئەناو، ئەرۆیشـــتم کە (رزگار) بەو شـــێوەیە منی بینی خێرا خـــۆی بۆ نەگیراو دەســـتی کرد بەگریـــان و منیش ئەملاو ئەولام ماچ کـــردو، وتم هیچ نییە تۆزێك نەخۆشم، ئیتر هەر دەیووت چیتە بۆ وات لیّ هاتوە رەنگت زەردبووەو لاواز بوی؟ لەم قسانەدا بوین و دایکم و باجی خانم گەیشتن و ئەوانیش تێر تێر گریان کە بەو شێوەیە منیان بینی، انجا ســـەرداری برام هات و هەمان شـــت و دوای ئەو کاك (صالح و حاجی حەســـەن) هاتنو کاك صالح زۆر بێ تاقەت و پەرێشان بوو بۆم و، دەستی کرد بە گریان، پێم وتن هیچ نییە نەخۆشی (التهاباتی کبد)م تووش بوە، ئاگادارم کردن، کە داو و دەرمانم لە سلێمانیەوە بـــۆ بهێنن و لای (دکتۆر یادگـــار) حاڵەکەمی تێگەیەنن و بزانن چی باشـــە ئەوەم بۆ بکەن، هەر ئەو رۆژە کاك عوســـمان و دایکم هاتن بۆلام لەگەڵ کاك فریق، ئیتر بەراســـتی زۆر لە کەســـوکاری برادەران ئەهاتن بۆ هەوالم، کە زانیان نەخۆشم، بەڵێ رۆژی مواجەهە تەواوبوو، بەجێیانهێشـــتم و رۆیشتن، چاوەڕوانی رۆژی مواجەهەی ١/٥ی ئەکەم، کە زۆر نزیکە دێنەوە بـــۆلام، پاش رۆژی مواجەهە باری تەندروســـتیم باش نەبوو، زۆر بـــێ تاقەت بووم وە ئازارم زۆربوو، نەمنەزانی چی بکەم، بەڵام چی بکەم هەر ئەبێ خۆم بدەمە دەست بارو زروفەکە، تا چاك ئەبمەوە، هەمـوو ئەمەلێکم ئەوە بوو کە تارۆژی ١/٥ چاك ببمەوە بەشکم کە دێن بۆلام بـــا دڵیان خـــۆش بێت و خەفەت نەخۆن، بەڵام هەرچەنـــد رۆژی مواجەهە نزیك ئەبۆوە باری تەندروستیم هیچ نەگۆڕا بەرەو باشی شەوی ١/٥ هەرچۆنێك بوو بەهەزار حاڵێك ریشم تاشی، ئیتر شەو خەوم نەبوو، هەر لەبیرکردنەوەدا بووم، کە چۆن هەرچاك نەبومەتەوەو، وەکو خۆمم؟ بەڵێ رۆژ بۆوە لەســـەرەوە هەر چاوەڕێیان بـــوم کەزوو بێن ئەوەبوو (رزگار) دەرکەوت لەگەڵ (بانە)گیاندا، ســـەیری کردم و ئەملاو ئەولای ماچ کردم، وتی باشـــتر بوی؟ پێم وت باشترم، ئینجا (گوڵزار)و منداڵەکان هاتن، بەراســـتی گزە زۆر بێ تاقەت بوو بۆم هەر ئەگریا. دوای ئەوان پاش ماوەیەك (ســـەلار)هات لەگەڵ (سارادا) وە دەرمان و دەرزیەکانیان بۆ هانیم، هەر

خێرا کاک (سامان) دەرزیەکی لێدام، دوای ماوەیەك بەختیارو کاک (نوری) هاتن بەڕاستی پێم خۆش بوو، بەڵێ زۆر خۆش بوو، کە ماڵ و منداڵ و کەسوکارو ناسیاو لام دانیشتبون، وە شتومەکی شیرینیان بۆ هێنابوم، کە هەر ئەبێ شتی شیرینی بخۆم، چونکە ترشی و چەوری قەدەغە کران لێم.

پاش مواجەهە هەموو رۆژێك دەرزیم لەخۆم ئەدا، ئەویش ماڵی کاك(سامان) ئاوابێت کە بەڕاستی زۆر هیلاك بوو بەدەستمەوە، وەهەموو رۆژێك دەرزی لێ ئەدام، هەندێ رۆژ تەندروستیم باش بوو، بەڵام هەندێ رۆژ خراب بوو، ئەو شەوانە لەبەر ئازار خەوم نەبوو، تا نزیکەی (١٢) رۆژ دوای بەکارهێنانی ئەو دەرزیانە چوومەوە بۆلای دکتۆری خەستەخانە، پێیم وت تەندروستیم باش نیە، (فحصی)کردم و ئەم حەبانەی بۆنوسیم.

أ-لازیکس ب- کفلێکس (گولاج) ج- پرۆفین

دەستم کرد بە بەکارهێنانیان تا رادەیەك باش بووم، هەستم ئەکرد ئازاری پشت و تەنیشتم لائەچێ ئەگەر چی هەرسکم ئازاری تیێدا هەیە.

هەموو هیوایەکم ئەوەیە کە تارۆژی مواجەهەی ١٩٩١/١/١٨ باش ببمەوە خۆم بچمە خوارەوەو پێشوازیان بکەم و بۆ ئەوەی دڵیان خۆش بێت، بەڵام رۆژی ١/١٦ هاتو شەوەکەی کات ژمێر(٣٠ر٢)ی شەو بەغدا درایە بەر فرۆکەو شەر لەنێوان عیراق و امریکا هەڵگیرسا، ئیتر خەمم بوو، کە ئەترسم بەم رۆژە ناخۆشە بێن بۆ مواجەم، هەرچەندە پێم وتن ئەگەر زروفەکە تەواو نەبوو نەیەن بۆلام و، پێویست ناکات تا بزانین چۆن ئەبێت ئەوا ئەمرۆ ١/١٧ وە هەر چاوەرێ ی رۆژی ١/١٨م نازانم دێن یان نا ئومێدەوارم کەسوکارم و ماڵ و منداڵم بێ وەبن.

بەڵێ لەبەر بێ سەیارەیی و نەبوونی بەنزین رۆژی ١/١٨ مواجەهەم نەبوو، نەك تەنها من بەڵکو هەموان کەس نەهات بۆلایان... ئیتر رۆژان و بەتایبەتی شەو ئازار وازی لێ نەئەهێنام و، زۆر بێ تاقەت بووم، غەمم ئەخوارد کە ئەم نەخۆشیەی من درێژەی کێشا بێ ئەوەی تۆزقاڵێك هەست بەوە بکەم کە بەرەو چاك بوونەوە ئەڕۆم، هەرچۆنێك بوو، هەر خواردنم شیرینی بوو کە تاکە رێگایەك بوو، بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشیە، هەر چۆنێك بوو بەم شێوەیە شەو و رۆژم ئەبردە سەر تا نزیکەی رۆژی ٢/٢ کە مواجەهە بوو ئەو رۆژە تەنها بەس (گزە) هاتبوو بۆلام وەکو گوڵ گەشامەوە هەرچەندە باری تەندروستیشم باش نەبوو، وە شتی بۆهێنام هەر دڵخۆشی ئەدامەوە، کە تەندروستیم باشە، نزیکەی (١٥٠) دینارێکی دامێ و دەنگی بەربوونیش لەئارادا هەبوو، هەندێ شتی زیادەم پیا ناردەوە، بەڵام ئەو دەنگی بەربوونە هەمووی درۆو دەلەسە بوو، هیچی تر. پاش تەواو بوونی مواجەهە بۆ شەوەکەی خەوم نەبوو، لەبەر ئازار بۆ رۆژی دوایش هەر بەو شێوەیە ئازار وازی لێ نەهێنام، لە رۆژی ٢ شەممە رێکەوتی ٢/٤ لای عەسرەکەی ئازارێکی بێ شومارم بۆ هات و لەهیچ شوێنێك خۆم نەگرت لەتاوا گریام برادەران هەموو دەست بەجێ زوو هاتن بە لامەوە، زۆر پەرێشان بورن

بەوەی کە تەندروســتیم خراپە، خێرا عەرەبانەیان هێناو دەســتیان گرتم و بەرەو خەستەخانە کاکە (سامان) بردمی باش بوو دکتۆری مقیمی لیّ بو سەیری کردم وتی (تشمع کبد)م هەیەو ئێســتا کارەبا نیەو دنیا تاریکە هیچ شتێکم بۆ ناکرێت سبەینیّ کاتژمێر(۳۰ر۹) وەرنەوە ئاو لە لەشت دەرئەهێنم، وە چەند دەنکە حەبێکی دامیّ کە شەو بەکاری بهێنم تا سبەینیّ، هەر چۆنێك ئەو شــەوەش ئارامم گرت تا ســبەینیّ چوومەوە بۆ نەخۆشخانەو ئینجا دوکتۆر هات کیسەیەکی هێناو دەرزیەکی گەورەی کردبە پشتما، بەڵام لەبەر ئێش نەمئەزانی چی بکەم، وە نزیکەی نیو لیتر ئاوی دەرهێناو، وتی بەمە تۆزێك باری تەندروستیت باش ئەبێت، ئەتوانم بڵێم تارادەیەك باش بوو، بەڵام علاجی کۆتایی ئەو وەزعە نەبوو بۆمن، ئەو ئاوەی لە سکمی دەرهێنا رەنگەکەی مەیلەو زەردو بەســەر ســەوزێکی کاڵ ئەیروانی، بەم شــێوەیە مامەوە هــەر چاوەروانی ئەوە بووم، کە چاك ببمەوە، بــەڵام ئەڵێی چی لێرە گیرم خواردوو کە علاج هەیە کە خەســتەخانە هەیە چارەسەرت کەمە، رۆژی جمعەی رێکەوتی ۲/۸ لای نیوەرۆکەی وتیان وەرە بانگت ئەکەن، کاك (ســامان) عەرەبانەی بۆ ئامادە کردم و، رۆیشتم، یەکێك لە حەرەسەکان وتی تۆی (سالار محمد سعید) وتم بەڵیّ وتی وەرە، لەگەڵ (کاك سامان) رۆیشتین تا نزیك دەرگای دەرەوە، کە ســەیرم کرد روانیم یەکێك لەکیســەیەکدا قابلەمەیەك شۆربای برنج و یەك شوشــە (سینەمەکی) دایە دەستم، وتی ئەوە بۆت هاتوە لەگەڵ نامەیەکی بچوك کە خوێندمەوە زانیم کە(ســیوان و رزگارو سەلار) هاتون بۆلام، بەڵام ماوەیان نەدابونیّ کە ببینن، بەهەر حاڵ نوسیبویان کە پەرداخێك لەئاوی (سینەمەکیەکە) بخۆم بۆ ناوسکم باشەو ئازارم کەم ئەکاتەوە، کە خواردمەوە پاش ماوەیەك سکم کەوتە چوون، ئەو رۆژە تا شەو هەر بەرێگەی (تەوالێت)ەوە بووم، بەڵام لەنیوە شەودا باش لێم قەوما تا گەیشتمە (تەوالێت) خۆم پیس کرد، خێرا جلەکانم لەبەرخۆم داکەن و، خۆم پاك کردەوەو جلی ترم لەبەرکرد، بۆ رۆژی دوایی واتە شەممە رێکەوتی ۲/۹ پێش نیوەرۆ وتیان وەرە مدیر بانگت ئەکات، کاکە سامان خێرا عەرەبانەی بۆ ئامادە کردم وە پێکەوە رۆیشتین حەرەسەکە لای دەرگاکە وەستا بوو، وتی تۆی (ســالار) وتم بەڵیّ وتی وەرە لەگەڵیدا رۆیشــتین تا نزیك دەرگای دەرەوە، کە روانیم لە پرسگەکەدا (سیوان و رزگارو سەلارو دەشتی گیان) چاوەروانم ئەکەن، ئیتر خێرا ئەملاولایان ماچ کردم وە زۆر دڵخۆش بووم کە هاتون بۆلام، ووتیان چویندتە لای وەزیرو واســتهمان بۆ کردی کە بتبەن بۆ خەستەخانەی دەرەوەو نامەمان هێناوە بۆ مدیری ئێرە بۆ ئەو مەسەلەیە، ئیتر ماوەیــەك لایان مامەوەو گەرامەوە وە لەگەرانەوەمدا چورمە لای مدیر بۆ مەســەلەی خەستەخانەی دەرەوە، ووتی بەیانی ئەتنێرم بۆ خەستەخانەی دەرەوە. منیش سوپاسم کرد، بۆ بەیانی لەگەڵ (کاکە ســامان)دا چومە لای مدیر ئەویش ووتی بچۆ بۆ خەســتەخانەکەمان با کتابت بۆ بکەن چوومە خەستەخانەو پاش ماوەیەك کتابیان بۆکردم بۆ خەستەخانەی (النور) لەگەرەکی (الشعلە) لە بغداد، بەڵام ئەو رۆژە ناوچەوانم نەی هێنا سەیارە نەبوو، کەوتە بەیانی وە نزیکەی کاتژمێر (۳۰ر۱۰) پێش نیوەرۆ هەر چۆنێك بوو سەیارە ئامادە بوو، لە یادم نەچیّ

ئەو شـــەوەی کە بۆ بەیانی ئەچوم بۆ خەستەخانە لەنیوە شەودا هەستام دەست بەئاو بگەیەنم بەڵام ڕەتم داو بەسەـــردا کەوتم چونکە کارەبا نەبوو، ژورەکە تاریك بوو، سەرم شکا، هەردوو بـــرادەری ژورەکە (کاك بکرو کاك مریوان)م خەبەر کردەوە! بـــە دیتۆڵ بۆیان پاك کردمەوە، وە بۆیان بەســـتم، بەڵیَ پاش ئامادە بونی ســـەیارە بەرەو خەستەخانەی (النور) کەوتینە ریَ و لەویَ دوو دکتۆر خێرا فحصیان کردم وە ووتیان بابکەوێت، ئیتر بردیانم تەســـلیمی پۆلیسی خەســـتەخانەیان کردم، کە ژورێکی تایبەت هەیە بۆ کەسانی سجن وە حەرەسی بەدیارەوەیە، دوای ماوەیەك هەمدیســـان ئەو دو دکتۆرە هاتنـــەوە لام و، باش فحصیان کردم، وتیان وەرە لەگەڵمـــان بۆ (وەحدەی باطنیە) وە چووم لەویَ نزیکەی (٧٠٠ ســـی ســـی) ئاویان لە ســـکم دەرهێنا، ئینجا دوو حەب و دەرزیەکیان دامیَ، ئەو شەوە تارادەیەك تەندروستیم فرقی کردو، هەر چۆنێك بوو رۆژم کردەوە، بۆ بەیانی حەرەسەکان گۆران و، سیَ کەسی تر هاتنە شوێنیان، بەڵام تابلێی بەد رەوشت و نەفس نزم بون، کەوتنە گاڵتە پێکردنم بە وشەی (رفیق)وە قسەو ناوناتۆرەی ناشـــیرینیان بەکار ئەهێنا بەرامبـــەرم، پاش تۆزێك دوای ئەم بەزمە کەلەبچەیان هێناو دەســـتیان بەستم بەو قەرەوێڵەیەی لەســـەری کەوتبوم، بەراستی بەم وەزعە زۆر بێزار بـــووم و دەرونم پێی تێکچوو، پاش ماوەیەك، دکتۆرێکـــی پیاو و دکتۆرێکی ئافرەت هاتنە ســـەرم دکتۆرە پیاوەکە (فحص)ی کردم و، انجا ووتی کتابی بۆ بکەن با بگەڕێتەوە، چونکە لێرە علاجمان نیەو کارەبا نیەو خۆی ئەم نەخۆشیە وردە وردە چاك ئەبێتەوە، منیش بەراستی حەزم کرد کە بگەڕێمەوە بۆ(ابوغرێب) چونکە ٢ رۆژی تر مواجههەیەو، با لەویَ مواجههەیان بکەم و نەگەڕێن بەدواما، بۆ خەســـتەخانە ئەو رۆژە کتاب تەواو بوو بەڵام سەیارە نەبوو، ئەو شـــەوەش مامەوە تا بەیانی بۆ بەیانی پێم ووتن هەرچۆنێك بێت سیارەم بۆ پەیدابکەن ئەگەر لەســـەر حسابی خۆشـــم بێت، ئیتر مقدمێك خەریکی هەوڵ دانی ســـیارە بوو، پاش نیوەرۆ ســـەیارەیەکی تەکســـیان بۆ گرتم و بە (٦٠) دینار حســـابەکەمان برانەوە، لە خەســـتەخانەی (نور)ەوە بۆ ابوغرێب، هاتمەوە بۆ ســـجن نزیکەی کات ژمێـــر (٣٠ر١) پاش نیوەرۆ بوو، ئیتر گەرامـــەوە ژورەکەی لای خۆم و برادەران لەدەورم کۆبونەوەو باســـی وەزعەکەم بۆکردن، کە چۆن لەخەســـتەخانە ئەو دوو شەوە بردمە ســـەر، بۆ رۆژی دوایی واتە پێنج شەممە، هەستام ریشم تاشی و سەرم بەملا شت چونکە ئەم مواجههەیە رێکەوتی ٢/١٥ ئەکات.

رۆژی مواجههـــە هاتو هەرچەندە تەندروســـتیم باش نەبوو وە ئازارم هەبـــوو، چاوەریَ بوم کەبێن، کەچی تا نزیکەی کات ژمێر (٩)ی بەیانی کەس دیارنەبوو، خەریك بوو دلم ئەتەقی و زۆر بـــیَ تاقەت بوم، پاش کات ژمێر(٩) ئەوەندەم زانی، (ســـەلارو کاك محســـن و چاوان) هاتن و لەدوای ئەوانیش (ســـیران‌و رزگارو سروشـــت) هاتن ئیتر ووتم ئەوە بۆ دواکەوتن؟ زۆر پەرێشـــان بووم، ووتیان لە بغداد بوین سیارەمان درەنگ دەست کەوت، باش بوو لای دکتۆر یادگار دەرمانیان بۆ هێنابوم، کە بەراستی کاری هەبوو، وە تا رادەیەك تەندروستیم باش بوو، وە ئاوسایی ســـکم تۆزێك نیشت، ئیتر رەچەتەی دەرمانەکەم دانیَ کە دکتۆری خەستەخانەی

(نور) بۆی نوسـیبوم، ووتم بـۆ ئەم مواجهەیە کە ڕێکەوتی ٣/٢ ئـەکات بۆم بهێنن، ئیتر پاش مواجهەکە کە ڕۆیشـتن ئازاری سـکم هەبـوو، تا چەند ڕۆژێك بـەڵام پاش هەفتەیەك ئازارم کەمبۆوە، وە ئێستا تارادەیەك شت ئەخۆم و پیاسە ئەکەم هەندێك جار بەڕۆژ ئەخەوم هەرچەندە بەشەو خەوم نیە، چارنیە هەرئەبێت ئارام بگرم تا چاك ئەبمەوە، ئێستا چاوەڕوانی ڕۆژی مواجهەکەم.

پێش مواجهەی ٣/٢ بە دوو ڕۆژ کاك سامان و کاك عزیز ئاویان بۆ گەرم کردم وە لەحەمامی قسم، پاش ئەم خۆشتنە تۆزێك لەشم سوك بوو، دەرمانەکانم لێ بڕاوە ئەگینا تەندروستیم باشـتر ئەبوو، بۆ شـەوەکەی خەوم نەبوو، هەندێك جار بێ تاقەت بووم، هەسـتم ئەکرد کە هەناسـەم سـوارەو زۆر بێ هێزم، بەڕاستی زۆر زۆر لاواز بووم، وە ئەم لاوازیە زۆر بێ هێزی کردوم و ناتوانم زۆر بجولێم، سـبەینێ واتە ٣/٢ مواجهەیـە چاوەڕوانم بزانم کامیان دێن؟ وە بەتایبەتی دەرمانەکانم لێ بڕان ئەمڕۆ تا ڕادەیەك تەندروسـتیم باشە هەرچەندە بێ هێزو لاوازم.

بەڵـێ ڕۆژی ٣/٢ هات و ڕۆژی جومعە بوو مواجهـە هەبوو لەم مواجهەیەدا دایکم و باجی خانم هاتبوون بۆلام بەڕاستی زۆر دلم کرایەوە و زۆر خۆشحاڵ بووم بەقسەی خۆش و نەستەق چەند سـاتێکمان بردە سـەر نانمان خواردو تۆزێ سنگی مریشك و لەگەڵ یەك دوو یاپراخم خوارد، دەرمانەکانیان بۆ هێنابوم تۆزێك لەگەڵ گوڵەدا لای محاجرەکان پێکەوە وەستاین و قسەمان ئەکرد سەبارەت بە نەخۆشیەکەم، هەرئەوەندەم خۆش بوو کە مواجهە تەواو، بوو ئیتر دوای ڕۆشـتنی ئەوان باری تەندروستیم خراپ بوو، ئازارێکی زۆرم بۆهات و زۆر بێ تاقەت بووم، چەند ڕۆژێك بەم شـێوەیە مامەوە بەهیچ شـێوەیەك نەم ئەتوانی بۆخۆم هەستم لەناو جێگەکەمـدا، ئەبوایە برادەران هەڵیان سـانمایە، بۆ توالێت ئەبوایـە یەکێکم لەگەڵ بوایە بیگرتمایە نەم ئەتوانی بۆخۆم هەنگاوێك هەڵهێنم، ئیتر شـەو و ڕۆژ لەبەر بێ هێزی و ئازار خەوم نەبوو، وام لێ هاتبو ئەت ووت یەکەم جارە وا توشـی ئەم نەخۆشـیە بووم، بەڕاستی قەت ئەوەندە بێ زار نەبووم وە دلم پەلە پەلی ئەکردو هەناسـەم سـوار بووبوو، ئەم کارە تا هەفتەیەکی کێشـا تا ڕۆژی مواجهەی ڕێکەوتی ٣/٨ هەسـتم کـرد وا وردە وردە باش ئەبم وە هەسـت ئەکەم کە ئاوساوی سـکم وا خەریکە بەتەواوی نامێنێ و کەم بۆتەوە، بەڵام هەر سـکم ئازاری هەیە بەتایبەتی ڕۆژی ١ شەممە ڕێکەوتی ٣/١٠ تۆزێك چێشتی برنجم خوارد، بەڕاستی باری تەندروستی خراپ کردم تا نزیکەی کات ژمێر (٩)ی ئەو شەوە هەو بێ تاقەت بووم و ئازارم هەبوو.

ئەمـڕۆ تا ڕادەیەك تەندروسـتیم باشـە، چاوەڕوانی ئەوەیـن لە بەندیخانـە بەرمان بەن و ڕزگاربین.

ئەمەش ئەو نامەیەیە کە بۆ بەڕێوەبەری بەندیخانەی نووسیوە.

**السيد مدير قسم الاحكام الطويلة المحترم**
**بواسطة السيد أمر قاطع المحترم**

**م/ طلب كتاب تأيد**

**اني النزيل ســالار المحكوم لمدة (٢٠)ســنة وفق المادة ١٧٥ من (ق.ع.غ.) جئتكم بطلبي هــذا.. راجيــا التفضل والأمر بالموافقة حــول تزويدى بكتاب تأييــد الى مديرية تقاعد في السليمانية وذلك لصرف رواتب التقاعدي اعتبارا من ١٩٩٠/٢/١ علما بأني من أحد الموظفين المتقاعدين.**

**هذا ولكم جزيل الشكر وفائق الأحترام.**

**النزيل**

**سالار محمد سعيد عبدالرحمن**

**قسم الأحكام الطويلة**
**ملحق قسم/٧**
**١٩٩٠/١٢/٢**

# رزگار محەمەد عەبدوڵڵا

(رزگار محەمەد عەبدوڵڵا)[1]



- ساڵی (١٩٦٣) لە سلێمانی لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیی و دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- پەیمانگەی تەکنۆلۆژیی لە کەرکوك تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بە ریزەکانی کۆمەڵەوە کردووە.
- لە (١٩٩٠/٢/٢٣) لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە مەحکەمەی سەورەی بەغدا بە موئەبەد حوکمدراوە.
- دوای ئازادکردنی لە زیندان. پلەی ڕێکخراوەیی کارگێڕی مەڵبەندی سلێمانی بووە.
- لە شەوی (١٨-١٩٩٦/٥/١٩) لەلایەن چەند دەستێکی دوژمن بەگەل و (ی.ن.ك) لە سەرچنار شەهیدکراوە.

---

١- ئەم ژیاننامەیە لە کتێبی (شەهیدان جەباری حاجی رەشید و هاوڕێکانی) وەرگیراوەو وێنەکەش هاوڕێ (بەختیار عومەر) بەدەستی گەیاندم.

## موحسین حەمەئەمین محەمەد عەلی

ناسراو بە (موحسینی مەلا حەمەئەمین هەڵەبجەیی)[1]

- ساڵی (١٩٥٢) لە بنەماڵەیەکی ئایینیی و زەحمەتکێش و کوردپەروەری شاری هەڵەبجەی شەهید لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە هەڵەبجەو قۆناغی ئامادەیی کشتوکاڵی لە بەکرەجۆ تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) خێزانی پێکهێناوە. بووەتە خاوەنی (٨) منداڵ، بەم ناوانە: (هادی، هێمن، ئەژین، ئەسرین، گوڵان، باخان و ئاڤێستا).
- ساڵی (١٩٦٦) پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابییانی کوردستانەوە کردووەو بەشداریی شۆڕشی ئەیلوولی کردووە.
- ساڵی (١٩٨٦) پەیوەندیی بە (ی.ن.ک)ەوە کردووە. لەگەڵ یەکەم تەقەی شۆڕشی نوێدا لە (١٩٧٦/٨/٨) لەلایەن رژێمەوە دەستگیرکراوەو بە (تەتەری شارەزوور) ناسراوە. لەو باوەدۆخەدا بوێرانە کاریکردووە، بەبێ ئەوەی دەزگاکانی رژێم سوودی لێوەربگرن و نهێنییەکانی بدرکێنێت، ئازادکراوە.
- پاش ئازادکردنی درێژەی بەخەبات داوەو لە ساڵانی (١٩٨٠)دا لێپرسراوی کەرتی (شەهید جەعفەر) بووە لە رێکخراوی سلێمانی.
- بۆجاری دووەم لە (١٩٩٠/١/٢٧)دا لەگەڵ ژمارەیەك هاورێی لە سنووری رێکخراوی سلێمانیدا دەستگیرکراوەتەوە. بەهۆی ئەزموونی پێشووی لە زینداندا، بەرگەی ئەشکەنجەکانی دەزگای ئەمنی سلێمانی گرتووەو خۆراگر بووە، دوژمن هیچ سوودێکی لێ وەرنەگرتووەو نهێنییەکانی نەدرکاندووە.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە مەحکەمەی سەورەی بەغدا بە (١٠) ساڵ زیندانیکردن حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشی ئەحکام تەویلە.
- لە (١٩٩٠/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە لەگەڵ هاورێکانیدا ئازادکراوەو لە (١٩٩١/١٢/٢٣) گەیشتووەتەوە سلێمانی و بەخاکی نیشتمان شادبووەتەوە.

---

١- ئەم ژیاننامەیە لەلایەن هادی کوڕیەوە ئامادەکراوەتەوەو بۆی هێناوم و بەدەستکارییەوە نووسیومەتەوە. بەکەڵکوەرگرتن لە کتێبی (شەهیدان جەباری حاجی رەشید و هاورێکانی).

تێبینی: بۆ ژیاننامەی ئەم (٨) شەهیدە کەڵك لە کتێبی (شەهیدان جاباری حاجی رەشید و هاورێکانی) وەرگیراوە. کە لەلایەن بەشی راگەیاندن و رووناکبیریی مەڵبەندی (١)ی رێکخستنی سلێمانییەوە لە ساڵی ٢٠٠١-دا چاپکراوەو بڵاوکراوەتەوە.

- دوای ئازادبوونی، لە کۆمیتەی هەڵەبجەدا خەباتی کردووەو خزمەتی ناوچەکەی کردووە وەکو کارگێڕێکی کۆمیتە.
- ساڵی (١٩٩٣) لە بەشی پەیوەندییەکانی مەڵبەندی (١)ی سلێمانی خەباتی کردووە، لەلایەن (م.س) دووجار سوپاسنامەی بۆ نێردراوە.
- دوای کارەساتی (٣١/ئاب)و گەڕانەوەی لە سەیرانبەند، کراوە بە بەڕێوەبەری ئاسایشی هەڵەبجەی شەهیدو لەوبوارەدا بە سەرکەوتوویی کارەکانی ئەنجامداوەو بەشداریی سەرجەم شەڕەکانی پاریزگاریی لە حکومەتی هەرێم کردووە.
- بەشداریی خولی ئەفسەرانی لە قەلاچوالان کردووەو بەپلەی زۆر بەرز خولەکەی بڕیوە.
- لە ڕۆژی (٢٠٠٠/٧/٩) بەهۆی نەخۆشییەوە گیانی لەدەستداوەو ژیانی کوردستانی ئازادکراوی بەجێهێشتووە.

# ژياننامەی هاوڕێيان و (پواز)

ئەو هاوڕێيانەی کە کورتەيەك لەمێژوو و ژيانيان لەم کتێبەدا بلاوکراونەتەوە، ئەو کۆمەڵە تێکۆشەرەن کە لە دامەزراندنی (ی.ن.ك)و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا بێباکانە لەپێناوی ئازادیی و سەرفرازیی گەل و نیشتمانەکەياندا خۆبەخشانە چوونەتە ناو ڕيزەکانی (کۆمەڵە)و (ی.ن.ك)ەوەو خەباتيان کردووە. لەناو شارو شارۆچکەکاندا. کە لەدوای ئەنفال ڕێکخراوی سلێمانی (پیرەمەگروون) لەبەر بارودۆخەکەو لەسەر بڕياری سەرکردايەتی و ناوەندی کۆمەڵە، سەرپەرشتی سەرجەم ڕێکخستنی پارێزگاکانی (سلێمانی، هەولێر، دهۆك، بەغداو کەرکوك)ی دەکرد. ئەگەر سەرنجی ژياننامەکان بدرێت، دەبينرێت بەتەمەنترين تێکۆشەر (تاليب سەعيد مۆرياسی)يە کە بە (عەريف تاليب و مام تاليب) ناسراوەو لەدايکبووی سالی (١٩٣٤)ە، بچکووترين تێکۆشەر (ئەردەڵان عومەر)ە، کە لەدايکبووی سالی (١٩٧٠)يە. ئەمە لەڕووی تەمەنەوە، ئەگەر لەڕووی کارو پيشەو بڕوانامەيانەوە وردبينەوە، بۆمان دەردەکەوێت چەند کەسيان خاوەنی بڕوانامەی جياجيان لە بوارە زانستييەکان و هەريەکەشيان فەرمانبەری دياری ناو دامودەزگا حکومييەکان بوون و تا ڕۆژی دەستگيرکردنيان لە کارەکەياندا دەواميان کردووە، کە خاوەن بڕوانامەکان بەشی شێرييان بەرکەوتووە. ئەوانی ديکەش هەريەکەيان خاوەنی بەرژەوەنديی و کاری تايبەتی خۆيان بوون و سەر بەهەموو چين و توێژەکانيان تێدايەو لە تەمەنی جياجيادان.

لە ژياننامەی هەريەکێکياندا دەبينرێت لە مێردمندالييەوە چوونەتە کۆڕی خەباتی سياسيی و ڕێکخراوەيی و کوردايەتييەوەو بەبێ دابڕان لە خەباتی بزووتنەوەی ڕزگاريخوازی گەلەکەيدا بەبێ سلکردنەوە، تێکۆشاون و کۆڵيان نەداوە. ئەگەر ژياننامەی هەريەکێکيان بەدووررو درێژيی بنووسينەوەو باسی ڕۆژان و سالانی خەباتکردنی بکرێت، دلنيانم هەريەکەيان کتێبێك لە ياداشتی ژيانيان بەرهەم دەهێنرێت.

زۆر لە هاوڕێيان لەکاتی نووسينەوەی ژياننامەکەيدا چەند لاپەڕەيەکی نووسيوەو بۆی ناردووم، بەلام بەرنامەم بۆ نووسينەوەی ژياننامەی هاوڕێيان لە (پواز)دا زياتر بۆ ئەوەبوو، بيسەلمێنم کە لە ڕێکخراوی سلێمانی و ڕێکخستنی شارەکاندا، ڕۆڵەگەلێکی وا تێکۆشەر بوون و بەبێ ئەوەی دەربەستی ژيانی خۆيان، خێزان و مندالەکانيان، وەزيفەو سامان و سەرمايەيان بن، ڕقنەستوورانەو لە دژی سياسەتی ڕژێمی دکتاتۆری بەعس و کە بەشالاوی ئەنفال و کيمياباران و بەکوشتنی بەکۆمەل جينۆسايدی گەلەکەمانی کرد، تێدەکۆشان و خەباتيان دەکرد. بۆيە نەمتوانی دەقاو دەقی نووسينەکانيان وەکو خۆی بنووسمەوەو بلاوی بکەمەوە، بەلکو هەولمدا لە ژياننامەکان پووختەيەك لە ژياننامەيان لەچەند خالێکدا چڕبکەمەوە، بەشێوەيەك ئەوەی من مەبەستمە بۆ کتێبەکەو بۆ خوێنەری کتێبەکە دەربکەوێت، کە ئەو کۆمەڵە تێکۆشەرە کێن و چی بوون؟ هەولمداوە بەشێوەيەکی گشتيی يەکسانيی لە نووسينەوەی ژياننامەکاندا بکەم،

جگە لــە هەندێك هاوڕێ نەبێت کە پەیوەندیی بــەکارو چالاکییەکی ڕێکخراوەیی تایبەتەوە بووەو بۆ مەبەست بڵاوم کردوونەتەوە. ڕام وایە بەم ژیاننامانە دەردەکەوێت کە لەو سەردەمە ڕەش و دژوارانەدا، گەلەکەمان و نیشــتمانەکەمان خاوەنی کۆمەڵێك ڕۆڵەی جەربەزەبوون و بەئاشــکرا بێ سڵکردنەوە ملیان لە چەقۆی تیژی دەزگاکانی بەعس و ئەمن و ئیستیخباراتی ڕژێم ســویوەو ڕووبەڕووی سیاســەتە شــۆڤێنیانەکەی بوونەتەوەو ڕازی نەبوون مل بۆ ڕژێم و پیاوەکانی کەچ بکەن.

خوێنەری خۆشەویســت (ئێمە)، واتە ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی کە بەیەك بڕیاری دادگای سەورەو بەیەك مادە حوکمدراین، ژمارەمــان گەیەنرابووە (٣٠) هاوڕێ. (٥) هاوڕێمان بە مادەی (١٥٦) بــە حوکمی ئیعدام و (٢٣) هاوڕێمان بە مادەی (١٧٥)، کە (٩)مان بە (١٠) ســاڵ و (١٤)مان بە موئەبەد حوکمدراین و (٢) هاوڕێمان ئیفراج بوون.

کاتێك بەرنامەم بۆ نووسینەوەی ژیاننامەیان داڕشت، پەیوەندیم بە زۆربەی هاوڕێیانەوە کرد، ئەوەشی خۆم دەستم پێی نەدەگەیشت بەڕێگای هاوڕێیان ئاگادارم دەکردەوە...

ئەوانەی بە هەرهۆیەکەوە نەیانتوانی بەدەنگی داواکەمەوە بێن، ئەم هاوڕێیانە بوون:

١. کامەرانی مەلا عەزیز.
٢. کامیل سابیر.
٣. محەمەد زاهیر محەمەد تۆفیق.
٤. حاجی ئەحمەد قادر.

## -٢-

# هاوڕێیانی زیندووی زیندان

## ١-جەمالی میرزا عەزیز ناسراو بە (مامۆستا جەمال)



- لە گەڕەکی دەرگەزێنی شاری سلێمانی لە ساڵی (١٩٤٥) لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیی و دواناوەندیی لە شاری سلێمانی تەواوکردووە.
- کۆلێژی ئاداب بۆ زمان و ئەدەبی ئینگلیزیی لە زانکۆی بەغدا تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٦٧) بە مامۆستای زمان و ئەدەبی ئینگلیزیی لە پەروەردەی سلێمانی دامەزراوەو پاشان نێردراوە بۆ ئامادەیی هەڵەبجە لە قەزای هەڵەبجە.
- دوای ماوەیەك گوێزراوەتەوە بۆ ناوەندیی سیروانی کوڕان لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بە شۆڕشی کوردستانەوە کردووە.
- پاش نسکۆی شۆڕش، لەگەڵ ئەوکەسانەدا کە لەناو شۆڕشدا بوون، دوورخراوەتەوە بۆ شارەکانی (روتبە، تکریت، رومادی)، ماوەی سێ ساڵ لەو شارانە وەکو مامۆستا ماوەتەوە.

**خەباتی سیاسیی:**

- لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا چووەتە ریزی (ی.ق.ك)ەوەو لەدوایدا بووە بە ئەندامی (پ.د.ك).
- لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا چووەتە ریزەکانی کۆمەڵەوە.
- درێژەی بە خەبات و تێکۆشان داوە لەناو رێکخستنە نهێنییەکان، تا لە (١٩٩٠/١/٢٥)دا لەگەڵ پۆلێك لە تێکۆشەرانی کۆمەڵە دەکەوێتە بەر شاڵاوی گرتن و لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە. کە ئەو شاڵاوەیان ناونابوو (ئەنفالی رێکخستن).
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لەبەرئەوەی هیچی لەسەر ساغ نەبووەوە لەلایەن مەحکەمەی سەورەوە ئیفراج کراوە.

- لەدوای ئازادبوونییەوە دەست بە تێکۆشان و خەبات دەکاتەوە تا ڕاپەڕینی (١٩٩١).
- لەدوای ڕاپەڕینەوە وەکو کارگێڕی مەڵبەندی سلێمانی درێژەی بە خەبات داوە.
- لەگەڵ دامەزراندنی (TV.puk)دا بۆ یەکەمجار لەو ساڵەدا وەکو یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەو دەزگایە لەگەڵ کاك عەباس عەبدولڕەزاق (عەباسی ڤیدۆ) دەکرێتە لێپرسراوی ئیداریی ئەو تەلەفزیۆنە.
- لە ساڵی (١٩٩٤)دا لە پیلانێکی چەپەڵی دوژمنانی کوردو کوردستاندا هەوڵی تیرۆرکردنی دەدرێت و بەخەستیی برینداری دەکرێت و تائێستاش بەسەختیی ئەو برینەوە دەتلێتەوە، هەرچەند چارەسەری لە وڵاتی بەریتانیا بۆکراوە.
- بەو بۆنەیەوە وەکو پەنابەرێکی سیاسیی لەو وڵاتە وەردەگیرێت و (٦) ساڵ لە لەندەن ماوەتەوە. ئێستا گەڕاوەتەوە کوردستان جارجارە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی سەر لە لەندەن دەداتەوە.
- وەکو لێپرسراوی پەیوەندییەکانی دەرەوەی (ی.ن.ك) کاری کردووە.
- پۆستی بریکاری وەزارەتی پەروەردەی دراوەتیێ و لە ساڵی (٢٠٠٣)دا پۆستی بریکاری وەزارەتی پەیوەندیی و هاوکاریی وەرگرتووە.
- لە ئێستادا خانەنشینەو لە شاری سلێمانی دەژی.

**بواری ڕووناکبیریی:**

- لەکاتی ڕاپەڕینەکانی کوردستاندا بەڵگەنامەیەکی ئێجگار زۆر دەست دەکەون و کۆدەکرێنەوە، لەبەرئەوەی مامۆستا وەك کادیرێکی پێشکەوتووی (ی.ن.ك)و شارەزایی لە زمانەکانی ئینگلیزیی و عەرەبی و کوردیا، ئەو بەڵگەنامانەی پێ دەسپێردرێت بۆ ڕێکخستن و ڕەوانەکردنی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەڕێگای ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤەوە، کە بەسەدان تەن مەزەندە دەکرا.
- مامۆستا جەمال بەهۆی شارەزایی تەواوی لە زمانی ئینگلیزیی و لە بوارەکانی مافی مرۆڤدا، بۆیە کتێبێکی لەوبارەیەوە بڵاوکردووەتەوە. کە لەلایەن ڕێکخراوی مافی مرۆڤەوە بە زمانی کوردی چاپکراوە، ژمارەیەکی زۆر لەو بەڵگەنامانەی تێدایە.
- لەبەر گرنگیی کتێبەکە کراوە بە زمانی عەرەبی و لە ئەڵمانیا چاپکراوە.
- دواتر لە کوردستان جارێکی دیکە چاپکراوەتەوە.
- هەروەها چەندین بەڵگەنامەی گوێزراوە لەنێوان کونسوڵگەریی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاو شۆڕشەکانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی و بەناوی (لەتاریکییەوە بۆ ڕووناکی) چاپی کردووە.

- نەوشیروان مستەفا لە ساڵی (١٩٩٩)دا لە لەندەن بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای داوەتێ، بۆئەوەی بیگۆڕێتە سەر زمانی کوردی.
- ئەم کتێبەی بەچاپگەیاندووە (عیراق تاوانی جینۆساید- جریمة العراق في الابادة الجماعية).
- جگە لەم بەرهەمانە، چەندین نووسینی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاوکردوونەوە بە زمانی کوردی و عەرەبی.

**تێبینی:**

ئەم مێژووی ژیانەی مامۆستا جەمال لەسەر راسپاردەی خۆی کە بە تەلەفۆن لە لەندەنەوە پێی راگەیانم لە گۆڤاری (سلێمانی)، ژمارە (٩٥)ی مانگی ئەیلوولی (٢٠٠٨) وەریگرم. منیش (مامۆستا محەمەد نووری تۆفیق)م لەوبارەیەوە ئاگادارکرد. شەوی (٢١-٢٢/٦/٢٠١٠) نووسخەیەکی لە گۆڤارەکە بۆهێنام، سوپاسی دەکەم و ئەم ژیاننامەیە لەو گۆڤارەوە وەرگیراوە کە کاتی خۆی وەکو بابەتێك بەناوی (رۆڵە بەئەمەکەکانی شار) لە دوالاپەرەی گۆڤارەکەدا بڵاوکراوەتەوە. دیارە ئەم کارەشمان بۆیە ئەنجام دا، چونکە (مامۆستا جەمال) لەوکاتەی من ژیاننامەی ئەو هاورێیانەم دەنووسییەوە، بۆ چارەسەری نەخۆشیی برینداربیەکەی چووبووەوە لەندەن و چەند نەشتەرگەرییەکیان بۆ کردبوو، کە نەیتوانی بە دەستخەتی خۆی سەراپای ژیاننامەی خۆی بنووسێتەوەو بۆم بنێرێت.

- لە مانگی (٨/٢٠١٠) مامۆستا جەمال گەرایەوە کوردستان، ژیاننامەکەم بۆ نارد، دوای سەیرکردنی چەند سەرنج و تێبینی لەسەر نووسیبوو، منیش بەهەند وەرمگرتن و چۆنی نووسیبوونەوە وام دارشتەوە کە لە (٩/٥)دا بۆی ناردووم.

## ٢- مەجید سەلیم سلێمان



- ساڵی (١٩٤٥) لە گەڕەکی مەڵکەندی شاری سلێمانی هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٥٢) چووەتە قوتابخانەو تا پۆلی (١)ی ناوەندیی خوێندووە.
- ساڵی (١٩٦١) باوکی کۆچی دوایی‌کردووەو بەو هۆیەوە وازی لە خوێندن هێناوە.
- ساڵی (١٩٦٠) پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووەو تا ساڵی (١٩٧٥) بە بەردەوامی خەبات و تێکۆشانی کردووە.
- بۆ بژێویی ژیان، چەندین جۆری کاروکاسبی کردووە.
- پیاوێکی بیرتیژو بەتوانایە لە قسەکردن و خوێندنەوەی خێزان و بنەماڵەکانی شاردا‌و پیاوێکی خۆشەویست و سەخی و کراوەیە لەناو جەماوەردا.
- دوای نسکۆی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥)، بۆئەوەی لە خەبات دانەبڕێت و بەهۆی دڵسۆزیی و پەرۆشیی بۆ گەل و نیشتمانەکەی، لە ساڵی (١٩٧٦) لەگەڵ دروستبوونی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا پەیوەندیی بە ریزەکانی (یەکێتی)یەوە کردووە.
- لەپەیوەندیکردنییەوەو لەو ساڵانەی خەباتیدا بە بەردەوامی لە خەبات و تێکۆشاندا بووە، لە چەندین بواردا بەپێی توانا یارمەتی و هاوکاریی شۆڕشی کردووە. هەر ئەرك و کارێکی خرابێتە ئەستۆ، بەبێ کەمتەرخەمیی و بەوپەڕی دڵسۆزیی و پەرۆشییەوە بەئەنجامی گەیاندووە.
- لە هەر رۆژو ساڵێکدا شۆڕش پێویستی بەکۆمەك و یارمەتی بووبێت و ئاگاداریان کردبێت، بەبێ ئەوەی سڵ بکاتەوە بەدەنگی شۆڕشەوە چووەو موڵك و سامانی بەهی شۆڕش زانیوە لەپێناوی خزمەتی شۆڕش و گەلەکەیدا.
- بەهۆی پوازێك و کەسێکی خۆفرۆشی ناو ریزەکانی رێکخستن و دەستنیشانکردنی ئەم پیاوە دڵسۆزە لەلایەن ئەو خۆفرۆشەوە، بۆ دەزگاکانی ئەمن لە رۆژی (١٩٨٩/٦/٢٥) لەگەڵ خێزان و منداڵەکانیدا لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراون.
- پاش چەند رۆژێك خێزان و منداڵەکانی ئازادکراون، بەڵام دوای (٣) مانگ دەستگیرکراونەتەوەو بۆ ماوەی (٤) مانگ لە دائیرەی ئەمنی سلێمانی زیندانیی کراونەتەوە.
- لە ئەمنی سلێمانی ئازارو ئەشکەنجەی زۆر دراوەو خۆفرۆشەکەش لەناو ئەمندا وازی لێنەهێناوە، بەڵام لەبەر خۆڕاگریی و نەدرکاندنی هیچ سەرەداوێك، دوژمن نەیانتوانیوە

کەڵکی لێوەرگرن و بەرپەرچی تاوانبارکردنی لەلایەن ئەو خۆفرۆشەوە داوەتەوە.
- دوای ئـەوەی دائـیرەی ئەمن لە ئەنجامـی خۆڕاگریی کاك مەجید، بۆیـان دەرکەوت کە تۆمەتبارکردنەکـەی لەلایـەن ئەو تاوانبارەوە، درۆیـەو بەناڕەوا دەسـتگیرکراوە. لە ڕۆژی (١٩٩٠/٥/١٩) لە ئەمنی سلێمانی ئازاد دەکرێت.
- لە ڕۆژانی زیندانییدا کە لە ئەمندا بووە، هاودەم و هاوڕێیەکی خۆشمەشرەب و خۆشەویستی ئەوانە بووە کە لەگەڵیدابوون و وورەی زۆرکەسـی بەرزدەکـردەوەو گاڵتەی بەوانە دەکرد کە لەبەردەمی ئەشکەنجەو لێکۆڵینەوەدا خۆیان بەلاواز پیشاندەدەن.
- ئێستا لە ژیاندا ماوەو تەندروستی زۆرباشەو لە دڵسۆزیی و پیاوەتیدا هەر پیاوەکەی جاران و پیاوە بەجەرگەکەی دائیرەی ئەمنی سلێمانییە.

## ٣-محەمەدی مەلاحسێن

ناسراو بە (مامۆستا محەمەد سەرسپی، حاجی)



- ساڵی (١٩٣٧) لە گەڕەکی سەرشەقام لەناو خێزانێکی ئایینیی هەژاردا لە سلێمانی لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و خانەی مامۆستایانی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) بە مامۆستای سەرەتایی لە پەروەردەی سلێمانی دامەزراوەو نێردراوەتە قوتابخانەی (قلیجە) لە شارەزوور.
- ساڵی (١٩٦٢) گوێزراوەتەوە بۆ شارۆچکەی خورماڵ و دواجار بۆ قوتابخانەی (ئیبن خەلەکان) لە سلێمانی.
- لە تەمەنی مامۆستایەتی و خزمەتی پەروەردە، جگە لە مامۆستایی چەند ساڵ یاریدەدەری بەڕێوەبەری قوتابخانە بووە.
- دوای ئازادکردنی لە ساڵی (١٩٩٢)، گەڕاوەتەوە بۆ قوتابخانەکەی خۆی لە سلێمانی.
- دوای نۆیەمین کۆنگرەی مامۆستایان و بوونی بە ئەندامی سکرتارییەتی مامۆستایان و لەبەر ئەرك و کارەکانی سکرتارییەت لە هەولێر، راژەکەی گوێزراوەتەوە بۆ پەروەردەی هەولێرو نێردراوەتە قوتابخانەی (بارزین)ی سەرەتایی.
- لە (١٩٩٤/١٢/٢١)دا کراوە بە راوێژکاری پەروەردەیی لە ئەنجومەنی وەزیران.
- لە (١٩٩٥/٧/١) گەڕاوەتەوە بۆ پەروەردەی سلێمانی بە پلەی سەرپەرشتیاری یەکەمی پەروەردەیی.
- لە (٢٠٠٠/١٠/٢٨) تەفەروغی بۆ کارەکانی یەکێتیی مامۆستایان کردووە.
- لە (٢٠٠٢/١٢/١٠) دیسان گەڕاوەتەوە بۆ پەروەردە بە پلەی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی.

- لە (٢٠٠٣/١١/١) بە یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردەی سلێمانی دانراوە بۆ کاروباری پیشەیی.
- لە (٢٠٠٤/٩/١) گەڕاوەتەوە بۆ سەرپەرشتیاری پەروەردەیی لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی پەروەردەی سلێمانی.
- لە (٢٠٠٦/٨/٣١) بەپلەی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی خانەنشین کراوە.

※ تێکڵاوبوونی بە خەباتی ڕێکخراوەیی:

- له ساڵی (١٩٦٢) لە قوتابخانەی (ئیبن خەلەکان) لە سلێمانی لەرێگای یەکێتیی مامۆستایانی کوردستانەوە تێکڵاوی بواری بزووتنەوەی رێکخراوەیی و سیاسیی بووە.
- یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان.
- لە یەکەم کۆنگرەی دامەزراندن لە ساڵی (١٩٦٢)و لە دووەم کۆنگرەی لە ساڵی (١٩٦٥) و لە سێیەم کۆنگرەی لە ساڵی (١٩٦٨)، کە بەنهێنی و لەناو شاری سلێمانی لە ماڵاندا بەستراون، ئەندامی کۆنگرەکان بووەو رۆڵی بەرچاوی بینیوە لە رێکخستنی مامۆستایاندا، لە کۆنگرەی گشتیی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستاندا بەشداربووەو لە لقی سلێمانی کارو خەباتی رێکخراوەیی کردووە تا دەستپێکردنەوەی شۆرش لە ساڵی (١٩٧٤)دا.
- دوای نسکۆی شۆرش و پیلانی دوژمنانی گەلەکەمان و دروستبوونەوەی شۆرشی نوێخوازی گەلەکەمان لەسەر راسپاردەی شەهید (ئارام)، کە بە نامەیەك ئاراستەی شەهید مامۆستا جەمال تاهیری کردبوو، تیایدا داوای دروستکردنەوەی رێکخراوەکانی خوێندکاران و مامۆستایان و ژنانی کردبوو. رێکخراوی (ی.م.ك)یان دروستکردووەتەوە.
- لە مانگی (١٩٧٧/١١) لە هاوینەهەواری سەلاحەدین کۆنفرانسی ژیانەوەی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان بە ئامادەبوونی (٩) مامۆستا کە هەر سێکەسیان نوێنەری شارەکانی (سلێمانی، کەرکوك، هەولێر) بوون. کە یەکێك لە نوێنەرەکانی سلێمانی (مامۆستا محەمەد) بووەو لەو کۆنفرانسەدا بووەتە ئەندامی سکرتارییەت وەکو نوێنەری سلێمانی هەڵبژێردراوە.
- دووەمین کۆنفرانسی لە مانگی شوباتی (١٩٨٣)، کە لە گوندی بالیسان بەستراوە، مامۆستا ئەندامی کۆنفرانس بووەو بۆ ئەندامی سکرتارییەت هەڵبژێردراوەتەوە.
- سێیەمین کۆنفرانسی لە مانگی (١٩٨٥/٩) لە سماقوولی بەستراوە، کە لەم کۆنفرانسەشدا مامۆستا محەمەد بە ئەندامی سکرتارییەت هەڵبژێردراوەتەوە وەکو نوێنەری پارێزگای سلێمانی.
- لەهەموو کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سکرتارییەت و تەنفیزیدا بەنهێنی لە سلێمانییەوە چووەتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکاندا.
- لە کۆنگرەی گشتیی دوای راپەرین لە ساڵی (١٩٩٢) بە بەشداریی نوێنەری گشت لایەنەکان، نۆیەمین کۆنگرە لە هەولێر بەسترا، لەم کۆنگرەیەشدا مامۆستا محەمەد بە ئەندامی سکرتارییەت هەڵبژێردراوەتەوە، وەکو نوێنەری (ی.ن.ك).

* خەباتی سیاسیی و بەشداریکردنی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەماندا.
- لەوکاتەوەی دەستیکردووە بە خەباتی رێکخراوی پیشەیی مامۆستایان، تێکڵاوی خەباتی سیاسیش بووە لە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا.
- کاتێك پارتی بوو بە دوو بەشەوە لە ساڵی (١٩٦٤)دا مامۆستا لەگەڵ باڵی (م.س)دا بووە.

- کاتێك بەیانی (١١)ی ئازاری ساڵی حەفتا دەرچوو، هەردوو باڵەکە یەکیانگرتەوەو پێش یەکگرتنەوە، باڵی (م.س) لە کۆنگرەیەکی نائاسایی سازکرد بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخەکەو میکانیزمی تێکەڵاوبوونەوە. مامۆستا محەمەد ئەندامی ئەو کۆنگرەیە بووە.
- کاتێك گفتوگۆ راوەستاو رژێم لە بەڵێنەکانی پاشگەزبووەوە، شۆرش دەستیپێکردەوە، مامۆستا لەگەڵ زۆربەی مامۆستایانی تێکۆشەردا چوونەتە دەرەوەو چووەتە ناوچەی پێنجوێن و لەوێ کراوە بە ئەندامی لیژنەی ناوچە.
- دوای نسکۆی شۆرش لە ساڵی (١٩٧٥)دا کاتێك دەگەرێتەوە بۆ ناوشار. لەلایەن شەهید مامۆستا جەمال تاهیر پەیوەندیی پێوە دەکرێت و دوای گفتوگۆو راگۆرینەوە، شان دەداتەوە بەر خەباتی سیاسیی لەناو کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا، لەکاتێکدا ئەم بریارە دەدات، کە شۆرشی نوێخوازی گەلەکەمان بەرپابووەتەوە، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دروستبووەو بانگەشەی شۆرشی کردووەو پێشمەرگە چوونەتەوە شاخ. مامۆستا لە رۆژی دەستبەکاربوونییەوە لە ریزەکانی کۆمەڵەو یەکێتیدا، بەچەندین پلەدا تێپەریوە تا بووەتە ئەندامی رێکخراوی سلێمانی (پیرەمەگروون)، لە ماوەی ساڵانی خەباتیدا بووەتە بەرپرسی چەندین کەرت و هێڵ و بەسەرکەوتوویی و نەترسانە ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێکردووە.
- لە (١٩٩٠/٢/١٠)، کەوتووەتە بەرشاڵاوی گرتن و لەلایەن دەزگای ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوەو ماوەی (٩) مانگ لە ئەمنی سلێمانی لەگەڵ هاورێکانیدا ماوەتەوە.
- لە (١٩٩١/١٠/١٦)، لە مەحکەمەی سەورە بە موئەبەد حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکام سەقیلە.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشتیی و گۆرینەوە ئازادکراوەو لە (١٢/٢٣)، لەگەڵ هاورێکانیدا گەیشتوونەتەوە خاکی ئازادکراوی کوردستان.
- مامۆستا محەمەد جگە لەوەی کە لە ساڵی (١٩٩٠)دا دەستگیرکراوەو حوکمی موئەبەد دراوە، لە مێژووی ژیانیدا چەند جارێکی دیکە کەوتووەتە بەر شاڵاوی گرتن.
١- لە (١٩٦٣/٦/٩)، کە رژێمی بەعس کەوتە رەشبگیریی خەڵکی سلێمانی قارەمان و ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان لەو رۆژەدا راپێچی زیندان و ئەستەبڵەکانی حامیەی سلێمانیکردو ژمارەیەکیان زیندەبەچاڵکردن، کە لەناویاندا (یاسین، ئەنوەر، حەمەبۆر، ئیسماعیل، حەمەباقی)یان تێدابوو. لەو شاڵاوی رەشبگیرییەدا مامۆستا لەگەڵ دکتۆر جەمال رەشید رەئیسی سحەی سلێمانی و فوئاد رەشید سەرپەرشتیاری پەروەردەیی و ئەحمەد ساڵح قاسم، شێخ مارف شێخ حەمەغەریب، شێخ نەزیف و مەحمود خەفاف. کە نزیکەی دوومانگ لە بەندیخانەدا ماونەتەوەو دواجار ئازادکراون.
٢- لە مانگی (١٩٦٥/٣) بەهۆی تەقەکردنەوە لەسەر شەقامی بەرخانەقا، بەیانییەکەی مامۆستاو جەمالەرەش و چەند کسێکی دیکەیان دەستگیرکرد، لەگەڵ جەمالەرەشدا کەلەبچەیان کردووەو راپێچی ئینزیباتخانەی سلێمانی کراون و دواجار براونەتە حامیەی

سلێمانی و دوایی ڕەوانەی سجنی سلێمانی کراون، ئەو سجنەی ئێستا کراوەتە (پارکی دایك)، پاش چەند ڕۆژێك لەلایەن دادوەری سـلێمانییەوە بانگکراون، هەرچەندە مفەوەزێکی پۆلیس بەسەرییەوە شاهید بووە، بەلاّم بەبڕیاری دادوەر ئازادکراوە، لەو ساڵەدا کە ئەو دەستگیرکراوە، (٥٦) ئەندام و کاربەدەستی گەورەی بەعس لەو بەندیخانەیەدا بوون، لەوانە: (نازم گزار، سلیم عیسا، عەلی علیان) لەگەڵدابووە.

## * مامۆستاو داستانی ڕزگارکردنی ئازادی سەگرمە لە مەرگ:

من کـە دەڵێم ئەوانەی لـەو ڕۆژگارەدا لە ئەمنی سـلێمانی دەسـتگیرکرابوون، ژمارەیان گەیەنرایـە (٣٠) کـەس کە لە هاوڕێ و خەڵکانی ئاسـایی و هاوڵاتیی کاسـبکارو بازاڕیی نەبوون، بەڵکو خەڵکانی تێکۆشـەرو خاوەن خەبات و بەرخودان بوون، ئەوان بوون بەوپەڕی چاونەترسـیی و ئازایەتییەوە سەرپەرشتی ڕێکخسـتنە نهێنییەکانی ناوشارەکان و مەفرەزە پارتیزانەکانی پێشمەرگەیان لە گەرمیان، چەمی ڕێزان، قەرەداغ، شارباژێر، دۆڵی جافایەتی و شـوێنەکانی دیکە دەکـرد، بۆیە دەبینرێت لـە چیرۆکی ئازادکردنی ئازادی سـەگرمەی فەرماندەو پێشمەرگە، لەکاتی برینداربوونیدا چەند هاوڕێیەك لەو هاوڕێیانەی کە لە ئەمنی سلێمانی دەسـتگیرکرابوون بەشداریسان لەو ئۆپراسـیۆنەدا کردووە کە یەکێك لەو هاوڕێیانە (مامۆستا محەمەد)ە، دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

فەرموون ئێوەو چیرۆکەکە:

کاتێك کاك ئازادی سەگرمە لەسەرکردایەتییەوە نێردرایەوە بۆ ناوچەی گەرمیان و قەرەداغ، بۆ سەرپەرشـتی مەفرەزەکانی پێشـمەرگە، زۆری نەخایاند لە مانگی (١٠/١٩٨٨)دا بەهۆی هێرشـێکی فڕۆکەکانی ڕژێمەوە بەخەستیی بریندارکراو بەهۆی ئاگادارییەکەوە کە چەندجار لە دەنگی گەلی کوردسـتانەوە خوێندرایەوەو لە ئاگادارییەکەدا داوا دەکرا کە فریای (باوکی تایلاند)، واتە ئازادی سـەگرمە بکەون، ئەوکاتە هەڤاڵانی ڕێکخراوی پێرەمەگروون بەوپەڕی توانایانـەوە کەوتنـە هەوڵدان بـۆ بەدەنگەوەچوونی ئـەو ئاگادارییە. تـا کاك ئازادیان لە گەرمیانەوە گەیاندە سـلێمانی و لە سـلێمانییەوە بۆ قەڵادزێ بەمەبەستی ڕەوانەکردنی بۆ سەرکردایەتی و دواجار گەڕانەوەی بۆ سلێمانی.. کاتێك هێنرایەوە سلێمانی، لە ماڵی هاوڕێ (سـامان مەولود) شـوێنی بۆ چاککرا. پاش چەند ڕۆژێك شەهید جەبار هاتە ماڵمان، وتی: مـن دەچم بۆ بەغداو دیارە ئاگاداری کە باوکی تایلاند لە ماڵی هاوڕێ سـامانە. ئەوەندەی مـن لێرەنابـم هەرچی داواو پێداویسـتییەکیان هەبوو بۆیان جێبەجێ بکـە. یەك دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕاسـپاردەیەی شەهید جەبار. ڕۆژێك کاتێکمزانی هاوڕێ (سامان) هات بۆماڵمان‌و شپرزەییەکی پێوە دیاربوو. وتی :مامۆستا فریای کاك ئازاد بکەوە. زۆر نائارمەو ئازارێکی ئێجگار زۆری هەیەو لەتاو ئازارەکەی هەرەشـەی چوونە دەرەوەمان لێدەکات، کە بڕوات بۆ

نەخۆشخانە ئەگەر دەرزی (پەسەدینی) بۆ پەیدا نەکەن. کاك ئازاد لەوکاتەوەی بریندارکرابوو، هەڤالێك لە رێکخراوەوە بۆ تیمارکردنی نێردرابوو. لەبەر زۆریی ئازاری، دەرزی (پەسەدین) یان لێدابوو. دیاربوو ئالوودەی ئەو دەرزییە بووبوو. کە لێی دەبڕا تەندرستی زۆر تێکدەچوو، ئازاری زۆری بۆدەهات و لەو رۆژانەشدا ئەو دەرزییەیان لێنەدابوو. هەر کاك سامان رۆیشت بەپەلە کەوتمە خۆم (د.حەمید حانەقینی)م دەناسی پیاوێکی کوردپەروەربوو. لە پێنجوێنەوە لە سالی (١٩٧٤) بووبوو بە هاورێم. چووم بۆلای لە عەیادەکەی. کە چوومە ژوورەوە، هەرخۆی بوو. وتی: فەرموو بابزانم چیتەو فەحسەت بۆبکەم. وتم: نەخۆش نیم، بۆکارێکی ئێجگار گرنگ هاتووم بۆلات. پرسی، فەرموو چییە؟ وتم: هاتووم بۆ هەندێك دەرزی پەسەدین. وتی: ئەوە لای من دەست ناکەوێت، گەلێ پۆزش و بیانووی هێنایەوە. منیش پێم وت: هەرگیز نارۆمە دەرەوە تا بۆم پەیدا نەکەیت، چونکە (پ.م)یەکی بریندارمان هەیەو پێویستی بەو دەرزییەیە. کە وام وت: راماو رەنگی گۆڕا. وتی: دانیشە ئێستا دێمەوە. دوای کەمێك هاتەوەو لە زەرفێکدا (٣) ئەمبوولی خستە دەستمەوە، وتی: ئەوە داواکەتم جێبەجێکرد. ویستم پارەی بدەمێ، لەراستیدا توورەبوو، زۆری پێناخۆشبوو. وتی: ئێمەش ئەوەندەمان بەردەکەوێت. دوای سوپاسکردنی گەرامەوە بۆمالی کاك سامان. ئەمبوولەکانم تەسلیمی کاك سامان کرد. وتم: هەرچی دیکەت ویست ئاگادارم بکە. کاك سامان وتی: ناچی بۆلای و سەرێکی لێنادەیت؟ لەبەرئەوەی ئێمە وا پەروەردەکرابووین کە تەنها ئەوکارانەی پێمان دەسپێردرا، جێبەجێبکەین و بە باشم نەزانی یەکتر بناسین، وتم: نا، ناچم بۆلای، بەلام لاپەرەیەکم بدەرێ با نامەیەکی بۆ بنووسم. ئەم نامەیەم بۆ نووسی:
(هاورێی بەرێز داوای بەپەلە چاکبوونەوەت دەکەم. ئێمە هەمیشە لە خزمەتی گەل و نیشتمان و پێشمەرگەدا دریغی ناکەین... هەربژین). ئیتر رۆیشتم. من ئەمەندە بەشداریم لەو رووداوەدا کردووەو هەر بۆ مێژوو حەزمکرد باسی بکەم.

ئەم مامۆستا تێکۆشەرو خاوەن خەباتە کاتێك خانەنشینکراوە بە پلەی (سەرپەرشتیاری پەروەردەیی) خانەنشینکراوە، لە کاتێکدا دەبینرێت و دەزانرێت مامۆستاو کەسانی دیکە بە بەرێوەبەری گشتیی و راوێژکارو وەزیرو بریکاری وەزیر خانەنشینکراون، کە لە ژیانیاندا ئامادە نەبوون تەنها رۆژێکی ژیانیان بۆ مەرگەساتی گەلەکەیان تەرخان بکەن و ئامادەش نەبوون هەوالی شۆرش و خەباتی گەلەکەیان گوێلێبگرن.

## ٤-(ئەحمەد محەمەد ساڵح عەبدولڕەحمان)

ناسراو بە (مامۆستا ئەحمەد ساڵح و مامۆستا ئەحمەدی ڕاگەیاندن)



* ژیانی تایبەت و وەزیفی

- لە (١٩٤٩/٧/١) لە گەڕەکی حاجیحانی (مەڵکەندی)ی شاری سلێمانی لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیی، دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٧٢) بەشی جوگرافیای کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدای تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بە مامۆستا (مودەریس) لە پەروەردەی سلێمانی دامەزراوەو نێردراوەتە ناوەندیی چوارتا لە قەزای شارباژێڕ.
- ساڵی (١٩٧٤-١٩٧٥) مامۆستای شۆڕش بووە لە دواناوەندیی ماوەت لە (سەردەمی شۆڕش) دا.
- ساڵی (١٩٧٥-١٩٧٦) مامۆستای دواناوەندیی سلێمانی ئێواران بووە.
- ساڵی (١٩٧٨-١٩٨٨) گوێزراوەتەوەو بۆ ناوەندیی گۆیژەی کوران.
- ساڵی (١٩٨٨-١٩٩٠) گوێزراوەتەوەوە بۆ ناوەندیی کانیسکانی کوران، وەکو مامۆستای جوگرافیا.
- دوای ئازادکردنی لە زیندان لە ساڵی (١٩٩٢-٢٠٠٠)، بووەتە سەرپەرشتیاری پسپۆریی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان لە پەروەردەی سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٦) بروانامەی ماستەری لە جوگرافیای دێنشینی بەدەستهێناوە.

لە (٢٠٠٦)ەوە وەکو مامۆستا لە بەشی جوگرافیای کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی دەوام دەکات.

- لە ساڵی (١٩٧٢) خێزانی پێکهێناوە.

* ژیانی سیاسیی و ڕێکخراوەیی

- ساڵی (١٩٦٣) لە پۆلی دووی ناوەندیی پەیوەندیی بە(یەکێتیی قوتابییانی کوردستان)ەوە کردووە.
- لە هەمان ساڵدا پەیوەندیی بە (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە کردووە.

- لەکاتی جیابوونەوەی (پارتی) (باڵی مەکتەبی سیاسـیی) لە پارتی لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیی بووە لە کۆنفرانس و کۆنگرەکاندا بەشداریکردووە لە بەغدا.
- لـە کۆنفرانسـی (قوتابییانـی کوردسـتان)ی سـاڵی (١٩٦٨)ی باڵـی(م.س) لە کەلار بەشداریکردووە.
- لەکۆنگرەی قوتابییانی عیراق سـاڵی (١٩٦٩) لە هۆڵی (خولد)ی بەغدا بەشـداریکردووە، یەکێـك بـووە لـە (٧٨) نوێنـەرە کوردەکەی کۆنگرەو لەسـەر مەسـەلەی کەرکوك کشاونەتەوە.
- سـاڵی (١٩٧٢) لـە کۆنگـرەی گشـتیی (ی.ق.ك) لە هۆڵـی زانکۆی سـلێمانی‌و دوای یەکگرتنـەوەی هەردوو باڵەکەی قوتابییان، وەك نوێنـەری قوتابییانی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا بەشداریکردووە.
- سـاڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کردووە لە ناوچەی شـارباژێڕو کراوەتە مامۆستای شۆڕش لە چوارتاو ماوەت، تا نسکۆی ساڵی (١٩٧٥).
- سـاڵی (١٩٧٢) یەکێك بووە لەو (٣٠) کادیـرەی کە لە خولی پێگەیاندنی کادیران لە لقی پارتی دیموکراتی کوردسـتان-باڵی مەکتەبی سیاسـیی. لە بەغداو لەگەڵ شەهیدان (ئارام و فەهمی قەرەداغی)دا بەشداریکردووە.
- سـاڵی (١٩٧٢) لەرێگای شەهید فەهمی قەرەداغییەوە چووەتە ریزی کۆمەڵەی (مارکسی لینینی کوردستان)ەوە.
- لە ساڵی (١٩٨٣) ئەندامی کۆنفرانسی (ی.م.ك) بووە لە (بالیسان).
- لە ساڵی (١٩٨٥) ئەندامی کۆنفرانسی (ی.م.ك) بووە لە سماقوولی.
- لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا، بەناوی نهێنی (ئاوات)و لە (ی.م.ك) بەناوی نهێنی (سەنگەر)، نووسینی نووسیوەو ناسراوە.
- لە خەباتی سیاسـیی لە ریزەکانی کۆمەڵەدا دوای وەرگرتنی چەندین پۆستی رێکخستنی نهێنی لەناو شاردا، بووەتە ئەندامی رێکخراوی سلێمانی (پیرەمەگروون).
- بەهۆی خەباتی سیاسـیی و شـاڵاوی ئەنفالی رێکخستنەکانی ناوشـار لە (١٩٩٠/١/٢٥)، کەوتووەتە بەر شاڵاوی گرتن و لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراون.
- لە جەلسـەی یەکەمـی مەحکەمە لـە رۆژی (١٩٩٠/٩/٩) لە مەحکەمەی بەناوسـەورە بەحوکمی ئیعدام حوکمدراوە.
- لە جەلسـەی سـێیەمی مەحکەمەی سـەورە، حوکمی ئیعدامەکەی گۆڕاوە بۆ موئەبەد، بەحوکمی موئەبەد بەپێی مادەی (٢/١٧٥) حوکمدراوەو نێردراوە بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکامی سەقیلە.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) لە بەندیخانەی ئەبوغرێب بە لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە ئازادکراوەو لە (١٢/٢٣) گەیشتووەتەوە ئامێزی نیشتمان.

- دوای ئازادبوون، لە کۆنگرەی یەکەمی (ی.ن.ک)دا بەشداریکردووە لە ساڵی (١٩٩٢).
- دوای کۆنگرە، کراوەتە ئەندامی مەڵبەندی (١)ی سلێمانی لە بەشی ڕاگەیاندن و پاشان کراوەتە کارگێڕ مەڵبەند بۆ کاری ڕاگەیاندن.
- ئەندامی دووەمین کۆنگرەی (ی.ن.ک) بووە.
- ساڵی (٢٠٠٠ تا کۆتایی ٢٠٠٦ جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی سلێمانی بووە، لێپرسراوی بەشی چاودێریی و هەڵسەنگاندن) بووە.
- لە ساڵی (١٩٩٤)ەوە تائێستا، واتە تا (٢٠١٠) مامۆستای بابەتی (ڕێکخستن و ڕێکخستنی سیاسی)یە لە پەیمانگەی کادیر لە قەڵاچوالان.
- ساڵی (١٩٨٣) بەنهێنی بەشداریی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا کردووە لە مێرگەپان.

## ٥- عەزیز محەمەد ئەحمەد
ناسراو بە (مامۆستا شیخ عەزیز)



- لە (١٩٤٦/٦/٨) لە گوندی حاجی مامەندی سەر بەقەزای شارباژێڕ لەنێوانی کۆمەڵێ چیای سەرکەشدا هاتووەتە دنیای خەم و کوێرەوەریی گەلەکەی لە کوردستاندا.
- لە پەنجاکاندا مالیان هاتووەتە سلێمانی و لە گەڕەکی (بەرخانەقا)نیشتەجێ بوون.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیی، ئامادەیی و پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایانی لە سلێمانی تەواو کردووە، بە مامۆستای سەرەتایی، لە (١٩٧٠/٣/١١) لە بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی سلێمانی دامەزراوەو نێردراوە بۆ دەڤەری پێنجوێن، ماوەی (١١) مانگ لەو ناوچەیە مامۆستا بووە.
- دواجار گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی (گوندی چالاخ)و لەوێوە بۆ قوتابخانەی (گوندی سابیرئاوا)، دواجار گوێزراوەتەوە بۆ ناوشاری سلێمانی. لەناو شاری سلێمانی لەچەند خوێندنگەیەك مامۆستابووە، تا لە (١٩٩٠/١/٢٣) لە خوێندنگەی (ئاوات) کەوتووەتە بەر شالاوی گرتن و لەلایەن دەزگای ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی گەڕاوەتەوە بۆ کاری پەروەردەیی.
- لە ساڵی (٢٠٠٥)دا کراوە بەیاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردەی سلێمانی.
- لە ساڵی (٢٠٠٨)دا خانەنشینکراوە.
- لە شەستەکانەوە پەیوەندیی بە خەباتی خوێندکارانەوە کردووە لە ریزەکانی (یەکێتیی قوتابییانی کوردستان)دا، تا ساڵی (١٩٧٠) خەباتی کردووە.
- لە (١٩٥٩-١٩٦٠) پەیوەندیی بە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە، لە بواری کاری حزبیدا بە بەردەوامی تێکۆشاوەو تا جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی لە ساڵی (١٩٦٤)داو لەگەڵ باڵی (م.س) ماوەتەوەو خەباتی کردووە.
- دوای بەیاننامەی ئازاری (١٩٧٠)و تێکلاوبوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی لەگەڵ پارتیدا. بە بەردەوامی خەباتی کردووە.
- لە ساڵی (١٩٧٤)دا کاتێك رژێم لە بەیاننامەی (١١)ی ئازار پەشیمان بووەوە. پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کردووەو چووەتە ناوچەی پێنجوێن، تا نسکۆی (١٩٧٥)و دوای نسکۆ گەڕاوەتەوە سلێمانی و گەڕاوەتەوە بۆکاری پەروەردەو فێرکردن.
- لە ساڵانی (١٩٧٥-١٩٧٦)دا پەیوەندیی بە کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستانەوە کردووە.

له ڕێکخستنه نهێنییه‌کانی شـارۆچکه‌ی پێنجوێن به‌وپه‌ڕی نه‌ترسییه‌وه کاریکردووه‌و به‌شداریی زوربه‌ی چالاکییه‌کانی ناوچه‌ی پێنجوێنی کردووه به ڕاپه‌ڕینه‌کانیشه‌وه.

- پاش ڕاپه‌ڕینه‌کانی پێنجوێن، که‌وتووه‌ته ژێر چاودێریی ده‌زگاکانی ئه‌من و ئیـسـتخباراتی ڕژێم و به‌ناچاریی کاری وه‌زیفیی گواسـتووه‌ته‌وه بۆ سـنووری قه‌زای دووکان و چووه‌ته (گوندی چالاخ)و سـالی (١٩٨٠) په‌یوه‌ندیی به ڕێکخستنه‌کانی ناوشاره‌وه کردووه، کاری چالاکی ڕێکخراوه‌یی به‌رده‌وام بووه.
- له‌ناو ریزه‌کانی کۆمه‌له‌دا پله‌ی حزبیی گه‌یشتووه‌ته ئه‌ندامی ڕێکخراوی سلێمانی.
- یه‌کێکه له‌و مامۆسـتایانه‌ی که هه‌ولیداوه له‌پال خه‌باتی حزبیدا، له خه‌باتی (پیشه‌یی)دا به‌شداریی بکات، کاربکات و مامۆستا عه‌زیز به یه‌کێك له مامۆستاکانی دامه‌زرێنه‌ری ڕێکخراوی (پیشه‌یی یه‌کێتیی مامۆستایانی کوردستان) ده‌ژمێردرێت.
- له کۆنفرانسـی (دوو- سێ)ی (یه‌کێتیی مامۆسـتایانی کوردستان)دا له سالانی (١٩٨٣-١٩٨٥)دا له (بالیسـان)و (سماقوولی) به‌نهێنی به‌شداریی کۆنفرانسه‌کانی که له ناوچه‌ی ژێر ده‌سه‌لاتی شۆڕشدا به‌ستراون، کردووه.
- له‌کاری حزبیدا په‌یوه‌ندیی به کۆمیته‌ی هه‌رێمه‌کانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌وه هه‌بووه.
- به‌شـدارییه‌کی زۆری له خه‌بات و چالاکییه‌کانی ڕێکخراوی سلێمانیدا کردووه‌و به‌رپرسی چه‌ندین پۆل و که‌رتی ڕێکخستن بووه.
- له سـه‌رتاوه تا (١٩٧٦) وه‌کو ئه‌ندام پۆل و پاشان ئه‌ندام ڕێکخراوی (سووره) له پێنجوێن. له سالی (١٩٧٨) بووه‌ته ئه‌ندام که‌رت و له‌م که‌رتانه‌دا خه‌باتی کردووه، (که‌رتی شه‌هید ئیسماعیل، شه‌هید شیهاب)، تا بووه‌ته ئه‌ندامی ڕێکخراوی سلێمانی.
- له سالانی (١٩٨٥-١٩٨٦) ئه‌ندام ڕێکخراوی سێبه‌ری سلێمانی بووه.
- له (١٩٩٠/١/٢٣) له‌گه‌ل شـالاوی ئه‌نفالی ڕێکخسـتندا که‌وتووه‌ته به‌ر شـالاوی گرتن و له‌لایه‌ن ئه‌منی سلێمانییه‌وه ده‌ستگیرکراوه.
- دوای ئازارو ئه‌شـکه‌نجه‌یه‌کی زۆرو دوای (٩)مانگ مانه‌وه له ئه‌منی سلێمانی و سێ جار بردن بۆ مه‌حکه‌مه، له (١٩٩٠/١٠/١٦)دا له مه‌حکه‌مه‌ی به‌ناوسه‌وره له‌گه‌ل هاوڕێیانیدا به موئه‌به‌د حوکمدراوه‌و نێردراوه‌ته به‌ندیخانه‌ی ئه‌بوغرێب، به‌شی ئه‌حکام سه‌قیله.
- له (١٩٩١/١٢/٢٢) به لێبووردنی گشـتیی و گۆڕینه‌وه له‌گه‌ل هاوڕێکانیدا ئازادکراوه‌و له (١٩٩١/١٢/٢٣) گه‌ڕاوه‌ته‌وه کوردستانی ئازادکراو.
- دوای ئازادبوونی گه‌ڕاوه‌ته‌وه بۆکاری په‌روه‌رده‌یی.
- دوای ئازادبوون له (١٩٩٢/٤/٢) بووه‌ته کارگێڕی کۆمیته له مه‌لبه‌ندی سلێمانی.
- له (١٩٩٥) بووه‌ته به‌رپرسی کۆمیته‌ی مامۆستایان.
- سـالی (١٩٩٦) بووه‌ته ئه‌ندام مه‌لبه‌ندی سلێمانی و به لێپرسراوی کۆمیته‌ی مامۆستایان ماوه‌ته‌وه.

- دواجــار بووەتە لێپرســراوی ئەم کۆمیتانــە: (کۆمیتەی تایبەت، ١١ کاریزەوشــک، ٦ی چوارباخ).
- لەبواری کاری ڕێکخراوی پیشــەیی، لەگەڵ ئازادبوونیدا لەگەڵ مامۆستاکانی هاوڕێیدا، خەباتی پیشەیی لەناو یەکێتیی مامۆســتایانی کوردستاندا کردووە، وەکو ئەندام لقی سلێمانی.
- ئەندامــی کۆنگرەی (٩)ی (ی.م.ک) بووەو دوای کۆنگرە بووەتە ئەندامی لقی ســلێمانی و لێپرسراوی لقی سێبەری (ی.م.ک).
- ئەندامی کۆنگرەی (١-٢)ی (ی.ن.ک)و پلینۆمەکان بووە.
- ئێستا وەکو کادیرێکی کەنارخراو لە هیچ ئۆرگانێکی (ی.ن.ک) کار ناکات.

## ٦- (عەبدولڕەحمان قادر غەفوور)

ناسراو بە (شیخ عەبدول)



- ســالی (١٩٥٤) لە گوندی دۆڵەسووری سەر بەقەزای پێنجوێن لەدایکبووە.
- لــە ســالی (١٩٥٦) ماڵیان هاتووەتە سلێمانی و لە گەڕەکی چواربــاخ بوونەتــە کرێچــی و پاشــان چوونەتــە گەڕەکی شێخان.
- لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٧) ماڵیان چووەتە سەرچنار.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سەرچنار تەواوکردووە.
- ســالی (١٩٦٨) لەکاتێکــدا خوێنــدکاری پۆلــی دووەمــی ناوەندیی بــووە، پەیوەندیکردووە بــە یەکێتیی قوتابییانی کوردستانەوە.
- ســالی (١٩٦٩) پەیوەندیی بە (پارتی دیموکراتی کوردستان- باڵی مەکتەبی سیاسیی)ەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٧٤) لەکاتێکدا خوێندکاری پۆلی شەشەمی ئامادەیی بووە، پەیوەندیی بە شۆڕشی گەلەکەمانەوە کردووە.
- لەدوای هەرەســی شۆڕشــی ئەیلوول، ئامادەیی تەواوکردووە، پاشان دەورەیەکی مەساحی لە بەغدا، کە ماوەکەی شــەش مانگ بووە، تەواوکردووە، لە ســالی (١٩٧٦)دا بووە بە (مساح)و لە ناوچەی (خاڵس)ی پارێزگای دیالە دامەزراوە.
- لە ســالی (١٩٧٧)دا خێزانی پێکهێناوە، باوکی ســێ کورو دوو کچە بەم ناوانە: (کارزان، کاردۆ، هێژا، خەندە، کانی).
- ســەرەتای ســالی (١٩٨٠) پەیوەندیی بــە ریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردســتانەوە کردووە.
- بەردەوامبووە لە خەباتی سیاســیی و لە ســالی (١٩٨٢) لەرێی رێکخســتنەوە پەیوەندیی بە ریزەکانی شۆڕشــەوە کردووە، هەر لەوســالەدا بە فەرمانی شــۆڕش گەڕاوەتەوە ناو شــار بۆ بەردەوامبوون لەکاری رێکخســتنی نهێنی. گەڕانەوەکەشی بەهۆی دەرچوونی لێبووردنی گشتییەوە بووە.
- پلە بەپلەی رێکخســتن لەســەر کارو خەباتی نهێنی بەردەوام بــووە، تا لە (١٩٩٠/٢/١٣) لەگەڵ کۆمەڵێك هاورێیدا تووشی شاڵاوی گرتن هاتوون.
- لــە رۆژی (١٩٩٠/١٠/١٦) لەلایەن دادگــای بەناو (الثورة)ی رژێمی بەعســییەوە حوکمی

موئەبەد دراوەو نێردراوە بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشی ئەحکام سەقیلە.

- لە رۆژی (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوەیان لەگەڵ هەندێك ئەفسەری دیل ئاڵوگۆڕیان پێکراو ئازادبووە.
- سەرەتای ساڵی (١٩٩٢) کراوەتە ئەندامی مەڵبەندو لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی سەرچنار.
- ساڵی (١٩٩٦) لەگەڵ دامەزراندنی مەکتەبی مافی مرۆڤ، وەك ئەندامی لیژنەی سلێمانی دەستبەکاربووە.
- ساڵی (١٩٩٨) بووە بەئەندامی مەکتەبی مافی مرۆڤ.
- کۆتایی ساڵی (١٩٩٩) بووە بە یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایش بۆ یاساو مافی مرۆڤ.
- ساڵی (٢٠٠١-٢٠٠٢) کۆلێژی یاسای لە زانکۆی سلێمانی تەواوکردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) کراوە بە بەڕێوەبەری گشتیی چاودێریی کۆمەڵایەتی لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی.
- لە ناوەراستی ساڵی (٢٠٠٧) خانەنشین کراوە.
- لەهەمان ساڵدا پەیوەندیی کردووە بە سەندیکای پارێزەرانەوەو دەستی کردووە بەکاری پارێزەریی و تائێستاش بەردەوامە.
- وەك بەردەوامبوونی لە خەباتی ڕێکخراوەییدا، لە مانگی کانوونی دووەمی (٢٠١٠)ەوە لە مەکتەبی هەڵبژاردنی (ی.ن.ك) وەك بەرپرسی بەشی یاسا کاردەکات.
- لەبواری نووسین و ڕۆژنامەگەریی و رووناکبیریدا:
- چەندین وتاری جۆراوجۆری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە.
- نامیلکەیەکی بەناوی (هەڵوێست) لە ساڵی (٢٠٠٥) بەچاپگەیاندووە، کە چەند کورتەچیرۆکێکی لەخۆگرتووە.
- دەربارەی مافی مرۆڤ، نامیلکەیەکی بەچاپگەیاندووە بەناوی (گوڵبژێرێك لە مافەکانی مرۆڤ).
- (پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان)ی کردووە بەکوردی و دووجار لەچاپدراوەتەوە.
- جێگری سەرنووسەری گۆڤاری پەیامی مرۆڤایەتی بووە، کە مەکتەبی مافی مرۆڤ دەریدەکرد.
- لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ناوخۆ بووە، پاشان بووەتە سەرنووسەری گۆڤارەکەو دوای ئەوەی دوو ژمارەی لێ دەرکردووە، لەسەر داوای خۆی وازی لێهێناوە.
- لە ساڵی (١٩٩٧)ەوە وەك ماموٚستای وانەی مافی مرۆڤ، کە سەدان سەعات ئەم وانەیەی وتووەتەوە لە پەیمانگای کادیران و خولەکانی ئاسایش و پۆلیسداو تائێستا بەردەوامە.
- ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە.

- ئەندامی کۆمکارانی زیندانییە سیاسییەکانی کوردستانە.
- ئەندامی سەندیکای پارێزەرانی کوردستانە.
- ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کوردە.

## ٧- عەلی ساڵح سلێمان

ناسراو بە ( مام عەلی)و (عەلی زراعە)



- ســاڵی (١٩٤٤) لە قۆخی پیرمەندی گوندی نۆرکی شارباژێڕو لە ناحیەی ســیوەیلی قەزای چوارتای پارێزگای سلێمانی لەناو خێزانێکی جوتیاردا لەدایکبووە.
- ســاڵی (١٩٥٥) لەگەڵ چەند ماڵەخزمێکیاندا لە شــارباژێڕەوە هاتوونەتە گونــدی (زرگوێزی گــەورە)ی ناحیەی تانجەرۆی شارەزوور.
- ســاڵی (١٩٥٥) چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی لە گوندی زرگوێز قۆناغی سەرەتایی تەواوکردووە.
- ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆی تەواوکردووە.
- پەیمانگەی تەعاون و ئیرشادی لە بەغدا تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٧١) لەمحتەی تەربییەی حەیوانی لە سلێمانی دامەزراوە.
- ساڵی (١٩٨٥-١٩٨٩) جێگری بەڕێوەبەری سامان و تەندروستی ئاژەڵ بووە لە سلێمانی.
- لەدوای راپەڕین و ئازادبوونی لە زیندان لە (٢٠٠٠/١/١) بووەتە جێگری بەڕێوەبەری گشتیی کشتوکاڵی سلێمانی.
- لە (٢٠٠٦/١/١) بەپلەی بەڕێوەبەری گشتیی خانەنشین کراوە.
- ئێستا سەرۆکی سەنتەری بابانە لە سلێمانی.
- ســاڵی (١٩٥٩) پەیوەندیی بە رێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووەو بە بەردەوامی و بەبێ دابڕان کاریکردووە.
- لەکاتی ئینشــقاقەکەی پارتی لە ساڵی (١٩٦٤) لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا ماوەتەوەو لە پارتی شۆڕشگێڕی کوردستاندا خەباتی کردووە.
- لەکاتی رۆیشتنی سەرکردایەتی پارتی شۆڕشگێڕ بۆ ئێران، لە رێکخراوی تانجەرۆ بەنهێنی خەباتی کردووە.
- دوای گەڕانەوەی ســەرکردایەتی بۆ کوردســتان لەسەر بڕیاری (هەڤاڵ مام جەلال) چووەتە بەشــی عەسکەریی و لقێکی پێشمەرگەی بە ناوی لقی رێکخراوی تانجەرۆوە لە هێزی شارەزوور کردووەتەوە تا ساڵی (١٩٧٠).
- دوای دەرچوونــی بەیاننامەی (١١ی ئــازاری ١٩٧٠) لەگەڵ هەڤاڵاندا چــووە بۆ بەغدا، تا لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان تێکڵاوبوونەتەوە.
- لەکاتی تێکچوونەوەی گفتوگۆی رژێم لەگەڵ ســەرکردایەتی شۆڕشــداو لە ساڵی (١٩٧٤)

کراوه بە لێپرسـراوی ڕێکخراوی بەکرەجۆو ڕاسـتەوخۆ پەیوەندیی بە لقی (٤)ەوە بووە، بەنهێنی لەو سنوورەدا کاریکردووه.

- بەهۆی ئاشـکرابوونییەوه لەلایـەن ڕژێمەوه لە (١٩٧٥/١/١) بەیارمەتـی بەرێوەبەرەکەی توانیوەتی دەربچێت و پەیوەندیی بە شۆڕشەوە بکات و دەستگیرنەکرێت.
- لـە سـاڵی (١٩٧٦) لەڕێگای دکتۆر خەسـرەو خاڵەوە پەیوەندیی بـە ڕیزەکانی کۆمەڵەو (ی.ن.ك)ەوە کردووه.
- لەماوەی سـالانی خەباتیداو لەناو ڕیزەکانـی کۆمەڵەدا چەندین پلەی پێدراوەو ئاڵوگۆڕی زۆری پێکراوەو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشـەران خەباتی نهێنییان لەناو شـاردا کردووه، کە ناکرێت ناوی ئەو هاوڕێیانە لەم نووسینەدا بنووسرێت.
- ماوەیەك بەرپرسـی چەك و تەقەمەنی ڕێکخراوی سـلێمانی بووەو بەنامەو ناونیشـانی تایبەت دابەشیکردوون.
- ماوەیـەك پـردی پەیوەندیـی نێوانی ڕێکخـراوی سـلێمانی و مەڵبەنـدی (١) بووە لە (بەلەکجار).
- ماوەیەکیش پردی پەیوەندیی نێوانی ڕێکخراوی سـلێمانی و هاوڕێیانی قەڵادزێ بووە بۆ گواستنەوەو هێنان و بردنی پۆستەی ڕێکخراو بەرێگای هەڤاڵ (جەلالی عەلی ئاغا).
- لە دروسـتکردنی مەفرەزەی پێشـمەرگەی ناوشـارو پارتیزاندا لەگەڵ چەند هاوڕێیەك و بەتایبەتی هاوڕێ جەلالی عەلی ئاغدا لەسـەر ڕاسـپاردەی ڕێکخراوی سلێمانی ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە.
- ماوەیـەك چەك و تەقەمەنی و دەرمان لەلای کۆکراوەتەوەو بەنامەی ڕێکخراو نێردراوە بۆ تیپەکانی (٣١-٣٣)ی شاربازێر.
- لە (١٩٩٠/١/٢٤) لەکاتی شـالاوی ئەنفالی ڕێکخستنی ناوشارەکان کەوتووەتە بەرشالاو و لەلایەن دەزگای ئەمنی سلێمانییەوه دەستگیرکراوه.
- دوای مانـەوەی (٩) مانگ لە ئەمنی سـلێمانی، لـە (١٩٩٠/١٠/١٦) لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێکانی بە موئەبەد حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشـی ئەحکام سەقیلە.
- لـە (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشـتیی و گۆڕینەوه لەگـەڵ هاوڕێکانیدا ئازادکراوەو ١٢/٢٣ بەخاکی نیشتمان شادبووەتەوه.
- دوای ئازادبوونی بووەتە ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك).
- دوای کۆنگرە، بووەتە ئەندامی مەڵبەندی سلێمانی و لێپرسراوی کۆمیتەی بەکرەجۆ.
- ساڵی (٢٠٠٦) بووەتە لێپرسراوی کۆمیتەی تایبەت و دواجار چووەتە بەشی چاودێریی مەڵبەند.
- ماوەیەك لێپرسراوی کۆمەلایەتی مەڵبەند بووە.
- جارێکی دیکە کراوەتەوه بە لێپرسراوی کۆمیتەی بەکرەجۆ.

- تا چووەتەوە بۆ کاری حکومیی، ئەندامی مەڵبەند بووە.
- ئەندامی دووەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووە لە سلێمانی.
- تائێســـتا لەسەر هەڵوێستی جوامێرانەی لە خەباتدایە، بەردەوامە لەناو (ی.ن.ك )دا بەبێ ئەوەی لەهیچ ئۆرگانێکی یەکێتی کاری هەبێت.

## ٨- كارزان ئیسماعیل ئەحمەد



ناسراو بە (کارزانە قەڵەو)

- ساڵی (١٩٦٣) لە شاری قەڵادزێ هاتووەتە دنیاوە.
- قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە قەڵادزێ تەولوکردووە.
- قۆناغی ئامادەیی لە ئامادەیی پیشەسازیی (١٧ی تەمووز) لە سلێمانی تەواوکردووە.
- لە(١٩٨٩/٧/٧)ژنی هێناوە.
- باوکی چوار مندالە بەم ناوانە: (ئاریز، تیشوو، گلێنە، ئالان).
- ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
- لە یادی (١٩٧٤/٤/٢٤)ی قەسفی شاری قەڵادزێ لەلایەن رژێمەوە لە (١٩٨٢/٤/٢٤)دا بەشداریکردووە، کە لەشێوەی راپەرین و رێپێواندا بەرێوەچوو. لەو یادەدا وەکو کادیرێکی دیارو بەرپرس سەرپەرشتی رێپێوانەکەی کردووەو رۆلی پێشەنگی بینیوە
- ساڵی (١٩٨٥) چووەتە دەرەوەو پەیوەندیی بە شۆرشەوە کردووەو لە کەرتی رێکخستنی قەڵادزێ بووەتە پێشمەرگە.
- ساڵی (١٩٨٦) لە پێشمەرگایەتییەوە بەبریار گەراوەتەوە بۆ ناوشارو بۆ کارو خەباتی تایبەتی رێکخستنەکانی ناوشار.
- تەتەری رێکخستن بووە لەنێوانی سلێمانی- هەولێرو هەولێرو پشدەرداو بەزیرەکی ئەرکەکانی سەرشانی لەکاتی خۆیدا ئەنجامداوە.
- لە گواستنەوەی کاك (ئازاد حەمە غەریب) (ئازادی سەرگرمە) لە گەرمیانەوە بۆ سلێمانی و لە سلێمانییەوە بۆ قەڵادزێ و لە قەڵادزێوە بۆ سلێمانی و بۆ دواجار بردنەوەی لە سلێمانییەوە بۆ قەڵادزێ وەکو هاورێیەکی لێهاتوو، نهێنی پارێزو خاوەن متمانە، یەکێك بووە لە هاورێ کارامەکان لە مانگی (١٩٨٨/١١)دا ئەو ئەرکانەی پێی سپێردرابوو لەکاتی خۆیداو بەبێ دواکەوتن و نەترسانە جێبەجێی کردووە.
- لە شەوی (١٣-١٩٨٩/١٠/١٤) لەلایەن دائیرەی ئەمنەوە لە ماڵەکەی خۆیدا لە سلێمانی دەستگیرکراوە.
- لەبەرئەوەی خۆراگربووەو نەیانتوانیوە هیچی لەسەر ساغ بکەنەوە، بەمەبەستی ئازادکردن لە (١٩٨٩/١٢/١٦)دا نێردراوە بۆ بەرێوەبەرێتیی پۆلیسی سلێمانی.

- لەبەر چەند هۆیەك جارێکی دیکەو لە (١٩٨٩/١٢/١٩)دا لە بەڕێوەبەرێتی پۆلیسی سلێمانییەوە بردوویانەتەوە بۆ دائیرەی ئەمن.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە دادگای سەورە لە بەغدا لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێیانی بە (١٠) ساڵ زیندانیی حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکام سەقیلە.
- دوای ئەوەی بەهۆی لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە (١٩٩١/١٢/٢٢) ئازادکراون. ئەو لە بەندیخانەوە نێردراوە بۆ خزمەتی سەربازیی لە سەربازگەی بەغدا لە تکریت.
- لە (١٩٩٢/١/١) لەڕێگای وەرگرتنی مۆڵەتی سەربازییەوە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لە زیندان و خزمەتی سەربازیی رزگاری بووەو گەیشتووەتەوە خاکی نیشتمان.
- ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووە.
- لە ساڵی (١٩٩٢)وەوە بە بەردەوامی کارو خەباتی لە ئۆرگانەکانی (ی.ن.ك)دا کردووە.

**تێبینی:**

پانۆرامای بریندار بوون و گواستنەوەی کاك ئازاد محەمەد غەریب (ئازادی سەگرمە)، هاوڕێ (ئاکۆ محەمەد وەهبی) لە ژمارە (٢)ی حوزەیرانی (١٩٩٦)ی گۆڤاری پێشمەرگەدا بەدوورو درێژیی و بە وێنەو بەڵگەنامەوە، بەناونیشانی (هەڤاڵ ئازادی سەرگرمە چۆن لە مەرگ و سەقەتبوون رزگارکرا؟!)، نووسیوەو بڵاویکردووەتەوە. کە لە مانگی (١٩٩٨/١٠) دا بووە، لەو نووسینەی (کاك ئاکۆ)دا لە چەندین شوێندا باسی (هاوڕێ کارزان)ی کردووە. لەبەرئەوەی بابەتەکەی (کاك ئاکۆ محەمەد وەهبی) بابەتێکی گشتیی پانۆراماکەیەو باسی رۆڵی جوامێرانەی ژمارەیەك هاوڕێی ناو رێکخستنەکانی کۆمەڵەی لە سنووری رێکخراوی سلێمانیدا کردووە.

(هاوڕێ ئاکۆ)، واتە (کارزان ئیسماعیل)یش لەگەڵ نووسینەوەی ژیاننامەکەیدا باسی لەو پانۆرامایەی ئەو رۆژگارو سەردەمە سەختە کردووە، کە زیاتر پەیوەندیی بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی خۆیەوەتی لەو کارو خەباتەدا، بۆیە بەجێی خۆی دەزانم نووسینەکەی (هاوڕێ ئاکۆ، واتە کارزان ئیسماعیل) لەم کتێبەدا وەکو بابەتێك کە پەیوەندیی بە هاوڕێیەکی زیندانیمانەوەیە، بڵاوی بکەمەوەو بڵاوکردنەوەی بەرای من دەبێتە تەواوکەری بەپێزکردنی بابەتەکەی (کاك ئاکۆ محەمەد وەهبی) و دەرخستنی رۆڵی کاریگەریی ئەو هاوڕێیانەمان لە خەباتی نهێنی ناو شارەکاندا. بفەرموون ئێوەو بابەتەکەی (کارزان ئیسماعیل) (هاوڕێ ئاکۆ).

## پانۆرامای گواستنەوەی ئازادی سەگرمەو ڕۆڵی(هاوڕێ ئاکۆ) کارزان ئیسماعیل لەو پانۆرامایەدا

لەدوای ئەنفال من ئەرکی گەیاندنی پۆستەکانی ڕێکخستنم پێسپێردرابوو، لەنێوانی (سلێمانی و قەڵادزێ و هەولێر. قەڵادزێ و سلێمانی و هەولێر). ئەو کاتەش (کاک جەباری حاجی ڕەشید) لێپرسراوی ڕێکخراوی سلیمانی بوو. سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی هەولێرو بەغداو شوێنەکانی دیکەی دەکرد. لەبەرئەوە من زوو زوو سەرم لێدەدا.

لە مانگی (١٠/١٩٨٨)دا لە ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە ئاگادارییەك بەم شێوەیە چەندجار بڵاوکرایەوە: ((لە (فەتاح)ەوە بۆ (ڕەنج)، تکایە بەپەلە پەیوەندیی بە باوکی (تایلاند)ەوە بکەن لەڕێگای (شاسوار)ەوە بۆمان بنێرن))، برووسکەکە تا (١٠/١٧) چەندجار خوێندرایەوە. هەموو تێگەیشتین کە کارەساتێك ڕوویداوە. لە ڕۆژێکی سەردانەکانمدا لەکاتی بڵاوکردنەوەی ئەو ئاگادارییە بۆلای (کاك جەبار) پێی ڕاگەیاندم، کە کاك ئازادی سەگرمە لە (١٠/١١) لە شاڵاوێکی فرۆکەکانی ڕژێمدا بۆسەر پارتیزانەکان لە گەرمیان، بەفیشەکی دۆشکە پێکراوە برینەکەی قورسە. دەمانەوێت لە گەرمیانەوە بیگەیەنینە سەرکردایەتی. بۆ ئەوکارە پێم باشە تۆ بیگریتە ئەستۆ. منیش بەبێ دوودڵیی یەکسەر پێم وت: هەر کات فەرمانتان دا من ئامادەم. دیاربوو دوای دراسەیەکی وردی هەمەلایەنەی هاوڕێیان، بڕیاری ئەوەیان دابوو کە کاك ئازاد لە گەرمیانەوە بگوێزنەوە بۆ سەرکردایەتی... بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش بەم شێوەیە ڕێوشوێنی ورد گیرایەبەر:

### هەنگاوی یەکەم

ئەوکاتە من لە قەڵادزێ بووم سەیارەیەکی بەرازیلی شینم هەبوو. ئێوارەیەك هاوڕێ ("شاسوار"، کاك مستەفا ئیبراهیم دەروێش)و هاوڕێ (کاك ئەحمەد بچکۆل) ئاگاداریانکردم. کە سەردانی (کاك جەباری حاجی ڕەشید) بکەم لە سلێمانی. وتیان: (هاوڕێ پۆلا)، واتە (کاك بەکری دارتاش) بەیانی لەسەر شەقامی گشتیی ڕانیە چاوەڕوانت دەکات. دیاربوو کاك جەبار بۆ ئەومەبەستە کاك بەکری ناردبوو بەدوای مندا. منیش لەسەر ڕاسپاردەی ئەوان بەیانی چوومە ڕانیەو لەسەر شەقامەکە (شەهید) کاك بەکری دارتاشم بینی و لەگەڵمدا سواربوو. بەجووتە بەرەو سلێمانی کەوتینە ڕێ، کە گەیشتینە سلێمانی، کاك بەکر لە دووڕێیانی سەرچنار دابەزی و بەمنی وت: بچۆ بۆلای (کاك جەبار) ئێستا لە چاوەڕوانیتایە. منیش چووم بۆماڵی کاك جەبار لە گردەکەی سەرچنار.

کە چوومە ماڵیان، ڕاست وابوو کاك جەبار چاوەڕوانیدەکردم. کاتێك بەیەکەوە دانیشتین و پێی ڕاگەیاندم کە ئەرکی گوێزانەوەی کاك ئازادمان بە تۆ سپاردووە دەمانەوێت بەزوویی بڕیارەکەمان جێبەجێ بکەیت، وتی: بەبڕیاری من و هاوڕێ شاسوار ناوی نهێنی تۆ لە (ئاکۆ)وە دەبێتە (هیوا).

کاتێك بەبێ دوودڵیی ڕەزامەندیی خۆمم بۆ ڕزگارکردنی کاك ئازاد نیشانداو، وتم: بەسەر چـاو و کەی دەفەرموون جێبەجێی دەکەم، وتـی: بڕیارمان داوە تۆ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکەدا ئەوکارە بگرنە ئەسـتۆو کاك ئازاد لەگەڵ تۆدا سـواربێت و بگەیەنیتە سلێمانی، لە سلێمانیشـەوە بیگەیەنیتە قەڵادزێ، بۆئەوەی ڕەوانەی سەرکردایەتی بکرێت... ئەو شەوە لە سلێمانی مامەوە.

## هەنگاوی دووەم

بەیانـی چوومەوە بۆ ماڵـی کاك جەبار، دوای ئەوەی ڕێنوێنی وردی کردم بەمەبەسـتی ئەنجامدانی کارەکە. کاتێك چووم بۆ ماڵی کاك جەبار، هاوڕێیان (کاك حەمەنوری گەرمیان و کاك حەمەڕەشـیدی باریکەیـی) لەوێ بوون، دیاربوو ئەوانیش بـۆ هەمان کار هاتبوون. کاك جەبار پێی وتم: ئێسـتا بچۆ بۆ (سەرکارێز) لەوێ هاورێیەك بەناوی (فوئاد) چاوەڕوانتە. سەیارەیەکی سـووری بەرازیلی پێیە... کە یەکتان بینی سەیارەکانتان بگۆڕنەوە. واتە، من سـەیارەکەی خۆم بدەم بە هاوڕێ (فوئاد)و ئەویش سـەیارەکەی کە لایەتی بیدات بە من. کە چوومە سەرکارێز سەیرمکرد (هاوڕێ فوئاد) (کاك حەمە لەتیف هەورامی)یە. پێشتر یەکمان دەناسی و لە ماڵی هاوڕێیەك چەندجار یەکمان بینیبوو.

کاك جەبار چۆنی وت، وامانکرد. من سـەیارە بەرازیلییە سـوورەکەم لە (هاوڕێ فوئاد) وەرگرت و ئەویش سـەیارە بەرازیلییە شـینەکەی لە من وەرگرت. ئەو سـەیارە بەرازیلییە سـوورە ڕێکخراو کڕیبووی بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی ڕێکخسـتن، بەڵام سـەیارە بەرازیلییە شینەکە هی خۆم بوو.

لەکاتێکـدا ئێمە خەریکی ئـەم ئاڵوگۆڕە بوویـن، کاتێکمانزانـی کاك حەمەنووری و کاك حەمەڕەشـیدیش گەیشـتنە سەرکارێز. ئەوان سـەیارەیەکی کرۆنای تەکسییان پێبوو. هەرچوارمان بەسـێ سەیارەوە، واتە من بەرازیلییە سوورەکەو کاك حەمەلەتیف بە برازیلییە شینەکەو کاك حەمەنووری و کاك حەمەڕەشیدیش بەسواری کرۆنا تەکسییەکە لە (سلێمانی)ەوە بەدوای یەکدا بەرەو کەلار بەڕێکەوتین. کاتێك گەیشتینە (ئاوە خوێڕێ) کاك حەمەڕەشید دابەزی و چوو بۆ دەواجنەکەو ئێمەش چووین بۆ کەلار. شـەو چووینە ماڵی هاوڕێیەکی کاك حەمەنووری و شەو لەوێ ماینەوە.

## هەنگاوی سێیەم

بەیانی کاتژمێر (٦) لە کەلارەوە چووینەوە بەرەو سلێمانی. کە گەیشتینە ئاوەخوێڕی کاك حەمەلەتیف لەسـەر شـەقامەکە مایەوە. من و کاك حەمەنووریش چووین بۆ دەواجنەکە[1].

---

[1]- مولکی حەمەی وەلی بوو کە پیاوێکی دڵسۆزو تێکۆشەری ئەو ڕۆژگارە سەختەبوو، دەواجنەکەی کردبوو بنکەیەکی نهێنی بۆ خزمەتی پێشمەرگەو شۆڕش، لە دەربەندیخان دادەنیشت تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە.

کە گیشتینە دەواجنەکە، سەیرمانکرد کاك ئازادو کاك حەمەرەشیدو پێشمەرگەیەکی لێیە، پێشمەرگەکە (کاك جەمال)ی خوشکەزای کاك ئازاد بوو. دوای ئەوەی بەباشیی برینەکەی کاك ئازادمان پاككردەوە. وەرەقەیەکی عەددەم تەعروزی عەسکەری و نووسراوێکی خەستەخانەی عەسکەریمان بۆ پڕکردەوە، هی (فەوجی سواراغا)بوو، کە بەهۆی شەهید (سەیدحاجی)وە دەستمان کەوتبوو. کاك ئازاد لەگەڵ مندا سواربوو. کاك حەمەرەشیدو کاك جەمال لەگەڵ کاك حەمەنووریدا سواربوون، کە گیشتینە سەر شەقامەکەی لای کاك حەمەلەتیف، هەرسێ سەیارەکە یەك بەدوای یەکدا بەرەو سلێمانی کەوتینە ڕێ و من لەپێشیانەوە بووم. کە گیشتینە سلێمانی، من بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئەوان بکەم، یەکسەر خۆم گەیاندە گردی سەرچنارو خۆم بە گەراجەکەی ماڵی کاك جەباردا کرد. هەرچوومە ماڵەوە یەکسەر کاك جەبار هات بەپیرمەوە باوەشی پیاکردم و ناوچەوانی ماچکردم و دەستخۆشیی لێکردم. دوای ئەوەی کاك ئازادمان دابەزاندو بردمانە ماڵەوە. کاك حەمەنووری و کاك حەمەرەشیدیش پەیدابوون... وەکو دەمبینی کاك جەبارو هاوڕێیان لە هەوڵی ئەوەدابوون کە دکتۆر بۆ کاك ئازاد پەیدابکەن. من شەو لە سلێمانی مامەوەو بەیانییەکەی بەپێی ئەو پلانەی نەخشەکێشرابوو، چوومەوە بۆ ماڵی کاك جەبار.

### هەنگاوی چوارەم

بەیانی کە گەیشتمەوە ماڵی کاك جەبارو نەخشەکەی پێڕاگەیاندم و پێی وتم: کاك ئازاد لەگەڵ خۆت سوار دەکەیت، شەهید (سەید حاجی) بە مەفرەزەیەکی چەکدارەوە دێنە چەقچەق و لەگەڵ ئەواندا دەڕۆن بۆ قەڵادزێ.

کاتێك کاك ئازادم سوارکردو لە ماڵی کاك جەبار دەرچووم، لە چەقچەقی سەرچنار سەیرمکرد (شەهید سەید حاجی، شەهید مستەفا کەرکوکی و ئەحمەدی برای سەید حاجی) لەگەڵ چەند چەکدارێکدا چاوەڕوانیم دەکەن و بەیەکەوە بەرەو ڕانیە کەوتینە ڕێ، کە گەیشتینە ڕانیە، چووینە ماڵی (سەید حاجی)و ئەو شەوە لەماڵیان ماینەوەو بەیانی لەگەڵ کاك ئازاددا بەرەو قەڵادزێ بەرێکەوتین.

پێشتر کاك شاسوار ئاگاداری کردبووم کە کاك ئازاد بەرم بۆ ماڵی کاك ئەحمەد بچکۆل و لەوێوە بیبەم بۆ ماڵی (گوڵەخانی) خوشکی (کاك ئەحمەد). منیش بەپێی ڕاسپاردەکە هەر گەیشتمە قەڵادزێ، کاك ئازادم برد بۆ ماڵی گوڵەخان، ماوەی شەش شەو و ڕۆژ لەماڵیان ماینەوە، دوای شەش شەو و ڕۆژەکە لەرێگای (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)ەوە ڕەوانەی (سونێ) کرا. بەمەبەستی ناردنی بۆ سەرکردایەتی. (٩) ڕۆژ لە (سونێ) مایەوە بەهۆی بەفربارینەوە نەتوانرابوو ڕەوانە بکرێت، گەڕاندیانەوە بۆ قەڵادزێ و برایە ماڵی (مامۆستا عومەری) برای کاك ئەحمەد بچکۆل. ماوەی چەند ڕۆژێك لە ماڵیان بوو. بەهۆی ئەوەی خێزانەکەی لە حاڵەتی منداڵبووندا بوو. بۆ یەك شەو گوێزرایەوە بۆ ماڵی (کاك

زەینەدین)ی زاوای (کاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵا)و دواجار بردمە ماڵی خوشکم و دیسان بردمەوە بۆ ماڵی مامۆستا عومەری برای کاك ئەحمەد بچکۆل. کە منداڵەکەیان بوو، کاك ئازاد ناوی نا (لانا). دوای ئەوە کاك شاسوار دکتۆر عەبدولرەحمانی برای شەهید حسێن جنوبی و دکتۆر محەمەدی قادر مینەی هێنایە سەر کاك ئازاد بۆ تیمارکردنی، لەبەرئەوەی برینەکەی کاك ئازاد زۆر گەورە بوو، ئێسقانی قاچی هەمووی ورد بووبوو. پارچەش لەناو قاچیدا مابووەوە. تیمارکردن سوودی ئەوتۆی نەبوو. بۆیە کاك جەبار ئاگاداری هاوڕێیانی کرد کە کاك ئازاد بەرینەوە بۆ سلێمانی.

## هانگاوی پێنجەم

دوای راسپاردەی کاك جەبار لەگەڵ شەهید (کاك شاسوار)دا بەسەیارەکە کاك ئازادمان بردەوە بۆ سلێمانی... لە سلێمانی لە ماڵی کاك (سامان مەولود) (هاوڕێ بەرزان) ژوورێکی تایبەتی بۆ ئامادەکرابوو، یەکسەر بردمانە ماڵی کاك سامان و ئەو ماوەیەی لە مالیان بوو، خزمەتێکی زۆر باشیان دەکرد، بەڵام وەزعی کاك ئازاد زۆر خراپ بوو، برینەکەی رەشبووبووەوە. مەترسی زۆری لێدەکرا، بۆیە کاك جەبار لەگەڵ هاوڕێیاندا کاك شاسوارو کاك سامان و کاك بەکری دارتاش هەوڵیاندا دکتۆری بۆ پەیدا بکەن، بۆ تیمارکردن و چارەسەرکردنی و لە ماڵی کاك سامانەوە بردبوویان بۆ لای (دکتۆر ئازاد ئیسماعیل حەقی)... دوای ئەوەی دکتۆر کاك جەباری ئاگادارکردبوو، کە برینەکەی قورسەو پێویستی زۆری بەچارەسەرکردنە، بۆیە کاك ئازادیان گەیاندە بەغدا. لەبەرئەوەی من لەمەیاندا بەشدار نەبووم باسی ناکەم.

## هەنگاوی شەشەم

دوای سێ مانگ مانەوەی کاك ئازاد لە بەغداو گەرانەوەی بۆ سلێمانی، لە رۆژی (١٩٨٩/٣/٢) لەسەر بریاری کاك جەبارو هاوڕێیان لە ماڵی کاك جەبارەوە کاك ئازادم لەگەڵ خۆمدا سوارکردو بەدووقۆڵیی بەرەو قەڵادزێ بەرێکەوتین. کە گەیشتینە تاسلوجە سەیرمکرد مەفرەزەیەکی پشکنین لەسەر شەقامەکەن. راوەستام و بیرم لەوە دەکردەوە بڕۆم یان نەڕۆم؟ لە بیرکردنەوەدا بووم، سەربازەکانی کەمینەکە هاتن بۆلام و وتیان بۆ وا مەشغولی، منیش وتم: دەعوەتمان هەیەو دەمەوێت فریایان بکەوم، وتیان: سندوقەکەت بکەرەوە کە سندووقەکەم کردەوەو سەیریانکرد یەك کێس بیرەو چەند بووتلێك ویسکی تێدایە (کە ئەو جۆرە خواردنەوەیە بە بەردەوامی لە سەیارەکەمدا بوو بۆ سەر لێشێواندنی جەندرمەکانی رژێم)، وتیان سندووقەکەت داخە بۆخۆتان قەپاتن و ئیزنیاندام و رۆیشتم. ئەم حاڵەتە نەمهێشت کاك ئازاد پێی بزانێت. کە کەوتینەوە رێ و باسی حاڵەتەکەم بۆ کاك ئازاد کرد، بەجووتە گەیشتینە شاری قەڵادزێ و بەسەلامەتیی بردمە ماڵی خوشکی کاك

ئەحمەد بچکۆل، کاتێك چووینە ماڵەوە سـەیرمکرد (کاك مستەفای سەید قادرو کاك ئەمین قـادر مینە)، کە ناسـرابوو بە هاوڕێ (چیا) لەوێ بوون. کە بـۆکاری حزبیی هاتبوون، یەك شـەو لەو ماڵە مانەوە، دوایی هەرسێکیانمان بردن بۆ ماڵی (مامۆستا عومەری برای کاك ئەحمەد بچکۆل). بۆ رۆژی دوایی لەرێگای (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)ەوە رەوانەی سـەرکردایەتی کرا. دیارە ئەم داسـتانە هەر بەنووسین و قسـەکردن ئاسان و خۆشە، ئەگینا کارێکی قورس و زۆر مەترسیدار بوو، لەو رۆژو رۆژگارە سەخت و ناهەموارەدا.

**سەرنج:**

١- لـە هاوڕێیانـی زیندانیمـان (هـاوڕێ کارزان) چـوارەم هاوڕێمانە کە لە داسـتانی گواسـتنەوەی کاك ئازادی سەگرمەدا بە رۆڵی جوامێرانە بەشـداریکردووە، هاوڕێ شەهید جەبار نەخشەدانەری چۆنێتی جێبەجێکردنی ئەو داستانە بووە. هاوڕێ شەهید بەکری دارتاش رۆڵی دیارە لەم نووسینەی هاوڕێ کارزان و هاوڕێ ئاکۆ محەمەد وەهبـی-دا، هاوڕێ سامان لەم نووسینەو نووسینەکەی کاك ئاکۆ بەپرشنگداریی باسکراوە.

٢- راسـتی ناوەکانـی ئاگادارییەکـەی کـە لە ئیزگـەی دەنگی گەلی کوردسـتانەوە بڵاوکراوەتەوە، بەم شێوەیەیە:

- (فەتاح) (کاك نەوشـیروان مسـتەفایە)، کە ئەوکاتە سـکرتێری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بووە.

- (رەنج) شەهید کاك جەباری حاجی رەشیدە، کە ئەو کاتە لێپرسراوی رێکخراوی سلێمانی و سەرپەرشتیاری رێکخستنەکانی هەولێرو بەغداو مەفرەزە پارتیزانەکان بووە.

- (باوکی تایلاند) کاك ئازادی سـەگرمەیە، کە ئەوکاتە بەرپرسـی دەستە پارتیزانەکانی پێشمەرگەی گەرمیان و قەرەداغ بووەو بریندارکراوە.

- (شاسوار) شەهید مسـتەفا ئیراهیم دەرویشە، کە ئەوکاتە یەکێك بووە لە کادیرە کاراو چالاکەکانی کۆمەڵە لە سنووری قەڵادزێ و سلێمانی.

٣- (کاك شـێخ سـدیق شـێخ عوسـمانی شـێخ مەعرووف ناسـراو بە هاوڕێ (شاهۆ)و (د.مەحمود) سـەبارەت بە چۆنێتی ناردنـی بۆلای کاك ئازادی سـەگرمە لەرێگای کەرتی شـەهید سـەرکەوتەوە بۆ تیمارکردنی کاك ئازادو مانەوەو گەڕانەوەی لای کاك ئازاد، کاك شـێخ سدیق لەگەڵ ژیاننامەی خۆیدا سەرگوزشـتەی چوونی بۆ لای کاك ئازادو مانەوەی و تیمارکردنی بۆ ناردووم، لەبەرئەوەی (کاك شـێخ سدیق) پەیوەندیی بەناوەرۆکی کتێبەکەوە نییەو یەکێك نییە لە هاوڕێیانی زیندانمان و چەند کەسی دیکەی وەکو (کاك حەمەنووری و کاك ئاکۆ محەمەدو کاك حەمەرەشیدو کاك وەستا لەتیف هەورامی) لە (داستانی ئازادکردنی کاك ئازادی سـەگرمە)دا بەشـداریانکردووە، لەبەرئەوەی ئەوانیش وەکو کاك شـێخ سدیق پەیوەندییـان بەناوەرۆکی کتێبەکەوە نییە، بـە بابەتی تایبەت لە کتێبەکەدا باس نەکراون.

تەنها وەکو ناو ناویان هاتووە. بۆیە بەپەســەندم نەزانی ئــەو بابەتەی بۆی ناردبووم، بڵاوی بکەمەوە. داوای لێبووردن لە هاوڕێم کاکە شێخ سدیق دەکەم و سوپاسی زۆریشی دەکەم کە بۆ هاوکاریکردنم لەم بارەیەوە نووسخەیەك لە گۆڤاری پێشمەرگەشی بۆناردم. کە بابەتەکەی کاك ئاکۆ محەمەد وەهبــی لەسەر کاك ئازاد تێیدا بڵاوکراوەتەوە.

## ٩- عوسمان عەبدول مەعرووف بەرزنجی

کە بە (مامۆستا عوسمانی شیخ عەبدول) ئێستا بە دکتۆر عوسمان ناسراوە



- ساڵی (١٩٥٤) لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیی، دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- کۆلێژی پەروەردە، بەشی زمان و ئەدەبی کوردی زانکۆی بەغدای لە (١٩٧٧-١٩٧٨) تەواوکردووە.
- لە (١٩٧٨/٩/١٤) لە پەروەردەی سلێمانی بە مامۆستا دامەزراوەو نێردراوە بۆ قەڵادزێ.
- لە ساڵی (١٩٨٢) لە قەڵادزێوە گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی و کراوەتە یاریدەدەری بەڕێوەبەری سانەوی گۆیژەی کوران.
- لە (١٩٨٧/٧/١) لەبەر هەڵوێستی کوردایەتی و سیاسیی لەکاری وەزیفیی دوورخراوەتەوە.
- دوای دوورکەوتنەوەی لە پیشەی مامۆستایی، بۆ بژێوی ژیانی خەریکی کاروکاسبی ئازاد بووە.
- ساڵی (١٩٩٣-١٩٩٤) بووەتە خوێندکاری ماجستێر لە زانکۆی سەلاحەدین و لە ساڵی (١٩٩٤-١٩٩٥) بڕوانامەی ماجستێری لە زانکۆی سەلاحەدین وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٩٩-٢٠٠٠) لە خوێندنی باڵا لە زانکۆی سلێمانی وەرگیراوەو لە ساڵی (٢٠٠٢)دا بووەتە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا لە ئەدەبی هاوچەرخدا.
- دوای ئازادبوونی لە زیندان، لەم بوارانەدا کاریکردووە:

١- مامۆستا لە ئامادەیی ڕۆشنبیری کوران.

٢- بەڕێوەبەری چاودێریی کۆمەڵایەتی سلێمانی لە ساڵی (١٩٩٢).

٣- مامۆستای زانکۆ لە کۆلێژی زمان بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی لە ساڵی (١٩٩٣).

٤- لێپرسراوی مۆزەخانەی ئەنتۆگرافیای زانکۆی سلێمانی لە ساڵی (١٩٩٧).

٥- یاریدەدەری ڕاگری کۆلێژی زمان لە ساڵی (١٩٩٧).

٦- سەرۆکی بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی (٢٠٠٣).

٧- ڕاگری کاروباری خوێندکاران لە زانکۆی سلێمانی لە ساڵی (٢٠٠٥).

٨- ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی سلێمانی لە ساڵی (٢٠٠٦). ئێستاش وەك مامۆستا لە کۆلێژی زمان بەشی کوردی دەوام دەکات.

- لە (١٩٨٩/١١/٧) چووەتە ژیانی هاوسەریی و خێزانی پێکهێناوە.
- ساڵی (١٩٦٨) پەیوەندیی بەڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان-باڵی مەکتەبی سیاسییەوە

کردووەو لە ساڵی (١٩٧٠) بووەتە ئەندام.

- پاش تێکەڵاوبوونەوەی هەردوو باڵی پارتی، بەردەوامبووە لە خەباتدا تا لە ساڵی (١٩٧٤-١٩٧٥)دا بووەتە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی پارتی لە ئامادەیی سلێمانی کوڕان، هەتا دوای نسکۆی شۆڕش بەردەوام بووە.
- لە (١٩٧٨/٤/٢٦) پەیوەندیی بە ریزەکانی (ی.ن.ك) (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە کردووە، کە ئەو سەردەمە بە (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان) ناسرابوو.
- لە سنووری کەرتەکانی (شەهید شەهاب، شەهید جەعفەر، شەهید ئارام)دا لە ڕێکخراوی سلێمانی خەباتی کردووە.
- لە ساڵی (١٩٨٠) شەرەفی ئەندامێتی کۆمەڵەی پێدراوەو لەژێر ناوی نهێنی (سوورکێو، هاوژین-٦١)دا کاری کردووە.
- لە شاڵاوی ئەنفالی ڕێکخستنی ناو شارەکاندا لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە لە (١٩٩٠/٣/٧) کەوتووەتە بەر شاڵاوی دەستگیرکردن.
- ماوەی حەوت مانگ و نۆ ڕۆژ لە ئەمنە سوورەکەی سلێمانی ماوەتەوە، ئازارو ئەشکەنجەی زۆری دراوە.
- لە یەکەم جەلسەی مەحکەمەی سەورەدا لە مانگی (٩)دا لەگەڵ (١٩) هاوڕێیدا بە حوکمی ئیعدام حوکمدراوە.
- لە سێیەم جەلسەی مەحکەمەدا لە (١٩٩٠/١٠/١٦) بە حوکمی موئەبەد حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشی ئەحکامی سەقیلە.
- کاتێك لە ئەمنە سوورەکە بووە لە (١٩٩٠/٨/٦) بەپێی بڕیارێکی سەدامی دکتاتۆر ئەو زیندانییانەی کە تەحقیقیان تەواو دەکرا، ڕێگای مواجەهەی کەسوکاریان دەدراو ئەمیش لەو ڕۆژەدا کەسوکاری هاتوونەتە مواجەهەی و کۆڕپەیەکی تەمەن (١٤) ڕۆژیان خستووەتە باوشییەوە بەناوی (ئاڤێستا)و لەسەر داوای خۆی ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ (ئازیز).
- لەناو زیندانی ئەبوغرێبدا پەیوەندیی بە کۆمیتەی باوەڕەوە کردووەو لەناو زینداندا خەباتی کردووە.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە ئازادکراوەو (١٢/٢٣) لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێیانی گەیشتوونەتەوە کوردستانی ئازادکراو.
- دوای ئازادبوونی، بەشداریی لە یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك)دا کردووە.
- دوای کۆنگرە بە کارگێڕی کۆمیتەی (٦)ی بەختیاری و سەرپەرشتیاری کۆمیتەی (٥) ڕێکخستنەکانی ناوشار بەردەوام بووە لە خەباتدا.
- ئەندامی سێیەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووەو خۆی بۆ ئەندامی سەرکردایەتی کاندیدکرد، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە.
- ئائێستا وەکو ئەندامێکی (ی.ن.ك) لە ریزەکانی ڕێکخستندا خەبات دەکات.

## ١٠- سامان مەولود غەریب



- لە ساڵی (١٩٥٧) لە شاری سلێمانی لەناو خێزانێکی هەژارو رەنجدەردا هاتووەتە دنیاوە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیی، دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) کۆلێژی کشتوکاڵی لە زانکۆی سلێمانی تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٨١) چووەتە ژیانی هاوسەرێتییەوە.
- ئێستا بەرپرسی ئاسایشی فرۆکەخانەی نێودەوڵەتیی سلێمانییە.
- ساڵی (١٩٧٧) لەوکاتەی خوێندکاری زانکۆ بووە، پەیوەندی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٨٤) ئەندامی سێیەمین کۆنفراسی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بووە لە مێرگەپان.
- ساڵی (١٩٨٥) لەبەرئەوەی بانگهێشتی خزمەتی سەربازیی کراوە، پەیوەندیی بە شۆرشەوە کردووە لە ناوچەی مەرگە، بەلام لەسەر بریاری هەڤاڵان و دوای ئاسانکاریی گەراوەتەوە بۆ ناوشارو خۆی بۆ کاری رێکخستنی ناوشار تەرخانکردووەو لەو ماوەیەدا ئەم کارانەی پێسپێردراوە:

١- ئەندامێتی کەرتی شەهید کرێکارو بەرپرسی پۆلی شەهید بەختیار.
٢- لەگەڵ هاوڕێ مامۆستا ئەحمەدی سەناعە کاری چاپەمەنییەکانی رێکخراوی سلێمانی کردووە.
٣- هەندێ هاورێ پەیوەندیی تاکیان پێوەی بووە.

- لە کارەکانی رێکخستندا جگە لەوەی گەیشتووەتە پلەی ئەندامی کەرت، دەستنیشانکراوە بۆ ئەندامی رێکخراوی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٨٥) بەهۆی (سیروان)ی برایەوە کە بووبوو بە پێشمەرگە، لەگەڵ یەکەم وەجبەی ماڵە پێشمەرگەدا دایك و باوکی و سالاری برای دەستگیرکراون و ماڵەکەیان (حیجز) کراوەو دوو ساڵ لە (تکریت)و حەدیسە زیندانیی کراون.
- ساڵی (١٩٨٨)و دوای ئەنفال و لەکاتی برینداربوونی فەرماندەی پێشمەرگە پارتیزانەکانی ناوچەی گەرمیان و بۆ رزگارکردنی کاك (ئازاد، لە مەرگ و سەقەتبوون)، رۆڵی بەرچاوی بینیوە لە جێگا تەرخانکردن لە ماڵەکەی خۆیدا، بۆ شاردنەوەو حەوانەوەو چارەسەرکردن تابردنی بۆ بەغدا.

-ساڵی (١٩٨٩) لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوەو بەرگەی ئەشکەنجەکانی ئەمنی گرتووە. بە هەوڵ و کۆششی کەسوکاری، دوای دوو مانگ ئازادکراوە.
- لە (١٩٩٠/١/٢٣) جارێکی دیکە کەوتووەتە بەر شاڵاوی ئەنفالی ڕێکخستنی ناو شارو لەلایەن دەزگای ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوەتەوە.
- دوای نۆ مانگ مانەوە لە ئەمنی سلێمانی، لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لەلایەن مەحکەمەی بەناو سەورەوە بە موئەبەد حوکمدراوەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا نێردراوە بۆ بەندیخانەی ئەحکام سەقیلەی ئەبوغرێب.
- لە ئەبوغرێب یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (کۆمیتەی باوەڕ) لەناو بەندیخانەدا.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بەلێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە لە بەندیخانەی ئەبوغرێب ئازادکراوەو نێردراوە بۆ خزمەتی سەربازیی و لە خزمەتی سەربازییەوە لە (١٩٩٢/١/١) لە خزمەتی سەربازیی و زیندان ئازادکراوەو گەیشتووەتەوە کوردستان.
- لە یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك)دا بەشداریکردووە.
- دوای کۆنگرە، بووەتە ئەندامی مەڵبەندی سلێمانی و لێپرسراوی (کۆمیتەی سرك).
- دوای هەڵوەشاندنەوەی (کۆمیتەی سرك) چووەتە بەشی ڕێکخستنی مەڵبەند.
- لە کۆنگرەی (٢-٣)ی (ی.ن.ك)دا ئەندامی کۆنگرە بووە.
- دوای مەڵبەند، چەند پۆستێکی جیاجیای لەکاری حزبیدا پێسپێردراوەو بەسەرکەوتوویی ئەنجامیداون.
- لەگەڵ ئەم ژیاننامەیەی (هاوڕێ سامان)دا بابەتێك بلاودەکەمەوە کە پەیوەندیی بە ڕزگارکردنی (کاك ئازادی سەگرمە)وەیە لە مەرگ و سەقەتبوون)، کە گێڕانەوەی خۆیەتی. بەلای منەوە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی زۆرگرنگە بۆ ڕۆڵی هەڤاڵانی ڕێکخراوی سلێمانی (پیرەمەگروون) کە لەو سەردەمە سەخت و ناهەموارەدا چەلەنگانەو چاونەترسانە بینیویانە، چیرۆکەکە بەشێوەیەکە لەو باوەڕەدام هەندێك کەس لەمڕۆدا بەهەڵبەستراو و ناڕاستی دەزانن، چونکە کارێکی واو لە ڕۆژگارێکی وادا لەلای زۆر کەس قبووڵ ناکرێت، لەکاتێکیشدا چیرۆکێکی ڕاستی و واقیعییانەیەو چەند کەس لە پاڵەوان و ئەکتەرەکانی زرت و زیندوو ماون.

### سامان مەولودو ئازادی سەگرمە

کاتێك دەستم کرد بە نووسینەوەی یاداشتەکانی زیندانم و نووسینەکانم کۆکردەوەوە، سەیرمکرد بووەتە (کتێبێك)، لەکۆتایی تایپکردنیدا بیرۆکەی ئەوەم لادروستبوو کە هەوڵ بدەم ژیاننامەی ئەو (٣٠) هاوڕێیەی کە لە ئەمنی سلێمانی یەکیانخستین و ناوبین نایین (جەماعەتی جەبار)و هەر بەیەکەوە ناردیانین بۆ مەحکەمەی سەورەو هەربەیەکەوە لە مەحکەمەش بەیەك دەعوا حوکمدراین...

کاتێك ژیاننامەی هاوڕێیانم پێگەیشت، بۆم دەرکەوت کە ژمارەیەك لە هاوڕێیانمان لە ئازادکردنی (ئازادی سەگرمە) لە مەرگ و سەقەتبوون لەو ئۆپراسیۆنەدا رۆڵی بەرچاویان بینیوە. بۆیە وام بەباشزانی هەر بۆ مێژوو بۆ راستی خەباتی جوامێرانەی ئەو هاوڕێیانەمان کە لە سەردەمی خەباتی نهێنیدا لەناو شارەکانی (سلێمانی، کەلار، چەمچەماڵ، کەرکوك، هەولێر، بەغدا، قەڵادزێ) خزمەتی شۆڕش و کۆمەڵەو (ی.ن.ك)یان کردووەو نموونەیەك لەو جوامێرییەیان رزگارکردنی فەرماندەی پارتیزان کاك ئازادی سەگرمەیە لە مەرگ و سەقەتبوون، جا لەوانەی لەو پلانەدا بەشدارییانکردووە، لە هاوڕێیانی زیندان (جەباری حاجی رەشید، کارزان ئیسماعیل، وەستا بەکری دارتاش، سامان مەولود، مامۆستا محەمەدی مەلاحسێن). بوون، ئەوانەی شەهیدکران هاوڕێیان (جەباری حاجی رەشیدو وەستا بەکری دارتاش). ئەوانەی لەژیاندا ماون، هاوڕێیان (سامان مەولود، کارزان ئیسماعیل و مامۆستا محەمەدی مەلاحسێن)ن. هاوڕێ (کارزان ئیسماعیل) بابەتێکی لەوبارەوە نووسیوەو لەگەڵ ژیاننامەکەیدا بڵاوی دەکەمەوە، (مامۆستا محەمەدی مەلاحسێن)یش ئەوەی پەیوەندیی بەوەوە هەبووە بابەتێکی کورتی نووسیوەو لەگەڵ ژیاننامەکەیدا دایدەبەزێنم، هاوڕێ (سامان مەولود)یش بابەتێکی لەسەر چیرۆکە راستییەکە نووسیوەو چۆنی نووسیوە، هەروا وەکو خۆی بڵاوی دەکەمەوە. لێرەدا پێویستە هەڵویستە لەسەر خەبات و تێکۆشانی ئەو هاوڕێ زیندانییانە بکرێت و نەوەکانی ئێستاو ئاییندە لایان روون بێت و بزانن کە لە رۆژگارێکی ئێجگار سەختی خەباتی گەلەکەیاندا، کۆمەڵێك تێکۆشەری جەربەزەو خاوەن هیممەت و بەتوانا هەبوون کە ملیان لە چەقۆی تیژی دوژمن ساویوەو گوێیان بەزیندانیی و لەسێدارەدان نەداوە لەپێناوی ئازادکردنی گەل و نیشتمانەکەیاندا، ئەو کۆمەڵەش هەرهەموو کادیری بەتواناو خاوەن ئەزموونی خەباتی نهێنی ناوشارەکانی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) (ی.ن.ك) بوون.

**فەرموون ئێوەو گێڕانەوەکەی هاوڕێ (سامان مەولود) سەبارەت بە ئازادی سەگرمە**

ململانێکانی نێوانی گەلی کوردو رژێمە یەك لەدوای یەکانی عێراق، بەشێوەیەك قووڵبووەوە ئەنجامەکەی بەرەنگاربوونەوەیەکی سیاسیی و چەکداریی ئەوتۆی لێکەوتەوە کە دوژمنان بە بەردەوامی و بەوپەڕی توانایان هەوڵیانداوە کە گەلی کورد لەناوبەرن و سیمای نەتەوەیی بسڕنەوەو خاك و نیشتمانەکەی بەتەواویی داگیربکەن و مۆرکی نیشتمانێکی کوردستانی پێوە نەهێڵن. گەلی کوردو شۆڕشەکەی بەوپەڕی جەسوورییەوە خەباتی دەکردو کۆششی دەکرد لەپێناوی بەدیهێنانی مافەرەواکانیداو پارێزگاری لە بوون و مانەوەی دەکردو بەگژ سیاسەتی دوژمنکارانەو رەگەزپەرستانەی رژێمەکاندا دەچوو. ململانێکە ئەوەندە پەرەیسەندو گەورە بوو. رژێمی بەعسی دوژمن بەگەلەکەمان شاڵاوی ئەنفال و کیمیابارن و سووتماککردنی گەلی کوردو خاکی نیشتمانەکەمانی هەڵبژاردو لەو شاڵاوە نامرۆڤانەیەیدا

دەیان چیرۆکی پڕ لە ناسـۆرو ناخۆشـیی لێکەوتەوە، کە ناتوانرێت لە بابەتێکی وا کورتدا باسـبکرێت... لەدوای ئەو شاڵاوە کە ئەنفالی گەلەکەمان و سـووتماککردنی کوردستانی لێکەوتەوە. پێشمەرگەی کوردستان و سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بەپێی بەرنامەو نەخشەیەکی داڕێژراوی شۆڕشـگێڕانەی پارتیزانی بڕیاری ڕووبەڕوونەوەی ئەو سیاسەتەی ڕژێمی دایەوەو پێشمەرگە شۆڕشگێڕو خەباتکارەکانی ناردەوە ناو قووڵایی ناوچە ئەنفالکراوەکان و ڕێکخراوی سـلێمانی کـردە پردی پەیوەندیی نێوان و لـە ئەنجامی ئەو بڕیـارەدا (کاك ئازاد محەمەد غەریب) (ئازادی سـەگرمە) بووە هەوێنی چالاکییەکی بێوێنەی (ڕێکخراوی سـلێمانی)، ئەو چیرۆکە لەگەڵ ڕوودانیدا لە سەرکردایەتییەوە دەستپێیکرد، کە بەهۆی ئێزگەی دەنگی گەلی کوردسـتانەوە، وەکو ئاگادارییەك و بەپیرەوەچوونێك ڕاگەیەنرا. ئـەو بانگەوازو ئاگادارییە بەلای گوێگرانی ئێزگەکەوە بەئاسایی سەیر دەکرا، بەڵام بۆ هەڤاڵانی ڕێکخستن و بەتایبەتی ڕێکخراوی سـلێمانی، بووە هۆی ورووژاندنی هەڤاڵان و بـۆ بەپیرەوەچوونی ئەو ئاگادارییە، هەریەکە چەمکێکی ئەو ڕووداوەی گرتەئەسـتۆ (یان خرایە ئەستۆ)، شەهیدی نەمر (جەباری ڕەشـەی مەلا ئیبراهیم) سەرپەرشـتیکەرو نەخشـەدانەری ئەو چالاکییە بوو. لەو ڕۆژگارەدا ڕۆژێك بە منی وت: هاوڕێ لە ماڵەکەت ژوورێکی تایبەت ئامادە بکە ئێمـمان پێیەتی و ئیشەکەش هێنانی کاك ئازادی سـەرگرمەیە بۆ چارەسەرکردن. لەگەڵ ڕاسپاردەی شەهیدا، لەگەڵ هاوڕێم کاك کارزان ئیسـماعیل چووینە بازاڕ لە شەقامی کاوە کومبارو کەلوپەلی پێویسـتمان بۆ ژوورەکە کڕی و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، ژوورەکەمان ڕێکخست و ئامادەکرد. پاش چەند ڕۆژ لە مانگی (١٢/١٩٨٨)دا ڕۆژێك شەهید جەبارو کاك مستەفا ئیبراهیم (شاسوار) و کاك کارزان ئیسماعیل، کاك ئازادیان هێنا بۆ ماڵی ئێمەو خوشکەزایەکی بەناوی (جەمال) لەگەڵدا بوو. دیارە کاك ئازاد زۆرینەی خەڵکی کوردسـتان ناوبانگیان بیستبوو، دەیانناسی کەسێکی ئاسایی نەبوو یان پێشـمەرگەیەکی نەناسراو نەبوو، بۆیە مانەوەی لە سلێمانیداو لەژێر چاوی ئەوهەموو ئەمن و ئیسـتخبارات و پیاوانی ڕژێم ئاسـان نەبوو. لەو ڕۆژەوە بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ لە ماڵی ئێمەو لەو ژوورەدا مایەوە، کاك ئازاد لەگەڵ ئەوەی بەشـێکی زۆر لە جەسـتەی بەشـێوەیەك پێکرابوو، کە مەگەر هەر پیاوێکی بەهیمەت و ئازای وەکو کاك ئازاد بەرگەی ئێش و ئازاری ئەو برینە قووڵەی جەسـتەی بگرێت. بەڕاستی هەرچەند سەیرم دەکردو هەڵسـوکەوتم لەگەڵـدا دەکرد. نموونەی پیاوی بەجـەرگ و خۆڕاگرو ڕیخۆڵەکێش بـوو، لەگەڵ ئازارەکانیداو ئەگەر بڵێم لە شـێرێکی بریندار دەچوو درۆنییە، چونکە لەگەڵ گرانیی و خۆرستی برینەکانی لەشی و ئەو ئازارو ئێشەی بەسات خاوی نەدەکردەوە/ پیاوێکی وەرەبەرزو خۆگرو گەشـبین و بەهیوایەکی ئێجگار بەرزەوە دەژیاو چاوەڕوانی چارەسەرکردن و چاکبوونەوەی دەکردو خۆی نەدەدایە دەست ئازارو وڕە نزمبوونەوە.

ئەوەی من دەیلێـم ئەو ڕۆژانەی من لەگەڵیدا ژیام و ڕۆژانە بە بەرچاومەوە تیمار دەکراو برینەکانی بۆ پاك دەکرایەوە لەلایەن کاك (شاسوار)ەوە، کە شارەزایی لە بواری تەندروستیدا

هەبوو، جارێك نەمبینی هاوارێك بكات یان كارێك بكات كاك شاســـوار شپرزە بكات. كاك ئازاد پێویســـتی بەوەبوو. كە پیشانی پزیشكی شـــارەزای نەشتەرگەریی و ئێسك بدرایە. بۆ ئەمەش شـــەهید (وەســـتا بەكری دارتاش) چوو بۆلای (دكتۆر ئازاد ئیســـماعیل حەقی)، كە پزیشـــكی ئەو بوارە بوو. مەوعیدی ئێوارەی بۆ وەرگرتبوو. ئێوارەیەك لەگەڵ شەهید جەبار كاك ئازادمان برد بۆ عەیادەكەی دكتۆر ئازاد. شـــەهید وەســـتا بەكر چاوەڕێی دەكردین. بە باوەش بە قادرمەكاندا سەرمانخستە سەرەوە بۆلای دكتۆرو هەوڵمان دەدا بەهەموو شێوەیەك كاك ئازاد بشارینەوەو وا بكەین كەس نەیبینێت، نەبادا بناسرێتەوە. دوای پشكنینی لەلایەن دكتۆرەوە. دكتۆر وتی: ئەم برینە نەشـــتەرگەریی گـــەورەی دەوێت و لە توانای ئێمەدا نییە. زیاتر رای وابوو كە دەبێت قاچی ببردرێتەوە. لە عەیادەكەوە كە لەســـەر شـــەقامی پیرەمێرد بوو، چووین بۆ شـــەقامی گۆران و لەلای دەرمانخانەی نەوزاد وەســـتاین، تا كاك جەبار چوو دەرمانەكانی بۆ بهێنێت، كەوتینە ناو ســـەیتەرە (زاڵگە)ی ناوشارەوە، كە لەو ساڵەدا جارجار لەگەڵێك شـــوێن دادەنرا. ئێمە خۆمان تێكنەداو پاش ســـەیركردنێكی ئاسایی دەربازبووین بەگەڕانەوەمـــان بۆماڵەوە بیر لە بەرنامەیەكی تر كرایەوە. بـــەوەی بەهەر نرخێك بووە كاك ئازاد بگەیەنرێتە بەغدا لەســـەر راســـپاردەی دكتۆر ئازاد. ئەوكات هاوڕێ (دكتۆر خەســـرەو گوڵ محەمەد) لە بەغدا بوو. لەرێگای شـــەهید جەبـــارەوە ئاگادارکراو ئەویش ئامادەكاری تەواوی كردو شـــوێنی شاردنەوەو چارەســـەركردن و حەوانەوەی بۆ دابینكرد. كاك شاسوار لە رانیە لەگەڵ شـــەهید سەید حاجی پسوولەیەكی ســـاختەیان بۆدەركرد بۆ زاڵگەكانی رێگای بەغدا، لە سلێمانیش كاك حەمەڕەشیدی باریكەیی و كاك حەمەنووری سەوزبلاخی گەرمیان تەكسییان ئامادەكرد بۆ بردنی بۆ بەغدا.

بەیانییەكـــی زوو كاك حەمەڕەشـــیدو كاك حەمەنووری هاتن بۆماڵمـــان و كاك ئازادیان خستە تەكسییەكەوەو بردیان بۆ بەغدا، لەوێش دكتۆر خەسرەو چاوەڕوانی دەكردن. مانەوەی لە بەغداو ئەوشتانەی بۆی كراوە، من لێی ئاگادارنیم و تەنها بۆیان گێڕاومەتەوە.

ئـــەو مـــاوەی (١٠) رۆژەی لە ماڵی ئێمە بوو. ئەوەندە قارەمـــان بوو. كە ئازاری بۆدەهات داوای دەكـــرد ئەگەر ناتوانرێت چارەســـەری بكرێت، هەوڵ بدەین خۆمان شـــەهیدی بكەین و نەكەوێتـــە بەردەســـتی دوژمن. ئەو رۆژانە لەگەڵ ئازارەكانی كاتمان بەقســـەو گێڕانەوەی سەرگوزشـــتەی خۆش و یاریی وەرەقەو كۆنكـــەن و گوێگرتن لە رادیۆو هەواڵەكانی ئێزگەی جارجـــارە بەپاككردنەوەی برینەكانی و تیماركردنەوە كاتمان بەســـەردەبرد. ئەوەندەی لە ماڵی ئێمە بوو رێگای نەدەدا ئێمە بیشـــۆین یان پاكی بكەینەوە. هەمووی بە تەنها خۆی دەیكرد لەمەشەوە وانەی خۆراگریی فێردەكردین.

وەكو بۆیان گێڕامەوە، پێش ئەوەی بهێننە ماڵی ئێمە هەوڵدراوە ببرێتە ئێران لە سنووری قەڵادزێ و دۆڵی شـــەهیدانەوە، بـــەڵام لەبەر بوونی دوژمن لە ناوچەكەو شـــەڕو پێكدادان نەتوانراوە رەوانە بكرێت و بۆ چارەسەركردن گێڕدراوەتەوە بۆ شارو چارەسەركردنەكەی لەناوخۆی

ولاّت بکریّت. که گەیەنراوەتە بەغداش براوەتە لای دکتۆرو نەشتەرگەریی بۆکراوەو لە ماڵی باوك و خوشکی دکتۆر خەسرەو شـــاردراوەتەوەو چارەسەری بۆکراوە. خێزانەکەیان بردووە بۆ بەغــدا. (کاك ئاکۆ محەمەد وەهبی) چووەتە بەغدا بۆ ســەردانی. کاتێکیش هێنراوەتەوە بۆ ســلێمانی بە ئۆتۆمبێلی شەهید جەبار، که خۆی لێی دەخوری لەگەڵ خاتوو شەمام شەوقی خێزانیدا، گەیەنراوەتەوە ســلێمانی و لە ســلێمانییەوە لەگەڵ کاك کارزاندا نێردراوەتەوە بۆ قــەلاّدزێ و دوای چەنــد رۆژ مانەوە نێردراوە بۆ دیوی ئێران و بــەرەو هەندەران. حەزدەکەم ئەوەش باس بکەم دوای چەند رۆژ بەدوای رۆیشتنی کاك ئازاددا، لە ماڵی ئێمەوە بۆ بەغدا. دائیرەی ئەمن هاتن بۆ ماڵمان و ماڵیان بەوردیی پشکنی و هیچیان نەدۆزییەوەو لە مانگی (ئازاری ١٩٨٩)دا لەلایەن دائیرەی ئەمنەوە دەســتگیرکرام. پــاش مانگێك لێکۆلینەوە، که هیچ شــتێکیان هەڵنەکران و بەحوکمی پارەو هەوڵی کەسوکارم ئازادکرام. تا (١٩٩٠/١/٢٣) جارێکی دیکە دەستگیرکرامەوە.

## ١١- تالیب عەبدوڵڵا سەعید[1]



ناسراو بە (تالیب مۆریاسی، عەریف تالیب، مام تالیب)

- ساڵی (١٩٣٤) لەگوندی مۆریاسی شارباژێر هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٥٧) پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە.
- لە (١٩٦١/١٢/١٣)دا پەیوەندیی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە، لە هێزی سەفین و بێتواتە بووەتە پێشمەرگە.
- لە ساڵانی شۆڕشدا لە (٦١، ٦٢، ٦٣، ٦٤، ٦٥،٦٦) لە شەڕەکانی (هێران و نازەنین، بیارە، سەرتەك، بەمۆ، زمناکۆ، ناوتاق، دەربەندیخان، پردی زەڵم، فەردج ئاوا، کەولۆس، چوالە، قەرەداغ) بەشداریکردووە.
- لە ئینشقاقی پارتی دیموکراتی کوردستاندا لە ساڵی (١٩٦٤) لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بووە.
- لەکاتی دەرچوونی بەیاننامەی (١١ئازاری ١٩٧٠) کراوەتە ئەندامی ڕێکخراوی فەرمانبەران لە سنووری لقی (٤)ی سلێمانی (پ.د.ك).
- لە شوباتی ساڵی (١٩٧٢)دا بەنهێنی پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
- لەکاتی دەستپێکردنەوەی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٤)دا پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردووەو کراوەتە جێگری بەتالیۆنی (٥)ی چەمی ڕێزان لە ناوچەی شوان و شێخ بزێنی.
- ساڵی (١٩٧٨) کراوەتە ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.
- لە (١٩٩٠/٢/١٥) لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە مەحکەمەی سەورەی بەغدا بە (١٠) ساڵ حوکمدراوەو نێردراوە بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشی ئەحکامە قورسەکان.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە، لە زیندان ئازادکراوەو لە (١٢/٢٣) بەخاکی نیشتمان شادبووەتەوە.
- لە ساڵی (١٩٩٢) ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووە.

---

١-ئەم ژیاننامەیە لە کتێبی (گەڕان بەدوای ڕاستیدا)و نووسینێکی (مام تالیب) وەرگیراوە، کە لە (٢٥ /٤/ ٢٠١٠)دا بۆی ناردبووم.

- له (١٩٩٦/٣/١٦) چووه‌ته ناو ریزه‌كانی پارتی دیموكراتی كوردســـتان و كراوه به ئه‌ندامی لقی چوار.
- له ســـاڵی (١٩٩٦) كتێبێكی به ناونیشـــانی (گه‌ران به‌دوای راســـتیدا) چاپكردووه، وه‌كو یاداشتنامه‌ی پێشـــمه‌رگه‌یه‌كی ماندوونه‌ناس، كه رووداوه‌كانی ساڵانی (١٩٥٣-١٩٩٦) تێدایه.

## ١٢- بەختیار عومەر عەبدوڵڵا

کە بە (بە بەختیاری ئەولیەو بەختیاری زیندانی) ناسراوە.



- ســاڵی (١٩٦٣) لە گەرەکی سابونکەرانی شاری سلێمانی لەناو خێزانێکی هەژاری کوردپەروەردا هاتووەتە دنیاوە.
- قۆناغەکانــی خوێندنی ســەرەتایی، ناوەندیــی، دواناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- پەیمانگای تەکنۆلۆجیای لە زانکۆی بەغداو لە ســاڵی (١٩٨٦) دا تەواوکردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) کۆلێژی زانستە رامیارییەکانی لە زانکۆی سلێمانی تەواوکردووە.
- بە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرێتیی فرۆشــتنی چیمەنتۆی سلێمانی دامەزراوە.
- پێش دەستگیرکردنی لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە، لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٩) بە (٣) مانگ ژیانی هاوسەریی پێکهێناوە.
- ســاڵی (١٩٧٩) لەگەڵ چەند هاورێیەکیدا رێکخراوێکیان بەنــاوی (یەکێتیی قوتابییانی کوردستانی سەربەخۆ)وە دامەزراندووە.
- لەبەر بچووکیــی رێکخراوەکەو کەمیی ئەندام و کەمئەزموونییــان لەرێگای (هـ.پ.ك) ەوە لە ناوچەی قــەرداخ پەیوەندییان بە (ی.ن.ك)ەوە کــردووەو بەرەو رووی رێکخراوی سلێمانی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردســتان) کراونەتەوە. بەتاکیی و وەکو لێپرسراوی شانەکەیان پەیوەندیی بە (هـ.ئەرخەوان)ەوە بوو.
- ماوەی (٦)مانگ لەژێر تاقیکردنەوەدا هێڵراونەتەوە.
- دوای دڵنیابوون لێیان و دەرچوون لە تاقیکردنەوەدا گوێزراوەتەوە بۆ لای (تەها)ناوێك، کە خوێندکاری زانکۆی سلێمانی بووەو ناوە نهێنییەکەی (هـ.ئاری) بووە.
- دوای چەند مانگێك و لە ســاڵی (١٩٨١)دا بەنامەیەك پیرۆزبایی ئەندامێتیی (کۆمەڵەی) لێکراوە.
- لەو ســاڵەوە بەبــێ دابڕان لە ریزەکانــی کۆمەڵەدا خەباتی کردووە. لە ســاڵی (١٩٨١ تا ١٩٩٠/٢/١٠) کــە ڕۆژی دەســتگیرکردنییەتی لەچەندیــن (شــانەو پۆل) پشــوودرێژانە تێکۆشــاوەو لەو ســاڵانەدا چەندین هاورێی لەناو ریزەکانی رێکخستندا ناسیوەو کاری لەگەڵــدا کردوون و کاریــان لەگەڵدا کــردووە، وەك ئەوانەی بیرمــاون، ئەمانە بوون (کامل ســابیر (هـ.ئالان)- ئەکرەم میهرداد، مامۆســتا ئەحمەدی ســەناعە (هـ.سوورە)،

عەدنان شاســوار (ه.ئاکام) نزار مستەفا (ه.جۆکوت)، مامۆستا شەفیقی حەمەبچکۆل (کە بەداخەوە خائین دەرچوو)، بێســتوونی تەندروســتی، تەهای نانەوا، ئەحمەد کەریم، عوسمان، مامۆستا شێخ محەمەد عەبدولکەریم (ه.ئاویــەر).

- لەماوەی خەباتی نهێنیدا، ئەم ناوە نهێنییانەی هەبووە:

(ئارام، گیتی، شوان).

- ئەوکاتــەی دەســتگیرکراوە، ئەندام پۆلی شــەهید کرێکار بووە، کــە ئەندامانی پۆلەکە بریتیبوون لە: بەختیارو ئەحمەد کەریم و مامۆستا شێخ محەمەد بەرپرسیان بوو،و سەر بە کەرتی (شەهید جەمال) بوون.

- لەکاتی شالاوی رێکخستنی ناو شارەکاندا، لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە لە رۆژی (١٩٩٠/٢/١٠) دەستگیرکراوەو ماوەی زیاتر لە (٩)مانگ لە ئەمنی سلێمانی بووە.

- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە دادگای ســەورەی بەغدا لەگەڵ هاورێکانیدا بە (١٠) ســاڵ زیندانیی حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکام سەقیلە).

- لــە (١٩٩١/١٢/٢٢) کاتێك هاورێکانی بەلێبووردنی گشــتیی و گۆرینــەوە ئازادکراون، بەهۆی خزمەتی ســەربازییەوە لە بەندیخانەوە رەوانەی خزمەتی ســەربازیی کراوەو لە سەربازگەکەیەوە لە (١٩٩٢/١/١) گەیشتووەتەوە سلێمانی و ئازادکراوە.

- لە بەندیخانە پەیوەندیی بە کۆمیتەی باوەرەوە کردووە.

- دوای ئازادبوونی لە (١٩٩٢/١/٥) کراوەتە کارگێری کۆمیتەی (١) لە مەڵبەندی ســلێمانی و بەو پلەیە لە کۆمیتەکانی (٤، ٦، ٣) کارێکردووە.

- لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٦) کراوەتە ئەندامی مەڵبەندی سلێمانی.

- لە مەڵبەندی سلێمانی بووەتە بەرپرسی ئەم کۆمیتانە:

سەرچنار، کاسبکارانی یەك، قەرەداغ، (٧)ی شێخ محێدین.

- لە کۆنفراسی مەڵبەند لە (٢٠٠٠)دا بە ئەندام مەڵبەند هەڵبژێردراوە.

- لــە ســاڵی (٢٠٠٢) بەهەڵبــژاردن کراوەتــە ئەنــدام مەکتەبــی پەیوەندییە کوردستانییەکان.

- لــە (٢٠٠٦/٤/١٤) ماڵئاوایی لە (ی.ن.ك)ی کــردووەو چووەتە ناو بزووتنەوەی گۆران و لە کۆمــیسیۆنی هەڵبژاردنەکانی سلێمانی دانراوە وەکو نوێنەری بزووتنەوەکەو سەرپەرشتی هەڵبژاردنی بزووتنەوەی کردووە لە هەڵبژاردنەکاندا.

## ١٣- عەبدولعەزیز عومەر عارف



- سـاڵی (١٩٤٥) لـە گەڕەکی چوارباخی شـاری سـلێمانی لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سـەرەتایی، ناوەندیی و ئامادەیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- سـاڵی خوێندنـی (١٩٦٩-١٩٧٠) کۆلێژی کشـتوکاڵی لە زانکۆی بەغدا تەواوکردووە.
- سـاڵی (١٩٧٠) دوای تەواوکردنـی خوێنـدن گەڕاوەتـەوە سلێمانی.
- سـاڵی (١٩٧٠-١٩٧١) بەفەرمانبـەر لە کارگەی شـەکری سلێمانی دامەزراوە.
- سـاڵی (١٩٩٢) دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردسـتان، کراوە بە بەڕێوەبەری بەڕێوەبەریتی کشتوکاڵی سلێمانی.
- لە ١٩٩٤/٣/١٦ بووەتە بەڕێوەبەری گشـتیی بەڕێوەبەریتی گشتیی کشتوکاڵ و ئاودێریی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٥) لە پۆستەکەی لابراوەو بەپلەی بەڕێوەبەری گشتیی خانەنشین کراوە.
- سـاڵی (١٩٩٥) بەخێزانـەوە چووەتە وڵاتـی تورکیاو دوای مانەوەی دوو سـاڵ لەو وڵاتە، لەڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە چووەتە وڵاتی سوید بە پەنابەری سیاسیی وەرگیراوەو ئاێسـتاش لەو وڵاتە نیشتەجێیە.
- ساڵی (١٩٦٥) لە بەغدا پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابییانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە.
- سـاڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) هەڵبژێـردراوە بـۆ ئەندامێتی مەکتەبی تەنفیزیـی (ی.ق.ك) لە بەغدا.
- دوای دەرچوونی بەیاننامەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠) لە ڕێکخراوی کارگەکانی سەر بەلیژنەی ناوچەی بەغداو لقی (٥) کاریکردووە.
- سـاڵی (١٩٧٠-١٩٧١) بووەتە ئەندامی ڕێکخراوی فەرمانبەرانی سـەر بەلیژنەی ناوچەی سلێمانی لە لقی (٤).
- سـاڵی (١٩٧٣) کراوەتـە ئەندامی لیژنەی ناوچەی سـلێمانی و لێپرسـراوی ڕێکخراوی قوتابییانی زانکۆی سلێمانی.
- سـاڵی (١٩٧٤) لەگەڵ لیژنەی ناوچەی سـلێمانی پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردووە، لەگەڵ

لیژنـــەی ناوچە چوونەتە چوارتاو بارەگایان داناوەو هەر لەوســـاڵەدا لە لیژنەی ناوچەی سلێمانییەوە گوێزراوەتەوە بۆ لیژنەی ناوچەی هەڵەبجەو کراوە بە لێپرسراوی ڕێکخراوی بیارە.

- لە نسکۆی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥)دا گەڕاوەتەوە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و (ی.ن.ك)ەوە کردووە.
- لە ســالآنی خەباتیدا لە ریزەکانی ڕێکخســـتنی نهێنی کۆمەڵە لەناوشـــاری سلێمانی لە چەندین (پۆل و کەرت)دا خەباتی کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) لەسەر بریاری ناوەندی کۆمەڵە کراوەتە ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٨٤) بەشداریی کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەی کردووە لە مێرگەپان.
- ساڵی (١٩٨٨)و دوای ئەنفال وەکو ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی (پیرەمەگروون) بەرپرسیاریتی چەندین هێڵ و کەرتی ڕێکخســـتنی نهێنی ناوشاری وەرگرتووەو سەرپەرشتی مەفرەزە پارتیزانەکانی پێشمەرگەی لە (سووورداش، چەمی ریزان، قەرەداغ و گەرمیان) کردووە.
- بەهۆی (پواز)ەوە لە بەیانی رۆژی (١٩٩٠/١/٢٣) لە بازگەی تاسـلوجەی ســلێمانی لەگەڵ (شـــەهید جەباری حاجی رەشـــید)دا دەکەونە بەر ئەنفالی ڕێکخستن و لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەســـتگیر دەکرێن. ئەوکاتەی دەستگیرکراوە، جگە لەچەند ئەرك و کارێکی ڕێکخراوەیی، بەرپرسی کەرتی (شەهید جەمال) بووە.
- دوای مانەوەی (٩) مانگ لە ئەمنی سلێمانی، لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە مەحکەمەی سەورەی بەغـــدا لەگـــەڵ هاورێکانیدا بـــە موئەبەد حوکـــم دەدرێت و دەنێردرێتـــە بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکامی سەقیلە.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشـــتیی و گۆڕینەوە، ئازاد دەکرێت و لە (١٩٩٠/١٢/٢٣) دەگاتەوە سلێمانی.
- دوای ئازادکردنی، بەشداریی یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك) دەکات لە ساڵی ١٩٩٢.
- لە یەکـــەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردســـتان دەبێتە ئەندامی لیژنـــەی هەڵبژاردن لە ســـلێمانی کە لە (١٩٩٢/٥/١٩)دا ئەنجامدرا. دوای کۆنگرە، بووەتە ئەندامی مەڵبەندی سلێمانی.
- دواتر دەبێتە ئەندامی لیژنەی تەنسیقی بەرەی کوردستانیی.
- ئەندامی کۆمکارانی زیندانییە سیاســـییەکانی کوردستانەو یەکێکە لەو زیندانییـانەی کە (منحە)ی مانگانەی زیندانییانی سیاسیی وەردەگرێت.

## ١٤- حەمەتاهیری شێخ مەحمودی شێخ محەمەدی گوڵانی



- لە (١٩٥٣/٤/٦) لە گەڕەکی شێخانی سلێمانی لەدایکبووە.
- بۆئەوەی لە خزمەتی سەربازیی دەربازبێت و بەر بەدەل بکەوێت، لە ساڵی (١٩٦٩) تەمەنی گەورەکردووەو خۆی کردووە بە موالیدی (١٩٤٨).
- قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- پەیمانگەی تەندروستی باڵای لە بەغدا تەواوکردووە.
- لەبەرئەوەی باوکی یەکێك بووە لە پیاوە دڵسۆزو کوردپەروەرەکانی کوردو نزیك بووە لە شێخ مەحمودی نەمرو هاوکاریی شێخی کردووە، (شێخ عەبدوڵلا)ی برای کە بە مولازم (عەبەرەش) ناسرابوو، لە ساڵی (١٩٦٣) لە شۆڕشی ئەیلولدا لە کفری شەهیدکراوە وەکو فەرماندەیەکی ئەوکاتەی شۆڕش و (ئیبراهیمی برای) کە ناسراوە بە (بلەرەش) ئەویش یەکێك بووە کە لە سەرەتای ژیانییەوە ڕێبازی خەباتی کوردایەتی هەڵبژاردووەو لە شۆڕشی ئەیلولدا وەك کادیرێکی سیاسیی بەشداریکردووە، ئەمیش چووەتە ریزی خەباتی کوردایەتییەوە.
- لە ساڵی (١٩٦٥) بووەتە ئەندامی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان، لەو ڕێکخراوەوە دەستی بە خەباتی ڕێکخراوەیی کردووە تا ساڵی (١٩٧٠).
- لە (١١ی ئازاری ١٩٧٠) کاتێك هەردوو باڵەکەی پارتی تێکەڵاوبوونەوە، لەکاتی خوێندنی پەیمانگەدا لە بەغدا لەسەر خەبات بەردەوام بووە.
- ساڵی (١٩٧١) بەفەرمانبەر لە نەخۆشخانەی گشتیی سلێمانی دامەزراوە.
- لە ژیانی فەرمانبەریدا چووەتە ناو ریزەکانی (پ.د.ك)ەوەو دەستی بەخەباتی سیاسیی کردووە.
- لە ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردووەو کراوەتە لێپرسراوی سیاسیی فەرمانبەرانی لقی (٤)ی تەندروستی، لەکاتی هەڵبژاردنی ناوچەی پێنجوێن وەکو کادیرێکی پارتی سەر بە لقی (٤) هەڵبژێردراوە.
- هەر لەوساڵەدا لەلایەن لقی (٤)ەوە هەڵبژێردراوە بۆ خولی کادیری لە سەرکردایەتی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا.
- لە نسکۆی (١٩٧٥)دا گەڕاوەتەوە سلێمانی.
- لە ساڵی (١٩٧٦) لەڕێگای چەند هاوڕێیەکییەوە کەوتووەتە خوێندنەوەی ئەو نامیلکەو

کتێبانەی پەیوەندیی بەبیری (مارکسی لینین)ەوە بوو.

- دوای هەڵبژاردنی ئەو ڕێبازە لە ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بە کۆمەڵەی مارکسی لینینییەوە کردووەو لە خەباتی ژێرزەمینی لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا بە بەردەوامی بەبێ دابڕان خەباتی نهێنی لەناوشاردا کردووە.
- لە (١٩٩٠/٢/٢٢) کە ئەوکاتە ئەندامی کەرتی (شەهید عەزیز) بووە، لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکراوە.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە دادگای سەورە بە (١٠) ساڵ زیندانیی حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشی ئەحکامە قورسەکان.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بە لێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە، ئازادکراوە.
- ساڵی (١٩٩٢) ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووە.
- ساڵی (١٩٩٢) یەکێك بووە لەو فەرمانبەرانەی بواری تەندروستی، کە کۆمەڵەی کارمەندانی تەندروستی کوردستانیان دروستکردووەو لە کۆنفراسەکەدا بە سەرۆکی لقی سلێمانی هەڵبژێردراوە.
- لە کۆنگرەی گشتیی هەرچوار لقی کۆمەڵەی تەندروستی (سلێمانی، کەرکوك، هەولێر، دهۆك) بۆ سکرتێری گشتیی کۆمەڵە هەڵبژێردراوە.
- ساڵی (١٩٩٦) لەبەر چەند هۆیەك کە تایبەت بووە بەخۆی و بەرەزامەندیی (مەکتەبی سیاسیی) (ی.ن.ك) چووە بۆ هەندەران.
- لە (١٩٩٦/٨/١٥) لەکاتێکدا کە لەکەمپدابووە لە هەندەران، پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە کردووە لە کۆمیتەی (بەتە لۆکس)، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیداو هەڵبژێردراوە بۆ لێپرسراوی شارەکە پاش دەرچوونی لە کەمپ چووەتە شاری (ماسلاوس).
- ساڵی (٢٠٠٣) لە هەندەرانەوە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، بۆئەوەی لە خەباتی سیاسیدا بەشداریی بکات، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك نەیتوانیوە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات.
- لە (٢٠٠٥/١٢/١) گەڕاوەتەوە بۆ سەر کارەکەی خۆی لە وەزارەتی تەندروستی و دواجار خانەنشین کراوە.
- ئێستا لە هەندەران دەژی.

## ١٥- فەرەیدوون سەعید جەعفەر

ناسراو بە مامۆستا (فەرەیدوون دارتاش)



- سـالّی (١٩٤٣) لـە سـلێمانی لەنـاو خێزانێکـی هـەژاری کوردپەروەردا لەدایکبووە، (حمەسـەعیدی) باوکی سروودی کوردی فێرکردوون و هانیداون بۆ ڕێبازی کوردایەتیی.
- قۆناغەکانـی خوێندنی سـەرەتایی و ناوەندیی لە سـلێمانی تەواوکردووە.
- سـالّی (١٩٥٩) چووەتە بەشی مۆسـیقای پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغداو سالّی (١٩٦٢) پەیمانگەی تەواوکردووە.
- سـالّی (١٩٦٢) بە مامۆسـتای هونـەر لە دیانـای ڕەواندوز دامەزراوە.
- سـالّی (١٩٦٣) لـە دیاناوە بۆ شـەقلاوا گوێزراوەتەوە. لەم قوتابخانەیـەدا بۆ یەکەم جار سروودی نیشتمانی کوردی بە خوێندکارەکان وتووە.
- سالّی (١٩٦٧) لە شەقلاواوە بۆ سلێمانی و بۆ قوتابخانەی ئەمین زەکی گوێزراوەتەوەو دواتر وەکو ڕاهێنەرو سەرپەرشتیار چووەتە چالاکیی قوتابخانەکان.
- شەش خەلاّتی جۆراوجۆری وەرگرتووە.
- لـە سـالّی (١٩٦٧) لەکاتـی دامەزراندنی (تیپی مۆسـیقای سـلێمانی) یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی تیپەکە.
- لە سـالّی (١٩٧٥)ەوە تا سـالّی (١٩٩٦) هەموو ساڵێك بە سەرۆکی تیپ هەڵبژێردراوەو لە ئێستادا ئەندامی تیپەکەیە.
- ئێستا سەرۆکی هونەرمەندانی کوردستانە.
- برای شەهید (ئەنوەر دارتاشە).

### ژیانی سیاسیی و ڕێکخراوەیی:

- سـالّی (١٩٥٨) چووەتە ریزی یەکێتیـی قوتابییانی کوردسـتانەوەو ئەندامی لیژنەی پەیمانگەکانی بەغداو ئەندامی لقی سلێمانی بووە.
- لە خۆپیشاندانەکانی سالّی (١٩٦١) لە بەغداو سەردەمی عەبدولکەریم قاسم بەشداریکردووە، لەلایەن ڕژێمی ئەوکاتەوە فەرمانی دەسـتگیرکردنی دەرچووەو بەردەسـت نەکەوتووە. ڕۆژنامـەی (الجمهوریـە)و گۆڤـاری (الفلقە) لەسـەریان نووسـیوەو داوای دادگاییان کردووە.

- ســالّی (١٩٥٩) چووەتە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە. وەکو ئەندامیکی چالاك کاری لە ریکخستنەکانی بەغدا، سلیمانی، هەولیر، رەواندوز، شەقلاوا کردووە، تا پلەی گەیشتووەتە کارگیری لقی هەولیرو سەرپەرشتی کۆیەو شەقلاواو رەواندوزی کردووە.
- سالّی (١٩٦٢) لەگەلّ چەند ماموستایەکی دیکەدا یەکیتیی ماموستایانی کوردستانیان لە هەولیر-شەقلاوا، کۆیە، رەواندوز دروستکردووە.
- لەکاتی کەرتبوونی پارتیدا لە ســالّی (١٩٦٤) لەگەلّ بالّی (م.س)دا بووەو لە کۆنفراسی تیماری قەرەداغ لە ســالّی (١٩٦٧) بەشــداریی کــردووەو دوای چەند مانگیك لە ریزی پارتی کشاوەتەوە.
- سالّی (١٩٧١) چووەتە ریزی کۆمەلّەی مارکسی لینینی کوردستانەوە.
- لە (١٩٧٤/٨/١٩) لەگەلّ کامیلی برایدا لەلایەن ئەمنی عامەوە لە بەغدا دەستگیرکراون و دوای دوو مانگ ئازادکراون.
- لە (١٩٧٤/٣/٢٥) لەگەلّ تیپی موســیقای سلیمانی پەیوەندیی بە شۆرشی کوردستانەوە کــردووە. دوای دوو مانگ لەســەر رەزامەندیی (کۆمەلّە) گەراوەتەوە ناوشــارو کاری کۆمەلّەی کردووە.
- چەندین جار بۆ کاری کۆمەلّەو یەکیتیی ماموستایان لەگەلّ چەند هاورییەکیدا سەردانی ناوزەنگیان کردووە.
- لە (١٩٨٠/٧/١٥) لەلایەن دەزگاکانی رژیمەوە دەستگیرکراوەو براوەتە (هەینەی کەرکوك)، لە ئەنجامی بەدرۆخستنەوەی کەسیکی (پواز)ئاسا (٩) هەڤالّی دەستگیرکراو ئازادکران و کەسەکەش بە (٦) سالّ زیندانیی حوکمدرا.
- چەندینجار بۆ کاروباری کۆمەلّەو یەکیتیی هونەرمەندان سەردانی ناوزەنگ، بالیسان، خەتیّ، ئاوەژیّ و سورداشی کردووە.
- لە کۆنفرانسی کۆمەلّەی رەنجدەرانی کوردستان لە میرگەپان لە سالّی (١٩٨٤) ئەندامی کۆنفرانس بووە.
- لە (١٩٩٠/١/٢٣) لە شــالّاوی ئەنفالی ریکخســتنی ناوشــاردا لەلایەن دەزگای ئەمنی سلیمانییەوە دەستگیرکراوە.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لەگەلّ (٢٩) هاوریدا لە مەحکەمەی ســەورە بە (١٠) ســالّ زیندانیی حوکمدراوەو نیردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغریب، بەشی (احکام طویلة).
- لــە (١٩٩١/١٢/٢٢) لــە بەندیخانەی ئەبوغریــب ئازادکراوەو (١٢/٢٣) گەیشــتووەتەوە سلیمانی و کوردستانی ئازادکراو.
- دوای ئازادبوونی، کراوەتە کارگیری مەلّبەندی ســلیمانی، بۆ سەرپەرشــتی ریکخراوە جەماوەرییەکان.
- لە مانگی (١٩٩٥/١٢) چووەتە دەرەوەی ولّات و لە ئەلّمانیا جیگیربووە.

- لە ساڵی (٢٠٠١)دا گەڕاوەتەوە کوردستان.
- لە کۆنگرەی (١، ٢، ٣)و پلینۆمی (٣)ی (ی.ن.ك)دا بەشداریی کردووە.
- لە ساڵی (٢٠٠٩)دا کراوەتە ئەندامی ئەنجومەنی ناوەند.
- لە ساڵی (١٩٨٣) لەگەڵ چوار هونەرمەند (یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستان)یان دروستکردووەو بەدوایدا کۆمیتەی (شاخ)و گشت شارەکانیان دروستکردووە.
- لە ساڵی (١٩٨٣) لەلایەن یەکێتیی هونەرمەندانەوە پێشنیازی ئاشتبوونەوەی گشتیی کراو وەکو نوێنەری هونەرمەندان سەردانی لایەنە سیاسییەکانی کوردستانی کردووەو ئەنجامەکەی بەرەی کوردستانیی لێدروستبووە.
- لە هەرسێ کۆنگرەی یەکێتیی هونەرمەنداندا لە ساڵانی (١٩٩٢، ١٩٩٣، ٢٠٠١) بە سەرۆکی ڕێکخراوەکە هەڵبژێردراوەتەوە.
- لە کۆنگرەی نەتەوەییدا لە هۆڵەندا وەکو نوێنەری هونەرمەندان بەشداریی کردووە.

## ١٦- محەمەد رەسوڵ سەعدی

ناسراو بە (کاکە زیاد)



- ســاڵی (١٩٥٥) لــە گوندی (ئەســپیندارە)ی هیران و خۆشــناوەتی هاتووەتە دنیاوە.
- تا ســاڵی (١٩٦٠) لە گوندەکانی (ئەسپیندارەو کەروتیان و بەرەکە) ژیانی ئاسایی بەسەر بردووە.
- لە شەستەکانەوە ماڵیان چووەتە شارۆچکەی شەقڵاوا، چەند ساڵێك لە شەقڵاوا ماونەتەوەو دواجار بۆ بژێویی ژیانیان ماڵیان چووەتە گوندی (سیساوا)ی دەشتی هەریر.
- خوێندنی ســەرەتایی لە گوندی سیســاوا تەواوکردووەو لە ساڵی (١٩٧٤) لە قۆناغی سێی ناوەندیی بووە لە هەریر.
- ساڵی (١٩٧٤) ماڵیان گەڕاوەتەوە بۆ شەقڵاوا.
- دوای هەرەسی شۆڕشی کوردستان، لە ساڵی (١٩٧٥)دا کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ شەقڵاوا، ڕژێم لە شــەقڵاوا دائیرەی ئەمن دەکاتەوە، لەو دائیرەیە چەندجار بانگی دەکەن و هەڕەشەی لێدەکەن و دەستگیری دەکەن.
- ساڵی (١٩٧٧) وەکو هەوادارێکی شۆڕش و پەرۆشی کوردایەتیی لە شۆڕش و هەڤاڵانی سەر بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك) نزیکدەبێتەوەو هاوکاریی و یارمەتیان دەدات.
- ساڵی (١٩٨١) خێزان پێکدێنێت و دەچێتە ژیانی خێزانییەوە.
- ساڵی (١٩٨٥) بەهۆی هاوکاریکردنی بۆ شۆڕش، چەندینجار دەستگیرکراوەو ئازادکراوە.
- لە ساڵانی (١٩٨٦- ١٩٩٠) بەوپەڕی توانای مادیی و مەعنەویی هاوکاریی شۆڕش و پێشمەرگەی کردووە.
- بەهــۆی دڵســۆزیی و متمانەیەوە (نوری نانەکەلی) مانگانە (٣٠) هــەزار دیناری لە (ئەحمەد ئیسماعیل)ی برای وەرگرتووەو داویتییە (کاکە زیاد) بۆ شۆڕش و هێزی پێشمەرگەو مانگانە (١٠) هەزار دیناری لە (عەدنانی) خاوەن کارگەی کاشی گەڵاڵە وەرگرتووەو ئەو دووبڕە پارەیە کە دەیکردە (٤٠) هەزار دینار، ئەوکاتە مانگانە ناردوویەتی بۆ شۆڕش.
- لە بارودۆخی شۆڕش لە ساڵی (١٩٨٨)داو لە مانگی (٥)دا بەمەبەستی سەردانی کاك کۆسرەت، ســەردانی ئێرانی کردووەو لەو سەردانەیدا جگە لە کاك کۆسرەت، کۆمەڵێك لە سەرکردەو فەرماندەییەکانی هێزی پێشمەرگەی بینیوەو ئەو داواو پێداویستییانەی داوایان لێکردووە، بۆی جێبەجێکردوون.
- لە (١٩٨٨/١٠/١٦) جارێکی دیکە لەســەر داوای هەڤاڵانی ســەرکردایەتی ســەردانی ئێرانی

کردووەتــەوەو برادەرانــی ســەرکردایەتی بینیــوەو داواکاریــی و راســپاردەکانیانی بــۆ جێبەجێکردوون.

(کاکە زیاد) بەم شێوەیەی خوارەوە باس لەو کارو ئەرک چالاکییانەی دەکات کە لەدوای ئەنفال و دوای ئەو دوو سەردانەی بۆ ئێران بۆ خزمەتی شۆڕش و هەڵسانەوەی ئەنجامیداون:

دوای ئەو سەردانانەو راسپاردەکانی هەڤاڵان، گەرمترو پرۆشانەتر کەوتمە کارکردن، بۆئەوەی لەناو هەولێرو دەوروبەری ئەوەی پێم دەکرا بۆ یارمەتی و هاوکاریی هاوڕێیانی رێکخستن لەناو شــاردا، خســتمە ئەســتۆی خۆم. وەکو لە ژیاننامەکەدا وتوومە من لەناو (ی.ن.ک) هیچ پلەو پایەیەکی رێکخراویی و حزبیم نەبوو. واتە لە شــانەو پۆل و ئۆرگانێکی حزبیدا کارم نەدەکرد، بەڵام بارودۆخی ئەوکاتەی شــۆڕش و گەلەکەم وای دەخواســت کە چیم پێدەکرێت کەمتەرخەمی نەکەم. هەر بۆ ئەو مەبەســت و ئەرکە ماڵەکەی خۆم کە ئەوکاتە لە گەڕەکی (موفتی) هەولێر بوو، کردمە بنکەیەکی نهێنی کارکردنی ناوشــارو خۆشــم تەرخانکرد بۆ راپەڕاندنی کارەکانی رێکخســتن و شــۆڕش... دیارە پەیوەندییــەکی فراوانم هەبوو لەناو هەولێرو ناوچەی پشــدەرو خۆشــناوەتی و قەڵادزێ. زۆرم لەو هەڤاڵانە دەناســی و هاوڕێم بوون کە لەو ســەردەمەدا کاری رێکخستن و شۆڕشیان دەکرد. ئەو هاوڕێیانە متمانەیەکی تەواویان پێم بوو، دەرامەتی ئابووریم زۆرباش بوو. لە خەرجکردنی پارەش بێباک بووم. بۆیە هاوڕێیان ماڵەکەمیان هەڵبژارد، بۆئەوەی کارەکانی رێکخســتنی تێدا ئەنجام بدەن، هاوڕێیان لە (هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، قەڵادزێ، چەمچەماڵ و بادینانەوە) دەهاتن بۆ ماڵمان و یەکتریان دەبینی و رێوشوێنیان دادەنا. ئەوانەشی بەزۆریی سەردانی ماڵمانی دەکردو ئەوانەی بیرم ماون، ئەم هەڤاڵانە بوون:

١- شــەهید جەباری حاجی رەشیدو خاتوو شەمامی خێزانی، کە ئەوکاتە شەهید سەرپەرشتیاری (رێکخستنی سلێمانی- کەرکوك) بوو.

٢- عارف روشدی (کە ئەوکاتە سەرپەرشتیاری رێکخستنی دهۆك و بادینان بوو)

٣-دکتۆر خەسرەو گوڵ محەمەد (کە ئەوسەردەمە سەرپەرشتیاری رێکخستنی بەغدا بوو).

٤- کاکە زیاد عومەر تەها، کە بە (کاك زیاد گچکە) ناســراوبوو (سەرپەرشــتیاری رێکخستنی هەولێر بوو).

٥- مستەفای سەید قادر (سەرپەرشتیاری هەموو رێکخستنەکان بوو).

٦- مســتەفا ئیبراهیم دەروێش (شاســوار)، کە ئەوکاتە ســەرباز بوو، سەرپەرشتی رێکخستنی قەڵادزێ و پشدەری دەکرد.

جگە لە چەند هاوڕێیەکی دیکە کە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە.

ماوەیەکــی زۆر کارەکان لە ماڵــی ئێمەدا جێبەجێدەکران. دوایی هەڤــاڵان بیریان لەوە کردەوە بۆ شــوێنەونی و کەمکردنەوەی ئەرك لەســەر ماڵمان، بڕیاریاندا خانوویەك بکرن. خانوویەکی بچووکیان لەهەمان گەڕەك بەرامبەر ماڵمان کڕیی. کارەکانیان لە ماڵی ئێمەوە گواســتەوە بۆ

ئەو خانووەو کردیانە بنکەیەکی نهێنی کارکردن و راپەڕاندنی کارەکانی ڕێکخستن و شۆڕش. لەو خانووەدا ژوورێکی تایبەتیان دروستکرد کە شەهید جەبار لە سلێمانییەوە وەستای بۆهێناو ژوورەکە جێگای (٥-٦) کەسی تێدا دەبووەوە، هەر لەناو ژوورەکەدا شوێنێکیان بۆ شاردنەوەی شتومەك دروستکرد، کە زۆر قایم و شاراوە بوو. ئەوەندە قایم و نهێنی بوو، ئەو خانووە کە دواجار فرۆشراوە، ئەوەی کرێیەتی نازانێت ئەو شوێنە لەکوێی ژوورەکەدایەو ئەو ژوورە برادەران کۆبوونەوەیان تێدادەکرد. ئەو خانووە بەزۆریی هەردوو کاك مستەفای تێدابوون، واتە: (مستەفای سەید قادرو مستەفا ئیبراهیم) (شاسوار).

ئەوانەشی هاتوچۆی ئەو خانووەیان دەکرد، هەرهەمان برادەران بوون کە لەپێشەوە باسم کردوون، کە هاتوچۆی ماڵی ئێمەیان دەکرد.

لە مانگی (١)داو لە (٢١-١٩٩٠/١/٢٢) شەهید جەبار هاتە هەولێرو یەکمان بینی و سەری لە ماڵمان دا. وتی: کە گەڕامەوە دەچم بۆ بەغدا سەر لە دکتۆر خەسرەو دەدەم. هەرچی پۆستەیەکیان هەبێت لەگەڵ خۆم دەیهێنم و رۆژی یەکشەممە دێمەوە بۆ لاتان. گەڕایەوە بۆ سلێمانی.

رۆژی (١٩٩٠/١/٢٣) لەکاتێکدا ویستبوویان لەگەڵ عەزیز عومەردا بچن بۆ بەغدا، لە بازگەی تاسلوجە لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکرابوون... هەر ئەو رۆژە نیوەڕۆو دوای نیوەڕۆ خاتوو شەمام تەلەفۆنی بۆ ماڵی ئێمە کردبوو. لەگەڵ (لەیلا)ی خێزانمدا قسەی کردبوو و هەواڵی کاك جەباری پرسیبوو. کە لەگەڵ برادەراندا گەڕامەوە ماڵەوەو (لەیلا) باسی ئەوەی کرد، کە پرسیاری کاك جەباری کردووەو وتوویەتی بەیانی لەگەڵ عەزیز عومەردا بەنیازی بەغدا رۆیشتوون. دەنگیان نییە نەهاتوون بۆ هەولێر؟ کاك مستەفا سەید قادریش وتی: ئەوان بڕیاربووە بچن بۆ بەغدا بۆ هەولێر بۆدێن. ئیتر ئێمە تەلەفۆنمان لەگەڵ خاتوو شەمامدا کردەوە، دیاربوو زۆر لەخەمدابوو. ئەو رۆژە زیاتر لە چوار پێنج تەلەفۆنمان لەگەڵدا کرد، دیاربوو پەشۆکابوو.

شەو دەوری کاتژمێری یەك لە ئەمنی سلێمانییەوە هاتن بۆ هەولێرو دایان بەسەر ماڵی ئێمەدا. پێش هاتنیان بەنیو سەعات هەردوو کاك مستەفا رۆیشتبوون. من کە زانیم ئەمنەو داویانە بەسەرماندا، خۆم دەربازکردو رامکرد. کە منیان دەست نەکەوتبوو، لەیلای خێزانم و منداڵەکانم و هەرچی میوان لە ماڵمان بوون دەستگیریانکردبوون، کە یەکێکیان (بورهانی بلەیی) بوو، کە ئەوکاتە موستەشاری حکومەت بوو.

لەکاتی پشکنینی ماڵماندا دوو کلاشینکۆف، (٤) رومانە، چوار کاسێتی ڤیدۆیی لەسەرە هەڵەبجەو شێخ وەسانان و شەڕی دابان و هەلاج و ئەو وتارەی کە مام جەلال لە گفتوگۆی (١٩٨٤) دا لە سووورداش خوێندبوویەوە، گرتبوویان. چوار ئۆتۆمبێلیان بردبوو. رۆژی دوایی کە لەگەڵ هەڤاڵاندا مستەفای سەید قادرو مستەفا دەرویش و دکتۆر نەزمی یەکمان بینییەوە، کەوتینە مەشوەرەتی ئەوەی چی بکەین و چۆن کارێك بکەین ئەوانەی دەستگیرکراون ئازادیان بکەین؟ ئەوکاتە (فەرمان ڤیرژەیی) سەر بە حکومەت بوو، پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ دائیرەی ئەمنی

هەولێردا هەبوو، لەرێگای (ئەبو قەحتان)ێکەوە کە رائیدی ئەمنی حوکمی زاتی بوو، لە هەولێر.
دوای مشــوورەت بۆ بارسووکیی من و ئازادکردنی دەستگیرکراوەکان. رێککەوتین کە (٢٠) هەزار دیناری ئەوکاتــە لەرێگای فەرمانەوە بدرێتە ئەو (ئەبو قەحتانــە)، بۆئەوەی کارێك بکرێت ئەو شــتانەی لە ماڵماندا گیرابوون، لەسەر من لابرێت و بکرێتە هی کەسێکی دیکە. ئەوانیش هەر لەرێگــای پیاوانی ئەمنەوەو بە زەبری ئەوپارەیە، ئەوشــتانەیان والێکرد کە پەیوەندیی بەمنەوە نییەو خستیانە سەر کەسێکی دیکە.
لە دانیشــتنێکدا لەگەڵیاندا وتیان: تۆ هیچت لەســەر نییە تەنها تۆ بتوانە (مســتەفا ئیبراهیم دەروێش)مان بۆ بدۆزەرەوەو شوێن و جێگایمان پێبڵێ، کە ئەومان دەستگیرکرد یەکسەر ئەوانەی لە ماڵی ئێوەدا گیراون، ئازادیان دەکەین و تۆش دەســتگیرناکەین، ماوەی مانگێکیان بۆ دانام.
منیش بەڵێنم دانێ کە هەوڵی ئەوە بدەم کە (کاك مســتەفا)یان تەسلیم بکەم. لە ماوەی ئەو مانگەدا من بە بەردەوامی لەگەڵ هەردوو کاك مســتەفادا، واتە مستەفای سەید قادرو مستەفا دەروێش بەدوای (مستەفا ئیبراهیم دەروێشدا دەسوورامەوە)، بەدوای کەسێکدا دەگەڕام کە ڕۆژانە لەگەڵیدابووم.
مانگەکەم تەواوکرد، پێم ڕاگەیاندن کە بۆم نادۆزرێتەوەو لەســەر بڕیاری هەردوو کاك مستەفا چوومە ئەمنی ســلێمانی و خۆم تەســلیمی ئەمن کرد. دوای تەســلیمکردنی خــۆم، خێزانم و منداڵەکانــم و میوانەکانــم ئازادکران، بەڵام خێزانەکەم وەکو دەستبەســەر وابوو، دەبوو ڕۆژانە ســەردانی ئەمنی هەولێر بــکات، واتە لە (١٩٩٠/٢/٢٣) خۆم تەســلیم کــرد. کاتێکیش خۆم تەســلیم کرد باســی ئەو شــتانەیان لەگەڵدا نەکردم کە لە ماڵماندا گیرابوون. دیاربوو لەسەر منیان لابردبوو، لەڕۆژی دەســتگیرکردنمەوە لەگەڵ هاوڕێکانمدا لە ئەمنی ســلێمانی مامەوە.
تا ناردیانین بۆ مەحکەمەی ســەورەو لە ڕۆژی ١٩٩٠/١٠/١٦-دا حوکمی (١٠) ساڵم بەسەردا دراو نێردرامە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەشی ئەحکام تەویلە.
کە چووینە ئەبوغرێب، یەکەم شــەو بیرۆکەی دروستکردنی ڕێکخســتنم لەلای هاوڕێیان (شێخ عەبدوول، کارزان، ســامان، بەختیار، ســالار) خســتە ڕوو. پێم وتن: هەرچەندە لە دەرەوە کاری ڕێکخستنم نەکردووە، بەڵام لێرە دەمەوێت کاری ڕێکخستن بکەم و کۆمیتەیەك دروست بکەین و ئەوانیش لەگەڵمدا هاوڕابوون، کۆمیتەکەمان دروستکرد. کاتێك کاك مستەفای سەید قادریش دەســتگیرکراو هێنایانە بەندیخانەی ئەبوغرێب. هەوڵێکی زۆرم دا تا گواســتیانەوە بۆ بەشەکەی ئێمەو بیرۆکەی ڕێکخســتن و کۆمیتەکەم بۆ باسکرد. ئەویش زۆری بەلاوە باش بوو، پێشنیازی کــرد کە ناوی بنێین (کۆمیتەی باوەڕ)و ناونرا کۆمیتەی باوەڕ. ئەمەی گێڕامەتەوە، کورتەیەکەو ئەگەر بەدرێژیی باســی بکەم چەند لاپەڕەیەکی دەوێت و باوەڕناکــەم لە بڕگەیەکدا زیادەڕۆییم کردبێت و بەڕاســتی شتەکانم باس نەکردبێت.
- کاك زیاد بەهۆی بارودۆخی سیاســیی کوردســتانەوەو لەکاتی شــەڕەکانی ناوخۆوە هاتووەتە سلێمانی و ئێستا لە سلێمانی دادەنیشێت و کاری بەڵێندەرایەتی دەکات.

## ١٧- ئەردەڵان عومەر عەلی



- ساڵی (١٩٧٠) لە گەڕەکی هەوارەبەرزەی شاری سلێمانی لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٨٥-١٩٨٦) بەمەبەستی ئەوەی ببێتە پێشمەرگە، چەندینجار پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کردووە، بەڵام لەبەر کەمیی تەمەنی ڕێگایان نەداوە ببێتە پێشمەرگە.
- لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ ناوشار، ناوی کەسێکیان لەناوشار داوەتێ، تا پەیوەندیی پێوە بکات و لەگەڵیدا بەنهێنی لەناوشار نیش بکات. ئەویش کە گەڕاوەتەوە کەسەکەی دۆزیوەتەوەو کاری لەگەڵدا کردووەو پەیوەندیی پێوە کردووە، دیارە پەیوەندییەکەشی لە ساڵی (١٩٨٦)دا بووەو لەو ساڵەوە لە ڕیزەکانی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)دا خەباتی کردووە. بەداخەوە ئەو برادەرە پەیوەندیی بەدەزگای ئەمنی ڕژێمەوە هەبووەو ئەو ماوەیەی کە بەیەکەوە خەباتیان کردووە، دەنگی تۆمارکردووەو داویەتی بە ئەمن و هەر بەهۆی ئەو (پواز)ەوە لە دەمەوە دراوەو لە ڕۆژی ١٩٨٩/١١/١٦ لەلایەن ئەمنی سلێمانیەوە دەستگیرکراوە.
- ئەو (پواز)ە بۆ سەلماندنی کارو قسەکانی، لە ئەمن ڕووبەڕووی بووەتەوەو زانیاریی لە بەردەمی جەللادەکانی ئەمندا لەسەر داوە.
- دوای مانەوەی (١١)مانگ لە ئەمنی سلێمانی، لە ڕۆژی (١٩٩٠/١٠/١٦) لەلایەن دادگای بەناو سەورەی بەغدا لەگەڵ هاوڕێکانیدا بە موئەبەد حوکمدراوەو نێردراوەتە بەندیخانەی ئەبوغرێب، بەشی ئەحکام سەقیلە.
- لەناو بەندیخانە پەیوەندیی بە (کۆمیتەی باوەڕ)ەوە کردووە.
- لە (١٩٩١/١٢/٢٢) بەلێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە بەندیخانەی ئەبوغرێب ئازادکراوەو هەر لە بەندیخانەوە نێردراوە بۆ خزمەتی سەربازیی و لە خزمەتی سەربازییەوە لە (١٩٩٢/١/١) گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و بەتەواویی ئازادکراوە.
- دوای ئازادکردنی لە ساڵی (١٩٩٢) بەشداریی کۆنگرەی (١)ی (ی.ن.ك)ی کردووە.
- دوای کۆنگرە، وەکو کارگێڕی کەرت و ئەندامی کۆمیتە لە مەڵبەندی سلێمانی کاریکردووە.
- دوای ساڵێك چووەتە بەشی ڕاگەیاندنی مەڵبەندو لە ڕاگەیاندنی مەڵبەند کاریکردووە.
- دوای ئەوە چووەتە دەستەی حیمایەکانی (هەڤاڵ کوردۆ قاسم)ی ئەندامی سەرکردایەتی

(ی.ن.ك)و وەكو شۆفێر زیاتر لە دوو ساڵ دەوامی كردووە.
- دوای ئەوە بەكارێكی تایبەتی (ی.ن.ك) لە ئۆرگانێكدا خەباتی كردووە.
- لــە (٣١ی ئابی ١٩٩٦)دا لەگەڵ ئەو ئۆرگانــە چووەتە ئێران و دوای گەڕانەوەی ئۆرگانەكە ئەمیش گەڕاوەتەوە سلێمانی.
- لە رۆژی (١٩٩٨/٨/٦) بەرەو هەندەران رۆیشتووەو لە یۆنان گیرساوەتەوەو لەو ماوەیەی لەو وڵاتە بووە، ســەردانی رووسیاو بولغاریای كردووەو زیاتر لە (١٠) ساڵ لەو وڵاتانە ماوەتەوە.
لــە (٢٠٠٨/٥/١٣) لەرێگــای فرۆكەخانــەی نێودەوڵەتیی هەولێر بۆ ئێجگــاری گەڕاوەتەوە كوردستان.
- لە گەڕانەوەیەوە وازی لە كارو خەباتی حزبیی هێناوەو بۆ دابینكردنی بژێویی ژیانی ئێستا خەریكی كارو كاسبــی ئازادە.
ئەردەڵان بچووكترین هاوڕێی گیراومانە لەناو ئەو (٣٠) هاوڕێیەی كە لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە لە ساڵی (١٩٨٩-١٩٩٠)دا كەوتینە بەر شاڵاوی گرتن.

## ١٨- عەلی محەمەد شاسوار

ناسراو بە (عەلی شەهید محەمەد)



- سـالی (١٩٦٤) لە گەرەکی (کەلاری کۆن) لە قەزای کەلار لەناو بنەماڵەیەکی هەژارو شۆڕشگێڕدا لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەلار تەواوکردووە.
- بەهۆی ئەوەی باوکی، واتە (شەهید محەمەد) لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا پێشمەرگە بووە. لە تەمەنی منداڵی چەندجار بۆ ئێران و خوارووی عیراق لەگەڵ ماڵی باوکیدا ئاوارە کراون.
- لە سـالی (١٩٨٠) لە شەڕێکی پێشمەرگانەی پێشمەرگەکانی گەرمیان (شەهید محەمەد)ی باوکی بە گوللەی فڕۆکەکانی ڕژێم شەهید دەکرێت و بە شەهیدی دوژمن سەری دەبڕێت و بەسەر بردراویی بەخاک دەسپێردرێت.
- دوای (٣) مانگ بەسەر شەهیدبوونی باوکیدا، بۆ تۆڵەسەندنەوەی باوکی، بەرقنەستووریی لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا دەبێتە پێشمەرگەو دەکرێتە فەرماندەی کەرتی (١)ی تیپی (٥٣)ی شێروانە. لە هەرێمی قەرەداغ.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا (٥) جار بریندارکراوە.
- سالی (١٩٩٨)و دوای ئەنفال بەبڕیاری شۆڕش دەگەڕێتەوە بۆ کەلارو دەبێتە فەرماندەی تیپی (سوپای رزگاریی کوردستان) (سرك) لە گەرمیان.
- بەهـۆی بوونی پـوازەوە لە (١٩٩٠/١/٢٣) لە شالاوی ئەنفالی ڕێکخستندا دەکەوێتە بەر شالاوی گرتن و لەلایەن دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیردەکرێت.
- لە (١٩٩٠/١٠/١٦) لە مەحکەمەی سەورە لەگەڵ هاورێکانیدا بە موئەبەد حوکم دەدرێت و دەنێردرێتە بەندیخانەی ئەبوغریب بەشی ئەحکام سەقیلە.
- لەناو زینداندا پەیوەندیی بە (کۆمیتەی باوەڕ)ەوە کردووە.
- لـە (١٩٩١/١٢/٢٢) بەلێبووردنی گشتیی و گۆڕینەوە ئازاد دەکرێت و لـە بەندیخانەوە دەنێردرێت بۆ خزمەتی سەربازیی.
- لە (١٩٩٢/١/١) بەئێجگاریی ئازاد دەکرێت و دەگەڕێتەوە کوردستان.
- دوای ئازادبوونی دەبێتە ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی (ی.ن.ك).
- لە دروستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بەپلەی ئەفسەری ئاسایش لە ئاسایش دادەمەزرێت.
- ئێستا پلەکەی (عەمید)ەو بەڕێوەبەری (بەڕێوەبەرێتی ئاسایشی گەرمیان)ە لە کەلار.

# با به ژیانی خۆشما بچمەوە

## ١٩- محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، کە بە (مامۆستا شێخ محەمەد، شێخە سوورە) ناسراوم

**یەکەم: ژیانی ئاسایی و وەزیفیم چۆن بووە؟**



- لە پاییزی ساڵی (١٩٤٤) لە گوندی سۆڵەی دەربەندی ناوچەی قەرەداغ لەناو بنەماڵەیەکی ئاینیی خاوەن تەکیەو خەلیفەو دەرویش و رووناکبیرو نیشتمانپەروەر، لە بناری ریزە چیای داریکەلی و قەڵای بەخشی و لە بەرامبەری زنجیرە شاخی سەگرمەدا هاتوومەتە دنیاوە.
- لە حوجرەی مزگەوتەوەو لەلای باوکم و چەند مەلایەکی دۆست و خۆشەویستی باوکم و مەلای دێکەمان دەستم بەخوێندن کردووە، چەند گوندو شوێنم کردووەو، تا لە دواجاردا لە حوجرەوە چوومەتە قوتابخانەی سەرەتایی و قۆناغی سەرەتاییم لە زانستی ئێوارانی سەرەتایی و ناوەندیم لە ناوەندی جمهوریی و ئامادەییم لە ئامادەیی (وەتەن)ی کوران لە سلێمانی تەواوکردووە.
- لە قۆناغی خوێندنی ئامادەییدا لە ساڵی ١٩٦٧-دا ژنم هێناوە.
- لە ساڵی خوێندنی (١٩٦٨-١٩٦٩) لە (بەشی کوردی کۆلێژی زمان)ی زانکۆی بەغدا وەرگیرام، لە ساڵی خوێندنی (١٩٧١-١٩٧٢) بەشی کوردیم لە کۆلێژی ئادابی بەغدا تەواوکردووە، لە (١٩٧٢/٦/٣٠) بروانامەی بەکالۆریۆسم لە زمان و ئەدەبی کوردیدا وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٧١) کە لە زانکۆ بووم بۆ ماوەی (٣) مانگ بەشێوەی کاتیی بە موراقیبی دائیرەی ئیشغالی سلێمانی دامەزراوم. هەر لە هاوینی ئەو ساڵەدا لەسەر داوای (کۆڕی زانیاری کورد) لە بەغدا، کرامە ئەندامی (لیژنەی کۆکردنەوەو بەدواداگەڕانی داستان و چیرۆك وشەی کوردی) لە ناوچەکانی (شارباژێر، پێنجوێن، سەیدسادق، قەرەداغ).
- لە (١٩٧٢/١٠/٢٦) بەمەبەستی خزمەتی سەربازیی پەیوەندیم بە تەجنیدی سلێمانییەوە کردووەو نێردراوم بۆ سەربازگەی مەشقی کەرکوك و دوای دوو مانگ مەشقکردن. گوێزرامەوە بۆ (کولییەی ئەرکان) لە جادرییەی بەغداو دوای تەواوکردنی ماوەی خزمەتی سەربازیی، لە (١٩٧٣/١٢/١) تەسریح کرام.
- لە (١٩٧٤/٢/٢٣) لەسەر بڕیاری مەجلیسی خدمە فەرمانی دامەزراندنم وەکو مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی لە وەزارەتی پەروەردە بۆ دەرکرا، لە فەرمانی دامەزراندنەکەدا بۆ (ئامادەیی کوت) لە پارێزگای واست دانرابووم، لەبەرئەوەی لە سەرەتای ساڵەکەدا پەیوەندیم

